تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

رضي الله عنهم

# حياة الصحابة

به‌ كوردی

کاندهلوی

ته‌حقیقی فه‌رمووده‌کان

شیخ ناصر الدین الالبانی

وه‌رگێڕانی: نیهاد جه‌لال

به‌رگی دووه‌م

# ژیانی هاوەڵان

(رضي الله عنهم)

نووسینی:

زانای پایەبەرز محمد یوسف الكاندهلوی

وەرگێڕانی:

نهاد جلال حبيب الله

هاودەم بە تەحقیقی فەرموودەکان لەسەر بنەمای بڕیاری فەرموودەناس

محمد ناصرالدين الألباني

بەرگی دووەم

١٤٣٢کۆچی ٢٠١١زایینی

بسم الله الرحمن الرحیم

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: ژیانی هاوەڵان(رضي الله عنهم).

نووسەر:محمد یوسف الکاندهلوی

وەرگێڕانی: نهاد جلال حبیب الله.

ساڵ و نۆرەی چاپ: یەکەم/٢٠١١-١٤٣٢

شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕێ نوێ

ژمارەی سپاردن: ١٢٦٥ - ٢٠١١

تیراژ: ٢٠٠٠





# (بەشی هەشتەم)

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی چۆن سامانی خۆیان و ئەوەی خوا پێی دەبەخشین لە ڕێی خواو جێی ڕەزامەندی خوادا دەیانبەخشی، چۆن ئەوەیان لاخۆشەویستتر بوو لەوەی بۆ خۆیان بێت، چۆن بە هەربارێکەوە بێت خۆیان لە بەخشی دوادەخست و بە کەسانی دیکەیان دەبەخشی).

# (بەشی هەشتەم)

# (پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی چۆن سامانی خۆیان و ئەوەی خوا پێی دەبەخشین لە ڕێی خواو جێی ڕەزامەندی خوادا دەیانبەخشی، چۆن ئەوەیان لاخۆشەویستتر بوو لەوەی بۆ خۆیان بێت، چۆن بە هەرباریکەوە بێت خۆیان لە بەخشی دوادەخست و بە کەسانی دیکەیان دەبەخشی).

## (پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاندان لەسەر بەخشین)

موسلیم و نەسائی و جگە لەویش لە جەریرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە نیوەی ڕۆژدا لە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین و خەڵکێکی بێ بەرگی پێ یەتی پۆشەر بەرگ و عەبا هاتن بۆ لای، شمشێریان لەدەست بوو، زۆربەیان بەڵکو هەموویان لە(موزەر) بوون، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕەنگی گۆڕا(ڕەنگی ناخۆشحاڵی) کاتێك ئەو سەختیەی ئەوانی بینی، چوویە ژوورەوەو دواتر هاتە دەرەوەو فەرمانی کرد بە بیلال تا بانگی داو نوێژی کرد و دواتر وتاری خوێندەوەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە(یا ایها الناي اتقوا ربکم الذي خلقکم من نفس واحدة) تا کۆتایی ئایەتی(ان الله کان علیکم رقیبا) هەروەها ئایەتی(اتقوا الله ولتنظر نفس ماقدمت لغد) دوایی فەرمووی(تصدق رجل من دیناره، من درهمة، من ثوبه، من صابره، من صاع تمرهن حتی قال ولو بشق تمرة) واتە(با هەرکەس بە دیناری، بە درهەمی، بە جلی، بە مشتی ببەخشێ، بە مشتێ خورمای، تا فەرمووی بە لەتە خورمایەکیش ببەخشێت) یەکێك لە پشتیوانان مشتێ زیاتری هێنا. پاشان خەڵکی بەدوایدا هاتن تا ئەوەی دوو بەشە خواردن و جلم دی تا ئەوەی دەبینم ڕوخساری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەگەشایەوە وەك ئەوەی زێڕپۆش بێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من سن في الاسلام سنة حسنة فله اجرها واجر من عمل بها، من بعده من غیر ان ینقص من اضورهم

شيء، ومن سن في الاسلام سنة سيئة كان عليه وزرها و وزر من عمل بها بعده من غير ان ينقص من اوزارهم شيء) واته(هەركەس لە ئیسلامدا سوننەتێك دابنێت پاداشتی خۆی و ئەوەی هەیە کە کاری پێ دەکات لە دوای خۆی بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوانیش کەم بکات، هەرکەسیش لە ئیسلامدا شتێکی خراپ دابنێت تاوانی خۆی و ئەوەشی لەسەرە کە لە دوای خۆی دەیکات بەبێ ئەوەی لە تاوانی ئەوانیش کەم بکات).[1] پێشتریش فەرموودەمان لەسەر ئەوە هێنا کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هانی موسڵمانان دەدات لەسەر بەخشین لە ڕێی خوادا.

حاکم – بە صەحیحی داناوە – لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: بەنی عەمری کوڕی عەوف لە ڕۆژی چوار شەممە لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بوون ئینجا فەرموودەکە دێنێت تا ئەوەی دەڵێت: فەرمووی(ئەی کۆمەڵی پشتیوانان) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(کنتم في الجاهلية اذ لاتعبدون الله تحملون وتفعلون في اموالكم المعروف و تفعلون الى ابن السبيل حتى اذا من الله عليكم بالاسلام و بنيه اذا انتم تحصنون اموالكم، فيما ياكل ابن ادم اجر، وفيما ياكل السبع و الطير اجر) واته(ئێوە لە سەردەمی نەفامیدا کە خواتان نەدەپەرست و ماندوێتیتان دەچەشت و لە ماڵوسامانداندا بە چاکە دەتانبەخشی و بۆ ڕێبواریشتان دەبەخشی تا ئەوەی خوای گەورە بە ئیسلام و بە پێغەمبەرەکەی منەتباری کردن ئێستا دەکەونە کۆکردنەوەی سامانتان، لەوەی نەوەی ئادەم دەیخوات پاداشتی لەسەرە، لەوەی ئاژەڵ و باڵندە دەیخوات پاداشتی لەسەرە) خەڵکەکە گەڕانەوە و هەرکامیان سی دەرگای لە باخچەکەیەوە دەکردەوە.[2]

ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکەم وتاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە چوویە سەر مینبەر سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و فەرمووی(ئەی

[1] – لە الترغيب والترهيب ج١ ص٥٣ دا واهاتووە.
[2] – لە الترغيب والترهيب ج٤ ص١٥٦ دا واهاتووە.

خەڵکینە خوای گەورە ئیسلامی وەك ئایین بۆ هەڵبژاردون، دەی بە بەخشندەیی و ئاکاری جوان هاودەمی باش بن بۆ ئیسلام، بزانن بەخشندەیی(سەخاوەتمەندی) درەختێکی بەهەشتەو ڕەگەکانی لە دونیادان، هەرکامتان سەخاوەتمەند بێت بەردەوام پەیوەستە بە ڕەگێکەوە تا ئەوەی خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە، وریابن، دەست داخراویی درەختێکی ناو دۆزەخەو ڕەگەکانی لە دونیادان، هەرکامتان دەست داخراوە بەردەوام پەیوەستە بە ڕەگێکەوە تا خوای گەورە دەیخاتە دۆزەخەوە، دووجار فەرمووی: سەخاوەتمەندی لە پەروەردگارەوەیە، سەخاوەتمەندی لە پەروەردگارەوەیە).[1]

## (حەزی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و هاوەڵانی بۆ بەخشین)

ترمزی لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و داوای لێکرد شتێکی پێبدات، ئەویش فەرمووی(ما عندي ما اعطيك ولكن ابتع علي شئيا فاذا جائني شيئ قضيته) واتە(هیچم لانیە تا بتدەمێ بەڵام شتێکم لەسەر بفرۆشە کە شتێکم بۆ هات دەیدەمەوە) عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پێم بەخشی، دەی شتێك کە نایتوانی خوا لەسەری دانەناوی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حەزی نەکرد بە قسەکەی عومەر، یەکێك لە پشتیوانان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ببەخشەو مەترسە لەوەی خاوەنی عەرش کەمی بکاتەوە، پێغەمبەر(ص) زەردەخەنەی کردو لە ڕوخساریدا زەردەخەنە لەسەر قسەکەی پشتیوانەکە بینراو فەرمووی(بهذا امرت) واتە(وا فەرمانم پێکراوە).[2][3]

---

[1] - لە كنز المعال ج٣ ص٣١٠ دا هاتووە.

[2] - ضعیف.

[3] - لە البداية والنهاية ج٦ ص٥٦ دا هاتووە، بەزارو ئیبن جەریرو خەرائینیش لە مكارم الاخلاق وە سەعیدی کوڕی مەنسوریش هێناویەتی، لە كنز العمال ج٤ ص٤٢ دا واهاتووە. هەیسەمی

ئیبن جەریر لە جابرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و داوای لێکرد، ئەویش پێی بەخشی، پاشان یەکێکی تر هاتو داوای لێکردو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڵێنی پێدا، عومەری کوڕی خەتتاب هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوات لێکراو بەخشیت، پاشان داوات لێکراو بەخشیت، پاشان داواتلێکراو بەخشیت، دووبارە داواکراو بەخشیت، وەك ئەوەی پێغەمبەر(ص) ڕقی لەو قسەی بێت، عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهمی هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ببەخشەو مەترسە خاوەن عەرش کەمی بکاتەوە، وا فەرمانت پێکراوە، لە کنز العمال ج٣ ص٣١١ دا واهاتووە.

بەزار بە سەنەدی حەسەنو تەبەرانی لە ئیبن مەسعوودەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ لای بیلالو بڕێ خورمای لەلابوو، فەرمووی(ئەی بیلال ئەمە چیە؟) وتی: ئەمەم بۆ میوانەکانی تۆ ئامادە کردووە، فەرمووی(اما تخشى ان يكون لك دخان في نار جهنم انفق يا بلال و لاتخش من ذي العرش اقلالا) واتە(مەگەر ناترسیت لە دۆزەخدا بۆت بێتە دووکەڵ ئەی بیلال ببەخشەو لەوە مەترسە خاوەنی عەرش کەمی بکاتەوە)[1][2].

ئەبویەعلا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سێ باڵندەم پێشکەشی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کردو ئەویش یەکێکیانی دەرخواردی خزمەتکارەکەی دا، بۆ بەیانی هەندێکی لێ هێنان پێغەمبەر(ص) فەرمووی(الم انهك ان ترفعي شيئا لغد! فان الله تعالى ياتي برزق كل غد) واتە(مەگەر دوورەپەرێزیم لێ نەکردیت کە

ج١٠ ص٢٤٢ دەڵێت: بەزار هێناویەتیو تیایدا ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی حونەینی هەیە کە زۆرینە بە لاوازی دەزاننو ئیبن حیببان متمانەی پێدەداتو دەڵێت هەڵەدەکات.

[1] – صحيح.

[2] – ئەبونەعیمیش لە الحلية ج١ ص١٤٩ دا لە عەبدوڵڵاوە بەو جۆرە هێناویەتی، ئەبویەعلاو تەبەرانی لە ئەبی هورەیرەوە بە هەمان شێوە بە سەنەدی حەسەن هێناویانە، لە الترغيب والترهيب ج٢ ص١٧٤ دا واهاتووە.

هیچی لێ هەڵنەگری بۆ بەیانی، چونکە خوا هەموو ڕۆژێك ڕۆزی دەنێرێت) هەیسەمی ج١٠ ص٢٤١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، ئەحمەدیش لە ئەبولبوختەری لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب بە خەڵکی وت: زیادەیەکی ئەم سامانە لامان ماوەتەوە، ئەوانیش وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئێمە سەرقاڵمانکردوویتو دەرفەتت بۆ کەسو کارو بازرگانیت نیە، دەی ئەوە بۆ تۆ، عومەر(رضي الله عنه) بە منی وت: تۆ چی دەڵێیت؟ وتم: ئەوان وتیان چی بکە، وتی: بڵێ، وتم: بۆ دڵنیاییت دەکەیت بەگومان، وتی: هەردەبێت ئەوەی وتت بیڵێیت، وتم: بەڵێ بە خوا دەیڵێم، بیرت دێت کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تۆی نارد بۆ سەدەقە کۆکردنەوە چوویت بۆ لای عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبو ئەویش سەدەقەکەی پێ نەدایت، کێشەیەك کەوتە نێوانتانەوە، تۆ بە منت وت: لەگەڵم وەرە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تا پێی بڵێین چی کردووە، چووین بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بینیمان ماندوو شەکەت بوو، گەڕاینەوە و بۆ بەیانی چووینەوەلای وشحاڵ بینیمان. پێت وت: عەبباس چی کردووە، پێی دەفەرمویت: مامی پیاو جێی باوکیەتی! بۆمان باسکرد کە ڕۆژی یەکەم ماندوێتی ئەومان بنیوە و بۆ ڕۆژی دووەم خۆشی ئەومان بینیوە، ئەویش فەرمووی(انما اتيتما في اليوم الاول وقد بقي عندي من الصدقة ديناران، فكانما الذي رايتما من خثوري لذالك، و اتيتما في اليوم و قد وجهتهما فذالك الذي رايتما من طيب نفسي) واتە(ئێوە ڕۆژی یەکەم هاتنو منیش دوو دیناری صەدەقەم لامابوو، ئەو ماندوێتیەم لەبەرئەوەبوو، ئەمڕۆ هاتو منیش ئەو دوو دینارم بەخشیبوو ئەوە ئەو خۆشحاڵیەم بوو) عومەر وتی: ڕاست دەکەیت بە خوا. لە دونیاو دواڕۆژدا سوپاست دەکەم[1,2].

[1] – ضعیف.

[2] – ئەبویەعلاو دەورەقیو بەیهەقیو ئەبوداودیش هێناویانە، لە سەنەدەکەدا ئیتر ساڵێك لە الحلية ج٤ ص٣٨٢ لە ئەبولبوختەریەوە هێناویەتی عومەر – فەرموودەکە بەو واتایە دێنێت –

بەزار لە تەلحەی کوڕی عەبدوڵلاوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پارەیەك هێنرا بۆ عومەر(ﷺ) و ئەویش لە نێو موسڵمانداندا دابەشی کردو هەندێکی لێ مایەوە، لەوبارەوە ڕاوێژی پێکردن ئەوانیش وتیان: بۆچی ئەگەر دەکرێت دایناێیت بۆ جێگیرێك! دەڵێت: عەلیش هیچی نەدەوت، وتی: ئەی ئەبولحەسەن بۆچی قسەناکەیت؟ وتی: ئەوان قسەیان کرد، عومەر(ﷺ) وتی: دەبێت قسەم بۆ بکەیت، وتی: خوا پشکی ئەو داراییەی بڕیوەتەوە، باسی سامانی بەحرەینی کرد کاتێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و نێوانیان تێکەوت تا دابەشکردنی شەو، نوێژەکانی لە مزگەوتدا کرد، ئەوەم لە ڕووخساری پێغەمبەردا(ﷺ) بینی تا لێ بوویەوە، وتی: قەینا هەردەبێ دابەشی بکەیت، ئەویش دابەشی کرد بەسەرمداو لەوەدا هەشت سەد درهەمم بەرکەوت.[1]

ئەحمەدو ئەبویەعلا لە ئوم سەلەمەوە هێناویانەو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕەنگ گۆڕاوی هات بۆ لام، منیش ترسام لە ئازارەوە بێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ڕەنگت گۆڕاوە؟ فەرمووی(من اجل الدنانير السبعة التي اتينابها امس امسينا و هي خصم الفراش) وفي الرواية(اتتنا و لم ننفقها) واتە(لە پێناو ئەو حەوت دینارەی دوێنێ بۆمان هات، ئەومان بردە سەرو هێشتا لە کەناری جێگەکەدایە) لە گێڕانەوەیەکیشدا(بۆمان هاتووەو نەمانبەخیشووە)[2] .[3]

تەبەرانی لە معجم الكبير بە گێڕەرەوەی جێ متمانەی جێ پشت پێ بەستن لە صەحیحدا – لە سەهلی کوڕی سەعدەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)

---

هەیسەمی ج١٠ ص٢٣٨ دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، ئەبویەعلاو بەزاریش هێناویانە بەڵام ئەبولبوختەری لە عەلی و عومەریشەوە نەیبیستووە، بۆیە مورسەلی صەحیحە، تەواو.

[1] – هەیسەمی ج١٠ ص٢٣٩ دەڵێت:لە سەنەدەکەدا حەجاجی کوڕی ئەرتە هەیە کە مودەللەسە.

[2] – صحيح.

[3] – هەیسەمی ج١٠ ص٢٣٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی هەردووکیان صەحیحن.

حەوت دیناری لابوو لای عائیشە دایناـبوو، لە کاتی نەخۆشیدا فەرمووی ئەی عائیشە(ابعثي بالذهب الى علي) واتە(ئەو زێڕە بنێرە بۆ لای عەلی) دوایی لە هۆش چوو و عائیشە سەرقاڵبوو پێیەوە تا ئەوەی چەندجار ئەوەی وتەوە، هەمووجار ئەوە پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) لە هۆش دەبردەوەو عائیشەش سەرقاڵ دەبوو پێوەی، ئینجا ناردی بۆ لای عەلی و ئەویش بەخشی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەرەمەرگیدا شەوی بردە سەر لە شەوی دووشەممە، عائیشە(رضي الله عنها) چرایەکی خۆی نارد بۆ لای یەکێك لە کۆگاکانی و وتی: لەمەدا بڕێ لە ڕۆنی هیزەمان بۆ بنێرە، چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەرەمەرگدایە،[1] لە الترغيب والترهيب ج٢ ص١٧٨ لای ئەحمەد لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردم کە ئەو زێڕەی لە کاتی نەخۆشیدا لای بوو – لای عائیشە – بیبەخشم، کە بە هۆش هاتەوە فەرمووی(چیت کرد ؟) وتم: ئەم بارەی تۆ سەرقاڵی کردم) فەرمووی(فهلم بها)(دەی زووکە) ئەویش حەوت یان نۆ دینار بوو – ئەبوحازم گومانی حەوت بوو یان نۆ – کە هێنای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ما ظن محمد لقى الله و هذة عنده و ما تنفي هذا من محمد لقى الله و هذه عنده)[2].[3]

بەزار لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوزەر(رضي الله عنه) پێی وتم برازاگیان، من لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووم دەستیم گرتبوو، پێی فەرمووم(يا اباذر ما احب ان لي احدا ذهبا و فضة انفقته في سبيل الله اموت يوم اموت ادع منه قيراطا) واتە(ئەی ئەبوزەر حەزناکەم هێندەی کێوی ئوحود زێڕو زیوم

---

[1] – ئیبن حیبان لە صەحیحەکەیدا لە فەرموودەکەی عائیشەوە بەو واتایە هێناویەتی،

[2] – صحيح.

[3] – هەیسەمی ج١٠ ص٢٤٠ دەڵێت ئەحمەد بە چەند سەنەدێك هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدێکیان صەحیحن. بەیهەقیش ج٦ ص٣٥٦ لە فەرموودەکەی عائیشەوە(رضي الله عنها) بەو جۆرە هێناویەتی.

هەبێت لە پێناو خوادا بیبەخشم بەڵام لە ڕۆژی مەگمدا چنگێکم هێشتبێتەوە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا قیراتێك؟ فەرمووی(یا اباذر اذهب ای الاقل و تذهب الی الاکثر، ارید الاخرة و ترید الدنیا، قیراطا)(ئەی ئەبو زەر بۆ کەمتر دەچم و بۆ زیاتر دەچیت، دواڕۆژم دەوێت و تۆش دونیات دەوێت، بەڵێ قیراتێك) سێ جار پێی وتمەوە.[1,2]

ئەحمەد لە ئەبوزەرەوە هێناویەتی هات بۆ لای عوسمان و ئەویش مۆڵەتی داو داردەستێك بە دەستیەوە بوو، عوسمان وتی: ئەی کەعب: عەبدولڕەحمان مرد و پارەیەکی بە جێهێشتووە، تۆ چۆنی دەبینیت؟ وتی: ئەگەر ماف خوای تێدا داوە گرفتی نیە، ئەبوزەر گۆچانەکەی هەڵگرت و دای لە کەعب و وتی: گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو(ما احب لو ان هذا الجبل لي ذهبا انفقه و یتقبل مني اذرمنه خلفي ست اواق)(ئەی عوسمان سوێندت دەدەم بە خوا بیستووتە؟ سێ جار. وتی: بەڵێ،[3]

لە کنز العمال ج۳ ص۳۱۰ هێناویەتی و تیایدا دەڵێت: عوسمان بە کەعبی وت: ئەی ئەبوئیسحاق پێت وایە زەکاتەکەی داوە ئایا ئیتر ترسی لەسەر خاوەنەکەی هەیە؟ وتی: نا، ئەبوزەر گۆچانێکی پێبوو دای لەبەرگوێی کەعب و دواتر وتی: ئەی کوڕی کچە جوولەکەکە تۆ بانگەشەی دەکەیت ماف ڕێی خوای تێدا نیە، ئەگەر زەکاتی بەخشی لە کاتێکدا خوا دەفەرموێت(و یؤثرون علی انفسهم و لو کان بهم خصاصة) خواش دەفەرموێت(و یطعمون الطعام علی حبه مسکینا و یتیما و اسیرا) خوا دەفەرموێت(وفي اموالهم حق معلوم للسائل والمحروم) بەو جۆرە لە قورئاندا نموونەی وای دەهێنایەوە.

---

[1] – صحیح.

[2] – تەبەرانی بە هەمان شێوە هێناویەتی، هەیسەمی ج۱۰ ص۲۳۹ دەڵێت: سەنەدەکەی بەزار حەسەنە.

[3] – هەیسەمی ج۱۰ ص۲۳۹ دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە سەنەدەکەدا ئیبن لهیعە هەیە کە چەند کەسێك بە لاوازی دەزانن. ئەبویەعلاش گێڕاویەتیەوە، بەیهەقی لە غەزوانی کوڕی ئەبی حاتەمەوە بە دووردرێژی هێناویەتی.

ئـەبوداود و ترمـزی – دەڵێـت سـەنەدەکەی صـەحیحە – و دارمـی و حـاکم و بەیهـەقی و ئەبونـەعیم لـە الحلیـەو جگـە لـەوانیش لـە عومـەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانـە دەڵێـت: پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێـك فـەرمانی پێکـردین ببەخـشین. لـەو کاتـەدا بـڕێ سامانم لابوو، وتم: ئەمڕۆ پێش ئەبوبەکر دەکەوم ئەگـەر بێتـو بڕیـاربێ ڕۆژێ پێشی بکـەوم، نیـوەی سـامانەکەمم هێنـا، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی(مـا ابقیـت لاهلـك؟) واتـە(چیت بۆ ماڵ و منداڵت هێشتووەتەوە؟) وتم: بـۆم هێشتبنەوە؟ وتم: هێنـدەی ئەمـە، ئەبوبـەکریش چـی لابوو هـەمووی هێنـا، فـەرمووی(ئەبوبـەکر چیت بۆ ماڵ و منداڵـت هێـشتووەتەوە؟) وتـی: خـواو پێغەمبـەری خـوام بـۆ هێـشتوونەتەوە،عومەر دەڵێ وتم: تاماوم پێشی نادەمەوە.[1]

بەیهـەقی لـە(شـعب الایمـان) لـە حەسـەنەوە هێناویـەتی دەڵێـت: کەسـێك بـە عوسمـانی(رضي الله عنه) وت: ئـەی سـەرمایەداران خێرتـان بـرد، دەبەخـشن و ئـازاد دەکـەن و حـەج دەکـەن و چاکە دەکـەن، عوسمـان وتـی: ئێـوەش ئێرەییمـان پـێ دەبـەن، وتـی: ئێمـە ئێرەییتـان پـێ دەبەین، وتـی: دەی سـوێند بـەخوا درهـەمێك کـە کەسـێك بـە سەختی دەیبەخشێت(زۆر لە خۆی دەکات لەتاو نەبوونی) خێری زیاترە لە دەهـەزار کەمی ناو زۆر[2][3].

عەسـکەری لـە عوبەیـدوڵڵای کـوڕی موحەممـەدی کـوڕی عائیـشەوە هێناویـەتی دەڵێت: داواکەرێك لەبەردەم ئەمیری باوەڕداران عەلیدا وەستا و ئـەویش بە حەسـەن یـان حوسـەینی وت بـڕۆ بـۆ لای دایکـت و پێـی بڵـێ شـەش درهـەمم لــەلا بەجێهێشتوویت، درهـەمێکی بهێنـە، چوو ئینجا گەڕایـەوە، عـەلی وتـی: دایکم پێـی وتم: شەش درهـەمت بۆ ئارد بەجێهێشتووە، عـەلی وتـی: ئیمـانی بەندەیـەك ڕاست

[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٤٧ دا واهاتووە.

[2] – حسن.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص٣٢ دا واهاتووە.

نیه تا ئەوەی لەلای خوا بەجێ متمانەو بێ گومانتربێت لەوەی لە دەستی خۆیدایە، پێی بڵێ: شەش درهەمەکە بنێرێت، ئەویش پارەکەی ناردو عەلیش دای بە داواکەرەکە، دەڵێت هەنگاوی نەنا تا کابرایەك دای بە پاڵیداو وشترێکی پێبوو دەیفرۆشت، عەلی وتی: ئەم وشترە بەچەندە؟ وتی: بە سەدو چل درهەم، عەلی وتی: بیبەستەوە با دواتر پارەکەیت بدەینێ، کابرا بەستیەوەو چوو، دوایی کەسێك هات و وتی: ئەو وشترە هی کێیە؟ عەلی وتی: هی منە. وتی: ئایا دەیفرۆشیت؟ وتی: بەڵێ. وتی: بەچەند؟ وتی: بە دوو سەد درهەم. وتی: باشە، وشترەکەی بردو دوو سەد درهەمەکەی پێدا، سەدو چل درهەمەکەی بە کابرا داو شەش درهەمەکەی هێنا بۆ فاتیمەو ئەویش وتی: ئەمە چیە؟ وتی: ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی پێیداوین(من جاء بالحسنة فله عشر امثالها).[1](هەرکەس چاکەیەك بکات دە بەرامبەری بۆ هەیە).

ئەحمەدو ئەبوداودو ئەبویەعلاو ئیبن خوزەیمەو جگە لەوان لە ئوبەیەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە بەخشش خوازیەوە ناردمی و منیش دام بەلای کەسێکدا، کە پارەکەی کۆکردەوە هیچم نەدی لەسەری بێت جگە لە وشترێکی بچووك، وتم: دەی ئەوە لە جیاتی سەدەقەکەتە بیدە. وتی: ئەمە بۆ شیرو سواریش نابێت، بەڵام ئەمە وشترێکی گەنجی گەورەی قەڵەوە، هانێ بیبە. پێم وت: من شتێك نابەم فەرمانم پێ نەکرابێت، ئەوە پێغەمبەری خوا لێت نزیکە ئەگەر پێت خۆشە برۆ بۆ لای و پێی بڵێ، ئەگەر قبوڵی کرد وەریدەگرم، ئەگەر نا وەری ناگرم، وتی: باشە، لەگەڵم هات و وشترەکەی هێنا تا چووینە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێنەرت هات بۆ لام تا سەدەقەی ماڵم وەرگرێت ئەی بە خوا لە ماڵمدا هیچ بۆ پێغەمبەری خواو نێردراوەکەی نەبوو، لە پێشتردا هەموو ماڵیم بۆ کۆکردەوە، دەڵێت ئەوەی لەلامە کە شیرو سواری نیە ئەوە بدەم، من وشترێکی

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص٣١١ دا واهاتووە.

گەورەی گەنجم پێداوە تا بیبات کەچی ڕازی نابێت، وا هێناومە بۆ لای تۆ ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ذاك الذي عليك فان تطوعت بخير جزاك الله فيه و قبلناه منك) واتە(ئەوەت لەسەرە، ئەگەر خۆبەخشی خێرت هەیە خوا پاداشتت بداتەوە لەسەری و ئێمەش لێت وەردەگرین) وتی: دەی ئەوەتا ئەی پێغەمبەری خوا هێناومە بیگرە. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانیکرد تا وەریگرین و نزای بەرەکەتی بۆ ماڵ و سامانی کرد.[1]

بوخاری لە(الادب المفرد) ص٤٣ لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: دوو ئافرتم نەدیوە بەخشندەتر بن لە عائیشە و ئەسما(رضي الله عنهما) بەخشندەییشیان جیاوازبێت، عائیشە(رضي الله عنها) بەرەبەرە کۆی دەکردەوە کە زۆر دەبوویەوە دابەشی دەکرد. ئەسماش(رضي الله عنها) هیچی هەڵنەدەگرت بۆ بەیانی.

عەبدولڕەزاق و ئیبن ڕاهەویە لە کەعبی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك لە باوکیەوە هێناویانە دەڵێت: موعازی کوڕی جەبەل کەسێکی نەرمونیانی گەنجی هەڵکەوتەی ناو گەنجانی هۆزەکەی بوو و هیچی نەدەهێشتەوە، بەردەوام قەرزی وەردەگرت تا ئەوەی هەموو پارەکەی بە قەرزەوە دەچوو لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) داوای بۆ کرد تا لەخاوەن قەرزەکانی داوای بۆ بکات تا بۆی دانەنێن، بەڵام ئامادە نەبوون، ئەگەر ئەوەیان لە پێناو کەسێکدا واز لێ بهێنایە ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەموو ماڵەکەی لە پێناو قەرزەکەیدا بۆ فرۆشت تا ئەوەی موعاز هیچی نەمایەوە، تا لە فەتحی مەککەدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کردی بە بەرپرسی دەستەیەك لە یەمەن تا بازرگانی بۆ بکات موعاز لەوێ مایەوە و ئەمیر بوو، ئەو یەکەم کەس بوو لە ماڵ و سامانی ڕێی خوادا بازرگانی کرد، لەوێ مایەوە تا ئەوەی دەستکەوت و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرد، کە هاتەوە

[1] – له كنز العمال ج٣ ص٣٠٩ دا واهاتووه.

عومەر بە ئەبوبەکری وت: هەواڵ بنرێرە بۆ ئەو کابراو هێندەی بەشی ژیانی دەکات بیدەرێ‌و ئەوی تری وەربگرە، ئەبوبەکر وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆ بازرگانی‌و منیش هیچی لێ وەرناگرم مەگەر خۆی بیدات. عومەر چوو بۆ لای موعاز بەوەی ئەبوبەکر بە گوێی نەکرد. عومەر ئەوەی بۆ موعاز باسکرد، موعاز وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) منی نارد بۆ بازرگانی‌و منیش نایکەم، پاشان موعاز بە عومەری وت: بە گوێت دەکەم‌و فەرمانت بەجێ دەگەیەنم، من لە خەومدا بینیم: من لە حەوزە ئاوێکدا بووم‌و دەترسام بخنکێم، تۆش ڕزگارت کردم، موعاز هات بۆ لای عومەرو بۆی باسکردو سوێنی خوارد هیچی نەشارێتەوە تەنانەت قامچیەکەشی. ئەبوبەکر وتی: بەخوا لێت وەرناگرم من داومە بە تۆ، عومەر وتی: ئیتر بەوجۆرە باشە. موعاز ئەوکات چوو بۆ شام.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢١٣ لە ڕێگەی عەبدولڕەزاقەوە بە سەنەدی لە کەعبی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: موعازی کوڕی جەبەل گەنجێکی جوانی نەرمونیانی هەڵکەوتەی گەنجانی هۆزەکەی بوو، هەرچی لێ داوابکرایە دەیبەخشی یا ئەوەی قەرزێکی کردو پارەی پێ نەهێشت، بە هەمان شێوە فەرموودەکە دێنێت.[2]

حاکم لە فەرموودەکەی جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: موعازی کوڕی جەبەل یەکێك بوو لە جوانترین کەسەکان‌و ڕەوشت جوانترین‌و دەست کراوەترینیان، قەرزێکی زۆری کرد، خاوەن قەرزەکان هاتن بۆ داوای قەرزەکە تا چەند ڕۆژێك لەماڵەوە خۆی شاردەوە لێیان تا ئەوەی سکالایان کرد لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش ناردی بە شوێن موعازداو ئەویش هات‌و خاوەن قەرزەکانیشی لەگەڵدا بوون. وتیان:

---

[1]- لە کنز العمال ج٣ ص١٢٦ دا واهاتووە.

[2]- حاکم ج٣ ص٢٧٣ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی کەعبی مالیك لە باوکیەوە بە کورتی هێناویەتی، حاکم ج٣ ص٢٧٣ دەڵێت: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی بوخاری‌و موسلیم صەحیحەو ئەوانە نەیانهێناوە. زەهەبیش لەسەری کۆکە.

ئەی پێغەمبەری خوا مافەکەمان وەربگرەوە لێی، فەرمووی(رحم الله من تصدق علیه) واتە(ڕەحمەتی خوا لەوەی لە قەرزەکەی یارمەتی دەدات) هەندێ ئەوەیانکردو هەندێکی دی ڕازی نەبوون و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مافەکەی خومان لێی دەوێت، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(اصبر لهم یا معاذ) واتە(موعاز لەبەردەمیاندا خۆت بگرە) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە کاڵاو سامانی موعازی سەندو دایەوە بە خاوەن قەرزەکان و ئەوانیش لە نێو خۆیاندا دابەشیانکرد، پێنج حەوتی مافەکەیان بردەوەو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆمان بفرۆشە، فەرمووی(خلوا علیه فلیس لکم علیه سبیل) واتە(وازی لێ بهێنن مافتان لەسەریەوە نیە) موعاز چوو بۆ لای بەنی سەلەمە، یەکێك پێ وت: ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان ئەگەر داوات لە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بکردایە باش بوو وا ئەمڕۆ هەژار کەوتوویت، موعاز وتی: داوای لێ ناکەم، چەند ڕۆژێك مایەوە، ئینجا پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بانگیکردو ناردی بۆ یەمەن و فەرمووی(لعل الله ان یجبرك و یؤدي عنك دینك)( بەڵکو خوا قەرەبووت بۆ بکاتەوە و قەرزەکەت لەسەر لابەرێ) موعاز چوو بۆ یەمەن و لەوێ مایەوە تا پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) مردو ئەو ساڵەی تیایدا عومەری کوڕی خەتتاب حەجی کرد هاتە مەککەو ئەبوبەکر عومەری لەسەر حەج دانا، لە ڕۆژی(الترویه) لەوێ بەیەك گەیشتن و دەستیانکردە ملی یەکدی و هەرکامیان سەرەخۆشی مەرگی پێغەمبەریان لەوی دیکەیان دەکرد، دواتر پێکەوە بوون و قسەیان دەکرد، ئەو کات عومەر هەندێ غوڵامی دی، - ئینجا فەرموودەکەی ئیبن مەسعود دێنێت -.[1]

حاکم لە ڕێگەی ئەبوائیلەوە لە عەبدوڵڵاوە هێناویەتی: کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) مردو ئەبوبەکریان بە خەلیفە دانا، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) موعازی ناردبوو بۆ یەمەن، ئەبوبەکر عومەری لەسەر حەج داناو موعازی لە مەککە بینی و چەند کۆیلەیەکی پێ بوو، وتی: ئەوانە چین؟ وتی: ئەوانە خەڵاتم کراون، ئەوانەش بۆ ئەبوبەکرن، عومەر وتی:

[1] - ئیبن سەعدیش ج٣ ص١٢٣ لە جابرەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

وای دەبینم بیانبەیت بۆ ئەبوبەکر. بۆ بەیانی پێی گەیشت، وتی: ئیبن خەتتاب دوێنێ بینیم بەرەو ئاگر دەچووم و تۆش دەتگرتم تا نەکەوم، بۆیە ملکەچت دەبم، کۆیلەکانی بردو ئەبوبەکر وتی: ئەمانە خەڵاتکراون بۆ من و ئەوانەش بۆ تۆ، وا خەڵاتەکەمان دایتەوە، موعاز چوو بۆ نوێژو سەیری کرد لە دوایەوە نوێژ دەکەن، وتی: بۆ کێ نوێژ دەکەن؟ وتیان: بۆ خوا، وتی: دەی ئێوەش بۆ ئەو بن، ئازادی کردن.[1]

## (بەخشینی ئەوەی حەزی لێیەتی)

شەش زانای فەرمووده لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: عومەر لە خەیبەر زەویەکی دەستکەوت، هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: زەویەکم دەستکەوتووە کە هیچکات سامانێکی لەوە چاکترم دەستنەکەوتووە، تۆ فەرمانی چیم پێ دەکەیت؟ فەرمووی ئەگەر دەتەوێت ئەسڵەکەی بهێڵەرەوەو بیکە بە سەدەقە، عومەر سەدەقەی کرد تا ئەسڵەکەی نەفرۆشێت و خەڵات نەکرێ و نەکرێت بە میرات و بۆ هەژاران و خزمان و نزیکان و ئازادکراوان و لە ڕێی خواداو بۆ میوان بێت، گرفت نیە هەرکەس سەرپەرشتی بکات بە شێوەیەکی ڕەوا لێی بخوات یان خواردنی دۆستێك بدات بەبێ زیادەڕەوی و لادان.[2]

عەبدی کوڕی حەمیدو ئیبن جەریرو ئیبن نەزیر لە عومەرەوە هێناویانە نامەی نووسی بۆ ئەبوموسای ئەشعەری(رضي الله عنه) تا کەنیزەکێکی گیراوی جەلەولای بۆ بفرۆشێت، ئەویش بانگی کەنیزەکەکەی کردو وتی: خوا دەفەرموێت(لن تنال البر حتى تنفق مما تحبون) عومەر ئازادی کرد.[3]

---

[1] – حاکم ج٣ ص٢٧٢ دەڵێت: زەهەبی لەسەری کۆکەو لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحەو ئەو داونە نەیانهێناوە.

[2] – لە نصب الراية ج٣ ص٤٧٦ دا واهاتووە.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص٣١٤ دا واهاتووە.

ئیبن سەعد ج٤ ص١٢٣ لە نافعەوە هێناویەتی عەبدوڵای کوڕی عومەر کەنیزەکێکی هەبوو، کاتێك زۆر پێی سەرسام بوو ئازادی کردو مارەی بڕی لە مەولایەکی، کەنیزەکەکە منداڵێکی بوو، نافیع دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی عومەرم دی ئەو منداڵەی دەگرتە باوەش و ماچی دەکردو دەیوت: ئای بۆ بۆنی فلانە کەس واتە ئەو کەنیزەکەی ئازادی کرد.

بەزار لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەم ئایەتەم بیرکەوتەوە(لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) بیرم کردەوە خوا چی پێ بەخشیوم، خۆشەویستترینیان مەرجانە کە کەنیزەکێکی ڕومیم بوو، وتی: دەی لە پێناو خوادا ئازاد بیت، ئەگەر لە شتێکدا پەنام بگرتایە لەبەر خوا بێت مارەم دەبڕی،[1].

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٢٩٤ لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر کە زۆر بە شتێك لە سامانی سەرسام بوایە لە ڕێی خوادا دەیبەخشی، - نافع کە کۆیلەی بوو - ئەوەیان لێ بەدی کرد، لەوانەیە یەکێکیان پەلەی بکردایەو بچوایەتە مزگەوت، کە ئیبن عومەر دەیبینی لەو بارە باشەدایە ئازادی دەکرد، هاوەڵەکەی پێی دەوت: ئەبوعەبدولڕەحمان بەخوا ئەمانە فێڵت لێ دەکەن، ئیبن عومەر دەیوت: هەرکەس بە پێناوی خوای گەورە هەڵمانخەڵەتێنێت بۆی دەخەڵەتێین، نافع وتی: ئێوارەیەك ئیبن عومەر بە وشترێکەوە بە سامانێکی زۆرەوە چوو کە سەرسامی چوونەکەی بوو یەکسەر وەستاندی و لەسەری دابەزیو وتی: فافع ڕەشۆو باری لابەن و بیڕازێننەوەو بیبەنە شوێنی خۆی با قەڵەو ببێ، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا لە نافعەوە وتی: لەسەر وشترەکەی بوو دەچوو - واتە ئیبن عومەر - کە بە وشترەکەی سەرسام بوو، وتی(ئیخ ئیخ) وەستاندی و دواتر وتی نافع کەل و پەلەکەی

---

[1]- هەیسەمی ج٦ ص٣٢٦ دەڵێت: بەزار هێناویەتی و لە سەنەدەکەیدا کەسێك هەیە نایناسم، حاکم ج٣ ص٥٦١ هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد کردووە، نافیع مارەی بڕی، بەوە ئوم وەلەدی بوو، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٢٩٥ لە ڕێگەی موجاهیدو جگە لەویشەوە هێناویەتی.

لەسەرلابە دەمبینی بۆ شتێکی دەویست، هەستام بارەکەیم لابرد، پێی وتم: سەیرکە بزانە وەك سەری هیچی لەسەر بەدی دەکەیت؟ وتم: بۆ خاتری خوا پێم بڵێ ئەگەر دەتەوێت بیفرۆشم بەنرخەکەی دەیکڕم، وتی: ڕێك و پێك بردی و زەنگی کردە ملی و بردیە شوێنی خۆی، هەرکات سەرسامی شتێکی سامانی بوایە دەیبەخشی.

هەر ئەو دەڵێت: ئیبن عومەر سەرسامی هەر سامانێکی بوایە لە ڕێی خوادا دەیبەخشی، جار هەبوو لە کۆڕێکدا سی هەزاری دەبەخشی، دووجار ئیبن عامر سی هەزاری پێدا، وتی: ئەی نافع دەترسم درهەمەکانی ئیبن عامر لە خشتەم ببەن، بڕۆ تۆ ئازادیت، یەك مانگ لە سەر گۆشت خواردن نەدەچوو مەگەر لە سەفەر یان لە ڕەمەزاندا، مانگ هەبوو خۆی دەگرت و پارچە گۆشتێك چیە نەیدەخوارد.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٩٧ لە سەعیدی کوڕی ئەبی هیلالەوە هێناویەتی عەبدولای کوڕی عومەر(رضي الله عنه) لە جوحضە دابەزی و نەخۆش بوو، وتی: حەزم لە ماسیە، گەڕان و دەستیان نەکەوت تەنها یەك دانە نەبێت، ژنەکەی(صەفیەی کچی ئەبوعوبەید) بردی و بۆی ئامادەکرد و بۆی هێنا، هەژارێك هات و لای وەستا و ئیبن عومەر پێی وت: بیبە، ئەوانەی دەوریان وتیان: سبحان الله تۆ ناڵەت بوو بۆ ئەمە، ئێمە شتی ترمان پێیە پێی دەدەین، ئەویش وتی: عەبدوڵڵا لەگەڵی خۆشی دێت.

هەروەها لە ڕێگەی عومەرەوە ئیبن سەعد بەو جۆرە هێناویەتی و تیایدا هاتووە: ژنەکەی وتی: درهەمێکی پێ دەدەین ئەوە لەمە بۆی باشترە، تۆ حەزەکەی خۆت بەدی بهێنە. وتی: حەزی خۆمم ناوێت.[2]

---

[1]- تەبەرانیش بە کورتی هێناویەتی، لە المجمع ج٩ ص٣٤٧ دا هاتووە، ئیبن سەعد لە نافعەوە بە کورتی لە ج٤ ص١٢ دا هێناویەتی.

[2]- هەروەها لە ڕێگەی نافعەوە هێناویەتی، ئیبن سەعدیش ج٤ ص١٢٢ لە حەبیبی کوڕی مەزرووقەوە بە زیادەیەکەوە بەو واتایە هێناویەتی.

بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە هێناویانە دەڵێت: ئەبوتەلحە لە مەدینەدا لە هەموو پشتیوانان زیاتر دارخورمای هەبوو، خۆشەویستترین سامانی(بەیرەحا) بوو ڕووی لە مزگەوت بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەچوویە ناوی و تیایدا ئاوی پاکی دەنۆشی، ئەنەس دەڵێت: کە ئەم ئایەتە دابەزی(لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) ئەبوتەلحە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خوای گەورە دەفەرموێت(لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) خۆشەویسترین سامانی منیش(بەیرەحا)یەو لە ڕێی خوادا دەیبەخشم و چاوەڕێی پاداشتی خوا دەکەم، ئەی پێغەمبەری خوا بزانە خوا لە چیدا پێی خۆشە خەرجی بکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بخ! ذالك مال رابح) واتە(بەخ! ئەوە سامانێکی جێ قازانجە).[1] لە صەحیحی بوخاریدا دواتر ئەمەشی هێناوە(وقد سمعت ما قلت و اني ارى ان تجعلها في الاقربين) واتە(من قسەکەی تۆم بیست و پێم باشە لەناو نزیکاندا بیبەخشیت) ئەوبتەلحە وتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەبوو لەناو نزیکان و ئامۆزاکانیدا دابەشی کرد.

سەعیدی کوڕی مەنسوور و عەبدی کوڕی حەمید و ئیبن مونزیر و ئیبن ئەبی حاتەم لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە هێناویانە دەڵێت: کە ئەم ئایەتە دابەزی(لن تنال البر حتى تنفقوا مما تحبون) زەیدی کوڕی حارسە بە ئەسپێکیەوە هات کە پێی دەوترا(شبلة) هیچ سامانێکی هێندەی ئەوە لای خۆشەویستتر نەبوو، وتی: ئەمە بەخشیومە، پێغەمبەریش(ﷺ) قبوڵی کرد و ئوسامەی کوڕی لەسەر دانا، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی لە ڕوخساری زەیدا بەدی کرد و فەرمووی(ان الله قد قبلها منك) واتە(خوا لێی وەرگرتوویت) ئیبن جەریر لە عەمری کوڕی دینارەوە بەو جۆرە هێناویەتی، عەبدولڕەزاق و ئیبن جەریریش لە ئەییوبەوە هێناویانە دەڵێت: لە ساماندا سێ بەشدار هەن: قەدەر بۆ بردنی خێرو خراپەی لە لەناوچوون و مەرگ

---

[1] – لە الترغيب والترهيب ج٢ ص١٤٠ دا واهاتووە،

فەرمانت لێ وەرناگرێت، میراتگر چاوەڕێی دەکات سەر بنێتەوە دواتر وەریدەگرێت و تۆش سەرکۆنەکراویت، ئەگەر توانیت لە پەککەوتەترین ئەو سیانە بیت مەبە، خوای گەورە دەفەرموێت(لن تنالو البر حتى تنفقوا مما تحبون) بزانن ئەم وشترە خۆشەویستترینی سامانمە بۆیە حەزمکرد پێشی بخەم بۆ خۆم.

## (بەخشین لەگەڵ پێویستیدا)

ئیبن جەریر لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێك عەبایەکی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، سەهل وتی: چنراو بوو و چوار دەوری هەبوو، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم تا ئەم بەرگەت بدەمێ، پێغەمبەر(ﷺ) وەریگرت و پێویستی پێ بوو و پۆشی، یەکێك لە هاوەڵانی لەبەریدا بینی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چەندە جوانە، بیدە بە من، فەرمووی بەڵێ، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی فەرموو هاوەڵانی سەرکۆنەیانکرد و وتیان: چاکت نەکرد کاتێك دەزانی پێغەمبەر(ﷺ) پێویستیەتی و وەریگرتووە کەچی تۆ داوای دەکەیت، دەزانیت هەرکەس داوای هەرچی لێ بکات ناڵێت نا، وتی: بە خوا تەنها لەبەر ئەوە وامکرد بەو هیوایەی بەرەکەتەکەیم بەرکەوێت کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی پۆشیوە، بەڵکو بەمەوە کفن بکرێم.

ئیبن جەریر لە سەهلەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەرگ و ڕازاوەیەکی پەژمینی ڕەش هات بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و چواردەورەکەی سپی بوو بەوەوە چوو بۆ ناو هاوەڵانی و بە دەستی دای بەسەر ڕانیدا و فەرمووی(الا ترون الى هذه ما احسنها) واتە(سەیری ناکەن چەند باشە) دەشتەکیەك وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، بیدە بە من - پێغەمبەر(ﷺ) داوای هەرچی لێبکرایە هەرگیز نەیدەوت نا - فەرمووی(بەڵێ) ئەوەبوو پێیداو داوای دوو بەرگی سادەی کردو پۆشینی فەرمانی بە وێنەی ئەوەش کردو بۆی چنرا، پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردو هێشتا لە کاتی چنیندا بوو.[1]

[1] - لە کنز العمال ج٤ ص٤٢ دا واهاتووە.

## (چیرۆكی ئەبووعەقیل(رضي الله عنه))

تەبەرانی لە ئەبوعەقیلەوە هێناویەتی لەسەر دوو مشت خورما شتی لەسەرشانی ڕادەكێشاو یەكێكیانی دەبرد بۆ كەسوكاریو ئەوی تریشی لە پێناو خوادا بەخشیو دەیهێنا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و پێ دەوت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(انثره في الصدقة)(بە خێرو صەدەقە بیبەخشە) دووڕووان گاڵتەیان تێدا دەكرد وتیان: خوا پێویستی بەوە نیە، بە مشتێ خورما خێری بۆ بكرێت، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند(الذين يلمزون المطوعين من المؤمنين في الصدقات والذين لايجدون جهدهم) دوو ئایەتی هێناوە.[1]

بەزار لە ئەبوسەلەمەو ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(تصدقوا فاني لريد ان ابعث بعثا) واتە(ببەخشن چونكە دەمەوێت دەستەیەك بنێرم) عەبدولڕەحمانی كوڕی عەوف هاتو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من چوار هەزارم هەیە، دوو هەزاری دەدەم بە قەرز لای پەروەردگارم و ئەوی دیكەشی بۆ ژنو منالم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بارك الله فيما اعطيت و بارك لك فيما امسكت) واتە(خوا بەرەكەت بخاتە ئەوەی بەخشیتو بەرەكەت بخاتە ئەوەی هێشتووتەوە) یەكێك لە پشتیوانان مایەوەو دوو مشت خورمای دەستكەوتو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دوو مشت خورمام هەیە، مشتێكی لە ڕێی پەروەردگارمداو مشتێكی بۆ ژنو منالم، دووڕووەكان گاڵتەیان پێكردو وتیان: ئەمەی وەك ئیبن عەوف دەیبەخشێت بۆ ڕووپامایییە، یان وتیان: خواو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێویستیان بەو مشتە نیە؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(الذين

---

[1]- هەیسەمی ج٧ ص٣٣ دەڵێت: كەسەكانی سەنەدەكەی جێ متمانەن بەڵام خالیدی كوڕی یەسار كەس نابینم قسەی وای لەسەر بكات، تەواو.

یلمزون...) بەزار دەڵێت: نەمانبیستووە کەس لە فەرموودەکەی عومەری کوڕی ئەبوسەلەمەوە هێنابێتی جگە لە تالوتی کوڕی عیماد[1][2].

## (چیرۆکی عەبدوڵڵای کوڕی زەید(رضي الله عنه))

حاکم ج٣ ص٣٣٦ لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبدەرەبەوە کە بانگی پێ نیشاندرا هێناویەتی هات بۆ لای پێغەمبەر(عليه السلام) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم حەوشەم بەخششە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی، دایك و باوکی هاتن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە پاڵپشتی ژیانمانە، پێغەمبەر(عليه السلام) گێڕایەوە بۆیان، دواتر مردن و کوڕەکەیان بە میراتی وەرگرت. زەهەبی دەڵێت ئیرسالێ لە سەنەدەکەدا هەیە.

## (چیرۆکی یەکێك لە پشتیوانان)

موسلیم و جگە لەویش لە ئەبوهورەیرەوە هێناویانە وتی: کابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەر(عليه السلام) و وتی: من دەست کورتم، ئەویش ناردی بۆ لای هەندێ لە ژنەکانی، وتیان: سوێند بەو کەسەی بە حەق تۆی ناردووە تەنها ئاومان هەیە، تا هەموویان ئەمەیان وت، دوایی پێغەمبەر(عليه السلام) فەرمووی ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی ئەمشەو میوانداری دەکات، یەکێك لە پشتیوانان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، بردیەوە بۆماڵەوە و بە ژنەکەی وت هیچمان هەیە؟ وتی: تەنها نانی منداڵەکانمانە، وتی: دەی بە شتێك سەرقاڵیان بکە. ئەگەر نانیان ویست بیانخەوێنە، کە میوانەکەمان هاتە ژوورەوە چراکە بکوژێنەوە تا وابزانێت منیش نان دەخۆم، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٧ ص٣٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عومەری کوڕی ئەبوسەلەمە هەیە کە عجلی و ئەبوخەیتەمە و ئیبن حیببان متمانەیان پێداوە و شوعبە و جگە لەویش بە لاوازی دەزانن و کەسەکانی دیکەیان جێ متمانەن، تەواو.

ئەگەر ویستی بخوات هەستەو چراکە بکوژێنەوە، دانیشتن و میوانەکە نانی خواردو ئەوانیش بە برسێتی سەریان نایەوە، بۆ بەیانی هاتەلای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی(قد عجب الله صنیعکما) واتە(خوا بەو کارەتان بەرامبەر میوانەکەتان سەرسام بوو) لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: ئەم ئایەتە دابەزی(و یؤثرون علی انفسهم ولو کان بهم خصاصة).[1]

## (چیرۆکی حەوتماڵەکە)

تەبەری لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: سەرە مەڕێك حەوت ماڵی کردو هەرکامیان دەیاندا بەوی دیکەیان، هەمووشیان پێویستیان پێی بوو تا ئەوەی گەڕایەوە بۆ ماڵی یەکەم.[2]

## (ئەوەی قەرز دەدات بە خوا)

ئەحمەدو بەغەوی و حاکم لە ئەنەسەوە هێناویانە کابرایەك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فلان کەس دارخورمایەکی هەیەو منیش دیوارەکەم لایەتی، دەی پێی بڵێ تا بەشم بدات، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(اعطه ایاها بنخلة في الجنة) واتە(بەرامبەر بە دارخورمایەکی بەهەشت بیدەرێ) بەڵام کەسەکە ئامادە نەبوو، ئەبودەحداح هات و وتی: ئەو دارخورمایەم پێ بفرۆشە بەرامبەر حەوشەکەم، ئەویش رازیبوو، ئینجا ئەبوودەحداح هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دارخورماکەم لێ کڕی، دەی بیدە پێی من داومە بەتۆ، فەرمووی(کم

[1]- لە الترغیب و الترهیب ج٤ ص١٤٧ دا واهاتووە، بوخاری و نەسائیش هێناویانە، لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا ناوی ئەو هاوەڵە هاتووە کە ئەبوتەلحەیە، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص٣٣٨ دا هاتووە، لە گێڕانەوەی تەبەرانیدا ناوی ئەو کابرا هاتووە بە ئەبوهورەیرە ناوی هاتووە، هەوەك ئیبن حەجەر لە فتح الباری ج٨ ص٤٤٦ دا واهێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج٣ص ١٧٦ دا واهاتووە.

من عذق راح لابي الدحداح في الجنة)( چەند دارخورمای پڕبەر لە بەهەشتدا بۆ ئەبوودەحداح دانراون)چەند جارێ فەرمووی، پاشان ئەبوودەحداح چوو بۆ لای ژنەکەی و وتی: ئەی ئوم دەحداح لەو حەوشە بڕۆ دەرێ فرۆشتوومە بە دارخورمایەکی بەهەشت، ئەویش وتی: فرۆشتنێکی بە قازانجە، یان شتێکی لەو جۆرەی وت[1].[2]

ئەبویەعلا لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: کە ئەم ئایەتە دابەزی(من الذي يقرض الله قرضا حسنا) ئەبودەحداح وتی: دەستت بێنە، دەستی هێنا، وتی: حەوشەکەم بە قەرز داوە بە پەروەردگارم، حەوشەکەی شەش سەد خورمای تێدابوو، هات و چوو تا هاتەناو حەوشەکە، ئوم دەحداح لەگەڵ منداڵەکانی لەوێ بوون، وتی: ئوم دەحداح وتی: بەڵێ، وتی: بێرە دەرەوە بە قەرز داومە بە پەروەردگارم[3].[4]

---

[1] –صحيح.

[2] – لە الإصابة ج٤ ص٥٩ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٩ ص٣٢٤ دەڵێت: ئەحمەدو تەبەرانی بە سەنەدی صەحیح هێناویانە، تەواو.

[3] – ضعيف.

[4] – هەیسەمی ج٩ ص٣٢٤ دەڵێت: ئەبویەعلاو تەبەرانی بە سەنەدی جێ متمانە هێناویانە کەسەکانی سەنەدەکەی ئەبویەعلا صەحیحن، تەواو مەسعودەوە بەو جۆرە بە سەنەدی لاواز هێناویەتی، لە المجمع ج٣ ص١١٣ دا هاتووە، ئیبن مندەش هێناویەتی، لە الاصابة ج٤ ص٥٩ هێناویەتی. ئیبن ئەبی حاتەم هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج١ ص٢٩٩ دا واهاتووە، تەبەرانی لە عومەری کوڕی خەتتابەوە بەو واتایە بە سەنەدی لاواز هێناویەتی، لە المجمع ج٣ ص١١٣ دا هاتووە، پێشتر قسەی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفمان هێنا کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چوار هەزارم هەیە، دوو هەزاری بە قەرز دەدەم بە پەروەردگارم.

# (بەخشین لەسەر ئیسلام)

ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئیسلام داوای هەرچی لێبکردایە دەیبەخشی، یەکێك هات بۆ لای و فەرمانی کرد مەڕێکی زۆری صەدەقەی نێوان دوو شاخی پێ بدرێت، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: ئەگەر کەسێك دەهات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) دونیای بوێت شەوناکاتەوە تا ئایینەکەی لا خۆشەویستتر دەبێت لە دونیاو هەموو ئەوەی لە دونیادا هەیە،[1] تەبەرانیش لە زەیدی کوڕی سابتەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکێك لە عەرەبەکان هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای خاکێکی نێوان دوو شاخی کرد، ئەویش بۆی نووسی و ئەویش موسڵمان بوو و هاتە لای هۆزەکەی و پێی وتن: موسڵمان بن چونکە لەلای کەسێکەوە هاتوم کە بەبێ ترس دەبەخشێت[2].[3] لە چیرۆکی موسڵمانبوونی صەفوانی کوڕی ئومەییەدا هێنامان(پێغەمبەر(ﷺ)) بەناو دەستکەوتەکاندا دەگەڕاو صەفوانی کوڕی ئومەییەی لەگەڵدا بوو، صەفوانی کوڕی ئومەییە سەیری دۆڵێکی پڕ حوشترو مەڕی دەکردو زۆر سەیری کرد، پێغەمبەر(ﷺ) چاوی لێی بوو، فەرمووی(ابا وهب يعجبك هذا الشعب؟) واتە(ئەبووەهب ئەو دۆڵە سەرسامی کردویت؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(هو لك وما فيه) واتە(چی تێدایە بۆ تۆ) صەفوان یەکسەر وتی: ئەم دەروونە تەنها لە دەروونی پێغەمبەر دەچێت، شایەتی دەدەم هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لە خواو موحەممەدیش بەندەو نێردراوی خوایە، یەکسەر موسڵمان بوو[4].[1]

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٦ ص٤٢ دا هاتووە، موسلیمیش بەو جۆرە لە ئەنەسەوە هێناویەتی.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص١٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدولڕەحمانی کوڕی یەحیای عزری هەیە، لە بارەیەوە هاتووە، مەجهول(نادیارە) کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن، تەواو.

[4] – ضعيف.

# (بەخشین لە جیهادی ڕێی خوادا)

## (بەخشینی ئەبوبەکر(رضي الله عنه))

ئیبن ئیحساق لە ئەسماوە هێناویەتی دەڵێت: کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەبوبەکر دەرچوو، ئەبوبەکر هەموو ماڵەکەی خۆی هێنا کە پێنج هەزار درهەم یان شەش هەزار درهەم بوو، ئەسما دەڵێت: باپیرم ئەبوقوحافە هات بۆ لامان و چاوی لە دەست دابوو، وتی: بەخوا واسەیردەکەم ئەبوبەکر هەموو پارەکەی لەگەڵ خۆی بردووەو ئێوەی بێبەش کردووە، دەڵێت وتم: نا بابەگیان، ئەو پشکێکی زۆری بۆ هێشتووینەتەوە، ئەسما دەڵێت: چەند بەردێکم خستە گۆزەیەکی ناو ماڵەوە کە باوکم لەوێ پارەی دادەنا. کراسێکم دابەسەریداو دەستیم گرت و خستمە سەری و وتم: بابەگیان دەستت بخەرە سەر پارەکە، ئەویش دەستی خستەسەرو وتی: ئەگەر ئەوەی بۆ بەجێ هێشتبن باشی کردووە، ئەمە باشە بۆتان. ئەسما وتی دەی سوێند بەخوا هیچی بۆ بەجێ نەهێشتووین، بەڵام ویستم باپیرم هێور بکەمەوە[2][3]. پێشتر وتمان لە غەزای تەبووک سامانەکەی خۆی بە بڕی چوار هەزار درهەم بەخشی.

[1]– واقیدی و ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە هێناویانە، لە کنز العمال ج٥ ص٢٩٤ دا هاتووە.

[2]– صحیح.

[3]– لە البدایة والنهایة ج٣ ص١٧٩ دا هاتووە، ئەحمەدو تەبەریش بە هەمان شێوە هێناویانە، هەیسەمی ج٦ ص٥٩ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد صەحیحن جگە لە ئیبن ئیسحاق،

# بەخشینی عوسمانی کوڕی عەففان(ﷺ))

ئەحمەد لە عەبدولڕەحمانی کوڕی حەبابی سلمیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری خوێندەوەو هانی سوپای ڕۆژی سەختیدا، عوسمانی کوڕی عەففان وتی: سەد وشتری بە چەك و شمەکەکانیەوە لەسەر منە، پاشان لە مینبەر دابەزی و دووبارە هانیدان، عوسمان وتی: سەدی تر بە چەك و شمەکەکانیانەوە لەسەر من، دەڵێت: بینیم پێغەمبەر(ﷺ) بەم جۆرە دەستی دەجوڵاند – عەبدو صەمەد وەك سەرسوڕمان دەستی دەهێنا – فەرمووی(ما على عثمان ما عمل بعد هذا)(عوسمان لەمەودوا لەسەری نیە هەرچی بکات) بەیەهقی هێناویەتی و سێ جار دەیلێت و باس دەکات کە سێ سەد وشتری بە چەك و شمەکەوە ئامادەکردووە، عەبدولڕەحمان دەڵێت: من بینیم پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەر بوو دەیفەرموو(ما ضر عثمان بعدها – او قال بعد اليوم)(دوای ئەمە – یان فەرمووی دوای ئەمڕۆ – هیچ زیان بە عوسمان ناگەیەنێت)[1][2].

حاکم ج٣ ص١٠٢ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سەمرەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففان هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەزار دیناری هێنا کاتێك سوپای ڕۆژی سەختی ئامادەکرد، عوسمان لە ژوورەکەی پێغەمبەر(ﷺ) داینا، پێغەمبەر(ﷺ) وەریگرت و فەرمووی(ما ضر عثمان ما عمل بعد هذا اليوم) چەند جارێك وتیەوە.[3] لە فەرموودەکەی ئیبن عومەردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اللهم لاتنس لعثمان، ما على عثمان ما عمل بعد هذا) واتە(خوایە عوسمان لە بیر مەکە، عوسمان لە دوای ئەمە چی بکات زیانی پێ ناگەیەنێت).

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە البدايە والنهايە ج٥ ص٤ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٥٩ دا بەو جۆرە هێناویەتی.

[3] –حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت صەحیحە ئەبونەعیم لە الحليە ج١ ص٥٩ بەو جۆرە لە عەبدولڕەحمانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی.

ئیبن عەدی و دارقوتنی و ئەبونەعیم و ئیبن عەساکیر لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان و داوای کرد لە ئامادەسازی سوپای ڕۆژی سەختیدا تارمەتی بنوێنێت. عوسمانیش دە هەزار دیناری نارد و خرایە بەردەست، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قبووڵی کرد و سەرو خواری پێ دەکرد و نزای بۆ (عوسمان)دەکرد و فەرمووی(فغر الله لك يا عثمان ما اسررت و ما اعلنت و ما اخفيت و ما هو كائن الى ان تقوم الساعة، ما يبالي عثمان ما عمل بعد هذا) واتە(ئەی عوسمان خوای گەورە لە نهێنی و ئاشکراو دیارو نادیارت خۆش بێت تا ڕۆژی دوایی، عوسمان لە دوای ئەمە چی بکات گرفتی نیە)[1][2].

ئەبویەعلاو تەبەرانی لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویانە ئەوەی بینی کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان پارەی نارد بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تا سوپای سەختی ئامادە بکات و حەوت سەد ئوقیەی زێڕی هێنا.[3]

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٥٩ لە قەتادەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمان هەزار دانەی گرتەخۆ، تیایدا لە غەزای تەبووك پەنجا سوار(ئەسپ) بوون، ئیبن عەساکیر لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمان(رضي الله عنه) نۆ سەدو پەنجا وشترو پەنجا ئەسپی ئامادەکرد یان وتی: نۆ سەدو حەفتا وشترو سی ئەسپ واتە لە غەزای تەبووکدا، لە المنتخب كنز العمال(ج٥ ص١٣) دا واهاتووە، پێشتر باسمانکرد عوسمان لە غەزای تەبووکدا خەرجی سێ یەکی سوپای ئامادەکرد تا ئەوەی دەوترا هەرچیەکیان پێویست بوایە بۆی دابین دەکردن.

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە المنتخب كنز العمال ج٥ ص١٢ دا واهاتووە.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص٨٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبراهیمی کوڕی ئیبان هەیە کە لاوازە. تەواو

## (بەخشینی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه))

ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: عائیشە(رضي الله عنها) لە ماڵەوە بوو کە دەنگێکی لە مەدینە بیست، وتی: ئەوە چیە؟ وتیان: کاروانەکەی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفە لە شامەوە هاتووەو هەموو شتێکی پێیە، حەوت سەد وستر بوون، دەڵێت: مەدینە یەکپارچە دەنگ و شلۆقی دایگرت، عائیشە(رضي الله عنها) وتی: گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو(قد رایت عبدالرحمن بن عوف یدخل الجنة حبوا)(عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفم بینی بە گاگۆڵکێ دەچوویە ناو بەهەشت) عەبدولڕەحمان ئەمەی بیستەوە، وتی: ئەگەر بتوانم بە لەسەرپێ دەچمە ناوی، چی بارو کۆڵی هێنابوو هەمووی لە ڕێی خوادا بەخشی[1,2].

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٩٩ لە زوهریەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بەشێکی سامانی چوار هەزاری بەخشی، دواتر چل هەزار دیناری بەخشی، پاشان پێنج سەد ئەسپی لە ڕێی خوادا بەخشی، دواتر لە ڕێی خوادا هەزارو پێنج سەد وڵاخی گرتە ئەستۆ بۆ بەخشین، هەموو سامانی لە بازرگانیدا بوو، لە البدایة والنهایة ج٧ ص١٦٣ لە موعەمەر لە زوهریەوە بەو جۆرە هێناویەتی دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بەشێکی سامانی بەخشی، دواتر چل هەزار دیناری بەخشی، دواتر پێنج سەد ئەسپی لە ڕێی خوادا ئامادەکرد لەگەڵ پێنج سەد وڵاخدا، زۆربەی سامانی لە بازرگانیدا بوو.[3]
پێشتریش هێنامان کە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه) لە غەزای تەبووکدا دوو سەد ئۆقیەی بەخشی.

---

[1] – ضعیف.

[2] – ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٩٨ لە ئەنەسەوە بەو جۆرە هێناویەتی. ئیبن سەعد ح٣ ص٩٣ لە حەبیبی کوڕی ئەبی مەرزوقەوە بەو واتایە هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٧ ص١٦٤ دا دەڵێت: لە سەنەدەکەی ئەحمەددا بە تەنها عەمارەی کوڕی زادانی سەیدەلانی هەیە کە لاوازە،

[3] – لە الاصابة ج٢ ص٤١٦ دا واهاتووە،

# (بەخشینی حەکیمی کوڕی حیزام(رضي الله عنه))

تەبەرانی لە ئەبوحازمەوە هێناویەتی دەڵێت: نەمانبیستبوو لە مەدینەدا کەس هەبێت لە ڕێی خوادا زیاتر لە حەکیمی کوڕی حیزام(رضي الله عنه) ببەخشێت، دەڵێت: دوو دەشتەکی هاتنە مەدینەو داوایان کرد کەسێك لە ڕێ خوادا ئامادەیان بکات(بۆ جیهاد)، حەکیمی کوڕی حیزامیان پێ نیشان درا، چوون بۆ لای لەناو کەسوکاریدا بوو، ئەویش پرسیاری لێکردن چییان دەوێت؟ ئەوانیش وتیان چییان دەوێت، حەکیم پێی وتن: پەلەمەکەن تا بێمە دەرەوە بۆ لاتان، حەکیم بەرگێکی دەکردەبەر کە لە میسرەوە بۆی هاتبوو لە پەنجەرە دەچوو و نرخەکەی چوار درهەم بوو، داردەستێکی بە دەستەوە بوو، دوو غوڵامیشی لەگەڵدا بوو، هەرکات بیدایە بە پاڵ شەخەڵدانێکدا یان سەتڵێکی شەخەڵدا ڕیزاڵێکی تێدابوایە بۆ وشتر بشیایە تا لە ڕێی خوادا بەکار بێت هەڵیدەگرت و بەلایەکی داردەستەکەی چاك و پاکی ڕادەگرت و دواتر بە دوو غوڵامەکەی دەوت: ئەمە لای خۆتان هەڵگرن، دوو دەشتەکیەکەش یەکێکیان خۆی ئەوەی دەکرد وتی: قوڕت بەسەر ڕزگارمان بکە، بەخوا ئەم کابرا هیچی لە دەست دەرنایەت، هاوەڵەکەی پێی وت: قوڕت بەسەر پەلە مەکە با سەیربکەین، هەردووکیانی برد بۆ بازاڕو سەیری کرد دوو وشتری چاك و قەڵەو و ڕێك و پێك هەن، هەردوو وشترەکەی بە پێویستیەکانیانەوە کڕی، دواتر بە دوو غوڵامەکەی وت: ڕزاڵە فڕێ دەن شیاوی ئەو وشترانە نیە، پاشان نان و پێویستی پێدان و پارەیەکیشی پێدان لەگەڵ دوو وشترەکەشدا، ئینجا یەکێکیان بەوی تری دەوت: سوێند بەخوا تا ئێستا نەمبیستبوو کەسی دەستگرەوە هێندە چاکەخواز بێت.[1]

تەبەرانی لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە هێناویەتی خانوویەکی لە موعاویە بە شەست هەزار کڕی، وتیان: بەخوا موعاویە هەڵیخەڵەتاندیت، وتی: لە سەردەمی

[1] – لە مجمع الزوائد ج٩ ص٣٨٤ دا واهاتووە.

نەفامیدا بە کوندەی مەی وەرمدەگرت، دەی ئێوە دەکەمە شایەت ئەمە لە ڕێی خوادا و بۆ هەژاران و ئازادکراوان دەبەخشم، ئێستا کێ هەڵخەڵەتاوە! لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا بە سەد هەزار.[1]

## (بەخشینی ئیبن عومەرو هاوەڵانی دیکەش (رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٩٦ لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر زەویەکی بە دوو سەد وشتر فرۆشت، سەد دانەیانی لە ڕێی خوادا بەخشی و مەرجی لەسەر خاوەنەکانیان دانا نەیانفرۆشێت تا(وادي القرى) ی پێ تێپەڕێنن. پێشتر لە باسی هاندانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ جیهادو بەخشینی ساماندا باسمانکرد عومەری کوڕی خەتتاب لە غەزای تەبووکدا سەد ئۆقیەو عاصمی کوڕی عەدی نەوەد کۆڵ خورمای بەخشی و عەبباس و تەلحەو سەعدی کوڕی عوبادەو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش(رضي الله عنهم) سامانێکی زۆریان بەخشی، لە باسی جیهادیشدا وتمان کابرایەك وشترێکی لە ڕێی خوادا هێناو قەیسی کوڕی سلعی ئەنساریش(رضي الله عنه) لە جیهاددا لە ڕێی خوادا بەخشینی هەبوو.

## (بەخشینی زەینەبی کچی جەحش و ئافرەتێکی دیکەش)

بوخاری و موسلیم - بە دەقی موسلیم - لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اسرعكن احاقا بي اطولكن يدا) واتە(ئەوەتان خێراتر دەگاتەوە بە من کە دەست کراوەتر بێت(بەخشندەتر بێت)) دەڵێت: ئیتر ئەو ئافرەتانە بە تەواوەتی دەکەوتنە بەخشین، لە هەمووومان زیاتر زەینەب بوو، چونکە خۆی ئیشی دەکردو دەیبەخشی. لە ڕێگەیەکی دیکەوە هاتووە: عائیشە(رضي الله عنها) وتی: کاتێك لە دوای مەرگی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە

---

[1]- هەیسەمی ج٩ ص٣٨٤ دەڵێت: تەبەرانی بە دوو سەنەد هێناویەتی، یەکێکیان حەسەنە، تەواو.

ماڵ یەکێکمان کۆدەبووینەوەو دەستمان لەسەر دیوار دادەنا تا درێژی بکەینەوە، واماندەکرد تا ئەوەی زەینەبی کچی جەحش مرد کە ئافرەتێکی کورت بوو و لە ئێمە درێژتر بوو، ئەو کات زانیمان پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی بە درێژی دەست بەخشین بووە، زەینەب ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، خۆشەو سمینی دەکردو لە ڕێی خوادا دەیبەخشی.[1]

## (بەخشین بە هەژاران و نەداران و دەست کورتان)

ئەبوعوبەید لە الاموال لە عومەیری کوڕی سەلەمەی دوئلیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رض) لە نیوەی ڕۆژدا وتی لە ژێر سایەی درەختێکدا ئافرەتێکی دەشتەکی هەبوو، لە خەڵکی دوور بوو، کە خەڵك چوو ئەو ئافرەتە هات بۆ لای و وتی: من ئافرەتێکی هەژارم و منداڵم هەیە، ئەمیری باوەڕدارانیش عومەری کوڕی خەتتاب موحەممەدی کوڕی سەلەمەی نارد بۆ مەسەلەی کۆکردنەوەی پارە بەڵام هیچی پێ نەبەخشین، ڕەحمەتی خوات لێ بێت بەڵکو تۆ لەلای سکاڵامان بۆ بکەیت، ئەویش هاواری کرد یەرفەرء موحەممەدی کوڕی سەلەمەم بۆ بانگ بکە، وتی: من هێندە بارم نالەبارە دەبێت لەگەڵم هەستیت بێیت بۆ لای، وتی: پشت بە خوا ئەو دەیکات، وتی: ئادەی، ئەویش هات و وتی: سەلامت لێ بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئافرەتەکە شەرمی لێ کرد، عومەر وتی: چۆن کەم تا چاکترینتان

---

[1] - لە الاصابة ج٤ ص٢١٤ دا واهاتووە، تەبەرانی لە المعجم الاوسط لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی و لە فەرموودەکەیدا عائیشە دەڵێت: زەینەب پەتی دەچنی و دەیدا بە سریەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوانیش لە غەزاکانیاندا بەکاریاندەهێنا، هەیسەمی ج٨ ص٢٧٩ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی متمانەیان پێ دراوە، هەندێکیشیان لاوازییان تێدایە، پێشتر باسمانکرد ئافرەتان بۆ ئامادەسازی غەزای تەبووك یارمەتی موسڵمانیان دەداو میسك و یان دەنارد.

هەڵبژێرم چی دەڵێیت ئەگەر پەروەردگارت پرسیاری لێکردیت لەسەر ئەم ئافرەتە؟ چاوانی موحەممەدیش فرمێسکیان لێ دەهات، عومەر وتی: خوای گەورە پێغەمبەری خۆی نارد، ئێمەش بڕوامان پێی هێناو شوێنی کەوتین، ئەویش بەپێی فەرمانی پەروەردگار کاری کرد، کەوتە بەخشینی خێر بۆ هەژاران تا خوای گەورە لەسەر ئەو بارە بردیەوە، دواتر ئەبوبەکر لەسەر ئەو سوننەتە چوو تا خوا بردیەوە، ئەویش منی لە دوای خۆی دانا، منیش هەوڵدەدەم چاکترین هەڵبژێرم، تۆم ناردووە دەی سەدەقەی ئەمساڵو ساڵی پێشووی بدەرێ نازانم خۆزگە دەمناردیت، پاشان فەرمانی کرد ارێك شمەکی بۆ بێنن، گەنمو ڕۆنی(زەیتی) پێدا وتی: ئەمە ببە تا لە خەیبەر پێمان دەگەیت، ئێمە دەمانەوێت بچینە ئەوێ، لە خەیبەر ئافرەتەکە هاتەوە، لەوێ فەرمانی کرد دووباری دیکەی پێ بدەنو وتی: ئەمە ببەو زیاتریشی تێدایە تا موحەممەد دێت بۆ لاتان، وتوومە ماف ئەمساڵو ساڵی دواتریشت پێ بدات[1]، لە کنز العمال ج٣ ص٣١٩ دا واهاتووە،دووبارە ئەبوعوبەیدو بوخاریو بەیهەقیش لە ئەسلەمەوە هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) چووم بۆ بازاڕ، ئافرەتێکی گەنج گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتابو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مێردەکەم نەماوەو منداڵانێکی بچووکی بۆ بەجێ هێشتووم، سوێند بەخوا کەسیان گەورە نین – ناگەنە ئەژنۆ – هیچ کشتوکاڵو شیریان نیە، دەترسم گورگ(ساڵی وشکەساڵیو نەبوونیە) بیانخوات و منیش کچی خەفاف کوڕی ئیمای غیفاریم کە باوکم لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە حودەیبیەدا بەشداربووە، عومەر لەگەڵی وەستاو نەچوو، دواتر وتی: مەرحەبا لە وەچەی نزیك. پاشان چوو بۆ لای وشترێکی ڕێكو پێك کە لە ماڵدا بەسترابوویەوە، دووباری پڕی خواردنی لەگەڵ بڕێ پارەو جل لە نێوان دوو کۆڵەکەدا داناو ڕەشوەکەی دایە دەست ئافرەتەکەو دواتر وتی: بیبە تەواو نابێت تا خوای گەورە چاکترتان بۆ دەنێرێت،

[1] - ضعيف.

کابرایەك وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران زۆرت پێدا، عومەر وتی: دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، باوکی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە حودەیبییەدا بەشداربووە، سوێند بەخوا دەمبینی باوك و برای ئەم ئافرەتە کاتێك گەمارۆی قەڵایەکیان دابوو، فەتحمان کردو پشکی خۆمانمان تێدا داوا دەکرد.[1]

## (بەخشینی سەعیدی کوڕی عامری کوڕی جزیمی جومەحی)

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٤٤ لە حەسسانی کوڕی عەتیەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب موعاویەی لەسەر شام لابرد سەعیدی کوڕی عامری کوڕی جزیمی جومەحی نارد، دەڵێت: لەگەڵی کەنیزەکێکی قوڕەیش کە زۆر جوان بوو چوو، هێندەی نەبرد تا پێویستیەکی زۆری هەبوو، عومەر ئەوەی بیستەوەو هەزار دیناری بۆ نارد، دەڵێت: بردیە لای ژنەکەی و وتی: عومەر ئەمەی بۆ ناردین، ئەویش وتی: بۆچی ڕۆن و کەرەو خواردنمان بۆ ناکڕیت؟ وتی: لەوە چاکترت پێ نیشان بدەم؟ ئەم پارە دەدەینە دەست کەسێك تا بازرگانی پێ بکات بۆمان و ئێمەش لە قازانج و زامنەکەی دەخۆین، وتی: دەی باشە. ئەویش کەرەو خواردنی لەگەڵ دوو وشترو دوو غولامدا کڕی کە پێویستیەکانیان لەسەر جێبەجێ دەکردو بە سەر هەژاران و نەدارانداد دەیانبەخشی، هێندەی نەبرد تا ژنەکەی پێی وت: ئەوەندەو ئەوەندەی فەوتا بەڵکو بیگێڕیتەوە، ئەویش هێندەی لێ بێدەنگ بوو تا ئەوەی ئازاری دا، – ئەو تەنها شەوانە دەچوویە ژوورەوە – یەکێك لە کەسانی خزمانی کە چوویە ژوورەوە بۆ لای پێی وت: چی دەکەیت؟ تۆ ئازاری ئەو کوڕەت داو ئەویش بەو پارە خێری کردووە، ئەویش لەتاو خەفەتدا لەسەر ئەو سامانە گریا، پاشان ڕۆژێك پیاوەکە هاتە ژوورەوە بۆ لای و وتی: لەسەرخۆبە من چەند

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٧ دا واهاتووە.

هاوڕێیەکم هەبوون کەمێکە لێك جیابوونەتەوە حەزناکەم لێیان دووربم و دونیا و چی تێدایە بۆ من بێت، ئەگەر یەکێ لە حۆریەکان لە ئاسمانەوە دەربکەوتایە هەموو دونیای ڕۆشن دەکردەوەو ڕووناکی ڕووی ڕووناکی مانگ و خۆی دەبەزاندو تۆزی خێری دونیاو چی تێدایە دادەپۆشین تۆ لە من زیاتری لەوەی وازت لێ بهێنم بۆیان تا ئەوەی واز لەوان بهێنم بۆ تۆ، ژنەکەش هێوربوویەوەو ڕازی بوو.

هەروەها لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سابتی جومەحیەوە هێناویەتی و لە فەرموودەکەیدا هاتووە: کە دەچوو بۆ بەخشین خواردنی بۆ ماڵەوەیان دەکڕی و ئەوی دیکەشی دەبەخشی و ژنەکەشی پێی دەوت: زیادەی بەخششەکەت کوا؟ دەیوت: دام بە قەرز. هەندێ کەس هاتن و وتیان: ژن و منالت هەقیان هەیە لەسەرت و خزمانت مافیان لەسەرت(زاواو خزمانی هاوسەری) وتی: من بۆ لە دەستدانی حۆریەکان خزمان و ڕەزامەندی هیچ کەس پێش ناخەم، ئەگەر یەکێك لە ئافرەتانی بەهەشت دەرکەون دونیا ڕۆن دەکەنەوە وەك چۆن خۆر ڕۆشنی دەکاتەوە، من لە کاروانی یەکەم دواناکەوم و پاش ئەوەی بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویێت(يجمع الله عز وجل الناس للحساب فيجيئ فقراء المؤنين يزفون كما يزف الحمام، فيقال لهم: قفوا عند الحساب، فيقولون ما عندنا حساب و لا اتيتمونا شيئا، فيقول ربهم: صدق عبادي فيفتح لهم باب الجنة فيدخلونها قبل الناس سبعين عاما) واتە(خوای گەورە خەڵکی کۆدەکاتەوە بۆ لێپێچینەوە، هەژارانی باوەڕداران دەهێنرێن وەك کۆتر سەما دەکەن، پێیان دەوترێت: ڕاوەستن بۆ لێپێچینەوە، ئەوانیش دەڵێن: هیچ حسابێکمان نیەو ئێوە هیچتان پێ نەداین، پەروەردگاریان دەیوت: بەندەکانم ڕاستیان کرد، بەوە دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکرێتەوە و حەفتا ساڵ پێش خەڵکەکە دەچنە ناویەوە).

پێشتر چیرۆکێکی سەعیدمان هێنا کە پێی وت: دەڵێیت چی تا بیدەینە دەست کەسێك تا زیاتر لە توانای خۆمان بۆمان بهێنێتەوە؟ وتی: دەی باشە. ئەویش کەسێکی خزمی جێ متمانەی خۆی بانگکردو ڕایسپاردو وتی: ئەمە ببە بۆ لای

فلان بێوەژن و ئەوە بۆ فلان هەتیو و ئەوە بۆ فلان هەژارو ئەوە بۆ فلان نەخۆش، بڕێکی زێڕی مایەوە وتی: ئەوەش ببەخشە، پاشان گەڕایەوە سەر کارەکەی، ژنەکەی وتی: ئەرێ خزمەتگوزارێکمان بۆ ناکڕیت؟ ئەم پارە بۆ چی. وتی: لەوە باشترو جێ پێویستتر دەبینیت.[1]

## (بەخشینی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٩٧ لە نافعەوە هێناویەتی ئیبن عومەر سکاڵای کردو هێشوویەك ترێی بە درهەمێك بۆ کڕدرا، هەژارێك هات، وتی: بیدەن بەو هەژارە، کەسێك بە دوایدا هات و ئەویش بە درهەمێك پێی فرۆشت، دواتر هێنای بۆی، هەژارەکە هاتەوەو داوای لێکرد، ئەویش وتی: بیدەنێ، کەسێك چوو بە درهەمێك لێی کڕیەوەو هێنای بۆ ئیبن عومەر، هەژارەکە هاتەوەو داوای لێکرد، وتی: بیدەنێ، هەمدی کابرایەك چوو و لێی کڕیەوە بە درهەمێك هەژارەکە ویستی بگەڕێتەوە کابرا نەیهێشت، ئەگەر ئیبن عومەر بەوەی زانیبا نەیدەچەشت.

هەروەها لە ڕێگەیەکی دیکەوە لە نافعەوە هێناویەتی ئیبن عومەر کاتێك نەخۆش بوو حەزی بە ترێ بوو ، منیش هێشوویەك خورمام بە درهەمێك بۆ کڕی، خستمە دەستی، بە هەمان واتا هێناویەتی، لە کۆتاییەکەیدا دەڵێت بەردەوام کابرا دەهاتەوە داوای دەکردو ئەویش دەیوت: بیدەنێ، تا ئەوەی لە سێیەم یان چوارەم جاردا بە سواڵکەرەکەم وت: قوڕت بەسەر شەرم ناکەیت. بە درهەمێك بۆم کڕیو هێنام بۆی تا بیخوات.[2]

---

[1] – ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٤٥ دا هێناویەتی.

[2] – هەروەها ئیبن موبارەك بە شێوەی دەقی یەکەم بە کورتی هێناویەتی، لە الاصابة ج٢ ص٢٤٨ دا هاتووە، تەبەرانیش هێناویەتی، لە المجمع ج٩ ص٣٤٧ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٤ ص١١٧

## (بەخشینی عوسمانی کوڕی ئەبولعاص(رضي الله عنه))

تەبەرانی لە ئەبونەزرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە(ایام العشر) دا هاتم بۆ لای عوسمانی کوڕی ئەبولعاص، ماڵێکی هەبوو کە چۆڵی کردبوو بۆ قسە، بەرانێك درا بە پاڵیدا، بە خاوەنەکەی وت: بە چەندە؟ وتی: بە دوانزە درهەم، وتم: ئەگەر دوانزە درهەمم پێبوایە بەرانێکم پێ دەکڕی و دەمکرد قوربانی و بەشی ژن و منالم دەدا، کە چووم بە دوامدا کوپویەکی بۆ هێنام کە پەنجا درهەمی تێدابوو، هیچ کات درهەمم نەدیبوو هێندە بەرەکەتی تێدابێت کە پێی بەخشیم و ئەو چاوەڕوانی پاداشتی بوو لای خواو منیش پێویستیم پێی بوو، هەیسەمی ج٩ ص٣٧١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

## (بەخشینی عائیشە(رچی اللە عنها))

مالیك لە الموطا ج٣٩٠دا هێناویەتی پێی گەیشتووە لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە(رضي الله عنها) هەژارێك داوای لێکردو ئەویش بە ڕۆژوو بوو و لە ماڵیدا تەنها کولێرە هەبوو، بە مەولاکەی وت: پێی بدە. وتی: هیچت نیە تا ڕۆژووی پێ بشکێنیت، وتی: پێی بدە. ئەویش وایکرد، کە ئێوارە هات ماڵێك یان کەسێك گۆشتی ئامادەی مەڕی بۆ هێناین، عائیشە بانگی کردم و وتی: لەمە بخۆ، ئەمە لە نانەکەت باشترە. مالیك دەڵێت: پێم گەیشت هەژارێك داوای خواردنی کرد لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش ترێی لە دەستتدا بوو، بە کەسێکی وت: بیبە بیدەرێ. ئەویش سەیری دەکردو سەری سوڕدەما، عائیشە وتی: سەرت سوڕدەمێنێت؟ دەزانیت ئەم دەنکە چەند مسقاڵ هەیە؟

---

هێناویەتی، هەیسەمی دەڵێت: کەسەکانی تەبەرانی کەسانی صەحیحن جگە لە نەعیمی کوڕی حەماد.

# (دانەدەست هەژار)

تەبەرانیو حەسەنی کوڕی سوفیان لە موحەممەدی کوڕی عوسمان لە باوکیەوە هێناویانە دەڵێت: حارسەی کوڕی نوعمان – لە گێڕانەوەیەکی تردا لە حارسەی کوڕی نوعمانەوە – چاوی لە دەست دا بوو، بۆیە پەتێکی لە شوێنی نوێژەکەیەوە بۆ بەردەرگای ژوورەکەی دانابوو، ئەگەر هەژارێك بهاتایە بۆ لای دەچوو لە زەمبیلەکەی شتێکی دەهێناو پەتەکەی دەگرت تا دەهاتەوەو دەیدایە دەستی، ژنو منالی دەیانوت: ئێمە لە بری تۆ دەیدەینێ، وتی: من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە دەیفەرموو(مناولة المسكين تقي مصارع السوء)[1,2].

ئیبن عەساکیر لە عەمری لەیسیەوە هێناویەتی دەڵێت: لای واسلەی کوڕی ئوسقع بووین، یەکێك هات داوای لێکرد، ئەویش پارچەیەکی هەڵگرتو فلسێکی لەسەردانا و هەستاو خستیە دەستی، وتم: ئەبولئوسقع کەس نیە لە کەسو ماڵت لە جیاتی خۆت بیدەنە دەست؟ وتی: با، بەڵام هەرکەس خۆی شتێك بداتە دەست هەژارێك بەهەر هەنگاوێکی تاوانێکی دەسڕێتەوە، کە خستیە دەستیەوە بە هەر هەنگاوێکی دە تاوانی دەسڕێتەوە.[3]

ئیبن سەعد لە نافعەوە هێناویەتی ئیبن عومەر شەوانە کەسوکاری خۆی لە دەوری کۆدەکردەوە، دەڵێت: کە دەنگی هەژارێکی دەبیست هەڵدەستا پشکی گۆشتو نانی خۆی بۆ دەبردو دەگەڕایەوە سەیری دەکردن ئەوان لێ بوونەتەوە، ئەگەر تۆ شتێکت لێ پێی گەیشت ئەویش پێ دەگەیشتو دواتر بەیانی ڕۆژووی دەگرت(تۆ چەندەت دەخوارد ئەویش ئەوەندەی لێ دەخوارد).

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە الاصابة ج١ ص٢٩٩ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٣٥٦ و ئیبن سەعد ج٣ ص٥٢ لە موحەممەدی کوڕی عوسمان لە باوکیەوە بەوجۆرە هێناویەتی.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص٣١٥ دا واهاتووە.

# (بەخشین بە داواکاران)

ئیبن جەریر لە ئەنەسەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ مزگەوت و عەبایەکی نەجرانی چاك و توندوتۆڵ چنراوی لەبەردا بوو لە دوایەوە دەشتەکیەك هات، سوچی عەباکەی گرت تا لاملی پێغەمبەر(ﷺ) ماندوو کرد، وتی: ئەی موحەممەد لەو ماڵەی خوا کە لەلاتە بەشمان بدە. پێغەمبەر(ﷺ) لای کردەوە و زەردەخەنەی کرد و فەرمووی(مووا لە) واتە(بڕۆن پێی بدەن).[1]

هەروەها لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژانە(بەیانیان) لە مزگەوت دادەنیشتین، کە هەڵدەسا بچێتەوە بۆ ماڵەوە بە پێوە بووین تا دەچوویە ماڵەوە، ڕۆژێك هەستا، کە گەیشتە نیوەی کۆڕەکە دەشتەکیەك خۆی گەیاندە لای و وتی: ئەی موحەممەد دوو وشترم بدەرێ چونکە لە سامانی خۆت و باوکت نایدەتێ، کە پێی گەیشت عەباکەی ڕاکێشا و لاملی سوورکردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لا واستغفر الله، لا احملك حتی تقیدني) سێ جار ئەمەی فەرموو، پاشان کەسێکی بانگکرد و پێی فەرموو دوو وشتری بدەرێ، بارێکی گەنم و بارێکی خورما.[2]

ئەحمەد و تەبەرانی لە نوعمانی کوڕی موقرینەوە هێناویانە دەڵێت: بە چوار سەد کەسی موزینەوە هاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمانی خۆی پێکردین، هەندێ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خواردنمان پێ نیە. پێغەمبەر(ﷺ) بە عومەری فەرموو(زودهم) واتە(بیاندەرێ و بۆیان بپێچەرەوە) وتی: تەنها بڕێ خورمام هەیە کە بڕواناکەم بەشیان بکات، فەرمووی(انطلق فزودهم) واتە(بڕۆ

---

[1]- لە کنز العمال ج٤ ص٤٣ دا واهاتووە، مالکیش لەگەڵ بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە(ﷺ) هێناویانە، هەروەك لە البدایة والنهایة(ج٦ ص٣٨) دا هاتووە.

[2]- لە کنز العمال ج٤ ص٤٧ دا واهاتووە، ئەحمەد و چوار زانای فەرموودەش جگە لە ترمزی لە ئەبوهورەیرەوە بەو جۆرە هێناویانە، لە البدایة والنهایة ج٦ ص٣٨ یشدا وا هاتووە.

بیانـدەرێ) ئـەویش بـردینی بـۆ ئـەوێو تیایـدا خورمـا هـەبوو وەك خورمـای تـازەی نیوەگـەییو وابـوو، وتـی: هـەڵگرن. ئـەوانیش پێویستی خۆیـان هـەڵگرت، وتـی: مـن کۆتا کەسیان بووم، سەیرم کردەوەو شوێنی خورمایەکم لێ ون نەبوو لە کاتێکدا چوار سەد کەس لێیان بردبوو[1][2].

ئەحمەد و تەبەرانی لە دکینی کوڕی سەعیدی خەسعەمیەوە هێناویانە دەڵێت: ئێمەو چوار سەدو چل کەس هاتین بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تەنها خورمای چوار مانگـەو نەگەیـشتووم لایـە، فـەرمووی(هەسـتە بیانـدەرێ) عومـەر وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بیـستمو بـە گوێـت دەکـەم، هەسـتامو ئێمـەش لەگـەڵی چووینە سـەرەوە بۆ ناو ژوورێکی، کلیلی لـە ژوورەکەیدا هێنا و دەرگاکەی کردەوە، دکین دەڵێت: لە ژوورەکە خورما هەبوو وەك تازە پێکەییوو وابوو، هەڵگرن، هەرکەسەو بەشی پێویستی خۆی هەڵگرت، من کۆتا کەسیان بووم لامکردەوە وەك ئەوە وابوو یەك خورمامان لێ نەبردبێت[3][4].

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٦٥ لە دکینەوە هێناویەتی بە چوار سەد سوارەوە هاتین بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بەو جۆرە فەرموودەکە دێنێت، تیایدا عومەر وتی: تـەنها خورمـای سـەرەتاو کـە مـن بـۆ خـۆمو ژنو منـاڵم، ئەبوبـەکر وتـی: گـوێگرو گوێڕایـەڵ بـە، عومـەر وتـی: بـەڵێ. ئەبونـەعیم وتـی: ئـەم فـەرموودە صـەحیحەو بەڵگەیـەکی پێغەمبەرایەتیـە. ئەبونـەعیم لـە الحلیـة ج١ ص٣٠٠ لـە ئەفلەحـەوە هێناویەتی: ئیبن عومەر بەرپەرچی هیچ داواکارێکی نەدایەتەوە تەنانەت کەسی گول هەبوو پەنجەکانی خوێنیان لێ دەچۆڕا لە قاپەکەیدا لەگەڵی نانی دەخوارد.

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٣٠٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد صەحیحن.

[3] – صحیح.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص٣٠٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی هەردووکیان صەحیحن، ئەبوداودیش بەشێکی هێناوە، تەواو.

# (خێرو سەدەقەکان)

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٢ لە حەسەنی بەسریەوە هێناویەتی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) سەدەقەی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و شاردیەوە(بە شاراوەیی هێنای) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم سەدەقەم بۆ خوایەو خوا چاوەڕێمە، عومەر(رضي الله عنه) بە ئاشکرا سەدەقەکەی هێنا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە سەدەقەکەمەو دەگەڕێمەوە لای خوا(لای ئەو وادەم هەیە) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(یا عمر! وترت قوسك بغیر وتر، مابین صدقتکما کما بین کلمتیکما) واتە(ئەی عومەر بەبێ پەت کەوانەکەت چەمانەوە، نێوانی سەدەقەی هەردووکتان وەك نێوانی قسەی هەردووکتان وایە).[1]

ئیبن عەددی و ئیبن عەساکیر لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من یشتري لنا بئر رومة فیجعلها صدقة للمسلمین سقاه الله یوم القیامة من العطش) واتە(کێ بیری ڕەومەمان بۆ دەکڕێت و دەیکات بە سەدەقە بۆ موسڵمانان تا خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا تینوێتی نەهێڵێ) عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه) کڕیی و کردی بە سەدەقە بۆ موسڵمانان.

تەبەرانی و ئیبن عەساکیر لە بەشیرەوە هێناویانە دەڵێت: کە کۆچەران هاتنە مەدینە ئاویان بۆ نەبوو کابرایەکی بەنی غیفار کانیەکی هەبوو پێی دەوترا ڕەومە، بە مشت و ڕێژە ئاوی لێ دەفرۆشت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(بعنیها بعین في الجنة) واتە(پێم بفرۆشە بەرامبەر کانیەکی ناو بەهەشت) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خۆم و ماڵ و منداڵم بەس ئەمەمان هەیە و ناتوانم، عوسمان ئەمەی بیست و کڕی بە سی و پێنج هەزار درهەم، پاشان هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری

[1] – ئیبن کەسیر دەڵێت سەنەدەکەی جەیدە، بە یەکێك لە مورسەلەکان دادەنرێت. لە النتخب ج٤ ص٣٤٨ دا واهاتووە.

خوا ئەگەر من بیکڕم‌و هەمان ماف ئەو کابرام دەدەیتیّ؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: دەی وا کڕیم‌و دەیبەخشم بە موسڵمانان.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٨٨ لە سەعدی ژنی تەلحەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك تەلحە سەد هەزار درهەمی بەخشی، دوایی ڕێی چوونە مزگەوتی لێ گرت بەوەی هەردوو چمکی جلەکەیم بۆ کۆکردەوە پێشتر وتمان عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لە سەردەمی پێغەمبەردا(عليه السلام) بە چوار هەزار بەشێکی سامانی بەخشی، دواتر چل هەزار دیناری بەخشی.

حاکم ج٣ ص٦٢٢ لە سائیبی کوڕی ئەبی لوبەوە هێناویەتی دەڵێت: کە خوای گەورە لە ئەبولوبابە خۆش بوو ئەبولوبابە وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(عليه السلام)و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەو شوێنەی خۆم بەجێ دێڵم کە تیایدا تاوانم کردووەو هەموو سامانی خۆم دەکەمە سەدەقە لە ڕێی خواو پێغەمبەرەکەیدا، پێغەمبەر(عليه السلام) فەرمووی(یا ابا لبابة یجزيء عنك الثلث) واتە(ئەی ئەبولوبابە پاداشتی سێیەکت دەدرێتەوە). دەڵێت: منیش سێ یەکیم بەخشی.

ئیبن سەعد ج٤ ص٦٤ لە نوعمانی کوڕی حەمیدەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ خاڵۆم چووم بۆ لای سەلمان لە مەدائین کە لەوێ کاری گەڵا خورمای دەکرد، گوێم لێبوو دەیوت: گەڵا خورما بە درهەمێك دەکڕم‌و بە کاری دێنم‌و دەیفرۆشم بەسێ درهەم، درهەمێکی وەردەگرمەوەو درهەمێکی بۆ ژن‌و منداڵم خەرج دەکەم‌و درهەمێکیشی دەبەخشم، ئەگەر عومەری کوڕی خەتتابیش ڕێگریم لێ بکات وازنایەنم.

---

[1] – لە المنتخب ج٥ ص١١ دا واهاتووە.

# (خەڵات و دیاریەکان)

تەبەرانی لە ئەبی مەسعودەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە غەزایەکدا بووین کە خەڵکی تووشی سەختی بوون تا ئەوەی بێهیواییم لە موسڵمانان و خۆشحاڵیم لە ڕووخساری دووڕووواندا بەدیکرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بینی فەرمووی(و الله لاتغيب الشمس حتى ياتيكم الله برزق) واتە(سوێند بەخوا شەو ئاوانابێت تا ئەوەی خوا ڕۆزیتان بۆ دەنێرێت) عوسمان(رضي الله عنه) زانی فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستە، بۆیە چواردە ولاخی بە باری خواردنەوە کڕی و نۆ دانەیانی نارد بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بینی فەرمووی(ئەمە چیە؟) وتی: عوسمان بە دیاری بۆی ناردوویەت، خۆشی لە ڕووخساری پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بینراو ناخۆشی و بێهیوایی ڕووخساری دووڕووانی گرتەوە، بینیم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستەکانی بەرزکردەوە تا سپیایی بنباڵی دەرکەوت و نزای بۆ عوسمان دەکرد بە جۆرێك پێشتر و دواتریش نەمبیستبوو نزای وا بۆ کەس بکات(اللهم اعط عثمان، اللهم افعل بعثمان)[1].[2](خوایە ببەخشە بە عوسمان، خوایە بکە بۆ عوسمان).

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٣٢٨ لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر مانگێك یان هەفتەیەك یان ئەوەندەی خوا بیەوێت ئەرکی خەرجی ماڵێکی موسڵمانان بگرمە ئەستۆ لام خۆشەویستترە لە حەج و لە دوای حەج، ئەگەرتەبەقێ شت هێندەی نرخی شەش یەکی درهەمێ(دانق)پێشکەشی برایەکی باوەڕدارم بکەم لام خۆشەویستترە لە دینارێك کە لە ڕێی خوادا بیبەخشم.

---

[1] - ضعيف.

[2] - هەیسەمی ج٩ ص٨٥ دەڵێت: تەبەرانی گێراویەتیەوە و لە سەنەدەکەیدا سەعیدی کوڕی موحەممەدی وارق هەیە کە لاوازە، ئیبن عەساکیر لە ئەبی مەسعودەوە بەو جۆرە هێناویەتی. لە المنتخب ج٥ ص١٢ دا واهاتووە.

# (نان پێدان)

بوخاری لە الادب و ئیبن زەنجەویە لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر هەندێ لە هاوەڵانم لەسەر مشتێ خواردن کۆبکەمەوە لام خۆشەویستترە لەوەی بچم بۆ بازاڕو پێنج کۆیلە بکڕمو ئازادیان بکەم.[1]

بەیهەقی لە عەبدولواحیدی کوڕی ئەیمەنەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: جابر(رضي الله عنه) میوانێکی هاتو ئەویش نانو سرکەی بۆ هێناین، وتی: بخۆن من بیستوومە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو(سرکەیەکە خواردنی چەند باشە) قوڕ بەسەری بۆ کەسانێك گاڵتە بکەن بەوەی بۆیان دادەنرێت، قوڕ بەسەری بۆ ئەوەی ئەو شتەی لەماڵەکەیدایە بە کەمی دەزانێت دایبنێت بۆ هاوڕێکانی[2]، [3] ئەبویەعلاش هێناویەتی بەڵام ئەو دەیڵێت: هێندە بەسە بۆ خراپەی کەسێك تا ئەوەی دەخرێتە بەردەمی گاڵتەی پێ بکات، لە سەنەدەکەی ئەبویەعلادا ئەبوتالیبی قاصی هەیە کە نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکەی ئەبویەعلا جێ متمانەن، لە صەحیحیشدا بە کورتی هاتووە، تەواو.

تەبەرانی لە المعجم الاوسط بە سەنەدی جەیید لە حەمیدی تەویلەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هەندێ هاتن بۆ لای و لە کاتی نەخۆشیەکیدا سەردانیان کرد، ئەویش وتی: ئەی کەنیزەك ئادەی شتێك بێنە بۆ هاوەڵەکانمان با پارچەیەکیش بێت چەنکە من بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(مکارم الاخلاق من اعمال الجنة) واتە(ئاکارە بەرزەکان لە کارەکانی بەهەشتن)[4].[1]

---

[1] - لە کنز العمال ج٥ ص٦٥ دا واهاتووە.

[2] - ضعیف.

[3] لە کنز العمال ج٥ ص٦٦ دا واهاتووە، ئەحمەد و تەبەرانی لە المعجم الوسیط هێناویانە.

[4] -حسن.

تەبەرانی لە شەقیقی کوڕی سەلەمەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من و هاوڕێیەکم چووین بۆ لای سەلمانی فارسی(رضي الله عنه)، سەلمان وتی: ئەگەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕێگری نەکردایە لە زۆرکردن ئەوا زۆری دەکرد بۆ ئێوەو دواتر نان و شیری بۆ دەهێنان؟ هاوڕێکەم وتی: ئەی ئەگەر لە خوێکەماندا گیای بۆنخۆش هەبێ چەند باشە، ئەو کات سەلمان مەسینەکەی خۆی ناردو ئەویش بە ڕەهنی گرت و گیاکەی هێنا، کە خواردمان هاوڕێکەم وتی: سوپاس بۆ خوا کە بەوەی پێی بەخشیوین ڕازی کردووین، سەلمان وتی: ئەگەر ڕازی بوویتایە بەوەی خوا پێی داویت مەسینەکەم لە ڕەهندا نەدەبوو.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٥٣ لە حەمزەی کوڕی صوهەیبەوە هێناویەتی صەهەیب(رضي الله عنه) خواردنی زۆری دادەنا، عومەر پێی وت: ئەی صوهەیب تۆ خواردنی زۆر دەبەخشی ئەمە زیادەڕەویە لە ساماندا صوهەیب وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خیارکم من اطعم الطعام و رد السلام) واتە(چاکترینتان ئەوەیە نان بدات و وەڵامی سەلام بداتەوە) ئەمە وایکردووە وابکەم.[3]

---

[1]- لە الترغیب والترهیب ج٤ ص١٥٢ دا واهاتووەو هەیسەمی ج٨ ص١٧٧ پاش هێنانی لە تەبەرانیەوە دەڵێت: سەنەدەکەی جەییدە، ئیبن عەساکیریش ج١ ص٤٢٨ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2]- هەیسەمی ج٨ ص١٧٩ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە موحەممەدی کوڕی مەنسوری تووسی، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕێی لێگرتین بۆ میوان(زۆر کار بکەین)(خەرجی زۆر بکەین) لە کاتێکدا لامان نەبێت(لە توانامان‌دا نەبێت).

[3]- صحیح.

# (پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نان دەبەخشێت)

موسلیم ج٢ ص٨٢ لە جابرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لە ماڵێکدا دانیشتبووم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دای بەلامداو ئاماژەی بۆ کردم، چووم بۆ لای، دەستیگرتمو چووین تا گەیشتینە ماڵی یەکێك لە ژنەکانی، چوویە ژوورەوە و مۆڵەتی بۆ وەرگرتمو منیش چوومە ژوورەوە لە پشت پەردەوە، فەرمووی: ئەرێ نان هەیە؟ وتیان: بەڵێ، سێ کولێرە هێنراو خرانە سەر سفرەیەك، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یەکێکیانی هەڵگرتو خستیە بەردەم خۆیو یەکێکیشی لەبەردەمی مندا دانا، پاشان سێیەمی هەڵگرتو لەتی کردو نیوەی لای خۆی و نیوەی لەبەردەم مندا دانا، پاشان فەرمووی پێخۆر( چەوری) هەیە؟ وتیان: نا تەنها بڕێ سرکە نەبێت، فەرمووی(هاتوه فنعم الادم هو) واتە(بیهێنن دەی ئەوە پێخۆرێکی زۆر باشە).[1]

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عوسمانی دی کە وشترێکی پێبوو گەنمو غەزوبەزو هەنگوینی پێ بوو، فەرمووی(انخ) بیوەستێنە، ئەویش وەستاندی، داوای بەردێکی کردو لەسەری غەزوبەزو هەنگوینو گەنمی دانا، دواتر ئاگریان لە ژێریدا کردەوە تاپێ گەیشت، پاشان وتی: بخۆن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لێی خواردو پاشان فەرمووی(هذا شيء يدعوه اهل فارس الخبيص) واتە(ئەمە خواردنێکە خەڵکی فارسی تێکەڵ دەیخۆن)[2].[3]

ئەبوداود لە عەبدوڵڵای کوڕی بوسرەوە هێناویەتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تەشتێکی هەبوو چوار کەس هەڵیاندەگرت پێی دەوترا ( الغراء)، بۆ جێشتەنگا سوجدەی ئەو

---

[1] – فەرموودەناسانی سوننە هێناویانە لە جمع الفوائد ج١ ص٢٩٥ یشدا هاتووە.

[2] – حسن.

[3]– – لە جمع الفوائد ج٩ ص١٩٧ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٥ ص٢٨ دەڵێت: تەبەرانی لە هەرسێکیاندا(موعجەمەکانی) هێناویەتیو کەسەکانی سەنەدەکەی موعجەمی صەغیرو وەسیتی جێ متمانەن.

کاتیان برد، تەشتەکە(بەلەمەکە)هێنراو تریتی تێداکردو تاویان تێدا، کە زۆر بوون پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چەمایەوە، دەشتەکیەك وتی: ئەوە چیە؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ان الله جعلني عبدا كريما و لم يجعلني جبارا عنيدا) واتە(خوا منی کردووە بە بەندەیەکی بە سۆزو بەخشندەو بە کەسێکی خۆسەپێن و ملەجیڕی دانەناوم، پاشان فەرمووی(كلوا من جوانبها و دعوا ذروتها يبارك فيها) واتە(لە لاکانیەوە بخۆن و ناوەکەی وازلێ بهێنن تا بەرەکەتی تێ بکەوێت)[1][2].

## (ئەبوبەکر(رضي الله عنه) نان دەبەخشێت)

موسلیم ج٢ ص١٨٦ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: چەند میوانێکمان هاتن بۆ لامان. دەڵێت: باوکم قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەبوو لەو شەوەدا، چوو و وتی: ئەی عەبدولڕەحمان ئاگات لە میوانەکان بێت، کە ئێوارە هات هێنانمانە شوێنەکانیان، ئامادەنەبوون نان بخۆن و وتیان: با باوکت بێت و لەگەڵمان نان بخوات، منیش پێم وتن ئەو کەسێکی پۆڵایینە، دەترسم ئەگەر نان نەخۆن ئازارم بدات، هەر ئامادەنەبوون، کە هاتەوە هیچی نەکردو یەکسەر وتی: وریای میوانەکان بوون؟ وتیان: نەبەخوا، وتی: مەگەر بە عەبدولڕەحمانم نەوتبوو؟ وتی: منیش خۆم دوورگرتبوو لێی، وتی: عەبدولڕەحمان، منیش خۆم لێ شاردەوە، وتی: گەمژە سوێندت دەدەم ئەگەر دەنگم دەبیستیت وەرە. منیش چووم، وتم: بەخوا تاوانی منی تێدا نیە، ئەوە میوانەکانتە پرسیاریان لێ بکە، نانم بۆ هێنان بەڵام ئامادەنەبوون نان بخۆن تا تۆ نەیەیتەوە، وتی: بۆچی نانی ئێمەتان قبوڵ نەکردووە؟ ئەبوبەکر وتی: دەی بەخوا ئەمشەو لێی ناخۆم، وتیان: دەی بەخوا هەتا لێی نەخۆیت لێی ناخۆین، وتی: هەرگیز شەوی وا

---

[1] – حسن.

[2] – لە المشكاة ص٣٦١ دا واهاتووە.

شەڕ حاڵم نەدیبوو هاوار بۆتان بۆچی خواردنمان قبوڵ ناکەن؟ پاشان وتی: یەکەمیان لە شەیتانەوە بوو دەی نانەکەتان بخۆن، نان هێنرا، بە ناوی خواوە نانی خواردو ئەوانیش نانیان خوارد، بۆ بەیانی چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاکەیان نواندو منیش لاریم نواند، ئینجا بۆی گێڕایەوە چی بووە، ئەویش فەرمووی(بل انت ابرهم و اخيرهم) واتە(بەڵکو تۆ چاکەکارترو چاکترینیان بوویت) دەڵێت: باسی پشکی سڕینەوەی(كفارة) سوێندەکەم پێ نەگەیشت.

## (ناندانی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه))

مالیك لە ئەسلەمەوە هێناویەتی بە عومەری وت: وا لەولا وشترێکی کوێر هەیە، وتی: بیدە بە ماڵێك تا سوودی لێ وەربگرن، وتم: کوێرە، وتی: با بخرێتە ڕیزی وشترەکانەوە، وتم: چۆن بلەوەڕێت؟ وتی: ئایا ولاخی سەرانەیە یان ولاخی بەخشین؟ وتم: هی سەرانەیە، وتی: بەخوا دەتانەوێت بیخۆن، وتم: نیشانەی ولاخی سەرانەی لەسەرە، فەرمانی کردو سەربڕا، نۆ قاپی لابوو، هەرچی میوەو شمەکی خۆشی بوایە لەو قاپانەدا دایدەناو دەینارد بۆ ژنەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆتا جار دەینارد بۆ حەفصە(رضي الله عنها)، ئەگەر کەموکورتیەکی هەبوایە پشکی حەفسە دەبوو، لەو قاپانەدا گۆشتی ئەو سەربڕاوەی دادەناو دەینارد بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، فەرمانی کرد چی مایەوە لێ بنرێت، کۆچەران و پشتیوانانی بۆ بانگکرد[١][٢].

---

[١] – صحيح.

[٢] – لە جمع الفوائد ج١ ص٢٩٦ دا هاتووە.

## (ناندانی تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا(رضي الله عنه))

حەسەنی کوڕی سوفیان و ئەبونەعیم لە المعرفە لە سەلەمەی ئەکوەعەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بیرێکی خۆی لەلای شاخ فرۆشت و نانی دەرخواردی خەڵك دا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(انك یا طلحة الفیاض)( ئەی تەلحە تۆ زۆر سوود بەخشی )[1].

## (ناندانی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه))

ئیبن سەعد ج٤ ص٢٨ لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: چاکترین کەس بۆ هەژاران لە بەخشیندا جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب بوو، دەیبردینەوە و چی لەماڵیدا هەبوایە دەرخواردی دەداین تا ئەوەی هیزەی بۆ دەهێناین و هیچی تێدانەبوو، لەتی دەکرد و ئێمەش چی تێدابوایە دەمانلێسیەوە.

## (ناندانی صوهەیبی ڕۆمی(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٥٤ لە صوهەیبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: نانێکم چاك کرد بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بۆم برد و ئەویش لەگەڵ هەندێ کەسدا دانیشتبوو، چووم بۆ لای و ئاماژەم بۆ کرد و ئەویش ئاماژەی کرد و پێی نیشامدام کە ئەی ئەوانە، وتم: نا، ئەویش بێدەنگ بوو، منیش لە شوێنی خۆم هەستام، کە سەیری کردم ئامارژەم بۆ کرد، فەرمووی(ئەمانەش) وتم: نا، دووجار ئەوەی کرد یان سێ جار، وتم: بەڵێ، ئەوانیش، بەڵام شتێکی سادە و کەم بوو، خۆی و ئەوانیش هاتن و نانیان خوارد و لێیشی مایەوە.

---

[1] – لە امنتخب ج٥ ص٦٧ دا واهاتووە.

# (ناندانی عەبدوڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم ج١ ص٢٩٨ لە موحەممەدی کوڕی قەیسەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر تەنها لەگەڵ هەژاراندا نانی دەخوارد تا ئەوە زیانی بە لەشی دەگەیاند، ژنەکەی بڕێ خورمای بۆ ئامادەکرد، ئەگەر نانی بخواردایە دەرخواردی دەدا(ئاو)، لە ئەبی بەکری کوڕی حەفصەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر تا هەتیوێك لەسەر سفرەو خوانی نەبوایە نانی نەدەخوارد.

حەسەن هێناویەتی کە ئیبن عومەر ئەگەر نانی بەیانی یان ئێوارەی بخواردایە هەتیوانی دەوری بانگدەکرد، ڕۆژێك نانی بەیانی دەخوارد ناردی بە شوێن هەتیوێکداو نەیدۆزیەوە، ئەو خواردنەوەیەکی شیرینی هەبوو کە لە دوای نان دەیخواردەوە، هەتیوەکە هاتو لەنان ببویەوەو ئیبن عومەریش ئاردێکی شێلراوی بە دەستەوە بوو تا بیخواتەوە، ئەویش پێیداو وتی: بیگرە، وابزانم دەست بڕاو ماف خواراو بوویت.

هەروەها لە ج١ ص٢٩٨ لە مەیمونی کوڕی مهرانەوە هێناویەتی ژنەکەی ئیبن عومەر سەرکۆنەی دەکرد، پێیان وت: ئەرێ دڵت ناسوتێت بۆ ئەو پیرە؟ وتی: چی لێ بکەم هەرچی خواردنی بۆ دروست دەکەین کەسێك بانگ دەکات بێت بیخوات، ناردی بە شوێن هەندێك لە هەژاراندا کە لە سەرەڕێی دادەنیشتن کاتێك دەچوو بۆ مزگەوت، ژنەکەی ناردی بە شوێنیاندا و نانی پێدان و پێی وتن: ئیتر نەیەنە سەر ڕێی، پاشان ئیبن عومەر هاتەوە بۆ ماڵەوە، وتی: بنێرن بۆ لای فلان و فلان، ژنەکەی خواردنێکی بۆ ناردن و پێی وتبوون ئەگەر بانگی کردن مەیەن بۆ لای، ئیبن عومەر وتی: دەتانەوێت ئەمشەو نان نەخۆم، ئەویش نانی نەخوارد.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٠٢ لە ئەبوجەعفەری قاریئەوە هێناویەتی دەڵێت: مەولاکەم وتی: لەگەڵ ئیبن عومەر دەچووم بۆ خزمەتکردنی، دەچوویە لای

[1] – ئیبن سەعد ج٤ ص١٢٢ بەو شێوە هێناویەتی.

هەرکانیەك بانگی خەڵکەکەی دەکرد تا نانی لەگەڵ بخۆن، گەورە کوڕەکانی دەچوونە ژوورو نانیان دەخوارد، هەبوو دووپارو یان سێ پارووی دەخوارد، لە(الجحفة) دابەزیو ئەوانیش هاتن، کۆیلەیەکی ڕەشی بێ بەرگ هات، ئیبن عومەر بانگی کرد، کۆیلەکە وتی: شوێنم نیە وا جێیان گرتووە. بینیم ئیبن عومەر ڕێی بۆ کردووەو بۆی چەمیەوە تا سەری بردە لای سنگی.

ئیبن سەعد ج٤ ص١٠٩ لە ئەبوجەعفەری قارئیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئیبن عومەر لە مەککەوە چووم بۆ مەدینە. ئەو لەگانێکی گەورەی پێبوو کە تیایدا نان دەخووسێنرا، کوڕو هاوەڵانیو هەرکەس بهاتایە لەسەری کۆدەبوونەوە تا ئەوەی هەیانبوو بە پێوە نانی دەخوارد، وشترێکی پێبوو دوو کۆڵی زیادەی لەسەربوو، شەربەت و ئاویان تێدابوو و پڕبوون، هەرکامیان قاپێکی هەبوو لەو شەربەتەی دەخواردەوە(پڕی دەکرد) تا لێی تێر دەبوو.

ئیبن سەعد ج٤ ص١٠٩ لە میعەنەوە هێناویەتی: ئیبن عومەر کە خواردنێکی دروست دەکرد کەسێك بە شانو شکۆبوایە بیدایە بە پاڵیدا بانگی نەدەکردو کوڕو برازاکانی بانگیان دەکرد، بەڵام ئەگەر هەژارێك بیدایە بەلایدا بانگی دەکردو ئەوان بانگیان نەدەکرد، دەیوت: کەسێك حەزی پێ ناکات بانگی دەکەنو کەسێك کە حەزی پێ دەکات بانگی ناکەنو خۆیانی لێ بێ ئاگادەکەن.

# (ناندانی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٢٩١ لە سولەیمانی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی لە سەردەمی موعاویەدا لەگەڵ مونتەری کوڕی حارسی زەبی بە دەستەیەکی قورئان خوێنانی ئەهلی بەسرەوە چوو بۆ حەج، وتیان: بە خوا یەکێك لە هاوەڵانی جێ ڕەزامەنـــدنی موحەممـــەد(صلى الله عليه وسلم) نـــەبینین و فەرموودەیـــەکمان بـــۆ نەگێڕێتـــەوە ناگەڕێینەوە. بەردەوام پرسیارمان دەکرد تا ئەوەی بۆمان گێڕدرایەوە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لە خوارووی مەککەوە دابەزی، ئێمەش چووین بۆ لای، بینیمان بارێکی گەورەی سێ سەد سواری هەبوو، سەدیان سوارو دوو سەدیشیان پێچراوە بوون، وتمان ئەمە هی کێیە؟ وتیان: هی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە، وتمان: هەمووی هی ئەوە؟ ئێمە بیستوومانە لە هەموان خاکیترە. وتیان: ئەم سەدەیان بۆ براکانی هێناونی، دوو سەدەکەش بۆ خەڵکی ناوچەکان و میوانەکانی کە دێن بۆ لای ، ئێمەش زۆر سەرمان سوڕما لەوە. وتیان: سەرتان لەوە سوڕنەمێنێت، چونکە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر کەسێکی دەوڵەمەندەو بە ماف سەرشانی دەزانێت تا خەرجی زیاتری هەبێت بۆ ئەوانەی دێن بۆ لای، وتمان: بمانبەن بۆ لای. وتیان: لە مزگەوتە، چووین بە شوێنیدا تا لە پشت کەعبەوە بینیمان دانیشتبوو، کەسێکی بالا کورتی چاولێل بوو، پارچە قوماشی خەتخەت و مێزەربەسەر بوو، کراسی لەسەرشان نەبوو، پێڵاوەکانی لەلای چەپیەوە دانابوو.[1]

[1] – ئیبن سەعد ج٤ ص١٢ لە سولەیمانی کوڕی ڕەبیعەوە بەو واتایە بە زیادەوە هێناویەتی.

# (ناندانی سەعدی کوڕی عوبادە(رضي الله عنه))

ئیبن عەساکیر لە سەعدی کوڕی عوبادەوە هێناویەتی قاپێکی پڕ لە مۆخی هێنا بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی(ئەی سەعد ئەمە چیە !) وتی: سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە حەق ناردووە چل جەرگدارم سەربڕیوە حەزمکرد تێر مۆخت بکەم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خواردیو نزای خێری بۆ کرد.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە هێناویەتی سەعدی کوڕی عوبادە(رضي الله عنه) پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) دەعوەت کرد، بڕێ خورماو نانی بۆ هێناو ئەویش خواردی، پاشان قاپێك شیری بۆ هێناو ئەویش خواردیەوەو فەرمووی(اكل طعامكم الابرار و افطر عندكم الصائمون و صلت عليكم الملائكة، اللهم اجعل صلواتك على ال سعد بن عبادة).[2](چاکەکاران نانتان بخۆنو ڕۆژووەوانان لاتان ڕۆژوو بکەنەوەو فریشتەکان صەلەواتتان لەسەر بدەن، خوایە صەلەواتت ببارێنە بەسەر خێزانی سەعدی کوڕی عوبادەدا).

ئیبن سەعد ج٣ ص١٤٢ لە عروەوە هێناویەتی دەڵێت: گەیشتم بە سەعدی کوڕی عوبادە کە لەسەر بەرزاییەکەوە هاواری دەکرد: کێ حەزی لە چەوری یان گۆشتە با بێت بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادە، پاشان گەیشتمە لای کوڕەکەی هەمان هاواری دەکرد، لە ڕێگەی مەدینەدا دەچووم و گەنجێك بووم کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بەرەو زەوییەکی دەچوو دای بەلامدا، وتی: ئەی گەنج بزانە لەسەر بەرزاییەکەی سەعدی کوڕی عوبادە کەس دەبینیت بانگ بکات، سەیرم کرد وتم: نا، وتی: ڕاست دەکەیت.

---

[1] – لە كنز العمال ج٧ ص٤٠ دا واهاتووە.

[2] – لە كنز العمال ج٥ ص٦٦ دا واهاتووە. لە لایەکی دیکەشەوە لە ئەنەسەوە بەو واتایە بە دووررو درێژی هێناویەتی، تیایدا هاتووە: بڕێ لە سمسمو بڕێ لە خورمای بۆ هێنا، لە كنز العمال ج٥ ص٦٦ دا واهاتووە.

# (ناندانی ئەبوشوعەیبی ئەنساری(رضي الله عنه))

بوخـاری لـە ئەبومەسـعودی ئەنـسارییەوە هێناویـەتی دەڵێـت: یـەکێك لـە پـشتیوانان هـەبوو پێـی دەوتـرا ئەبوشـوعەیب، غـوڵامێکی قەڵـەوی هـەبوو، وتـی: خـواردنێکم بـۆ ئامادەبکـە تـا پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) و پێـنج کـەس بـانگ بکـەم، یـەکێك شوێنیان کەوت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(انك دعوتنا خامس خمسة و هذا رجل قد تبعنا فان شئت اذنت لە وان شئت ترکتە) واتە(تۆ ئێمە ئەم پێنجەت بانگکردو ئەمـەش کابرایەکـە شـوێنمان کـەوتووە، ئەگـەر دەتـەوێت مۆڵـەتی بـدە، ئەگـەریش دەتـەوێت وەری مـەگرە) وتـی: بـەڵکو مۆڵـەتم داوە، موسـلیم ج٢ ص١٧٧ لـە ئەبومەسـعودەوە بەو جـۆرە هێناویـەتی، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ی بـینی و برسـێتی لـە ڕوخسارِیدا بەدیکرد، بە غوڵامەکەی وت: قورِبەسەر خواردنێکمان بۆ ئامادەبکە بۆ پێنج کەس – بە هەمان شێوە هێناویەتی.

# (ناندانی بەرگدروویەك)

موسلیم ج٢ ص١٨٠ – دەقەکە هـی ئەوە – و بوخـاری لـە ئەنەسـەوە هێناویانە بەرگدروویەك میوانداری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی کرد بۆ خواردنێك کە دروستی کردبوو، ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: لەگەڵ پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) چووم بۆ ئەو خواردنە، نانێکی گـەنمی لەگـەڵ قـاپێکی پڕ گۆشتی خستە بەردەم پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ئەنـەس دەڵێت: دەمـدی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم)(دبا و) ی لـەلاکانی قاپـەکانی کۆکردەوە. لـەو ڕۆژەوە حـەزم لە(دبا و) بوو.

# (ناندانی جابری کوڕی عەبدوڵلا(رضي الله عنه))

بوخاری لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی خەندەق چاڵمان هەڵدەکەند شتێکی ڕەق هاتە بەردەممان، هاتن بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتیان: ئەم شتە ڕەقە لە چاڵەکەدا هاتووەتە ڕێمان، فەرمووی (انا نازل) واتە(من دادەبەزم بۆی) پاشان هەستاو سکی بە بەردێك بەستبوو، سێ ڕۆژ ماینەوەو هیچمان نەخوارد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پیکەکەی هەڵگرت و لێیداو بە توندی گەڕایەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە بۆ ماڵەوە، بە ژنەکەم وت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)م لە بارێکدا دی کە هی خۆگرتن نەبوو، هیچ خواردن هەیە؟ وتی: گەنمو بزنم هەیە، بزنەکەم سەربڕی و گەنمەکەم هاڕی و کردمە هەویر تا گۆشتەکەمان ئامادەکرد، دواتر هاتم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەویرەکە شکابوویەوە(ئامادەبوو) و گۆشتەکەش لەسەر دوو بەرد بوو، خەریکبوو پێدەگەیشت، وتم: سووکە نانێکم ئامادەکردووە ئەی پێغەمبەری خوا خۆت و کەسێك یان دوو کەس وەرن، فەرمووی(چەندێکە؟) وتم: ئەوەندەیە. فەرمووی(کثیر طیب، قل لها لاتنزع البرمة ولاالخبر من التنور حتی اتی) واتە(زۆرو پاکە، بە ژنەکەت بڵێ گلێنەکە و نانەوکە لە تەنوورەکە دەرنەکات تا دێم) فەرمووی هەستن. کۆچەران و پشتیوانان و هاودەمانیان هاتن، کاتێك چوو بۆ لای ژنەکەی وتی: قوربەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆچەران و پشتیوان و هاودەمانی هێناوە، وتی: مەگەر پێت وت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی(ادخلوا ولاتضاغطوا) واتە(بچنە ژوورەوەو قەرەباڵغی مەکەن) نانەکەی پارچە پارچە دەکردو گۆشتی لەسەر دادەناو گلێنەو تەنوورەکەی دەخستەکارو دەیدا بە هاوەڵانی و دواتر لایدەبرد، بەو جۆرە وایدەکرد تا هەموو تێربوون و هەمووی مایەوە، فەرمووی(کلي هذا و اهدي فان الناس اصابتهم مجاعة)(ئەمە بخۆو ببەخشە، چونکە خەڵکی تووشی برسێتی بوون) بوخاری هێناویەتی و بەیهەقی لە الدلائل لە جابرەوە بە زیاتر هێناویەتی، تیایدا دەڵێت: کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە بڕی خواردنەکەی زانی بە هەموو موسڵمانانی

وت(قوموا الى جابر) واته(هەستن بچن بۆ لای جابر) دەڵێت: تووشی شەرمێك بووم کە تەنها خوا دەیزانێت، وتم: لەسەر مشتێك برێ گەنم و شتمان بۆ هات، چووم بۆ لای ژنەکەم و وتم: حەیات چوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەموو خەڵکی خەندەقی هێناوە، وتی: پرسیاری لێ کردیت خواردنەکە چەندە؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، دەڵێت: بەوە ژنەکەم خەفەتێکی زۆری لەسەر لابردم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بضنة ذوورء قةرةبالَغى مةكةن)پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)سەرقاڵی چاککردنی گۆشتەکە بوو و دەیدا بە خەڵکەکە تا هەموو تێربوون و پرتر لە سەرەتا مابوویەوە، پاشان فەرمووی(کلي و اهدي)( بخۆو بە دیاریش بنێرە) ئەو ژنەش بەردەوام دەیخواردو ئەو ڕۆژەش دەیبەخشی، هەروەها ئیبن ئەبی شەیبە هێناویەتی، لە کۆتاییەکەیدا دەڵێت: پێی وتم ئەوان هەشت سەد کەس بوون، وتی: سێ سەد کەس بوون[1،2].

بوخاری لەلایەکی دیکەوە لە جابرەوە بەو جۆرە هێناویەتی و تیایدا هاتووە: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاواری کرد و فەرمووی(یا اهل خندق ان جابرا قد صنع سؤرا فحیهلا بکم) واته(ئەی خەڵکی خەندەق جابر خواردنێکی ئامادەکردووە، دەی بچن بۆی) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لاتنزلن برمتکم ولاتخبزن عجینکم حتی اجيء)( سەرەکەی دامەگرن و هەویرەکەتان مەکەن بە نان تا دێم) چووم و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات و خەڵکی هاتن، چووم بۆ لای ژنەکەم، وتی: ئابڕووت بردم، وتم: تۆ چیت وت وامکرد، ژنەکە برێ هەویری دەرهێنا و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تفی تێکرد و بەرەکەتی تێکەوت، دواتر چوو بۆ لای گلێنەکە و تفی تێکرد و بەرەکەتدار بوو، پاشان فەرمووی(ادعي خبازة فلتخبز معك وا ق حي من برمك ولاتنزلوها)(نانکەرێ بانگ بکە و با لەگەڵت نان بکات و سەرەکە بپارێزن دایمەگرن) کەسەکان هەزار کەس

---

[1] – صحیح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٩٧ دا واهاتووە.

بوون، سوێند بە خوا هەموو خواردیانو تێربوونو چوون و هەمووی بە پڕی مایەوە.[1]

تەبەرانی لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: دایکم خواردنێکی ئامادەکردو وتی: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ومیوانداری بکە، چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و وتم: دایکم شتێکی ئامادەکردووە، ئەویش بە هاوەڵانی فەرموو(هەستن) پەنجا کەس لەگەڵی هەستان، لەبەر دەرگا دانیشت و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ادخل عشرە عشرە)(دە دە بیانبەرە ژوورەوە) خواردیان تا تێربوونو لێی مایەوە.[2]

## (ناندانی ئەبوتەلحەی ئەنساری(رضي الله عنه))

موسلیم ج٢ ص١٧٨ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوتەلحە بە ئوم سولەیمی وت دەنگی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست کە لاوازبوو و برسێتیم لێ بەدیکرد، هیچمان هەیە بۆ خواردن تا بانگی بکەم، وتی: بەڵێ، چەند مشتێ گەنمی دەرهێناو دواتر پەڕۆیەکی هێناو پێچایەوەو خستیە ژێر کراسەکەمو دواتر گێڕایەوە، ئینجا ناردمی بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، چووم و سەیرمکرد پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خەڵکیدا دانیشتبوو، لەلایان وەستام، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەبوتەلحە تۆی نارد؟) وتم: بەڵێ: فەرمووی(بۆ خواردنێکە؟) وتم: بەڵێ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەوانەی چواردەوری فەرموو(هەستن) کەوتنەڕێو منیش لە پێشیانەوە چووم تا چوومە لای ئەبوتەلحەو پێم وت: ئەبوتەلحە وتی: ئەی ئوم سولەیم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هاوەڵانیدا هاتووەو هیچمان نیە دەرخواردیان بدەین، وتی: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، ئەبوتەلحە چوو تا گەیشتە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و لەگەڵی هات تا هاتنە ژوورەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(هلمي ما عندك يا ام سليم) واتە(ئوم سولەیم

---

[1] – موسلیم ج٢ ص١٧٨ لە جابرەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٣٠٨ دەڵێت: کەسەکانی جێ متمانەن.

چیت لایە ئادەی بیهێنە) ئەویش ئەو نانەی هێنا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد پێی و وردی کردو ئوم سولەیم جامێکی ڕۆنی هێنا. پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هێندەی خوا بیەوێت شتی لەسەر فەرموو، پاشان فەرمووی(ائذن لعشرة) واتە(دە کەسیان بانگ بکە بۆ ژوورەوە) مۆڵەتی دانو هاتنو تێریان خواردو چوونە دەرەوە، دواتر فەرمووی(ائذن لعشرة) ئەوانیش هاتن و تێریان خواردو چوونە دەرەوە، ئەمجارەیش فەرمووی(مۆڵەتی دە کەسیان بدە) بەو جۆرە هەموویان هاتن و تێریان خوارد، هەموویان حەفتا یان هەشتا کەس بوون.[1]

## (ناندانی ئەشعەسی کوڕی قەیسی کندی(رضي الله عنه))

تەبەرانی لە قەیسی کوڕی ئەبوحازمەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەشعەس بەدیلی هێنرا بۆ لای ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کۆتەکەی کردەوەو خوشکەکەی لێ مارە بڕی، ئەویش شمشێرەکەی هەڵگرتو چوویە بازاڕی وشتر فرۆشیو هەر وشترێکی بدیبایە ملی لێدەکردەوە، خەڵکی هاواریان کرد ئەشعەس بێباوەڕ بوو، کە لێبوویەوە شمشێرەکەی لابردو وتی: سوێند بە خوا بێباوەڕ نەبووم، بەڵام ئەو پیاوە خوشکەکەی خۆی لیٚ مارەکردم، ئەگەر لە وڵاتی خۆماندا بووینایە چێشتی ئاهەنگەکەمان لەمە جیاواز بوو، ئەی خەڵکی مەدینە بخۆن، ئەی خاوەن وشترەکان ئێوەش وەرن پارەکەتان وەربگرن.[2]

---

[1]- بوخاریش لە ئەنەسەوە بەوجۆرە هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٩ ص١٠٥ دا هاتووە ئیمامی ئەحمەدو ئەبویەعلاو بەغەوی هێناویانە، هەروەك لە البداية والنهاية دا فەرموودەو دەقیان زۆر هاتووە، تەبەرانیش هێناویەتی لە المجمع ج٨ ص٣٠٦ دا هاتووەو دەڵێت: ئەبویەعلاو تەبەرانی هێناویانە، ئەوەشی بۆ زیادکردووە کە نزیکەی سەد کەس بوون، کەسەکانی سەنەدەکەی ئەبویەعلاو تەبەرانی کەسانی صەحیحن.

[2]- لە الاصابة ج١ ص٥١و المجمع ج٩ ص٤١٥ دا واهاتووە، هەیسەمی دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە عەبدولموئمینی کوڕی عەلی.

## (ناندانی ئەبوبەرزە(رضي الله عنه))

ئیبن سەعد ج٤ ص٣٥ لە حەسەنی کوڕی حەکیم لە دایکیەوە هێناویەتی کە ئەبوبەرزە(رضي الله عنه) نانێکی بەیانی هەبوو کە ترێت بوو و نانێکی ئێوارە بۆ بێوەژنان و هەتیوان و هەژاران.

## (میوانداری میوانانی هاتووی ناو مەدینەی پاك)

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٣٧٤ لە تەلحەی کوڕی عەمرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کابرایەك کە لە مەدینە ناوبانگی هەبوایە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دادەبەزی، ئەگەر ناوبانگی نەبوایە لای هاوەڵەکانی صوففە دادەبەزی، وتی: من لەوانەبووم لای ئەهلی صوففە دابەزیم، هاودەمی کەسێك بووم - ڕۆژانە لای پێغەمبەرەوە مشتێ خورمای بۆ دووکەس دەهێنابۆمان - ڕۆژێك سەلامی نوێژی دایەوە، یەکێکمان بانگی کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خورما سکی سوتاندووین و بەرگمان دڕاو نەما، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) چوویە سەر مینبەرەکەی و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و دواتر باسی کرد لە هۆزەکەیەوە چی تووش بووە، فەرمووی(من و هاوەڵەکەم زیاتر لە سیانزە شەو (بضع عشرة) ماینەوە و جگە لە بەرهەمی داری ئەراك هیچ خواردنێکمان نەبوو، چووین بۆ لای براکانمان لە شوێنەکانیان و خواردنی زۆرینەیان خورما بوو، وەك خۆیان پێیان داین، سوێند بە خوا ئەگەر نان و گۆشتم بۆ شك ببردنایە بۆم دادەنان، بەڵام لەوانەیە بگەنە سەردەمێك یان هەرکامتان پێی بگات بەرگی پەردەی کەعبە دەپۆشن و بە تەشت و لەگان بۆتان دێنن و دەبەن).[1]

---

[1]- تەبەرانی و بەزاریش بەو جۆرە هێناویانە، هەیسەمی ج١ ص٣٢٣ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکەی بەزار صەحیحن جگە لە موحەممەدی کوڕی عوسمانی عقیلی، تەواو. ئیبن جەریر

تەبەرانی لە فەوالەی لەیسیەوە هێناویەتی دەڵێت: دەچووین بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و دیاریان لای دادەبەزی و ئەوانی دیکەش لای ئەهلی صوففە، من لەناو ئەهلی صوففە دابەزیم، یەکێك لە ڕۆژ هەینی بانگی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خورما ناوسکی خواردین، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خەریکە هەرکامتان بژیت بە تەشت و لەگان بۆی بهێنرێت و وەك بەرگی پۆشتەی کەعبە بپۆشن).[1]

بەیهەقی لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی دەکرد بۆ هاوەڵانی دواتر لایکردەوە و دەیفەرموو بە هاوەڵانی (با هەرکەسەو بەپێی ئەوەی لایەتی کەس بباتەوە بۆ ماڵ) کەس هەبوو یەك و هەبوو دوو کەس و هەبوو سیانی دەبردەوە، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ئەوانی دیکەی دەبردنەوە.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٤١ لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە شەو دەهات خەڵکێکی ناو صوففەی لە نێوان هەندێ لە هاوەڵانیدا دابەش دەکرد، هەبوو کەسێکیان دوویان سێ کەسی دەبردەوە تا دە کەسی هێنا، سەعدی کوڕی عوبادە(رضي الله عنه) هەموو شەوێك هەشت کەسی دەبردەوە بۆ ماڵەوە.[3]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٣٨ لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دای بەلامداو فەرمووی(ابا هر) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا،

---

هێناویەتی، لە کنز العمال ج٤ ص٤١ دا هاتووە ئەحمەد و حاکم و ئیبن حیببان هێناویانە، لە الاصابة ج٢ ص٢٣١ دا هاتووە.

[1]- لە سەنەدەکەدا میقدادی کوڕی داود هەیە کە لاوازە، کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن، هەیسەمیش ج١٠ ص٣٢٣ وا دەڵێت.

[2] - کنز العمال ج٥ ص٦٥.

[3]- ئیبن ئەبی دونیا و ئیبن عەساکیر بەوجۆرە بە کورتی هێناویانە، لە منتخب کنز العمال ج٥ ص١٩٠ دا هاتووە.

فەرمووی(بڕۆ بۆ لای ئەهلی صوففەو بانگیان بکە) دەڵێت: ئەهلی صوففەش میوانی ئیسلام بوون و ماڵ و ژن و سامانیان نەبوو، کە سەدەقەیەکی بۆ دەهات دەینارد بۆیان و هیچی لێ هەڵنەدەگرت، ئەگەر دیاریەکی بۆ بهاتایە دەینارد بۆیان و خۆیشی بەشێکی لێ هەڵدەگرت.[1]

هەروەها لە ج١ ص٣٥٢ لە ئەبوزەرەوە هێناویەتی دەڵێت: من لە ئەهلی صوففە بووم، کە شەو دەهات دەچووینە بەر دەرگای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئەویش فەرمانی دەکرد هەرکەسەو کەسێکی لەگەڵ خۆی دەبردەوە، هەرکەس لە ئەهلی صوففە دەمانەوە دە کەس یان زیاتر یان کەمتر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) خواردنەکەی خۆی دەهێنا و لەگەڵیان نانی دەخوارد، کە لێدەبووینەوە دەیفەرموو(لە مزگەوتدا بخەون) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دای بەلامداو من لەسەر ڕوو کەوتبووم، ئەویش بەپێ دای لە سکم و فەرمووی(ئەی جوندوب ئەو ڕاکشانە چییە؟ ئەوە ڕاکشانی شەیتانە).

هەروەها لە ج١ ص٣٧٤ لە تەخفەی کوڕی قەیسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد بە هاوەڵانی، هەبوو کەسێك، هەبوو دوو کەسی دەبردەوە، تا ئەوەی پێنج کەس مانەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووین(بەڕێکەون) لەگەڵی چووین بۆ لای عائیشە(رضي الله عنها) فەرمووی(ئەی عائیشە نان و ئاومان بۆ بێنە) ئەویش خواردنی(جەشیشە) ی هێنا، دەڵێت: ئەوەمان خوارد ئینجا خواردنی(حیسە)ی هێنا و خواردمان، پاشان فەرمووی(عائیشە خواردنەوەمان بۆ بێنە) ئەویش قاپێ شیری هێنا، خواردمانەوە، پاشان فەرمووی(ئەگەر دەتانەوێت بمێننەوە، ئەگەریش دەتانەوێت بچن بۆ مزگەوت) وتمان: دەچین بۆ مزگەوت. من لە مزگەوتدا لەسەر سك کەوتبووم کە کەسێك بەپێ لێی دەدام فەرمووی(ئەمە ڕاکشانێکە خوا ڕقی لێیەتی) وتی: سەیرمکرد دەبینم پێغەمبەری خوایە.

---

[1] – بوخاری و موسلیم هێناویانە.

تەبەرانی و ئەبونەعیم لە جەهجاهی غیفاریەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ هەندێ لە کەسانی هۆزەکەمدا کە دەیانەویست موسڵمان بن چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئێوارە هات و لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، کە پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی دایەوە فەرمووی(یاخذ كل رجل بيده جليسه) واتە(هەرکامتان دەستی ئەوەی پاڵی بگرێت و بیباتەوە) لە مزگەوتدا تەنها پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە، من کەسێکی گەورەو قەبەو درێژبووم کەس نەیدەبردمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بردمیەوە بۆ ماڵی خۆی، شیری بزنی پێدام و منیش تەواوم کرد، شیری حەوت بزنی بۆ دۆشیم و منیش هەموویم خواردەوە، ئوم ئەیمەن وتی: خوا ئەوە برسی بکات کە ئەمشەو پێغەمبەری خوای برسی کرد، فەرمووی(بەسە ئوم ئەیمەن هەمووکەس و ئێمەش ڕۆزیمان لەسەر خوایە) بەیانییان کردەوە لەگەڵ هاوەڵاندا کۆبوویەوەو هەرکەس دەیوت چی بۆ کراوە، من وتم: شیری حەوت بزنی پێدام و منیش خواردمەوە لەگەڵ نان‌دا، ئێوارە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) نوێژیان کرد، فەرمووی(با هەرکەس دەستی ئەوەی خۆی بگرێت، لە مزگەوتدا تەنها من مامەوەو پێغەمبەر(ﷺ)، من کەسێکی درێژبووم و کەس نەیدەبردمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بزنێکی بۆ دۆشیم منیش تێربووم، ئوم ئەیمەن وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر ئەمە میوانەکەمان نەبوو؟ فەرمووی با، ئینجا فەرمووی(ئەمشەو لە قاپی باوەڕدارانـدا نانی خوارد، پێشتر لە قاپی بێ باوەڕاندا نانی خوارد، بێباوەڕ لە حەوت قاپدا دەخوات و باوەڕدار لە یەك قاپدا دەخوات).[1]

بەیهەقی لە واسلەی کوڕی ئوسقعەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕەمەزان بوو و ئێمەش خەڵکە صوففە بووین ڕۆژوومان گرت، لە کاتی ڕۆژوو شکاندندا هەرکاممان لەگەڵ

[1]- لە كنز العمال ج١ ص٩٣ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەش بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابة ج١ ص٢٥٣ دا هاتووە، بەزارو ئەبویەعلا هێناویانە، لە المجمع ج٥ ص٣١ دا دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موسای کوڕی عوبەیدەی ڕەبزی هەیە کە لاوازە.

ئـەهلی بەیعەتـدا دەچـووین، شـەوێك كـەس نەیبردینـەوەو بـەیانیمان كـردەوەو هـەموومان كـەس نـەهات بمانباتـەوە، چووین بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و وتمان چی بووە، ئەویش ناردی بۆ لای هەریەك لە ژنەكانی تا پرسیاریان لێ بكات هیچیان لایـە؟ هـەركامیان هەرچی لابوایـە لەماڵەكەیدا دابەشـی دەكـرد، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی كۆببنـەوەو نـزای كردو فـەرمووی(خوایە داوای فـەزڵ‌و ڕەحمـەتی خۆتت لێدەكەم چونكە بە دەستی خۆتەو جگە لە تۆ كەس بە دەستی نیە) هێنـدەی نـەبرد هەركـەس داوای مۆڵـەتی كـرد بـەرخێكی بـرژاو و كولاویـشی هێنـا. پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی كرد خرایە بەردەستمان تا تێرمان خـوارد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی(ئێمـە داوای فـەزڵ‌و ڕەحمـەتمان لـە خـوا كـرد، ئەمـەش فەزڵیـەتی و ڕەحمەتەكەشـی بۆمـان لەلای ماوە)[1].[2]

بوخـاری لـە عەبـدولڕەحمانی كـوڕی ئەبوبـەكرەوە هێناویـەتی خـەڵكی صـوففە كەسـانێكی هـەژاربوون، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) جارێـك فـەرمووی(هەركـەس خـواردنی دوو كەسـی هەیە با سێ كـەس بباتـەوە، هەركـەس خـواردنی چواری لایە با پێنج یان شەش كەس بباتەوە) یان هاوشێوەی ئەوەی فەرموو، ئەبوبەكر سێ كەسی بردەوە، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) دە كەسـی بـردەوە، ئەبوبـەكر سـێ كـەس بـوو، مـن‌و دایـك‌و باوكم بووین، نازانم ئایا وتی: ژنەكەم و خزمەتكارەكەم لە ماڵمانداو ماڵی ئەبوبەكر بوون، ئەبوبـەكر لای پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) شـەوی كـردەوە، پاشـان هێنـدەی خوا بیـەوێت شـەو مایـەوە، ژنەكـەی پێـی وت: بۆچی نایـەیت بـۆ لای میوانـەكانت – یـان میوانەكـەت؟ وتی: مەگەر نانت پێ نەداون؟ وتی: ئامادە نەبوون نان بخۆن تا تۆ بێیتـەوە، منیش چووم خۆم شاردەوە، وتی: یا غنثر، لێی تووڕەبوو و سـەركۆنەی كـرد، وتـی: بخـۆن سوێند بە خوا ناخۆم، ئێمە هەرتیكەیەكمان دەخوارد لە خـوارەوەی زیاتر دەبوو تا

---

[1] – حسن.

[2] – لە البدایة والنهایة ج٦ ص١٢٠ دا واهاتووە.

تێربووین و خواردنەکە زیاتر لە سەرەتای بوو، ئەبوبەکر سەیری کرد وەك خۆی یان زیاترە، بە ژنەکەی وت: یا اخت فراس وتی: نا چاوەکەم ئێستا سێ بەرامبەری پێشترە، ئەبوبەکر لێی خوارد، وتی: سوێندەکەم لە شەیتانەوە بوو، پاشان تیکەیەکی لێ خواردو بردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، من لای بەیانیم کردەوە، بەڵێنێك لە نێوان ئێمەو خەڵکیدا هەبوو، کاتەکە بەسەرچوو، دوانزە کەسمان بینی هەرکامیان چەند کەسێکی لەگەڵ بوو، خوا دەزانێت لەگەڵ هەرکامیاندا چەند کەس هەبوو، هەموو لێیان خوارد، - یان بەوجۆرە دەیڵێت - جگە لەوانەش هەروا، دەڵێت: جیابووینەوە.[1]

دارقوتنی لە(کتاب الاسخیاء) لە یەحیای کوڕی عەبدولعەزیزەوە هێناویەتی دەڵێت: سەعدی کوڕی عوبادە ساڵێك خۆی غەزای دەکرد و ساڵێك قەیسی کوڕی غەزای دەکرد، سەعد لەگەڵ خەڵکیدا غەزای دەکرد، کۆمەڵێك میوانی زۆری موسڵمان هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، سەعد لەو سوپایەدا بوو ئەمەی بیست، وتی: ئەگەر قەیس کوڕی من بێت دەڵێت: ئەی نسطاس کلیلەکان بێنە تا پێویستی پێغەمبەر(ﷺ) دابین بکەم ئەویش دەڵێت لە باوکیەوە نامەیەك بهێن دەدات لە لووتی و کلیلەکان وەردەگرێ و پێویستی پێغەمبەر(ﷺ) دابین دەکات، شتەکە وابوو و قەیس سەد کۆڵ پێویستی برد بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[2]

تەبەرانی لە مەیمونەی کچی حارسەوە هێناویەتی دەڵێت: ساڵێکی وشکەساڵی هات و دەشتەکیەکان دەهاتن بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە هاوەڵان دەکرد هەرکەسەو دەستی یەکێك بگرێت و بیباتەوە بۆ ماڵەوەو شەو میوانداری بکات، شەوێکیان دەشتەکیەك هات، پێغەمبەر(ﷺ) خواردنێکی سادەو برێ شیری لابوو،

---

[1] - لە چەند لایەکی دیکەوە لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوەو موسلیمیش هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٦ ص١١٢ دا واهاتووە.

[2] - لە الاصابة ج٣ ص٥٥٣ دا واهاتووە.

دەشتەکیەکە هەمووی خواردو هیچی بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەهێشتەوە، شەوێك یان دوو شەو مایەوەو ئەویش هەموو خواردنەکەی دەخواردن منیش بە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) وت: خوا بەرەکەت نەدەیتە ئەم دەشتەکیە، نانەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەخوات و بەشی ناهێڵێت، پاشان شەوێکی دیکە هێنایەوەو تەنها کەمێکی خوارد، بە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) وت: مەگەر ئەمە هەر ئەو نیە – بە موسڵمانی هاتبوویەوە – فەرمووی(ان الکافر یاکل في سبعة امعاء و ان المؤمن یاکل في معی واحد) واتە(بێباوەڕ لە حەوت قاپدا دەخوات و باوەڕدار لە یەك قاپدا دەخوات)[1،2].

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٢٨ لە ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ساڵی سەختی و ناڕەحەتیدا عەرەب لە هەموو لایەکەوە بەرەو مەدینە دەهاتن، عومەری کوڕی خەتتاب فەرمانی کرد بە کەسانێك تا لەسەریان ڕاوەستن و خواردن و چەوری و نانیان لەگەڵ دابەش بەکەن،(ابن اخت النمر) و میسوەری کوڕی مەخزومەو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای عوقبەی کوڕی مەسعود، ئەمانە کە ئێوارە دەهات دەهاتن بۆ لای عومەرو هەواڵیان پێدەدا لەسەر باری خۆیان، هەرکامیان لەلایەکی مەدینەوە بوو، دەشتەکیەکان لەنێوان(راس الثنیة) تا(راتج) تا بەنی حارسە تا بەشی ئەشهەل تا بەقیع تا بەنی قورەیزە دابەش ببون، دەشتەکیەکان لای بەنی سەلەمە بوون، ئەمانە لە مەدینە بوون شەوێك گوێم لە عومەر بوو – خەڵکی لای ئەو نانی ئێوارەیان خواردبوو – وتی: بزانن چەند کەس لای ئێمە بووە، لە سەرەتاوە ژماردنیان سەیریان کرد حەوت هەزار کەس، وتی: ئەو ماڵ و خێزانانە بژمێرن کە نەهاتوون و نەخۆش و منداڵەکانیش بژمێرن، سەیریان کرد چل هەزارن، پاشان چەند شەوێك مانەوەو خەڵکی زیادی کرد، فەرمانی کردو خەڵکەکە ژمێردران،

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص٣٣ دەڵێت: تەبەرانی بە تەواوەتی هێناویەتی، ئەحمەد کۆتاییەکەی هێناوە، کەسەکانی سەنەدی تەبەرانی کەسانی صەحیحن، تەواو.

سەیریان کرد ئەوانەی نانیان خواردووە دە هەزارو ئەوانی دیکەش پەنجا هەزارن، هێندەی نەبرد تا خوای گەورە بارانی ڕەحمەتی نارد، کە باری سەیرم کرد عومەر هەموو هۆزێکی لەوانە ڕاسپارد تا ئەوانەی لای خۆیان بەرەو شوێنی خۆیان بنێرنەوەو نان و کۆڵیان پێ بدەن، سەیرم کرد عومەر خۆی ئەوەی دەکرد، ئەسلەم دەڵێت: هەیانبوو دەمرد، سەیرمکرد دوو لە سێیان مردن و یەك لە سێیان مانەوە، دەمبینی ئەوانەی دەوری عومەر لە بەیانیەوە کاریان دەکرد تا ڕۆژئاوا دەبوو، پاشان نانی نەخۆشەکانیان دەدان و دواتر سەرقاڵی کاری گەنم و خواردن بوون، عومەر دەیوت: ڕۆن بێنن، دەکرایە ناو مەنجەڵی گەورەی سەرئاگر تا گەرمیەکەی دەچوو، دوایی نانی پێدا دەکرا، عومەر لە ماڵی هیچ منداڵ و ژنێکیدا لەوماوەدا هیچی نەدەخوارد مەگەر ئەوەی لەگەڵ خەڵکی دەیخوارد تا ئەوەی خوای گەورە خەڵکی بووژاندەوە.

ئیبن سەعد لە فراسی دەیلەمیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) هەموو ڕۆژێك لەسەر سفرەکەی بیست وشتری سەردەبڕی کە عەمری کوڕی عاص(رضي الله عنه) لە میسرەوە دەیناردن.[1]

دەینەوەری و ئیبن شازان و ئیبن عەساکیر لە ئەسلەمەوە هێناویانە کە عومەری کوڕی خەتتاب شەوێك دەگەڕا، سەیری کرد ئافرەتێك لە حەوشەی ماڵێکەوە منداڵەکانی لە دەوریدان و دەگرین و مەنجەڵێکیش لەسەر ئاگربوو کە پڕی کردبوو لە ئاو، عومەر لە دەرگاکە نزیك بوویەوە و وتی: ئافرەت(یا امة الله) ئەو منداڵانە بۆچی دەگرین؟) وتی: لەتاو برسێتی دەگرین، وتی: ئەی ئەو مەنجەڵی سەر ئاگرە چیە؟ وتی: ئاوم تێکردووە تا هەڵیانخەڵەتێنم تا ئەوەی بخەون و وابزانن شتی تیایە، عومەر گریا و دواتر چوو بۆ(دار الصدقة) و فەردەیەکی هێنا و بڕێ خورما و چەوری و جل و درهەمی تێکرد تا پڕبوو، پاشان وتی: ئەسلەم بیدە بەکۆڵما، وتم:

---

[1] – لە المنتخب کنز العمال ج٤ ص٣٨٧ دا واهاتووە.

ئەی ئەمیری باوەڕداران من لە بری تۆ هەڵیدەگرم، پێی وتم: دایکت بۆت بگری ئەسلەم خۆم هەڵیدەگرم چونکە من لە ڕۆژی دواییدا لێیان بەرپرسیارم، هەڵیگرت تا بردیەوە ماڵی ژنەکەو مەنجەڵەکەی هێناو چەوری‌و خورمای تێکردو بە دەستەکانی خۆی دەیجولاندو فووی دەکرد بە ئاگرەکەدا، دەمبینی دووکەڵ لە ڕیشیەوە دەردەهات، بەوجۆرە نانی بۆ لێنان، پاشان بە دەستی خۆی تێیدەکردو نانی پێدەدان تا تێربوون، دواتر چوویە دەرەوەو بە نەعلەکانیان هەڵدەقونی وەك وێنەی گورگ یاری بۆ دەکردن‌و منیش ترسام هیچی پێ بڵێم، بەو جۆرە یاری بۆ منداڵەکان دەکردو ئەوانیش پێکەنین، ئینجا هەستاو وتی: ئەسلەم دەزانیت بۆچی وامکرد؟ وتم: نا، وتی: بینیم دەگریان حەزم نەکرد بچم‌و ماڵئاواییان لێ بکەم تا بیانبینم پێدەکەنن، کە پێکەنین دڵم ئارامی گرت.[1]

لە البداية والنهاية ج٧ ص١٣٦ لە ئەسلەمەوە باسیکردووەو دەڵێت: شەوێك لەگەڵ عومەر چووم بۆ گەڕەکی(واقیم) لەوێ لە(صەدار) ئاگرێکمان بینی، وتی: ئەسلەم ئالەوێوە، ئەمشەو نەچووینەتە ئەوێ، بابڕۆین بۆ لایان، چووین بۆ لایان سەیرمانکرد ئافرەتێکەو چەند منداڵێکی لە دەورە، ئینجا بەو واتایە دەیهێنێت.[2]

[1] - لە المنتخب کنز العمال ج٤ ص٤١٥ دا واهاتووە،

[2] - تەبەری ج٥ ص٢٠ بەو واتایە بە چەند زیادەیەکەوە هێناویەتی.

# (دابەشکردنی خۆراك)

ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: ئوکەیدر قاپێکی(گۆزەیەکی) بەخششم پێشکەشی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کرد، کە لە نوێژ بوویەوە دای بە لای هەندێ کەسداو هەرکامیان و پارچەیەکی پێ دەدان، پارچەیەکی دا بە جابر، پاشان گەڕایەوە بۆ لای و پارچەیەکی تری پێدا، جابر وتی: پێشتر پێت دام، فەرمووی(هذه لبنات عبد الله) واتە(ئەمە بۆ کچەکانی عبد الله)[1,2].

ئیبن جەریر لە حەسەنەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە دەومەتولجەندەل قاپێکی هێنا ئەو خواردنەی تیابوو کە بینیتان پێشکەشی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) کرد، ئەوکات سوێند بە خوا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و خێزانەکانی پێویستیان پێ بوو، کە لە نوێژ بوویەوە بە کەسێکی فەرموو تا بیگێڕێت بەسەر هاوەڵەکانیدا، کەس هەبوو دەستی دەبردە ناوی و بڕێکی دەردەهێناو دەیخوارد، هێنای بۆ خالیدی کوڕی وەلید دەستی بردە ناوی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی یەکجار هەڵیانگرت من دووجار، فەرمووی(کل واطعم اهلك) واتە(بخۆو بەشی ماڵو مناڵەکەشت بدە) لە کنز العمال ج٤ ص٤٧ دا واهاتووە.

بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك لە نێو هاوەڵانیدا خورمای دابەش دەکرد، بە هەرکەسەو حەوتی دەبەخشی، بۆ من حەوتی بەخشیو یەکێکیان بێ ناوك بوو، زۆر حەزم لەوەبوو چونکە جوینی خۆشو سووك بوو، موسلیم ج٢ ص١٨٠ لە ئەنەسەوە هێناویەتی خورمایەك هێنرا بۆ (رضي الله عنه) ئەویش پەلەی بوو و دابەشی کرد لە نێوان هاوەڵانیداو بەخێرا لێی دەخوارد.

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە جمع الفوائد ج١ ص٢٩٧ دا واهاتووە. هەیسەمی ج٥ ص٤٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەلی کوڕی زەید هەیە کە لاوازە لەگەڵ ئەمەشدا فەرموودەکەی حەسەنە.

ئیبن عەبدولحەکەم لە لەیسی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی خەڵکی مەدینە لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا(رضي الله عنه) لە ساڵی وشکی و نەبوونیدا تووشی سەختی بوون، ئەویش نامەی نووسی بۆ عەمری کوڕی عاص لە میسر:

(لە بەندەی خوا عومەری ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ عەمری کوڕی عاص، سەلام پاشان سوێند بە خوا ئەی عومەر گوێت لێ نیە ئەی عەمر خۆت و هاودەمانت تێربن من و هاودەمانم لەناوبچین، دەی فریاکەوە، دەی فریاکەوە).

عەمری کوڕی عاصیش ئەم نانەی بۆ نووسی:

(بۆ بەندەی خوا عومەری ئەمیری باوەڕداران لە عەمری کوڕی عاصەوە پاشان بەڵێ بەسەرچاو، دواتر بەڵێ بەسەرچاو، وا کاروانێکم بۆ ناردیت سەرەتاکەی لای تۆیەو کۆتاییەکەی لای منە. سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێ بێت).

عەمر کاروانێکی گەورەی نارد کە سەرەتاکەی لە مەدینەو کۆتاییەکەی لە میسر بوو، کاروانەکان یەك لە دوای یەك دەهاتن، کاتێك ئەمانە گەیشتنە لای عومەر دابەشی کرد بەسەر خەڵکداو بۆ هەرماڵێکی مەدینەو دەوروبەری وشترێکی بە کۆڵ و خوردنیەوە دانا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوام و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی نارد تا دابەشی بکەن بەسەر خەڵکدا، ئەوانیش بۆ هەرماڵێك وشترێکیان بە خواردنی ناو کۆڵەکەیەوە دانا تا نانەکە بخۆن و وشترەکەش سەرببڕن و گۆشتەکەی بخۆن و چەورییەکەشی بەکاربهێنن، سوودیش وەربگرن لەو بەرگەی کە خواردنی تێدایە بۆ لێفە یان شتی تر، بەمە خوای گەورە دەرووی لە خەڵك کردەوە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت کە کەنداوی لە نیلەوە بۆ قلزم لێداوە تا خواردن ببەن بۆ مەدینە و مەککە، هەروەها ئیبن خوزەیمە و ئەبوعوبەیدەو حاکم و بەیهەقی لە ئەسلەمەوە هێناویانە کە ئەسلەم وتی: عومەری کوڕی خەتتاب لە ساڵی نەبوونیدا نووسی بۆ عەمری کوڕی عاص – فەرموودەکە دێنێت – تیایدا هاتووە: کاتێك یەکەمم کاروان هاتە مەدینە زوبەیری بانگکردو وتی: بڕۆ بۆ سەرەتای ئەو کاروانەو پێشوازی لێبکەو هەرماڵێك توانیت بانگیان

بکەیت بانگیان بکە بۆم، هەرکەس نەتتوانی بیهێنیت ئەوا بۆ هەرماڵێك وشترێك و کۆڵەکەی پێبدەو بیانبە تا دوو کراس بپۆشن و وشترەکە سەربېڕن و چەورییەکەی هەڵبگرن و گۆشتەکەی و بەرگەکەی بەکاربهێنن و دواتر بڕێ لە گۆشتی وشك و چەوری و گەنم لێ بنێن و بخۆن تا خوا ڕۆزییان بۆ دەنێرێت، زوبەیر ئامادە نەبوو و وتی: بە خوا تاماویت شتی وا نابینیتەوە، پاشان کەسێکی دیکەی بانگکرد – وابزانم تەلحە بوو – ئامادەنەبوو، پاشان ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحی بانگکردو ئەویش چوو، پاشان اسدەکات عومەر هەزار دیناری دا بە ئەبوعوبەیدەو ئەویش قبوڵی نەکرد، دوایی لەسەر ئەو قسەی عومەر پێی وت قبوڵی کرد.[1] دواتر باسی ئەوە دەکەین پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) خواردنی لەناو پشتیوانان و بەنی ظفردا دابەشکرد لە باسی ڕێزگرتن و خزمەتکردنی پشتیواناندا باسی دەکەین.

## (پۆشین و دابەشکردنی جل و بەرگ)

ئەبونەعیم لە حببانی کوڕی جزئی سولەمیەوە هێناویەتی ئەو دیلەی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، جلی خەتخەتی دا بە جوزئیو ئەویش لە لای موسڵمان بوو، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(ادخل علی عائشة تعطيك من الابردة التي عندها بردين)(بڕۆ بۆ لای عائیشە تا لەو جلانەی(عەبا) لە لای هەن دوو دانەت بداتێ). ئەویش چوو بۆ لای ئاعیشەو وتی: خوا ئاگای لێت بێت لەو جلانەی لاتن یەکێکم بۆ هەڵبژێرە، چونکە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دانەیەکیانی داوە بە من، ئەویش سیواکێکی داری ئەراکی ڕاکێشا کە درێژبوو، وتی: ئەوە ئەوە هەڵبگرە، ئافرەتی عەرەب نەدەبینران.[2]

---

[1] – لە المنتخب ج٤ ص٣٩٦ دا واهاتووە.

[2] – لە المنتخب ج٥ ص١٥٣ دا واهاتووە.

ئیبن سەعد لە جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: بڕێك پۆشاك لە یەمەنەوە هێنرا بۆ لای عومەر(رضي الله عنه) ئەویش دای بە خەڵك، ئەوانیش بەو بەرگانەوە چوون و ئەویش لە نێوان گۆڕو مینبەردا دانیشتبوو و خەڵکی دەهاتن و سەلامیان لێدەکردو نزایان بۆ دەکرد، حەسەن و حوسەین(رضي الله عنه) لە ماڵی فاتیمەی دایکیانەوە لەگەڵ خەڵکەکە هاتن و هیچ لەو جلانەیان لەبەردا نەبوو عومەریش نێوچاوانی دابوو بەیەکدا، وتی: سوێند بە خوا ناحەسێمەوە تا بەرگتان نەدەمێ، وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران بەرگت دا بە هاوڵاتیانت و باشت کرد، وتی: لەپێناو ئەو دوو کەسەدا بەبێ ئەو بەرگانە لەناو خەڵکدا دەچن، بە زیادم زانی بۆیان کەچی نەیانبوو، پاشان نامەی نووسی بۆ یەمەن کە دوو بەرگ و پۆشاك بۆ حەسەن و حوسەین بنێەو پەلەش بکە، ئەویش دوو دانەی بۆ ناردو عومەریش پێیدان، لە کنز العمال ج٧ ص١٠٦ دا واهاتووە، پێشتر باسی چیرۆکی ئوسەیدی کوڕی حوزەیرو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەمان کرد لەگەڵ عومەردا سەبارەت بە دابەشکردنی جل و بەرگ لەناو خەڵکدا لە باسی ڕێزگرتنی پشتیوانان، هەروەها عومەر جلێکی بێتووکی چاکی دا بە ئوم عەممارە لەبەر ئەوەی لە ڕۆژی ئوحوددا بە باشی دەجەنگا، ئەمەمان لە باسی شەڕکردنی ئافرەتاندا هێناوە.

زوبەری کوڕی بەکار لە موحەممەدی کوڕی سەلامەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب هەواڵی نارد بۆ شیفای کچی عەبدوڵڵای عدوی کە وەرە بۆ لام، وتی: منیش بەیانی چووم بۆ لای و عاتیکەی کچی ئوسەیدی کوڕی ئەبولعەیسەم لەبەر دەرگاکەیدا بینی، چووینە ژوورەوەو کەمێك قسەمان کرد، ئینجا عومەر داوای بەرگێکی کردو پێیداو دانەیەکیشی دا بە من، منیش وتم: ئەی عومەر من لە پێش ئەو موسڵمان بووم و ئامۆزاتم، تۆ ناردووتە بە شوێن مندا، بەڵام ئەو لە خۆیەوە

هاتووە، عومەر وتی: ئەمەم تەنها بۆ تۆ دانابوو، کە پێکەوە هاتن بیرمکردەوە ئەو لە تۆ نزیکتربوو لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).[1]

ئیبن عەساکیر و ئەبوموسای مدینی لە(کتاب استدعاء اللباس) لە ئوصبوغی کوڕی نباتەوە هێناویانە دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای عەلی(رضي الله عنه) و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من پێویستیەکەم بە تۆ هەیە بەرزم کردەوە بۆ لای خوا پێش ئەوەی بەرزی بکەمەوە بۆ لای تۆ، ئەگەر بەجێی بگەیەنیت سوپاسی خواو سوپاسی تۆش دەکەم، ئەگەر نەیکەیت سوپاسی خوا دەکەم و لە تۆش دەبوورم، عەلی وتی: بنووسە بۆ سەرزەوی، من حەزناکەم زەبوونی سکاڵا لە ڕوخسارتدا ببینم، ئەویش نووسی من پێویستیم هەیە، عەلی وتی: دەی کراسێکت لەسەر من، بۆی هێنا و کابراش هەڵیگرت و پۆشی و دواتر وتی:

کسوتني حلة تبلى محاسنها — فسوف اكسوك من حسن الثنا حللا

ان نلت حسن ثنائي نلت مكرمة — و لست تبغي بما قد قلته بدلا

ان الثناء ليحي ذكر صاحبه — كالغيث يحيى نداه السهل و الجبلا

لاتزهد الدهر في خير توفقه — فكل عبد سيجزي بالذي عملا

عەلی وتی: دنیاریشم لەسەر بێت تا بتدەمێ سەد دینار هێنراو پێیدا، ئوصبوغ وتی: وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران بەرگێك و سەد دینار؟! وتی: بەڵێ گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو(انزلو الناس منازلهم) واتە(بەپێی کەسەکان هەڵوێست بنوێنن) دەی ئەمەش پلەی ئەو کابرایە لای من[2،3].

ترمزی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی کەسێك هات داوای لێکردو ئیبن عەبباس پێی وت: ئایا شایەتی دەدەیت هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لە خواو موحەممەد

[1] – لە الاصابە ج٤ ص٣٥٦ دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص٣٢٤ دا واهاتووە.

پێغەمبەری خوایە؟ وتی: بەڵێ، وتی: ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو دەبێت؟ وتی: بەڵێ، وتی: داوات کردووەو داواکاریش مافی هەیە، مافی سەرشانمە بێینە لات، ئەویش جلێکی پێداو دواتر وتی: بیستم پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو(ما من مسلم یکسوا مسلما ثوبا الا کان في حفظ الله مادام علیه منه خرقة)[1] .[2]

# (ناندانی موجاهیدان)

ئەبوبەکر لە(الغیلانیات) و ئیبن عەساکیر لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە(رضي الله عنه) هێناویانە پێغەمبەر(ﷺ) دەستەیەکی ناردو قەیسی کوڕی عوبادەی لەسەریان دانا، چوون و ماندووبوون و قەیس نۆ وڵاخی بۆ سەربڕین، کە چوونەوە ئەوەیان باسکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی(ان الجود من شیمة اهل ذالك البیت) واتە(بەخشندەیی لە شەریتی ئەو ماڵەیە) ئیبن ئەبی دونیا و ئیبن عەساکیر لە ڕافیعی کوڕی خدیجەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوعوبەیدە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب هات و بە قەیسی کوڕی سەعدی وت: بڕیارمداوە پێت بڵێم سەرنەبڕیت، کە سەریبڕی و ئەمە گەیشتەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)(بنه في بیت جود) واتە لە غەزای الخبط.[3] تەبەرانی لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بردینی، تووشی برسێتیەك بووین و ئەویش حەوت وڵاخی بۆ سەربڕین، لە کەناری دەریا دابەزین و سەیرمانکرد گەورەترین حووت لەوێدایە، سێ ڕۆژ لێمان خواردو چیمان لێ ویست لێمان هەڵگرت و چووین

---

[1] – ضعیف.

[2] – مجمع الفوائد ج١ ص١٤٧.

[3] – لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٢٦٠ دا واهاتووە

تـا هاتینـەوە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و پێمـان وت چـی بـووە، وتیـان: ئەگـەر بمانزانیایە پێی دەگەین پێش ئەوەی بڕوات حەزمان دەکرد لەویٚ لامان بوایە.[1]

ئەبوعوبەید لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە هێناویەتی دەڵێت: بیلال هات بۆ لای عومەر کاتێك هات بۆ شام سەرکردە سەربازیەکانیش لە لای بوون، وتی: ئەی عومەر ئەی عومەر، عومەر وتی: ئەمە عومەرە، وتی: تۆ لە نێوان ئەمانەو خوادایتو نێـوانی تـۆو خـوا کـەس نیـە، دەی بزانـە کـیٚ لەبەردەسـتتو کـیٚ لـە ڕاسـتو چەپتەوەیە، چونکە ئەوانەی هاتوون بۆ لات سوێند بە خوا تەنها گۆشتی باڵندە دەخۆن. عومـەر وتـی: ڕاسـت دەکـەیت لـەم کۆڕەمـدا هەڵناسـم تـا بـۆ هەرکەسـێکی موسـڵمانان دوو قـاپ گـەنم و ئەوەنـدەش زەیتیـان بـدەنیٚ، وتیـان ئـەی ئـەمیری باوەڕداران بۆی دابین دەکەین ئەوە لەسەر ئێوەیە خوای گەورە خێرو بەخششی زۆر کردووە، وتی: دەی باشە[2].[3]

---

[1]- هەیسەمی ج٥ ص٣٧ دەڵێت: لـە سەنەدەکەدا عەبدوڵڵای کوڕی صاڵحی نووسەری لەیس هەیە، عەبدولمەلیکی شوعەیبی کوڕی لەیس دەڵێت: جیٚ متمانەیەو ئەحمەدو جگە لەویش بە لاوازی دەزانن و ئەبوحەمزەی خەولانیش نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جیٚ متمانەن، تەواو.

[2] – حسن.

[3] – لـە کنـز العمـال ج٢ ص٣١٨ دا واهـاتووە، تەبـەرانیش لـە قەیـسەوە بەو جـۆرە هێناویـەتی، هەیـسەمی ج٥ ص٢١٣ دەڵێـت: کەسـەکانی سـەنەدەکە صـەحیحن جگـە لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەحمەد.

# (خەرجی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چۆن بوو؟)

بەیهەقی لە عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: لە حەلەب گەیشتم بە بیلالی بانگبێژی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، وتم: ئەی بیلال پێم بڵێ خەرجی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چون بوو، وتی: شتێکی نەبوو مەگەر ئەوەی من هەمبوو لەو کاتەوەی خوا بە پێغەمبەر ناردی تا کۆچی دوایی کرد وابوو، ئەگەر موسڵمان بهاتایە بۆ لای و بیبینیایە هەژارە فەرمانی پێدەکردم دەچووم قەرزم دەکردو جل و شتم بۆ دەکڕی و جلم پێدەداو نانم پێدەبەخشی تا ئەوەی یەکێك لە بێباوەڕان هاتە ڕێم و وتی: ئەی بیلال من توانام هەیە ئیتر تەنها لە من قەرز بکە، وتم: ڕۆژێکیان دەست نوێژم گرت و چووم تا بانگ بدەم بینیم بێباوەڕەکە لەگەڵ دەستەیەکی بازرگاناندایە، کە منی بینی وتی: ئەی حەبەشی، منیش وتم: ئەی لەبیە، ئەویش ڕووگرژی نواندو قسەیەکی ڕەقی کردو وتی: دەزانیت تۆ و ماوەی مانگ چەندتان ماوە؟ وتم: نزیکە. وتی: تەنها چوار شەوت ماوە تا بێم قەرزەکەت لێ وەربگرمەوە چونکە من ئەمەم لەبەر ڕێزی خۆت و هاوەڵەکەت پێنەدایت بەڵکو تا ببیت بە کۆیلەم و بەرت بدەم تا لەناو مەڕومالاتدا بکەویتە لەوەڕاندن وەك چۆن پێشتر وابوویت، وتی: منیش بەو قسەیە وەك خەڵك دڵگران بووم و چووم و بانگمدا و نوێژم کردو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە بۆماڵەوە، منیش داوای مۆڵەتم کردو چووم بۆ لای، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەو بێباوەڕەی بۆم باسکردیت کە قەرزی لێ وەردەگرم ئاوای پێ وتم و تۆش و منیش هیچمان نیە تا قەرزەکەم بدەمەوە و ئەویش ئابڕووم دەبات، دەی مۆڵەتم بدە تا بچم بۆ لای هەندێ لەو شوێنانەی موسڵمان بوون تا خوای گەورە ڕۆزی پێغەمبەرەکەی بدات تا قەرزەکەم بداتەوە، چووم تا گەیشتمە ماڵەوەو شمشێرو خەنجەرو ڕمەکەم و نەعلەکانی لای سەرم هەڵگرت و ڕوومکردە ئاسمان و هەرچی دەخەوتم بێداردەبوومەوە تا بینیم شەوێکم ماوە خەوتم تا ئەوەی بەری بەیانی یەکەم هات، ویستم بچم بینیم کەسێك هاواری دەکرد ئەی بیلال بڕۆ بەدەم وەڵامی پێغەمبەری خواوە، چووم تا گەیشتمە لای، سەیرم کرد چوار وڵاخی پڕبار لەوێن، هاتم بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و داوای مۆڵەتم کرد، پێی فەرمووم(ابشر فقد جاءك الله بقضاء دينك) واتە(مژدەت لێ بێت خوای

گەورە دانەوەی قەرزەکەی بۆ ناردیت) سوپاسی خوام کرد، فەرمووی(الم تمر علی الرکاب المناخات الاربع) واتە(ئەریٚ ئەو چوار ولاخە مۆڵدراوە نابەیت؟) وتم: با، فەرمووی(فان لك رقابهن وما علیهن) واتە(دەی خۆیانو بارەکەشیان بۆ تۆ) جلو بەرگو خواردنیان لەسەر بوو گەورەی(فدك) بە دیاری ناردبوونی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(فاقبضهن الیك ثم اقضي دینك) واتە(بیانبە بۆ خۆتو دواتر قەرزەکەت بدەرەوە) وتی: وامکردو بارەکەم لیٚ لابردنو ئالفم پێدانو دواتر چووم تا بانگی بەیانی دووەم، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی کرد چووم بۆ بەقیع و پەنجەکانم خستنە گوێم و وتم: کیٚ قەرزی لای پێغەمبەری خوایە با بێت، بەردەوام دەمفرۆشتو قەرزم دەدایەوە تا هیچ قەرزێك لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەما تا دوو ئوقیە یان ئۆقیەو نیوێك زیادەبوو، دواتر چووم بۆ مزگەوتو زۆری ڕۆژەکەم چووبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە تەنها لە مزگەوتدا دانیشتبوو، سەلامم لێکرد، فەرمووی(ما فعل ما قبلك؟) واتە(ئەوەی پێشترت چی کرد؟)(چیت کرد بەو شتە؟) خوای گەورە هەموو قەرزەکانی پێغەمبەری خوای دایەوەو هیچی لەسەر نەما، فەرمووی(هیچی زیادەبوو؟) وتم: بەڵیٚ دوو دیناری، فەرمووی(انظر ان تریحني منهما فلست بداخل علی احد من اخلي حتی تریحیني منهما) واتە(بزانە ئاسودەم ناکەیت لە دەست ئەو دوو دینارە، چونکە ناچمە ماڵی هیچکام لە ژنو ماڵم تا ئاسودەم دەکەیت لە دەست ئەو دوو دینارە) کەس نەهات بۆ لامانو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە مزگەوتدا مایەوە تا ڕۆژبوویەوە، ڕۆژی دووەمیش لە مزگەوتدا مایەوە تا کۆتایی ڕۆژ ئەو کات دوو سوار هاتن، بردنم و کراسو خواردنم بۆ کڕین تا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی کردو فەرمووی(مافعل الذي قبلك؟) وتم: خوا ئاسودەی کردیت لێی، ئەوکات الله اکبری کردو سوپاسی خوای گەورەی کرد لە ترسی ئەوەی نەوەك مەرگ بێتە ڕێیو ئەوپارەی لامابێت، پاشان شوێنی کەوتم تا چوو بۆ لای ژنەکانیو سەلامی لەیەك بە یەکیان کرد تا کاتی چوونەوە ماڵو خەوی هات، ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارە بوو کە لێت کردم[1][2].

---

[1] – ضعیف.

[2]– لە البدایة والنهایة ج٦ ص٥٥ دا واهاتووە، تەبەرانی لە عەبدوڵڵاوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٤ ص٣٩ دا واهاتووە.

## (دابەشكردن‌و چونیێتی دابەشكردنی سامان لەلایەن پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم))

تەبەرانی لە ئوم سەلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: من بزانم زیاترین سامانێك خرایە بەردەم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تا ئەو ڕۆژەی خوا بردیەوە، ئەوەبوو لە تاریكی شەودا تورەكەیەكی بۆ هێنرا هەشت سەد درهەم‌و نامەیەكی تێدابوو، ئەویش ناردی بۆ من‌و ئەوكات شەوبوو، پاشان دوای درەنگەشەو گەڕایەوەو لە ژوورەكەو لە شوێنی نوێژەكەیدا كە بۆ ئەو و خۆمم ئامادەكردبوو و نوێژی كرد، چاوەڕێ بووم‌و ئەویش نوێژەكەی درێژكردەوە، دوایی چوویە دەرەوە ئینجا گەڕایەوە، بەو جۆرە تا بانگی بەیانی درا، نوێژی كردو دواتر گەڕایەوەو فەرمووی(این تلك الخريطة التي فتنتني البارحة؟)(ئەو خەریتەی شەو منی تووشی فیتنە كرد كوا؟) بانگی كرد تا بیهێنن‌و دابەشیكرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا شتێكت كرد كە پێشتر وات نەدەكرد، فەرمووی(كنت اصلي فاوتي بها فانصرف حتى انظر اليها ثم ارجع فاصلي) واتە(من نوێژم دەكرد هێنرا، هاتم‌و سەیرم دەكردو دواتر گەڕامەوە نوێژم دەكرد)[1][2].

حاكم ج٣ ص٣٢٩ لە حەمیدی كوڕی هیلال لە ئەبی بوردە لە ئەبی موسای ئەشعەریەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلائی كوڕی حەزرەمی لە بەحرەینەوە هەشتا هەزاری نارد بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، نە پێشترو نە دواتریش هێندە سامان نەهاتبوو بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، فەرمانی كرد لەسەر حەسیرێك بڵاوكرایەوەو بانگ دراو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات‌و بە پێوە سەیری سامانەكەی دەكردو هاتن‌و ئەویش پێی دەبەخشین، ئەو ڕۆژ ڕۆژی بەدر بڕی ئازادكردنی خۆم‌و غفیلیشم بەخشی و ئەو

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٥ دەڵێت: تەبەرانی بە چەند سەنەدێك گێڕاویەتیەوەو هەندێك لە سەنەدەكان صەحیحن.

پارەی نەبوو، دەی لەو پارە بەشم بدەن پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خذ) واتە(ببە) ئەویش کردی بە کراسێکدا کە زێری لەسەر بوو چوو و نەیتوانی، سەری بەرزکردەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیدە بە کۆڵما، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی(اما اجد ما وعد الله فقد انجزلي ولا ادری الاخری)(یەکێ لەو شتانەی خوا بەڵێنی پێدابووم بۆی هێنامەدیء ئەوی دیکەشیان نازانم)(قل لمن في ایدیکم من الاسری ان یلعم الله في قلوبهم خیرا یؤتکم خیرا مما اخذتم کنکم و یغفر لکم) ئەمە باشتربوو لەوەی لە منی وەرگرت و نازانم بە لێبوردنەکەش چی دەکات.[1]

## (ئەبوبەکر سامان دابەش دەکات و یەکسانیشی تێدا بەکاردێت)

ئیبن سەعد لە سەهلی کوڕی ئەبی حەسمو جگە لەویشەوە هێناویەتی ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە بەرزایی مەدینە(السنح) ماڵێکی دیاری هەبوو و کەس پاسەوانی نەدەکرد، پێی وترا: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئایا لەسەر بەیتولمال کەسێك دانانێیت بۆ پاسەوانی؟ وتی: ترسی لەسەر نیە، وتم: بۆ چی؟ وتی: قفڵی لەسەرە، چی تێدا بوایە دەیبەخشی و هیچی تێدا نەدەهێشتەوە، کاتێك ئەبوبەکر لە مەدینە شوێنی گۆڕی بەیتولمالی لەوێدا دانا کە تیایدا بوو، لە شوێنە هۆزو خێڵەکانیان و لە جوهەینەوە بڕێکی زۆری سامانی بۆ هاتبوو، لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکردا کانی ئەبوسەلیم کرایەوە و سەدەقەی بۆ دەنارد و دەخرایە بەیتولمالەوە، ئەبوبەکر بەسەر کەس کەس و دەستە دەستەدا دابەشی دەکرد و هەر سەد کەسێك ئەوەندەو

---

[1]- حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێ لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە، ئیبن سەعد ج٤ ص٩ لە حەمیدی کوڕی هیلالەوە بەو جۆرە بەو واتایە هێناویەتی و باسی ئەبوبوردەو ئەبوموسای نەرکردووە.

ئەوەنـدەی بەردەکـەوت، لـە دابەشـکردندا یەکـسانی دەگرتەبـەر، لـە نێـوان کۆیلـەو ئازادو ژن و پیاو و گەورەو بچوکدا، وشتر و ئەسپ و چەکی دەکڕی و لەپێناو خوادا دەیـدا بـە خـەڵکان، سـاڵێکیان بـڕێ بـەرگی کـە لـە لادێـوە هێنـابوونی لـە زستاندا دابەشی کردن بەسەر بێوەژنانی خەڵکی مەدینـەدا، کاتێك ئەبوبەکر مردو بە خاك سپێردرا عومەری کوڕی خەتتاب سپاردەکانی بانگکردو بردنی بۆ ماڵی ئەبوبەکرو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و عوسمانی کوڕی عەففانیشی لەگەڵ بوو، چوونەناو بەیتولمال و هیچ دینـارو درهـەمێکیان تێدابەدی نەکردو شوێنی پارەیان بەدیکرد تەواو ببوو، تیایدا درهەمێکیان بینی بەوە سۆزیان جولا بۆ ئەبوبەکر، لە مەدینـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا(صلى الله عليه وسلم) پێوەرێك هـەبوو کـە چـی سـامان لای ئەبوبـەکر هـەبوو دەپێورا، پرسیاری لێکرا ئەو سامانەی هێنـرا بـۆ ئەبوبـەکر چەند بـوو؟ وتـی: دوو سەد هەزار[1][2].

ئەحمـــەد لـــە(الزهـــد) لـــە ئیـــسماعیلی کـــوڕی موحەممـــەدەوە هێناویـــەتی ئەبوبەکر(رضي الله عنه) بڕێك سامانی دابەشکردو لە نێوان خەڵکیدا یەکسانی کرد. عومەر پێی وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یەکسانی لە نێوان هاوەڵانی بەدرو خەڵکی دیکـەدا دەکـەیت؟ ئەبوبـەکر وتـی: دنیـا گەیاندنـەو چاکترینیشی ناوەندەکەیەتی، فەزڵ و زیادەی لە پاداشتیاندایە، ئەبوعوبەیدەیش لە ئیبن حەبیب و جگە لەویشەوە هێناویەتی ئەبوبەکر قسەی لەگەڵ کرا لەسەر ئەوەی لـە دابەشـکردندا هەندێ کـەس جیابکاتەوە، ئەویش وتی: فەزڵیان لای خوایە ئەم بژێویە یەکسانی تێدا باشترە.[3]

بەیهەقی ٣٤٨ لە ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر بوو بە خەلیفەو بە یەکسانی لـە نێوان خەڵکدا دابەشکاری دەکرد، بە ئەبوبـەکر وتـرا: ئـەی خـەلیفـەی پێغەمبـەری خـوا بـەڵکو فـەزڵی پـشتیوانان و کۆچـەران زیـاتر بکـەیت. وتـی: ئـەوەی

---

[1] – صحيح.

[2] – لە كنز العمال ج٣ ص١٣١ دا واهاتووە.

[3] – لە كنز العمال ج٢ ص٣٠٦ دا واهاتووە.

هەیانبوو لێیان کرِدرایەوە، ئەم ژیانە پێشەنگی تیایدا باشترە لە جیاکاری. عومەر لە عەبدوڵڵای مەولای غەفرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر کەوتە دابەشکاری و یەکەم دابەشکاریشی ئەوەبوو عومەری کوڕی خەتتاب پێی وت: فەزڵی کۆچەرانی یەکەم و پێشینان پێش بخە. وتی: پێشینەیان لێ کرِدراوە، بۆیە بە یەکسانی دابەشکاری کرد.

بەیهەقی و ئیبن ئەبی شەیبەو بەزار و حەسەنی کوڕی سوفیان لە عومەری مەولای غەفرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(عليه السلام) کۆچی دوایی کرد لە بەحرەینەوە سامانێك هات، ئەبوبەکر(رضي الله عنه) وتی: کێ شتێکی یان پێویستیەکی لای پێغەمبەر(عليه السلام) هەبوو با هەستێت وەریبگرێتەوە، جابر(رضي الله عنه) هەستا و وتی: پێغەمبەری خوا فەرمووی(ان جائني مال من البحرين لاعطينك هكذا وهكذا) واتە(ئەگەر لە بەحرەینەوە سامانێکم بۆ هات دڵنیابە ئەوەندەو ئەوەندەت پێ دەبەخشم) سێ جار ئاماژەی بە دەستی کرد، ئەبوبەکر پێی وت هەستەو بە دەستەکانی خۆت هەڵیبگرە ئەویش وایکردو پێنج سەد درهەم دەرچوو، وتی: هەزاری پێ بدەن. لە نێوان خەڵکدا بە دە درهەم دە درهەم دابەشیکردو وتی: ئەمە ئەو بەڵێنانەن پێغەمبەر(عليه السلام) بە خەڵکی دان. تا ئەوەی ساڵی دواتر هات پارەیەکی زیاتر لەوەی بۆ هات بە بیست درهەم بیست درهەم دابەشی کردو زیادەیەکی لێ مایەوە پێنج درهەم پێنج درهەم دابەشیکرد بەسەر خزمەتکارەکاندا و وتی: ئێوە کۆمەڵێ خزمەتکارتان هەن خزمەتتان دەکەن و چارەسەری کارتان دەکەن ئێمەش کەمێکمان بڕیەوە بۆیان، وتیان: بۆچی فەزڵی کۆچەران و پشتیوانان نادەیت بەسەر خەڵکدا لەبەر ئەوەی پێشتر موسڵمان بوون و لای پێغەمبەر(عليه السلام) پلەو پایەیان بەرزبوو، وتی: پاداشتی ئەوانە لای خوایە، ئەم ژیانە یەکسانی و پێشەنگی تیایدا لە جیاکاری باشترە، بەو شێوەیە هەنگاوی نا – فەرمووەدەکەی هێناوە، وەك دواتر دەیهێنین – پێشتر دادپەروەری عەلی و یەکسانی لە دابەشکردنیدامان باسکرد کە عەلی چی بەو ژنە عەرەبیە وت کە وەك مەولاکەی پێیدا وتی: من سەیری کتێبی خوام کرد نەمدی فەزڵی کوڕی ئیسماعیل بدات بەسەر کوڕی ئیسحاقدا(علیهما السلام).

# (دابەشکاری عومەری فاروق و فەزڵدانی بە پێشینەو خاوەن نەسەبەکان)

ئیبن ئەبی شەیبەو بەزارو بەیهەقی لە عومەری مەولای غەفرەوە هێناویەتی – فەرموودەکە دێنێت وەك پێشتر هێنامان – تیایدا هاتووە: کاتێك ئەبوبەکر(رضي الله عنه) مرد عومەر هاتە شوێنی و خوای گەورە فتوحاتێکی زۆری پێ بەخشی و سامانی زیاتری بۆ هات، وتی: ئەبوبەکر سەبارەت بەم سامانە ڕایەکی هەبوو و منیش ڕایەکی دیکەم هەیە، ئەو کەسەی دژ بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)شەڕی دەکرد لەگەڵ ئەو کەسەی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو و شەڕی دەکرد وەك یەکیان نابینم، بۆیە کۆچەران و پشتیوانانی پێشخست و بۆ بەشداربوانی بەدر پێنج هەزاری دانا، ئەوانەی پێش بەدریەکان موسڵمان ببوون بۆ هەرکامیان چوار هەزاری دانا، بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوانزە هەزاری دانا جگە لە صەفیە و جوەیرە کە بۆ هەرکامیان شەش هەزاری بڕیەوە، ئەوانیش ئامادە نەبوون وەری بگرن، عومەر وتی: لەبەر کۆچکردنیان ئەوەم بۆ بڕینەوە ئەوانیش وتیان: لەبەر کۆچ بۆت نەبڕیونەتەوە بەڵکو لەبەر پلەو پایەیان لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئێمەش پلەو پایەمان وەك ئەوان بوو، ئەویش تێگەیشت و یەکسانی کردنەوە، بۆ عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب دوانزە هەزاری بڕیەوە لەبەر نزیکی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بۆ ئوسامەی کوڕی زەید چوار هەزاری بڕیەوە، بۆ حەسەن و حوسەین(رضي الله عنه) پێنج هەزاری دانا و وەك باوکیان حسابی بۆ کردن لەبەر نزیکیان لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر سێ هەزاری دانا، وتی: بابە گیان بۆ ئوسامەی کوڕی زەید ئەوەندەو بۆ منیش سێ هەزارت داناوە، باوکی فەزڵێکی زیادەی نەبوو کە تۆ نەتبێت و خۆیشی فەزڵێکی نیە کە من نەمبووبێت، وتی: باوکی ئەو لە باوکی تۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆشەویستتر بوو، خۆیشی لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆشەویست بوو، بۆ کوڕانی کۆچەران ئەوانەی بەشداری بەدر بوون دووهەزار بڕیەوە.

عومەری کوڕی ئەبوسەلەمە دای بەلایدا وتی: هەزاری بۆ زیاد بکەن یان وتی: هەزاری بۆ زیاد بکە ئەی غولام، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا وتی: لەبەرچی لە ئێمە زیاتری پێ دەدەیت؟ فەزڵی باوکی لە فەزڵی باوکمان زیاتر نەبوو، وتی: لەبەر ئەبوسەلەمە دووهەزارم بۆ بڕیەوەو لەبەر ئوم سەلەمەش هەزارم بۆ دانا ئەگەر تۆ وەك ئوم سەلەمەت هەیە با هەزارت بۆ زیاد بکەم، بۆ عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوسمان واتە برازای تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵا(رضي الله عنه) – واتە عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵا – هەشت سەدی بڕیەوە، بۆ نەزری کوڕی ئەنەس هەزار درهەم تەلحە پێی وت: ئیبن عوسمان وەك ئەو هات بۆ لات ئەوەندەت بۆ بڕیەوە، من لە ڕۆژی ئوحود گەیشتم بە باوکی ئەمەو لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێکردم وتم: وابزانم کوژراوە. ئەویش شمشێرەکەی هەڵگرت و خۆی یەکلا کردەوەو وتی: ئەگەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کوژرابێت ئەوا خوا زیندووەو نامرێت، جەنگا تا کوژرا، بەڵام ئەو مەڕی دەلەوەڕاند، ئێستا دەتانەوێت بە یەکسان دایانبنێم، عومەر هەموو تەمەنی بەو جۆرە کاری دەکرد – فەرموودەکە دێنێت وەك دواتر بڕێکی دیکەی دێنین –.[1]

بەیهەقی ج٦ ص٣٥٠ لە ئەنەسی کوڕی مالیك و ئیبن موسەیبەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب پێنج هەزاری بۆ کۆچەران و چوار هەزاری بۆ پشتیوانان نووسی، بۆ ئەوانیش بەشداری بەدر نەبوون لە کوڕانی کۆچەران چوار هەزاری دانا، لەوانە عومەری کوڕی ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدوڵڵای مەخزومی و ئوسامەی کوڕی زەیدو موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای جەحشی ئەسەدی و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنهم) بوون، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: ئیبن عومەر لەوانە نیە، ئەو و ئەو؟! ئیبن عومەر وتی: ئەگەر مافێکم هەیە بمدەرێ ئەگەر نا مەمدەرێ. عومەر بە ئیبن عەوفی وت: بەخوا من و تۆ هەردووکمان پێنج هەزارمان نابێت.[2]

---

[1]– دەقەکە هی بەزارە وەك لە المجمع ج٦ ص٤ دا واهاتووە، دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئەبومەعشەرنە هەیە کە لاوازە و بە فەرموودەی ئەو دادەنرێت.

[2]– ئیبن ئەبی شەیبە بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٢ ص٣١٥ دا واهاتووە.

ئیبن عەساکیر لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب کاتێك مووچەی بۆ خەڵك بڕیەوە بۆ عەبدوڵڵای کوڕی حەنزەلە دوو هەزار درهەمی دانا، تەلحە برازایەکی خۆی هێنا و وەك ئەوی بۆ نەبڕیەوە، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەو پشتیوانیەت پێش برازاکەم خست؟ وتی: بەڵێ چونکە من باوکیم بینی لە ڕۆژی ئوحود شمشێرەکەی خستبوویە کار وەك پەناو خۆ ونکردنی وشتر.[1]

ئەحمەد لە ناشرەی کوڕی سمی یەزەنیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی(جابیە) گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو کە وتاری بۆ خەڵك دەخوێندەوە دەیوت: خوای گەورە منی بە خەزنەداری ئەم سامانەو دابەشکەری داناوە، وتی خوای گەورە دابەشی دەکات و من لە کەسوکاری پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) دەست پێدەکەم دواتر لە شەرەفمەندترینیانەوە بۆ ژنانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دە هەزاری بڕیەوە جگە لە جوەیرە و صفیەو مەیمونە، عائیشە(رضي الله عنها) وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دادپەروەری لە نێوانماندا دەکرد، عومەریش وایکرد دواتر وتی: من لە هاوەڵاندا بە کۆچەرانی یەکەم دەست پێدەکەم - چونکە بە ستەمو دوژمنایەتی لەماڵمان دەرکراین - پاشان شەرەفمەندترینیان بۆ ئەهلی بەدر پێنج هەزارو بۆ پشتیوانانی بەشداربووی بەدر چوار هەزارو بۆ بەشدارانی ئوحودیش هەزاری بڕیەوە، کێ زووتر کۆچی کردبێت لە پێشتر پێی دەبەخشرێت، کێ هێواشی لە کۆچدا نواندبێت هێواشی لە بەخشینیدا دەکرێت، کەس جگە لە باری کوڵی خۆی سەرکۆنەی کەس نەکات. من پۆزشتان بۆ دێنمەوە لە لابردنی خالیدی کوڕی وەلید(رضي الله عنه) من فەرمانم پێکرد تا ئەو پارەو سامانە لەسەر لاوازانی کۆچەران دابنێ کەچی دای بە توانا و خانەدان و قسە ڕۆیشتووەکان، بۆیە لامبردو ئەبوعوبەیدەم دانا، ئەبوعەمری کوڕی حەفص(رضي الله عنه) وتی: سوێند بەخوا: ئەی عومەری کوڕی خەتتاب جێی پۆزش نیت تۆ کاربەدەستێکت لابرد کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دایناببوو، شمشێرێکت خستە کالان کە

---

[1] - لە کنز العمال ج٢ ص٣١٩ دا واهاتووە.

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەڵیکێشابوو، ئالآیەکت دانا کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەڵیکردبوو، حەسودیت بە ئامۆزاکەم برد عومەری کوڕی خەتتاب وتی: تۆ زۆر نزیکیت، تەمەنت کەمە، دەمارگیریت بۆ ئامۆزاکەت هەیە[1][2].

## (عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) دیوانی مووچەو بەخشین(العطايا) دادەنێت)

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٦و بەیهەقی ج٦ ص٣٥٠ لە ئەبی هورەیرەوە هێناویانە دەڵێت: لە لای ئەبوموسای ئەشعەریەوە(رضي الله عنه) چووم بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه)و هەشت سەد هەزار درهەمم بۆ برد، پێی وتم: چیت هێناوە؟ وتم: هەشت سەد هەزار درهەمم هێناوە، وتی: هاوار بۆت چۆن عومەری کوڕی خەتتاب بنوێتو خەڵکی شتێکیان بۆ هاتووە کە لەوکاتەوەی ئیسلام هاتووە تا ئێستا شتی وایان بۆ نەهاتووە، ئەگەر عومەر بکەوێ چی لە کاتێکدا ئەو پارەی لایە لە شوێنی خۆیدا داینەنێت قوڕبەسەر دەبێت، کە نوێژی بەیانی کرد دەستەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتن بۆ لای، پێی وتن: شەو شتێك بۆ خەڵك هاتووە کە لەو کاتەوەی ئیسلام هاتووە شتی وایان بۆ نەهاتووە، من ڕایەکم هەیەو ئێوەش ڕاوێژم پێ ببەخشن، پێم باشە پێوانەو بەش بۆ خەڵك دابنێم، وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران وامەکە، خەڵکی دێنە ناو ئیسلامو سامان زیاد دەکات بەڵام بە نوسین بیاندەرێ، هەرکە خەڵك زۆر و سامانیش زۆر بوو بەوجۆرە دەیاندەیتێ، وتی: ڕاوێژم پێ بدەن سەرەتا لە کامیانەوە دەست پێبکەم؟ وتیان: لە تۆوە ئەی ئەمیری

---

[1] - صحيح.

[2] - هەیسەمی ج٦ ص٣ دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتیو کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن بەیهەقیش ج٦ ص٣٤٩ لە ناشرەی کوڕی سمی یەزەنیەوە بەو جۆرە هێناویەتی، بەڵام باسی پۆزشی لابردنی خالیدو دواتری نەهێناوە.

باوەڕداران تۆ بەرپرسی ئەو کارەیت، هەیانبوو دەیوت ئەمیری باوەڕداران چاکتر دەزانێت، وتی: نا، بەڵکو لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) دەست پێدەکەم، پاشان نزیك لەو بەو جۆرە، بەو جۆرە دیوانی دانا، لەبەنی هاشمو موتەلیبەوە دەستی پێکردو بە هەموویانی بەخشی، دواتر بەنی عەبدشەمس و دواتر بەنی نەوفەلی کوڕی عەبدمەناف، بۆیە بە بەنی عەبدشەمس دەستی پێکرد چونکە لە دایکەوە برای هاشم بوو.

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٢ و تەبەری ج٥ ص٢٢ لە ڕێگەی خۆیەوە لە جوبەیری کوڕی حوەیرسەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) لە دانانی دیواندا ڕاوێژی بە موسڵمانان کرد، عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) پێی وت: هەموو ساڵێك چیت لا کۆبوویەوە هەمووی دابەش بکە و هیچی لێ مەهێڵەرەوە، عوسمانی کوڕی عەففان وتی: پارەیەکی زۆر دەبینم کە تەواو بەشی خەڵك دەکات، ئەگەر نەژمێردرێن تا بزانرێت کێ وەری گرتووەو کێ وەری نەگرتووە لە ترسی ئەوەی پارەکە وابڵاو نەبێتەوە، وەلیدی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران چوومە شام و سەیرم کرد پادشاکانیان دیوانێکیان دانابوو و دیوانی سەربازانیان هەبوو، تۆش وابکە. ئەویش ڕاکەی ئەوی وەرگرت، عقیلی کوڕی ئەبوتالیب و مەخزەمەی کوڕی نەوفەل و جوبەیری کوڕی مەتعەمیش(رضي الله عنهم) هەمان ڕیان هەبوو – ئەمانە لە وەچەزان نەسەبدارانی قوڕەیش بوون – عومەر وتی: هەرکەس و بەپێی پلەو پایەی ناوی بنووسن، ئەوانیش لە بەنی هاشمو دواتر ئەبوبەکرو هۆزەکەی و دواتر عومەرو هۆزەکەی لەسەر خیلافەت دەستیانپێکرد، کاتێك عومەر سەیری کرد وتی: بە خوا گومانم وابوو وابێت بەڵام لە نزیکی لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) دەست پێ بکەن تا عومەر دەخەنە ئەو شوێنەی کە خوا دەیەوێت.

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٢ و تەبەری لە ڕێگەی خۆیەوە ج٥ ص٢٣ لە فەرموودەکەی ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: بەنوعەدی هاتن بۆ لای عومەر و

وتیان: تۆ لە خەلیفەی پێغەمبەری خوایت یان خەلیفەی ئەبوبەکرو ئەبوبەکریش خەلیفەی پێغەمبەری خوایە، وتیان: ئاوا، دەی خۆت لەو شوێنە دابنێ کە ئەو خەڵکە دایاننناویت، وتی: بەخ بەخ بەنی عەدی، دەتانەوێت لەسەر پشتم بخۆن تا چاکەکانم بدەم بە ئێوە، بەخوا تا سەرەتان دێت ئەگەر چی نووسینیش لەسەرتان بنوسرێ – واتە لە کۆتایی هەمواندا بنوسرێن – من دوو هاوڕێم هەبوو کە ڕێیان بڕی، ئەگەر لێیان لابدەم لێم لادەدرێت، سوێند بە خوا لە دنیا نەگەیشتینە فەزڵ و ئەو پاداشتەی لە ڕۆژی دوایی لە خوا دەمانەوێت لە موحەممەدەوە(ﷺ) دەیبینین، ئەو لە هەمووان شەرەفمەندترەو هۆزەکەشی لەناو عەرەبدا شەرەفمەندترینە بەو جۆرە تا دەڕوات، عەرەب بەهۆی پێغەمبەرەوە شەرەفمەندبوون، ئەگەر هەندێکمان بە باوباپیرانێکی زۆرو ئەوەی لە نێوانماندایە پێی بگەین تا دەگەینە وەچەو نەسەبی دواتر تا ئادەم لێی جیابینەوە تەنها لە چەند باپیرێکی کەمەوە نەبێت، لەگەڵ ئەمەشدا سوێند بەخوا ئەگەر عەجەمەکان کاربکەن و ئیمەش بێکاربین ئەوان لە ئێمە لە موحەممەد نزیکترین لە ڕۆژی دواییدا، ئیتر با کەس نەڕوانێتە نزیکی و بە ویستی خوا کاربکات، چونکە هەرکەس کەموکورتی لە کاریدا هەبێت وەچەونەسەبی پێشی ناخات.

## (گەڕانەوەی عومەر(رضي الله عنه) بۆ ڕای ئەبوبەکرو عەلی (رضي الله عنهما) لە دابەشکردندا)

بەزار لە عومەری کوڕی عەبدوڵلای مەولای غەفرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە بەحرەینەوە سامانێك هات بۆ ئەبوبەکر – ئینجا وەك پێشتر هێنامان بە دوورو درێژی فەرموودەکە دێنێت – تیایدا هاتووە: ڕۆژی هەینی – عومەر – هاتە دەرەوە و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و وتی: قسەیەکتان بیستووە دەڵێت ئەگەر عومەر – یان ئەگەر ئەمیری باوەڕداران – بمردایە فلان کەسمان دادەنا و بەیعەتمان پێدەدا، دانانی ئەبوبەکر کتوپڕبوو، بەڵێ، سوێند بەخوا کتوپڕبوو، ئێمە نموونەی وەك ئەبوبەکرمان لە کوێ بوو تا گەردنی بۆ کەچ بکرێت وەك چۆن بۆ ئەبوبەکر گەردنمان کەچ کرد. ئەبوبەکر ڕای دابەشکردنی یەکسانی هەبوو، من ڕای جیاکردنەوەو پلەبەندیم هەبوو، ئەگەر بۆ ئەم ساڵی دواتر بژیم دەگەڕێمەوە بۆ ڕاکەی ئەبوبەکر، ڕاکەی ئەو لە ڕاکەی من باشتربوو، – ئینجا فەرموودەکە دێنێت[1].[2]

## (عومەر(رضي الله عنه) سامان دەبەخشێت)

ئیبن سەعد ج٤ ص٢٠ لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: لە بەیتولمالی عومەردا پاش دابەشکردنی بەسەر خەڵکدا شتێك مایەوە، عەبباس بە عومەرو خەڵکی وت: پێتان چۆنە ئەگەر مامی موسا(علیە السلام) لە ناوتاندا بوایە ڕێزتان دەگرت؟ وتیان: بەڵێ، دەی من لەو لە پێشترم، من مامی پێغەمبەرەکەتانم، عومەر خەڵکی نواندا ئەوانیش ئەو زیادەیان پێدا کە مابوویەوە.

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئەبومەعشەر نەجیح هەیە کە لاوازە کار بە فەرموودەی دەکرێت.

ئەبویەعلا لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی چەکمەجەیەك هات بۆ عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) ئەویش سەیری هاوەڵانی کرد تا بزانێت بە کێی بدەن، وتی: مۆڵەت دەدەن بینێرم بۆ عائیشە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوی خۆشدەویست؟ وتیان: باشە، ئەویش بردی بۆ عائیشە، ئەویش کردیەوە وترا ئەمە عومەری کوڕی خەتتاب بۆی ناردوویت. وتی: دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چی ڕوویکردووەتە عومەر؟ خوایە قبوڵیم بۆ بەخششی مەهێڵەرەوە.[1]

ئیبن سەعد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لەسەر سەدەقە داینام، منیش چووم و ئەبوبەکر مرد، عومەر وتی: ئەی ئەنەس هیچت بۆ هێناوین؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەوەت بۆ هێناوین - ئاژەڵ - و سامان بۆ تۆ. وتم: لەوە زیاترە، وتی: ئەگەر ئەوەش بۆ تۆ بێت، پارەکە چوار هەزار بوو، من لە خەڵکی مەدینە دەوڵەمەندترین بووم.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٣ ص٣٥٥ لە عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خەڵك لەبەردەم عومەردا پشکی خۆیان برد سەری بەرزکردەوە و سەیری کابرایەکی کرد پێکرانێك بە ڕووخسارییەوە بوو، پرسیاری لێکرد و ئەویش پێی وت لە غەزایەکدا وای لێهاتووە، وتی: هەزاری بۆ بژمێرن، هەزار درهەمی دا بە کابرا، پاشان ماوەیەك وەستا و پارەکەی کەنار خست، ئینجا وتی: هەزاری بۆ بژمێرن، هەزاری تری دا بە کابرا، چوار جار ئەوەی کرد، کابرا لە زۆری ئەوەی پێی بەخشرا شەرمی کرد و دەرچوو، وتی: پرسیاری لێکرا پێی وترا ئێمە بینیمان کابرا لە زۆری بەخشینەکەی شەرمی دەکرد و دەرچوو، عومەر وتی: سوێند بە خوا ئەگەر بمایەتەوە هەتا درهەمێك بمایە هەر پێمدەدا، کەسێك لەپێناو خوادا لێی بدرێت ڕووخسار سپییە.

[1] - هەیسەمی ج٦ ص٦ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن.

[2] - لە کنز العمال ج٣ ص١٤٨ دا واهاتووە.

## (عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) سامان دابەش دەکات)

ئەبوعوبەید لە(الاموال) لە عەلیەوە هێناویەتی لە ساڵێکدا سێ جار بەخشینی هەبوو پاشان لە ئەسبەهانەوە پارەیەکی بۆ هات وتی: بەیانی بۆ بەخشینی چوارەم بێین، من خەزنی ناکەم بۆتان، پەتەکانی دابەشکردو هەندێك وەریان گرت و هەندێکیش وەریان نەگرت.[1]

## (عەلی و عومەر(رضي الله عنهما) چی لە بەیتولمالدایە دابەشی دەکەن)

بەیهەقی ج٦ ص٣٥٧ لە یەحیای کوڕی سەعید لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی وت: بەیتولمالی موسڵمانان هەموو مانگێك جارێك دابەش بکە، هەموو هەینیەك جارێك دابەشی بکە، دوایی وتی: هەموو ڕۆژێك دابەشی بکە، دەڵێت: یەکێك هەستا و وتی: ئەمیری باوەڕداران بەڵکو ئەوەی لە ماڵ و سامانی موسڵمانان ماوە بیهێڵیتەوەو بۆ سەختیەك یان دەرچوونێك، عومەر بە کابرای وت: شەیتان لەسەر زمانتە، خوای گەورە بەڵگەکەی پێ داوم و لە خراپەی پاراستوومی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چی بۆ ئامادەکرد منیش ئەوەی بۆ ئامادە دەکەم گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەیم.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٤٥ لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە عێراقەوە پارەیەك هات بۆ عومەرو ئەویش کەوتە دابەشکردنی، کەسێك هەستا و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بەڵکو بیهێڵیتەوە بۆ کاتی دوژمنایەتیەك کە دوژمن بێت یان سەختیەك کە بێت. عومەر وتی: چیتە خوا بتکوژێت، شەیتان لەسەر زمانت قسەدەکات، خوای گەورە بەڵگەی ئەوەی پێ داوم، سوێند بە خوا ئەمڕۆ لە فەرمانی خوا لانادەم، نا، بەڵام پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چی بۆ ئامادەکردین منیش خۆمی بۆ ئامادە دەکەم.

---

[1] - لە کنزالعمال ج٢ ص٣٢٠ دا واهاتووە.

ئیبن عەساکیر لە سەلەمەی کوڕی سەعیدەوە هێناویەتی دەڵێت: پارەیەك هێنرا بۆ عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف هەستاو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی لەو سامانە لە بەیتولمال ناهێڵیتەوە بۆ تەنگانە یان ڕووداوێکی کتوپڕ ئەویش وتی: ئەم قسە تەنها هی شەیتانە، خوای گەورە بەڵگەی پێداوم و لە شەڕی پاراستوومی، ساڵێك خوا یاخی بم لە ترسی شتێکی هاتوو، لە خوا ترسییان بۆ ئامادەدەکەم، خوا دەفەرمویت(ومن یتق الله یجعل له مخرجا و یرزقه من حیث لایحتسب) دەبێتە ئاشوب بۆ ئەوەی دواترم.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٥ لە حەسەنەوە دەڵێت: عومەر نووسی بۆ حوزەیفە(رضي الله عنه) بەخشش و ڕۆزی خەڵك بدە، ئەویش بۆی نووسی وامانکردووەو زۆرێکیشی لێ ماوەتەوە، عومەر بۆی نووسی ئەوە پشکەیە کە خوا پێیداون، ئەوە هی عومەرو بنەماڵەی عومەر نیە، دابەشی بکە بەسەریاندا.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٨١ لە عەلی کوڕی ڕەبیعەی والبیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن نەباج هات و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بەیتولمالی موسڵمانان پڕبووە، ئەویش وتی: الله اکبر هەستایە سەرپێ و دەستی گرت بە ئیبن نەباجەوە تا چوو بۆ لای بەیتولمالی موسڵمانان و وتی:

هذا جنائي و خیاره فیه          و کل جان یده الی فیه

ئەی ئیبن نەباج ئادەی خەڵکی کووفەم بۆ کۆبکەرەوە لەناو خەڵکدا هاوارکراو چی لە بەیتولمالدا بوو هەمووی بەخشی و دەیوت: ئەی زەردو سپی(هەموو شتەکان) کەسی تر لە خشتەبەرن نەوەك من. بەو جۆرە تا هیچ دینارو درهەمێکی تێدا نەما، دواتر فەرمانی کرد پاك بکرێتەوەو دوو ڕکات نوێژی تێدا کرد.

لە موجەمیعی تیمیەوە دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) گسکی بەیتولمالی دەداو تیایدا نوێژی دەکردو دەیکردە مزگەوت لە پێناو ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا شایەتی بۆ بدات.[2]

---

[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣١٩ دا واهاتووە.

[2] – ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج٣ ص٤٩ لە موجەمیعی تەیمیەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

لە موعازی کوڕی عەلا لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەڵێت: گوێم لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب بوو دەیوت: لەو فەیئو بەشەی هەتانە تەنها شووشەیەکم هەیە کە دیهقان پێشکەشی کردم دواتر چوو بۆ بەیتولمال و چی تێدابوو دابەشی کردو دواتر دەیوت: هەرکەس قاپە خورمای هەبێت و ڕۆژانە لێی بخوات سەرکەوتوو و براوەیە.

لە عەنتەرەی شەیبانیەوە دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) لە سەرانەو خەراجی خەڵکی هەر خاوەن شوێن و پیشەیەك دەبرد تا لە سوژن کارو خاوەن پەت و گوریس هەمان شتی وەرنەدەگرت، پاشان لەنێو خەڵکدا دابەشی دەکرد، لە بەیتولمالدا چی بوایە دابەشی دەکرد بەبێ ئەوەی شەو بێت مەگەر سەرقاڵیەکی بوایە شەوی بەسەردا دەهات و بەیانی دابەشی دەکرد بەبێ ئەوەی دنیا من لە خشتەمەبەو بڕۆ جگە لەمن لە خشتەببە. ئەم شعرەی دەوت:

هذا جنائي و خياره فيه        و كل جان يده الى فيه

ئەبوعوبەیدە لە عەنتەرەوە دەڵێت ڕۆژێك چووم بۆ لای عەلی(رضي الله عنه) قەنبەر هات بۆ لای و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ کەسێکیت هیچ ناهێڵیتەوەو کەسوکاری خۆشت لەو سامانەدا پشکیان هەیەو منیش شتێکم بۆ شاردوویتەتەوە. وتی: چیە؟ وتی: دەی وەرە تا بزانیت چیە. بردیە ماڵێکەوە کە بەرگێکی گەورەی پڕ قاپوقاچاخی زێڕیان تێدابوو، کە عەلی ئەوەی بینی وتی: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، دەتەوێت ئاگرێکی گەورە ببەیتە ماڵەوە؟ پاشان دەیپێواو بەهەر شەرەفمەنێك پشکێکی دەداو دەیوت:

هذا جنائي و خياره فيه        و كل جان يده الى فيه

من لە خشتە مەبەو جگە لە من لە خشتەببە.[1]

[1]- لە منتخب كنز العمال ج٥ ص٥٧ دا واهاتووە، ئەحمەد لە(الزهد) و موسەددەدا لە موجەمعیەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە المنتخب ج٥ ص٥٧ دا واهاتووە.

# (ڕای عومەر(رضي الله عنه) لەسەر مافی موسڵمانان لە بەیتولمالدا)

بەیهەقی ج٦ ص٣٥١ لە ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: گویم لە عومەر(رضي الله عنه) بوو دەیوت: بۆ ئەم سامانە کەس کۆبکەنەوەو بزانن کێ شیاویەتی، پاشان پێی وتن: من فەرمانم پێ کردوون بۆ ئەم سامانە کەس کۆبکەنەوەو بزانن کێ شیاوە، من چەند ئایەتێکی قورئانم خوێندەوە بیستم خوا دەیفەرموو(ما افاء الله على رسوله من اهل القرى فلله ةللرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل كي لايكون دولة بين الاغنياء منكم وما اتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا واقتوا الله ان الله شديد العقاب. للفقراء المهاجرين الذين اخرجوا من ديارهم واموالهم يبتغون فضلا من الله ورضوانا وينصرون الله ورسوله اولئك هم الصادقون) سوێند بە خوا تەنها بۆ ئەوانە نیە(والذين تبوؤا الدار والايمان من بعدهم يحبون من هاجر اليهم ولايجدون في صدورهم حاجة مما اوتوا ويؤثرون على انفسهم ولوكان بهم خصاصة) سوێند بە خوا بۆ ئەوانەش نیە(والذين جاءوا من بعدهم) سوێند بە خوا هەر موسڵمانێك لەو سامانەدا پشکی هەیە پێی درابێت یان پێی نەدرابێت تەنانەت ئەگەر شوانێکی ناوچەی عەدەنیش بێت، هەروەها ج٦ ص٣٥٢ لە مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدسانەوە لە باسی چیرۆکێکدا هێناویەتی ئەم ئایەتەی خوێندەوە(انما الصداقات للفقراء و المساكين.... تا کۆتایی ئاساییەکە) وتی: ئەمە بۆ ئەوانە. ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە(و علموا انما غنمتم.... تا کۆتایی ئایەتەکە) پاشان وتی ئەوە بۆ ئەوانە، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە(ما افاء الله على رسوله..... تا کۆتایی ئایەت)، پاشان ئەمەی خوێندەوە(للفقراو المهاجرين..تا کۆتایی ئایەتەکە). پاشان وتی: ئەوانە کۆچەران بوون، ئینجا ئەمەی خوێندەوە(والذين تبوؤ الدار.... تا کۆتایی ئایەتەکە) وتی: ئەمە پشتیوانانن. وتی(والذين جاؤا من بعدهم..... تا کۆتایی ئایەتەکە). وتی: ئەمە خەڵکی لێی تێبگات هیچ موسڵمانێك نەماوە لەم سامانەی هەتانە تەنانەت کۆیلەشتان بەشی

هەیە تیایدا. ئەگەر بژیم – بە ویستی خوا – هیچ موسڵمانێك نابێت مەگەر ئەوەی ماڤ خۆی پێبدرێت، تەنانەت شوانێك لە(سرو) و(حمیر) دەبێت ماڤ خۆی بگاتە دەستو تیایدا تەوێڵی عارەق نەکات، ئیبن جەریر لە مالیکی کوڕی ئەوسەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص٣٤٠ دا واهاتووە.

## (تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا(رضي الله عنه) سامان دابەش دەکات)

تەبەرانی بە سەنەدی حەسەن لە تەلحەی کوڕی یەحیا لە دایەگەورەیەوە(سوعدا) رضي الله عنها دەڵێت: ڕۆژێك چووم بۆ لای تەلحە – مەبەستی تەلحەی کوڕی عوبەدوڵڵایە – سەیرم کرد بارگرانیەکی پێوە دیارە، پێموت چیتە؟ پێدەچێت لەبەر ئێمە ماندوو و هیلاك بیت، وتی: بە ڕاستی تۆ نمونەی ئافرەتی موسڵمانیت، بەڵام بڕێك سامانم لا کۆبوەتەوەو نازانم چی پێ بکەم، وتی: دەی بۆچی پێی بێتاقەت دەبیت ئەو خەڵکە بانگ بکەو لە نێوانیاندا دابەشی بکە، وتی: ئەی غوڵام ئادەی ئەو خەڵکەم بۆ بانگ بکە پرسیارم کرد لە خەزنەدار کە چەندی دابەشکرد؟ وتی: چوار سەد هەزار.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٨٩ لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: تەلحە(رضي الله عنه) زەویەکی بە حەوت سەد هەزار فرۆشتو شەوێك ئەو پارەی لامایەوە ئەو شەوە لە ترسی ئەو سامانە تا بەیانی نەخەوت، کە بەیانی هات دابەشیکرد بە سەر خەڵکدا.[2]

حاکم ج٣ ص٣٧٨ لە سوعدای ژنی تەلحەوە(رضي الله عنهما) هێناویەتی دەڵێت: تەلحە هات بۆ لام و سەیرم کرد دڵگرانە وتم: بۆچی بە ڕووخسار گرژی

---

[1] – لە الترغیب والترهیب ج٢ ص١٧٦ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٩ ص١٤٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێمتمانەن، ئیبن سەعد ج٣ ص١٥٧ و ئەبونەعیمیش ج١ ص٨٨ بە هەمان شێوە هێناویانە.

[2] – ئیبن سەعد ج٣ ص١٥٧ بە دوورو درێژی هێناویەتی.

دەتبینم؟ لە شتێکی ئێمە بێزاربوویت؟ وتی: نەبەخوا تۆ هیچ بێزارت نەکردووم، بە ڕاستی تۆ هاوەڵێکی باشیت، بەڵام پارەیەکم لا کۆبووەتەوە، وتی: دەی بینێرە بۆ کەس و خزمانت و لە نێوانیاندا دابەشی بکە. ئەویش وایکرد، پرسیارم کرد لە خەزنەدار کە چەندی دابەشکرد. وتی: چوار سەد هەزار بوو، دەڵێت پێی دەوترا(تەلحەی فەیاض).

## (زوبەیری کوڕی عەوام(رضي الله عنه) سامان دابەش دەکات)

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٩ لە سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیزەوە هێناویەتی دەڵێت: زوبەیری کوڕی عەوام(رضي الله عنه) هەزار مەملوکی هەبوو کە خەراجیان پێدەدا. ئەویش هەموو شەوێك دبەشی دەکرد و دواتر دەچوویەوە بۆ ماڵەوە و هیچی پێ نەبوو.

لە موغیسی سمیەوە دەڵێت: زوبەیر هەزار مەملوکی هەبوو کە خەراجیان پێدەدا، لەو خەراجەیان درهەمێکیشی نەدەچوویە ماڵیەوە.[1]

بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە دەڵێت: کاتێك زوبەیر لە ڕۆژی شەڕی جەمەل بانگی کردم لە پاڵی وەستام، وتی: کوڕی شیرینم ئەمڕۆ وەی دەکوژرێت یان ستەمکارە یان ستەم لێکراوە، من وایدەبینم ئەمڕۆ بە ستەملێکراوی دەکوژرێم، لە گەورەترین غەم و پەژارەم بۆ ئایینە، قەرزەکەمان ڕێمان پێدەدات لە سامانمان هیچی بمێنێت، وتی: کوڕی شیرینم ماڵ و سامانمان بفرۆشە و قەرزەکەم بدەرەوە، وەسیەتی کرد سێ یەکی و بۆ کوڕەکانیشی سێ یەکی - واتە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر - دەیوت سێ یەك سێ یەك، ئەگەر دوای دانەوەی قەرزەکە هیچی لێ مایەوە سێیەکی بۆ کوڕەکەت، هیشام دەڵێت: لە کوڕانی عەبدوڵڵاخوبەیب و عەباد

---

[1]- بەیهەقی ج٨ ص٩ لە موغیسەوە بەو جۆرە هێناویەتی، یەعقوبی کوڕی سوفیان بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابة ج١ ص٥٤٦ دا هاتووە.

هاوته‌مه‌نی هه‌ندێ له‌ کوڕانی زوبه‌یر بوون، ئه‌و ڕۆژ نه‌ کوڕو نه‌ کچی هه‌بوو، عه‌بدوڵلا ده‌ڵێت: له‌سه‌ر قه‌رزه‌که‌ی وه‌سیه‌تی بۆ ده‌کردم‌و ده‌یوت کوڕی شیرینم ئه‌گه‌ر نه‌تتوانی بیده‌یته‌وه‌ داوای یارمه‌تی له‌ مه‌ولاکه‌م بکه‌، وتی: سوێند به‌ خوا نه‌مزانی چی ویست تا ئه‌وه‌ی وتم: بابه‌کیان مه‌ولاکه‌ت کێیه‌؟ وتی: خوا، سوێند به‌ خوا هه‌ر سه‌ختیه‌ك هاتبێته‌ ڕێم له‌ ئایینه‌که‌یدا وتوومه‌ ئه‌ی مه‌ولای زوبه‌یر قه‌رزه‌که‌ی بده‌ره‌وه‌. ئه‌ویش داویه‌تیه‌وه‌ زوبه‌یر کوژراو هیچ دینارو درهه‌مێکی به‌جێ نه‌هێشت جگه‌ له‌ دووپاچه‌ زه‌وی – له‌وانه‌ یه‌کێکیان باخ بوو – له‌گه‌ڵ یانزه‌ خانووی ناو مه‌دینه‌و دوو خانووی مه‌دینه‌و دوو خانووی به‌سره‌ و خانوویه‌کی کووفه‌و خانوویه‌کی میسر، ئه‌و قه‌رزه‌ی له‌سه‌ربوو ئه‌وه‌بوو کابرا سامانی بۆ ده‌هێناو ماڵئاوایی لێ ده‌کرد، زوبه‌یر ده‌یوت تا به‌ڵام پێشینه‌یه‌، من ده‌ترسم ون بێت، هیچ به‌رپرسیارێتی‌و کۆکردنه‌وه‌یه‌کی سامان‌و کارێکی نه‌ده‌گرته‌ ئه‌ستۆ مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی له‌ غه‌زایه‌کدا بووبێت له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) یان له‌گه‌ڵ ئه‌بوبه‌کرو عومه‌ر و عوسمان(رضي الله عنهم)، عه‌بدوڵلای کوڕی زوبه‌یر ده‌ڵێت: قه‌رزه‌که‌یم ژمارد سه‌یرمکرد دوو ملیۆن‌و دوو سه‌د هه‌زاره‌، ده‌ڵێت: حه‌کیمی کوڕی حیزام گه‌یشت به‌ عه‌بدوڵلای کوڕی زوبه‌یر، وتی: برازاگیان براکه‌م چه‌ند قه‌رزی له‌سه‌ربوو؟ ئه‌ویش پێی نه‌وت‌و وتی: سه‌د هه‌زار، حه‌کیم وتی: سوێند به‌ خوا بڕوام نیه‌ پاره‌و سامانتان به‌شی ئه‌و قه‌رزه‌ بکات، عه‌بدوڵلا پێی وت: ئه‌ی ده‌ڵێیت چی ئه‌گه‌ر دوو ملیۆن و دوو سه‌د هه‌زار بێت؟ وتی: بڕواناکه‌م ده‌ره‌قه‌تی بێن، ئه‌گه‌ر یه‌کتان که‌وت پێم بڵێن زوبه‌یر باخێکی به‌ سه‌دو حه‌فتا هه‌زار کڕیبوو عه‌بدوڵلا فرۆشتی به‌ یه‌ك ملیۆن‌و شه‌ش سه‌د هه‌زار، دواتر هه‌ستا و وتی: کێ قه‌رزی لای زوبه‌یره‌ با له‌ به‌رامبه‌ریدا ئه‌و باخه‌ وه‌ربگرێت، عه‌بدوڵلای کوڕی جه‌عفه‌ر – که‌ چوار سه‌د هه‌زار قه‌رزی لای زوبه‌یر بوو – به‌ عه‌بدوڵلای وت: ئه‌گه‌ر ده‌تانه‌وێت به‌جێی دێڵم بۆتان عه‌بدوڵلا وتی: نا وتی: ئه‌گه‌ر ده‌تانه‌وێت دوای ده‌خه‌م بۆ هه‌ر کاتێ ئێوه‌ بتانه‌وێت عه‌بدوڵلا وتی: نا، وتی: ده‌ی پارچه‌یه‌کی بده‌ن به‌ من عه‌بدوڵلا

وتی: لێرەوە تا ئەویّ بۆ تۆ، دەڵێت: ئەوەی لیّ فرۆشتو قەرزەکەی پیّ دایەوەو بەشی کردو چوار پشكو نیوەیشی لیّ مایەوە، هات بۆ لای موعاویەو عەمری کوڕی عوسمانو مونزیری کوڕی زوبەیرو ئیبن زەمعەی لەگەڵدا بوو موعاویە پێی وت: بە چەند باخەکەت فرۆشت؟ وتی: بۆ هەر پشکێك سەد هەزار وتی: چەندی لیّ مایەوە؟ وتی: چوار بەشو نیو مونزیری کوڕی نەزیر وتی: پشکێکم بە سەد هەزار دەوێت، عەمری کوڕی عوسمان وتی: پشکێکم بە سەد هەزار دەوێت ئیبن زەمعەش ئەوەی وت: موعاویە وتی: چەندی ماوەیتەوە؟ وتی: پشكو نیوێك، وتی: بە سەدو پەنجا هەازر دەمەوێت، دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر بەشەکەی خۆی بە شەش سەد هەزار لای موعاویە فرۆشت، کە ئیبن زوبەریر لە دانەوەی قەرزەکەی لێبوویەوە بەنوزوبەیر وتیان: میراتەکەمان لە نێواندا دابەش بکە، وتی: نەبەخوا لە نێوتاندا دابەشی ناکەم تا لە کاتی حەجدا چوار ساڵ هاوار بکەم: خەڵکینە کیّ قەرزی لای زوبەیرە با بێت بۆ قەرزەکەی، دەڵێت: هەموو سیّ یەکی هەبوو، هەرکام لەو ئافرەتانەش دوو ملیۆنو دوو سەد هەزاریان بەرکەوت هەموو پارەکەی پەنجا ملیۆنو دوو سەد هەزار بوو، ئیبن کەسیر لە البداية والنهاية ج٧ ص٢٤٩ دا دەڵێت: هەموو ئەو پشکەی بە میرات لە نێوان میراتگراندا دابەشکرا سیو هەشت ملیۆنو چوار سەد هەزار بوو سیّ یەکی جیّ وەسیەتەکەشی نۆزدە ملیۆنو دوو سەد هەزار بوو، کۆی هەمووی پەنجاو حەوت ملیۆنو شەش سەد هەزار بوو، ئەو قەرزەی پێشتر درایەوە دوو ملیۆنو دوو سەد هەزار بوو، بەمە ئەوەی بە قەرز و وەسیەتو میراتەوە بەجیّ هێشت پەنجاو نۆ ملیۆن و هەشت سەد هەزار بوو ئەمەمان بۆیە هێنا چونکە لە صەحیحی بوخاریدا هەیەو ڕوانینێکی لەسەرەو دەبێت ئاگاداری بین.[1]

---

[1] – ضعيف.

## (عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه) سامان دابەش دەکات)

حاکم ج٣ ص٣١٠ لە ئوم بەکری کچی میسوەرەوە هێناویەتی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه) زەویەکی بە چل هەزار دینار کڕی، لەناو بەنی زەهرەو هەژارانی موسڵمانان و کۆچەران و ژنانی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) دابەشی کرد لەو سامانە بڕێکی نارد بۆ عائیشە؟ ئەویش وتی: کێ ئەمەی نارد؟ وتم: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف، چیرۆکەکەی گێڕایەوە، عائیشە وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لایحنو علیکن من بعدي الا الصابرون) واتە(لە دوای من تەنها خۆڕاگران سۆزیان دەبێت بۆتان(خێزانەکانی)) خوای گەورە لە ئاو و کانیاوی بەهەشت عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف تێر ئاو بکات.[1] ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٩٩ لە جەعفەری کوڕی بەرقانەوە هێناویەتی دەڵێت: بیستم عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف سی هەزار ماڵی ڕزگارکرد(یارمەتیدان و ئاگای لێیان بوو).

## (ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح و موعازی کوڕی جەبەل و حوزەیفە(رضي الله عنهم) سامان دابەش دەکەن)

تەبەرانی لە المعجم الکبیر لە مالیکودارەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) چوار سەد دیناری هەڵگرت و خستیە کیسەیەك و دای بە غولامێك و وتی: بیبە بۆ ئەبوعوبەیدەی جەڕاح و دواتر لە ماڵەوە ماوەیەك لەگەڵی بمێنەرەوە تا بزانیت چی دەکات، ئەویش چوو و وتی: ئەمیری باوەڕداران دەڵێت ئەمە بۆ

---

[1] – حاکم دەڵێت ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت: موتەصیل نیە ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٩٨ و ئیبن سەعد ج٣ ص٩٤ لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە بەو جۆرە هێناویانە بەڵام لە گێڕانەوەکەی ئەبونەعیمدا واهاتووە(لن یحنو علیکم بعدي الا الصابرون) حاکم ج٣ ص٣٠٨.

پێویستی خۆت بەکاربهێنە، وتی: خوا ڕەحمەتی بەسەردا دابارێنێ، پاشان وتی: ئەی کەنیزەك وەرە، ئەم حەوتە ببە بۆ فلان‌و ئەوە بۆ فلان تا هەمووی تەواوکرد، غولامەکە گەڕایەوە بۆ لای عومەرو پێی وت: چی کردووە، عومەر بە هەمان شێوە ناردی بۆ مەعازی کوڕی جەبەل و هەمان فەرمانی پێکرد، ئەویش بردی بۆی‌و پێی وت: ئەمیری باوەڕداران پێت دەڵێت: ئەمە بۆ برێ پێویستیت بەکاربهێنیت، ئەویش وتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئەی کەنیزەك وەرە، ئەمە ببە بۆ ماڵی فلان‌و ئەوەندە ببە بۆ ماڵی فلان، ئەو کات ژنەکەی موعاز دەرکەوت‌و وتی: ئێمەش – بەخوا – هەژارین بەشمان بدە، کە چی تەنها دوو دیناری تێدا مابوو، موعاز ئەو دوو دینارەی بۆ فڕێدان، غولامەکە گەڕایەوە بۆ لای عومەرو پێی وت چی بووە، عومەر بەوە دڵخۆش بوو و وتی: ئەوانە برای یەکترن، گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودە تا مالیکودار جێمتمانە‌و ناسراون، مالیکوداریش ناناسم.[1]

[1]- لە الترغیب والترهیب ج٢ ص١٧٧ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٣ص١٢٥ دەڵێت: تەبەرانی لە المعجم الکبیر هێناویەتی و مالیکودار ناناسم‌و کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو. دەڵێم: لە الاصابة ج٣ ص٤٨٣ دا ئیبن حەجەر هێناویەتی‌و دەڵێت: مالیکی کوڕی عیاضي مەولای عومەرە کە پێی دەوترا مالیکودار، شارەزایی‌و بیرتیژی هەبوو و فەرموودەکەی لە ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) بیستووە. لە هەردوو شەیخی زانا موعازو ئەبوعوبەیدەشەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، هەردوو کوڕەکەشی عەون‌و عەبدوڵڵا فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە، هەروەها ئەبوصاڵحی سمان فەرمووی لێ گێڕاوەتەوە، ئیبن سەعد لە چینی یەکەمی تابیعینی مەدینەدا ناوی هێناوە‌و دەڵێت: ناسراو بووە، عەلی کوڕی مدینی دەڵێت: مالیکودار خەزنەداری عومەر بووە، تەواو. لە الاصابة دەڵێت: لە(فوائد داود بن عمر الضبي جمع البغوي) لە ڕێگەی عەبدولڕەحمانی کوڕی سەعیدی کوڕی یەربووعی مەخزومی لە مالیکودارەوە هێناویانە – بە هەمان شێوە دەیهێنێت – ئیبن سەعد ج٣ ص٣٠٠ لە میعەنی کوڕی عیساوە هێناویەتی دەڵێت: پێشنیارمان بۆ مالیکی کوڕی ئەنەس – بەو جۆرە بە کورتی دەیهێنێت–.

بوخاری لە(التاریخ الصغیر) ص٢٩ لە زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بە هاوەڵاتی وت: هیوا بخوازن، یەکێکیان وتی: هیواو ئاواتم ئەوەیە پڕی ئەم ماڵە درهەمم هەبێت لە ڕێی خوادا ببەخشم، وتی: ئاوات بخوازن، یەکێکی دی وتی: هیواو ئاواتم ئەوەیە ئەم ماڵە پڕ گەوهەر بێت – یان شتێکی لەو جۆرە – تا لە ڕێی خوادا ببەخشم، عومەر وتی: هیوا بخوازن، وتیان: دوای ئەوە ئاواتمان نیە. عومەر وتی: بەڵام من ئاواتم ئەوەیە پڕی ئەم ماڵە کەسی وەك ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح و موعازی کوڕی جەبەل و حوزەیفەی کوڕی یەمانم هەبێت تا لە گوێڕایەڵی خوادا کاریان پێ بسپێرم، پاشان پارەیەکی نارد بۆ حوزەیفە، وتی: بزانە چی دەکات، دەڵێت: کە بۆی برد دابەشی کرد، دواتر پارەیەکی نارد بۆ موعازی کوڕی جەبەل ئەویش دابەشی کرد، پاشان پارەیەکی نارد بۆ ئەبوعوبەیدە وتی: بزانە چی دەکات، عومەر وتی: من پێم وتن – یان دەربڕینێکی لەو شێوەیە –.

## (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنه) سامان دابەش دەکات)

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٩٦ لە مەیمونی کوڕی مهرانەوە هێناویەتی دەڵێت: بیست و دوو هەزار دینار هات بۆ ئیبن عومەر کە لە کۆڕێکدا دانیشتبوو، لە شوێنی خۆی هەڵنەسا تا هەمووی دابەشکرد.

نافع هێناویەتی موعاویە سەد هەزاری نارد بۆ ئیبن عومەر، ئەویش بە خێرایی هەمووی بەخشی و هیچی لانەما.

ئەیوبی کوڕی وائیلی ڕاسبی دەڵێت: چووم بۆ مەدینە و کابرایەکی دراوسێی ئیبن عومەر پێی وتم: لەلایەن موعاویەوە چوار هەزار و لەلایەن کەسێکی دیکەوە چوار هەزار و لەلایەن کەسێکی دیکەشەوە دوو هەزار و میوەیەك هات بۆ ئیبن عومەر، ئەویش هاتە بازاڕو ئاڵفی بۆ وڵاخەکەی دەویست و درهەمێکی کەم پێی

بوو، زانیم ئەوەی بۆ هاتووە، چووم بۆ لای و وتم: دەمەوێت لەسەر شتێك پرسیارت لێ بکەم و حەزدەکەم ڕاست وەڵامم بدەیتەوە، وتم: مەگەر لەلای موعاویەوە چوار هەزار و لەلای کەسێکی دیکەوە چوار هەزارو لەلای کەسێکی دیکەشەوە دوو هەزارو قەیفەیەکی بۆ ئەبوعەبدولڕەحمان نەهات؟ وتی: با، وتم: دەی من بنیم بە پارەیەکی کەمەوە بۆ ئالف دەگەڕا، وتی: هێندەی نەبرد تا دابەشیکرد، قەیفەکەی هەڵگرت و خستیە سەر پشتی و دواتر چوو و بردیو هاتەوە، وتم: ئەی کۆمەڵی بازرگانان چی دەکەن بە دنیا لە کاتێکدا ئیبن و عومەر دوێنێ دە هەزار درهەمی دروستی بۆ هات، کەچی ئەمڕۆ بە درهەمێکی کەمەوە بۆ ئالف دەگەڕا بۆ ولاخەکەی.

ئیبن سەعد ج٤ ص١٠٩ لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت: بیست و ئەوەندە هەزار هات بۆ ئیبن عومەر، ئەویش لە شوێنەکەی هەڵنەسا تا هەمووی بەخشی – ئەوەی بۆ زیادکردووە وتی: بەردەوام دەیبەخشی تا چی لابوو نەما، دوایی هەندێ لەوانەی پێی دەبەخشین هاتن بۆ لای داوای قەرزی لە هەندێ لەوانە کرد کە پێی بەخشیبوون ئەوانیش پێیان بەخشی، مەیمون دەڵێت: کەس هەبوو پێی دەوت: پیسکە، سوێند بەخوا درۆدەکەی لەوەی سوودی بۆ هەبوو پیسکەیی نەبوو.

## (ئەشعەری کوڕی قەیس(رضي الله عنه) سامان دابەش دەکات)

تەبەرانی لە ئەبوئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: قەرزێکم لای کابرایەکی کندە بوو و منیش بەیانیان دەچووم بەلایدا، نوێژی بەیانیم لە مزگەوتەکەی ئەشعەری کوڕی قەیس دەکرد، کە پێشەوا وەڵامی دایەوە لەبەر پێی هەرکەسێکدا جلێك و نەعلێك و پێنج سەد درهەمی دانا، وتم: من خەڵکی ئەم مزگەوتە نیم، وتم: ئەمە چیە؟ وتیان: ئەشعەری کوڕی قەیس لە مەککەوە هاتووە[1].

---

[1] – ضعیف.

## (عائیشەی کچی ئەبوبەکر(رضي الله عنهما) سامان دابەش دەکات)

ئیبن سەعد لە ئوم درەوە هێناویەتی دەڵێت: سەد هەزاریان هێنا بۆ عائیشە(رضي الله عنها) ئەویش هەمووی دابەشکردو ئەو ڕۆژیش بە ڕۆژووبوو، پێموت: ئەرێ لەوەی بەخشیت نەتتوانی بە درهەمێك كەمێك گۆشت بكڕیت تا ڕۆژووی پێ بكەیتەوە؟ وتی: ئەگەر بیرت بخستمایەتەوە دەمكرد.[2]

## (سەودەی کچی زەمعەی دایکی باوەڕداران سامان دابەش دەکات)

ئیبن سەعد بە سەنەدی صەحیح لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر بڕێك پارەی(درهەم) نارد بۆ سەودە(رضي الله عنها)، وتی: ئەمە چیە؟ وتیان درهەمە، وتی: وەك ئەمە داكە لە هی خورما دەچێت؟! دابەشی كرد بەسەر خەڵكەكەدا.[3]

## (دایکی باوەڕداران زەینەبی کچی جەحش (رضي الله عنها) سامان دابەش دەکات)

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٦ لە بەرەی كچی ڕافیعەوە هێناویەتی دەڵێت: كاتێك بەخشش درا عومەر(رضي الله عنه) ئەوەی كە بۆ زەینەب دانرابوو نارد، كە بۆی وتی: خوا لە عومەر خۆش بێت، براكانی دیكەم لە من شیاوترن بەم بەشە، وتیان: ئەمە هەمووی بۆ تۆیە، وتی: سبحان الله، بە جلێك بڕێكی لێ هەڵگرت و وتی: بیبەن و كراسێكی بدەن بەسەردا. دوایی پێی وتم: دەستت ببەرە ناوی و مشتێكی لێ ببەو بیبە بۆ

---

[1] – هەیسەمی د٩ ص٤١٥ دەڵێت: لە سەنەدەكەدا ئیسرائیلی مەولائی هەیە كە ڕاجیاوازی لەسەرە، كەسەكانی دیكەی سەنەدەكە صەحیحن، تەواو.

[2] – لە الاصابة ج٤ ص٤٦١ دا واهاتووە.

[3] – لە الاصابە ج٤ ص٣٣٩ دا واهاتووە.

بەنی فلان و بەنی فلان لەو خزم و هەتیوانەی. تا ئەوەی کەمێکی لە ژێر جلەکەدا مایەوە، پێی وت: ئەی دایکی باوەڕداران خوا لێت خۆش بێت سوێند بە خوا ئێمەش مافمان هەیە تیایدا، وتی: ئەوەی لە ژێر جلەکەیدایە بۆ ئێوە، وتی: لە ژێر جلەکەدا هەشتا و پێنج درهەممان بینی، پاشان دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتی: خوایە دوای ئەم ساڵە بەخششی عومەرم نەگەیەنیتەلا(تەمەنم نەگاتە ساڵێکی تر ئەم کاتە) ئەوە بوو مرد.

هەروەها ئیبن سەعد لە موحەممەدی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی دەڵێت: بەخششی زەینەبی کچی جەحش(رضي الله عنها) دوانزە هەزار بوو تەنها یەك ساڵ وەریگرت، ئەو دەیوت: خوایە ساڵێکی تر نەگەمە ئەمە چونکە فیتنەیە، پاشان لە نێوان خزمان و هەژاراندا دابەشی کرد، عومەر ئەمەی بیستەوەو وتی: ئەوە ئافرەتێکە خێری پێ نیازە، لەسەری وەستا و سەلامی بۆ نارد و وتی: بیستوومە دابەشت کردووە، بۆیە هەزار درهەمی بۆ نارد تالای خۆی بیهێڵێتەوە، ئەویش بە هەمان شێوە بەخشی.[1]

## (بەش برینەوە بۆ لەدایکبوو)

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٧ و ئەبوعوبەیدو ئیبن عەساکیر لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: دەستەیەکی بازرگانان هاتن و لە شوێنی نوێژ دابەزین، عومەر بە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی وت: دەکرێت ئەمشەو لە دەست دزی لێنەکردن پاسەوانیان بیت؟ ئەو شەوە هەردووکیان پاسەوانیان دەکرد و نوێژیان دەکرد هێندەی خوا بۆی نووسیبوون، عومەر گوێی لە گریانی منداڵێك بوو، چوو بەرەو لای گریانەکەو بە دایکی وت: لە خوا بترسەو بەرامبەر کۆرپەکەت باش بە. پاشان گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی و دووبارە گریانەکەی بیستەوەو چوویەوە بۆ لای دایکی و هەمان شتی پێوت و گەڕایەوە، لە کۆتایی شەودا هەمدی گریانی

[1] – لە الاصابة ج٤ ص٣١٤ دا واهاتووە.

کوڕپەکەی بیست و هات بۆ لای دایکی و وتی: قوڕت بەسەر دەبینم دایکێکی خراپیت، بۆچی ئەم کوڕپەت ئەم شەو چاو بەیەکدا نانێت؟ وتی: ئەی بەندەی خوا ئەمشەو سەرکۆنەی زۆرت کردم من لە شیری دەبڕمەوەو ئەویش ئامادەنیە، وتی: بۆچی؟ وتی: چونکە عومەر تەنها بۆ کەسی لەشیر بڕاوە بەشی بڕیوەتەوە. وتی: تەمەنی چەندە؟ وتی: ئەوەندە مانگە، عومەر وتی: قوڕت بەسەر پەلەمەکە لە شیر بڕانەوەیدا، نوێژی بەیانی کردو لەتاو کڵپەی گریاندا خەڵکی لە قورئان خوێندنەوەکەی تێنەدەگەیشتن، کاتێك سەلامی دایەوە وتی: بەدبەختی بۆ عومەر دەبێ چەند منداڵی موسڵمانانی کوشتبێت، دواتر وتی: بانگەواز بکرێت لەشیر براندنەوەی منداڵەکانتاندا پەلەمەکەن چونکە بەشمان بڕیوەتەوە بۆ هەر منداڵێکی موسڵمان کە لە دایك دەبێت، ئەمەشی بۆ هەموو شوێنەکان نووسی(ئێمە بۆ هەر منداڵێکی موسڵمانی لە دایکبوو بەش دەبڕینەوە).[1]

## (پێشکاریی لە بەخشین بۆ خودو نزیکان لە بەیتولمالدا)

ئیبن سەعد ج٣ ص١٩٨ لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کە دەڵێت: سامانی خۆم وەك سامانی هەتیو دەزانم، ئەگەر هێندە پێویستیم پێی نەبێت وەری ناگرم، ئەگەریش ناچاربووم بە دروستی و ڕەوایانە لێی وەردەگرم، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەڵێت: خوای گەورەم لای خۆم وەك سامانی هەتیو داناوە(من كان غنيا فليستعفف ومن كان فقيرا فلياكل بالمعروف).

هەروەها لە عروەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: لەم سامانەدا هێندەم بۆ ڕەوایە کە لە پێویستی خۆم ببەم. لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٤١٨ دا واهاتووە.

[1] - لە كنز العمال ج٢ ص٣١٧ دا واهاتووە.

ئیبن سەعد ج٣ ص١٩٨ لە عیمرانەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ) ئەگەر پێویستی هەبوایە دەچوو بۆ لای بەرپرسی بەیتولمال و قەرزی لادەکرد، هەندێ جار لەسەری سەخت دەبوو بەرپرسی بەیتولمال دەچوو بۆ لای و داوای قەرزەکەی لێدەکردەوە، ئەویش بیانوویەکی بۆ دەهێنایەوە یان مووچەو بەشەکەی خۆی وەردەگرت و قەرزەکەی دەدایەوە.

هەروەها لە ج٣ ص١٩٩ لە ئیبراهیمەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب خەلیفە بوو و بازرگانی دەکرد و کاروانێکی ئامادەکرد بۆ شام و ناردی بۆ لای عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و داوای چوار هەزار دینار قەرزی لێکرد، بە نێردراوەکەی وت پێی بڵێ لە بەیتولمال وەریبگرێت و دواتر بیگێڕێتەوە، کە نێردراوەکە هات بۆ لای پێی وت: چی وتووە، عومەر پێی گەیشت و پێی وت: تۆ وات وتووە، ئەگەر پێش ئەوەی تۆ بێیت بمردمایە دەتانوت ئەمیری باوەڕداران بردوویەتی وازی لێبهێنن بۆی و لە ڕۆژی دواییدا ڕێی پێ دەگیرا، نا، من ویستم لە کەسێکی کۆڵنەدەری چرووکی وەك تۆ وەریبگرم ئەگەر مردم لە سامانی خۆم وەریبگرێتەوە.[1]

ئیبن عەساکیر لە بەرائی کوڕی مەعرورەوە هێناویەتی عومەر(ﷺ) ڕۆژێك دەرچوو تا چوویە مینبەرو سکاڵایەکی کرد، هەنگوینی بۆ نێردراو لە بەیتولمالیشدا هیزەیەك هەبوو، وتی: ئەگەر مۆڵەتم دەدەن دەیبەم ئەگەر نا لێم حەرامە. ئەوانیش مۆڵەتیان دا.[2]

ئەحمەد لە الزهد لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: پارەیەك هێنرا بۆ عومەر(ﷺ) حەفسەی کچی عومەر ئەمەی بیست و هات و وتی: ئەی ئەمیری

---

[1] – ئەبوعوبەیدەش لە الاموال و ئیبن عەساکیر لە ئیبراهیمەوە بەو جۆرە هێناویانە، لە المنتخب ج٤ ص٤١٨ یشدا هاتووە.

[2] – منتخب کنز العمال(ج٤ ص٤١٨).

باوەڕداران ماڤ نزیكانت بدە لەم سامانە، خوای گەورە وەسیەتی كردووە بۆ نزیكان، ئەویش پێ وت: كچی شیرینم ماڤ نزیكەكانم لە سامانی خۆمە بەڵام ئەمە بەشی موسڵمانانە، فێڵ لە باوكت دەكەیت هەستە، ئەویش هەستاو بە شوێن خۆیدا گەڕایەوە.[1]

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەحمەدو ئیبن ئەبی دنیاو ئیبن ئەبی حاتەمو ئیبن عەساكیر لە ئەسلەمەوە هێناویانە دەڵێت: عەبدوڵڵای كوڕی ئەرقەمم دی هات بۆ لای عومەر(رضي الله عنه) و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران جلو بەرگی جەلەولامان هەیە قاپوقاچاخی زیوینمان لایە، بزانە ڕۆژێكت هەیە تا تیایدا فەرمان بكەیت شتێكی لێ بكەین، ئەویش وتی: كە بینیت دەستم بە تاڵ بوو پێم بڵێ، ڕۆژێك هاتو وتی: وادەبینم ئەمڕۆ دەستت بەتاڵە، وتی: بەڵێ، ئادەی بەڕەیەك والاكەنو شتەكەی لەسەر دانێن، تا هاتو لەسەری وەستاو وتی: خوایە تۆ باسی ئەم سامانەت كردووەو فەرمووتە(زین للناس حب الشهوات.......حسن المئاب) هەروەها فەرمووتە(لكیلا تاسوا علی مافاتكم ولاتفرحوا بما اتاكم) ئێمە تەنها دەتوانین دڵخۆش بین بەوەی بۆت جوان كردووین، خوایە وامان لێبكە بە حەق بەكاری بخەین و پەنادەگرم بە تۆ لە خراپەی. وتی: كوڕێكی خۆی هێنا كە پێی دەوترا عەبدولڕەحمانی كوڕی بهیە، وتی: بابەگیان خاتەمێكم بدەرێ، وتی: بڕۆ بۆ لای دایكت تا قاووتت بداتێ، وتی: سوێند بە خوا هیچی پێ نەدا.[2]

ئەحمەد لە الزهد لە ئیسماعیلی كوڕی موحەممەدوە هێناویەتی دەڵێت: میسك و عەنبەر لە بەحرەینەوە هێنرا بۆ عومەرو وتی: سوێند بە خوا حەزدەكەم ئافرەتێكی پێوانەكاری باش پەیدابكەم تا ئەو بۆم بپێوێت بۆ ئێوەی لەنێو موسڵماناندا دابەشی بكەم، عاتیكەی كچی زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نوقەیری ژنی پێ وت: من بۆ ئەوە باشم بۆ چی من نەیكەم؟ وتی: نا، وتی: بۆ چی؟ وتی:

---

[1] – لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٤١٢ دا واهاتووە.

[2] – لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٤١٢ دا واهاتووە.

دەترسم بیکەیت و وای لێبکەیت - پەنجەکانی خستە نێوجانگەکانی - و مل و گەردنی پێ بسڕێت بەوە بەشێکی زیاتر لە موسڵمانان ببەیت.[1]

ئیبن سەعد و ئیبن ئەبی شەیبە و ئیبن عەساکیر لە حەسەنەوە هێناویانە عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) کەنیزەکێکی بینی لەتاو لاوازیدا پێچی دەخوارد؟ وتی: ئەو کەنیزەکە چیە؟ عەبدوڵلا وتی: ئەوە یەکێکە لە کچەکانت، وتی: کام کچمە؟ وتی: کچی من، وتی: بۆ چی وای لێهاتووە؟ وتی: کارەکەی تۆ هیچی پێ نابەخشیت، وتی: ئەرێ بەخوا، بەرامبەر کوڕەکەت چیە؟ دەی بەرامبەر کوڕەکەت تێکۆشە کابرا. المنتخب کنز العمال ج٤ ص٤١٨.

ئیبن سەعد و ئەبوداود ئەبوعوبەید لە الاموال لە عاصمی کوڕی عەمرەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێك عەمەر هاوسەری پێدام ماوەی مانگێك خەرجی لە بەیتولمال پێدام، پاشان یەفای پەردەداری ناردم بۆ لام، چووم بۆ لای، وتی: بەخوا وام نەدەزانی ئەو سامانە بۆم حەڵاڵ بێت ئەوەی بیگرمە دەست مەگەر بە حەقی خۆی نەبێت، کە گرتمە دەست هەرگیز حەرام نەبوو لەسەرم، من خەرجی مانگێکم لە بەیتولمال پێدایت، ئێستا بۆت زیاد ناکەم بەڵکو یارمەتیت دەدەم، ئەویش بە داهاتی سامانی خۆم لە باخدا، بڕۆ بیفرۆشە و دواتر بچۆ بۆ لای یەکێك لە بازرگانانی هۆزەکەت و لە کەناریدا کاربکە، ئەگەر شتێکی کڕی لەگەڵی بەشداربە و داوای خەرجی لێبکە و خەرجی ماڵ و منداڵت بەڕێوەببە.[2]

دەینەوەری لە(المجالسة) لە مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدسانەوە هێناویەتی دەڵێت: پۆستەی پاشای ڕۆم هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) و ژنەکەی عومەری کوڕی خەتتاب قەرزی دینارێکی کرد و بۆنێکی پێ کڕی و خستیە ناو خشڵەوە و لەگەڵ پۆستەکەدا ناردی بۆ ژنی پاشای ڕۆم، کە گەیشتە

---

[1] - لە المنتخب کنز العمال ج٤ ص٤١٣ دا واهاتووە.

[2] - لە المنتخب ج٤ ص٤١٨ دا واهاتووە.

دەستی خاڵی کردو پڕی کرد لە خشڵو وتی: بیبە بۆ ژنەکەی عومەری کوڕی خەتتاب، کە هێنایان بۆی ڕژاندیە سەر جلێك، عومەری کوڕی خەتتاب هاتە ژوورەوە و وتی: ئەمە چیە؟ ئەویش وتی: چی بووە، عومەر خشڵەکەی هەڵگرت و فرۆشتی و دینارێکی دا بە ژنەکەی و ئەوی دیکەی خستە ناو بەیتولمالی موسڵمانانەوە. سەعیدی کوڕی مەنسوورو ئیبن ئەبی شەیبەو بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: وشترێکم کڕیو ناردمە لادێ تا قەڵەو بوو بردم، عومەر هاتە بازاڕو سەیری کرد وشترێکی قەڵەو هەیە، وتی: ئەمە هی کێیە؟ وترا هی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە، ئەویش دەیوت: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر!! بەخ بەخ ئەی کوڕی ئومیری باوەڕداران؟ منیش هاتمو وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران چیتە؟ وتی: ئەم وشترە چیە؟ وتم: ئەمە هی خۆمەو کڕیمو ناردم بۆ ناولەوەڕ تا وەك موسڵمانانی تر هەمبێت، وتی: وشترەکەی کوڕی ئەمیری باوەڕداران بلەوەڕێنن؟ وشتری کوڕی ئەمیری باوەڕداران ئاوبدەن؟ ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بڕۆ سەرمایەکەت وەربگرەوەو ئەوی دیکەی بخەرە بەتولمالی موسڵمانانەوە.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٩ و ئیبن جەریرو ئیبن عەساکیر لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە هێناویانە خزمێکی(زاوایەکی) عومەری کوڕی خەتتاب هات بۆ لای عومەرو داوای لێکرد لە بەیتولمالی موسڵمانان یارمەتی بدات، عومەریش پیایدا هەڵشاخا و وتی: دەتەوێت وەك پاشایەکی ناپاك بچمەوە بەردەم پەروەردگار؟ دوای ئەوە لە سامانی خۆی دە هەزاری پێدا.[2]

ئەبوعوبەید لە عەنتەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە(خەوەرنەق)(شوێنێکی کوفە) چووم بۆ لای عەلی کوڕی ئەبوتالیبو قەیفەیەکی لەسەر بوو لەتاو سەرمادا دەلەرزی، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران خوای گەورە لەم سامانەدا پشکێکی بۆ خۆتو ماڵو منداڵت داناوەو

---

[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤١٩ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال د٢ ص٣١٧ دا واهاتووە.

ئێستاش لەتاو سەرمادا دەلەرزیت!! وتی: سوێند بە خوا هیچ لە ماڵو سامانتان نابەم، ئەم قەیفەش ئەوەیە کە لە ماڵی خۆمەوە هێنراوە، یان وتی: لە مەدینەوە هاتووە.[1]

## (گێڕانەوەی سامان
## (ئەو پارەو سامانەی بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)
## دەخرێتەڕوو دەیگێڕێتەوە)

یەعقوبی کوڕی سوفیان لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: خوای گەورە یەکێك لە فریشتەکانی لەگەڵ جبریل(علیه السلام) دا نارد بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فریشتەکە بە پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) وت: خوای گەورە سەرپشکت دەکات لە نێوان ئەوەی بەندەیەکی پێغەمبەر بیت یان پاشایەکی پێغەمبەر بیت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لایکردەوە بەلای جبریلدا وەك ئەوەی ڕاوێژی پێ بکات، ئەویش ئاماژەی بۆ کرد کە خاکی بە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بل اکون عبدا نبیا) واتە(بەڵکو بەندەیەکی پێغەمبەرم) دوای ئەو قسە بە پاڵدانەوە نانێکی تەواوی نەخوارد تا ئەو کاتەی گەڕایەوە لای خوای گەورە.[2]

تەبەرانی بەسەنەدی حەسەنو بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك لەگەڵ جبریل لەسەر سەفابوون، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(یا جبریل والذي بعثك بالحق ما امسی لال محمد سفة من دقیق و لاکف من سویق) واتە(ئەی جبریل سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ناردووە بنەماڵەی موحەممەد بە مشتێ گەنمو مشتێ ئاردی هاڕاو شەویان نەکردووەتەوە) ئەم قسەی کرد خێرا دەنگێکی بەرز لە ئاسمانەوە هات ترساندی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(امر الله

---

[1]- لە البدایة والنهایة ج٨ ص٣ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٨٢ لە هارونی کوڕی عەنتەرەوە لە باوکیەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

[2]- بوخاری لە التاریخ و نەسائیش هێناویانە، هەروەها لە البدایة والنهایة ج٦ ص٤٨ دا واهاتووە.

القيامة ان تقوم؟)(خوای گەورە فەرمانی بە ڕۆژی دوایی کرد تا دابێت؟) وتی: نا، بەڵام خوا فەرمانی بە ئیسرافیل کردو دابەزی بۆ لات کاتێك ئەو قسەی تۆی بیست، ئیسرافیل هات بۆ لای وتی: خوا قسەکەی تۆی بیست کلیلەکانی خەزێنەکانی زەوی پێداوم و ناردومی بۆ لات و فەرمانی پێکردم تا پێشنیارت بۆ بکەم شاخەکانی توهامەت بۆ بکەم بە زومرودو یاقوت و زێڕو زیو، ئەگەر دەتەوێت پاشایەکی پێغەمبەر بە یان پێغەمبەرێکی بەندە. جبریل ئامارەی بۆ کرد خاکی بە، ئەویش فەرمووی(بل نبیا عبدا) واتە(بەڵکو پێغەمبەرێکی بەندە) سێ جار وتیەوە[1][2].

ترمزی بە پلەی حەسەن لە ئەبوئومامەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هێناویەتی دەفەرموێت(پەروەردگارم پێشنیاری بۆ کردم تا دەشتەکانی مەککەم بۆ بکات بە زێڕ، وتم: نا، ئەی پەروەردگار، بەڵام ڕۆژێك تێربم و ڕۆژێك برسی بم – سێ جار ئەمە یان هاوشێوەی ئەمەی فەرموو – ئەگەر برسی بووم دەپاڕێمەوە لەبەردەمتدا و یادت دەکەم، ئەگەریش تێربووم سوپاست دەکەم)[3][4].

عەسکەری لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(فریشتەیەك هات بۆ لام و وتی: ئەی موحەممەد پەروەردگارت سەلامت لێ دەکات و دەفەرموێت ئەگەر دەتەوێت دەشتی مەککەت بۆ دەکەم بە زێڕ) ئەویش سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو فەرمووی(نا پەروەردگارم، بەڵام ڕۆژێك تێربم بۆ

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٥٧دا واهاتووە، هەیسەمی ج١٠ ص٣١٥ دەڵێت: تەبەرانی لە(المعجم الوسیط) دا هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا سەعدانی کوڕی وەلید هەیە کە نایناسم و کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، تەواو.

[3] – ضعیف.

[4] – لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٥٠ دا واهاتووە.

ئەوەی سوپاست بکەم بۆ ئەوەی ڕۆژێك برسی بمو لێت بپاڕێمەوە(داوات لێ بکەم))
لە کنز العمال ج٤ ص٣٩ دا واهاتووە.

بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: یەکێك لە بێباوەڕان لە ڕۆژی شەڕی ئەحزابدا کوژرا، ناردیان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە جەستەکەی بنێرە بۆمان بەرامبەر بەوە دوانزە هەزار دەدەین، ئەویش فەرمووی(هیچ خێرێك لە جەستەو بەهاو پارەیدا نیە)[1] ئەحمەد هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ادفعوا الیهم جیفته فانه خبیث الجیفة خبیث الدیة) واتە(لاك و کەلاکەکەی بدەنەوە پێیان چونکە کەلاکی پیس خوێن باییشی پیسە) بۆیە هیچی لێ وەرنەگرتن.[2] ئیبن ئەبی شەیبەش لە عیکرەمەوە هێناویەتی نەوفەل یان ئیبن نەوفەل لە ڕۆژی خەندەقدا ئەسپەکەی خستیە خوارەوەو کوژرا، ئەبوسوفیان بۆ تەرمەکەی سەد وشتری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دانا، پێغەمبەر(ﷺ) ئامادەنەبوو هیچی لێ دەربگرێت و فەرمووی ( بیبەن چونکە خوێن پاداشتی پیسەو کەلاکیشی پیسە).[3]

تەبەری لە عروەوە هێناویەتی حەکیمی کوڕی حیزام(ﷺ) چوو بۆ یەمەن و جل و بەرگی یەمەنی(ذویزن) ی کڕی و هێنایەوە بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێشکەشی کرد، ئەویش وەرینەگرت و فەرمووی(ئێمە دیاری بێباوەڕ وەرناگرین) واتە(انا لا نقبل هدیة مشرك) حەکیم فرۆشتی و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بۆی کڕدارو کردیە بەری و دواتر پێیەوە چوو بۆ مزگەوت، هەرگیز نەمدیبوو کەس ئەوەندە پێی بکەوێت، دەتوت مانگی چواردە شەوەیە، کە بینیم خۆم نەگرت و وتم:

ما نتظر الحکام بالحکم بعدما — بدا واضح ذوغرة وحجول
اذا واضحوه المجد اربی علیهم — بمنفرع ناء الذباب سجول

---

[1] – ضعیف.
[2] – ترمزیش هێناویەتی و دەڵێت فەرموودەکە غەریبە، لە البدایة والنهایة ج٤ ص١٠٧ دا واهاتووە.
[3] – لە کنز العمال ج٥ ص٢٨١ دا واهاتووە.

پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) پێکەنی.[1]

حاکم ج٣ ص٤٨٤ لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە هێناویەتی دەڵێت: موحەممەدی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە سەردەمی نەفامیدا لە هەموو کەس لام خۆشەویست بوو، کە بوو بە پێغەمبەر و چوو بۆ مەدینە حەکیمی کوڕی حیزام لە کاتی حەجدا چوو سەیری کرد جلی(ذویزن) بە پەنجا درهەم دەفرۆشێت، کڕی تا بە دیاری بیبات بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بردی و ویستی وەریبگرێت بەڵام پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەری نەگرت، عەبەیدوڵا دەڵێت: وابزانم فەرمووی(ئێمە هیچ لە بێباوەڕان وەرناگرین، بەڵام ئەگەر پێت باشە بە پارە دەیبەین) منیش پێمدا تا هاتە مەدینەو کردیە بەری و لەسەر مینبەر بینیم لەبەری بوو، هیچکات وەك ئەو ڕۆژ نەمبینیبوو هێندە جوانی بکەوێت، پاشان دای بە ئوسامەی کوڕی زەید، حەکیم لەبەری بزن باشترم و باوکی من لە باوکی ئەو و دایکم لە دایکی ئەو باشترە، حەکیم دەڵێت: چوومەوە بۆ مەککەو بە قسەکەی ئوسامە سەرسام بووم.[2]

ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: مامی عامری کوڕی توفەیلی عامری پێی وتم: عامری کوڕ توفەیل ئەسپێکی پێشکەشی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کرد و عامر بۆی نووسی تووشی دوومەڵێکم لێدەرکەوتووە، بەڵکو لە لای خۆتەوە دەرمانێکم بۆ بنێریت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەسپەکەی وەرنەگرت چونکە موسڵمان نەببوو و قاپێکی هەنگوینی بۆ ناردو فەرمووی(تداو بها) واتە(وەك دەرمان بەکاری بهێنە).

---

[1]- لە کنز العمال ج٣ ص١٧٧ دا واهاتووە، تەبەرانی بەو جۆرە لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە هێناویەتی، لە المجمع ج٨ ص٢٧٨ دا واهاتووەو دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەعقوبی کوڕی موحەممەدی زوهری هەیە کە زۆرینە بە لاوازی دەزانن و ڕای متمانەشی لەسەرە، تەواو.

[2]- حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت صەحیحە.

هەروەها لە کەعبی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت(ملاعب الاسنه) هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و دیاریەکی هێنا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێشنیاری موسڵمانبوونی بۆ کرد ئەویش ئامادە نەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(دەی من دیاری هاوەڵدانەر وەرناگرم).[1]

ئەبوداود و ترمزی بە صەحیحی و ئیبن جەریر و بەیهەقی لە عیاضي کوڕی حیماری مەجاشعیەوە هێناویانە کە دیاریەکی – یان وشترێکی – پێشکەش بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کرد، ئەویش فەرمووی موسڵمان بویت؟ وتی: نا، فەرمووی(فاني نهیت عن زبدا المشرکین) واتە(دەی من دوورە پەرێزیم لێ کراوە لە ناردەنی و خەڵاتی هاوەڵدانەران)[2][3].

## (ئەبوبەکر(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

بەیهەقی ج٦ ص٢٥٣ لە حەسەنەوە هێناویەتی ئەبوبەکری(رضي الله عنه) وتاری بۆ خەڵك خوێندەوەو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و دواتر وتی: ژیرانەترین ژیریی لە خوا ترسیە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت و تیایدا هاتووە بۆ بەیانی چوو بۆ بازاڕو عومەر(رضي الله عنه) پێی وت: بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: بۆ بازاڕ، وتی: شتێکت بۆ دانراوە تا نەچیتە بازاڕ، وتی: سبحان الله ئەی ژن و منالم، وتی: بە شێوەیەکی دروست مووچەت بۆ دەبڕینەوە، وتی: هاوار بۆ عومەر من دەترسم نەتوانم هیچ لەو سامانە بخۆم، وتی: لە ماوەی دوو ساڵ وشتێکدا هەشت هەزار درهەمی خەرج کردووە، کە سەرەمەرگی هات وتی: من بە عومەرم وت دەترسم نەتوانم هیچ لەو سامانە بخۆم بەڵام وازی لێ نەهێنام، دەی ئەگەر مردم لە پارەو سامانم هەشت

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٧٧ دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص٧٧ دا واهاتووە.

هـەزار درهـەم ببەنـەوە بـۆ بـەیتولمال، کـە هێنـرا بـۆ عومـەر وتـی: ڕەحمـەتی خـوا لـە ئەبوبەکر بە ڕاستی ئەوانەی دوای خۆم بەهیلاکدا برد.

ئـیبن سـەعد ج٣ ص٣٩ لـە ئەبوبـەکری کـوڕی حەفـسی عومـەرەوە هێناویـەتی دەڵێت: عائیشە(رضي الله عنها) چوو بۆ لای ئەبوبەکرو لەباری سـەرەمەرگدا بـوو و ئەم شعرەی وت:

لعمرك ما يغني الثراء عن الفتى          اذا حشرجت يوما وضاق الصدر

ئەویش وەك تووڕە سەیری کردو وتی: دایکی باوەڕداران وانیە، بەڵکو(وجاءت سكرة الموت بالحق ذالك ما كنت منه تحيد) من حەوشەیەکم بۆ بەجێ هێشتبویت و لە دەرونمدا شتێك هەبوو، بۆیە بیگێڕەوە بۆناو میراتەکە، وتـی: بـەڵێ، گەڕاندمـەوە، وتـی: لەو کاتەوەی کاروباری موسڵمانانمان گرتەدەست دینـارو درهـەمێکیش چیە نەمانـدەخوارد، بـەڵام لـە خواردنیـان دەچـووە سـکمان و لـە سادەی بەرگـەکانیانمان وەردەگـرت، لـە بەشـی موسـڵمانان کـەم و زۆر هیـچمان نـەبوو جگـە لـەم کۆیلـە حەبەشیەو ئەو وشترە شیردەرەو ئەم بەرگی قەیفە، ئەگەر مردم بیاننێرە بۆ عومـەرو خۆت دووربگـرە لێیـان، ئـەویش وایکـرد، کـە نێـردراو هـات عومـەر گریـا تـا ئـەوەی فرمێـسکەکانی چـاویان جۆگـەیان بەسـت و دەیـوت: ڕەحمـەتی خـوا لـە ئەبوبـەکر بەڕاستی ئەوانـەی دوای خـۆی هـیلاك کـرد، دووجـار وتـی: ئینجـا وتـی: ئـەی غـوڵام لایانبە، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتـی: سبحان الله ئـەم کۆیلـە حەبەشیەو ئـەم وشـترەو بـەرگی قەیفـە بـە نرخـی پێـنج دینـار بیبـەین دەڵێیـت چـی بکـەین؟ وتـی: بیگێڕنـەوە بۆ ژن و منـاڵی، وتـی: نـا سوێند بەوەی موحەممـەدی بە حـەق نـاردووە هـەرگیز ئەمـە لـە ئەسـتۆی منـدا نابێـت لـە کاتێکـدا ئەبوبـەکر لەسـەرەمەرگدا دوورە پەرێزی لێکردن من بیانگێڕمەوە بۆ ژن و مناڵی؟! مەرگ لەوە نزیکترە.

# (عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێبێت) سامان دەگێڕێتەوە)

مالیك لە عەتای کوڕی یەسارەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەخششێکی نارد بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ئەویش وەرینەگرت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(بۆچی گێڕاتەوە؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر خۆت پێت نەفەرموین چاکتر بۆمان ئەوەیە لە کەس هیچ وەرنەگرێت، فەرمووی(امنا ذالك عن المسالة، فاما ماکان عن غیر مسالة فانما هو رزق یرزقکه الله) واتە(ئەوە لە داواکردنەوە، بەڵام جگە لە داواکردن ئەوە ڕۆزییەکە خوا پێت دەبەخشێت) عومەر وتی: دەی سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە تاماوم داوا لە هیچ کەس ناکەم‌و بەبێ داواکردن بۆم بێت وەریدەگرم، مالیك بەوجۆرە بە مورسەلی هێناویەتی، بەیهەقی لە زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەڵێت: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو دەیوت – فەرموودەکە دێنێت –[1].[2]

ئیبن سەعدو ئیبن عەساکیر لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: ئەبوموسای ئەشعەری فەرشێکی پێشکەشی عاتیکەی کچی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلی ژنی عومەر کرد وابزانم باڵو بستێك بوو، عومەر چوو بۆ لای ژنەکەی‌و بینی‌و وتی: ئەمەت لە کوێ بوو؟ وتی: ئەبوموسای ئەشعەری پێشکەشی کردم، عومەر هەڵیگرت‌و دای لەسەری ژنەکەی تا ئەوەی سەری ئازاری بەرکەوت، دواتر وتی: ئەبوموسام بۆ بهێنن‌و ماندووی بکەن، هێنراو ماندووکرا و ئەویش دەیوت: ئەی ئەمیری باوەڕداران پەلەمەکە، وتی: چی وایکرد ئەمە پێشکەشی ژنەکەم بکەیت؟ پاشان عومەر هەڵیگرت‌و دای لەسەری ئەبوموساو وتی: بیبە هیچ پێویستیمان پێی نیە.[3]

---

[1] – مرسل.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٢ ص١١٨ دا واهاتووە.

[3] – منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٨٣.

ئیبن عەبدولحەکەم لە لەیسی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: مقەوقس داوای لە عەمری کوڕی عاص کرد تا لاپاڵی شاخی(موقەتتم) ی بە حەفتا هەزار پێ بفرۆشێت، عەمری کوڕی عاص سەری لەوە سوڕما، عومەر نامەی بۆ نووسی پرسیاری لێ بکە بۆچی ئەوەندەی پێدایت لە کاتێکدا بۆ کشوکاڵ ناشێت و ئاوی بۆ ناچێ و سوودی لێ وەرناگیرێت؟ ئەویش پرسیاری لێکرد و مقوقس وتی: ئێمە لە کتێبەکاندا سیفەتیمان بیستووە کە چێنراوی بەهەشتی تێدایە، ئەویش ئەوەی نووسی بۆ عومەر، عومەریش بۆ نووسی: ئێمە پێمان وایە چێنراوی بەهەشت تەنها بۆ باوەڕدارانە چی لە موسڵمانان هات بۆ لات لەوێ بە خاکیان بسپێرە و بە هیچ نرخێك ئەو زەویەی پێ مەفرۆشە.

## (ئەبوعوبەیدەی جەراح(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

بەیهەقی ج٦ ص٣٥٤ لە ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەو کاتەی ساڵی وشکەساڵی بوو عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ عەمری عاص – فەرموودەکە دێنێت – تیایدا دەڵێت: پاشان ئەبوعوبەیدەی جەراحی بانگکرد و ئەویش بردی و کە گەڕایەوە عومەر هەزار دیناری بۆ نارد، ئەبوعەیدە وتی: من ئیشم بۆ تۆ نەکردووە ئەی کوڕی خەتتاب، من بۆ خوام کردووە و هیچ لە تۆ وەرناگرم لەسەری، عومەر وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بۆ کارێکی بناردینایە پێی دەبەخشین ئێمە حەزمان نەدەکرد وەریبگرین بەڵام پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕازی نەدەبوو، دەی تۆش وەریبگرە کابرا، بۆ ئایین و دنیاشت سوودی لێوەربگرە، ئەوکات ئەبوعوبەیدە وەریگرت.[1]

---

[1]– ئیبن خوزەیمە و حاکمیش بەو جۆرە لە ئەسلەمەوە هێناویانە، لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٩٦ دا واهاتووە.

# (سەعیدی کوڕی عەمر(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

نەسائی و ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵلای کوڕی زیادەوە هێناویانە عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) هەزار دیناری بەخشی بە سەعیدی کوڕی عمر(رضي الله عنه) ئەویش وتی: هیچ پێویستیم پێی نیە، بیدە بە کەسێك لە من زیاتر پێویستی پێیەتی، عومەر وتی: لەسەرخۆبە تا فەرموودەیەکی پێغەمبەرت(صلى الله عليه وسلم) بۆ بگێڕمەوە، پاشان ئەگەر ویستت هەڵیبگرەو ئەگەرنا وەریمەگرە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شتێکی پێشکەشی کردمو منیش وەك ئەو قسەی تۆم وت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من اعطی شیئا من غیر سؤال ولااسستشراف نفس فانه رزق من الله ولایرده) واتە(هەرکەس شتێکی پێدرا بەبێ سواڵو داواکردنو خۆزەبوون نواندن ئەوا ڕۆزییەکەو خوا پێی داوە باوەریبگرێتو نەیگێڕێتەوە)، سەعید وتی: تۆ خۆت لە پێغەمبەرت(صلى الله عليه وسلم) بیست؟ وتی: بەڵێ، ئەویش وەریگرت.[1] حاکم ج٣ ص٢٨٦ لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی عومەر بە سەعیدی کوڕی عامری کوڕی حوزەیمی وت: بۆچی خەڵکی شام خۆشیان دەوێیت؟ وتی: ئاگام لێیانەو سۆزو تێکەڵیم بۆیان هەیە، ئەویش دە هەزاری پێداو سەعیدیش وەرینەگرتو وتی: من چەند کۆیلەو ئەسپم هەنو بارم باشە، دەمەوێت کارەکەم لە پێناو خوادا بۆ موسڵمانان بێت، عومەر وتی: وا مەکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سامانێکی پێدامو منیش هەمان قسەی تۆم کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اذا اعطاك الله مالا لم تساله ولم تشره نفسك الیه فخذه فانما هو رزق الله اعطاك ایاه).[2](ئەگەر خوا شتێکی پێبەخشیت کە داوات نەکردبێتو دەروونت رووی تێنەکردبێ وەریبگرە چونکە ئەوە رۆزیەکە خوا پێیبەخشیویت) لە کنز العمال ج٣ ص٣٢٥ دا دەڵێت: کەسێك بوو لە شام جێی ڕەزامەندی بوو، عومەر پێی وت: بۆ خەڵکی شام خۆشیان دەوێیت؟ وتی: لەگەڵیان غەزا دەکەم و سۆزم بۆیان هەیە، عومەریش دە هەزاری بۆ خستەڕوو و وتی: بیبەو لە غەزاتدا سوودی لێوەربگرە، وتی: من پێویستم نیە، – ئینجا فەرموودەکە بەوجۆرە دێنێت –.

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص٣٢٥ دا واهاتووە.

[2] – بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە ئەسلەمەوە هێناویانە.

## (عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

ئەحمەدو حەمیدیو ئیبن شەیبەو دارمیو موسلیمو نەسائی لە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدیەوە هێناویانە کە چوو بۆ لای عومەر(رضي الله عنه) – لە ماوەی خیلافەتیدا – عومەر پێی وت: ئەرێ بۆچی بیستوومە تۆ چەند کارێکی خەڵك لە دوای یەك دێنیت؟ ئەگەر کرێی کارت پێدرا حەزناکەیت؟ وتی: بەڵێ، عومەر وتی: دەی بۆچی؟ وتی: من چەند ئەسپو کۆیلەیەکم هەنو بارم باشەو دەمەوێت کارکردنم لەپێناو خوادا بۆ موسڵمانان بێت، عومەر وتی: وامەکە، من دەمویست وابکەمو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەخششی کردمو منیش وتم بیدە بە کەسێکی لە من هەژارتر، تائەوەی جارێکیان پێیدامو هەمان شتم وت: فەرمووی:(بیگرەو هەڵیبگرەو بەخێر بیبەخشەو هەرچیەك لەو سامانە بەبێ داواکردنو چاولێبوون بۆت هات وەریبگرە،هەرچیەکیش وانەهات مەڕۆ بە دوایدا)ئیبن جەریر لێوەی هێناوە دەڵێت: عومەر لەسەر سەدەقەیەك دابنام کە بەجێمگەیاند کرێی کارەکەمی پێدام، وتم: من بۆ خوام کردووەو پاداشتیشم لای ئەوە، وتی: ئەوەی پێت دەدەم بیبە، من لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) کارێکم کردو ئەویش بەخششی کردمو منیش هەمان قسەی تۆم کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اذا اعطیتك شیئا من غیر ان تسالني فکل و تصدق).[1](ئەگەر شتێکم پێدایت کە داوات لێنەکردبم لێی بخۆو ببەخشە).

[1] – کنز العمال ج٣ ص٣٢٥.

# (حەکیمی کوڕی حیزام(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

عەبــدولڕەزاق لــە ســەعیدی کــوڕی موســەییبەوە هێناویــەتی دەڵێــت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە شەڕی حونەین بەخششێکی دا بە حەکیمی کوڕی حیزام ئەویش بەکەمی زانی، ئەویش بۆی زیاد کرد، حەکیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کام بەخششت چاکترە؟ فەرمووی(الاولى) واتە(یەکەمیان). پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(یا حكيم بن حزام ان هذا المال خضرة حلوة فمن اخذه بسخاوة نفس و حسن اكله بورك له فيه، ومن اخذه باستشراف نفس و سوء اكله لم يبارك له فيه وكان الذي ياكل ولايشبع واليد العليا خير من اليد السفلى) واتە(ئەی حەکیمی کوڕی حیزام ئەم سامانە سەوزو پاك‌و چاکە، هەرکەس بە سەخاوەتمەندی بیبات و بە چاکی بیخوات دەبێتە بەرەکەت بۆی، هەرکەس بە خۆزەبوون نواندن و خراپ خواردن بیبات بەرەکەتی لیٚ نابینێت‌و وەك ئەوە وایە دەخوات‌و تێرنابێت، دەستی باڵا لە دەستی خواروو باشترە) دەڵێت بۆ تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی(و منى) وتی: دەی سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە دوای تۆ هەرگیز داوا لە کەس ناکەم، تا مرد هیچی لە دیوان‌و بەخشش وەرنەگرت، عومەری کوڕی خەتتاب دەیوت: خوایە من تۆ لەسەر حەکیم بەشایەت دەگرم بانگی دەکەم بۆ ماڧ خۆی لەم سامانەداو ئەویش نایەوێت، وتی: بە خوا لە تۆو کەسی تریش هیچ وەرناگرم.[1]

بوخاری‌و موسلیم لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە هێناویانە دەڵێت: داوام کرد لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەویش پێی بەخشیم سیٚ جار وامکرد، دواتر فەرمووی(ئەی حەکیم ئەم سامانە سەوزو چاك‌و پاکە) ئینجا فەرموودەکە بەوجۆرە دێنێت تا دەڵێت: ئەبوبەکر حەکیمی بانگکرد تا بەخششی بکات ئەویش ئامادە نەبوو هیچی لیٚ وەربگرێت بۆ عومەریش هەروابوو، عومەر وتی: دەی ئەی کۆمەڵی موسڵمانان دەتانکەم بە شایەت لەسەر حەکیم کە من ئەو ماڧەی خوا لەم بەشەدا بۆی داناوە

[1] – لە كنز العمال ج٣ ص٣٢٢ دا واهاتووە.

پێیدەدەمو ئەویش ئامادەنیە وەریبگرێت، حەکیم لە دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تا مرد هیچی لە کەس وەرنەگرت.[1] حاکم ج٢ ص٤٨٣ لە عروەوە هێناویەتی حەکیمی کوڕی حیزام هیچی لە ئەبوبەکر وەرنەگرت تا مرد، بۆ عومەرو عوسمانو موعاویەش هەروابوو تا مرد(ڕەزای خوا لە هەموویان بێت).

## (عامری کوڕی ڕەبیعە(رضي الله عنه) پشك دەگێڕێتەوە)

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٧٩ لە زەیدی کوڕی ئەسلەم لە عامری کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی کابرایەکی عەرەب لای دابەزی، عامریش ڕێزی زۆری گرت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قسەی لەسەر کرد، کابرا هات بۆ لایو وتی: من لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داوامکردووە دۆڵێکی زۆر باشی عەرەب ببڕمەوە، ویستم بەشێکی بۆ تۆ و ئەوانی دواترت بێت، عامر وتی: نا پێویستم بەو پارچەیەت نیە، ئەمڕۆ سورەتێك دابەزی لە دنیا بێزاری کردوین(اقترب للناس حسابهم وهم في غفلة معرضون).

## (ئەبوزەڕی غیفاری(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٦٠ لە عەبدوڵلای کوڕی صامتی برازای ئەبوزەڕەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ماممدا چووم بۆ لای عوسمان، بە عوسمانی وت: مۆڵەتم بدە بچم بۆ(ڕەبزە) وتی: باشە، دەڵێن بڕێ ئاژەڵی صەدەقەت بدەنێ تا ئێوارەو بەیانی هەتبن، وتی: نا پێویستم بەوە نیە، پشکی ئەبوزەر بەشی دەکات، پاشان هەستاو وتی: لەسەر دنیای خۆتان سوور بنو وازبێنن لە ئێمەو ئایینو پەروەردگارمان ئەوان سامانی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفیان دابەش دەکرد، کەعبیشی لەلابوو، عوسمان بە کەعبی وت: سەبارەت بەوەی ئەم سامانە

---

[1]- لە الترغیب والترهیب ج٢ ص١٠١ دا واهاتووەو دەڵێت: بوخاریو موسلیمو ترمزیو نەسائی بە کورتی هێناویانە.

کۆدەکاتەوە دەڵێیت چی؟ وتی: لێی دەبەخشێت و لە چەند ڕێیەکەوە دەبەخشێت و ئەوەو ئەوە دەکات، وتی: من هیوای خێری بۆ دەخوازم، ئەبوزەر تووڕەبوو و داردەستەکەی بەڕووی کەعبدا هەڵگرت و وتی: ئەی کوڕی ژنە جوولەکەکە تۆ چووزانیت، کێ دەڵێت خاوەنی ئەم سامانە لە ڕۆژی دواییدا سامانەکەی نەبێتە دووپشك و ڕەشایی دڵی بگەزێت، لە ئەبی شوعبەشەوە دەڵێت: کابرایەك هات بۆ لای ئەبوزەرو بەخششێکی بۆ خستەڕوو، ئەبوزەر وتی: ئێمە بزنێکمان لایە دەیدۆشین و وشترێك بۆ گواستنەوەو ئازاردبوویەك خزمەتمان دەکات و زیادەی عەبایەکیش بەرگمانە، دەترسم لەسەر زیادە لێپێچینەوە بکرێم.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٦١ لە ئەبوبەکری کوڕی مونزیرەوە هێناویەتی دەڵێت: حەبیبی کوڕی مەسلەمە کە ئەمیری شام بوو سێ سەد دیناری نارد بۆ ئەبوزەرو وتی: بۆ پێویستی خۆت بەکاری بهێنە، ئەبوزەر وتی: بیبەرەوە بۆی، مەگەر کەسێکی زیاتر یاخی بەرامبەر خوای لە ئێمە زیاتر شك نەبرد، ئێمە تەنها سێبەرێکمان هەیە لە ژێریداین و بڕێ مەڕمان هەن و مەولایەك کە خزمەتمان دەکات، پاشان من زۆر لەوە زیاتر دەترسم، تەبەرانی لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: حارس – کابرایەکی قوڕەیشی بوو لە شام – بیستی ئەبوزەر باری باش نیە بۆیە سێ سەد دیناری بۆ نارد، ئەویش وتی: کەسێکی تر لە من کەمتری شك نەبرد تا بیداتێ، بیستم پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو(من سال ولە اربعون فقد الحف) واتە(هەرکەس چلی هەبێت و داوابکات ئەوە ملەجیڕی و لەسەر ڕۆیشتن دەکات) ئەبوزەریش چل درهەم و مەڕو دوو مایەنی هەیە، ئەبوبەکری کوڕی عەیاش دەڵێت واتە دوو خزمەتکار[1][2].

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٣٣١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی یونس، ئەبونەعیمیش لە ئیبن سیرینەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

## (ئەبوڕافیعی مەولای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سامان دەگێڕێتەوە)

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص١٨٤ لە ئەبوڕافیعی مەولای پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی دەفەرموێت(کیف بك یا ابارافع اذا افتقرت؟) وتم: مەگەر لەمەدا سەرناکەوم و ناڕۆم؟ فەرمووی بەڵێ، فەرمووی چیت هەیە؟ وتم: چل هەزار کەهی خوایە، فەرمووی(نا، هەندێکی ببەخشەو هەندێکی بهێڵەرەوەو بۆ کوڕەکەت بەکاری بێنە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا وەك چۆن مافمان هەیە بەسەریانەوە ئەوانیش مافیان هەیە بەسەرمانەوە؟ فەرمووی(بەڵێ، مافی کوڕ لەسەر باوك ئەوەیە قورئانی فێربکات) عوسمانی کوڕی عەبدولڕەحمان هێناویەتی(کتێبی خواو تیرهاوێژیی و مەلەوانی فێربکات) یەزید ئەمەشی بۆ زیاد کردووە(ماڵ و سامانی پاکی بۆ بەجێ بهێڵێت). وتی: هەژاریی من کەی دەبێت؟ فەرمووی(دوای من، ئەبوسەلیم دەڵێت: بینیم دواتر هێندە هەژارکەوت دادەنیشت و دەیوت کێ یارمەتی ئەم پیرە کوێرە دەدات، کێ دەستگیرۆیی کەسێك دەکات کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو هەژاردەکەویت، کێ دەبەخشێت، چونکە دەستی خوا دەستی باڵایەو دەستی بەخشندە دەستی نێوەندو دەستی داواکاریش نزمە، هەرکەیش دەوڵەمەندبێ و داوابکات نیشانەیەکی هەیە لە ڕۆژی دواییدا پێی دەناسرێتەوە، صەدەقە بۆ دەوڵەمەندو بۆ لەش ساغ دروست نیە، بینیم کەسێك چوار درهەمی پێدا ئەویش درهەمێکی لێ گێڕایەوە بۆی، ئەویش وتی بەندەی خوا خێرەکەم مەگێڕەوە، وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوورە پەرێزی لێکردم زیادەی سامان هەڵبگرم، ئەبوسەلیم دەڵێت: بینیم دواتر دەوڵەمەند بوو تا ئەوەی دەبەرابەری هەبوو، دەیوت خۆزگە ئەبوڕافیع لە هەژاریەکەیدا یان لە کاتی هەژاریدا بمردایە، دەڵێت: بۆ مەملووکەکەی بە هەمان ئەو نرخەی پێی کڕیبوو بۆی دەنووسی.[1]

[1] - ضعیف.

## (عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

حاکم ج٣ ص٤٧٦ لە ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی دەڵێت: موعاویە سەد هەزار درهەمی نارد بۆ عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صدیق دوای ئەوەی ئامادەنەبوو بەیعەت بدات بە یەزیدی کوڕی موعاویە، عەبدولڕەحمان ئامادەنەبوو وەریبگرێت و وتی: ئایینم بە دنیا بفرۆشم؟ چوو بۆ مەککە تا لەوێ مرد.[1]

## (عەبدوڵڵای کوڕی عومەری فاروق (رضي الله عنهما) سامان دەگێڕێتەوە)

ئیبن سەعد ج٤ ص١٢١ لە مەیمونەوە هێناویەتی دەڵێت: موعاویە فێڵی بۆ عەمری کوڕی عاص نایەوە و دەیویست بزانێت چی لە دەروونی ئیبن عومەردایە بزانێت دەیەوێت شەڕبکات یان نا، وتی: ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان بۆچی دەرناچیت تا بەیعەتت پێ بدەین؟ تۆ هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و کوڕی ئەمیری باوەڕدارانیتو لە هەموان شیاوتری بە خیلافەت، هەموو خەڵکی لەسەر هەمان قسەی تۆن؟ وتی: بەڵێ جگە لە کەمینەیەك، ئیبن عومەر وتی: ئەگەر تەنها سێ کەڵەگەت لە شاری(هەجەر) بمێنێتەوە من پێویستیم بەوە نیە، دەڵێت ئەو کات زانی شەڕی ناوێت، وتی: ئەی دەتەوێت بەیعەت بەکێ بدەیت خەریکە خەڵکی لەسەر ئەوە یەکدەنگنو ئەویش لە هەردووخاکدا پشكو لە ساماندا بە بڕی زیاتر لە پێویستی

---

[1] – زوبەیری کوڕی بەکار لە عەبدولعەزیزەوە بەوجۆرە هێناویەتی، لە الاصابە ج٢ ص٤٠٨ دا واهاتووە.

خۆت و کوڕو دواترت پشکت پێ دەدات؟ وتی: ئۆف بۆ تۆ؟ لەلام مەمێنەو ئیتر نەیەیت بۆ لام؟ هاوار بۆت. ئاییینی من بە دینارو درهەمی ئێوە نیە، هیوادارم لە دنیا دەرچم و دەستم پاك و سپی بێت.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٠١ لە مەیمونی کوڕی میهرانەوە هێناویەتی ئیبن عومەر نامەیەکی نووسی بۆ غولامێکی و کاتی بۆ دانا، کە سەرەتای کاتەکە تەواو بوو نووسراوەکەی بۆ هێنا و پرسیاری لێکرد ئەمەت لە کوێ بوو؟ وتی: من کارم دەکرد و داواشم دەکرد، ئیبن عومەر وتی: پیسی و چەپەڵی خەڵکت بۆ هێناوم و دەتەوێت دەرخواردی منی بدەیت؟ تۆ لەبەر خوا ئازادیت و چیت هێناوە بیبە بۆ خۆت.

## (عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

ئیبن ئەبی دنیا و خەرائیبی بە سەنەدی حەسەن لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی دیهقانێکی خاکی(سواد) لەسەر ئەوە قسەی لەگەڵ ئیبن جەعفەر کرد تا عەلی بدوێنێت لەسەر پێویستیەك، ئەویش پێی وت و عەلیش(رضي الله عنه) دابەشی کرد، دیهقانەکە چل(دینار) ی بۆ نارد، ئەویش گێڕایەوە و وتی: ئێمە چاکە نافرۆشین.

## (عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

بەغەوی لە ڕێگەی ئیبن عویەینە لە عەمری کوڕی دینارەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمان عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی لەسەر بەیتولمال دانا و کرێی سێ سەد هەزاری پێدا، ئەویش ئامادەنەبوو وەریبگرێت – ئینجا هەمان شێوەی فەرموودەکەی مالیك دێنێت – دەڵێت: بیستم عوسمان مۆڵەتی سی(٣٠) هەزاری دا بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم و ئەویش ئامادەنەبوو وەریبگرێت و وتی: من بۆ خوام کردووە[1،2].

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە الاصابة ج٢ ص٢٧٤ دا واهاتووە.

## (عومەری کوڕی نوعمانی کوڕی موقرین(رضي الله عنه) سامان دەگێڕێتەوە)

ئیبن ئەبی شەیبە لە موعاویەی کوڕی قورڕەوە هێناویەتی دەڵێت: من لای عومەری کوڕی نوعمانی کوڕی موقرین دابەزیبووم، کاتێك ڕەمەزان هات کابرایەك کیسێك درهەمی بۆ هێنا، وتی: ئەمیر موصعەبی کوڕی زوبەیر سەلامت لێ دەکات و دەڵێت هەرچی قورئان خوێنە شتێکمان بۆ ناردووە تۆش ئەمە وەربگرە، ئەویش پێی وت: بڵێ سوێند بە خوا بە مەبەستی دنیا ویستی قورئانمان نەخوێندووە، ئەمەشی بۆ ببەرەوە.[1]

## (ئەسماو عائیشەی کچانی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) سامان دەگێڕنەوە)

ئەحمەدو بەزار لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە هێناویانە دەڵێت: قوتەیەلی کچی عەبد ئەسعەد لە بەنی مالیکی کوڕی حسل چەند دیارییەکی قفڵ و پەپکەو غەز و بەزی بۆ ئەسمای کچی ئەبوبەکر هێنا، ئەو کات بێباوەڕ بوو، ئەسما ئامادەنەبوو دیارییەکەی وەربگرێت و بچێتە ناومالی، عائیشە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند(لاینهاکم الله عن الذین لم یقاتلوکم في الدین... ان الله یحب المقسطین). ئینجا فەرمانی پێکرد دیاریەکەی وەربگرێت و بچێتە ماڵیەوە.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٤ ص٢٠٤ لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: ژنێکی هەژار شتێکی پێبوو و هات بۆ لام تا بیکاتە دیاری بۆ من، منیش سۆزم بۆی جوڵا و حەزم

---

[1] – الاصابة ج٣ ص٢١ دا واهاتووە.

[2] – هەیسەمی ج٧ ص١٢٣ دەڵێت:لە سەنەدەکەدا موصعەبی کوڕی سابت هەیە کە ئیبن حیببان بەجێ متمانەو دەستەیەکیش بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن، تەواو).

نەکرد لێی وەربگرم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم(فهلا قبلتيه و كافاتيها! فاري انك حقرتيها فتواضعي يا عائشة فان الله يحب المتواضعين و يبغض المستكبرين) واتە(دەی با لێت وەربگرتایەو دەستگیرۆییت بکردایە، من وای دەبینم تۆ گاڵتەو کەمیت لە ڕوودا نواندووە، دەی عائیشە خاکی بە چونکە خوا کەسی خاکی خۆش دەوێت و ڕقیەتی لە کەسانی خۆبەزلزان.

ئیبن جەریر لە ئەبوسەعیدەوە هێناویەتی دەڵێت: تەواو حاڵمان خراپ بوو و کەس و کارم پێیان وتم بچم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و داوای شتێکی لێ بکەم، چووم و یەکەم شت کە لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست فەرمووی(من استغنى اغناه الله ومن استعف اعفه الله ومن سالنا لم ندخر عنه شيئا وجدنا)واتە(کێ داوانەکا و بوونی بوێت و(داوانەکات) خوا دەوڵەمەندی دەکات، خۆگرتن و عەفاف بگرێتەبەر خوا ئەوەی بۆ دەکات، هەرکەس داوای شتێکمان لێ بکات ئەگەر شك ببەین لێی ناشارینەوە) منیش هیچم لێ داوانەکرد و گەڕامەوە، ئەو کات دنیا داباری بەسەرماندا(سامان و ڕۆزیمان زۆر بوو).

ئیبن جەریر لە ئەبوسەعیدەوە هێناویەتی ڕۆژێك بەیانی کردەوە و لەتاو برسێتیدا بەردێکی لەسەر سکی دانابوو، ژنەکەی – یان کەنیزەکەکەی – پێی وت: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و داوای لێبکە، فلان کەس چوو بۆ لای و داوای لێکرد و پێیدا، منیش چووم بۆ لای و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتاری دەخوێندەوە، بەو فەرمایشتەی گەیشتم کە دەیفەرموو(من يستعفف يعفه الله ومن يستغن يغنه الله، ومن يسالنا اما ان نبذل له او نواسيه – شك ابوحمزة – ومن يستغن عنا احب اليا ممن يسالنا)واتە(ئەوەی دەوڵەمەندی بوێ و داوانەکات خوا دەوڵەمەندی دەکات، کێ خۆی بگرێت خوا دەچێت بەهانایەوە و ئاگای لێیە، هەرکەس داوا لە ئێمە بکات یان پێی دەدەین یان سۆز و بەدەمەوەچوونمان بۆی دەبێت – ئەبوحەمزە گومانی هەبوو – هەرکەس لە ئێمە داوانەکات لامان خۆشەویستترە لەوەی داوامان لادەکات) دەڵێت: منیش گەڕامەوە و داوای هیچم لێ نەکرد، دواتر خوا بەردەوام ڕۆزی بۆ

دەناردین تا ئەوەی بڕوام وابوو کەس لە ماڵی پشتیوانان هێندەی ئێمە دەوڵەمەند نەبوو.[1]

بەزار لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڵێنێکم هەبوو کە فەتحی قورەیزە کرا چووم تا بەڵێنەکەیم بۆ بباتەسەر، گوێم لێی بوو دەیفەرموو(من يستغن يغنه الله ومن يقنع يقنعه الله)(هەرکەس بێباك بێت خوا دەوڵەمەندی دەکات هەرکەسیش رازی بێت خوا قەناعەتی پێدەبەخشێ) منیش لە دەروونی خۆمدا وتم: دەی داوای هیچی لێ ناکەم[2].[3]

ئەحمەدو نەسائی و ئیبن ماجەو ئەبوداود بە سەنەدی صەحیح لە سەوبانەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من يكفل لي ان لايسال الناس شيئا اتكفل له بالجنة)واتە(کێ زامنی ئەوەم بۆ دەکات داوای هیچ لە کەس نەکات زامنی بەهەشتی بۆ دەکەم) من وتم: من، ئیدی داوای هیچی لەکەس نەدەکرد.

ئیبن ماجە وا هێناویەتی دەڵێت: داوای هیچ لە خەڵك مەکە، سەوبان جارهەبوو قامچیەکەی لەسەر وڵاخەکەی دەکەوت بە کەسی نەدەوت بیدەرەوە دەستم، دادەبەزی و هەڵیدەگرتەوە،[4] پێشتریش باسی بەیعەتدان لەسەر کارەکانی ئیسلاممان کردو فەرموودەکەی ئەبوئومامەمان هێنا لەسەر بەیعەتدانی سەوبان لەسەر ئەوەی داوای هیچ لە کەس نەکات، ئەبوئومامە دەڵێت: لە مەککە لە قەرەباڵغیدا بینیم قامچیەکەی دەکەوت و جار هەبوو دەکەوتە سەر پشتەملی

---

[1] – (لە کنز العمال ج٣ ص٣٢٢ دا واهاتووە.)

[2] – ضعیف.

[3] – (ئەبوسەلەمە فەرموودەی لە باوکیەوە نەبیستووە، ئیبن موعین و کەسانی دیکەش ئەمە دەڵێن، لە الترغيب والترهيب ج٢ ص١٠٤ دا واهاتووە.)

[4] – ( لە الترغيب والترهيب ج٢ ص١٠١ دا واهاتووە).

کەسێك، کابرا دەیگرت و دەیدایە دەستی و ئەویش نەدەگرت تا دابەزی و خۆی هەڵیگرتەوە،[1] لە کنز العمال ج٣ ص٣٢١ لە ئیبن ئەبی ملیکەوە هێناویەتی دەڵێت: جار هەبوو ڕەشۆی ولاخەکە لە دەستی ئەبوبەکر(ﷺ) دەکەوت و دەیدا بەڕانی وشترەکەیدا، وشترەکەی دەوەستاند و ڕەشۆکەی دەگرتەوە دەست، دەیانوت بۆ چی پێت نەوتین تا بیدەینەوە دەستت؟ وتی: خۆشەویستم فەرمانی پێکردم داوای هیچ لە کەس نەکەم.

## (ترس لە بەڕووداکردنەوەی دنیا)

## (ترسی پێغەمبەر(ﷺ))

بوخاری ص٥٧٨ لە عوقبەی کوڕی عامرەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دوای هەشت ساڵ لەسەر گۆڕی کوژراوانی ئوحود وەك ماڵئاوایی زیندوو و مردووەکان قسەی کرد و دواتر چوویە سەر مینبەر و فەرمووی(اني بين ايديكم فرط وانا عليكم شهيد و ان موعدكم الحوض، واني لانظر اليه من مقامي هذا، واني لست اخشى عليكم ان تشركوا ولكني اخشى عليكم الدنيا ان تنافسوها)واتە(من لە نێوانتاندا پێشڕەوتانم، من شاهیدم بەسەرتانەوە و وادەتان سەر حەزی کەوسەرە و ئێستا لەم شوێنەمەوە سەیری دەکەم، لەوە لێتان ناترسم کە هاوەڵ بۆ خودا دابنێن، لەوە لێتان دەترسم کێبڕکێی دنیا بکەن) دەڵێت ئەوە کۆتا ڕوانین بوو کە سەیری پێغەمبەرم(ﷺ) کرد.[2]

بوخاری لە الرقاق لە عوقبەی کوڕی عامرەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك دەرچوو و لەسەر کوژراوانی ئوحود نوێژی کرد – ئینجا فەرموودەکە دێنێت و تیایدا هاتووە(واني والله لانظر الى حوضي الان واني قد اعطيت مفاتيح خزائن

---

[1]– (تەبەرانی و ئەحمەد و نەسائیش لە سەوبانەوە بەکورتی هێناویانە، ئەحمەدیش هێناویەتی).
[2] – صحيح.

الارض – او مفاتيح الارض – واني والله ما اخاف عليكم ان تشركوا بعدي ولكني اخاف عليكم ان تنافسوا فيها).[1]

بوخاری و موسلیم له عەمری کوڕی عەوفی ئەنسارییەوە هێناویانە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحی نارد بۆ بەحرەین تا سەرانەی ئەوێی بۆ بهێنێت، ئەویش لە بەحرەین هێنای، پشتیوانان ئەمەیان بیستو چوون بۆ نوێژی بەیانی و لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) نوێژیان کرد، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لێبوویەوە چوو، ئەوانیش چوونە خزمەتی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کاتێك ئەوانی بینی زەردەخەنەی کردو دواتر فەرمووی(وابزانم بیستووتانە ئەبوعوبەیدە لە بەحرەینەوە شتێکی هێناوە) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(ابشروا واملوا ما يسركم! فوالله ما الفقر اخشى عليكم ولكن اخشى ان تبسط الدنيا عليكم كما بسطت على من كان قبلكم فتنافسوها كما نتافسوها فتهلككم كما اهلكتهم)واتە(بە موژدەبن و چیتان پێ خۆشە هیوای بۆ بخوازن، سوێند بە خوا لە هەژاری لێتان ناترسم، بەڵام دەترسم دنیا بە ڕووتاندا بکرێتەوە وەك چۆن بۆ ئەوانەی پێش ئێوە کرایەوە ئەو کات ڕکەبەری لەسەر بکەن وەك چۆن ئەوان کردیان ئینجا لەناوبچن وەك چۆن ئەوانی لەناوبرد).[2]

ئەحمەد و بەزار لە ئەبوزەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کابرایەکی هەڵوێست ڕەق لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وشکەساڵی خواردوینی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لە شتی جگە لەوە زیاتر ترسم هەیە بۆتان، کاتێك دنیا بەسەرتاندا دەڕژێت، بریا ئوممەتەکەم زێڕی نەدەپۆشی).[3]

---

[1] – ضعيف.

[2] – (لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٤١ دا واهاتووە).

[3] – (گێڕەرەوەکانی فەرموودەکەی ئەحمەد صەحیحن. لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٤٤ دا واهاتووە).

بوخاری و موسلیم لـه ئه‌بوسه‌عیدی خودریـه‌وه لـه فه‌رمووده‌یه‌كدا هێناویانه ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له‌سه‌ر مینبه‌ر دانیشت و ئێمه‌ش لـه ده‌وری دانیشتین، فـه‌رمووی(ان مما اخاف عليكم ما يفتح الله عليكم من زهرة الدنيا وزينتها)واته(ئه‌وه‌ی ترسم هه‌یه لێی بۆتان ئه‌وه‌یه خوای گه‌وره جوانی و گوڵ و گوڵزاری دنیاتان له ڕوودا بكاته‌وه).[1]

ئه‌بویه‌علا و به‌زار لـه سه‌عدی كوڕی ئه‌بی وه‌قاصه‌وه هێناویانه ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی(لانا الفتنة السراء اخوف عليكم من فتنة الضراء، انكم بفتنة الضراء فصبرتم، وان الدنيا حلوة خضرة)واته(به‌ڕاستی فیتنه‌ی خۆشگوزه‌رانی لـه فیتنه‌ی ژیان سه‌ختی ترسناكتره بۆتان، ئێوه به فیتنه‌ی نه‌بوونی و ژیان سه‌ختی تاقیكرانه‌وه و خۆتان گرت، دنیاش سه‌وزو شیرین و به‌تامه)[2].[3]

ته‌به‌رانی لـه عه‌وفی كوڕی مالیكه‌وه(رضي الله عنه) هێناویه‌تی ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له‌ناو هاوه‌ڵانیدا هه‌ستا و فه‌رمووی) (ئایا لـه نه‌بوونی و ده‌ستكورتی ده‌ترسن،ئایا چاوتان لـه دنیایه،بیرتان لای نه‌بێت چونكه خوا فه‌تحی فارس و ڕۆمتان بۆ ده‌كات،زۆری ناو دنیاتان پێده‌درێ تا ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر به‌رو لادان بچن هه‌ر ئه‌و دنیایه به‌ره‌و لادان ئاڕاسته ده‌گرێ) .[4]

---

[1] – (له الترغيب والترهيب ج٥ ص١٤٤ دا واهاتووه).

[2] – ضعيف.

[3]– (له سه‌نه‌ده‌كه‌دا كه‌سێك هه‌یه كه ناوی نه‌هاتووه، كه‌سه‌كانی دیكه‌ی سه‌نه‌ده‌كه صه‌حیحن، له الترغيب والترهيب ج٥ ص١٤٥ دا واهاتووه).

[4] – (له سه‌نه‌ده‌كه‌یدا مانه‌وه‌یه‌ك هه‌یه(ته‌واونیه)، له الترغيب والترهيب ج٥ ص١٤٢ دا واهاتووه).

# (ترسی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) و گریانی به دەست له ڕووداکرانەوەی دنیاوە)

بەیهەقی ج٦ ص٣٥٨ له میسوەری کوڕی مەخرەمەوە هێناویەتی دەڵێت: بڕێ دەستکەوتی قادسیه هێنرا بۆ عومەری کوڕی خەتتاب و ئەویش سەیری دەکردن و دەگریا، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفیشی لەگەڵدا بوو، عەبدولڕەحمان پێ وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمڕۆ ڕۆژی خۆشی و کامەرانیه، وتی: بەڵێ، بەلام ئەمە بچێت بۆ هەر کۆمەڵ و گەلێك دوژمنایەتی و ڕق و کینەیان بۆ بەجێ دێڵێت،[1] بەیهەقیش ج٦ ص٣٥٨ له ئیبراهیمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویەتی کاتێك خشڵ و سامانی کیسرا هێنرا بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەمی زوهری پێی وت: بۆچی له بەیتولمالدا داینانێیت؟ عومەر(رضي الله عنه) وتی: نایخەیته بەیتولمال تا دابەشی دەکەین، عومەر گریا و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی دەگریت؟ به خوا ئەمڕۆ ڕۆژی سوپاس و خۆشی و کامەرانیه، عومەر وتی: ئەم شتە(سامان) خوا بیدات بەهەر دەستە و گەلێك تووشی دوژمنایەتی و ڕق و کینەیان دەکات.[2]

بەیهەقی ج٦ ص٣٥٨ له حەسەنەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب فەرووی کیسرای بۆ هێنرا و خرایه بەردەستی، لەناو خەڵکەکەدا سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جەحشەم هەبوو؟ دەڵێت: بازنەکانی کیسرای کوڕی هورمزی بۆ فڕێدا و خستیه دەستیەوە و بازنەکانی گەیشتنە نزیکی سەرشانی کاتێك له دەستی سوڕاقەدا بینینی وتی: سوپاس بۆ خوا که بازنەکانی کیسرای کوڕی هورمز له

---

[1] – (خەرائیتیش له میسوەرەوە بەو جۆرە هێناویەتی، له کنز العمال ج٢ ص٣٢١ دا هاتووە).

[2] – (ئیبن موبارەك و عەبدولڕەزاق و ئیبن ئەبی شەیبە له ئیبراهیمەوە بەو جۆرە هێناویانە، له کنز العمال ج٢ ص٣٢١ دا هاتووە، ئەحمەد له(الزهد) و ئیبن عەساکیر له ئیبراهیمەوە بەو جۆرە بە کورتی هێناویەتی، له کنز العمال ج٢ ص١٤٦ دا هاتووە).

دەستی سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جەعشەمی ئەعرابی بەنی مودلیجدان، پاشان وتی: خوایە من دەزانم پێغەمبەرەکەت حەزی دەکرد سامانێکی دەستکەوێت تا لەپێناو تۆدا بیبەخشێت بە بەندەکانت، ئەوەت لێ دوورگرت لەبەر ویستو خواستی خۆت، پاشان وتی: خوایە دەزانم ئەبوبەکر حەزی دەکرد سامانێکی دەست کەوێت تا لە ڕێی تۆدا بیبەخشێت بە بەندەکانی تۆ، لەبەر ویستو خواستی خۆت لێت دوورگرت، خوایە پەنادەگرم بەتۆ ئەمە داو و تێکەوتنێکە بۆ عومەر پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە(ایحسبون انما نمدهم به من مال وبنين نسارع لهم الخيرات بل لايشعرون).[1]

ئەحمەد بە سەنەدی حەسەن و بەزارو ئەبویەعلا لە ئەبوسنانی دوئیلیەوە هێناویانە هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتابو دەستەیەکی کۆچەرانی یەکەمی لەلابوو عومەر ناردی شوشەیەکی بۆنیان لە قەڵای عێراقەوە بۆ هێنا، خاتەمێکی تێدابوو، یەکێ لە کوڕەکانی بردیو خستیە ناودەمی، عومەر لێی سەندو گریاو ئەوانەی چواردەوریان پێیان وت بۆچی دەگریت لەکاتێکدا خوای گەورە سەری خستیت بەسەر دوژمنداو دڵخۆشی کردویت؟ عومەر(رضي الله عنه) وتی: گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بوو دەیفەرموو(لافتح الدنيا على احد الا لقى الله عز وجل بينهم العداوة والبغضاء الى يوم القيامة)واتە(دنیا بەڕووی هەرکەسدا بکرێتەوە خوای گەورە تا ڕۆژی دوایی دوژمنایەتی ڕقو کینە دەخاتە نێوانیانەوە) منیش لەوە دەترسم.[2][3]

حەمیدی و ئیبن سەعد ج٣ ص٢٠٧ و بەزار و سەعیدی کوڕی مەنسور و بەیهەقی ج٤ ص٣٥٨و جگە لەوانیش لە ئیبن عەبباسەوە هێناویانە دەڵێت:

---

[1] – (عەبدی کوڕی حەمیدو ئیبن مونزیرو ئیبن عەساکیر لە حەسەنەوە بەو جۆرە هێناویانە، لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٤١٢ دا واهاتووە).

[2] – حسن.

[3] – لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٤٤ دا واهاتووە.

عومەری کوڕی خەتتاب کە نوێژی دەکرد لای خەڵك دادەنیشێت، هەرکەس ئیشێکی هەبوایە دەیدواند، کەس ئیشی نەبوایە هەڵدەساو نوێژی بۆ خەڵك دەکردو لەلایان دانەدەنیشت، منیش وتم: ئەی یەرفا ئەمیری باوەڕداران چیەتی؟ وتی: هیچی نیە. دانیشتم و عوسمانی کوڕی عەففان(ﷺ) هات و دانیشت و یەرفا چوو و وتی: ئیبن عەففان و ئیبن عەبباس هەستن، چووین بۆ لای عومەر دەبینین لەبەردەستیدا پارسەنگێکی پڕ سامان هەیە وتی: سەیری خەڵکی مەدینەم کردو ئەم دوانەتانم بە دەوڵەمەندترین زانی، ئەم سامانە ببەن و دابەشی بکەن، چی زیادەبوو بیگێڕنەوە، عوسمان چەمیەوە و منیش لەسەر ئەژنۆ کەوتم و وتم: ئەگەر کەم بوو بۆمان زیاد دەکەیت؟ عومەر وتی: بەردێك لە شاخێك، مەگەر ئەمە هی خوانیە کە موحەممەدو پێستەڕەقەیان دەخوارد، وتم: بەرێ بەخوا، سوێند بەخوا ئەمە هی خوایەو موحەممەد زیندوبوایە ئەگەر فەتحێکی بۆ هەبوایە کارێکی جیا لەو کارەی تۆی دەکرد، عومەر توڕەبوو و وتی: ئەی چی بکەم؟ وتم: لێی دەخواردو دەرخواردی ئێمەشی دەدا، عومەر کڵپەی گریان گرتی و تا ئەوەی باری شێواو دواتر وتی: هیوام وایە بەدەست بەتاڵی لێی دەرنەچم نەبۆم بێت نە لە دژم بێت.[1]

ئەبوعوبەیدو ئیبن سەعد ج٣ ص٢١٨و ئیبن ڕاهەویەو شاشی و حەسەن لە ئیبن عەبباسەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب بانگی کردم و منیش چووم بۆ لای دەبینیم لەبەردەستیدا کەوڵێك هەبوو کە زێڕی تێدابوو، وتی: ئەمە لەنێو ئەو خەڵکەدا دابەشی بکە، خوا زاناترە کاتێك ئەمەی لە پێغەمبەرەکەی و ئەبوبەکر بە دوورگرت و دای بە من، ئایا بۆ خێرە یان بۆ شەڕو زیانە، پاشان گریا و وتی: نەسوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر بە پێغەمبەرەکەی و ئەبەبەکری نەدا نیازی پێیان خراپ نەبوو ئەگەریش دای بە عومەر لەبەر چاکەو ویستی بۆ عومەر نیە.[2]

---

[1] – كنز العمال ج٢ ص٣٢٠. هەیسەمی ج١٠ ص٢٤٢ دەڵێت: بەزار بە سەنەدی جەید هێناویەتی.

[2] – لە كنز العمال ج٢ ص٣١٧ دا واهاتووە.

ئەبوعوبەیدو عەدەنی لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ناردی بە شوێنمداو منیش چووم بۆ لای، کاتێك گەیشتمە بەردەرگا گوێم لە نوزەو گریانی بوو، وتم: انا لله وانا الیه راجعون، بۆ ئەمیری باوەڕداران سوێند بەخوا موسیبەتیٚ هاتووە، کە چووم بۆ لای سەرشانیم گرت و وتم: هیچ نیە هیچ نیە ئەی ئەمیری باوەڕداران، وتی: بەڵکو تەواوو سەخت و خراپە، دەستی گرتم و بردمیە ژوورەوە سەیرمکرد بڕیٚ توێشوو لەسەریەك دانراون، وتی: ئێستا دەردی بنەماڵەی خەتتابە لەبەردەم خوادا، خوای گەورە ئەگەر بیویستایە ئەمەی دەدا بە دوو هاوەڵەکەم – واتە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر – تا سونەتێکیان بکردایە لەسەری و منیش پێشەنگیم پێبوەبکردایە وتم: دانیشە با بیر بکەینەوە، چوار هەزار چوار هەزارمان بۆ دایکی باوەڕداران دانا، بۆ کۆچەران چوار هەزار چوار هەزارو بۆ خەڵکەکەی دیکەش دوو هەزار دوو هەزار تا ئەوەی هەموومان دابەشکرد.[1]

## (ترس و گریانی عەبدولڕەحانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه) لە بەرووداکرانەوەی دنیا)

بوخاری ص٥٧٩ لە سەعیدی کوڕی ئیبراهیم لە باوکیەوە هێناویەتی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بە ڕۆژوو بوو و خواردنێکی بۆ هێنرا، وتی: موصعەبی کوڕی عومەیر زۆر لە من باشتربوو لە عەبایەکدا کفن کرا کە سەری دادەپۆشرا قاچەکانی دەردەکەوتن، کاتێك قاچەکانی دادەپۆشرا سەری دەردەکەوت – بینیم وتی: حەمزە لە من چاکتر بوو کوژرا، دواتر دنیا بەوجۆرە لە ڕوومانداا

[1] – (لە کنز العمال ج٢ ص٣١٨ دا واهاتووە).

كرايه‌وه – يان وتی: به‌مجۆره له دنيامان پێدراو ده‌ترسين چاكه‌كانمان بۆ پێش خرابن، پاشان ده‌گريا تا خواردنه‌وه‌كه‌ی به‌جێهێشت[1][2].

ئه‌بونه‌عيم له الحلية ج١ ص٩٩ له نه‌وفه‌لی كوڕی ئياسی هوزه‌ليه‌وه هێناويه‌تی ده‌ڵێت: عه‌بدولڕه‌حمانی كوڕی عه‌وف لامان داده‌نيشت و چاكترين هاوكۆڕ بوو، ڕۆژێك لامان نه‌بوو تا چووين بۆ ماڵی، چوويه ژوورو خۆی شۆردو دواتر هاته ده‌ره‌وه‌و لامان دانيشت، له‌گانێكمان بۆ هێنرا كه نان و گۆشتی تێدابوو، كه دانرا عه‌بدولڕحمانی كوڕی عه‌وف گريا، پێمان وت: ئه‌ی ئه‌بوموحه‌مه‌د بۆچی ده‌گريت؟ وتی: پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) دنيای به‌جێهێشت و خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی تێريان نه‌خوارد له نانی گه‌نم، (ترمزی‌و سه‌راج له نه‌وفه‌له‌وه به‌و جۆره هێناويانه[3].

به‌زار له ئوم سه‌له‌مه‌وه(رضي الله عنها) هێناويه‌تی عه‌بدولڕه‌حمانی كوڕی عه‌وف چوو بۆ لای‌و وتی: دايه گيان ترسام سامانم له‌ناو ببات، من له‌ناو قوڕه‌يشدا له هه‌موان سامانم زياتره، وتی: كوڕی شيرينم ببه‌خشه من له پێغه‌مبه‌رم(صلى الله عليه وسلم) بيست ده‌يفه‌رموو(ان من اصحابي من لايراني بعد افارقه)واته (له‌ناو هاوه‌ڵانمدا هه‌يه دوای ئه‌وه‌ی به‌جێی دێڵم نامبينێته‌وه) عه‌بدولڕه‌حمان چوويه ده‌ره‌وه‌و گه‌يشت به عومه‌ر(رضي الله عنه) و وتی:پێه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) چی به ئوم سه‌له‌مه وتووه، عومه‌ر چوو بۆ لای ئوم سه‌له‌مه‌و وتی: سوێندت ده‌ده‌م به‌خوا من له‌وانه‌م؟ وتی: نا، له‌دوای تۆيش وه‌لامی كه‌سی تر ناده‌مه‌وه[4].

---

[1] – ضعيف.

[2] – ( ئه‌بونه‌عيم له الحِليه ج٢ ص١٠٠ به‌هه‌مان شێوه هێناويه‌تی).

[3] – له الاصابة ج٢ ص٤١٧ دا واهاتووه).

[4] – (هه‌يسه‌می ج٩ ص٧٢ ده‌ڵێت: كه‌سه‌كانی سه‌نه‌ده‌كه صه‌حيحن).

# (ترس و گریانی خەبابی کوڕی ئەرەت(رضي الله عنه) لە دەست بەڕووداکرانەوەی دنیا)

ئەبویەعلاو تەبەرانی بە سەنەدی جەید لە یەحیای کوڕی جەعدەوە هێناویانە دەڵێت: خەباب(رضي الله عنه) کەوتبوو هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەردانیان کردو وتیان: ئەی ئەبو عەبدوڵڵا موژدەت لێبێت، دەچیتە سەر حەوزی موحەممەد، وتی: چۆن ئەوە دەبێت؟ ئاماژەی کرد بۆ سەرو خواروویماڵەکەی و تی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(انما يكفي احدكم كزاد الراكب).[1](بۆ هەرکامتان هێندەی توێشووی سوارێك بەسە).

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٤٥ لە تاریقی کوڕی شەهابەوە هێناویەتی دەڵێت: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەردانی خەببابیان کردو وتیان: ئەبوعەبوڵڵا موژدەت لێ بێت، براکانت بەیانی بۆیان دەخرێتەڕوو، ئەویش گریاو وتی: من ئازارم نەبوو بەڵام ئێوە کەسانێکتان بیرهێنامەوەو ناوی براکانمتان لاهێنام، ئەوانە هەموویان بە پاداشتی خۆیانەوە چوون و منیش ئەترسم پاداشتی ئەو کارانەی باسیان دەکەن ئەوەبێت کە دوای ئەوان پێمان درا.[2]ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٤٤ لە حارسەی کوڕی موزریەوە هێناویەتی دەڵێت: چووین بۆ لای خەباب و سکی لە حەوت هوە سوتێنرابوو(داخ کرابوو) وتی: ئەگەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەیفەرمووایە(لا يتمنين احدكم الموت)واتە(کەستان هیوای مەرگ نەخوازێت) هیوای مەرگم دەخواست، یەکێکیان وتی: باسی هاوەڵێتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و چوونەلای بکە، وتی: ترسام ئەوەی لامبوو لەو چل هەزار درهەمەی ماڵ بمێنێتەوە.

ئەبونەعیم ج١ ص١٤٥ لە ڕێگەیەکی دیکەوە لە حارسەوە بەو جۆرە بە کورتی هێناویەتی و ئەوەش دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووم و درهەمێکم نەبوو ئێستا

---

[1] – (لە لاالترغيب والترهيب ج٥ ص١٨٤ دا واهاتووە).

[2] – ،( ئیبن سەعد ج٣ ص١١٨ لە تاریقەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

لە پاڵ خانوەکەمدا چل هەزار درهەم هەیە، دەڵێت: دواتر کفنەکەی هێنرا، کەبینی گریاو وتی: بەڵام حەمزە کفنێکی بۆ نەبوو جگە لە عەبایەکی خەت ڕەش و سپی، کە سەری دادەپۆشرا قاچەکانی دەردەکەوتن، کە قاچەکانی دادەپۆشران سەری دەردەکەوت، تا ئەوەی درابەسەر سەریداو لەسەر قاچەکانی شمەك دانرا.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٤٥ لە ئەبووائیل و شەقیقی کوڕی سەلمەوە هێناویەتی دەڵێت: چووین بۆ لای خەباب – لەکاتی نەخۆشیدا – وتی: لەم تابوتەدا هەشتا هەزار درهەم هەیە، سوێند بەخوا ڕامنەگرتووەو لە هیچ داواکارێکم نەگرتووەتەوە، دواتر گریا، وتمان بۆچی دەگریت؟ وتی: چونکە هاوەڵانم چوون و دنیا هیچی لێ کەم نەکردنەوە، ئێمەش ماینەوە تا ئەوەی شوێنێك شك نابەین بۆیان – بۆ موسڵمانان – جگە لەناو خۆڵ، ئەبونەعیم دەڵێت: ئەبوئوسامە لە ئیدریسەوە هێناویەتی و دەڵێت: حەزم دەکرد ئەوەو ئەوە بوایە یان وتی: پشقل یان شتی تر بوایە، ئەبونەعیم ج١ ص١٤٦ لە فەرموودەکەی قەیسەوە هێناویەتی دواتر دەڵێت: کەسانێکی پێش ئێمە چوون و هیچیان لە دنیا نەبرد، ئێمە دوای ئەوانە ماینەوەە تا دنیامان هاتەپێش و کەسمان نازانین لە کوێ دایدەنێین جگە لەناو خۆڵ، موسڵمان لە هەر چیەکدا بەخشیویەتی پاداشت وەردەگرێت جگە لەو بەخشینەی بۆ ناو خۆڵە.

بوخاری لە خەببابەوە هێناویەتی و دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تەنها لەپێناو خوادا کۆچمان کردو پاداشتمان لای خوا مسۆگەر بوو، هەمانبوو چوو و لە پاداشتەکەی هیچی نەخوارد لەوانە موصعەبی کوڕی عومەیر کە لە ڕۆژی ئوحود کوژراو تەنها پارچە جلێکی بەجێهێشت، کاتێك سەریمان دادەپۆشی قاچەکانی دەردەکەوتن، کە قاچەکانیمان دادەپۆشی سەری دەردەکەوت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(غطوا بها راسه واجعلوا على رجليه الاذخر) هەمانبوو بەرهەمەکەی پێ گەیشت و دەیچنێتەوە.[2]

[1] – (ئیبن سەعد ج٣ ص١١٧ لە حارسەوە بەوجۆرە هێناویەتی).

[2] – (ئیبن سەعد ج٣ ص٨٥ و ئیبن ئەبی شەیبەش بەو جۆرە هێناویەتی و لە کنز العمال ج٧ ص٨٦ یشدا هاتووە).

# (ترس و گریانی سەلمانی فارسی(رضي الله عنه) لە بەڕووداکرانەوەی دنیا)

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٩٩ لە ئەبولبوختەری لە کەسێکی بەنی عبسەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ سەلمانی فارسی بووم، باسی فەتحی کانزاو خشڵی کیسرای کرد کە خوا پێشکەشی موسڵمانانی کرد، سەلمان وتی: ڕۆژیان دەکردەوەو دینارو درهمێك و مشتێ نانیان نەبوو، پاشان ئەی کەسی بەنی عەبەس ئاوایە، دواتر دامان بە لای(بیادرتذري) دا هەمان شتی وت.[1]

تەبەرانی لە کەسێکی بەنی عەبەسەوە هێناویەتی دەڵێت: لە پاڵ کەناری دیجلەدا لەگەڵ سەلمانی فارسی دەچووم، وتی: ئەی کەسی بەنی عەبەس دابەزەو بخۆرەوە، ئاوم خواردەوە، وتی: ئەو خواردنەوەت هیچی لە ئاوی دیجلە کەم نەکرد؟ وتم: بڕوام نیە، وتی: دەی زانیتیش وایە لێی وەردەگریت و کەم ناکات، دوایی وتی: سەرکەوە، دامان بەلای چەند خەروارێکی گەنم و جۆدا، وتی: دەڵێن ئەمە فەتحە بۆمان و سەختیشی بۆ هاوەڵانی موحەممەد نایەوە، بۆ ئێمە چاك و بۆ ئەوان خراپە؟ وتم: نازانم بەڵام دەزانم خراپەی بۆ ئێمەو چاکەی بۆ ئەوانە، وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سێ ڕۆژی یەك لە دوای یەك تێرنەبوو تا گەیشتەوە لای پەروەردگاری.[2]

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٩٥ لە ئەبوسوفیانەوە لە مامۆستاکانیەوە هێناویەتی دەڵێت: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(رضي الله عنه) چوو بۆ لای سەلمان و سەردانی کرد، سەلمان گریا، سەعد پێی وت: بۆچی دەگریت؟ دەگەیتەوە بە هاوەڵانت و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەر حەوز دەبینی و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) کە مرد لێت

---

[1] – صحيح.

[2] – (هەیسەمی ج١ ص٣٢٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا گێڕەرەوەیەك هەیە کە ناوی نەهاتووەو کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن).

ڕازیبوو، وتی: لە ترسی مەرگو حەزی دنیاوە ناگریم، بەڵام پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕایسپاردینو فەرمووی(لیکن بلغة احدکم من الدنیا کزاد الراکب)واتە(با بەشو شمەکی هەرکامتان لە دنیادا وەك توێشووی سواربێت) کەچی ئەم پشتیانە لە دەورمن – لە دەوری مەسینەیەك یان تەشتێك و شتی لەوجۆرە هەبوو – سەعد پێی وت: شتێکمان پێ بڵێ تا دوای خۆت بیگرینەبەر، پێی وت: لە کاتی بێتاقەتیتدا و لە کاتی دەستەڵاتو حوکمتدا و لە کاتی بەخشینی دەستدا خوات لەبیر بێت.[1]

ئیبن ماجە بە سەنەدی جێ متمانە لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: سەلمان(رضي الله عنه) ناساغ بوو و سەعد سەردانی کرد سەیری کرد دەگری، سەعد پێ وت: بۆچی دەگریت؟ براگیان مەگەر هاودەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەبوویت؟ مەگەر؟ مەگەر؟ سەلمان وتی: لەتاو خۆشی دنیاو ڕقم لە ڕۆژی دوایی ناگریم، بەڵکو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمایشتێکی بۆ بەجێهێشتین وادەبینم لامدابێت، وتی: چی بوو؟ وتی: ڕایسپاردین کە هەکامتان وەك توێشووی سوارێك شتی بەسە کەچی من لامداوە، تۆش ئەی سەعد لە کاتی حوکمو دابەشکردنتدا لە خوابترسە، لە کاتی ویستو سەختیدا لە خوا بترسە، سابت دەڵێت: بیستم تەنها بیستو چەند درهەمێکی لەگەڵ ئافرەتێکدا(کەنیزەکێکدا) کە لەلای بوو بەجێهێشتبوو.[2][3]

ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا لە عامری کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی سەلمان کە سەرەمەرگی هات هەندێ بێزاریو سەختییان لێ بەدیکردو وتیان: بۆچی وایت؟ ئەی ئەبوعەبدوڵڵا تۆ لە چاکەدا پێشینەت هەیە، لەگەڵ

---

[1]– ( حاکم بە صەحیحی هێناویەتی، لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٦٥ لە ئەبوسوفیانەوە لە مامۆستاکانیەوە ئەوجۆرە هێناویەتی، لە گێڕانەوەکەی حاکمدا هاتووە: لە دەوریدا تەشتێكو جامێكو مەسینەیەك هەبوو، ئیبن ئەعرابی لە ئەبوسوفیانەوە لە مامۆستاکانیەوە بە کورتی هێناویەتی، لە کنز العمال ج٢ ص١٤٧ دا واهاتووە).

[2] – حسن.

[3] – (الترغیب والترهیب ج٥ ص١٢٨).

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە چەندین جەنگ و فتوحاتی گەورەدا بەشدار بوویت، وتی: ئەوە بێزارم دەکات کاتێك ئازیزمان لێمان جیابوویەوە ڕایسپاردین و فەرمووی(لیکف المرء منکم کزاد الراکب) ئەمە بێزارم دەکات، سامانی سەلمان کۆکرایەوەو بەهاکەی پانزە درهەم بوو.[1,2]

## (ترسی ئەبوهاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی قوڕەیشی(رضي الله عنه))

ترمزی و نەسائی لە ئەبووائیلەوە هێناویانە دەڵێت: موعاویە(رضي الله عنه) هات بۆ لای ئەبوهاشمی کوڕی عوتبە(رضي الله عنه) ئەو کات نەخۆش بوو سەردانی کردو بینی دەگریا، وتی: خاڵەگیان بۆچی دەگریت؟ ئازارت هەیە یان حەزی دنیایە؟ وتی: نا، بەڵام پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕاسپاردەیەکی هەبوو کە وەرمانەگرتن وتی: چی بوو؟ وتی: بیستم دەیفەرموو(انما یکفي من جمع المال خادم و مرکب في سبیل الله)واتە(لە کۆکردنەوەی ساماندا تەنها خزمەتکارێك و سوارێك لە ڕێی خوادا بەسە) ئەمڕۆ دەبینم شتم کۆکردۆتەوە.[3,1]

---

[1] – صحیح.

[2] – ( لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٧٤ دا واهاتووە، ئیبن عەساکیر لە عامرەوە بەوجۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٤٥ دا واهاتووە بەڵام ئەوە دەڵێت: پانزە دینار بوو. لە کنز العمال لە ئیبن حیببانەوە وا هێناویەتی، ئەبونەعیمیش لە الحلیة ج١ ص١٩٧ لە عامری کوڕی عەبدوڵلاوە لەم فەرموودەدا هێناویەتی، دواتر دەڵێت: عامری کوڕی عەبدوڵلا وای وت دینار بوو، ئەوانی دیکە لەسەر ١٣ – ١٩ درهەم ڕێککەوتن، پاشان لە عەمری کوڕی نەدیمەوە هێناویەتی دەڵێت: شمەکەکانی سەلمان فرۆشران و گەیشتنە چواردە درهەم، تەبەرانی لە عەلیەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە اترغیب والترهیب ج٥ ص١٥٦ دا دەڵێت: سەنەدەکەی جەییدە بەڵام عەلی سەلمانی نەبینیوە).

[3] – صحیح.

## (ترس و گریانی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح(رضي الله عنه) لە بەڕووداکرانەوەی دنیا)

ئەحمەد لە ئەبی حەسنە موسلیمی کوڕی ئەکیەسی مەولای عەبدوڵڵای کوڕی عامر لە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحەوە هێناویەتی دەڵێت: باسی کرد هەندێ هاتن بۆ لای و بینییان دەگری، یەکێ وتی: ئەبوعوبەیدە بۆچی دەگریت؟ وتی: بۆیە دەگریم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی فەتحێکی موسڵماناندا کە بەخششی موسڵمانانی دەدا تا باسی شامی کرد فەرمووی(ان ینسا في اجلك یا اباعبیدة! فحسبك من الخدم ثلاثة خادم یخدمك، و خادم یسافر معك، وخادم یخدمك اهلك و یرد علیهم، و حسبك من الدواب ثلاثة: دابة لرحلك و دابة لنقلك و دابة لغلامك)واتە( ئەی ئەبوو عوبەیدە ئەگەر مەرگت دواکەوت ئەوا لە خزمەتکاردا سێ خزمەتکارت بەسە، خزمەتکارێك خزمەتی خۆت بکات، خزمەتکارێك سەفەرت لەگەڵ بکات، خزمەتکارێك خزمەتی ماڵ و منداڵت بکات و کاریان بۆ بکات، لە ئاژەڵیشدا سیانت بەسە، ئاژەڵێکیان بۆ بارو کوڵت ئاژەڵێك بۆ گواستنەوت، ئاژەڵێك بۆ غوڵامەکەت)

---

[1]– ئیبن ماجە لە ئەبووائیل لە سەمرەی کوڕی سەهم لە کەسێکی هۆزەکەیەوە کە ناوی نەهێناوە هێناویەتی دەڵێت: لای ئەبوهاشمی کوڕی عوتبە دابەزیم و موعاویە هات بۆ لای – فەموودەکە بەو جۆرە دێنێت – ئیبن حیبان لە صەحیحەکەیدا لە سەمرەی کوڕی سەهمەوە هێناویەتی دەڵێت: لای ئەبوهاشمی کوڕی عوتبە دابەزیم ئەو کات ناساغ بوو، موعاویە هات بۆ لای – فەرموودەکە دێنێت و ڕەزینیش هێناویەتی و ئەوەی بۆ زیاد کردووە کە مرد ئەوەی بەجێی هێشتبوو کۆکرایەوە گەیشتە سی درهەم، ئەو شتەشم حساب کرد کە تیایدا هەویری دەشێلاو تیایدا دەیخوارد،( لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٨٤ دا واهاتووە، بەغەوی و ئیبن سەکەن لە ئەبووائیل لە سەمرەی کوڕی سەهمی کەسێکی هۆزەکەیەوە هێناویەتی، لە الاصابة ج٤ ص٢٠١ دا هاتووەو دەڵێت: ترمزی و جگە لەویش بە سەنەدی صەحیح لە ئەبووائیلەوە هێناویەتی دەڵێت: موعاویە هات بۆ لای ئەبوهاشم – فەرموودەکە دێنێت – حاکم ج٣ ص٦٣٨ لە ئەبووائیل و ئیبن عەساکیر لە ڕێگەی سەمرەوە هێناویانە، لە کنز العمال ج٢ ص١٤٩ یشدا هاتووە).

پاشان من سەیری ماڵەکەم دەکەم پڕە لە کۆیلە، سەیری گەورەکەم دەکەم دەبینم پڕە لە ئاژەڵ و ئەسپ، دەی چۆن بگەمەوە بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە دوای ئەمە لە کاتێکدا پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) وەسیەتی بۆ کردین(ان احبکم الي و قربکم مني من لقيني على مثل الحال الذي فارقني عليها)واتە(خۆشەویستترین و نزیکترینتان لە من ئەوەیە بەو بارەوە بگاتەوە پێم کە لەسەری لێم جیابوەتەوە)[1].[2]

## (دنیا نەویستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و هاوەڵانی و لە دنیا دەرچوون بەبێ کردنەبەری)

## (دنیا نەویستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئەحمەد بە سەنەدی صەحیح لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەر حەسیرێك بوو، دەڵێت: دانیشتم و جلەکەی لەسەری بوو هیچی تری لەسەر نەبوو، حەسیرەکە لەسەر لاتەنیشت و لەشی دەرکەوتبوو، بڕێ گەنمم لەگەڵ لەگەڵ گەڵای داری صەمغم لەلایەکی ژوورەکەدا بینی، هەروەها پێستەیەکم دی کە هەڵواسراو هەبوو، چاوەکانم فرمێسکیان ڕشت و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بۆچی دەگریت ئەی ئیبن خەتتاب؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن نەگریم کە ئەو حەسیرە کاری کردووەتە سەر لەشت و ئەوەش خەزێنەکەتە تەنها ئەوەی تێدا دەبینم، کەچی کیسراو قەیسەر لەناو بەرهەم و ڕووبارناندا دەژین و تۆش پێغەمبەرو هەڵبژاردەی خوایت و ئەوەت هەیە، فەرمووی(یا ابن خطاب اما ترضى ان تکون لنا الاخرة ولهم

---

[1] – ضعیف.

[2] – (هەیسەمی ج١٠ ص٢٥٣ دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوە و لە سەنەدەکەدا کەسێك هەیە ناوی نەهاتووە و کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن، تەواو، ئیبن عەساکیریش بەوجۆرە هێناویەتی لە منتخب ج٥ ص٧٣ دا واهاتووە).

الدنیا؟)واتە(ئەی ئیبن خەتتاب ئایا ڕازی نیت ڕۆژی دوایی بۆ ئێمەو دنیا بۆ ئەوان بێت؟) حاکم هێناویەتی و دەڵێت: لەسەر مەرجی موسلیم صەحیح و دەقەکەشی ئەوەیە عومەر وتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پاش ئەوەی مۆڵەتم وەرگرت، لە ژوورێکیدا لەسەر بەرگەکەی ڕاکشابوو و بەشێکی لەسەر خۆڵ بوو، لە ژێر سەریدا پشتیەك بوو کە گەڵای خورما داپۆشرابوو، لەسەر سەریشیەو لە کەنارێکی ژوورەکەدا، سەلامم لێکردو دانیشتم و وتم: تۆ پێغەمبەرو هەڵبژاردەی خوایت و کیسراو قەیسەریش لەسەر کورسی زێڕو فەرشی ئاوریشم بن، فەرمووی(اولئك عجلت لهم طيباتهم و هي وشيكة الانقطاع، وانا قوم اخرت لنا طيباتنا في اخرتنا)واتە(ئەوانە خۆشیەکانیان بۆ پێش خراوەو زوو نامێنێ، ئێمەش خەڵکێکین خۆشیەکانمان بۆ دواخراوە بۆ ڕۆژی دوایی)[1].[2]

ئەحمەدو ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا و بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسەر حەسیرێك بوو و عومەر چوویە ژوورەوە بۆ لای و حەسیرەکە کاری کردبوویە سەر جەستەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی کومبارێ یان ڕاخەرێ ناخەیتە ژێرت کە لەوە نەرمتربێت، فەرمووی(مالي وللدنيا، ما مثلي و مثل الدنيا الا كراكب سار في يوم صائف فاستظل تحت شجرة ساعة راح و تركها)واتە(من و دنیا چیمان بەچی، نمونەی من و

---

[1] - حسن.

[2]- ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا لە ئەنەسەوە هێناویەتی عومەر(رضي الله عنه) چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە هەمان شێوە فەرموودەکە دێنێت، لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٦١ دا هاتووە، ئەحمەدو ئەبوعلاش بە هەمان شێوە فەرموودەکەی ئەنەسیان هێناوە، هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٦ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد کەسانی صەحیحن جگە لە موبارەکی کوڕی فوزالە کە هەندێ متمانەی پێ دەدەن و هەندێکیش بلاوازی دەزانن، تەواو).

دنیا وەك سوارێك وایە كە لە ڕۆژێكی گەرما و خۆراویدا بڕوات، لە ژێر سایەی سێبەرێكیدا تاوێك لابدات دواتر بڕاو بەجێی بهێڵێت)[1,2].

بەیهەقی لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێكی پشتیوانان هات بۆ لامو سەیری ڕاخەرەكەی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) كرد كە قەیفەیەك بوو، ڕاخەرێكی پەژمینی بۆ ناردمو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتە ژوورەوە بۆ لامو فەرمووی(ئەی عائیشە ئەمە چییە؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا فلانە ئافرەت هاتو ڕاخەرەكەی تۆی بینی و چوو و ئەمەی بۆ ناردم، فەرمووی(بیگێڕەوە عائیشە، سوێند بەخوا ئەگەر بمویستایە خوای گەورە شاخی زێڕو زیوی پێدەدام)[3,4].

ئیبن ماجە و حاكم لە ئەنەسەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەرگی خوری دەپۆشی و پێڵاوی قایشداری دەكردەپێ،، دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نانێكی ناباشی دەخواردو جلێكی ڕەقو ناخۆشی دەپۆشی، بە حەسەن وترا: نانەكە چۆن بوو؟ وتی: هێندە ڕەقو ناخۆش بوو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ قومێ ئاودا ئینجا قووتی دەدا[5,1].

---

[1] – صحيح.

[2] – (لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٦٠ دا هاتووە. ترمزی بە صەحیحی و ئیبن ماجە لە ئیبن مەسعودەوە بەو جۆرە هێناویەتی، تەبەرانی و ئەبوشەیخ لە ئیبن مەسعودەوە بە شێوەی فەرموودەكەی عومەر هێناویەتی، لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٥٩ دا هاتووە، ئیبن حیببان و تەبەرانی لە عائیشەوە هێناویانە، لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٦٢ و المجمع ج١٠ ص٣٢٧ دا واهاتووە).

[3] ئەبوشەیخ بە دوورو درێژتر لەوە هێناویەتی، لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٦٣ دا واهاتووە.

[4] – حسن.

[5] – ضعيف.

ئیبن ماجەو ئیبن ئەبی دنیا لە(کتاب الجوع) و جگە لەویش لە ئوم ئەیمەنەوە هێناویانە گەنمێکی هاڕی و کردی بە خواردن بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەمە چییە ؟) وتی: خواردنێکە لای خۆمان ئامادەی دەکەین حەزمکرد بۆ تۆیشی دروست بکەم، فەرمووی(بیگێڕەوەو دوایی بیشێلە)[٢،٣].

تەبەرانی لە سەلمای ژنی ئەبوڕافیعەوە هێناویەتی دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی و عەبدوڵلای کوڕی جەعفەرو عەبدوڵلای کوڕی عەبباس هاتن بۆ لام، وتیان: بڕێ لە خواردنمان بۆ دروست بکە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حەزی بە خواردنی دەکرد، وتی: کوڕە شیرینەکانم ئەمڕۆ حەزی پێ ناکەن، هەستام و گەنمم هێنا و شێلام و شێوە نانێکم ئامادەکردو چەوریەکەشی زەیت بوو، بیبەرم بەسەردا کردو بردم بۆیان و وتم: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)حەزی لەمەبوو.[٤]

ئەبوشەیخی کوڕی دییان ل(کتاب الثواب) لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەرچووین تا چوویە باخ و حەوشەیەکی پشتیوانان و لە خورماکەی هەڵدەگرت و دەیخوارد و پێی فەرمووم(ئەی ئیبن عومەر بۆچی ناخۆیت؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا حەزی پێ ناکەم، فەرمووی(بەڵام من حەزی پێ دەکەم و ئەمە بەرەبەیانی چوارەم ڕۆژە کە هیچ خواردنێك ناخۆم، ئەگەر بمویستایە داوام دەکرد لە پەروەردگارم، ئەویش وەك موڵکی کیسراو قەیسەری پێ

---

[١]- (لە سەنەدەکەدا یوسفی کوڕی کەسیر هەیە کە لە نووحی کوڕی زەکوان نادیارە، حاکم دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە، لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٦٣ یشدا هاتووە).

[٢] – حسن.

[٣] – ( لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٥٤ دا واهاتووە).

[٤] – (هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە فائیدی مەولای کوڕی ئەبوڕافیع، لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٥٩ دا دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و سەنەدەکەی جەییدە).

دەبەخشیم، ئیتر ئەی ئیبن عومەر ئەگەر لەناو خەڵکێکدا مایتەوە کە ڕۆزی ساڵیان دەشاردەوەو متمانە لاواز دەبوو چی دەکەیت؟) سوێند بەخوا هێندەی نەبرد ئەم ئایەتە دابەزی(و کاین من دابة لاتحمل رزقها الله یروقها و ایاکم وهو السمیع العلیم) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(خوای گەورە فەرمانی پیّ نەکردووم بە خەزێنەی دنیاو شوێنکەوتنی ئارەزووەکان، هەرکەس خەزێنەی دنیا بکاتو نیازی ژیانێکی مانەوەبێت ئەوا ژیان بەدەستی خوایە، بزانن من دینارو درهەمێك ناهێڵمەوەو هیچ ڕۆزیەکیش بۆ بەیانی ناشارمەوە).[1]

تەبەرانی لە(المعجم الاوسط) لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: قاپێکی شیرو هەنگوین هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی(شربتین في شربة و ادمین في قدح! لاحاجة لي به، اما اني لاازعم انه حرام ولکن اکره ان یسالني الله عزوجل عن فضول الدنیا یوم القیامة، تواصع ذکر الموت احبه الله)(دوو خواردنەوە لە یەك دانەداو دوو شله لە قاپێکدا، هیچ پێویستیەکم پێی نیە، من ناڵێم حەرامە، بەڵام حەزناکەم لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە لەسەر زیادەی دنیا پرسیارم لیّ بکات، لەبەر خوا خاکی بە، هەرکەس لەبەر خوا خاکی بێت خوا بەرزی ڕادەگرێت، هەرکەس خۆبەزلزان بێت خوا ڕسوای دەکات، هەرکەس دەستیگرتەوە خوا دەوڵەمەندی دەکات، هەرکەس زۆر بیری مردن بکات خوا خۆشی دەوێت)[2][3].

---

[1] – (لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٤٩ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی حاتەم لە ئیبن عومەرەوە بەوجۆرە هێناویەتی، لە سەنەدەکەدا ئەبولعەتووق جوزەری هەیە کە لاوازە، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٣ ص٤٢٠ دا واهاتووە).

[2] – ضعیف.

[3] – ( لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٥٨ دا واهاتووە، هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا نەعیمی کوڕی مورعی عەنبەری هەیە کە ئیبن حیببان متمانەی پێدەداتو چەندێکی دیکەش بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جیّ متمانەن).

# (دنیانەویستی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه))

بەزار لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئەبوبەکر(رضي الله عنه) بووین کە داوای ئاوی کرد، ئاو و هەنگوین هێنرا، کە خستیە سەر دەستی گریاو کڵپە گرتی و تا وامانزانی تووشی شتێك بووە، هیچ پرسیارمان لێ نەکرد، کە لێبوویەوە وتمان: ئەی خەلیفەی پیغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چی وایکرد بەو جۆرە بگریت؟ وتی: من لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووم کە بینیم شتێکی لە خۆی دوور دەگرت و منیش هیچم نەدەبینی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەبینم پاڵ دەنێیت و هیچ نابینم؟ فەرمووی(الدنیا تكوعت لي فقلت اليك عني فقالت ام انك لست بمدركي)واتە(دنیا کشا بۆم، وتم: لێم دوور بکەوەرەوە، وتی: تۆ پێم ناگەیت) ئەبوبەکر وتی: ئەوەم لەسەر سەخت بوو ترسام لە فەرمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لامدابێت و دنیا پێم گەیشتبێت[1] [2].

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٠ لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هێناویەتی ئەبوبەکر داوای ئاوی کردو قاپێکی بۆ هێنرا کە ئاو و هەنگوینی تێدابێت، کاتێك نزیکی دەمی کردەوە گریا و ئەوانەی چواردەوری لەلای بوون گریان، بێدەنگ بوو و ئەوانیش بێدەنگ بوون، دواتر گەڕایەوەو گریا تا وایانزانی ناتوانن پرسیاری لێبکەن، دواتر ڕووخساری سڕی و گیانێکی بە بەردا هاتەوە، پێیان وت بۆچی

---

[1] - ضعیف.

[2] - ( هەیسەمی ج١٠ ص٢٥٤ دەڵێت: بەزار گێڕاویەتیەوەو لە سەنەدەکەدا عەبدولواحیدی کوڕی زەیدی زاهید هەیە کە لای زۆرینە لاوازەو ئیبن حیببانیش لە جێ متمانەکاندا ناوی هێناوەو دەڵێت: فەرموودەی ئەگەر لەسەریەوە بێت بەجێمتمانە دادەنرێت، کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو. لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٦٧ دا دەڵێت: ئیبن ئەبی دنیا و بەزار هێناویانەو گێڕەرەوەکانی جێ متمانەن جگە لە عەبدولواحیدی کوڕی زەید، ئیبن حیببان هەمان قسەی پێشتری لەسەر هێناوە، تەواو).

واگریایت؟ بەهەمان شێوە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیادکردووەو گریا و وتی: سوێند بە خوا ئەگەر تۆ لە دەستم ڕزگار بیت ئەوانی ترت لە دەستم ڕزگاریان نابێت.[1]

ئەحمەد لە الزهد لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر(رضي الله عنه) مردو دینارو درهەمێکی بەجێنەهێشتبوو، پێشتر سامانی خۆی بردو خستیە بەیتولمالەوە، هەروەها لە عروەوە هێناویەتی کاتێك ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە چی درهەمو دیناری هەبوو لە بەیتولمالی موسڵماناندا دایناو وتی: من بازرگانیم پێوە دەکردو کارم پێوە کرد، کاتێك بووم بە خەلیفەی موسڵمانان ڕێیان نەدا بچم بە دوای بازرگانیدا.[2]

ئیبن سەعد لە عەتای کوڕی سائیبەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك بەیعەت درا بە ئەبوبەکر لەسەر شانی بڕێ عەبا هەبوو دەچوو بۆ بازاڕ، عومەر وتی: بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: بۆ بازاڕ. وتی: چیدەکەیت لە کاتێکدا بویت بە خەلیفەی موسڵمانان؟ وتی: ئەی لە کوێ شتێ بۆ ماڵو منداڵم پەیدابکەم؟ عومەر وتی: وەرە ئەبوعوبەیدە شتێکت بۆ دەبڕێتەوە، چوون بۆ لای ئەبوعوبەیدەو ئەویش وتی: بەشی دوو کەسی کۆچەرانت بۆ دەبڕمەوە کە چاکترینو باشترینیان نەبێت، بەرگی زستانو هاوینیشت بۆ دەبڕمەوە، ئەگەر ویستت بیگێڕەوەو هی تربێنە، بۆ هەر ڕۆژێك نیو مەڕیان دانا لەگەڵ پۆشتەی سەرو سنگ.

لە حەمیدی کوڕی هیلالەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتیان هێندە ببڕنەوە ببۆ خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەشی بکات، وتیان: باشە، عەباکانی ئەگەر داینان لەبری ئەوان هاوشێوەیان ببات و ئەگەر چوو بۆ سەفەر وڵاخی بۆ دابین دەکەینو خەرجی بۆ ژنو منالی دەکێشین وەك چۆن پێشتر خەرجی ژنو منالی دەکێشا پێش ئەوەی ببێتە خەلیفە، ئەبوبەکر وتی: ڕازیم.[3]

[1]- ( حاکم و بەیهەقی بەوجۆرە هێناویانە، لە کنز العمال ج٤ ص ٣٧ دا واهاتووە).

[2] – ( لە کنز العمال ج٣ ص١٣٢ دا واهاتووە).

[3] – (لە کنز العمال ج٣ ص١٣٠ دا واهاتووە

# (دنیا نەویستی عومەری کوڕی خەتتاب(رخ))

تەبەری ج٤ ص١٦٤ لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب بوو بە خەلیفە لەسەر هەمان ڕۆزیی ئەبوبەکر چوو کە بۆیان بڕیبوویەوە، ئەڵام دواتر پێویستی زیاتری کرد، بڕێ لە کۆچەران لەوانە عوسمان و عەلی و تەلحەو زوبەیر(رضي الله عنهم) کۆبوونەوە، زوبەیر وتی: بەڵکو بڵێین خەرجی عومەر زیاد بکات چونکە پێویستیەتی، عەلی وتی: ئێمەش پێشتر ئەو نیازەمان هەبوو، دەی با بچین، عوسمان وتی: ئەوە عومەرە با بچین ڕاوێژی پێ بکەین، وتیان دەچین بۆ لای حەفسەو پرسیاری لێ دەکەین و داوادەکەین بیشارێتەوە، چوون بۆ لای و فەرمانیان کرد تا هەواڵی دەستەیەك بهێنێ و ناوی کەسی لانەبات مەگەر ئەوەی بەوە ڕازی بێت، ئینجا لەلای چوون، لەو بارەدا عومەر گەیشت و تووڕەیی لە ڕووخساریدا بەدیکرا وتی: ئەوانە کێن؟ وتی: پێویست ناکات بیانناسیت تا ڕای تۆ دەزانم، وتی: ئەگەر بمزانیایە کێن ڕووم ڕەش دەکردن تۆ لە نێوان من و ئەواندایت سوێندت دەدەم بەخوا چاکترین بەرگی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە ماڵتدا چی بوو؟ وتی: دوو کراسی بەرگ کەتانی کە بۆ کاتی هاتنی وەفد دەیکردنەبەر، و لە ڕۆژی هەینیشدا وتاری پێ دەدان، وتی: ئەی چ خواردنێکی دەخوارد، تۆ دەیزانیت؟ وتی: نانێکی گەنمان برژاند و چەوریمان کرد بەسەریداو بە ڕۆن تەڕمانکردو لێی خواردو لەبەر حەزبوونی لێی. وتی: ئەی ڕاخەری چی بوو؟ وتی: پۆشتەیەکی چڕۆ شلۆق کە لە هاویندا دەمانخستە ژێرمان لە زستاندا نیوەیمان ڕادەخست و نیوەکەی دیکەشمان دەدا بەسەرماندا، وتی: ئەی حەفسە دەی پێیان بڵێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە پێوانەوە زیادەی لە شوێنی خۆی داناو پشکی خۆی دواخست، دەی بەخوا منیش وادەکەم، نمونەی من و دوو هاوەڵەکەم وەك سێ کەس وایە کە ڕێگەیەك دەگرنەبەر، زیادەیەکی توێشووی هەبووەو گەیشتووە، دووەمیش هەروای کردووە، دواتر سێیەم هاتووە ئەگەر ڕێی ئەوان بگرێتەبەرو بە

بەش و توێشووی ئەوان ڕازی بێت پێیان دەگات و لەگەڵیان دەبێت، ئەگەر ڕێگەیەکی دیکە بگرێتەبەر ناگات پێیان.[1]

ئیبن عەساکیر لە حەسەنی بەسریەوە هێناویەتی دەڵێت: چوومە کۆڕێکی مزگەوتی بەسرەو سەیرمکرد دەستەیەکی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باسی دنیا نەویستی ئەبوبەکرو عومەرو فەتحی ئەو دوانە لە ئیسلامداو ژیان پاکییان باس دەکەن، لێیان نزیك بوومەوە، لە نێوانیاندا ئەحنەفی کوڕی قەیسی تەمیمی(رضي الله عنه) هەبوو، گوێم لێی بوو وتی: عومەری کوڕی خەتتاب لە سریەیەکدا بەرەو عێراقی بەڕێکردین، خوای گەورە عێراق و وڵاتی فارسی بۆ فەتح کردین، تیایدا دەستکەوتی فارس و خوراسانمان بەدەستهێنا و لەگەڵ خۆمان هێنامان و لێمان هەڵگرت و کردەبەر، کە هاتین بۆ لای عومەر ڕووی لێ وەرگێڕاین و قسەی لەگەڵ نەکردین، ئەمە لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەخت بوو، عەبدوڵڵای کوڕی کە لە مزگەوت دانیشتبوو، سکاڵامان لا کرد کە ئەمیری باوەڕداران ئەو جلەی لەبەر دیوین کە نەیبینیبوو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکری صدیقی خەلیفە بیپۆشن، ئێمەش چووینەماڵمان و جلەکانمان لابردو بە جلی پێشترمانەوە چووین بۆ لای، سەلامی لە یەکە بە یەکەمان کردو دەستی کردە ملی یەکە بە یەکەمان وەك ئەوەی پێشتر نەیبینیبین، ئێمەش دەستکەوتەکانمان خستە بەردەستی و ئەویش بە یەکسانی لە نێوانماندا دابەشی کرد، لەنێو دەستەوتەکاندا بەرچینەیەکی جۆرەکانی زەردو سەوزی تێکەڵەی هەبوو، عومەر چەشتی سەیری کرد تام و بۆنی خۆشە، بۆیە ڕووی تێکردین و وتی: سوێند بەخوا ئەی کۆمەڵی کۆچەران و پشتیوانان لە نێوتاندا کوڕو باوك و برا دەکوژرێت لەسەر ئەم خواردنە، پاشان فەرمانی کردو برا بۆ کوڕانی ئەوانەی لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) کوژرابوون لە کۆچەران و پشتیوانانیش،

[1]– (ئیبن عەساکیر لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە بەو جۆرە هێناویەتی. منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠٨).

پاشان عومەر هەستاو چوون بە دوایدا هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) چووین، وتیان: ئەی کۆمەڵی کۆچەران و پشتیوانان سەبارەت بە دنیا نەویستی و جوانی و پاکی ئەم کابرایە چی دەڵێن؟ بە ڕاستی لەو کاتەوەی لەسەر دەستی ئەو خوای گەورە وڵاتی کیسراو قەیسەری بۆ فەتح کردووین و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو وەفدی عەرەب و عەجەمی داوینەتە دەست دێن بۆ لای و ئەو جبەیەی لەسەر دەبینین کە دەبینن کە دوانزە پینەی تیایە، ئەگەر پرسیار لە کۆمەڵی هاوەڵانی موحەممەد بکەن ئێوە گەورەی هاودەمانی خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێشینەی کۆچەران و پشتیوانانن بەڵکو ئەو جبەیە بگۆڕێت بە کراسێکی نەرمی وا کە ڕەنگ و بۆیەکی هەبێت، با بەیانییان قاپی خواردن و ئێوارانیش قاپێ خواردن بۆ خۆی و کۆچەران و پشتیوانانی دەوری هەبێت، هەموویان وتیان: ئەمە تەنها قسەی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە، چونکە لە هەمووان زیاتر دەتوانێ بیدوێنێ و لە کچەکەیەوە خزمیەتی – یان حەفسەی کچی – چونکە ژنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و لەبەر پلەی پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لێدەگرێت، ئەوانیش عەلییان دواند، عەلی وتی: من ئەوە ناکەم بەڵام با ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە بکەن چونکە ئەوان دایکانی باوەڕدارانن ودەوێرن پێی بڵێن، ئەحنەف کوڕی قەیس دەڵێت: داوایان کرد لە عائیشەو حەفصە هەردووکیان پێکەوە بوون، عائیشە وتی: من ئەوە بە ئەمیری باوەڕداران دەڵێم. حەفصە وتی: بڕواناکەم بیکات و دواتریش بۆت دەردەکەوێت، چوون بۆ لای ئەمیری باوەڕداران. ئەویش لە خۆی نزیک کردنەوە، عائیشە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەت دەدەیت قسەت لەگەڵ بکەم؟ وتی: بفەرموو ئەی دایکی باوەڕداران. وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو بەهەشت و ڕەزامەندی پەروەردگاری چوو و دنیای نەویست و دنیاش ئەوی نەویست، ئەبوبەکریش پاش زیندووکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و کوشتی درۆزنان و تێکشکاندنی بەڵگەخوازی پووچەڵای پاش دادپەروەری لەناو هاوڵاتیان و یەکسانی دابەشکاری و ڕەزامەندی پەروەردگاردا بە شوێن پێی پێغەمبەردا(ﷺ) چوو و خوا بردیەوە بۆ ناو ڕەحمەت و ڕەزامەندی

خۆی و گەیاندیەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) لە(الرفیق الاعلی) ئەم کەسە دنیای نەویست و دنیاش ئەوی نەویست، خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ فەتحی خشڵ و کانزای کیسراو قەیسەرو وڵاتی هەردوکیانی هێنایەدی، سامانی ئەو دوو وڵاتە هێنرا بۆت و شوێنەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ملکەچت بوون و ئێمەش داوای پشتگیریزیاتری ئیسلام لەلایەن پەروەردگارەوە دەکەین، نێردراوانی عەجەم و وەفدەکانی عەرەب دێن بۆ لات و دێن و دەچن و تۆش ئەو جبەت لەبەرتە، دوانزە پینەی تیایە، بەڵکو بیگۆڕیت بە جلێکی نەرم کە ڕەنگ و بۆیەکی هەبێت و بەیانیان نانت بۆ هێنریٚ و ئێوارانیش قاپیٚ نان بۆ خۆت و کۆچەران و پشتیوانانی لای خۆت بهێنرێت. عومەر ئەوکات بە سەختی گریا و دواتر وتی: بۆ خوا پرسیارت لیٚ دەکەم ئایا دەزانیت پێغەمبەر(ﷺ) دە ڕۆژ یان پێنج یان سیٚ ڕۆژ یان نێوانی ئێوارەو بەیانیەك تێرنان بوو تا گەڕایەوە لای پەروەردگاری؟ وتی: نا، ئەویش ڕووی کردە عائیشەو وتی: بینیوتە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر سفرەیەك لە بەرزی بستێکی سەر زەویەوە خواردنی بۆ بهێنرێت لەسەر زەوی دایدەناو فەرمانی دەکرد سفرەکە لابرێت، وانیە؟ وتیان: بەریٚ وەڵڵا. عومەر بە هەردووکیانی وت: ئێوە ژنانی پێغەمبەر(ﷺ) و دایکانی باوەڕداراننن، مافتان لەسەر باوەڕداران هەیە بەتایبەت لەسەر من، بەڵام هاتوون حەزی دنیاییم زیاد بکەن و منیش دەزانم پێغەمبەر(ﷺ) جبەیەکی خوری پۆشی لەتاو ڕەقی و نالەباریەکەیدا بەرگەکەی هەڵدەپرواند، ئایا ئەمە دەزانن؟ وتیان: بەریٚ وەڵڵا وایە، وتی: دەزانن پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر عەبایەك لە ماڵەکەیدا دەکەوت ئەی عائیشە، بە ڕۆژ ڕادەخراو بە شەو جێگەی خەوتن بوو، ئێمە دەچووین بۆ لای دەمانبینی کاریگەری حەسیرەکە لەسەر لەشی دەرکەوتووە، ئەی حەفسە تۆ پێم بڵیٚ شەوێك جێی نەرمت بۆ ڕاخست ئەویش نەرمیەکەی بەدیکرد ڕاکشاو لەخەو هەڵنەسا تا بیلال بانگی دا، پێی فەرموویت((یا حفصة ماذا صنعت؟ اتیت المهاد حتی ذهب بي النوم الی الصباح؟))واتە((ئەی حەفسە چیت کرد؟ ئەمشەو جێی نەرمت ڕاخست تا خەو بردمیەوە تا بەیانی؟)) من و دنیا

لە کویێ، بۆچی تووشی ڕاخەری نەرمم دەکەن، ئەی حەفصە مەگەر نازانیت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خوا لێی خۆش ببوو لە ڕابردوو و داهاتووەی – شەو برسی و سوجدەو نوێژکارو لە تاریکی شەو و ساتی ڕۆژدا لەبەر خوا دەگریا تا خوا بردیەوە بۆ ڕەحمەت و ڕەزامەندی خۆی، عومەر نانی خۆش نەخوات و بەرگی نەرم و جوان نەپۆشێ، ئەو پێشەنگی بە هەر دوو هاوەڵەکەیەوە دەکات، دوو شلەمەنی کۆناکاتەوە مەگەر شیرو وەیت، تەنها مانگی جارێ هێندەی بەشی خەڵکی گۆشت دەخوات، هەر دووکیان – دایکی باوەڕداران – چوون بۆ لای هاوەڵان و ئەوەیان پێ وتن، عومەر بەو جۆرە بوو تا گەیشتەوە بە پەروەردگاری.[1]

عەبدولڕەزاق و بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە عیکریمەی کوڕی خالیدەوە هێناویانە حەفصەو ئیبن موتیع و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنه) عومەری کوڕی خەتتابیان(رضي الله عنه) دواندو وتیان: بەڵکو نانێکی خۆش بخۆیت تا لەسەر حەق بەهێزتر بیت، وتی: دەزانم ئێوە تەنها نیازتان ئامۆژگاریە، بەڵام من دوو هاوەڵی خۆم – پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر(رضي الله عنه) – بەو جۆرە بەجێهێشت، ئێستا ئەگەر ڕێگەکەیان بەردەم ناگەم بەمەنزڵگایان.[2]

ئیبن سەعد لە ئەبوئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) ماوەیەکی دوورو درێژ لە بەیتولمال هیچی نەدەخوارد تا برسیەتی داو هیلاکی کرد، هەواڵی نارد بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ڕاوێژی پێکردن، وتی: من سەرقاڵی ئەم کارەم و هیچیشی لێ نابەم، عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه) وتی: بخۆو نانیش بدە(بە ماڵ)، سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلیش وای وت، بە عەلی وت: تۆ چی دەڵێیت؟ وتی: بەیانی و ئێوارە لێی بخۆ، عومەر ئەو ڕایەی وەرگرت.[3]

---

[1] – ،( لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠٨ دا واهاتووە).

[2] – ،( لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤١١ دا واهاتووە).

[3] – ( لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤١١ دا واهاتووە).

عەبدی کوڕی حەمیدو ئیبن جەریر لە قەتادەوە هێناویانە دەڵێت: بۆمان باسکرا عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) دەیوت: ئەگەر بمەوێت لە هەمووتان خۆشتر دەخۆمو جوانتر دەپۆشم، بەڵام خۆشیەکانم دەهێڵمەوە(بۆ ڕۆژی دوایی). هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب کە چوو بۆ شام خواردنێکی بۆ دروستکرا کە پێشتر نەیبینیبوو، وتی: ئەمە بۆ ئێمە ئەی بۆ ئەو موسڵمانە هەژارانەی مردنو تێریان لە نانی جۆیش نەخوارد؟ عومەری کوڕی وەلید وتی: بەهەشتیان بۆ هەیە، چاوانی عومەر فرمێسکاوی بوونو وتی: ئەگەر ئەمە بەشی ئێمە بێت – بەشی دنیا – و ئەوانیش بەهەشت ببەن بە ڕاستی چاك بردویانەتەوە.[١]

ئیبن ماجە لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی کە عومەر چوو بۆ لای و ئەویش لسەر سفرە بوو، جێی بۆ کردەوە، وتی: بسم الله و بە دەستی پارووییەکی هەڵگرتو دواتر یەکێکی دیکەی برد، دواتر وتی: من خواردنێکی چەور بەدی دەکەم کە چەوری گۆشت نیە، عەبدوڵڵا وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من چووم بۆ بازاڕ بۆ ئاژەڵێکی قەڵەو دەگەڕێم تا بیکڕم دەبینم گرانە، بۆیە بە درهەمێك لاوازێکم کڕیو درهەمێکیشم خستەسەر بۆ قەڵەوێك، وتی: دەمەوێت ئێسك بە ئێسکی بێنیتەوە بۆم، وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەرکات دوو شتی بۆ بهاتایە یەکێکیانی دەخواردو ئەوی دیکەی دەکرد بە خێر، عەبدوڵڵا وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بیبە، هەرگیز دوو خواردنم لەلا کۆنا نابنەوە مەگەر ئەوەی منیش بەو جۆرە بکەم.[٢]

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٣٠ لە ئەبوحازمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) چوو بۆ لای حەفصەی کچی، حەفصە گۆشتاوێکی ساردو نانێکی بۆ هێنا، ڕۆنی کردبوو بەسەر گۆشتاوەکەدا، وتی: دوو خواردن – شلەمەنی – لەیەك قاپدا ناخۆم، تا دەگەمەوە بەخوا.[٣]

---

[١] – ( منتخب(ج٤ ص٤-٦)).

[٢] – لە كنز العمال ج٢ ص١٤٦ دا واهاتووە.

[٣] – ضعیف.

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٣٠ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتابم بینی ئەو ڕۆژ ئەمیری باوەڕداران بوو مشتێ خورمای بۆ هەبوو تا بیخوات تا لەگەڵ خەرابەکانی بیخوات.

لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە دەڵێت: لای عومەری کوڕی خەتتاب نانی شەوم خوارد، نان و گۆشتی دەخواردو دوایی دەستی دەهێنا بەسەر قاچیداو دەیوت ئەمە خاولی عومەرو بنەماڵەکەیەتی، دەینەوەری لە سابتەوە هێناویەتی دەڵێت: جارود لای عومەری کوڕی خەتتاب نانی خوارد، کە لێبوویەوە وتی: ئەی کەنیزەك ئادەی خاولیەك بێنە با دەستی بسڕێت، عومەر وتی: دەستت بە سمتت بسڕە.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٤٩ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلاوە هێناویەتی دەڵێت: هەندێ خەڵکی عێراق هاتن بۆ لای عومەر، عومەر سەیری کرد خانەدانانە دەخۆن، وتی: ئەی خەڵکی عێراق ئەگەر بمەوێت وەك ئێوە خواردنی نایابم بۆ ئامادە دەکرێت، بەڵام ئێمە لە خۆشی دنیامان دەهێڵینەوە بۆ ڕۆژی دواییمان، مەگەر نەتانبیستبووە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە خەڵکانێکی فەرمووە(اذهبتم طیباتکم في حیاتکم الدنیا).

ئەبونەعیم ج١ ص٤٩ و هینادی کوڕی حەبیبی کوڕی ئەبووسابیت لە هەندێ لە هاوەڵانیەوە لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کە خەڵکێکی عێراق هاتن بۆ لای و تیایاندا جەریری کوڕی عەبدوڵڵا(رضي الله عنه) هەبوو، ئەویش تەشتێ خواردنی نان و زەیتی بۆ هێنان، پێی وتن: هەڵگرن، ئەوانیش بە جۆرە ناحەزیەك لێیان هەڵگرت، عومەر پێی وتن: دەبینم چی دەکەن، ئەی چیتان دەوێت؟ بەتام و شیرین و گەرم و ساردتان دەوێت تا بیکەنە ورگتان؟!.[1]

ئیبن سەعدو عەبدی کوڕی حەمید لە حەمیدی کوڕی هیلالەوە هێناویەتی حەفسی کوڕی ئەبولعاص(رضي الله عنه) ئامادەی خواردنی عومەر(رضي الله عنه) بوو، نانی

[1] -(لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠٥ دا واهاتووە).

نەدەخوارد، عومەر پێی وت: بۆچی ناخۆیت؟ وتی: خواردنەکەت ڕەق و ناخۆشەو من دەگەڕێمەوە خواردنێکی نەرم و چاکم بۆ ئامادەکراوە لەوە دەخۆم، عومەر وتی: یانی وادەزانیت ناتوانم مەڕێك بێنن و توکەکەی لاببەن و گەنم بێنن و بکرێت بەنانی جوان و بڕێ شەربەت بێنن و بخرێتە ناو قاچاخێك و ئاوی بەسەردا بکرێت و وەك خوێنی ئاسکی لێ بێت؟ حەفص وتی: واتدەبینم زانا و شارەزای خۆشگوزەرانیت، عومەر وتی: بەڵێ سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر لە ترسی ئەوە نەبێت لە چاکەکانی ڕۆژی دواییم کەم بکات لە ژیانتاندا بەشداریم دەکرد.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٤٩ لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب دەیوت: سوێند بە خوا گوێمان لە خۆشی یەکانی ژیان نی یە، تا فەرمان بە کارێك(بەچکەی بزنێك) بکەین بۆمان پاك بکرێت و ئامادە بکرێ و ببرژێنرێت، دواتر گەنمی جوان بێنن و بکرێت بە نان بۆمان و شەربەتی جوان وەك چاوی پۆڕ بهێنن و بخۆین و بخۆینەوە، بەڵام دەمانەوێت خۆشی یەکانمان بهێڵینەوە، چونکە بیستوومانە پەروەردگارمان دەفەرموێت(اذهبتم طيباتكم في حياتكم الدنيا).

ئیبن موبارەك و ئیبن سەعد لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە هێناویەتی لەگەڵ وەفدێکی خەڵکی بەصرەدا چوو بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب، دەڵێت: دەچووین بۆ لای و ڕۆژانە نانێکی هەبوو، دەڵێت: هەندێ جار چەوری و هەندێ جار زەیت و هەندێ جار شیری لەگەڵدا بوو، هەندێ جار وشکە گۆشتی نالەبارمان هەبوو کە بە ئاو تەڕ دەکرایەوە، هەندێ جار گۆشتی جیڕ و کەم بوو، ڕۆژێك پێی وتین: سوێند بەخوا ئەتانبینم حەز بە نان و خواردنەکەم ناکەم، سوێند بە خوا ئەگەر بمەوێت لە هەمووتان خۆشتر دەخۆم و دەژیم، بەڵام سوێند بە خوا بێ ئاگا نیم لە مەل و کۆپارە و نانی جوان و گۆشتی برژاو و کوتە گۆشت، بەڵام گوێم لە خوایە کە

[1] – (لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠٣ دا واهاتووە).

ڕەخنەی لە کردەوەی خەڵکانێك دەگرێت دەفەرموێت(اذهبتم طيباتكم في حياتكم الدنيا و استمتعتم بها) ئەبوموسا وتی: بەڵکو بە ئەمیری باوەڕداران بڵێن تا لە بەیتولمال خواردنێکتان بۆ ببڕێتەوە و بیخۆن، ئەوانیش پێیان وت، عومەر وتی: ئەی کۆمەڵی سەرکردەکان، مەگەر بەوە ڕازی نین کە من بۆ خۆم دەمەوێت؟ وتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران مەدینە خاکێکە ژیان تێیدا سەختە و خواردنی تۆمان پێ باش نی یە، ئێمە لە خاکێکی دەوڵەمەنددایـن، ئەمیرمان نانی چاکە و دەخورێت، عومەر ماوەیەك سەری دانەواند و ئینجا سەری بەرز کردەوە و وتی: وا لە بەیتولمال دوو مەڕ و دوو جرێبم بۆ دانان. بۆ بەیانی یەکێك لەو دوو بەرخە لەسەر یەکێك لەو دوو جرێبە دابنێن، خۆت و هاوەڵانت بیخۆن. پاشان داوای خواردنەوەی حەڵاڵ بکە و بەشی ئەوانی ڕاستت بدە، دواتر ئەوانی دیکە تا دواتر هەستە پێویستییەکەت بەجێ بگەیەنە، بۆ شەو ئەوی دیکەش وا لێبکەو بیخۆ، ووریابە خەڵکی لەماڵیاندا تێر بکەن و نانی ژن و منداڵیان بدەن، چونکە ڕەقیتان لەگەڵ خەڵك ئاکاریان چاك و برسییان تێر ناکات، سوێند بەخوا لەگەڵ ئەمەشدا پێم وانی یە هەموو رۆژێك دوو بەرخ و دوو جرێب لێ ببڕێت، مەگەر ئەوەی خێراتر و وێرانەی بکات.[1]

هناد لە عوتبەی کوڕی فەرقەدەوە هێناویەتی دەڵێت، سوزگییەکی بچووکم برد بۆ عومەری کوڕی خەتتاب، ئەویش وتی: ئەوە چیە؟ وتم: خواردنێکە بۆم هێناویت چونکە تۆ لەبەری بەیانەوە سەرقاڵی ئیشی خەڵکیت حەزمکرد کە گەڕایتەوە خواردنێك بخۆیت تۆزێ توانات پێبدات، ئەویش سەری سوزگیەکەی لابردو وتی: ئەی عوتبە ئایا لەم خواردنە بەشی هەموو تاکێکی موسڵمانات داوە؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر هەموو سامانی قەیس ببەخشم بەشی ئەوە ناکات، عومەر وتی: دەی منیش پێویستیم پێی نیە، پاشان داوای بڕێ نانی ڕەق و گۆشتی ناباشی(جیڕ) کردو لەگەڵمدا بە تامەزرۆیی نانی دەخوارد، منیش پارچەیەکی پێم

---

[1] – (لە المنتخب ج٤ ص٤٠٢ دا وا هاتووە).

هەڵدەگرت و وامدەزانی کۆپارەیە کەچی دەمار بوو، لەگەڵ بڕێ گۆشتدا دەمجوی و قووتم نەدەدا کە چاوی لەسەر لابردەبردم گۆشتەکەم دەخستە نێوان سفرەکەو قاپەکە، پاشان داوای بڕێ شەربەتی کرد کە خەریك بوو خراپ دەبوو، وتی: بخۆرەوە، لێم هەڵگرت و خەریکبوو نەتوانم قووتی بدەم و ئەویش لێی خواردەوەو دواتر وتی: عوتبە گوێبگرە ئێمە ڕۆژانە چەند ئاژەڵێك سەردەبڕین بەشە چاکەکەی بۆ موسڵمانانی دەورمان دەبن، ملەکەشی بۆ کەسوکاری عومەر، لەم گۆشتە جیڕە دەخۆین و لەم شەربەتە دەخۆینەوە، لەناو سکماندا ئازارمان دەدات.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٣٠ لە حەسەنەوە هێناویەتی عومەر(رضي الله عنه) چوو بۆ لای کەسێك و تینووی بوو داوای ئاوی لێکرد، ئەویش هەنگوینی بۆ هێنا، وتی: چیە؟ وتی: هەنگوین، وتی: سوێند بە خوا نابێت بەشێك لەوەی لە ڕۆژی دواییدا لەسەری لێپێچینەوە بکرێم.[2]

ڕەزین لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر داوای ئاویکرد و شیلەی هەنگوینی بۆ هێنرا. وتی: ئەمە خۆشە بەڵام گوێم لە فەرمایشتی خوایە کە باسی ئارەزووخوازی خەڵکانێك دەکات و دەفەرموێت(اذهبتم طيباتكم في حياتكم الدنيا واستمتعتم بها) دەترسم چاکەکانمان پێش بخرێن، بۆیە نەیخواردەوە.[3]

تەبەری ج٤ ص٢٠٣ لە عروەوە هێناویەتی دەڵێت: کە عومەری کوڕی خەتتاب هات بۆ(ئیلە) کۆچەران و پشتیوانانی لەگەڵدا بوو، کراسێکی خۆی کە دواوەی لە شوێنی دانشتنی جیابببوویەوە(دڕابوو) لەتاو دوورو درێژی ڕێکردنیدا دای بە قەشەیەك و وتی: ئەمە بشۆرەوە و پینەی بکە، ئەویش بردی و وایکرد و دانەیەکی تری لەوجۆرەی بۆ دووری و بردی بۆ عومەر، عومەر وتی: ئەمە چیە؟ وتی:

---

[1] – (لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٤٠٤ دا واهاتووە).

[2] – ئیبن عەساکیر لە حەسەنەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە المنتخب ج٤ ص٤٠٤ دا واهاتووە.

[3] – ( لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٦٨ دا واهاتووە.

کراسەکەتم شۆردو پینەم کرد، ئەمەش کراسێکی منەو بۆ تۆ، عومەر سەیری کردو دەستی پیاهێناو دواتر کراسەکەی کردە بەری و ئەو کراسەی بۆ گێڕایەوەو وتی: ئەمەیان زیاتر عارەق هەڵدەمژێ.[1]

ئەحمەد لە(الزهد) و هەنادو ئیبن جەریرو ئەبونەعیم لە حەسەنەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب – خەلیفە بوو – وتاری بۆ خەڵك دەدا و جلەکەی بەری دوانزە پینەی پێوەبوو.[2]

مالیك لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەرم بینی – ئەو کات ئەمیری باوەڕداران بوو – نێوانی شانەکانی سێ پینەی یەکلەلایەکی پێوەبوو.[3]

ئیبن سەعد لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری نانی خۆیو ماڵەوەی دەداو لە هاویندا بەرگی(سادە) دەپۆشیو جلی دەکردەبەر تا پینەی دەکردو نەیدەگۆڕی تا هی تر دەهات، هەر ساڵێك تیایدا سامان زۆر بوایە جلم بۆ دەکرد، ئەوەی لە ساڵی پێشوو بینی حەفسە دواندی(لەبارەی جلەکانیەوە) ئەویش وتی: من لە بەیتولمالی موسڵمانان دەپۆشمو هێندەم بەسە.[4]

ئیبن سەعد لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ڕۆژانە بۆ خۆیو ماڵو منداڵی دوو درهەمی بۆ خەرجی وەردەگرت.[5]

---

[1]– ( ئیبن موبارەك لە عروەوە لە کاربەدەستێکی عومەرەوە بەو جۆرە هێناویەتی، منتخب ج٤ ص٤٠٢ دا وهاتووە).

[2] – (منتخب(ج٤ ص٤٠٥)).

[3] –( لە الترغیب والترهیب ج٣ ص٣٩٦ دا واهاتووە).

[4] – (لە المنتخب ج٤ ص٤١١ دا واهاتووە).

[5] – ( لە المنتخب ج٤ ص٤١١ دا واهاتووە).

## (دنیا نەویستی عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٦٠ لە عەبدولمەلیکی کوڕی شەددادەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففانم هەموو ڕۆژێ هەینیەك لەسەر مینبەر دەبینی کە بەرگێکی ڕەق و ناباشی عەدەنی دەپۆشی وابزانم نرخەکەی چوار یان پێنج درهەم بوو، لەگەڵ ڕیتەیەکی کوف ڕەقی خەتاویدا، حەسەن هێناویەتی پرسیار کرا لە قسەکەرانی ناو مزگەوت، وتی: عوسمانی کوڕی عەففانم بینی لە مزگەوتدا قسەی دەکرد، ئەو ڕۆژ خەلیفە بوو، دەڵێت: هەڵدەسا و شوێنەواری وردە بەرد و چەوی پێوە دیاربوو، دەڵێت: دەوترا: ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە، ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە.[1] شەرحەبیلی کوڕی موسلیمیش دەڵێت: عوسمان(رضي الله عنه) نانی ئیمارەتی دەرخواردی خەڵك دەداو خۆی دەچوویەوە ماڵی خۆی و سرکەو وەیتی دەخوارد.

## (دنیا نەویستی عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٨٢ لە کەسێکی سەقیفەوە هێناویەتی عەلی لەسەر ناوچەی عوبکەرا کردی بە بەرپرس، دەڵێت: لە ناوچەی سواد نوێژکەر نیشتەجێ نەبوون، پێی وتم: ئەگەر نیوەڕۆ هات وەرە بۆ لام، منیش چووم و نەمدی پەردەدارێکی هەبێت تا لێم بپرسێتەوە، بینیم دانیشتووە و قاپێك و جامێ ئاوی لابوو، داوای گلێنەیەکی کرد، لە دەروونی خۆمدا وتم: هیوام وابوو تا خشڵێکم بۆ بێنێ و نازانم چی تێدایە، سەیرمکرد مۆرێکی لەسەرە، مۆرەکەی لابرد دەبینم بڕێ ئاردە وردەی تێدایە، لێی دەرهێنا و ئاوی بەسەردا کرد و پێیدام، منیش خۆم نەگرت و وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران لە عێراق ئەمە دەکەیت و خواردنی عێراق لەمە زیاترە؟ وتی: بەخوا لە چروکیدا واناکەم، بەڵام بڕێ پێویستی خۆم دەکڕم و دەترسم خراپ بێ، لەبەرئەوە وادەکەم، حەزناکەم جگە لە شتی خۆم هیچی تر

---

[1] - (ئەحمەد هێناویەتی، لە صفة الصفوة ج١ ص١١٦ دا بەو جۆرە هاتووە).

بچێتە سکمەوە، ئەمەش دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) ئێوارەو بەیانی نانی دەخواردو خواردنی لە شتێك بوو کە لە مەدینەوە بۆی دەهات.

هەروەها لە ج١ ص٨١ لە عەبدوڵڵای کوڕی شریکەوە لە باپیریەوە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت:(فالوذج) هێنرا و خرایە بەردەستی، وتی: ئەمە بۆنی خۆشە و ڕەنگی خۆشەو تامی خۆشە، بەڵام حەزناکەم شتێ فێری ئارەزوو و دەرونم بکەم کە فێری نەبووە.[1]

ئیبن موبارەك لە زەیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) بە بەرگێکەوە هات بۆ لامان کە بە دەزوویەك پەیوەستی کردبوو، پێی وترا ئەوە چیە؟ وتی: من ئەم کراسانە دەپۆشم تا لە جوانیدا لێم دوورتر بێت و لە نوێژدا بۆم باشتربێت و سوننەتی باوەڕدار بێت.[2]

بەیهەقی لە کەسێکەوە هێناویەتی دەڵێت: سەیرمکرد عەلی(رضي الله عنه) بەرگێکی ڕەق و ناجوانی لەبەربوو، وتی: بە پێنج درهەم کڕیم، کێ درهەمێك قازانجم پێ دەدات پێی دەفرۆشم.[3]

یەعقوبی کوڕی سوفیان لە مجمع ی کوڕی سەمعانی تەیمیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوتالیب بە شمشێرەکەیەوە چوو بۆ بازاڕ، وتی: کێ ئەم شمشێرەم لێدەکڕێت؟ ئەگەر چوار درهەمم هەبوایە کراسێکم پێدەکڕی کە فرۆشتبووم.[4]

ئەبولقاسمی بەغەوی لە صاڵحی کوڕی ئەبوئەسوەدەوە لەوانەی بۆیان باسکردووە هێناویەتی کە عەلی لەسەر گوێدرێژێك بینی و قاچەکانی لەیەك لاوە دانابوو، دوایی وتی: من دنیام بە سووك دانا.[5]

---

[1] –( لە المنتخب ج٥ ص٥٨ دا هاتووە).

[2] – (لە المنتخب ج٥ ص٥٨ دا واهاتووە).

[3] – (منتخب کنز العمال ج٥ ص٥٨.)

[4] – (لە البدایة والنهایة ج٨ ص٣ دا واهاتووە).

[5] – (البدایة والنهایة ج٨ ص٥).

ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی ڕزینەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە ڕۆژی چەژندا، ئەویش(خزیرە) یەکی بۆ هێناین، وتمان: خوا چاکت بۆ بکات بەڵکو لەوەمان دەرخوارد بدەیت – قازەقۆڵنگ) –، چونکە خێری خوا زۆرە، وتی: ئیبن رەزین بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو(لایحل للخلیفة من مال الله الا قصعتان قصعة یاکلها هو واهله، و قصعة یضعها بین یدي الناس)واتە(بۆ خەلیفە حەڵاڵ نیە لە بەیتولمالی موسڵمانان زیاتر لە دوو بەش(قاپی خواردن) ی هەبێ، یەکێکیان خۆی و ماڵی و منداڵی بیخۆن، یەکێکی دیکەیان لەبەردەم خەڵکیدا دایبنێت[1][2].

## (دنیا نەویستی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٠١ لە عروەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب چوو بۆ لای ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح و سەیری کرد لەسەر کۆپانی وڵاخەکەی ڕاکشاوە، جانتاکەی کردووە بە پشتی، عومەر پێی وت: بۆچی وەك هاوەڵەکانت نەکردووە؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوەندەم بۆ هەیە، مەعمەر لە فەرموودەکەدا دەڵێت: کاتێك عومەر چوو بۆ شام خەڵکی و گەورەکانی ئەویێ چوون بۆ لای و عومەر وتی: براکەم کوا؟ وتیان: کێ؟ وتی: ئەبوعوبەیدە، وتیان: ئێستە دێت بۆ لات، کاتێك هات بۆ لای دابەزی و دەستیان کردە ملی یەکترو دواتر چوو بۆ ماڵەکەی و لە ماڵەکەیدا تەنها شمشێرەکەی و تیرو کەوانەکەی و بارو ئاژەڵەکەی بینی، – بە هەمان شێوە هێناویەتی –.[3]

---

[1] – صحیح.

[2] – ( لە البدایة والنهایة ج٨ ص٣ دا وهاتووە).

[3] – (ئیمامی ئەحمەدیش بەو جۆرە لە فەرموودەی موعەممەرەوە هێناویەتی، لە صفة الصفوة ج١ ص١٤٣ دا هاتووە ئیبن موبارەك لە الزهد لە ڕێگەی موعەممەرەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابه ج٢ ص٢٥٣ دا واهاتووە).

# ((دنیا نەویستی موصعەبی کوڕی عومەیر(رضي الله عنه)))

ترمزی بە پلەی حەسەن و ئەبویەعلاو ئیبن ڕاهەویە لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: بەیانیەك بە برسێتی لە ماڵ دەرچووم و سەرماش زۆری بۆ هێنابووم، پارچە پێستەیەکی خۆشەنەکراوی ناومالم هەڵگرت و دام بەسەر خۆمداو دواتر پێچام لە ملم و لەسەر سنگم توندم کردەوە تا خۆمی پێ بپارێزم، سوێند بەخوا لە ماڵمدا هیچم نەبوو تا لێی بخۆم، ئەگەر لە ماڵی پێغەمبەریشدا(صلى الله عليه وسلم) هیچ بوایە پێم دەگەیشت، چووم بۆ چەندلایەکی ناو شاری مەدینەو گەیشتم بە جولەکەیەك لە حەوشەیەك لە پاڵ دیوارەکەیدا وتی: ئەی عەرەب(دەشتەکی) چیتە؟ ئامادەی بۆ هەڵگۆزینی هەر سەتڵێك ئاو خورمایەکت بدەمێ؟ وتم: بەڵێ، دەی دەرگاکە بکەرەوە، ئەویش دەرگاکەی کردەوەو منیش ئاوم بۆ هەڵدەگۆزی و ئەویش خورمای پێدەدام تا دەستم پڕبوو، وتم: ئێستا بەسمە، خواردمن دواتر ئاوم بەدوادا کرد، دواتر چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و لە مزگەوتدا لە لای دانیشتم و کۆمەڵێ لە هاوەڵان لە دەوری بوون، موصعەبی کوڕی عومەیر بە عەبایەکی پینەکراویەوە هات، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی بیری کەوتەوە موصعەب جاران لە چ خۆشیەکدا بوو و ئێستا لەو بارەدایە چاوەکانی کلمەی گریان بوون و فرمێسکیان ڕشت و گریا، پاشان فەرمووی(كيف انتم اذا اغدا احدكم في حلة و راح في اخرى و سترت بيوتكم كما تستر الكعبة)(بارتان چۆنە ئەگەر سبەینێ یەکێکتان لە کاڵاجوانی و هی تردا بێت و ماڵەکانتان وەك کەعبە دابپۆشرێن) وتمان: ئەوکات باشترین بەشی پێویستمان هەیەو خۆمان بۆ پەرستش یەکلادەکەینەوە، فەرمووی(بل انتم واليوم خير منكم يومئذ)[1].[1](بەڵکو ئەمڕۆ لەو کات باشترن).

[1] – ضعیف.

تەبەرانی و بەیهەقی لە عومەرەوە(ﷺ) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سەیری موصعەبی کوڕی عومەیری کرد کە دەهات و پێستەیەکی بەرانی لەبەر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(سەیری ئەوە بکەن کە خوا دڵی ڕووناك کردووە، بەڕاستی دەمدی لای دایك و باوکی بوو جوانترین و خۆشترین خواردن و خواردنەوەیان پێدەدا، دەمدی بەرگێکی لەبەر بوو کڕیبووی – کڕدرابوو – بە دوو سەد درهەم، وا خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی هێناویەتی بەرەو ئەوەی دەیبینین)[2][3].

حاکم ج٣ ص٦٢٨ لە زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ دەستەیەکدا لە قوبا دانیشتبوو، موصعەبی کوڕی عومەیر هەستا و عەبایەکی لەسەر بوو کە جوان داینەدەپۆشی و ئەوانیش سەریان دانەواند، هات و سەلامی کردو ئەوانیش وەڵامیان دایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) قسەی خێری لەسەر کرد و وەسفی چاکی کرد، دواتر فەرمووی(بەڕاستی ئەمەم لە مەککە لای دایك و باوکی دەبینی ڕێزیان دەگرت و خۆشی و بەخششیان بەسەردا دەڕژاند، هیچ گەنجێکی قورەیش وەك ئەو نەبوو، دواتر لەپێناو ڕەزامەندی خواو سەرخستنی پێغەمبەرەکەیدا ئەوەی بەجێهێشت، بزانن هیچتان بەسەردا نایەت مەگەر ئەوە و ئەوە تا ئەوەی فارس و ڕۆمتان بۆ فەتح دەبێت، هەتانە بەیانی بەرگێك دەپۆشیٚ و ئێوارەش بەرگێکی تر، بەیانی قاپە خواردنێکتان بۆ دیٚ و ئێوارە قاپە خواردنێکی تر) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەمڕۆمان باشترە یان ئەو کات؟ فەرمووی(بەڵکو ئێوە

---

[1]– (لە کنز العمال ج٣ ص٣٢١ دا واهاتووە، هەیسەمی ج١٠ ص٣١٤ دەڵێت: ئەبویەعلا هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا کەسێك هەیە کە ناوی نەهاتووە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جیٚ متمانەن).

[2]– ضعیف.

[3]– ( لە الترغیب والترهیب ج٣ ص٣٩٥ دا واهاتووە، حەسەنی کوڕی سوفیان و ئەبوعەبدولڕەحمانی سولەمی و حاکم هێناویانە، لە کنز العمال ج٧ ص٨٦ دا هاتووە، ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٠٨ لە عومەرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

ئەمڕۆتان بۆ باشترە لەو ڕۆژە، بزانن ئەگەر ئەوەی من لەسەر دنیا دەیزانم ئێوەش بیزانن دڵتانی لێ ئاوادەکەن و لە بیری دەکەن(لاستراحت انفسكم منها)(دەروونتان لێی ئاسوودە دەبێت) لە الاصابة ج٣ ص٤٢١ دا هاتووەو لە صەحیحیدا لە ئیبن حیببانەوە هێناویەتی کە موصعەب تەنها جلێکی لە دوای خۆی بەجێهێشت کە سەریان دادەپۆشی قاچەکانی دەردەکەوتن، کە قاچەکانیان دادەپۆشی سەری دەردەکەوت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اجعلوا على رجليه شيئا من الاذخر)( لەسەر پێکانی شتێ لە ئیزخر دابنێن).

## دنیانەویستی عوسمانی کوڕی مەزعون(رضي الله عنه)

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٠٥ لە ئیبن شەهابەوە هێناویەتی عوسمانی کوڕی مەزعون ڕۆژێك چوو بۆ ناو مزگەوت و بەرگێکی خەتخەتی لەسەر بوو کە دڕابوو، ئەویش بە پارچە فەروویەك پینەی کردبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی دڵیان بۆی سووتا و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەو ڕۆژەتان چۆنە کە بەیانی جلێك و ئێوارە جلێکی ترتان دەبێ، لەبەردەستی یەکێکتاندا قاپە خواردنێ دادەنرێ و قاپەخواردنێکی دیکەی لەبەردەمدا لادەبرێ، چۆن کەعبە دادەپۆشرێ ئاوا ماڵەکانتان دادەپۆشن)، وتیان: خۆزگە ئەوە دەهات ئەی پێغەمبەری خوا تا خۆشی و خۆشگوزەرانیمان هەبوایە، فەرمووی(دەی ئەوە دەبێت، ئێوە ئەمڕۆ لەو کاتە باشترن).

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ لای عوسمانی کوڕی مەزعون لەو ڕۆژەدا کە کۆچی دوایی کرد، وا سەری بۆ لارکردەوە وەك ئەوەی وەسیەتی بۆ بکات، پاشان سەری بەرزکردەوەو سەیریان کرد کاریگەری گریان بە چاوانیەوە دیارە، پاشان بۆ جاری دووەمیش وابوو، بۆ جاری سێهەم کە سەری بەرزکردەوە پرمەو خیزەیەکی بیست، ئیتر زانیان مردووە، هەموو گریان،

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(مە انما هذا من الشیطان فاستغفرو الله)واتە(وامەکەن ئەوە لە شەیتانەوەیە دەی داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن) پاشان فەرمووی(اذهب عنك ابا السائب! فلقد خرجت و لم تتابس منها بشيئ).[1](ئەبووسائیب لە دنیا دەربازبە، با کاتێ چوویت هیچ لە دنیا ئالاوت نەبێت).

ئەبونەعیمیش لە عەبدڕەبیهی کوڕی سەعدی مەدەنیەوە بە کورتی هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(رحمك الله عثمان! ما اصبت من الدنیا ولا اصابت منك)واتە(ڕەحمەتی خوات لێبێت عوسمان! هیچت لە دنیا نەبردو هیچی لێ نەبردیت).[2]

## (دنیانەویستی سەلمانی فارسی(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٩٨ لە عەتیەی کوڕی عامرەوە هێناویەتی دەڵێت: سەلمانی فارسیم بینی زۆری لێکرا تا خواردنێك بخوات، ئەویش وتی بەسمە، من لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیستووە دەیفەرموو:(ان اکثر الناس شبعا في الدنیا اطالهم جوعا في الاخرة، یا سلمان انما الدنیا سجن المؤمن و جنة الاخرة)(ئەو کەسانەی لە دنیادا زیاتر تێرن لە ڕۆژی دواییدا برسێتیان درێژخایەنترە، ئەی سەلمان دنیا بەندینخانەی باوەڕدارو بەهەشتی بێباوەڕە) (عەسکەری لە(الامثال) دا بەو جۆرە هێناویەتی[3] [4].

---

[1]- (هەیسەمی ج٩ ص٣٠٢ دەڵێت: تەبەرانی لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی مقلاص لە باوکیەوە هێناویەتی و هیچکامیان ناناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن. تەواو. ئەبونەعیمیش لە الحلیة ج١ ص١٠٥ و ئیبن عەبدەلبیر لە الاستیعاب ج٣ ص٨٧ لە ئیبن عەبباسەوە لە ڕێگەی جیا لە ڕێگەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە باوکیەوە بە هەمان شێوە هێناویانە).

[2] – ضعیف.

[3] – حسن.

[4] – لە کنز العمال ج٧ ص٤٥ دا هاتووە).

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٩٧ لە حەسەنەوە هێناویەتی موچەی سەلمان پێنج هەزار درهەم بوو، ئەو کات ئەمیری نزیکەی سی(٣٠) هەزار موسڵمان بوو، بە عەبایەکەوە وتاری بۆ خەڵك دەدا کە هەندێکی ڕادەخستو هەندێکی دەدا بەسەر خۆیدا، کاتێك موچەکەی وەرگرت دەیبردو لە بەرهەمی دەستی خۆی دەخوارد.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٠٢ لە ئەعمەشەوە هێناویەتی دەڵێت: دەمبیست باسیان دەکرد حوزەیفە بە سەلمانی وت: ئەی ئەبوعەبدوڵڵا خانویەکت بۆ بنیادنەنێن؟ ئەویش حەزی پێ نەکردو وتی: پەلەمەکە تا پێت دەڵێم من خانوویەکت بۆ بنیاد دەنێم ئەگەر تیایدا ڕاکشایت سەرت لەملایە و قاچەکانت لەولایەوە بن، ئەگەریش هەستایت سەرت بەر سەقفەکەی بکەوێت، سەلمان وتی: دەڵێیت لە دەروونی منداایت.

ئیبن سەعد ج٤ ص٦٣ لە میعەن لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە هێناویەتی سەلمانی فارسی کە خانووی نەبوو دەچوویە ژێر سێبەری دارو درەختی موسڵمانان، کەسێك پێی وت: بۆچی خانوویەکت بۆ بنیادنەنێم تا لە سەرما و گەرما بتپارێزێت؟ سەلمان پێی وت: باشە، کە کابرا چوو سەلمان هاواری لێکرد، وتی: چۆن بنیادی دەنێیت؟ وتی: بە جۆرێك ئەگەر هەستایتەوە بدات لە سەرتو ئەگەریش ڕاکشایت پێت بەر دیواری بکەوێت، سەلمان وتی: باشە.

---

[1] – (ئیبن سەعد ج٤ ص٦٢ لە حەسەنەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

## ((دنیانەویستی ئەبوزەری غیفاری(رضي الله عنه)))

ئەحمەد لە ئەبو ئەسمائەوە هێناویەتی دەڵێت: چوو بۆ لای ئەبوزەر ئەوکاتەی لە(الربزة) بوو، ئافرەتێکی ڕەشی قژ شێواوی لە لابوو، هیچ دیمەنێکی جوانی و ژیری لێ بەدی نەدەکرا، وتی: سەیرناکەن ئەم ژنە ڕەشە چیم پێ دەڵێ؟ دەڵێت بچم بۆ عێراق، کە هاتم بۆ عێراق بەرەو دنیا ڕاکێشم بکەن، خۆشەویستم موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) ڕایسپاردم کە بەدەر لە پردی دۆزەخ ڕێگەیەکی تێکشکێنەرو ڕیسواکەر هەیە کە دەچین بەسەریدا اری توانایمان هەبێ تا ڕزگارمان بێ باشترە لەوەی کۆڵ و باری قورسمان پێ بێت.[1][2]

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٦٠ لە عەبدوڵڵای کوڕی خەراشەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوزەرم لە الربزە بینی لە کەپرێکدا کە ئافرەتێکی میهرەبانی لابوو کە لەسەر پارچە بەڕەیەك دانیشتبوو، بە ئەبوزەر وترا: تۆ کەسێکیت کوڕت بۆ نامێنێتەوە، وتی: سوپاس بۆ خوا کە لە شوێنی ئاوابوونەوە دەیانباتە مەنزڵگەی مانەوە، وتیان: ئەبوزەر بۆچی ئافرەتێکی تر ناهێنیت؟ وتی: ئەگەر ئافرەتێك بە هاوسەر بگرم دامبەزێنی لام خۆشەویستترە لەوەی ژنێك بێنم کە بەرزم بکاتەوە، پێیان وت: ئەی بۆچی ڕاخەرێکی لەمە نەرمتر ناهێنی؟ وتی: خوایە لێم خۆش بە، چیت پێ باشە بیبە.[3]

---

[1] - ضعيف.

[2] - (لە الترغيب والترهيب ج٥ ص٩٣ دا واهاتووە، ئەحمەد بە گێڕەرەوەی صەحیحەوە هێناویەتی، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٦١ لە ئەبی ئەسماوە و ئیبن سەعدیش ج٤ ص١٧٤ بەو جۆرە هێناویەتی).

[3] - ( تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی خەراشەوە بەو جۆرە هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص٣٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موسای کوڕی عوبەیدە هەیە کە لاوازە).

ئەبونەعیم ج١ ص١٦٢ لە ئیبراهیمی تەیمیەوە لە باوکیەوە لە ئەبوزەرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێی وترا: بۆچی وەك فلان و فلان شتێ بە شتێ ناکەیت؟ وتی: ئەگەر ببمە ئەمیر چی بکەم، من ڕۆژانە بڕێ ئاو یان شیرم پێویستە لە هەینیشتدا مشتێ گەنمم بەسە، هەر لە ئەبوزەرەوە هێناویەتی وتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) خواردنم مشتێ بوو، ئیتر تا دەگەمەوە بە پەروەردگارم لەوە زیاتری ناکەم.

## (دنیانەویستی ئەبودەردا(رضي الله عنه))

تەبەرانی لە ئەبودەرداوە هێناویەتی دەڵێت: من پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بازرگان بووم، کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نێردرا ویستم بازرگانی و پەرستش پێکەوە کۆبکەمەوە بەڵام نەکرا، بۆیە وازم لە بازرگانی هێنا و تاوم دایە پەرستش.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٠٩ لە ئەبودەرداوە بەو جۆرە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد کردووە، سوێند بەوەی گیانی ئەبودەردای بەدەستە حەزناکەم ئەمڕۆ لەبەر دەرگای مزگەوت دوکانێکم هەبێت تا لەیەك نوێژم نەکات و هەموو ڕۆژێ چل دینار قازانجی تێدابکەم و هەمووی لە ڕێی خوادا ببەخشم، پێی وترا: ئەبودەردا بۆچی حەز بەوە ناکەیت؟ وتی: لە ترسی سەختی لێپێچینەوە.[2]

ئەبونەعیم لە ڕێگەیەکی دیکەوە هێناویەتی دەڵێت: حەزناکەم لەسەر ڕێی بەردەرگای مزگەوت سەرقاڵی کڕین و فرۆشتن بم و ڕۆژانە سێ سەد دینارم دەستبکەوێت و لە هەموو نوێژەکانی مزگەوتدا ئامادەبم، ناڵێم: خوای گەورە فرۆشتنی حەڵاڵ و سووی حەرام نەکردووە، بەڵام حەزکەم لەوانەبم کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن لە یادی خوایان ناکات.

---

[1] – (هەیسەمی ج٩ ص٣٦٧ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن).

[2] – ( ئیبن عەساکیر بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٢ ص١٤٩ دا واهاتووە).

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٢ لە خالیدی کوڕی حودەیری ئەسلەمیەوە هێناویەتی چوو بۆ لای ئەبودەرداو بەرگێك یان خوریەکی لە ژێردا بوو، بەرگێکی خوریو نەعلێکی خوری لەبەردا بوو، ئەوکات نەخۆش بوو و عەرەقی کردبوو، وتی: حەزدەکەیت بە بەرگو جلی مەرعەزی لەوەی ئەمیری باوەڕداران ناردوویەتی جێگەکەت خۆش بکەیت؟ وتی: ئێمە ماڵێکمان هەیەو دەچینەوە ناویو کار بۆ ئەویێ دەکەین، حەسانی کوڕی عەتیە هێناویەتی هاوەڵانێکی ئەبودەردا میوانداریان کرد، ئەیش میوانداری کردن، هەیانبوو لەسەر لبادیێ بوو، هەیانبوو لەسەر جلەکەی بوو، بۆ بەیانی چوو بۆ لایان و ئەوەی لێێ بەدیکردن، وتی: ئێمە ماڵێکمان هەیە بۆ ئەوە کۆدەکەینەوەو بۆ ئەوێیش دەگەڕێینەوە.

ئەحمەد لە موحەممەدی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی خەڵکانێك شەوێکی سارد لای ئەبودەردا دابەزین، ئەویش نانێکی ناخۆشی بۆ ناردنو لێفەی بۆ نەناردن، هەندێکیان وتیان: نانی بۆ ناردین بەڵام بۆ سەرما وازی لێێ هێناین، کەسێکیان وتی: وازناهێنین یان دەبێت پێێ بڵێم، یەکێکی دیکە وتی: وازی لێێ بێنە، بەڵام ڕازی نەبوو و چوو تا لەبەردەرگا بینی دانیشتبوو و ژنەکەی تەنها سووکە جلێکی لەبەردابوو، کابرا گەڕایەوەو وتی: دەبینم وەك ئێمە شەو بەسەر دەبەیت، وتی: ئێمە ماڵکمان هەیە بۆ ئەویێ دەچین، ڕاخەرو لێفەکەمان ناردووە بۆ ئەویێ، ئەگەر هیچمان لەوە لابوایە بۆمان دەناردیت، ئێمە کۆڵێکی سوکمان هەیە کە لە کۆڵی قورس باشترە، تێدەکەیت چی دەڵێم؟[١]

پێشتر باسمان لە نکۆڵی ئەمیر کرد کاتێ عومەر چوو بۆ لایو دەرگاکەی پاڵێ پێوەنا سەیری کرد قفڵو بەستنی نیە، چوویە ماڵێکی تاریکەوەو بەدەست دەگەڕا تا کەوتە سەر پشتیەکەی سەیری کرد کۆپان بوو، جێگەکەشی بەردو چەو بوو، جلەکەشی جلێکی سادەبوو، عومەر وتی: ڕەحمەتی خوات لێبێت مەگەر شتم پێێ

[١] – (لە صفة الصفوة ج١ ص٢٦٣ دا هاتووە).

نەبەخشیت؟ مەگەر وام بۆ نەکردیت؟ ئەبودەردا پێی وت: ئایا فەرموودەی پێغەمبەرت(صلى الله عليه وسلم) لەبیرە؟ وتی: کامە؟ وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لیکن بلاغ احدکم من الدنیا کزاد الراکب)واتە(با بەش و کۆڵی هەرکامتان لە دنیادا وەك کۆڵ و توێشووی سوارێك وابێت) وتی: بەڵێ، ئەبودەردا وتی: ئەی عومەر ئەی ئێمە دوای ئەو فەرموودەیە چیمان کرد؟ تا بەیانی هەردووکیان دەگریان و گریانی هەرکامیان ئەوی دیکەشی دەخستەوە گریان.

## (دنیانەویستی معاذی کوڕی عەفرا(رضي الله عنه))

عومەری کوڕی شەیبە لە ئەفلەمی مەولای ئەبوئەیوبەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) فەرمانی دەرکرد بڕێ جلی بۆ بدورێت بە ڕستن بۆ خەڵکی بەشداربووی بەدرو ماندووبوونی زۆری لەگەڵدا بە خەرج دەدا، دانەیەکی نارد بۆ معاذي کوڕی عەفرا، ئەویش پێی وتم: ئەفلەم ئەمە بفرۆشە، منیش فرۆشتم بە هەزارو پێنج سەد درهەم، پاشان وتی: بڕۆ چەند کۆیلەیەکی پێ بکڕە بۆم، منیش پێنج دانەم پێ کڕی، پاشان وتی: کەسێك دوو قشری داناوە تا بۆ پێنج کۆیلە جل بکڕێ و ڕانادیارێك ئازادیان بکات، بڕۆن ئێوە ئازادن، عومەر بیستیەوە ئەوەی بۆ نارد نەیپۆشی، بۆیە دانەیەکی ڕەق و ناجوانی بۆ نارد کە بەهاکەی سەد درهەم بوو، کە نێردراوەکە بۆی هێنا وتی: دەبینم تۆی ناردووە تا ئەمەم بۆ بهێنی؟ وتی: ئەرێ بەخوا، ئەویش هەڵیگرت و بردی بۆ عومەرو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ ئەمەت بۆ ناردووم؟ وتی: بەڵێ ئێمە دانەیەکمان بۆ ناردیت لەوەی کە بۆ تۆو براکانت هەڵیانگرتبوو، کەچی بیستم نەتپۆشیوە، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من نەمدەپۆشی چونکە حەزم دەکرد ئەوەی لای تۆ چاکە بۆم بێت، ئەویش هەمدی پێیدایەوە.[1]

---

[1] – (لە صفة الصفوة ج١ ص١٨٨ دا واهاتووە).

## (دنیا نەویستی لەجلاجی غەتفانی(رضي الله عنه))

تەبەرانی بە سەنەدێکی بێ گرفت لە لەحلاجەوە هێناویەتی دەڵێت: لەوکاتەوەی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) موسڵمان بووم تێری سکم نانم نەخواردووە، تەنها بەشی پێویستی دەخۆمو دەخۆمەوە، بەیهەقی ئەوەشی بۆ زیادکردووە: سەدو بیست ساڵ ژیا، پەنجا ساڵ لە سەردەمی نەفامیدا، حەفتا ساڵ لە موسڵمانیدا.[1]

## (دنیانەویستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٩٨ لە حەمزەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر خواردنێکی زۆر لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هەبوایە پاش ئەوەی کەسێکی پەیدا بکردایە لێی بخوات خۆی تێری نەدەخوارد، ئیبن موتیع هات بۆ لای سەردانی کردو سەیری کرد جەستەی لاوازببوو، بە صەفیەی وت: بۆچی ڕەحمێکت نیە بۆی؟ بەڵکو جەستەی باش بێتەوە خواردنێکی بۆ ئامادەبکە، صەفیە وتی: ئێمە نانی بۆ ئامادە دەکەین بەڵام هەرچی کەس و کارو کەسانی دەوروبەری هەن هەموویان بانگ دەکات تا لێی بخۆن، تۆ لەوبارەوە قسەی بۆ بکە، ئیبن موتیع وتی: ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان بەڵکو خواردنێ بخۆیت تا کەمێك لەشت خۆی بگرێتەوە، وتی: هەشت ساڵە یەك جار تیایدا تێرنەبوم – یان وتی: تەنها یەك جار تیایدا تێربووم – ئێستا دەتەوێت لەو ساتەی چرکەساتێ تەمەنم ماوە تێربخۆم.

ئەبونەعیم لە حەمزەی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ باوکم دانیشتبووم کەسێك تێپەڕبوو، وتی: پێم بڵێلە جورف دەتدواند بە عەبدوڵڵای کوڕی

[1]– (لە الترغیب والترهیب ج٣ ص٤٢٣ دا واهاتووە)، ئەبولعەباسی سەراج لە مێژووەکەیداو خەتیب لە(المتفق) دا هێناویانە، لە الاصابە ج٢ ص٣٢٨ دا هاتووە، ئیبن عەساکیر هێناویەتی، (لە کنز العمال ج٧ ص٨٦ دا واهاتووە).

عومەر چیت وت؟ ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان پەکت کەوتو پیربوویتو ئەوانەی لەلاتن مافو پلەو پایەت نازانن، بە ماڵو منالت بڵێ شتێکت بۆ بکەنو کە گەڕایتەوە بۆ لایان سۆزیان هەبێ بۆت، وتی: هاوار بۆت بەخوا یانزە ساڵە یان دوانزەو سیانزەو چواردە ساڵە یەك جاریش تێرم نەخواردوە ئێستا چی؟ کە چەند ساتێکی کەم تەمەنم ماوە؟

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٠٠ لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەدیەوە – مەولای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر – لە عێراقەوە هاتو سەلامی لێدەکرد، وتی: دیاریەکم بۆ هێناویت، وتی: چیە؟ وتی: جەوارش، وتی: ئەوە چیە؟ وتی: خواردن هەرس دەکات، وتی: من چل ساڵە تێر نان نەبووم ئیتر ئیشم بەوە چیە؟.

هەروەها لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی کەسێك بە ئیبن عومەری وت: جەوارشت بۆبێنم؟ ئەویش وتی: ئەوە چیە؟ وتی ئەگەر نانت خوارد لەمە بخۆیت ئاسان هەرسی دەکەیت، ئیبن عومەر وتی: چوار مانگە تێرم نەخواردووە، ئیتر ئەوە بۆچی؟ بەڵام من کەسانێکم ڕاسپاردووە کە جارێك تێرو جارێك برسی دەبن؟[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٠٣لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لەو کاتەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد خشتم لەسەر خشت دانەناوەو دارخورمایەکیشم نەچاندووە، (ئیبن سەعد ج٤ ص١٢٥ بەو جۆرە هێناویەتی)، ئەبوسەعیدی کوڕی ئەعرابی بە سەنەدی صەحیح لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: هەرکاممان دەستی بە دنیا بگەیشتایە بۆی دەچوو و دنیاش ڕووی تێدەکرد جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنه)، لە مێژووی ئەبولعەباسی سەراج بە سەنەدی حەسەن لە سدیەوە هێناویەتی دەڵێت: دەستەیەکی هاوەڵانم دی پێیان وابوو کەس نیە لەسەر ئەو بارەبێت کە لەسەری لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جیابوویەوە جگە لە ئیبن عومەر.[2]

---

[1]- (ئیبن سەعد ج٤ ص١١٠ لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی، لە نافیعیشەوە بە کورتی هێناویەتی).

[2] – (لە الاصابة ج٢ ص٣٤٧ دا واهاتووە).

## (دنیانەویستی حوزەیفەی کوڕی یەمان(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٧٧ لە ساعدەی کوڕی سەعدی حوزەیفەوە هێناویەتی حوزەیفە(رضي الله عنه) دەیوت: هیچ ڕۆژێك نیە هێندەی ئەو ڕۆژە دڵخۆش و شادمان بم کە بچمەوە ماڵەوەو هیچ شك نەبەم بۆ خواردنیان، ئەوانیش بڵێن: زۆرو کەم هیچت پێ پەیداناکرێت، چونکە بیستوومە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو(ان الله شد حمیة للمؤمنین من الدنیا من المریض اهله الطعام، والله تعالى اشد تعاهدا للمؤمنین من البلاء من الوالد لولده بالخیر)واتە(خوای گەورە زیاتر لەو نەخۆشەی کە کەس وکاری لە خواردن بە دووری دەگرن باوەڕدار لە دنیا دەپارێزرێت، باوك چەندە چاکەی بۆ کوڕەکەی دەوێت خوای گەورە زیاتر لەوە دەیەوێت باوەڕدار تووشی بەڵابکات)[1، 2].

## (نکوڵی لەو کەسەی خۆی لە دنیا دوورناگریو چێژی پێ دەباتو وەسیەتکردن بە خۆگرتنەوە لە دنیاو خۆشیەکانی)

بەیهەقی لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) منی بینی ڕۆژی دووجار نانم دەخوارد فەرمووی(یا عائشة اوما تحبین ان یکون لك شغل الا جوفك؟ الاکل في الیوم مرتین من الاسراف، والله لایحب المسرفین)واتە(ئەی عائیشە مەگەر حەزناکەیت شتێك هەبێت سەرقاڵی بیت جگە لە سکت؟ نان خواردن لە ڕۆژێکدا دووجار زیادەڕەویەو خوای گەورەش زیادەڕەوانی خۆش ناوێت) لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا فەرمووی(یا عائشة اتخذت الدنیا بطنك، اکثر من اکلة کل یوم سرف والله یحب المسرفین)واتە(عائیشە دنیات لێ بووە بە سکت زیاتر لە یەك جار خواردن لە ڕۆژێکدا زیادەڕەویە، خوای گەورەش زیادەڕەوکارانی خۆش ناوێت)[3، 4].

---

[1] - ضعیف.

[2] - تەبەرانی لە ساعدەوە هێناویەتی، هەیسەمی ج١٠ ص٢٨٥ دەڵێ لە سەنەدەکەدا کەس هەیە نایناسم.

[3] - ضعیف.

[4] - ( لە الترغیب والترهیب ج٣ ص٤٢٣ دا واهاتووە).

ئیبن ئەعرابی لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: لای پێغەمبەر(ﷺ) دەگریام، ئەویش فەرمووی(ما يبكيك؟ ان كنت تريدين اللحوق بي فليكفك من الدنيا مثل زاد الراكب ولا تخالطين الاغنياء)واتە(بۆچی دەگریت، ئەگەر دەتەوێت بگەیتەوەبە من ئەوا لە دنیادا هێندەی بارو توێشووی سوارێکت هەبێ و تێکەڵی دەوڵەمەندان مەبە).[1] ترمزی و حاکم و بەیهەقی بەو جۆرە هێناویانەو ئەمەشیان بۆ زیادکردووە(ولا تستخلص ثوبا حتى ترقيعه)واتە(جلەکەت مەگۆڕە تا پینەی دەکەیت) ڕەزین هێناویەتی و ئەمەشی بۆ هێناوە: عروە وتی: عائیشە جلی تازەی نەکردەبەر تائەوەی کراسەکەی بەرز ڕادەگرت و بەریدەدایەوە، ڕۆژێك لەلایەن موعاویەوە هەشتا هەزاری بۆ هات، ئێوارەی نەکردەوە تا هەمووی بەخشی، کەنیزەکەکەی پێی وت: دەی با بە درهەمێکی گۆشتت بکڕیایە بۆمان؟ وتی: ئەگەر بیرت بخستمایەتەوە دەمکرد[2][3].

تەبەرانی لە ئەبوجوحەیفەوە هێناویەتی دەڵێت: کولێرەیەکم بە گۆشتێکی چاکەوە خواردو هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و نزگەرەم هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اكفف عنا جشاءك ابا جحيفة فان اكثر الناس شبعا في الدنيا اطولهم جوعا يوم القيامة)واتە(ئەبوجوحەیفە نزگەرەکەتمان لێ بەدوور بگرە، چونکە ئەو کەسانەی کە دنیادا زیاتر تێرن لە ڕۆژی دواییدا برسێتییان دوورو درێژترە) دوای ئەوە ئەبوجوحەیفە تا مرد تێری سکی نانی نەخوارد، نانی بەیانی بخواردایە نانی شەوی نەدەخوارد، یان نانی شەوی بخواردایە نانی بەیانی نەدەخوارد[4][5].

---

[1] – لە کنز العمال ج٢ ص١٥٠ دا واهاتووە.

[2] – ضعيف.

[3] –( لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٢٦ دا واهاتووە).

[4] – حسن.

[5] – هەیسەمی ج٥ ص٣١ دەڵێت: تەبەرانی لە دوو موعجەمی وسط و کبیر دا بە چەند سەنەدێك هێناویەتی، لە یەکێك لە سەنەدەکانی(المعجم الكبير) دا موحەممەدی کوڕی خالیدی کووفی هەیە

تەبەرانی لە جەعدەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کابرایەکی ورگنی بینی، بە پەنجەی ئاماژەی بە ورگی کردو فەرمووی(لو کان هذا في غير هذا لكان خيرا لك)واتە(ئەگەر ئەوە لەناو جگە لەمەدا بوایە بە دڵنیاییەوە خێری دەبوو بۆت) لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا کابرایەك خەوی بە پێغەمبەرەوە بینی، پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە شوێنیداو کابرا بۆی گێڕایەوەو کابرا ورگن بوون پێغەمبەر(ﷺ) بە پەنجەکانی ئاماژەی بە ورگی کردو فەرمووی(لوكان هذا في غير هذا المكان لكان خيرا لك)[1].[2]

مالیك لە یەحیای کوڕی سەلیمەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب گەیشت بە جابری کوڕی عەبدوڵڵا لەگەڵیدا کەسێك هەبوو گۆشتی هەڵگرتبوو(ورگن بوو) عومەر وتی: کەستان نایەوێت ورگەکەی بدات بە دراوسێکەی و ئامۆزاکەی، بەرامبەر بەم ئایەتە چی دەڵێن(اذهبتم طيباتكم في حياتكم الدنيا واستمتعتم بها).[3]

بەیهەقی لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتابم پێ گەیشتو منیش بە درهەمێك گۆشتم کڕیبوو، وتی: ئەی جابر ئەمە چییە؟ وتم: ئارەزوو و حەزی ژنو منداڵەکەمە منیش بە درهەمێك گۆشتم بۆ کڕین،

---

کە نایناسم، کەسەکانی دیکەی جێمتمانەن، تەواو. ئیبن عەبدولبیر لە الاستيعاب ج٤ ص٣٧ بەو جۆرە هێناویەتی، بەزار بە دوو سەنەد بە کورتی بەو جۆرە هێناویەتیو کەسەکانی هەر دوو سەنەدەکە جێ متمانەن، هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٣ وا دەڵێت، ئەبونەعیم لە الحلیە ج٧ ص٢٥٦ لە ئەبوجوحەیفەوە بەو واتایە هێناویەتیو لەوێوە کە دەڵێت نانی نەخوارد.... تا کۆتایی فەرموودەکەی نەهێناوە).

[1] – ضعيف.

[2]– (هەیسەمی ج٥ ص٣١ دەڵێت: تەبەرانی هەمووی گێڕاوەتەوە، ئەحمەدیش هێناویەتی بەڵام ئەو دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) خەوەکەی بە کابراوە بینی، کەسەکانی سەنەدەکان صەحیحن جگە لە ئەبوئیسرائیلی جوشەمی، تەواو.

[3] – (لە الترغيب والترهيب ج٣ ص٤٢٤ دا واهاتووە).

عومەریش دەیوتەوە حەزو ئارەزووی ماڵو مناڵم!! هێندە وتیەوە حەزم دەکرد ئەو درهەمەم ون بکردایەو نەگەیشتمایە بە عومەر.[1]

سەعیدی کوڕی مەنسور و عەبدی کوڕی حەمیدو ئیبن مونزیرو حاکمو بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە عومەر لە دەستی جابری کوڕی عەبدوڵڵادا درهەمێکی بینی وتی: حەزتان لە هەرچی هەبوو دەیکڕن؟ ئەی لەگەڵ ئەم ئایەتە چی دەڵێن(اذهبتم طيباتكم في حياتكم الدنيا واستمتعتم بها).[2]

عەبدولڕەزاقو ئەحمەد لە الزهدو عەسکەری لە المواعظو ئیبن عەساکیر لە حەسەنەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر چوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی سەیری کرد گۆشتی لەلایە، وتی: ئەم گۆشتە چیە؟ وتی: حەزم لێی بوو، وتی: حەزت لە هەرچی بێ دەبێ بیخۆیت؟ بەسە زیادەڕەوی بۆ کەسێك کە حەزی لە هەرچی بوو بیخوات.[3]

ئیبن موبارەك لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب بیستی یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان هەموو جۆرە خواردنێك دەخوات، بۆیە بە مەولایەکی خۆی کە ناوی یەفا بوو وت: ئەگەر زانیت کاتی نان خواردنیەتی پێم بڵێ، کە کاتی هات بە عومەری وتو عومەر هاتو سەلامی کردو مۆڵەتی وەرگرتو چوویە ژوورەوە، نانی ئێوارە هاتو کولێرە و گۆشت هێنرا، عومەر لەگەڵی خواردی، دواتر گۆشتی برژاو هێنرا، یەزید دەستی پێکردو عومەر دەستیگرتەوە، پاشان عومەر وتی: بەخوا جوانە یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان خواردن دوای خواردن؟ سوێند بەو کەسەی گیانی عومەری بەدەستە ئەگەر لە سوننەتیان لابدەن لە ڕێگەیاندا لێیان جیادەکرێنەوە.[4]

---

[1] – (لە الترغيب والترهيب ج٣ ص٤٢٤ دا واهاتووە). ئیبن جەریر لە جابرەوە بە درێژتر لەوە هێناویەتی، لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠٧ دا هاتووە.

[2] – (لە المنتخب ج٤ ص٤٠٦ دا واهاتووە).

[3] – ( لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠١ دا واهاتووە).

[4] – (لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠١ دا واهاتووە).

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٤٨ لە حەسنەوە هێناویەتی عومەر(رضي الله عنه) دای بە لای سەتڵێکی شەخەڵداو لەلای وەستا وەك ئەوەی هاوەڵانی پێی بێزار بن، عومەر وتی: ئەمە ئەو دنیایەتانە کە لەسەری سوورن پاڵی پێوە دەدەنەوە.

ئیبن عەساکیر لە سەلەمەی کوڕی کەلسومەوە هێناویەتی ئەبودەردا لە دیمەشق پردێکی بنیادنا، عومەر ئەوەی بیستەوەو ئەوکات لە مەدینە بوو، نامەی بۆ نووسی ئەی عوەیمری کوڕی ئوم عوەیمر ئایا بنیادەکانی ڕۆم‌و فارس بەشیان نەرکردیت تا هەمدی بنیادبنێیت؟ ئێوە ئەی هاوەڵانی موحەممەد پێشەنگن، ئیبن عەساکیرو هنادو بەیهەقی لە ڕاشیدی کوڕی سەعدەوە هێناویانە عومەر بیستی ئەبودەردا لە حیمس شوێن حەوانەوەیەکی بنیادناوە، ئەویش بۆی نووسی پاشان ئەی عوەیمر مەگەر بنیادی ڕازاندەوەی دنیا کە خوا فەرمانی کردووە وێرانی بکەیت(نەکەویتە ڕابواردنی) لەلایەن ڕۆمەوە بۆت بەس نەبووە؟[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج٧ ص٣٠٥ لە ڕاشیدی کوڕی سەعدەوە بەو جۆرە هێناویەتی، پاشان قسەی ڕازاندنەوەی دنیا ئەمەی هێناوە: نوێکردنەوەی لە کاتێکدا خوا مۆڵەتی پێداویت بۆ وێران کردنی، ئەگەر ئەم نامەیەم گەیشتە دەستت لە حیمسەوە بڕۆ بۆ شام، سوفیان وتی: بەوە سزایدا.

ئیبن عەبدولحەکەم لە یەزیدی کوڕی ئەبوحەبیبەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکەم کەس لە میسر ژووری بنیادنا خاریجەی کوڕی حوزافە بوو، عومەر ئەمەی بیست‌و نامەی بۆ عەمری کوڕی عاص(رض) نووسی

(سەلام، پاشان بیستوومە خاریجەی کوڕی حوزافە ژوورێکی بنیادناوە، خاریجە ویستی ئاگاداری شەرمگەی دراوسێکەی بێت، ئەگەر ئەم نامەم گەیشتە دەستت ئەو ژوورە بڕووخێنە پشت بەخوا، والسلام).[2]

---

[1] – ( لە کنز العمال ج٨ ص٦٢ دا واهاتووە).

[2] – ( لە کنز العمال ج٨ ص٦٣ دا واهاتووە).

ئیبن سەعدو بوخاری لە(الادب) لە عەبدوڵڵای ڕۆمیەوە هێناویانە دەڵێت: چووم بۆ ماڵی ئوم تەلق سەیرمکرد سەقفی ماڵەکەی کورت بوو، وتم: بۆچی سەقفەکەی وا کورتە ئوم تەلق؟ وتی: کوڕی شیرینم عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ کاربەدەستەکانی با بیناکانتان بەرزنەبن، چونکە خراپترین ڕۆژەکانتان ئەو ڕۆژانەن کە بیناکانتان بەرزو درێژ دەبن.[1]

ئیبن ئەبی دنیا و دەینەوەری لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە هێناویانە دەڵێت: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص نامەی نووسی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ئەو کات سەعد والی کوفە بوو – داوای لێکرد مۆڵەتی بدات بینایەك بکاتەوە بۆ دانیشتنی، ئەویش وتی: بینایەك بنیادبنێ لە خۆر بتپارێزێ و لە باران دوورت بگرێ، چونکە دنیا شوێنی بەرچاوتێرە، عەمری کوڕی عاصیش کە لەسەر میسر بوو نووسی چۆن حەزدەکەیت بۆ ئەمیرایەتیەکەت وابن بۆ هاوڵاتیەکانت وابە.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج٧ ص٣٠٤ لە سوفیانەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب بیستی کابرایەك بە خشت خانووی بنیادناوە، وتی: چاوەڕێ نەبووم لەم ئوممەتەدا کەسی وەك فرعەون هەبێت، دەڵێت: مەبەستی ئەو قسەی فیرعەون بوو کە دەیوت: ئەی هامان لەسەر قوڕ کۆشکێکم بۆ بنیادبنێ و ئاگرم بۆ بکەرەوە.ئیبن عەساکیر لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: لە سەردەمی باوکمدا ئاهەنگی هاوسەرگیریم گێڕا، باوکم لەناو خەڵکانێکدا کە بانگی کردن ئەبوئەیووبی بانگکرد، بە دوو بەرگی سەوز ماڵەکەمیان داپۆشیبوو، ئەبوئەیوب هات و سەری لەقاندو سەیری کرد ماڵەکە داپۆشراوە، وتی: عەبدوڵڵا دیوارەکان دادەپۆشن، باوکیشم شەرمی دەکردو وتی: ئەبوئەیووب ئافرەتان پێیان کردین، وتی: دەترسام ئافرەتان بەسەر ئەودا زاڵ بنن بەڵام ترسم لەوە نەبوو بەسەر تۆدا زاڵبن، نایەمە ماڵتان و خواردنتان ناخۆم.[3]

[1] – کنز العمال ج٨ ص٦٣.

[2] – (له منتخب كنز العمال ج٤ ص٤٠٦ دا واهاتووه).

[3] – ( له كنز العمال ج٨ ص٦٣ دا واهاتووه).

ئەحمەد لە الزهدو ئیبن سەعد ج٣ ص١٣٧و جگە لەوانیش لە سەلمانەوە هێناویانە دەڵێت: چووم بۆ لای ئەبوبەکر(رضي الله عنه) و پێم وت شتێکم پێ بڵێ، وتی: ئەی سەلمان لە خوا بترسەو بزانە دواتر کۆمەڵێك فتوحات دەبن، نازانم پشکی تۆ لەوەدا چیە، چی دەکەیتە سکتەوەو فڕێی دەدەیتەوە پشتەوە، بزانە هەرکەس پێنج نوێژەکە بکات لە پەنای خوادا شەو و ڕۆژ دەکاتەوە، دەی هیچ لە خەڵکانی خوا مەکوژە ئەگەرنا خوا پەنای خۆی دەخاتە مەیدان و بەسەر ڕووتدا بەرەو دۆزەخ ڕادەکێشێت.[1]

دەینەوەری لە حەسەنەوە هێناویەتی سەلمانی فارسی لە کاتی نەخۆشیەکەی ئەبوبەکردا هات بۆ لای ئەبوبەکرو وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەسیەتم بۆ بکە، ئەبوبەکر وتی: خوا دنیاتان بەڕوودا دەکاتەوە – فتوحاتی دنیاتان بۆ دەکات – دەی هەرکامتان بەشی پێویستی هەڵبگرن.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٤ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویەتی دەڵێت: لە کاتی ئەو نەخۆشیەی ئەبوبەکردا کە تیایدا مرد چووم بۆ لای و سەلامم لێکرد، ئەویش وتی: دەبینم دنیا بەڕێوەیە، کاتێك بەڕێوەیە بەرەو ڕووتان دێت و ئێوەش پۆشتەی ئاوریشم و پشتی دیباج دەخەنەکارو بە ڕاخەری خوری ئەزری بێزاردەبن، هەرکامتان گیای سەعدانی بۆخۆ دانابێت، سوێند بەخوا ئەگەر هەرکامتان – بەبێ هیچ هۆکارێ – بدرێ لە ملتان باشترە لەوەی لە گۆماوی دنیادا مەلەبکات.[3]

---

[1] – (لە کنز العمال ج٨ ص٢٣٣ دا واهاتووە).

[2] – (کنز العمال ج٢ ص١٤٦).

[3] – (تەبەرانیش بەو جۆرە لە عەبدولڕەحمانەوە هێناویەتی، لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٦٤ دا هاتووەو دەڵێت: حوکمی ڕەفعی بۆ هەیە چونکە لە ئیخبارەکاندا دادەنرێت).

ئەحمەد لە عەلی کوڕی ڕەباحەوە هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە عەمری کوڕی عاص(رضي الله عنه) بوو دەیوت: بەیانی و ئێوارەتان وای لێهاتووە حەزتان لەوەیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆی لێ بەدوور دەگرت، ڕۆژان حەزتان لە دنیایەو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆی لێ بەدوور دەگرت، سوێند بەخوا شەوێك لە ساڵێکدا نەهاتووە بەسەر پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) مەگەر ئەوەی پشکی سەختی و لەسەر بوونی زیاتر بوو بێت لە پشکی خۆشی و بۆ بوونی، هەندێ لە هاوەڵان وتیان: پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بینی کە قەرزی دەنواند،[1] لە گێڕانەوەیەکی ئەحمەد لە عەمرەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕێبازی ئێوە چەندە لە ڕێبازی پێغەمبەرەکەتان دوورە، ئەو لە هەمووان زیاتر خۆی لە دنیا دەپاراست، ئێوەش لە هەمووان زیاتر حەزتان لێیەتی[2][3].

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٠١ لە مەیمونەوە هێناویەتی کەسێکی بەنی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر داوای جلێکی لێکردو وتی: جلەکەم دڕاوە، ئەویش پێی وت: جلەکەت ببڕەو دواتر بیپۆشە، گەنجەکەش حەزی بەوە نەکرد، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پێی وت: هاوار بۆت لە خوا بترسە، لەو کەسانە مەبە خوا چی ڕۆزییان پێ دەبەخشێت لە ناوسك و لەسەر پشتیان دایدەنێن.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٦٣ لە سابتەوە هێناویەتی ئەبوزەر دای بە لای ئەبودەردادا کە خانوویەکی بۆ خۆی دروست دەکرد، ئەبوزەر وتی: بە ڕاستی بەردت لەسەر شانی خەڵك هەڵگرتووە، ئەویش وتی: خانوو بنیاد دەنێم، ئەبوزەر پێی وت: وەك ئەمە؟ وتی: براگیان لەوانەیە لەسەر ئەمە لە دەروونتدا شتێکت

---

[1]– (لە الترغیب والترهیب ج٥ ص١٦٦ دا هاتووە: ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو گێڕەرەوەکانی صەحیحن، حاکمیش هێناویەتی بەڵام ئەو دەڵێت: سێ ساڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وابووە ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا بە کورتی هێناویەتی، تەواو).

[2]– صحیح.

[3]– (هەیسەمی ج١٠ ص٣١٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد صەحیحن، ئیبن عەساکیرو ئیبن نەجاریش بەو جۆرە هێناویانە، لە کنز العمال ج٢ ص١٤٨ دا واهاتووە).

بەرامبەر بە من هەبیٚ، وتی: ئەگەر بمدایە بەلاتداو لە نێوەندی بیانووخوازی ژن و منالْتدابوویتایە لام خۆشتربوو لەوەی بەمجۆرە بتبینم.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٧ لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: جارێکیان زریٚ بەرگێکی نوێم پۆشی، سەیرم دەکرد و پێی سەرسام بووم، ئەبوبەکر وتی: سەیری چی دەکەیت؟ خوا سەیرت ناکات! وتم: بۆچی؟ وتی: نازانیت بەندە ئەگەر سەرسامی جوانی دنیا بوو و پەروەردگار سەرکۆنەی دەکات تا لێی جیادەبێتەوە(دەستبەرداری بیٚ)عائیشە وتی: منیش لامبردو کردم بەخێر، ئەبوبەکر وتی: بەڵکو ئەوە لە تاوانت بسڕێتەوە.

ئەبونەعیم لە الحیة ج١ ص٣٧ لە حەبیبی کوڕی زەمرەوە هێناویەتی دەڵێت: کوڕێکی ئەبوبەکری صدیق سەرەمەرگی هات و گەنجەکە چاوی لەسەر پشتیەکە بوو، کە مرد بە ئەبوبەکریان وت: کوڕەکەتمان وابینی، دەڵێت: لەسەر پشتیەکە بەرزیان کردەوەو سەیریان کرد لە ژێریدا پێنج یان شەش دینار هەیە، ئەبوبەکر بە دەستێکی دای بەسەر دەستەکەی تریداو دەیوت: انا لله وانا الیه راجعون وانابینم پشتت بەرگەی ئەمە بگرێت(بۆی بشێت).

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٤٢ لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوهوزەیلەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(رضي الله عنه) خانوەکەی خۆی بنیادنا بە عەمماری وت: ئادەی سەیرکە چیم بنیادناوە عەممار چوو و سەیری کردو وتی: بینایەکی گەورەت بنیادناوەو هیوات دوورو درێژە – یان دووربینانە ڕوانیویت – زوویش دەمریت.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٣ ص٣٢٣ لە عەتائەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوسەعیدی خودری بانگهێشت کرا بۆ نانێکی هاوسەرگیری، منیش لەگەڵیدا بووم، سەیری کرد هەموو جۆریٚ دانراوە، وتی: دەزانن پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر نانی بەیانی بخواردایە نانی شەوی نەدەخوارد ئەگەریش شەوی بخواردایە نانی بەیانی نەدەخوارد، ئەبونەعیم دەڵێت:( فەرموودەکەی عەتا غەریبەو تەنها وەزینی کوڕی عەتا گێڕاویەتیەوە – ئەوەی من بزانم –.[1]

---

[1] – ضعیف.

# (بەشی نۆیەم)

(هاوەڵان(رضي الله عنهم) چۆن لە ئارەزووە دنیاییەکانی باوكو براو کوڕ و ژن و خێڵ و سامان و بازرگانی و خانوو و بینا دەرچوون و پەیوەست بوون بە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی و خۆشەویستانی موسڵمانی خوا و پێغەمبەرەکەیەوە و ڕێزی ئەو کەسانەیان دەگرت کە پەیوەستی پەیامی موحەممەدی بوون و پەتی نەفامییان لە پێناو پەت و پەیوەستی ئیسلامدا پچڕاند).

## (بەشی نۆیەم)

## (هاوەڵان(رضی الله عنهم) چۆن لە ئارەزووە دنیاییەکانی باوكو براو كوڕ و ژن و خێڵ و سامان و بازرگانی و خانوو و بینا دەرچوون و پەیوەست بوون بە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی و خۆشەویستانی موسڵمانی خوا و پێغەمبەرەکەیەوە و ڕێزی ئەو کەسانەیان دەگرت کە پەیوەستی پەیامی موحەممەدی بوون و پەتی نەفامییان لە پێناو پەت و پەیوەستی ئیسلامدا پچڕاند).

ئەبو نەعیم لە الحلیه ج١ ص١٠١ لە ئیبن شەوزەبەوە هێناویەتی دەڵێت: باوکی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاج لە ڕۆژی بەدردا ڕێی بە ئەبو عوبەیدەی کوڕی گرت، ئەبوو عوبەیدەیش خۆی لێ دوور دەگرت، کە وازی نەهێنا ئەبوو عوبەیدە چوو بۆی و کوشتی، خوای گەورەش لە بارەیەوە کاتێك باوكی خۆی کوشت ئەم ئایەتەی دابەزاند({لَا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ })[١][٢][٣].

بەیهەقی ج٩ ص٢٧ لە مالیکی کوڕی عومەیرەوە- کە سەردەمی نەفامی بینیبوو- هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و وتی: من گەیشتم بە دوژمن و تیایاندا باوکم هاتە ڕێم، بیستم قسەیەکی ناشرینی پێ وتیت

[١] - المجادله٢٢.

[٢]- بەیهەقی ج٩ ص٢٧ و حاکم ج٣ ص٢٦٥ لە عەبدوڵڵای کوڕی شەوزەبەوە بەو جۆرە هێناویانە، (بەیهەقی دەڵێت: ئەم سەنەدە مونقەتیعە، تەبەرانیش بەو جۆرە بە سەنەدێکی جەیید لە ئیبن شەوزەبەوە هێناویەتی، لە الاصابه ج٢ ص٢٥٣ دا وا هاتووە).

[٣] - ضعیف.

و خۆم نەگرت و بە ڕم لێمدا تا کوشتم، پێغەمبەر(ﷺ) لێی بێدەنگ بوو، یەکێکی دی وتی: گەیشتم بە باوکم و وازم لێ هێنا و حەزم کرد کەسێکی تر لە بری من بیکوژێت، پێغەمبەر(ﷺ) لێی بێدەنگ بوو[1][2].

بەزار لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دای بە لای عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیدا کە لە ژێر سێبەری بینایەکی بەرزدا بوو، وتی: ئیبن ئەبی کەبشە تۆزی بەسەردا کردین، ئەوکات عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێندت دەدەم بەوەی کە ڕێزداری کردیت ئەگەر دەتەوێت با سەرەکەیت بۆ بێنم، فەرمووی(لا ولكن بر اباك و احسن صحبته)واتە(نا بەڵکو لەگەڵ باوکت چاك بەو و هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵدا بکە).[3] تەبەرانیش لە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد تا باوکی بکوژێت، ئەویش فەرمووی(باوکت مەکوژە).[4]

ئیبن ئیسحاق لە عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە هێناویەتی:عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیستوومە دەتەوێت عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بکوژیت لەسەر ئەوەی بیستووتە وای وتووە، ئەگەر دەیکوژیت منی بۆ بنێرە، دەچم سەری دێنم بۆت، سوێند بەخوا خەزرەج دەزانن کەس هێندەی من بەرامبەر باوکی چاك نەبووە، دەترسم کەسی تر بچێت بیکوژێت و دەروونم وازی لێ نەهێنێت سەیری بکوژی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بکات لەناو خەڵکدا بێت و بچێت و بیکوژم، بەمە بەرامبەر بە بێباوەڕێك موسڵمانێك بکوژم و بچمە دۆزەخەوە،

[1] – ضعيف.

[2] – (بەیهەقی دەڵێت: سەنەدەکەی مورسەلی جەییدە).

[3] – ( هەیسەمی ج٩ ص٣١٨ دەڵێت: بەزار هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن).

[4] – صحيح.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بەڵکو تا لەگەڵمان بمێنێتەوە سۆز و نەرمونیانی لەگەڵ دەنوێنین و بە چاکی لەگەڵی هەڵسوکەوت دەکەین)[1][2].

تەبەرانی لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە جەنگی بەنی موصتەلەق گەڕایەوە عەبدوڵڵای کوڕی عوبدوڵڵای کوڕی ئوبەی هەستاو شمشێرەکەی لەسەر سەری باوکی هەڵکشاو وتی: سوێند بەخوا دەبێت ڕاتوەستێنم تا دەڵێت موحەممەد عیزەتمەندترو من زەلیلم، وتی: هاوار بۆ تۆ، موحەممەد عیزەتمەندترو من زەلیلم، پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی بیستەوە پێی سەرسام بوو و لەسەر ئەوە سوپاسی عەبدوڵڵای کرد.[3]

ئیبن شاهین بە سەنەدی حەسەن لە عروەوە هێناویەتی دەڵێت: حەنزەلەی کوڕی ئەبوعامرو عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای ئوبەی کوڕی سەلول داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد تا باوکی خۆیان بکوژن، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدان[4][5].

ئیبن ئەبی شەیبە لە ئەیوبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر بە ئەبوبەکری وت: لە ڕۆژی ئوحود تۆم بینی خۆمم لێت لادا، ئەبوبەکر وتی: دەی ئەگەر من تۆم ببینیایە لێمدەدایت،[6] حاکم لە واقدیەوە هێناویەتی عەبدولڕەحمانی لە ڕۆژی بەدردا داوای شەڕی ڕووبەڕووی کرد، ئەبوبەکری باوکی

---

[1] - مرسل.

[2] - ( لە البدایە و النهایە ج٤ ص١٥٨ دا وا هاتووە).

[3]-( هەیسەمی ج٩ ص٣١٨ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەممەدی کوڕی حەسەنی کوڕی زبالە هەیە کە لاوازە).

[4] - ضعیف.

[5] - ( لە الاصابة ج١ ص٢٦١ دا واهاتووە).

[6]- ( لە کنز العمال ج٥ ص٢٧٤ دا هاتووە، حاکم ج٣ ص٤٧٥ لە ئەیوبەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

هەستا بۆی تا بەرەو ڕوو لەگەڵ بجەنگێ، دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە ئەبوبەکری فەرموو(متعنا بنفسك).[1]

ئیبن هیشام لە ئەبی عوبەیدەو جگە لەویشەوە لە کەسانی زاناوە لە(المغازي) دا هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بە سەعیدی کوڕی عاصی وت: کاتێك دەیدا بە لایدا: من وادەبینم لە دەروونتدا شتێك هەیەو وادەزانێت من باوکتم کوشتووە، ئەگەر من بمکوشتایە لەسەر کوشتنی پۆزشم بۆ نەدەهێنایەوە، بەڵام من عاصی کوڕی موغیرەی خاڵۆی خۆمم کوشت. بەڵام سەبارەت بە باوکی تۆ دام بەلایداو ئەویش وەك شاخگێڕانی گا دەهات و دەچوو، ویستم بچم بۆی، ئامۆزاکەی چوو بۆی و لە جیاتی من کوشتنی)،[2] لە الاستیعاب والاصابەشدا ئەمەش هاتووە: سەعیدی کوڕی عاص پێی وت: ئەگەر بتکوشتایە تۆ لەسەر حەق و ئەویش لەسەر پووچەڵی و ناهەقی بوو، عومەریش بە قسەکەی سەرسام بوو.

ئیبن جەریر لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بۆ کوژراوانی بەدر کرد تا لەسەر ڕوو ڕابکێشرێن بۆ بیری(قەلیب) و فڕێ درانەناوی، دواتر وەستاو فەرمووی(ئەی ئەهلی قەلیب ئایا ئەو بەڵێنە حەقەتان بینی کە پەروەردگارتان دای؟ چونکە من ئەو بەڵێنەم بە حەق بینی کە پەروەردگارم پێیدام) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا قسە بۆ مردووان دەکەیت؟ فەرمووی(بە ڕاستی زانییان کە پەروەردگاریان بە حەق چ بەڵێنێکی پێ دابوون!) کاتێك ئەبوحوزەیفەی کوڕی عوتبە باوکی خۆی بینی ڕایدەکێشا بۆ قەلیب پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناحەزی لە ڕوخساریدا بەدیکردو فەرمووی(ئەبوحوزەیفە وادیارە حەز بە بینینی ئەوە ناکەیت؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم کەسێکی گەورە بوو، هیوام وابوو

[1] - بەیهەقی ج٨ ص١٨٦ لە واقدیەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

[2] - ،( لە البدایە والنهایە ج٣ ص٢٩٠ دا واهاتووە.

پەروەردگارم ئیسلامی خەڵات بکات، بەڵام کە لەم بارەدا بینیم ئەوە دڵگرانی کردم، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) نزای خێری بۆ ئەبوحوزەیفە کرد[1] [2].

حاکم ج٣ ص٢٢٣ لە ئەبوزەنادەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوحوزەیفەی لە بەدردا بینی و عوتبەی باوکی بانگکرد بۆ شەڕی ڕووبەڕوو، باسی کرد کە هێندەی کچی عوتبەی خوشکی لەو بارەوە چ شعرێکی وت.[3]

ئیبن ئیسحاق لە نەبیهی کوڕی وەهبی بەنی عەبدولدارەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە دیلەکانی بینی لە نێوان هاوەڵانیدا دابەشی کردن و فەرمووی(لەگەڵیان چاك بجوڵێنەوە) دەڵێت: ئەبوعەزیزی کوڕی عومەیری کوڕی هاشم – برای موصعەبی کوڕی عومەیر لەسەری دیك و باوکیشیەوە – لە نێو دیلەکاندا بوو، ئەبوعەزیز دەڵێت موصعەبی برام و یەکێ لە پشتیوانان کە گرتبوومی بردمیان موصعەب وتی: چاك بیگرە چونکە دایکی ئەو دەوڵەمەندە بەڵکو لێی وەربگرێتەوە(بە پارە) ئەبوعەزیز وتی: من لەناو دەستی پشتیواناندا بوم کاتێك لە بەدرەوە هێنامیان، کە کاتی نانی بەیانی و ئێوارەیان هات نانیان دەدا بە من و خۆیان خورمایان دەخوارد، ئەوەش لەبەر وەسیەتەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە وەسیەتی بۆ کردن چاك بن، هەرکامیان پارچە نانێکی دەبوو دەیدا بە من و منیش شەرمم دەکرد و دەمگێڕایەوە و ئەویش نەیدەخوارد و بۆی دەگێڕامەوە، کاتێك موصعەبی برای بە ئەبولیوسری – ئەوەی گرتبووی – وت: توند بیگرە، ئەبوعەزیز پێی وت: براگیان ئەوە هەڵوێستتە لەگەڵم؟ موصعەب پێی وت: ئەوە برامە نەك تۆ.

---

[1] – صحیح.

[2] – ( حاکم ج٣ ص٢٢٤ لە عائیشەوە بەو جۆرە هێناویەتی و دەڵێت: لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە و بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبیش لەسەری کۆکە و ئیبن ئیسحاقیش بەو جۆرە بەبێ سەنەد باسی کردووە، لە البدایە والنهایە ج٣ ص٢٩٤ دا هاتووە).

[3] – ( بەیهەقیش ج٨ ص١٨٦ بەو جۆرە هێناویەتی).

دایکی پرسیاری کرد چاکترین لە بری دانی ڕزگارکردن لەناو قوڕەیشدا چەند بوو؟ وتیان: چوار هەزار درهەم. ئەویش بە ئەوەندە ئازادی کرد[1][2].

واقیدی لە ئەیوبی کوڕی نوعمانەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەو ڕۆژ ئەبوعەزیزی کوڕی عومەیر – کە برای دایكو باوکی موصعەبی کوڕی عومەیر بوو – بە دیلی کەوتە دەست موحریزی کوڕی فەزلە، موصعەب پێی وت: توند بیگرە چونکە لە مەککەدا دایکێکی هەیە کە پارەی زۆرە، ئەبوعەزیز پێی وت: برا گیان ئەوە هەڵوێستتە بەرامبەرم؟ وتی: موحریز برامە نەك تۆ. دایکی بۆ ئازادکردنی چوار هەزاری نارد[3][4].

ئیبن سەعد ج٨ ص٧٠ لە زوهەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب هات بۆ مەدینە ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست هەڵمەت بباتە سەر مەککە، ئەبوسوفیان هات بۆ لای و داوای لێکرد تا درێژە بدات بە ڕێککەوتنی حودەیبیە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی پێ نەداو لێی قبوڵ نەکرد، ئەبوسوفیان هەستاو چوو بۆ لای ئوم حەبیبی کچی، کاتێك چوو تا لەسەر جێگەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دابنیشێ ئوم حەبیبە جێگەکەی پێچایەوەو نەیهێشت، ئەبوسوفیان وتی: کچی شیرینم ئایا لەبەر ڕاخەرەکە لاتبرد یان لەبەر من؟ وتی: بەڵکو ئەوە ڕاخەری پێغەمبەری خوایەو تۆش کەسێکی پیسو بێباوەڕیت، وتی: کچی شیرینم: دوای خۆم خراپت بەسەر هاتووە[5][6].

---

[1] – مرسل.

[2] – ( لە البدایە والنهایە ج٣ ص٣٠٧.

[3] – ضعیف.

[4] – ( لە نصب الرایە ج٣ ص٤٠٣ دا واهاتووە).

[5] – مرسل.

[6] – (ئیبن ئیسحاق بەو جۆرە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٤ ص٢٨٠ دا هاتووە و ئەوەشی بۆ زیاد کردووە: حەزی نەکرد لەسەر جێگەکەی دابنیشێت).

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٣٣ لە ئەبولئەحوەصەوە هێناویەتی دەڵێت: چووین بۆ لای ئیبن مەسعودو سێ کوڕی لابوو وەك دینار وابوون، ئێمەش سەیرمان دەکردن. ئەویش تێگەیشت، وتی: وادیارە ئێوەش هیواتان بەمەی منە، وتمان: دەی پیاو هەر هیوای وای هەبێ باشە؟ ئەویش سەری بەرەو سەقفیماڵێکی کورتی بەرزکردەوە کە هێلانەی باڵندەیەکی(خطاف) تێدابوو، وتی: ئەگەر خۆڵی گۆڕەکەیان بتەکێنم لام خۆشەویستترە لەوەی هێلانەی ئەو باڵندەیە بکەوێت و بشکێت، ئەبوعوسمان لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی کە لە کوفە لەگەڵی دادەنیشت، ڕۆژێکیان لە ژوورێکدا بوو و لەلایایەوە فلان و فلان- دوو ژنی جوان و دیار – هەبوون و لە هەردووکیان نمونەی منالی هەبوون، لەسەر سەریەوە چریکەی چۆلەکەیەك هات، دواتر کەوت و سکی بریندار بوو، ئەویش دەستی بەسەردا هێناو وتی: ئەگەر بنەماڵەی عەبدوڵڵا بمرن و خۆشی بە دوایاندا بمرێت لام خۆشەویستترە لەوەی ئەم چۆلەکە بمرێ.

پێشتر باسی قسەی عومەرمان کرد سەبارەت بە ڕاوێژی خاوەن ڕاکان: سوێند بەخوا وەك ڕای ئەبوبەکر ناڕوانم بەڵام وای دەبینم دەستم بگات بە فلانی خزمی عومەر تا بدەم لە ملی، عەلی عەقیل بگرێت و بدات لە ملی، حەمزە فلان برای بگرێت و بدات لە ملی تا خوا بزانێت هیچ هەواداریمان بۆ بێباوەڕان لە دڵدانیە، هەروەها پێشتر باسی پشتیوانان لە پچڕاندنی نەفامیدا کرا.

# (خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) لەناو هاوەڵانیدا)

ئیبن ئیسحاق لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرەوە هێناویەتی سەعدی کوڕی موعاز(رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەپرێکت بۆ هەڵنەدەین تا تیایدابیت و وڵاخەکانت لە دەوردا ئامادەبکەین دواتر بچین بۆ دوژمن، ئەگەر خوا سەریخستین بەسەر دوژمندا ئەمە حەزو ویستی ئێمەیە، ئەگەر ئەوەنەبوو سواربیت و بگەیتەوە بەوانەماندا کە نەهاتوون، کەسانێك دواکەوتوون و نەهاتوون کە لە ئێمە زیاتر تۆیان خۆش دەوێت، ئەگەر بیانزانیبا شەڕ دەکەیت دوانەدەکەوتن تا خوا لە دەورتدا کۆیان بکاتەوە و لەگەڵت جیهادبکەن. پێغەمبەر(ﷺ) دەستخۆشی لێکرد نزای خێری بۆ کرد، پاشان کەپرێك بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدرا و تیایدا بوو[1,2].

تەبەرانی لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لە خۆم زیاتر لەلام خۆشەویستتری، لە کەسوکارو کوڕم زیاتر لام خۆشەویستتری، جار هەیە لە ماڵم بیرت دەکەم و خۆم ناگرم تا بێم بۆ لات و سەیرت بکەم، کاتێك بیری مەرگی خۆم و جەنابت دەکەمەوە دەڵێم ئەگەر تۆ بچیتە بەهەشت و لە پلەی پێغەمبەراندایت و منیش ئەگەر بچمە بەهەشت دەترسم نەتبینم. پێغەمبەر(ﷺ) هیچ وەڵامی نەدایەوە تا جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا(ومن يطع الله والرسول فاولائك مع الذين انعم الله عليهم من النبيين والصدقين والشهداء والصالحين)[3].

---

[1] – مرسل.

[2] – (البدايه والنهايه ج٣ ص٢٦٨).

[3] – (هەیسەمی ج٧ ص٧ دەڵێت: تەبەرانی لە(المعجم الصغير والمعجم الوسيگ) دا هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی عیمرانی عابدی، تەواو. ئەبونەعیم لە الحليه ج٤ ص٢٤٠ لە عائیشەوە بەو دەق و سەنەدە بەو جۆرە هێناویەتی. دەڵێت: ئەم فەرموودە

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی کابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من زۆر تۆم خۆش دەوێت تا جاری واهەیە بیرت دەکەم، ئەگەر نەیەم بۆ لات و نەتبینم وادەزانم گیانم دەردەچێت، بیردەکەمەوە ئەگەر چوومە بەهەشت و لە تۆ جیابوومەوە و پلەی تۆ بەرزربوو ئەوە لەسەر من سەخت دەبێ و حەزدەکەم لە پلەدا لەگەڵ تۆدابم، پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی نەدایەوە تا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(ومن یطع الله والرسول فاولائك مع الذين انعم الله هلیهم من النبیین والصدقین والشهداء والصالحین) پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردو ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە[1][2].

بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە هێناویانە کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی دوایی کەی دێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(چیت بۆ ئامادە کردووە؟) وتی: هیچ بەڵام خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێت، فەرمووی(تۆ لەگەڵ ئەودایت کە خۆشت دەوێت) ئەنەس وتی: بە هیچ شتێك دڵخۆش نەبووین هێندەی بەو قسەی پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆش بووین کە فەرمووی(انت مع من احب) ئەنەس دەڵێت: من پێغەمبەری خوا(ﷺ)و ئەبوبەکرو عومەرم خۆش دەوێن و هیوادارم بە خۆشەویستیم بۆیان لەگەڵیان بم.

لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا کەسێکی لادێ نشین هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕۆژی دوایی کەی دێت؟ فەرمووی(ویلك وما اعددت لها؟)واتە(هاوار بۆت چیت بۆ ئامادەکردووە؟) وتی: هیچم بۆ ئامادەنەکردووە جگە

---

لە فەرموودەکەی مەنسورو ئیبراهیمەوە غەریبەو فوزەیل بە تەنها هێناویەتی و عابدیش لەوەوە هێناویەتی.

[1] – حسن.

[2] – (هەیسەمی ج۷ ص۷ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا عەتای کوڕی سائیب هەیە کە شت تێکەڵ دەکات).

لەوەی خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێت، فەرمووی(انك مع من احببت)واتە(تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە خۆشت دەوێت)، وتی: ئێمە واین؟ فەرمووی: بەڵێ. ئێمەش ئەو ڕۆژە زۆر خۆشحاڵ بووین، ترمزی هێناویەتی کە وتی: هاوەڵانی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بینی بە شتێك دڵخۆش بوون کە پێشتر نەمدیبوو هێندە خۆشحاڵ بن، کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەس هەیە لەسەر کاری خێر کەسی خۆش دەوێت کە کار بە چاکە دەکات بەڵام خۆی نایکات، فەرمووی(المرء من احب).[1]

ئەبوداود لە ئەبوزەرەوە هێناویەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەس هەیە خەڵکانێکی خۆش دەوێت و ناتوانێت وەك ئەوان بکات، فەرمووی(انت یا اباژر مع من احببت)(ئەبوزەر تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە خۆشت دەوێت) وتی: دەی من خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێت، فەرمووی(فانك مع من احببت) ئەبوزەر دووبارەی کردەوەو پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) دووبارەی کردەوە.[2][3]

ئیبن عەساکیر لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تووشی نەبوونیەك بوو، عەلی(رضي الله عنه) ئەوەی بیستەوەو چوو بە دوای کارێکدا تا شتێکی پێ پەیدابکات تا بیبات بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، چوو بۆ باخێك کابرایەکی جوولەکەی بینی، داوای هەڵگۆزینی حەڤدە سەتڵ ئاوی لێکرد، بۆ هەر سەتڵێك خورمایەك، جوولەکەکە سەرپشکی کرد لەسەر خورماکەی، حەوت خورمای(عجوة)ی هەڵگرت و بردی بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من این لك هژا یا ابا الحسن؟)واتە(ئەی ئەبولحەسەن ئەمەت لە کوێ بوو؟) وتی: بیستم تووشی چی بوویت ئەی پێغەمبەری خوا، بۆیە چووم بۆ کارێك بگەڕێم تا شتێکت بۆ پەیدابکەم، فەرمووی(حملك علی هذا حب الله ورسوله ؟)واتە(خۆشەویستی خواو

[1] – صحيح.

[2] – صحيح.

[3] – لە(الترغيب والترهيب ج٤ ص٤٢٩، ٤٣١، ٤٣٣) دا هەیە.

پێغەمبەرەکەی ئەمەی پێکردیت؟) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(مامن عبد يحب الله ورسوله الا الفقر اسرع اليه من جرية السيل على وجهه، ومن احب الله ورسوله فليعد للبلاء تجفافا وانما يغني)[1][2].(هەر بەندەیەك خواو پێغەمبەری خوای خۆش بوێت ئەوا هەژاری لە خێرایی لافاو خێراتر بەرەو رووی دێت، وە هەرکەس خواو پێغەمبەری خوای خۆشدەوێت دەبێت بەرامبەر سەختیو گرفتەکان بەرگریەکی هەبێت، هێندە بەسە).

تەبەرانی لە کەعبی کوڕی عەجرەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و بینیم ڕەنگی گۆڕابوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایكو باوکمەوە بە قوربانت بم بۆچی ڕەنگت گۆڕاوە؟ فەرمووی(ما دخل جوفي مايدخل جوف ذات كبد منذ ثلاث)واتە(سێ ڕۆژە ئەوەی دەچێتە سکی هەر خاوەن جەرگێك نەچووەتە ناو سکی من) دەڵێت: چووم سەیرم کرد جوولەکەیەك ئاوی وشترێکی دەدات، منیش بەرامبەر بە خورمایەك بۆ هەر سەتڵە ئاوێك ئاوی وشترەکەم دا، خورماکەم کۆکردەوەو بردم بۆ پێغەمبەر(ﷺ)و ئەویش فەرمووی(ئەی کەعب لە کوێت بوو؟) منیش وتم چیم کردووە، فەرمووی(ئەی کەعب ئایا منت خۆش دەوێت؟) وتم: بەڵێ بە دایكو باوکمەوە بە قوربانت بم، فەرمووی(هەژاری لە ڕێکردەی لافاو بۆ کانەکانی خێراتە بۆ ئەو کەسەی منی خۆشدەوێت، دواتر سەختیەکت دێتە ڕێ دەی قەڵغانی بەرگری بۆ ئامادەبکە) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چاوی بۆ گێڕاو فەرمووی: کەعب چی کرد؟ وتیان: نەخۆشە، پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لای، وتم: کەعب موژدەت لێ بێت، دایکی وتی: بەهەشتت لێ پیرۆز بێت کەعب، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(من هذة المتالية على الله ؟)واتە(ئەم ژنە کییە لەسەر خوا سوێند دەخوات(سوێندی خوا دەدات)؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە دایکمە،

---

[1] – ضعيف.

[2] – ( لە کنز العمال ج٣ ص٣٢١ دا هاتووەو دەڵێت: لە سەنەدەکەدا حەنش هەیە).

فەرمووی (ما يدريك يا ام كعب؟ لعل كعبا قال ما لاينفعه و منع ما لايغنيه) (ئەی دایكی كەعب تۆ چووزانیت؟ كیٚ دەڵێت كەعب شتێكی نەوتووە كە سوودی بۆ نەبیٚو شتیٚ نەڵیٚو نەكا كە بێسوودە بۆی).[1] لە كنز العمال ج٣ ص٣٢٠ دا هاتووە بەڵام لە گێڕانەوەیەكدا وا هاتووە(لعل كعبا قال ما لايغنيه او منع وا لايعنيه).[2]

تەبەرانی لە حوصەینی كوڕی وەحووحی ئەنسارییەوە هێناویەتی تەلحەی كوڕی بەراء(ﷺ) كە گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی دەنووساند بە پێغەمبەرەوەو قاچەكانی ماچ دەكرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چیت پیٚ خۆشە پێم بڵیٚ با بیكەم لە فەرمانت لانادەم، پێغەمبەر(ﷺ) پێی سەرسام بوو كە ئەو هێشتا منداڵەو وادەكات، ئەو كات پێی فەرموو(بڕۆ باوكت بكوژە) ئەویش چوو تا بیكات، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی كردو پێی فەرموو(فاقبل فاني لم ابعث بقطيعة رحم)واتە(وەرە من نەنێردراوم بۆ پچڕاندنی سۆزو خزمایەتی) دوای ئەوە تەلحە نەخۆش كەوت، پێغەمبەر(ﷺ) چوو لە زستاندا بوو سەردانی كردو هەوا زۆر سارد بوون كە پێغەمبەر(ﷺ) چوویەوە بە كەس وكاری فەرموو(لاارى طلحة الا قد حدث فيه الموت فاذنوني به حتى اشهده و اصلي عليه و عجلوه)واتە(وا تەلحە دەبینم مەرگی هاتووە، دەی مۆڵەتیم بدەن تا ئامادەی سەر تەرمی بمو نوێژی لەسەر بكەمو خێرا بیبەن بۆ سەر قەبرستان) پێغەمبەر(ﷺ) نەگەیشتە لای بەنی سالمی كوڕی عەوف تا تەلحە مردو شەوی بەسەردا هات، تەلحە دەیوت: بمنێژنو بمگەیەنن بە پەروەردگارم، پێغەمبەر(ﷺ) بانگ مەكەن چونكە دەترسم جوولەكە بە هۆی هاتنی بۆ لای من زیانی پیٚ بگەیەنن، كە بەیانی هات هەواڵ درا بە

[1]- ( هەیسەمی ج١٠ ص٣١٤ دەڵێت: تەبەرانی لە المعجم الوسیگ بە سەنەدی جەیید هێناویەتی لە الترغيب والترهيب ج٥ ص١٥٣ دا لە مامۆستاكەیەوە ئەبولحەسەن دا دەڵێت، ئیبن عەساكیریش بەو جۆرە هێناویەتی.

[2] – حسن.

پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) هات و لەسەر گۆڕەکەی وەستا و خەڵکی لەگەڵیدا ڕیزیان بەست، پاشان دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی(اللهم الق طالحة تضحك اليه و يضحك اليك)واتە(خوایە وا بەخێرهاتنی تەلحە بکە بۆی پێبکەنیت و بۆت پێبکەنێت)[1,2].

تەبەرانی لە تەلحەی کوڕی مسکینەوە لە تەلحەی کوڕی بەرائەوە هێناویەتی هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: دەستت بکەرەوە با بەیعەتت پێبدەم، فەرمووی(ئەگەر تەنانەت فەرمانت پێ بکەم پەیوەندی لەگەڵ دایك و باوکت بپچڕێنیت؟) وتم: نا، دوایی گەڕامەوە بۆ لای و وتم: دەستت بکەرەوە تا بەیعەتت پێ بدەم، فەرمووی(لەسەر چی؟) وتم: لەسەر ئیسلام، فەرمووی(ئەگەر فەرمانت پێ بکەم پەیوەندیت لەگەڵ دایك و باوکتدا بپچڕیت؟) وتم: نا، بۆ جاری سێیەم وام پێوتەوە، دایکی لەو کەسانەبوو کە لە هەمووان چاکەی بۆی زیاتر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(یا طلحة انه ليس في ديننا قطيعة الرحم والكن احببت ان لايكون في دينك ريبة)واتە(ئەی تەلحە لە ئایینی ئێمەدا پچڕاندنی خزمایەتی نیە، بەڵام حەزمکرد هیچ گومانێ لە ئایین و موسڵمانبوونەکەتدا نەبێت) تەلحە موسڵمان بوو و دوایی نەخۆش کەوت، پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی کرد و سەیری کرد لە هۆش چووە، فەرمووی(وا دەبینم ئەمشەو تەلحە دەمرێت، ئەگەر بە هۆش هاتەوە بنێرن بە شوێنمدا) وتیان: بەڵێ، بە تەلحەیان وت چی فەرمووە، وتی: لەم کاتەدا مەنێرن بە شوێنیدا نەوەك گیانەوەرێك زیانی پێ بگەیەنێت یان شتێکی بێتەڕێ، بەڵام

---

[1] – ضعيف.

[2] – ( لە كنز العمال ج٧ ص٥٠ دا واهاتووە، بەغەوی و ئیبن ئەبی حەیسەمە و ئیبن ئەبی عاصم و ئیبن شاهین و ئیبن سکن هێناویانە، لە الاصابە ج٢ ص٢٢٧ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٩ ص٣٦٥ دەڵێت: ئەبوداود هەندێکی فەرموودەکەی هێناوە و لەسەری بێدەنگە و پشت بەخوا فەرموودەکە حەسەنە، تەواو).

ئەگەر مردم سەلامی منی پێ بگەیەنن و پێی بڵێن: داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی بەیانی کرد پرسیاری لەبارەی تەلحەوە کرد، وتیان: مردووەو پێش مەرگی وای وتووە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی(اللهم القه يضحك اليك و انت تضحك اليه)واتە(خوایە وا پێشوازی لێبکە بۆت پێبکەنێت و بەدەمیەوە پێبکەنێت)[1][2].

ئیبن عەساکیر لە زوهریەوە هێناویەتی دەڵێت: لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سکاڵا لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە کرا کە کەسێکی گاڵتەجاڕە فەرمووی:(وازی لێ بهێنن چونکە سکێکی هەیە کە خوا و پێغەمبەری خوای خۆشدەوێت)[3][4].

ئیبن ماجە و ئیبن مندە و ئەبونەعیم لە ئەدرەعەوە هێناویانە دەڵێت: شەوێك هاتم تا پاسەوانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بکەم، سەیرم کرد کەسێك بە دەنگی بەرز دەخوێنێتەوە(قورئان) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتە دەرەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کابرا دەنگەدەنگی ناوەتەوە، فەرمووی: ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی زیلبیجادەینە، لە مەدینە مرد و شۆردیان و تەرمەکەیان برد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:(ارفقوا به رفقوا الله به ! انه كان يحب الله و رسوله)واتە(نەرم لەگەڵی بجووڵێنەوە خوا لەگەڵی نەرم بێت، ئەو خوا و پێغەمبەری خوای خۆش دەویست) لە هەڵکەندنی گۆڕەکەیدا ئامادە بوو، فەرمووی( اوسعوا له اوسع الله عليه)واتە (فراوان گۆڕەکەی بۆ هەڵبکەنن خوا گۆڕەکەی بۆ فراوان بکات)، هەندێك لە هاوەڵان وتیان: ئەی

---

[1] – ضعيف.

[2] – (هەیسەمی ج٩ ص٣٦٥ دەڵێت: تەبەرانی بە مورسەلی و عەبدرەبیهی کوڕی صالح هێناویانە بەڵام عەبدرەبیهی ناناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو. ئیبن سکن بەو جۆرە هێناویەتی لە الاصابە ج٢ ص٢٢٧ دا واهاتووە).

[3] – ضعيف.

[4] – ( لە المنتخب ج٥ ص٢٢٣ دا واهاتووە).

پێغەمبەری خوا بەڕاستی بۆی دڵگران بوویت، فەرمووی(ئەو خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەویست)[1,2].

ئیبن سەعد ج٤ ص٢٥٤ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: لای ئیبن عومەر بووم قاچی سڕ بوو، وتم: ئەی ئەبو عەبدولڕەحمان پێت چیەتی؟ وتی: دەمارێك لێرەدا کۆ بووەتەوە(گرژ بووتەوە) وتم: خۆشەویست ترین کەس بانگ بکەم بۆ لات، وتم: ئەی محمد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات و گرژی یەکەی نەهێشت.

پێشتر باسی زەیدی کوڕی دسنەمان کرد کاتێك ئەبوسوفیان لە کاتی کوشتنیدا پێی وت: سوێندت دەدەم ئەی زەید ئایا حەز دەکەیت ئێستا موحەممەد لای ئێمە لە شوێنی تۆدا بێت و بدەین لە ملی و تۆ لەناو ژن و منداڵی خۆتدا بیت، وتی: سوێند بەخوا حەزناکەم ئێستا موحەممەد لێرە بێت و دڕکێك بچێت بە لەشیدا و ئازاری بدات و منیش لەناو ژن و منداڵمدا دانیشتبم، ئەبوسوفیان وتی: کەسم نەدیوە وەك هاوەڵانی موحەممەد خۆشەویستییان بۆ کەس هەبێت وەك ئەوەی ئەوان هێندە موحەممەدیان خۆش دەوێت، هەروەها کاتێك خوبەیب هاواریان لێ کرد و سوێندیان دا ئایا حەز دەکەیت موحەممەد لە شوێنی تۆدا بێت؟ وتی: نەبەخوا حەز ناکەم بەرامبەر بە ئازاردانی من دڕکێك بچێت بە پێیدا.

(پێشخستنی حەز و خۆشەویستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەسەر حەز و خۆشەویستی خۆیاندا)

عومەری کوڕی شەیبە و ئەبویەعلا و ئەبوبشیر لە(الفوائد) لە ئەنەسەوە سەبارەت بە چیرۆکی موسڵمان بوونی ئەبو قوحافە هێناویتی دەڵێت: کاتێك

---

[1] – ضعیف.

[2] – (المنتخب ج٥ ص١٢٤ دا واهاتووە. دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا موسای کوڕی عوبەیدەی ڕەبزی هەیە کە لاوازە).

دەستی درێژ کرد تا بەیعەتی پێبدات، ئەبوبەکر گریا، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(بۆچی دەگریت؟) وتی: ئەگەر لەجێی دەستی باوکم دەستی مامت بوایە و موسڵمان بوایە و خوا تۆی دڵخۆش بکردایە لام خۆشتر بوو لەمە.[1]

تەبەرانی و بەزار لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەبوبەکر لە ڕۆژی فەتحی مەککە ئەبوقوحافەی باوکی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەبوقوحافە پیرێکی کوێر بوو، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(بۆچی ئەم پیرەت لە ماڵ دانەنا تا ئێمە بچین بۆ لای؟) وتی: ویستم خوا پاداشتی لەسەر بداتەوە، بەخوا من موسڵمان بوونی ئەبوتالیبم لا خۆشتر بوو لە موسڵمان بوونی باوکم، ئەویش تا بەدیهاتنی حەز و ئاواتت ببینم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی ڕاست دەکەیت.[2][3]

ئیبن مەردەویە و حاکم لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێک لە ڕۆژی بەدردا دیلەکان گیران(لەناو دیلەکان کابرایەکی پشتیوانان گرتی، دەڵێت: پشتیوانان ویستیان بیکوژن، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەمەی بیستەوە و فەرمووی(من ئەمشەو لەبەر عەبباسی مامم نەخەوتوم، پشتیوانان دەڵێن دەیکوژین) عومەر وتی: بچم بۆ لایان؟ فەرمووی بەڵێ، عومەر چوو بۆ لای پشتیوانان و وتی: عەبباس بنێرن، وتیان: نەبەخوا نایینێرین، عومەر پێی وتن: ئەی ئەگەر ڕەزامەندی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ی لەسەر بێت، وتیان ئەگەر بۆ ئەوەیە ببیە، عومەریش بردی،کاتێک دەستی گرت وتی عەبباس موسڵمان ببە، بەخوا ئەگەر موسڵمان بیت لام خۆشەویستترە لەوەی خەتتاب موسڵمان ببێت، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی دەبینم پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) زۆر حەزی بە موسڵمان بوونتە.[4]

---

[1]– ( سەنەدەکەی صەحیحە، حاکم لەم ڕووەوە هێناو یەتی و دەڵێت: لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحە، لە الاصابە ج٤ ص ١١٦دا واهاتووە).

[2] – ضعیف.

[3] – (هەیسەمی ج٦ ص١٧٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موسای کوڕی عوبەیدە هەیە کە لاوازە).

[4] – (لە البدایە و النهایە ج٣ ص٢٩٨دا واهاتووە).

ئیبن عەساکیر لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) بە عەبباسی وت: موسڵمان ببە، بەخوا ئەگەر موسڵمان بیت پێم خۆشترە لەوەی خەتتاب موسڵمان بێت، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حەزی لێیە زوو موسڵمان بیت.[1]

ئیبن سەعد ج٤ ص٢٠ لە شەعبییەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبباس(رضي الله عنه) لە هەندێ شتتدا عومەری دەدواند، بە عومەری وت: ئەی ئەمیری بڕواداران ئەگەر مامی موسا(علیه السلام) بە موسڵمانی بێت بۆ لات چی بۆ دەکەیت؟ وتی: بەخوا چاکەی لەگەڵدا دەکەم، وتی: دەی من مامی موحەممەدی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) وتی: ئەبولفەزل ڕات چی یە؟ بەخوا باوکت لە باوکم لام خۆشەویست ترە، وتی: الله الله چونکە دەمزانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوی لە باوکم زیاتر خۆش دەویست، منیش خۆشەویستی و حەزی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) لە خۆم لا لە پێشترە.

ئیبن سەعد ج٤ ص١٤لە ئەبوجەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلی یەوە هێناویەتی: عەبباس(رضي الله عنه)هات بۆ لای عومەر(رضي الله عنه) و پێی وت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەحرەینی بۆ بڕیومەتەوە. وتی: کێ ئەوە دەزانێت؟ وتی: موغەیرەی کوڕی شەعبە، ئەویش هێنای و موغیرەیش شایەدی بۆدا، عومەر ئەوەی بۆ نەکرد وەك ئەوەی شایەتی یەکەی قبوڵ نەکات، عەبباس تووڕە بوو لە عومەر، عومەر وتی: عەبدوڵلا دەستی باوکت بگرە، سوفیان لە ڕێگەی جگە لە عەمرەوە هێناویەتی: عومەر وتی: بەخوا ئەی بەبولفەزل من بە موسڵمان وونی تۆ دڵخۆشتر بووم تا ئەوەی خەتتاب موسڵمان بێت، ئەمەش لەبەر ڕازی بوون و حەزی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).

ئیبن سەعد ج١ ص٢٥٧ لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە هێناویەتی دەڵێت: ئێمە لە کاتی سەرەمەرگی کەسێکدا لە پێشەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین، دەچووین بۆ لای و هەواڵمان پێ دەدا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەهات و داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکرد،

[1] – ( لە کنزالعمال ج٧ ص٦٩دا واهاتووە).

تا ئەوەی یەکلا بوویەوە لەگەڵ ئەوانەی هاودەمی بوون دەچوو، یان جاری وا هەبوو دادەنیشت تا بە خاك دەسپێردرا، جاری وا هەبوو ئەوە زۆری دەخایاند، کاتێك لەوە دەترساین ئەو درێژخایاندنە ئازاری بدات هەبوو دەیوت: سوێند بەخوا دەبوو پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بۆ کەس بانگ نەکردایە تا کابرا دەمرد، ئەوکات پێمان دەوت، بەوە ماندوو نەدەبوو، بەوە کاتیمان نەدەگرت، دەڵێت: ئەوەمان کرد، دەڵێت: کاتێك کەسەکە دەمرد دەچووین بە پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) دەوت، ئەویش دەهات و نوێژی لەسەر دەکرد و داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکرد، هەندێ جار دوای ئەوە دەچوو و هەندێ جار دەمایەوە تا بە خاك دەسپێردرا، ئێمەش لەو بارەدا بووین، دواتر وتیان: بەخوا با پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەهێنین،مردووەکە ببەین بۆ ماڵی خۆی و دواتر بنێرین بۆ لای تا نوێژی لەسەر بکات لە ماڵەکەی خۆیدا بۆ ئەو ئاسانترە، دەڵێت: ئەوەمان کرد، موحەممەدی کوڕی عومەر وتی: لەو کاتەوە ئەو شوێنە پێی وترا شوێنی تەرمەکان و تەرم دەبرایە ئەوێ، دواتر خەڵکیی بەو جۆرە تەرمەکانیان دەبرد و لەو شوێنەدا نوێژیان لەسەر دەکرد و تا ئەمڕۆش وایە،

حاکم لە ئەسلەمەوە هێناویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) چوو بۆ لای فاتیمەی کچی پێغەمبەر(رضي الله عنهما)، وتی: ئەی فاتیمە سوێند بەخوا کەسم نەدیوە هێندەی تۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆشەویست بێت، لە دوای باوکت کەس نیە هێندەی تۆ لام خۆشەویستربێت.[1]

[1] – ( کنز العمال ج٧ ص١١١).

## (بەرزو بەڕێز ڕاگرتنی پێغەمبەر(ﷺ))

ترمزی لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە لای هاوەڵانی کۆچەرو پشتیوانانی کە دانیشتبوون دەرچوو، لەنێویاندا ئەبوبەکرو عومەر(رضي الله عنهم) دانیشتبوون، کەس لە هاوەڵان چاویان لە ڕوودا بەرزنەکردەوە جگە لە ئەبوبەکر و عومەر کە سەیریان دەکردو ئەویش سەیری دەکردن، هەردووکیان زەردەخەنەیان بۆ دەنواندو ئەویش زەردەخەنەی بۆ دەنواندن[1].[2]

تەبەرانی و ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا لە ئوسامەی کوڕی شریکەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین وەك ئەوەی باڵندە بەسەر سەرمانەوە نیشتبێتەوە، کەسمان قسەی نەدەکرد تا ئەوەی هەندێ کەس هاتن بۆ لای و وتیان: خۆشەویستترین بەندەکان لای خوا کێن؟ فەرمووی(احسنهم خلقا)واتە(ئاکار جوانترینەکان)[3].[4]

چوار زانای فەرموودە – ترمزی بە صەحیحی داناوە – لە ئوسامەی کوڕی شریکەوە هێناویانە دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە دەوری بوون وەك ئەوەی باڵندە بەسەر سەریانەوە نیشتبێتەوە،[5] ئەبویەعلا بە صەحیحی لە بەرائی کوڕی عازبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دەمویست لەسەر شتێك پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) بکەم، بەڵام لەتاو شەرمو شانو شکۆیدا دوو ساڵ دوام خست[6].[1]

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( لە کتێبی(الشفا و) ی قاچی عیاچی ج٢ ص٣٣ دا واهاتووە).

[3] – صحیح.

[4] –(لە الترغیب والترهیب ج٤ ص١٨٧ دا واهاتووەو دەڵێت: گێڕەرەوەکانی تەبەری لە فەرموودەی صەحیحدا بە بەڵگە دێن).

[5] – (لە ترجمان السنە ج١ ص٣٦٧ دا واهاتووە)،

[6] – صحیح.

بەیهەقی لە زوهریەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسی جێ متمانەی ناو پشتیوانان بۆی گێڕامەوە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك دەستنوێژی دەگرت یان بەڵغەمی دەکرد هاوەڵان دەستیان دەخستەبەری و ڕەنگ و ڕوو و پێستیان پێ مەسح دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بۆچی وادەکەن؟) وتیان: تا پێی بەرەکەتداربین، فەرمووی(کێ حەزدەکات خواو پێغەمبەری خوا خۆشیان بوێت با لە قسەدا ڕاستگۆبێت و سپاردە بگەیەنێتەوە دەست خاوەنی و ئازاری دراوسێکەی نەدات)[2][3].

پێشتر لە فەرموودەکەی ڕێککەوتنی حودەیبیە لە بوخاری و جگە لەویشەوە لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە و مەڕوانەوە هێنامان: دواتر عروە(رضي الله عنه) چاوەکانی بڕیبووە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) سوێند بەخوا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەڵغەمی دەکرد دەکەوتە دەستی یەکێك لە هاوەڵان و دەیهێنا بەسەر دەست و دەموچاویدا، کە فەرمانی پێدەکردن کێبڕکێیان لەسەر دەکرد، کە دەستنوێژی دەگرت خەریکبوو لەسەر ئاودان بە دەستیەوە شەڕبکەن، کە قسەی دەکرد دەنگیان نزم دەکردەوە، لەتاو بە گەورانانیدا چاویان لە ڕوودا بەرزنەکردەوە، عروە گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی، وتی: هۆزەکەم بە خوا چووم بۆ لای پاشایان و قەیسەرو کیسراو نەجاشی، بەخوا هیچ پاشایەکم نەدیوە هاوەڵانی وەك هاوەڵانی موحەممەد گەورەکەیان بەرز ڕاگرن.

تەبەرانی لە عەبدولڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی ئەبی مرداسی سولەمیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ)بووین، داوای تەشتێ ئاوی کردو دەستی خستە ناو و دەستنوێژی گرت، ئێمەیش چووین وچی ئاو مابوویەوە خواردمانەوە، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی(چی وایکرد وابکەن؟) وتیمان: خۆشەویستی

---

[1] – ( لە ترجمان السنە ج١ ص٣٧٠ دا واهاتووە).

[2] – ضعیف.

[3] – (لە کنز العمال ج٨ ص٢٢٨ دا واهاتووە).

خواو پێغەمبەرەکەی، فەرمووی(ئەگەر حەزتان کرد خواو پێغەمبەرەکەی ئێوەیان خۆش بوێت ئەوا ئەگەر سپاردەتان درایە لا بیگێڕنەوەو ئەگەر قسەتان کرد ڕاست بڵێن‌و دراوسێیەتی چاك لەگەڵ دراوسێکەتان بکەن)[1].[2]

ئەبویەعلاو بەیهەقی لە الدلائل لە عامری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە هێناویانە کە باوکی پێی وتووە چووە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کرد کەڵەشاخی دەگرت، کە لێبوویەوە فەرمووی(ئەی عەبدوڵڵا ئەم خوێنە ببە لە شوێنێ کە کەس نەتبینێت بیڕێژە) ئەویش کە لە پێغەمبەر(ﷺ) دوورکەوتەوە خوێنەکەی خواردەوە، کە گەڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(عەبدوڵڵا چیت کرد بە خوێنە؟) وتم: حستمه شاوترین شوێن کە زانیم لە خەڵك دیارترنیە، فەرمووی(لعلك شربته ؟)واتە (وادیارە خواردووتەوە؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی(بۆچی خواردتەوە، هاواری ئەو خەڵکە بۆت‌و هاوارت بۆ ئەو خەڵکە) ئەبوموسا دەڵێت: ئەبوعاصم وتی: پێیان وابوو ئەو هێزەی هەیەتی لەو خوێنەوەیە.[3] لە گێڕانەوەیەکدا ئەبوسەلەمە وتی: پێیان وابوو ئەو هێزەی لە ئیبن زوبەیردا هەیە لە هێزی خوێنی پێغەمبەری خوادایە(ﷺ).[4]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٣ لە کیسانی مەولای عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: سەلمان(رخ) چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و عەبدوڵڵای کوڕی

---

[1] – ضعیف.

[2] – (هەیسەمی ج٨ ص٢٧١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عوبەیدی کوڕی واقیدی قەیسی هەیە کە لاوازە).

[3] – ( لە الاصابە ج٢ ص٣١٠ دا واهاتووە، حاکم ص٥٥٤و تەبەریش بەو جۆرە هێناویانە، هەیسەمی ج٨ ص٢٧٠ دەڵێت: تەبەرانی و بەزار بە کورتی هێناویانە، کەسەکانی سەنەدی بەزار صەحین جگە لە هونەیدی کوڕی قاسم، تەواو. ئیبن عەساکیریش بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٥٧ دا لەگەڵ باسی قسەکەی ئەبوعاصم هێناویەتی).

[4] – حسن.

زوبەیریش جامێکی پێبوو ئەوەی تێبدابوو دەیخواردەوە، عەبدوڵڵا چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش پێی فەرموو(لێبوویتەوە؟) وتی: بەڵێ، سەلمان وتی: ئەوە چی بوو ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی(اعطیتە غسالة محاجمي یهریق ما فیها)واتە(نۆرەی خوێنی کەڵەشاخم بوو پێمدا بیبات ئەوەی تیایەتی بیڕێژێت) سەلمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە خواردیەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خواردتەوە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(بۆ چی؟) وتی: حەزمکرد خوێنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بچێتە ناو سکمەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی خستە سەر سەری ئیبن زوبەیرو فەرمووی(ویل لك من الناس ویل للناس منك! لا تمس النار للا قسم الیمین)[1].[2](خراپەیەك لە تۆوە بۆ خەڵك و لە خەڵکەوە بۆ تۆ دەبێت، دۆزەخ بەشی لێت نابێ جگە لە بەشی سوێند).

تەبەرانی لە سەفینەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کەڵەشاخی گرت و فەرمووی(ئەو خوێنە بگرەو فڕێیبدە شوێنێ دووربێت لە ئاژەڵ و باڵندەو خەڵك) منیش دوورکەوتمەوەو خواردمەوە، پاشان ئەوەم بۆ باسکردو پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) پێکەنی[3][4].

تەبەرانی لە ئەبوسەعیدی خودریەوە هێناویەتی مالیکی کوڕی سنان کە باوکیەتی لە ڕۆژی ئوحوددا خوێنەکەی ڕووخساری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی لێسیەوەو قووتیدا، پێی وترا خوێن دەخۆیتەوە؟ وتی: بەڵێ خوێنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەخۆمەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خوێنم تێکەڵ بە خوێنی بوو دۆزەخی پێناگات)[5][6].

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( ئیبن عەساکیر لە سەلمانەوە بەو جۆرەو بە کورتی و بە سەنەدی جێ متمانەوە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٥٦ یشدا واهاتووە).

[3] – ضعیف.

[4] – (هەیسەمی ج٨ ص٢٧٠ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکەی تەبەرانی جێ متمانەن).

[5] – ضعیف.

[6] – (هەیسەمی ج٨ ص٢٧٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا کەسی وا نابینم لەسەر لاوازبوونی یەکدەنگی هەبێت، تەواو).

تەبەرانی لە حەکیمی کچی ئومەییە لە دایکیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) قاچاخێکی هەبوو کە میزی تێدادەکردو دەیخستە ژێر جێگەکەی، هەستا تا بیدۆزێتەوە، سەیری کرد دیارنیە، فەرمووی(این القدح؟) وتیان: سورەی خزمەتکاری ئوم سەلەمە کە لە خاکی حەبەشەوە لەگەڵی هات خواردیەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لقد احتظرت من النار بحظار)واتە(بە بەربەستێك خۆت لە دۆزەخ دوورگرت)[1][2].

تەبەرانی لە ئەبوئەیوبەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چوو و ئەبوئەیوب دابەزی، پێغەمبەر(ﷺ) لە خوارەوەی دابەزی و ئەبوئەیوبیش لە قاتی سەرەوە بوو، کە شەو هات ئەبوئەیوب بیری کردەوە لە سەرووی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بێ کەوتۆتە نێوانی سروش و پێغەمبەر(ﷺ)، ئەبوئەیوب نەدەخەوت و دەترسا تۆزی بەسەردا بباریّ و بجوولێ و پێغەمبەر(ﷺ) ئازاربدات، کە ڕۆژبوویەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمشەو من و ئوم ئەیوبیش چاومان بەیەکدا نەداوە، فەرمووی(بۆچی ئەی ئەبووئەیوب؟) وتی: بیرم کردەوە من لە سەرەوەبم ئەگەر بجووڵێم تۆز بەسەرتدا بکەوێت و جووڵەجووڵم ئازارت بدات و من لە نێوان تۆ و سروشتدا بم، فەرمووی(وامەکە ئەی ئەبوئەیوب ئایا چەند وشەیەکت فێربکەم ئەگەر بەیانیان دە جارو ئەوان دە جار بیانڵێیت بەرامبەریان دە چاکەت پێبدرێت و دە خراپەت بسڕێتەوەو بەوە دە پلە بەرزبیتەوەو لە ڕۆژی دواییدا وەك ئاستی دە ئازادکەر وابن، بڵێ: لا الە الا الله لە الملك والە الحمد لاشريك لە)[3].

---

[1] – ضعيف.

[2]– (هەیسەمی ج٨ ص٢٧١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەی کوڕی حەنبەل و حەکیم کە ئەوانیش جیّ متمانەن.

[3] – (لە کنز العمال ج١ ص٢٩٤ دا واهاتووە).

تەبەرانی لە ئەبوئەیوبەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەلام دابەزی وت: بە دایكو باوكمەوە بە قوربانت بم حەزناكەم لە سەرو تۆوە دابنیشمو تۆ لە قاتی خوارەوە بیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ان ارفق بنا ان تكون في السفل لما يغشانا من الناس)(لەخوارەوەبین ئاسانترە بۆمان لەبەر هاتنی زۆری خەڵك) بینیم گۆزەیەك شكاو ئاوەكەی ڕژا، منیش لەگەڵ ئوم ئەیوب هەستاین جلێكمان هەبوو لە جێی لێفە ئاوەكەمان پێ هەڵدەمژیەوە نەوەك بتكێتە سەر پێغەمبەر(ﷺ)و ئازاری بدات، خواردنێكمان ئامادە دەكرد ئەوەی لێی دەمایەوە و بۆی دەگێڕاینەوە دەگەڕاین بە شوێن پەنجەكانیداو لێمان دەخوارد بەو هیوایەی بەرەكەتمان دەستكەوێت، شەوێك خواردنەوەكەی بۆ گێڕاینەوە، چونكە ئێمە سیر یان پیازمان تێكردبوو، بۆیە شوێن پەنجەكانیمان لێ

بەدی نەكرد، بۆم باسكرد چیمان كردبوو و چیمان لە گێڕانەوەكەی خواردنەكەیدا بینی، ئەویش فەرمووی(من لەو خواردنە بۆنی ئەو درەختەم بەدیكرد، منیش كەسێكم قسەو موناجاتم هەیە، بۆیە حەزم نەكرد بۆنی ئەو درەختەم لێ بەدیبكرێت بەڵام ئێوە بیخۆن).[1]

ئەبونەعیمو ئیبن عەساكیر وەك دەقەكەی تەبەرانی هێناویانە، لە گێڕانەوەكەیاندا هاتووە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ناكرێت من لە سەرووی ژوورەكەی تۆوەبمو بەسەر تۆدا تێپەڕبم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیكرد شمەكەكانی گواسترانەوە، شمەكەكانیشی كەم بوون.[2][3]

---

[1]- (لە كنز العمال ج٨ ص٥٠ دا واهاتووە. حاكم ج٣ ص٤٦١ هێناویەتی بەڵام ئەمەی نەهێناوە: خواردنمان ئامادە دەكرد.... تا كۆتایی، دەڵێت: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیانهێناوەو زەهەبیش لەسەری كۆكە).

[2]- صحيح.

[3]- ( لە كنز العمال ج٤ ص٥٠ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن ئەبی عاصم لە ئەبوئەیوبەوە هێناویانە، لە الاصابە ج١ ص٤٠٥ دا واهاتووە).

ئیبن سەعد ج٤ ص١٢ ئەحمەدو ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: عەبباس لەسەر ڕێی عومەردا چۆراوگەیەکی هەبوو، عومەر لە ڕۆژی هەینیدا لەوێ جلەکانی دەشۆرد، دوو باڵندە سەربڕان بۆ عەبباس، کاتێك گەیشتنە لای جۆگەکە لەکە خوێنی دوو باڵندەکەی کردە ناو جۆگەکە، خوێنەکە گەیشتە لای عومەر، ئەویش فەرمانی کرد لاببرێت، دواتر گەڕایەوە جلەکەی لابردو جلی دیکەی پۆشی، پاشان هاتو نوێژی کرد بۆ خەڵك، عەبباس هات بۆ لای وتی: سوێند بەخوا ئەوە ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داینا، عومەر بە عەبباسی وت: بڕیارمدا بچیتە سەر پشتم و بیخەیتەوە ئەو شوێنەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داینا، عەبباس وایکرد.

ئیبن سەعد ج٤ ص١٣ لە یەعقوبی کوڕی زەیدەوە بەو جۆرە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیادکردووە، عومەر عەبباسی خستە سەرشانی و دوو قاچەکانی خستە سەر شانی عومەرو دواتر چۆڕاوگەکەی لە شوێنی خۆیدا دانایەوە، (هەیسەمی لە المجمع ج٤ ص٢٠٦ لە عوبەدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هێناویەتی، ئەحمەد هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن جگە لەوەی هیشامی کوڕی سەعد لە عوبەیدوڵڵای نەبیستووە).

ئیبن سەعد ج١ ص٢٥٤ لە ئیبراهیم لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدولقادریەوە هێناویەتی سەیری ئیبن عومەری کرد دەستی لەسەر شوێنی دانیشتنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دادەنا لە مینبەرەکەیدا، پاشان دەستی هێنا بەسەر چاویدا، لە یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قسیتیشەوە هێناویەتی وتی: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) دەبینی کە مزگەوت چۆڵ دەبوو دەستیاندەگرت بەلای مینبەرەکەی پاش گۆڕەکەیەوە - بە دەستی ڕاستیان - ئینجا ڕوویاندەکردە قیبلەو نزایان دەکرد.

# ((ماچکردنی جەستەی پێغەمبەر(ﷺ))

حاکم ج۳ ص۲۸۸ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلا لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئوسەیدی کوڕی حوضەیر(رضي الله عنه) پیاوێکی صاڵحی خەندەکاری گاڵتەچی بوو، ڕۆژێك لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو و قسەی بۆ خەڵك دەکردو دەیخستنە پێکەنین، پێغەمبەر(ﷺ) دای بەناو ورگیداو ئەویش وتی: ئازارت دام، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(تۆڵە بکەرەوە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ کراست لەبەرەو منیش کراسم لەبەرنەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) کراسەکەی هەڵکرد، ئەویش باوەشی پێداکردو کەلەکەی ماچکرد، وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمەم ویست.[1]

ئیبن ئیسحاق لە حیبانی کوڕی واسعەوە لە چەند شێخێکی هۆزەکەیەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕیزەکانی هاوەڵانی لە ڕۆژی بەدردا ڕێکخست و گۆچانێکی بەدەستەوە بوو کە خەڵکەکەی پێ ڕێکدەکرد، سەودای کوڕی غزیەی هاوپەیمانی بەنی عەدی نەجار لە ڕیزەکەدا پێشکەوتبوو دای بەلایدا، پێغەمبەر(ﷺ) بە دارەکە دای لە سکی و فەرمووی(ڕێکبەرەوە ئەی سواد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئازارت دام لە کاتێکدا خوا تۆی بە حەق و دادپەروەری نارد دەی ماف خۆم بدەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لەشی خۆی نیشانداو فەرمووی(تۆڵەت بکەرەوە) ئەویش باوەشی پیاکردو سکی ماچکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بۆچی واتکرد ئەی سواد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەت بینی ویستم کۆتا بینینم لەگەڵت وابێت پێستم بەر پێستت بکەوێت، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای خێری بۆکرد.[2]

---

[1]- (حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبیش لەسەری کۆکەو دەڵێت: صەحیحە، ئیبن عەساکیر لە ئەبویەعلاوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج۷ ص۳۰۱ دا هاتووە، تەبەرانی لە ئوسەیدی کوڕی حوضە یرەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٤ ص٤۳ دا هاتووە).

[2] – لە البدایە والنهایە ج۳ ص۲۷۱ دا واهاتووە،ئیبن سەعد ج۳ ص۷۲ لە حەسەنەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) سەوادی کوڕی عەمری دی، بەو جۆرە هێناویەتی، پێغەمبەر(ﷺ)

عەبدولڕەزاقیش هێناویەتی، لە كنز العمال ج٧ ص٣٠٢ یشدا لە حەسەنەوە هێناویەتی یەكێك لە پشتیوانان پێی دەوترا سوادەی كوڕی عەمر بۆنێكی لە خۆی دەدا وەك عورجون وابوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كە دەیبینی لێی ڕادەما، ڕۆژێك بەو جۆرە هات بۆ لای، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دارێكی دەستی لێداو ئازاری پێگەیاند، سوادە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆڵەم دەوێت، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم)بە دارەكەی دایە دەست، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوو كراسی لەبەربوو هەردووكیانی لابرد، خەڵكی سەركۆنەیان كرد، كە كراسەكانی لابرد تا گەیشتە شوێنی لێدانەكە دارەكەی فڕێداو كەوتە ماچكردنی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وازی لێدێنم بۆت تا ڕۆژێ دواییدا سكاڵام بۆ بكەیت.[1] پێشتر باسی خۆشەویستی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) لەناو هاوەڵاندا كرد كە لە حوصەینی كوڕی وەحوەحەوە هێناویەتی تەلحەی كوڕی بەراء(رضي الله عنه) كاتێك گەیشت بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆی دەلكاند پێیەوەو قاچەكانی ماچدەكرد، دواتریش باسی ئەوە دەكەین ئەبوبەكر لە دوای مردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕوومەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ماچدەكات.[2]

---

فەرمووی(خگ خگ ورس ورس) پاشان بە سیواك دای لە سكی، ئازار بەر سكی كەوت، بە هەمان شێوە فەرموودەكەی هێناوە. ضعیف.

[1] – ( بەغەوی هێناویەتی، لە الاصابە ج٢ ص٩٦ دا واهاتووە).

[2] – ضعیف.

# (گریانی هاوەڵان(رضي الله عنه) لە تاڤی بانگەشەی کوژرانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەوڵدانیان بۆ پاراستنی)

تەبەرانی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا خەڵکی مەدینە شڵەژان و وتیان: موحەممەد کوژرا تا ئەوەی لە دەوروبەری مەدینە ئەو دەنگۆیە بڵاوبوویەوە، یەکێ لە ژنانی پشتیوانان چوویە دەرێ و ڕوویکردە باوکی و کوڕەکەی و مێردەکەی و براکەی نازانم یەکەمجار کامیانی بینی، دای بەلای یەکێکیاندا وتی: ئەوە کێیە؟ وتیان: باوکت برات مێردت کوڕت، ژنەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا؟ وتیان: لەبەردەمتدایە تا چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و لایەکی جلەکەی گرت و وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانتبم ئەی پێغەمبەری خوا گوێم لە هیچ نیە مادەم لە فەوتان پارێزراویت[1,2].

بەزار لە زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژی ئوحود هەموان لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە مەدینە دەرچوون و کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە مەدینە نەمان تا کوژراوان زیاد بوون، کەسێك هاواری کرد موحەممەد کوژرا، هەندێ لە ژنان گریان، ژنێك وتی: مەگرین تا بزانم چی بووە، بە تەنها دەرچوو و تەنها بیری لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو و پرسیاری لەوبارەیەوە دەکرد[3].

ئیبن ئیسحاق لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دای بە لای ژنێکی بەنی دینناردا کە مێردەکەی و براکەی و باوکی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ئوحوددا بەشداربوون و کوژرابوون، کاتێك وتیان: ئەو

---

[1] – ضعیف.

[2] – (هەیسەمی ج٦ ص١١٥ دەڵێت: تەبەرانی لە موحەممەدی کوڕی شوعەیبی مامۆستایەوە هێناویەتی و منیش نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو).

[3] – ( هەیسەمی ج٦ ص١١٥ هێناویەتی دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەمۆی کوڕی صەفوان هەیە کە نادیارە، تەواو).

کەسانەت مردوون وتی: ئەی پێغەمبەری خوا؟ وتیان: ئەی ئوم فلان پێغەمبەری خوا سوپاس بۆ خوا باشەو بە ویستی تۆیە. ژنەکە وتی: دەی با بیبینم، ئاماژەی بۆ کرا، کە پێغەمبەری خوای بینی وتی: هەموو چەرمەسەری و ناڕەحەتیەك دوای تۆ ئاسانە[1].[2]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی ئەبوتەلحە لە ڕۆژی ئوحوددا لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) پارێزگاری پێغەمبەری دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) لە دواوە تیری پێدەدا، ئەبوتەلحە تیرهاوێژێکی چاك بوو، کاتێك تیری دەوەشاند پێغەمبەر(ﷺ) سەیری دەکرد تا بزانێت تیرەکەی دەکەوێتە کوێ، ئەبوتەلحەش سەری بەرزدەکردەوەو دەیوت: بە دایكو باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا بەو جۆرە تیرت بەرناکەوێت، من لەناوچم نەوەك تۆ، ئەبوتەلحە لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) خۆی دەنواندو دەیوت من زۆر بەهێزم ئەی پێغەمبەری خوا، دەی ئیشت چیە بمنێرەو پێمبکە.[3]

تەبەرانی لە قەتادە لە نوعمانەوە هێناویەتی دەڵێت: کەوانێك خەڵاتی پێغەمبەر(ﷺ) کراو پێغەمبەریش(ﷺ) لە ڕۆژی ئوحوددا دای بە من، منیش لە خزمەتیدا تیرم پێ دەهاویشت تا لەکارکەوتو منیش بەردەوام خۆم خیستبوویە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) تا تیرەکان بەر من بکەون، هەرکات تیرێك بەرەو پێغەمبەر(ﷺ) دەهات سەرم بۆ دەبرد تا نەیەڵم بەر پێغەمبەر(ﷺ) بکەوێت بەبێ ئەوەی تیرم هەبێت بۆ وەشاندن، ئینجا فەرموودەکە دێنێت وەك چۆن لە باسی دلێری قەتادەدا هاتووە.

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( لە البدایە والنهایە ج٤ ص٤٧ دا واهاتووە).

[3] – ( لە البدایە والنهایە ج٤ ص٢٧ دا واهاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص٦٥ لە ئەنەسەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

## (گریانی هاوەڵان بە باسی جودابوونەوەی پێغەمبەر(ﷺ))

ئیبن ئەبی شەیبە لە سەعیدەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك ئێمە لە مزگەوتدا بووین و پێغەمبەر(ﷺ) بە شتێك سەری بەستبوو لەتاو ئەو نەخۆشیەی کە تیایدا کۆچی دوایی کرد هات بۆ لامان و لەلامانەوە بەرەو مینبەرەکە چوو تا سەری وەستا، ئێمەش چووین بە دوایدا، فەرمووی(والذي نفسي بيده اني لقائم على الحوض الساعة)(ان عبدا عرضت عليه الدنيا و زينتها فاختار الاخرة)واتە(سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە من ماوەیەکی دی لەسەر حەوزم، بەندەیەك لە نێوان دنیا و دواڕۆژدا سەرپشك کرا ئەویش ڕۆژی دوایی هەڵبژارد) تەنها ئەبوبەکر تێگەیشت و چاوەکانی فرمێسکیان ڕشت و گریا و وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، بەڵکو بە باوك و دایك و گیان و سامانمانەوە بە قوربانت بین، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی و ئیدی نەچوویەوە سەری[1 2].

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك(اذا جاء نصر الله والفتح) دابەزی پێغەمبەر(ﷺ) فاتیمەی بانگکرد و فەرمووی(انه نعيت الى نفسي)(هەواڵی مەرگی خۆم دەدەم) فاتیمە گریا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(مەگری چونکە تۆ لەناو کەسانمدا یەکەم کەسی پێمدەگەیتەوە) فاتیمەش پێکەنی، یەکێ لە ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فاتیمەی بینی و وتی: تۆم بینی گریایت و پێکەنیت، فاتیمەش وتی: لە یەکەم قسەدا گریام پێی وتم کە بەجێمان دێڵێ، لە قسەی دوەمیدا فەرمووی(مەگری تۆ یەکەم کەسی لەناو کەسانمدا پێمدەگەیتەوە) منیش پێکەنیم[3 1].

---

[1] - ضعيف.

[2] - (لە کنز العمال ج٤ ص٥٨ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٤ ص٢٨ لە ئەبوسەعیدەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

[3] - حسن.

ئـیبن سـەعد ج٢ ص٣٩ لـە عائیـشەوە(رضـي الله عنهـا) هێناویـەتی پێغەمبەر(ﷺ) فاتیمەی کچی بانگکرد لەو نەخۆشیەیدا کە تێیدا کۆچی دوایی کرد، چپەیەکی بۆ فاتیمە کردو ئەویش گریا، دواتر بانگی کردەوەو چپەیەکی بۆ کردو فاتیمە پێکەنی، عائیشە دەڵێت: پرسیارم کرد لە فاتیمە لەو بارەیەوە، ئەویش وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێدام لەو نەخۆشیەیدا دەمرێت، منیش گریام، دواتر هەواڵی پێدام من یەکەم کەسك پێی دەگەمەوە منیش پێکەنیم، (بە سەنەدێکی دیکە بە دوورو درێژتر لێیەوە هێناویەتی)، ئوم سەلەمەش بەو جۆرە هێناویەتی، لە گێڕانەوەکەی ئوم سەلەمەدا هاتووە پسیارم لە فاتیمە کرد لەسەر گریان و پێکەنینی، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) پێ وتم دەمرێت و دواتر پێی وتم گەورەی ژنانی بەهەشتم لە دوای مریەمی کچی عیمران(علیها السلام) بۆیە پێکەنیم.

ئـیبن سـەعد ج٢ ص٣١٢ لـە عەلائـەوە هێناویـەتی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە سەرەمەرگیدا بوو فاتیمە گریا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(کچی شیرینم مەگری، ئەگەر مردم بڵێ انا لله وانا الیه راجعون چونکە هەموو کەسێك لە هەموو چەرمەسەریەك قەرەبوو و ڕزگاری دەبێت) فاتیمە وتی: بۆ تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرمووی(و مني)واتە (لە منیش).

ئەحمەد لە موعازی کوڕی جەبەلەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ یەمەن پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی دەرچوو و وەسیەتی بۆ دەکرد و موعاز سواربوو و پێغەمبەریش(ﷺ) بە پیادە لەگەڵی دەچوو، کاتێك لێبوویەوە فەرمووی(ئەی موعاز پێدەچێت پاش ئەمساڵ پێم نەگەیتەوەو لەوانەیە بدەیت بەپاڵ ئەم مزگەوتەم و گۆڕەکەمدا) موعازیش بەسەختی گریا لەتاو جودابوونەوەی لە پێغەمبەر(ﷺ)، پاشان ڕوویکردە مەدینەو فەرمووی(ان اولی الناس بي المتقون

[١]– ( هەیسەمی ج٩ ص٢٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە هیلالی کوڕی خەباب کە جێ متمانەشە بەڵام لاوازیەکی تێدایە، تەواو).

من كانوا و حيث كانوا)واتە (نزیكترین كەسان لە من لە خواترسانن هەركێ هەن و لە هەركوێ هەن)( هەیسەمی ج٩ ص٢٢ دەڵێت: ئەحمەد بە دوو سەنەد هێناویەتی و لە بارەی یەكێكیانەوە دەڵێت لە عاصمی كوڕی حەمیدەوە كە موعاز وتوویەتی و تیایدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(مەگری ئەی موعاز گریان لە شەیتانەوەیە).[1]

## (گریانی هاوەڵان لە ترسی مەرگی پێغەمبەر(ﷺ))

بەزار لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: هەندێ هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وترا وا ژنان و پیاوانی پشتیوانان لە مزگەوتدا دەگرین، فەرمووی بۆچی؟ وتیان: دەترسن تۆ بمریت، ئەویش بە سەختی بە بەرگێك كە دابووی بەسەر شانەكانیداو سەری بەستبوو چوویە سەر مینبەرو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری كرد، پاشان فەرمووی:

(پاشان خەڵكی زیاد دەكەن و پشتیوانان كەم دەكەن تائەوەی وەك خواردنی ناو چێشتیان لێ دێت، دەی هەركەس كارێكیانی گرتەدەست با چاكەیان قبووڵ بكات و چاوپۆشی لە خراپەكاریان بكات).[2]

---

[1]- كەسەكانی دوو سەنەدەكە صەحیحن جگە لە راشیدی كوڕی سەعدو عاصی كوڕی حەمید كە هەردوكیان جێ متمانەن).

[2]- (هەیسەمی لە المجمع ج١٠ ص٣٧ دەڵێت: بەزار لە ئیبن كەرامە لە ئیبن موساوە هێناویەتی ئێستا ناوی ئەو دوانە نازانم، كەسەكانی دیكەی صەحیحن، ئەم فەرموودە لە صەحیحدا هەیە جگە لە سەرەتاكەی تائەوەی دەڵێت دەرچوو و دانیشت – تەواو–، لە پەراوێزەكەیدا ئیبن حەجەر دەڵێت: ئیبن كەرامە موحەممەدی كوڕی عوسمانی كوڕی كەرامەیە، ئیبن موسا عەبدوڵڵایە، هەردووكیان كەسی صەحیحن، تەواو. ئیبن سەعد ج٢ ص٢٥٢ لە ئیبن عەبباسەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

ئەحمەد لە ئوم فەزڵی کچی حارسەوە هێناویەتی دەڵێت: لە کاتی نەخۆشی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) چووم بۆ لای، دەگریام و ئەویش سەری بەرزکردەوەو فەرمووی(بۆچی دەگریت؟) وتم: دەترسم تۆ شتێکت بەسەربێت نازانین دوای تۆ ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ ئەو خەڵکە چۆن بین؟ فەرمووی(انتم المستضعفون بعدي)(ئێوە دوای من لاوازو بێنیازن).[1]

## (ماڵئاوایی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم))

بەزار لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئازیزو خۆشەویست و پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) – بە باوکمەوە بە قوربانی بم – شەش ڕۆژ پێش مردنی(هەواڵی مەرگی خۆی پێدااین) قسەی ماڵئاوایی بۆ کردین، کاتێک وادەی جیابوونەوە نزیك بوویەوە لە ماڵی عائیشەی دایکمان کۆبووینەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) سەیری کردین و چاوەکانی فرمێسکاوی بوون و دواتر فەرمووی(مرحبابكم، و حياكم الله، و حفظكم الله، و نصركم الله، هداكم الله، سلمكم الله، قلبكم الله اوصيكم بتقوى الله، و اوصى الله بكم و استخلفه عليكم، اني لكم نذير مبين ان لا تعلوا على الله في عباده و بلاده فان الله قال لي و لكم(تلك الدار الاخرة نجعلها للذين لايريدون علوا في الارض ولافسادا والعاقبة للمتقين) وقال(اليس في جهنم مثوى للمتكبرين)واتە(مەرحەبا لە ئێوە، خوا ئابڕومەندتان بکات، خوا بتانپارێزێت، خوا پەناتان بدات و سەرتان بخات، خوا بەرزتان ڕاگرێ، خوا ڕێنموونیتان بکات، خوا ڕۆزیتان بدات، خوا سەرکەوتووتان بکات، خوا سەلامەتتان بکات، جێی ڕەزامەندی لای خوا بن، وەسیەتتان بۆ دەکەم لە خواترس بن و وەسیەتم لای خوا بۆ ئێوەیەو دەتاندەمە دەستی، من بە ئاشکرا ڕاتان دەچڵەکێنم بەرامبەر بەندەو خاك و وڵاتی

---

[1]– (هەیسەمی ج٩ ص٣٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەزیدی کوڕی ئەبوزیاد هەیە کە کۆمەڵێك بە لاوازی دەزانن).

خوا سەركێشى نەكەن چونكە خواى گەورە بە منو ئێوەش دەفەرموێت((تلك الدار الاخرة نجعلها للذين لايريدون علوا في الارض ولافسادا والعاقبة للمتقين) وقال(اليس في جهنم مثوى للمتكبيرين)(اليس في جهنم مثوى للمتكبيرين) پاشان فەرمووى(قد دنا الاجل والمنقلب الى الله و الى سدرة المنتهى والى جنة الماوى والكاس الاوفى والرفيق الاعلى)(بە ڕاستى نزيكبووەتەوە سەرەمەرگو گەڕانەوە بەرەولاى خواو بەرەو سيدرەتولمونتەهاو بەرەو بەهەشتى نەبڕاوەو بەرەو پەرداخى پڕو تەواو و بەرەو ڕەفيقى ئەعلا) وابزانم وتى: وتمان ئەى پێغەمبەرى خوا ئەى كێ بتشوات؟ فەرمووى(پياوانى خزمانم نزيك تا نزيك(بەپێى نزيكى)) وتمان لە چيدا كفنت بكەين؟ فەرمووى(ئەگەر ويستتان لەم جلەمدا يان لەبەرگێكى يەمەنى يان بەرگى سپى موزەريدا) وتمان ئەى كێ نوێژت لەسەر بكات؟ فەرمووى(پەلەمەكەن خواى گەورە لێتان خۆش بێتو لەسەر پێغەمبەرەكەتان پاداشتى خێرتان بداتەوە، كە شۆردمتانو خستمتانە سەرجێگەكەم لەم ماڵەم لەسەر كەنارو لايەكى گۆڕەكەم ماوەيەك لەلام دەرچنە دەرێ، چونكە يەكەم كەس كە نوێژم لەسەردەكات خۆشى ويستو هاوكۆڕم جبريلە، پاشان ميكائيل، پاشان ئيسرافيل، دواتر فريشتەى مەرگ لەگەڵ سەربازەكانيدا، بە گريانو هاوارو لێدانو شيوەن ئازارم مەدەن، با كەسانى(پياوانى) نزيكانى خزمم سەرەتا نوێژم لەسەر بكەن، دواتر ئێوە، سەلامى من بگەيەنن بە خۆتان، ئەو برايانەشتان كە ئامادەنەبوون سەلامم بگەيەنن پێيان، ئەوەش لە دواى من لەگەڵتان دێتە ناو ئايينتانەوە، من بە شايەتتان دەگرم سەلامى لێدەكەم، سەلام دەكەم لەو و هەركەس لەمڕۆوە تا ڕۆژى دوايى لەسەر ئەوم ئايينەم شوێنم دەكەوێت) وتمان: ئەى پێغەمبەرى خوا ئەى كێ لە ئێمە بتخاتە گۆڕەكەتەوە؟ فەرمووى(كەسانى خزمانى نزيكم لەگەڵ فريشتەگەلێكى زۆردا كە ئێوە دەبيننو ئێوە ئەوان نابينن)[1].

---

[1] - حسن.

# ((کۆچی دوایی پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم)))

ئه‌حمه‌د له یه‌زیدی کوڕی بابنووسه‌وه هێناویه‌تی ده‌ڵێت: من و هاوده‌مێکم چووین بۆ لای عائیشه مۆڵه‌تمان لێوه‌رگرت ئه‌ویش جێگه‌كه‌ی بۆ ڕاخستین و په‌رده‌ی به‌سه‌ر خۆیدا دا، هاوڕێكه‌م وتی: ئه‌ی دایكی باوه‌ڕداران سه‌باره‌ت به عیراك چی ده‌ڵێیت؟ وتی: عیراك چیه؟ منیش دام به‌سه‌ر شانی هاوڕێكه‌مدا، دایكمان عائیشه وتی: به‌سه ئازای براكه‌تت دا، پاشان وتی: عیراك چیه؟ حه‌یز؟ ئه‌وه‌ی خوا له‌باره‌یه‌وه فه‌رموویه‌تی ئه‌وه بڵێن، دواتر وتی: كاتێ له حه‌یزدا بووم پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) له باوه‌شی ده‌گرتم و سه‌ری ده‌خسته سه‌ر سه‌رم و نێوانی من و ئه‌و جلێك هه‌بوو و منیش حه‌یزدار بووم، پاشان وتی: پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) كه ده‌یدا به‌لای ده‌رگاكه‌مدا قسه‌یه‌كی ده‌كرد كه سودمه‌ندی ده‌كردم، ڕۆژێك دای به لای ده‌رگاكه‌مدا و هیچی نه‌وت، پاشان دوو یان سێ جار ئه‌مه دووباره‌بوویه‌وه، منیش وتم: ئه‌ی كه‌نیزه‌ك له‌به‌ر ده‌رگاكه‌دا جێگه‌كه‌م بۆ ڕاخه‌و سه‌ری خۆم به‌ست، پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) دای به‌لامداو فه‌رمووی عائیشه چیته؟ وتم: سه‌ری ئازاری هه‌یه، وتی: وای بۆ سه‌ری منیش، چوو و هێنده‌ی نه‌برد تائه‌وه‌ی خرابوویه ناو جێگه‌یه‌ك و هێنرا، پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لام و ناردی به دوای ژنه‌كانیدا و فه‌رمووی(من ناساغم و

---

[1] – (هه‌یسه‌می ج٩ ص٢٥ ده‌ڵێت: كه‌سه‌كانی سه‌نه‌ده‌كه صه‌حیحن جگه له موحه‌ممه‌دی كوڕی ئیسماعیلی كوڕی سه‌مره‌ی ئه‌حمه‌شی كه ئه‌ویش جێمتمانه‌یه، ته‌به‌رانی له المعجم الاوسگ دا به‌و جۆره هێناویه‌تی به‌ڵام ده‌ڵێت: ئه‌مه مانگێك پێش مردنی بوو، له سه‌نه‌ده‌كه‌دا چه‌ند لاوانێكی هێناوه، له‌وانه ئه‌شعه‌سی كوڕی تابق، ئه‌زدی ده‌ڵێت: فه‌رمووده‌ی ئه‌م كه‌سه صه‌حیح نیه). ئه‌بونه‌عیم له الحلیه ج٤ ص١٦٨ له ئیبن مه‌سعوده‌وه(رضي الله عنه) به‌و جۆره به دوورو درێژی به جیاوازیه‌كی كه‌مه‌وه هێناویه‌تی، پاشان ده‌ڵێت: ئه‌م فه‌رمووده غه‌ریبه له فه‌رمووده‌ی موڕه‌ی كوڕی عه‌بدوڵڵاوه هێناویه‌تی سه‌نه‌ده‌ی موته‌سیلی ته‌نها له عه‌بدولمه‌لیكی كوڕی عه‌بولره‌حمانه‌وه‌یه كه ئه‌ویش ئیبنولئه‌سبه‌هانیه – ئیبن سه‌عد ج٢ ص٢٥٦ له ئیبن مه‌سعوده‌وه به دوورو درێژی هێناویه‌تی و له سه‌نه‌ده‌كه‌یدا واقیدی هه‌یه.

ناتوانم بەڕێز بەسەرتان بکەمەوە، دەی مۆڵەتم بدەن تا لەلای عائیشە بم) منیش سەرقاڵی خزمەتکردنی بووم، پێشتر بۆ کەس شتی وامنەکردبوو،ڕۆژێکیان سەری لەسەر شانم بوو، سەری بەلای سەرمدا کەوت، وامزانی لەبەر شتێك وادەکات، کەچی لەدەمیەوە خاڵێکی سارد هاتەدەرێ، و کەوتە سەر لاملمو پێستی لەشم تەزووگرتی، وامزانی بووڕایەوە، بەرگێکم دا بەسەریدا، عومەرو موغیرەی کوڕی شوعبە(ﷺ) هاتنو مۆڵەتیان خواستو مۆڵەتم پێدانو بالاپۆشی خۆمم توندوتۆڵ کردەوە، عومەر سەیری پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: هاوار بۆ ئەو لەهۆشچوونە، ئەمە سەختترین لە هۆشچوونی پێغەمبەرە(ﷺ)، پاشان هەستان کە لە دەرگاکە نزیك بوونەوە موغیرە وتی: عومەر پێغەمبەر(ﷺ) مرد، منیش وتم(یان هاتووە عومەر وتی) درۆت کرد تۆ کابرایەکیت دەستت لێ وەشێنراوە پێغەمبەر(ﷺ) نامرێ تا خوا دووڕووان لەناودەبات، پاشان ئەبوبەکر هاتو منیش جلەکەم لەسەری لابردو ئەبوبەکر سەیری کردو وتی: انا لله وانا الیه راجعون پێغەمبەر(ﷺ)، دەمی بردە سەر تەوێڵی پێغەمبەر(ﷺ)و ماچی کردو وتی: پێغەمبەرم ڕۆ، پاشان سەری بەرزکردەوەو هەمدی سەری دانەواندو تەوێڵی ماچکردو وتی: خۆشەویستم ڕۆ، پێغەمبەر(ﷺ) مرد، ئینجا چوو بۆ مزگەوتو عومەریش(ﷺ)قسەی بۆ خەڵكو دەکرو دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) نامرێ تا خوا دووڕووان لەناودەبات، ئەبوبەکر(ﷺ) کەوتە قسەو سوپاسو ستایسی خوای کرد، دواتر وتی: خوا دەفەرموێت(انك میت وانهم لمیتون) تا گەیشتە تەواوکردنی ئایەتی(وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل....) ال عمران ١٤٤. پاشان وتی: هەرکەس خوا دەپەرستێت ئەوا خوا زیندووەو نامرێت، هەرکەسیش موحەممەد دەپەرستێت ئەوا موحەممەد مرد، عومەر وتی: ئەرێ ئەو ئایەتە لە قورئاندا هەیە؟ پاشان عومەر وتی: ئەی خەڵکینە ئەوە ئەبوبەکرەو یەکەمینی موسڵمانانە دەی بەیعەتی پێبدەن[١].

---

[١] – صحیح.

## (شۆردن و کفنکردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئیبن سەعد ج٢ ص٦١ لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بۆ شۆردن و کفنکردن برد دەرگاکەمان لە هەموو خەڵك داخست، پشتیوانان وتیان: ئێمە خاڵوانی پێغەمبەرین و ئەمە پایەمانە لە ئیسلامدا، قورەیش وتیان: ئێمە هۆزی ئەوین، ئەبوبەکر(رضي الله عنه) هاواری کرد ئەی کۆمەڵی موسڵمانان هەمووتان لە یەکترشیاوترن بەوە دەی بۆ خاتری خوا ڕاوەستن ئێوە ئەگەر بچنە ژوورەوە دوایان دەخەن لە شۆردنی، سوێند بەخوا تەنها ئەوەی بانگکراوە لەوێ دەبێ و کەس ناچێتە ژوورەوە، لە عەلی کوڕی حوسەینیشەوە دەڵێت: پشتیوانان هاواریان کرد ماف ئێمەیە چونکە خوشکەزامانە و پایەمان لە ئیسلامدا ئەوەبوو، داوایان لە ئەبوبەکر کرد شتێ بڵێ، ئەویش وتی: هەموان پێی شیاون، دەی عەلی و عەبباسم بۆ بانگ بکەن چونکە کەس ناچێت بۆ لایان مەگەر بە ویستی ئەوان خۆیان.[2]

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باری سەخت بوو و عائیشەو حەفصە(رضـي الله عنهمـا) لە لای بوون عەلی(رضي الله عنه) هات، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عەلی بینی سەری بەرزکردەوەو فەرمووی(لێم نزیك بەرەوە، لێم نزیك بەرەوە) لای خۆی داینیشاندو لەلای بوو تا مرد، کە گیانی سپارد عەلی هەستاو دەرگای داخست، عەبباس لەگەڵ بەنوعەبدولموتەلیبدا هات و لەبەردەرگا وەستان، عەلی دەیوت: بە باوکمەوە بە قوربانت بم بە زیندوویی و مردوویش بۆنت زۆر خۆش بوو، بۆنێکی خۆش بڵاوبوویەوە کە بۆنی لەو جۆرەیان بەدینەکردبوو،

---

[1] – (لە البدایە والنهایە ج٥ ص٢٤١ دا هاتووە، هەیسەمی ج٩ ص٣٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد جێ متمانەن، ئەبویەعلا بەوجۆرە هێناویەتی لەگەڵ زیادەیەکدا، سەنەدەکەشی لاوازە، تەواو، ئیبن سەعد ج٢ ص٢٦٧ لە یەزیدی کوڕی بابنووسەوە بەوجۆرە بە کورتی هێناویەتی).

[2] – ضعیف.

عەلی(رضي الله عنه) وتی: واز لە گریەی وەك گریانی ژن بێنن و بێن بەدەم هاوەڵەکەتانەوە، عەلی وتی: بچن بۆ لای فەزلی کوڕی عەبباس(رضي الله عنه)، پشتیوانان وتیان: لەبەرخوا سوێندمان دان و ئێمەش لە ڕووی پێغەمبەردا پشکمان هەیە، یەکێ لەوانیشیان بردەژوورەوە کە پێ دەوترا ئەوسی کوڕی خەوەلی(رضي الله عنه) بە دەستێکی مەسینەیەکی ئاوی هەڵگرتبوو، لە ماڵەکەوە دەنگێکیان بیست دەیوت: جلی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لامەبەن و بە جلەکەیەوە بیشۆن، عەلی(رضي الله عنه) لە ژێر کراسەکەوە دەستی دەبردو دەیشۆرد، فەزلیش کراسەکەی بەری دەگرت تا لانەچێت، پشتیوانیەکەش ئاوی بەسەردا دەکرد، عەلی پارچە پەڕۆیەکی بە دەستەوەبوو کە بەوە دەستی دەبردە ژێرجلەکە[1][2].

## (چۆنیەتی نوێژکردن لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرد پیاوان چوونەژوور و بەبێ بەرنوێژ دەستە بە دەستە نوێژیان لەسەر دەکرد تا لێبوونەوە، پاشان ئافرەتان چوون و نوێژیان لەسەرکرد، ئینجا منداڵان چوون و نوێژیان لەسەر کرد، پاشان کۆیلەکان چوون و بەبێ بەنوێژکار دەستە بە دەستە نوێژیان لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کرد.

واقدی لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خرایەناو کفنەکەی لەسەر جێگەکەی دانرا، دواتر خرایە کەناری گۆڕەکەی، دواتر خەڵکی دەستە دەستە نوێژیان لەسەر کردو کەس بەرنوێژی بۆنەدەکردن، واقیدی دەڵێت: کوسای کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم بۆی گێڕامەوە وتی: بە

---

[1] - ضعيف.

[2] - (هەیسەمی ج٩ ص٣٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەزیدی کوڕی ئەبوزیاد هەیە کە فەرموودەی حەسەنە لەگەڵ لاوازیەکەیدا کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، ئیبن ماجە هەندێکی هێناوە، تەواو، ئیبن سەعد ج٢ ص٦٣ لە عەبدوڵڵای کوڕی حارسەوە بەو واتایە هێناویەتی).

دەستنووسی باوکم نووسینێکم بەدیکرد تیایدا هاتبوو: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کفن کراو لەسەر جێگەکەی دانرا ئەبوبەکرو عومەر وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێبێت، کۆچەران و پشتیوانانیش هەمان سەلامیان کرد، دواتر ڕیزیان بەست و کەس بەرنوێژی بۆ نەدەکردن، ئەبوبەکرو عومەر کە لە ڕیزی یەکەمدا بوون بەرامبەر بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوون و وتیان: پەروەردگارا ئێمە شایەتی دەدەین پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی گەیاند کە بۆی دابەزی و ئامۆژگاری ئوممەتەکەی کردو لە پێناو خوادا جیهادی کرد تا خوا ئایینی خۆی شکۆدارکردو زاڵبوو و باوەڕ بە تاك و تەنهایی و بێهاوەڵی خوا هێنرا، دەی پەروەردگارمان لەو کەسانەمان بگێڕە کە دەکەونە شوێن ئەو پەیامەی لەگەڵی دابەزی و لەگەڵیدا کۆمان بکەرەوە تا بیناسین و بماننناسێت چونکە ئەو بەرامبەر بە باوەڕداران میهرەبان بوو، جگە لە ئیمان هیچمان ناوێت و هەرگیز نایفرۆشین، خەڵکی وتیان: ئامین، ئامین، ئینجا دەچوونە دەرێ و هەندێکی دیکە دەهاتنەژوورەوە تا پیاوەکان و دواتر ژنەکان و دواتر منداڵەکان نوێژیان لەسەر کرد[1].[2]

ئیبن سەعد ج٢ ص٧٠ لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خرایە سەر جێگەکەی وتی: کەستان لەسەری نەبێت بە پێشنوێژ بە زیندوویی و بە مردووییش، خەڵکی دەستە دەستە دەچوون و ڕیز ڕیز نوێژیان لەسەر دەکردو پێشەوایان نەبوو، الله اکبریان دەکردو عەلی لە پاڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) وەستابوو دەیوت: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێبێت ئەی پێغەمبەری خوا، خوایە ئێمە شایەتی دەدەین پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی گەیاند

---

[1] – ضعيف.

[2]– ( لە البدایە والنهایە ج٥ ص٢٦٥ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٢ ص٦٩ لە واقیدی لە موسای کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حارسی تەیمیەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

كە بۆی دابەزیو ئامۆژگاری ئوممەتی كردو لە پێناو خوادا جیهادی كرد تا خوا ئایینی خۆی شكۆدارو پەیامی بە كۆتاگەیاند، خوایە دەی لەو كەسانەمان بگێڕە كە دەكەونە شوێن ئەو پەیامەی بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دابەزیو دوای ئەویش چەسپاومان بكەو لەگەڵیدا كۆمانبكەرەوەو بە یەكمان بگەیەنەرەوە، خەڵكی دەیانوت: ئامین، بەو جۆرە پیاوانو دواتر ژنان، ئینجا منداڵان نوێژیان لەسەر كرد.[1]

## (باری هاوەڵان لە كاتی مردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و گریانیان بۆ لیّ جیابوونەوەی)

ئیبن خەسرەو لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كۆچی دوایی كردو ئەبوبەكر(رضي الله عنه) خەڵكی دەبینی چپەو ورتەیان بوو، بۆیە بە غولامەكەی وت: بچێت گویّ بگریّو هەواڵی بۆ بێنێتەوە، ئەویش وتی: بیستم دەیانوت موحەممەد مرد، ئەبوبەكریش ئەوەی لەسەر سەخت بوو و دەیوت وەی پشتی شكاوم تا گەیشتە مزگەوت وایانزانی ناتوانیّ بگات.[2]

عەبدولڕەزاق و ئیبن سەعدو ئیبن ئەبی شەیبەو ئەحمەدو بوخاریو ئیبن حیببانو جگە لەوانیش لە ئیبن عەبباسەوە هێناویانە ئەبوبەكری صدیق لە كاتی كۆچی دوایی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) دەرچوو و سەیری كرد عومەر قسەی بۆ خەڵك دەكرد، وتی: عومەر دانیشە، شایەتومانی وتو دواتر وتی: پاشان هەركامتان موحەممەدی دەپەرست ئەوا موحەممەد مرد، هەركامتان خوا دەپەرستێت ئەوا خوا زیندووەو نامرێت، خوا دەفەرموێت(وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل افان مات او قتل انقلبتم على اعقابكم؟؟؟) ئیبن عەبباس دەڵێت: سوێند بەخوا خەڵكی وایاندەزانی ئەو ئایەتە دانەبەزیوە تا ئەوەی ئەبوبەكر خوێندیەوە، هەموو

---

[1] – ( لە كنز العمال ج٤ ص٥٥ دا واهاتووە).

[2] – ( لە كنز العمال ج٤ ص٤٨ دا واهاتووە).

خەڵکی لەوەوە وەریانگرت هەرکەس دەیبیست دەیخوێندەوە، عومەری کوڕی خەتتاب وتی: سوێند بەخوا لە ئەبوبەکرم بیست ئەو ئایەتەی خوێندەوە لە پێ کەوتمو قاچەکانم لە خۆیان نەدەگرتمو کەوتمە زەوی و کە بیستم ئەوئایەتەی خوێندەوە زانیم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کردووە.[1]

ئیبن سەعد ج٢ ص٨٤ لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەندێ لە هاوەڵانی هێندە خەمباربوون کە هەیانبوو دووچاری ڕاڕایی و دوودڵی دەبوو، من لەوانەبووم کە خەفەتم بۆ خوارد، من لە کوچەیەکی مەدینەدا دانیشتبووم کە ئەبوبەکر بەیعەتی پێدابوو و عومەر(رضي الله عنه) دای بەلاماو هەستم بەو خەمباریە نەکرد کە من هەمبوو ئەویش هەیبێت، عومەر چوو بۆ لای ئەبوبەکر و وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جێی سەرسوڕمان نیە لات؟ من دام بەلای عوسمانداو سەلامم لێکردو ئەویش وەڵامی نەدامەوە، فەرموودەکە بە دوورو درێژی دێنێت وەك دواتر دەیهێنین.

ئیبن سەعد ج٢ ص٨٤ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سەعیدی کوڕی یەربووعەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) بە خەمباری هاتو ئەبوبەکر پێی وت: چیە بە خەمبار دەتبینم؟ عەلی وتی: ئەمە ئازارێکمە کە تووشی تۆ نەبووە، ئەبوبەکر وتی: گوێبگرن بزانن چی دەڵێت: سوێندتان دەدەم بەخوا کەس دەبینن هێندەی من پەژارەی خواردبێت بۆ پێغەمبەری خوا.

واقیدی لە ئوم سەلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئێمە کۆبووبوینەوەو نەدەخەوتین و دەگریان و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ماڵماندا بوو و ئێمە بە بینینی لەسەر جێگادا دڵمان دەکرایەوە، تا دەنگی زەنگن وەشێنانمان لە بەری بەیاندا بیست، ئوم سەلەمە وتی: هاوارمان کردو خەڵکی مزگەوتیش هاواریان کردو شاری مەدینە بە یەکجار دەنگی دایەوە، بیلال بانگی بەیانی دا، کە ناوی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هێنرا

[1] -( لە کنز العمال ج٤ ص٤٨ دا هاتووە).

گریا و كڵپەی پەژارەگرتی و ئێمەش زیاتر خەمباربووین و خەڵكی بەرەو لای گۆڕەكەی چوون بەڵام دەرگایان لەڕووداخرا، ئەی هاوار چ سەختیەك بوو، دوای ئەوە هەر سەختیەكمان دەهاتەڕێ بەیادی مەرگی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لامان ئاسان دەبوو[1].[2]

ئیبن مندەو ئیبن عەساكیر لە ئەبی زوئەیوبی هوزەلیەوە هێناویانە دەڵێت: چوومە مەدینەو خەڵكی پرمەی گریانیان بوو هاوشێوەی دەنگی حاجیان كە هەموو لە كاتی ئیحرام بەستندا دەنگیان دەبیستریێت، وتم: بەسە، وتیان: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كۆچی دوایی كرد (لە كنز العمال ج٤ ص٥٨ دا واهاتووەو ئیبن ئیسحاق بە دووررو درێژی هێناویەتی، وەك دواتر لەسەر قسەی هاوەڵان سەبارەت بە مەرگی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیهێنین).

سەیف و ئیبن عەساكیر لە عوبەیدوڵڵای كوڕی عومەیرەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرد و كاربەدەستی مەككە عتابی كوڕی ئوسەیدبوو، كاتێك هەواڵی مەرگی پێغەمبەریان بیست خەڵكی مزگەوت كەوتنە گریان و عتابیش چوویە دۆڵێكی مەككە، سوهەیلی كوڕی عەمر هات بۆ لای و وتی: هەستە قسە بۆ ئەو خەڵكە بكە، ئەویش وتی: ناتوانم لەگەڵ مەرگی پێغەمبەری خوادا قسەبكەم، وتی: دەی لەگەڵم وەرە من یارمەتیت دەدەم، هەردووكیان چوونە كەعبەو سوهەیل وتاری خوێندەوەو سوپاس و ستایشی خوای كردو وتارێكی بەشێوەی وتارەكەی ئەبوبەكر خوێندەوەو هیچ لێی لاینەدا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە عومەری كوڕی خەتتابی(رضي الله عنه) فەرموو بوو – سوهەیلی كوڕی عەمریش لە ڕۆژی بەدردا لەناو بەندكراوەكاندا بوو – چی وات لێدەكات دانەكانی دەربهێنیت، وازی لێبهێنە بەڵكو خوای گەورە بیباتە بارێك دڵخۆشت بكات، ئەوە ئەو پلەو بارەبوو كە

[1] – ضعيف.

[2] – ( لە البدایە والنهایە ج٥ ص٢٧١ دا واهاتووە. ئیبن سەعد بە كورتی ج٤ ص١٢١ هێناویەتی).

پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردبوو، کاروباری عتابی ڕێکخست.[1] ئیبن سەعدیش ج٢ ص٨٤ لە ئەبوجەعفەرەوە هێناویەتی دەڵێت: نەمبینی فاتیمە(رضي الله عنها) لە داوی پێغەمبەر(ﷺ) پێبکەنێت.

## (هاوەڵان سەبارەت بە مەرگی پێغەمبەر(ﷺ) چییان وت)

ئەبوئیسماعیلی هورەوی لە دلائل التوحید لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە باوکیەوە هێناویەتی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) لە کاتی سەرەمەرگی پێغەمبەردا(ﷺ) وتی:(ئەمڕۆ سروشت و فەرمایشتی لای پەروەردگارمان لە دەستدا).[2]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی ئوم ئەیمەن(رضي الله عنها) بە مەرگی پێغەمبەر(ﷺ) گریا، پێی وترا، بۆچی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەگریت؟ وتی: من دەمزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەمرێت، بەڵام بۆ سروش دەگریم چونکە لەسەرمان هەڵگیراو سورشمان لێبڕا.

بەیهەقی لە فەرمودەکەیدا هێناویەتی ئەبوبەکر(ر) پاش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە عومەری(رضي الله عنه) وت: بمانبە بۆ لای ئوم ئەیمەن تا سەردانی بکەین، کە گەیشتینە لای گریا، پێیان وت: بۆچی دەگریت؟ مەگەر خوای گەورە باشەی نیە بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ)؟ وتی: بەخوا بۆ ئەوە ناگریم تا بزانم خوای گەورە باشی لایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم سروش لە ئاسمانەوە بڕاونەما، ئەوانیش لەگەڵی کەوتنە پرمەی گریان.[3]

---

[1] – ( لە کنز العمال ج٧ ص٤٦ داهاتووە).

[2] – (لە کنز العمال ج٤ ص١٥٠ دا واهاتووە).

[3] – (لە البدایە والنهایە ج٥ ص٢٧٤ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەو موسلیم و ئەبویەعلاو ئەبوعوانەش لە ئەنەسەوە بەهەمان شێوە هێناویانە، لە کنز العمال ج٤ ص٤٨ دا هاتووەو ئیبن سەعد ج٨ ص١٦٤ لە ئەنەسەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

ئیبن ئەبی شەیبەش لە تاریقەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرد ئوم ئەیمەن(رضي الله عنها) گریا، پێی وترا: ئوم ئەیمەن بۆچی دەگریت؟ وتی: بۆ ئەوە دەگریم هەواڵی ئاسمانمان لێبڕا،[1] موسای کوڕی عوقبەش هێناویەتی ئوم ئەیمەن وتی: بۆ هەواڵی ئاسمان دەگریم بە شەوو ڕۆژ بۆمان دادەبەزی کەچی ئیتر پچڕاو هەڵگیرا، بۆ ئەوە دەگریم، خەڵکیش بە قسەکەی سەرسام بوون.[2]

مالیك لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: خەڵکی بە مەرگی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گریان و وتیان: سوێند بەخوا عەددی وتی: بەڵام بەخوا من حەزناکەم پێش ئەو بمردمایە تا لە دوای مردنیشی وەك کاتی زیندووبوونی بە ڕاستی بزانم و بڕوام پێی هەبێت.[3]

بوخاری لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەرەمەرگی هات ئازاری زۆری هەبوو و خەریکبوو لە هۆشی ببات، فاتیمە وتی: وەی باوکم ڕۆ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(لیس علی ابیك کرب بعد الیوم)واتە(لەمڕۆ بەدواوە ئازاری سەرشانی باوکت نەما) کە کۆچی دوایی کرد فاتیمە وتی: وەی باوکمڕۆ، چووم بەدەم بانگهێشتی پەروەردگاریەوە، وەی بابەگیان کە فیردەوس شوێنیەتی. وەی بابەگیان کە هەواڵی مەرگی لەگەڵ جبریل دەدەین، کە بەخاك سپێردرا فاتیمە وتی: ئەی ئەنەس حەسانەوە(خۆشتان هات) بەوەی خۆڵتان کرد بەسەر پێغەمبەری خوادا؟

---

[1]- ( لە کنز العمال ج٤ ص٦٠ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٨ ص١٦٤ بە سەنەدی صەحیح لە تاریقەوە بەو شێوە هێناویەتی).

[2] - ( لە البدایە والنهایە ج٥ ص٢٧٤ دا واهاتووە).

[3]- (لە البدایە والنهایە ج٦ ص٣٣٩ دا هاتووە، ئیبن عەبدولربیر لە الاستیعاب ج٣ ص٤٤٦ لە ڕێگەی مالیکەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابە ج٣ ص٤٥٠ دا دەڵێت: سەعیدی کوڕی هاشم واتە گێڕەرەوەی فەرموودەکە لە مالیکەوە لاوازە، ئیبن سەعد ج٣ ص٤٦٥ لە عروەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی).

ئەحمەد هێناویەتی فاتیمە(رضي الله عنها) وتی: ئەنەس خۆشتان هات پێغەمبەری خواتان(صلى الله عليه وسلم) لەناوخۆڵدا بەخاکسپاردو گەڕانەوە؟ حەماد دەڵێت: ئەنەس کە ئەم فەرموودەی دەوتەوە دەگریا تائەوەی تەواو هیلاکی دەکرد.[1]

تەبەرانی لە عروەوە هێناویەتی صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) دەلاواندەوەو دەیوت:

لهف نفسي و بت كالمسلوب ارقب الليل فعلق المحروب
من هموم و حسرة ارقتني ليت اني سقيتها بشعوب
حين قالوا ان الرسول قد امسى وافقته منية المكتوب
حين جئنا لال بيت محمد فاشاب القذال مني مشيب
فعراني لذاك حزن طويل خالط القلب فهو كالمرعوب

هەروەها دەیوت:

الا يا رسول الله كنت رخاءنا و كنت بنا برا ولم تك جافيا
وكان بنا برا رحيما نبينا لبيك عليك اليوم من كان باكيا
لعمري ما ابكى النبي لموته ولكن لهرج كان بعدك اتيا
كان على قلبي لفقد محمد ومن حبه من بعد ذاك المكاويا
افاطم صلى الله رب محمد على حدث امسى بيثرب ثاويا
ارى حسنا ايتمته و تركته يبكي و يدعو جده اليوم نائيا
فدى لرسول الله امي و خالتي و عمى و نفسي قصره و علاليا
صبرت و بلغت الرسالة صادقا ومت صليب الدين اباح صافيا
فلو ان رب العرش ابقاك بيننا سعدنا ولكن امره كان ماضيا
عليك من الله السلام تحية و ادخلت جنات من العدن راضيا[2].[1]

---

[1]- ( لە البدايە والنهايە ج٥ ص٢٧٣ دا واهاتووە، ئیبن عەساكیر و ئەبویەعلا لە ئەنەسەوە وەك فەرموودەكەی بوخارییان هێناوە. لە كنز العمال ج٤ ص٥٧ دا هاتووە ئیبن سەعد ج٢ ص٨٣ لە ئەنەسەوە بەوجۆرە هێناویەتی).

[2] – حسن.

تەبەرانی لە موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرد صەفیە(رضي الله عنها) عەباکەی ڕاوەشاندو دەیوت:

قد كان بعدك انباء و هنبثة ... لوكنت شاهدها لم يكثر الخطب[2].[3]

بوخاری و بەغەوی لە غونەیمی کوڕی قەیسەوە هێناویانە دەڵێت: چەند قسەیەکم لە باوکم بیست کە لە کاتی مەرگی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتی:

الا لي الويل على محمد ... قد كنت في حياته بمقعد

ابيت ليلي امنا الى الغد[4]

## گریانی هاوەڵان لە کاتی ناوهێنانی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم)

ئیبن موبارەك و ئیبن عەساکیر لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) شەوێك بۆ پاسەوانی دەرچوو، سەیری کرد لە ماڵێکدا ڕۆشناییەك هەیە، نزیك بوویەوە سەیری کرد پیرەژنێکە قژێکی دادەهێنێت تا بڵاوی بکاتەوە و دەیوت:

على محمد صلاة الابرار ... صلى عليك المصطفون الاخيار

قد كنت قواما بكى الاسحار ... يا ليت شعري المنايا اطوار

هلى تجمعني و حبيبي الدار

---

[1] – (هەیسەمی ج٩ ص٣٩ دەڵێت: تەبەرانی بە سەنەدی حەسەن هێناویەتی، تەواو.

[2] – (هەیسەمی ج٩ ص٣٩ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن بەڵام موحەممەد صەفیەی نەبینیوە، تەواو).

[3] – ضعيف.

[4] – (لە الاصابە ج٣ ص٢٦٤ دا هاتووە، بەزار بەو جۆرە هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص٣٩ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە بەشیری کوڕی ئادەم کە جێ متمانەشە، ئیبن سەعد ج٧ ص٧٩ بەو واتایە هێناویەتی).

مەبەستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، عومەر دانیشت و بەردەوام دەگریا تا دای لە دەرگای ماڵی ژنەکە، ژنەکە وتی: کێیە؟ وتی: عومەری کوڕی خەتتاب، وتی: من ئیشم چیە بە عومەر؟ لەم کاتەدا عومەر بۆچی دێت؟ وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت دەرگاکە بکەرەوە خەمت نەبێت، پیرەژنەکە دەرگاکەی بۆ کردەوە، عومەر چوویە ژوورەوەو وتی: ئەم شعرەی ئێستا وتت بیڵێرەوە، ژنەکە بۆی وتەوە، کە گەیشتە کۆتاییەکەی عومەر وتی: داوات لێدەکەم لەگەڵ هەردووکتاندا بمبەیتە ژوورەوە، ژنەکە وتی: عومەریش، ئەی لێبوردە لێی خۆش بە، عومەریش ڕازی بوو و گەڕایەوە.[1]

ئیبن سەعد ج٤ ص١٦٨ لە عاصمی کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: هەرچی ئیبن عومەر ناوی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) بهێنایە یەکسەر چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت، ئیبن سەعد ج٧ ص٢٠ لە موسەنناى کوڕی سەعیدی زارعەوە هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك بوو دەیوت: هەموو شەوێك خۆشەویستەکەم دەبینم، پاشان دەگریا.

## (هاوەڵان لەو کەسەیان دەدا کە قسەی بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوتایە)

ئیبن موبارەك لە حەرمەلەی کوڕی عیمران لە کەعبی کوڕی عەلقەمەوە هێناویانە غەرفەی کوڕی حارسی کندی(رضي الله عنه) کە لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاودەمی هەبوو – بیستی مەسیحیەك قسەی دەوت بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش لێیداو لووتی پەڕاند، ئەویش سکاڵای بردە لای عەمری کوڕی عاص(رضي الله عنه)، ئەویش پێی وت: ئێمە بەڵێنمان پێداون، غەرفە پێی وت: پەنا بەخوا لەوەی بەرامبەر بە قسەوتن بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڵێنیان پێ بدەین، ئێمە بەڵێنمان پێداون تا لە کڵێسایان دووربین و چی دەکەن تیایدا بیکەن و ئەرکێکیان نەدەین بەسەرشاندا کە دەرەقەتی نەیەن،

[1] – (لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٨١ دا واهاتووە).

ئەگەر دوژمن ڕووی تێکردن بەرگرییان لیّ بکەین و خۆیان حوکمی خۆیان هەبێت بە حوکمی ئێمە ڕازی بن و خۆیان بێن و بە حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی لە نێوانیاندا دادوەری بکەین، ئەگەر ڕێك بن لەگەڵمان بەرەوڕوویان نابینەوە، عەمر وتی: ڕاست دەکەریت.[1]

تەبەرانی لە غەرفەی کوڕی حارسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی - هاودەمی هەبوو لەگەڵ عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل(رضي الله عنه) لە یەمەن لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا جەنگاوە - دای بە لای مەسیحیەکی خەڵکی میسردا کە پێی دەوترا مندقون، بانگی کرد بۆ ئیسلام، مەسیحیەکە کەوتە قسە لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش هەڵمەتی بۆ برد، کێشەکە برایە لای عەمری کوڕی عاص(رضي الله عنه)، عەمر ناردی بە دوایداو وتی: ئێمە بەڵێنمان پێداون، بەو جۆرە دەیهێنێت[2][3].

ئیبن عەساکیر لە کەعبی کوڕی عەلقەمەوە هێناویەتی غەرفەی کوڕی حارسی کەندی(رضي الله عنه) - هاودەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووە - دای بەلای کابرایەکدا کە بەڵێنی موسڵمانانی بۆ هەبوو، غەرفە بانگی کرد بۆ ئیسلام، کابراش قسەی وت بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، غەرفەش کوشتی، عەمری کوڕی عاص پێی وت: ئەوان بەو بەڵێنە لێمان دڵنیابوون، غەرفە وتی: ئێمە لەسەر ئەوە بەڵێنمان پێنەداون بەرامبەر خواو پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئازارمان بدەن - فەرموودەکە دێنێت.

---

[1]- ( لە الاستیعاب ج٣ ص١٩٣ دا هاتووە بوخاری لە(التاریخ) لە نەعیمی کوڕی حەماد لە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك لە حەرمەلەوە بە سەنەدەکەی بەو جۆرە و بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی، لە الاصابە ج٣ ص١٩٥ دا واهاتووە).

[2] - ضعیف.

[3]- ( هەیسەمی ج٦ ص١٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدوڵڵای کوڕی صاڵحی نووسەری لەیس هەیە عەبدولمەلیکی کوڕی لەیس مەئمون متمانەی پێداوەو هەندێ بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، بەیهەقی ج٩ ص٢٠٠ بە هەمان شێوە هێناویەتی).

## (بەجێگەیاندنی فەرمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

بەیهەقی ج٩ ص٥٨ لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق لە یەزیدی کوڕی ڕومان لە عروەی کوڕی زوبەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی(رضي الله عنه) نارد بۆ(نەخلە) پێی فەرموو(لەوێبە تا هەواڵێکی قوڕەیشمان بۆ دێنیتەوەو فەرمانی شەڕی پێ نەکرد، ئەمەش لە مانگی حەرامدا بوو، نامەیەکی بۆ نووسی پێش ئەوەی پێی بڵێت بەرەو کوێ دەچێت، فەرمووی(خۆت و هاوەڵەکانت بڕۆن تا دووڕۆژ ڕێ دەبڕن، ئینجا نامەکەت بکەرەوەو سەیری بکە چی فەرمانم پێکردویت تیایدا بڕۆ بۆی و کەس لە هاوەڵانت ناچارمەکە بۆ چوون لەگەڵت) کە ماوەی دوو ڕۆژ ڕێ چوو نامەکەی کردەوەو تیایدا فەرمووبووی(٠ بڕۆ لە نەخلە دادەبەزیت لە هەواڵی قوڕەیشمان بۆ دێنیت لەو هەواڵەی لەسەر ئەوان پێت دەگات) ئەویش نامەکەی خوێندەوە بە هاوەڵەکانی وت: گوێگری و گوێڕایەڵیم لەسەرە، کامتان حەزی لە شەهیدیە با لەگەڵم بێت چونکە من دەچم فەرمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەجێبگەیەنم، کێ حەزناکات با بگەڕێتەوە چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕێگری لێکردووم زۆر لە کەستان بکەم، هەموو لەگەڵی چوون تا گەیشتنە ناوچەی(بەحران) سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عوتبەی کوڕی غەزوان وشترێکیان ون کرد و چوون بە دوایداو دوای کەوتن ئەوانی دیکەش چوون تا لە نەخلە دابەزین، عەمری کوڕی حەزرەمی و حەکەمەی کوڕی کیسان و عوسمان و موغیرەی دوو کوڕی عەبدوڵڵا کە باری بازرگانیان لە تائیفەوە هێنابوو دایان بەلایاندا، کە موسڵمانەکان ئەوانیان بینی واقیدی کوڕی عەبدوڵڵا(رضي الله عنه) سەری خۆی تاشیبوو چوو بەرەو ڕوویان، کە بینییان سەری تاشیوە وتیان: عەمارە ژیانیان نیە بۆتان، هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە کۆتا ڕۆژی ڕەجەبدا عەمرەیان پێکردن، وتیان: ئەگەر بیانکوژین لە مانگی حەرامدا ئەوانتان کوشتوون، ئەگەر وازیان لێ بهێنین ئەمشەو دەچنە ناوی و ڕێتان لێ دەگرن، هەموو یەکدەنگ بوون لەسەر کوشتنیان، واقیدی کوڕی عەبدوڵڵای

تـەمیمی تیرێکـی دا لـە عـەمری کـوڕی حـەزرەمی و کوشـتی و عوسمـانی کـوڕی عەبدوڵڵا و حەکەمی کوڕی کیسانیش خۆیان بەدەستەوەداو موغیرەش ڕایکردو لە دەستیان دەربازی بـوو، ئـەوانیش باروکاروانەکـەیان بـردە خزمـەت پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی(سوێند بەخوا فەرمانم پێنەکردن لە مانگی حەرامدا شەڕبکەن) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوو دیلەکەو کاروانەکەی کرد بە وەقف و هیچی لیّ نەبرد، کاتێك پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ئـەوەی پـیّ فـەرموون چـی لـە دەستیانداببوو کـەوت و وایـانزانی قوڕبەسەربوون و برا موسڵمانەکانیان لێیان تووڕەبوون، قوڕەیش کە ئەمەیان بیست وتیـان: موحەممـەد لـە مـانگی حەرامـدا خـوێنی ڕەوا کـردووەو تیایـدا سـامانی بـردووەو پیاوی دیل گرتووەو مانگی حەرامی ڕەواکردووە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزیند(یسالونك عن الشهر الحرام قتال فیه.......... اکبر من القتل)[1] دەفـەرموێت بێبـاوەڕبوون بـە خـوا گـەورەترە لـە کوشـتن، کـە ئـەم ئایەتـە دابـەزی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) کاروانەکـەی وەرگـرت و دوو دیلەکـەی بەلـەبری دان ئـازادکرد، موسڵمانان وتیان: هیوات هەیە ئەوە غەزابێت بۆمان؟ خوای گەورەش لەبارەیانەوە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد(ان الـذین امنـوا والـذین هـاجروا.... یرجـون رحمـة الله)[2]. ئـەوانیش هەشـت کـەس بـوون و ئەمیرەکەشـیان عەبـدوڵڵای کـوڕی جـەحش(رضي الله عنه) نوێیەمیان بوو.[3]

بەیهـەقی ج٩ ص١١ لـە جونـدوبی کـوڕی عەبـدوڵڵاوە(رضي الله عنه) هێناویـەتی دەڵێـت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستەیەکی نارد و عوبەیدەی کوڕی حارسی(رضي الله عنه) کرد بە ئەمیریان،

---

[1] – البقره ٢١٧.

[2] – البقره ٢١٨.

[3] – ( ئەبونەعیم لە ڕێگەی سەعیدی بەقاڵ لە عیکریمەوە لە ئیبن عەبباسەوە بە دوورو درێژی ئەم چیرۆکەی هێناوە، هەروەها لە ڕێگەی ئەسباتی کوڕی نەسرا لە سدیەوە هێناویەتی. لە الاصابە ج٣ ص٢٢٨ دا واهاتووە).

کاتێك چوو تا بڕوات سەیری پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد و گریا، ئەویش لە شوێنیدا کەسێکی نارد پێ دەوترا عەبدوڵڵای کوڕی جەحش(رضي الله عنه) و نامەیەکی نووسی و فەرمانی پێکرد تا نەگاتە فلان شوێن نەیخوێنێتەوە،و کەس لە هاوەڵانی ناچارنەکات لەگەڵی بچن، کە گەیشتە ئەو شوێنە نامەکەی خوێندەوەو وتی: من گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرم لەسەرە، کێ دەگەڕێتەوە با بگەڕێتەوە یەکێ لە هاوەڵانی گەڕایەوەو ئەوانی دیکەش لەگەڵی چوون، گەیشتن بە ئیبنولحەزرەمی و کوشتیان، ئەوەش لە ڕەجەب یان جەمادولئاخیر تێپەڕنەببوو، بێباوەڕەکان وتیان: لە مانگی حەرامدا کوشتیان، ئەم ئایەتە دابەزی(یسالونك عن الشهر الحرام قتال فیه...) هەندێ لە موسڵمانان وتیان: ئەگەر خێریان دەست کەوتبێ پاداشتیان بۆ نیە، ئەم ئایەتە دابەزی(ان الذین امنوا والذین هاجروا و جاهدوا في سبیل الله....و الله غفور الرحیم).[1]

بوخاری لە ئیسبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی ئەحزابدا فەرمووی(کەستان نوێژی عەسر نەکات مەگەر لەناو بەنی قورەیزەدا) هەندێ لە هاوەڵان لە ڕێدابوون کە عەسر هات، هەندێ وتیان: تا نەچینە ئەوێ نوێژی عەسر ناکەین، هەندێکی دیکە وتیان: بەڵکو نوێژدەکەین پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەی لێ داوانەکردووین و مەبەستی ئەوەنەبووە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی بیستەوە لە هیچ لایەکیان تووڕەنەبوو و سەرکۆنەی هیچکامیانی نەکرد، (موسلیمیش بەو جۆرە هێناویەتی).

تەبەرانی لە کەعبی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ئەحزاب گەڕایەوە جلی جەنگەکەی پۆشی و خۆی کۆکردەوە، دحیم لە فەرموودەکەیدا ئەوەی زیادکردووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی جبریل(علیه السلام)

[1]– ( ئیبن ئەبی حاتەم لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵاوە بەوجۆرە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٣ ص٢٥١ دا هاتووە).

دابەزی و فەرمووی دەستت لە شەڕ هەڵگرت، دەتبینم زرێپۆشەکەت لابرد ئێمە هێشتا لامانەبردووە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕاچڵەکی و بڕیاری دا خەڵکی نوێژی عەسر نەکەن تا بچن بۆ بەنی قورەیزە، ئەوانیش خۆیان ئامادەکردو کەوتنەڕێ نەگەیشتن تا خۆر ئاوابوو، خەڵکی لەسەر نوێژی عەسر دوو بۆچوونیان هەبوو، هەندێ وتیان: نوێژ بکەن چونکە مەبەستی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەوەنەبووە نوێژنەکەن، هەندێکی دیکەیان وتیان: فەرمانی پێکردین تا نەگەینە ئەوێ نوێژنەکەین ئێمەش قسەی پێغەمبەری خوا ناشکێنین و تاوانمان لەسەر نیە، دەستەیەکیان بە باوەڕو چاوەڕوانی پاداشتەوە نوێژیان کردو هەندێکی دیکە چوونە بەنی قورەیزە کە خۆرئاوابوو ئینجا نوێژی عەسریان کرد بە باوەڕو چاوەڕوانی پاداشتەوە پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) سەرکۆنەی هیچکامیانی نەکرد[1][2].

بەیهەقی لە جابرەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە ڕۆژی حونەیندا کە باری خەڵکی بینی فەرمووی ئەی عەبباس هاوار بکە: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، ئەی هاوەڵانی درەخت، ئەوانیش چوون بەدەمیەوەو وتیان بەڵێ، هەبوو دەچوو تا سواری وشترەکەی بێت، بەڵام نەیدەتوانی و زرێپۆشەکەی لە ملی لادەبردو شمشێرو قەڵغانەکەی دەگرتەدەست دواتر بەرەودەنگەکە دەچوون تا سەد کەسیان لە دەوری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کۆبوونەوە، خەڵکی بەرەوڕوو هاتن بۆ جەنگان، بانگەوازەکە بۆ یەکەمجار بۆ پشتیوانان بوو، دواتر بۆ خەزرەج بوو کە لە کاتی شەڕدا خۆڕاگرتربوون، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەناو سوارەکانیدابوو و سەیری

---

[1] – صحیح.

[2] – ( هەیسەمی ج٦ ص١٤٠ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە ئیبن ئەبی هوزەیل کە جێ متمانەشە، بەیهەقی لە عوبەیدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك و لە فەرموودەکەی عائیشەوە(رچی الله عنها) بە دوورو درێژتر لەوە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٤ ص١٢٧ دا واهاتووە).

شمشێروەشێنی خەڵکەکەی کردو فەرمووی(الان حمی الوطیس) سوێند بەخوا خەڵکی نەگەڕانەوە لای تا دیلەکان لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستبەستراوبوون، خوای گەورە بڕێکی لێ کوشتن و ئەوەیان شکا شکاو خوای گەورە سامان و ژن و منداڵیانی خستە دەست پێغەمبەرەکەی(صلى الله عليه وسلم).[1]

ئیبن وەهب لە فەرموودەکەی عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئێ عەبباس(اصحاب السمرة) بانگ بکە، دەڵێت: سوێند بەخوا کاتێك بانگم کردن وەك جولانی سۆزی مانگا بۆ بەچکەکانی سۆزیان جوولاو هاتن و وتیان بەسەرچاو، بەڵێ بەسەرچاو.[2]

ئیبن ئەبی شەیبە لە عیکریمەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕێککەوتنی لەگەڵ خەڵکی مەککە بەست خوزاعە هاوپەیمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوون لە سەردەمی نەفامیدا، بەنوبەکریش هاوپەیمانی قورەیش بوون، خوزاعە چوونە ناو ڕێککەوتنەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بەنوبەکریش چوونە ناو ڕێککەوتنی قورەیش، لە نێوان خوزاعەو بەنوبەکردا کێشەیەك هەبوو، قورەیش بە چەك و خۆراك یارمەتییان دان و سەرپەرشتییان کردن، بەنوبەکر دایان بەسەر خوزاعەداو لێیان کوشتن، قورەیش ترسان پەیمانەکەیان هەڵوەشاندبێتەوە، بە ئەبوسوفیانیان وت: بڕۆ بۆ لای موحەممەدو هاوپەیمانیەکە یەکلاو نێوانی خەڵکەکە چاك بکەرەوە، ئەبوسوفیان چوو بۆ مەدینە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(قد جائکم ابوسوفیان وسیرجع راضیا بغیر حاجة)واتە(ئەبوسوفیان هات بۆ لاتان و پاش کەمێك بە ڕەزامەندی و بەبێ پێویستی دەگەڕێتەوە) ئەبوسوفیان هات بۆ لای ئەبوبەکرو وتی: ڕێککەوتنەکە نوێ و نێوانی خەڵك چاك بکەرەوە، ئەویش وتی: من هیچم

---

[1] – صحیح.

[2] – ( موسلیم لە ئیبن وەهبەوە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٤ ص٣٣١ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص١١ فەرموودەکەی عەبباسی بە دوورو درێژی هێناوە).

بەدەست نیە بەڵکو بەدەست خواو پێغەمبەرەکەیەتی، بۆ عومەریش هەمان شتی وت، عومەر پێی وت: لەگەڵیان بەڵێن هەڵبوەشێنەوە چی نوێ هات بەرتاقیکردنەوەی خوا دەکەوێت و چی سەختی لێ دێت خوا بیبڕێت، ئەبوسوفیان وتی: هیچ کات گەورەی هۆزێکم وەك ئەمڕۆ نەدیبوو، پاشان چوو بۆ لای فاتیمە و فاتیمە وتی: تۆ لەناو ژنانی هۆزەکەتدا هیچ قسەت هەیە؟ پاشان چی بە ئەبوبەکر وت بەویشی وت، فاتیمەش(رضي الله عنها) وتی: کارەکە لەدەست مندا نیە، بەڵکو لە دەست خواو پێغەمبەرەکەیدایە، پاشان چوو بۆ لای عەلی(رضي الله عنه) هەمان شتی پێ وت، عەلی پێی وت: کەسی گومڕام وەك ئەم کەسەی ئەمڕۆ نەدیوە، تۆ گەورەی خەڵکیت دەی چاك کردنەوەی پەیمان و نێوانی خەڵك ڕێك بخە، ئەویش دەستەکانی بەسەر یەکداداو وتی: خەڵکیت بەرامبەر بەیەك بەکرێ گرتووە، پاشان چوویەوە بۆ لای خەڵکی مەککەو پێی وتن چی کردووە، وتیان: بەخوا تا ئێستا وەفدی وامان نەدیوە، بەخوا قسەی شەڕت بۆ نەهێناوین تا وریابین، قسەی ڕێککەوتنیشت بۆ نەهێناوین تا دڵنیابین، ئینجا باسی فەتحی مەککە دێت[1][2].

تەبەرانی لە ئەبی عەزیزی کوڕی عومەیری برای موصعەبی کوڕی عومەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە بەدردا لە نێو دیلەکاندا بووم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لەگەڵ دیلەکان باش ڕەفتاربکەن) من لەنێو دەستەیەکی پشتیوانان‌دا بووم، کە خواردنیان دەهێنا(بەیانی و ئێوارە) خۆیان خورمایان دەخواردو لەبەر وەسیەتەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نانەچاکەکەیان دەدا بە من.[3]

ئیبن عەساکیر لە عەبدولڕەحمانی کوڕی لەیلاوە هێناویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە(رضي الله عنه) ڕۆژێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و پێغەمبەریش وتاری دەداو

---

[1] – ضعیف.

[2] – (لە منتخب کنز العمال ج٤ ص١٦٢ یشدا هاتووە).

[3] – ( هەیسەمی ج٦ ص٨٦ دەڵێت سەنەدەکەی حەسەنە).

دەیفەرموو(دانیشن) ئەویش لە دەرەوەی مزگەوت لە شوێنی خۆیدا دانیشت، تا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە وتارەکەی بوویەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بیستەوەو پێی فەرموو(خوای گەورە سووربوونت لەسەر گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی زیاتر بکات)[1].[2]

ئیبن عەساکیر لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژی هەینی لەسەر مینبەر دانیشت و فەرمووی(دابنیشن) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە(رضي الله عنه) ئەوەی بیست و لەناو بەنی غەنەمدا دانیشت، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئیبن ڕەواحەیە ئەو فەرمایشتەی تۆی بیست لە شوێنی خۆیدا دانیشت.[3]

ئیبن ئەبی شەیبە لە عەتائەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتاری بۆ خەڵك دەخوێندەوە فەرمووی(دابنیشن) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ئەمەی بیست و لەبەردەرگادا بوو دانیشت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی عەبدوڵڵا وەرە ژوورەوە،[4] ئیبن عەساکیریش لە جابرەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژی هەینی چوویە سەر مینبەر فەرمووی(دانیشن) ئیبن مەسعود ئەوەی بیست و لەبەردەرگای مزگەوتدا دانیشت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی و فەرمووی(وەرە ئەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود).[5]

ئەبوداود لە ئەنەسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك دەرچوو و ئێمەش لەگەڵی بووین و گومەزیەکی دیاری بینی فەرمووی(ئەمە چیە؟) هاوەڵانی پێیان وت:

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( لە کنزالعمال ج٧ ص ٥٢ دا هاتووە، بەیهەقیش بەو جۆرە بە سەنەدی صەحیح لە عەبدولڕەحمانەوە هێناوەتی، لە الاصابە ج٢ ص٣٠٦ دا هاتووە).

[3] – (لە کنز العمال ج٩ ص٣١٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی مجمع هەیە کە لاوازە، لە الاصابە ج٢ ص٣٠٦ دا هاتووە دروستتر وایە فەرموودەکە مورسەلە).

[4] – (لە کنز العمال ج٧ ص٥٦ دا واهاتووە).

[5] – ( لە کنز العمال ج٧ ص٥٥ دا واهاتووە).

ئەوە هی فلان کەسی ئەنساریە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بێدەنگ بوو و لە دەروونیدا هێشتیەوە تا خاوەنەکەی هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و لەناو خەڵکدا سەلامی لێکرد، ئەویش ڕووی لێوەرگێڕا، دووبارەبوویەوە تا کابرا هەستی بە توورەیی و ڕوو وەرگێڕان کرد، سکاڵای لای هاوەڵانی کرد، وتی: بەخوا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە بێزاری دەبینم، وتیان: چوویە دەریۆ گومەزیەکەی بینیت، کابرا گەڕایەوەو ڕووخاندی و تەختی زەوی کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێکی دی دەرچوو و گومەزیەکەی نەبینی، فەرمووی(ما فعلت القبة؟) واتە(گومەزیەکە چی لێهات؟) وتیان: خاوەنەکەی لای ئێمە سکاڵای لەسەر ڕوو وەرگێڕانت کرد ئێمەش وتمان چی بووە ئەویش ڕووخاندی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی( هەموو بینایەك بەڵایە بۆ خاوەنەکەی مەگەر ئەوەی پێویستو ناچاری بێت) ئیبن ماجە بە کورتی هێناویەتی و لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جارێکی دی دای بەلایداو نەیبینی، پرسیاری لەبارەوە کردو پێی وترا: کابرا بە بیستنی ئەو شتە لایبردووە، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت، ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت).[1]

دولابی لە (الكني) ج٢ ص٤٤ لە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چووم بۆ(عقبة اذاخر) پێستەیەکی نیمچەخۆشەکراوم لەبەربوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لایکردەوە بەلامداو فەرمووی(ئەو جلە چیە؟) زانیم حەزی پێی نیە، چووم بۆ ماڵەوەو سەرقاڵی تەنوورگەرمکردن بوون جلەکەم خستەناوی و هاتمەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(چیت کرد بە عەباکە؟) وتم: فڕێم دایە ناو تەنوورەکە، فەرمووی(ئەی بۆچی نەتدا بە یەکیٚ لە ژنو خێزانەکانت ؟).[2]

ئەحمەدو بوخاریو ئیبن عەساکیر لە سەهلی کوڕی حەنزەلیەی عەبشەمیەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم(نعم الرجل خزيمة الاسدى لولا

---

[1] – ضعيف.

[2] – صحيح.

طول جمته و اسبال ازاره)واته(خوزەیمەی ئوسەدی کەسێکی زۆر چاك بوو بهاتبا و پرچەکانی درێژو جلەکەی شڕنەبوایە) خوزەیمەش ئەوەی بیستەوە، شفرەیەکی هەڵگرت و پرچەکانی بڕی تا نیوەی گوێی و جلەکەی هێنایە نیوەی لاقەکانی.[1]

ئەبونەعیم لە کنانی نێردراوی عومەرەوە(رضي الله عنه) بۆ لای هیرەقل کە پێی دەوترا: جوسامەی کوڕی موساجیقی کوڕی ڕەبیعی کوڕی قەیسی کینانی هێناویەتی دەڵێت: دانیشتم نەمزانی چی لە ژێرمدایە، سەیرمکرد و کورسیەکی زێڕم لە ژێردایە، کە بینیم لەسەری دابەزیم و ئەویش پێکەنی و پێی وتم: بۆچی لەسەر ئەو کورسیە دابەزیت کە پێی ڕێزدارمان کردیت؟ وتم: من بیستوومە لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوورەپەرێزی دەکرد لە شتی وا.[2]

عەبدولڕەزاقی کوڕی ڕافیعی کوڕی خودەیج(رضي الله عنه) دەڵێت: ڕۆژێك خاڵۆم هاتە ژوورەوە بۆ لام و وتی: ئەمڕۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوەرەپەرێزی لێکردین لە شتێك کە سوودی بۆ ئێوە هەیە و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی سوودی بۆ ئێوەش زیاترە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[3]

حەسەنی کوڕی سوفیان و ئەبونەعیم لە(المعرفة) لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمی کوڕی موحەممەدی ئەسلەمی کوڕی بحرەی برا حارسی کوڕی خەزرەجەوە - کە پیرێك بوو - هێناویەتی دەڵێت: دەچوویە مەدینە و پێویستی بازاڕی بەجێدەگەیاندو دواتر دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کە عەباکەی دادەنا بیری دەکەوتەوە لە مزگەوتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) نوێژی نەکردووە، دەیوت: سوێند بەخوا لە مزگەوتی

[1] - (لە کنز العمال ج٨ ص٥٩ دا واهاتووە).

[2]- (لە کنز العمال ج٧ ص١٥ دا واهاتووە، ئیبن مندە بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابە ج١ ص٢٢٧ دا هاتووە).

[3] - ( لە کنز العمال ج٨ ص٧٣ دا هاتووە).

پێغەمبەردا(ﷺ) دوو ڕكات نوێژم نەكردووە، چونكە پێی فەرمووین(هەركامتان لەم گوندە دابەزین با نەگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵو منالّی تا لەم مزگەوتەدا دوو ڕكات نوێژ بكات) پاشان عەباكەی هەڵدەگرتو دەگەڕایەوە بۆ مەدینەو لە مزگەوتی پێغەمبەردا(ﷺ) دوو ڕكات نوێژی دەكرد.[1]

سەعیدی كوڕی مەنسورو ئیبن نەجار لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە هێناویانە دەڵێت: داوای ئافرەتێكی پشتیوانانم كردو ئەمەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسكرد، ئەویش پێی فەرمووم(بینیوتە؟) وتم: نا، فەرمووی(لا، فانظر الیها فانە احری ان یؤدم بینكما) (نا، دەی سەیری بكە چونكە خۆشەویستیو گونجانی نێوانتان زیاتر گەرموگوڕتر دەكات) منیش چووم بۆ لای ئافرەتەكەو ئەوەم بە دایكو باوكی وت، هەردووكیان سەیری یەكتریان كرد، هەستامو هاتمەدەرێ، ئافرەتەكە وتی: ئەو كابرام بۆ بانگ بكەن، منیش لە كەناریدا وەستام، وتی: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێكردوویت سەیرم بكەیت دەی سەیرم بكە، ئەگەر نا ڕێت پێنادەم سەیرم بكەیت، منیش سەیرم كردو مارەم بڕی، هەرگیز ئافرەتێكم بە هاوسەر نەگرتووە هێندەی ئەو لام خۆشەویستو بەڕێزبێت، من حەفتا ئافرتم بە هاوسەر گرتبوو.[2][3]

ئەبوداود لە مەعروری كوڕی سوەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوزەڕم بینی لە ڕەبزە بوو و عەبایەكی ڕەقو ناباشی لەسەرشان بوو و غولامەكەشی هەروا، دەڵێت: خەڵكەكە وتیان: ئەبوزەڕ بۆچی ئەوەی لەسەرشانی غولامەكەتە نایبەیتو لەگەڵ

---

[1] – ( لە كنز العمال ج٣ ص٢٤٦ دا هاتووە، ئیبن مندە هێناویەتی و دەڵێت: فەرموودەكە غەریبە، تەبەرانی هێناویەتی بەلاّم بە موسلیمی كوڕی ئەسلەم ناوی هێناوە، لە الاصابە ج٣ ص٤١٤ دا هاتووە).

[2] – صحیح.

[3] – (لە كنز العمال ج٨ ص٢٨٨ دا واهاتووە).

ئەوەی خۆتدا بیکەیتە جلێك‌و بۆ غولامەکەت جلێکی دی بێنیت، ئەبوزەڕ وتی: من قسەیەکم وت بە کەسێك‌و دایکی ئەو کەسە عەجەمی بوو، سوکایەتیم بە دایکی وت، ئەویش لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سکاڵای لاکردم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم(ئەی ئەبوزەڕ تۆ کەسێکیت هێشتا سیفەتی نەفامیت تێداماوە) فەرمووی(ئەوانە براتانن و خوا فەزڵی ئێوەی داوە بەسەریاندا، هەرکامیان بۆتان ناگونجێ بیفرۆشن‌و سزای دروستکراوی خوا مەدەن). بوخاری‌و موسلیم‌و ترمزی هێناویانە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەوانە برای ئێوەن، خوا ئەوانی خستوەتە ژێر دەستتان، هەرکەس خوای گەورە براکەی خستە ژێردەستی با لەوەی خۆی دەیخوات نانی بدات و لەوەی دەیپۆشێت بەرگی بپۆشێ‌و کارێکی بەسەردا نەدات کە دەرەقەتی نەیەت، ئەگەر کارێکی بەسەردادا کە دەرەقەتی نەهات با لەسەری یارمەتی بدات)[1][2].

## (توندی بەرامبەر ئەوەی پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکات)

ئیبن سەعد ج٣ ص٩٢و ئیبن مونیع لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سکاڵای زۆری ئەسپێوە کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم دەدەیت جلی ئاوریشم بپۆشم؟ ئەویش مۆڵەتی دا، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەبوبەکر مردن‌و عومەر هات ئەبوسەلەمەی کوڕی بینی کە جلێکی ئاوریشمی لەبەردابوو، عومەر وتی: ئەمە چیە؟ دواتر عومەر دەستی کرد بە باخەڵی کراسەکەدا و تا خوار دڕاندی،

---

[1] - صحيح.

[2] - (لە الترغيب والترهيب ج٣ ص٤٩٥ دا هاتووە، بەیهەقی ج٨ ص٨ لە مەعرورەوە بە هەمان شێوە و ئیبن سەعد ج٤ ص٢٣٧ لە عەونی کوڕی عەبدوڵڵاوە بە کورتی هێناویانە).

عەبدولڕەحمان پێی وت: مەگەر نازانیت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ من بە حەڵاڵی دانا؟ وتی: بە حەڵاڵی دانا بۆت چونکە بەدەست ئەسپێوە سکاڵات بوو، بەڵام بۆ کەسی دیکە نابێت.

ئیبن عویەینەو موسەددەو ئیبن جەریر لە ئەبوسەلەمەوە هێناویانە دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف چوو بۆ لای عومەر – موحەممەدی کوڕی لەگەڵ بوو کە جلێکی ئاوریشمی پۆشیبوو – عومەر هەستاو باخەڵی کراسەکەی گرت و دڕاندی، عەبدولڕەحمان وتی: خوا لێت خۆش بێت! منداڵەکەت ترساندو دڵیت داخورپاند، وتی: ئاوریشمیان دەکەنەبەر؟ وتی: من ئاوریشم دەپۆشم، عومەر وتی: ئەی ئەوانیش وەك تۆ وان؟[1]

ئیبن عەساکیر و ئیبن سیرین هێناویانە خالیدی کوڕی وەلید(رضي الله عنه) چوو بۆ لای عومەر(رضي الله عنه) خالید جلێکی ئاوریشمی پۆشیبوو، عومەر پێی وت: خالید ئەمە چیە؟ وتی: دەی ئەمە چیەتی ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ مەگەر ئیبن عەوف نەیپۆشیوە؟ عومەر وتی: دەی مەگەر تۆش وەك ئیبن عەوفیت تا وەك ئەو بۆت هەبێت وابکەیت؟ بڕیارمداوە چی لە ماڵمدایە هەرکامیان بڕیٚ لەوەی لایەتی بیبات و پارچەپارچەی بکەن تا هیچی لیٚ نەمێنێت.[2]

پێشتر باسمانکرد هاوەڵان لە خیلافەتدا ئەبوبەکریان پێشخست، تیایدا هاتبوو دوای مردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە مانگێك خالیدی کوڕی سەعید هات و جبەیەکی دیباجی لەبەربوو، گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب و عەلی کوڕی ئەبوتالیب، عومەر هاواری کرد بۆ ئەوانەی دەوری ئەو جبەی پارچە پارچە بکەن، ئایا ئەو لەناو پیاوانماندا لە ئاشتیدا نەبووە و ئاوریشم دەپۆشێت؟ ئەوانیش جبەکەیان دڕاند.[3]

---

[1] – ( لە کنز العمال ج٨ ص٥٧ دا هاتووە).

[2] – (لە کنز العمال ج٨ ص٥٧ دا واهاتووە).

[3] – (تەبەری و سەیف و ئیبن عەساکیر هێناویانە).

ئیبن جەریر لە عەبدەی کوڕی ئەبولوبابەوە هێناویەتی دەڵێت: بیستم عومەری کوڕی خەتتاب بە مزگەوتدا تێپەڕبوو و کەسێك وەستاو نوێژی دەکردو جلی تەیلەسانی نەخشێنراو بە دیباجی لەبەرکردبوو، عومەر لای وەستاو وتی: چەندە دەتەوێت نوێژەکەت درێژبکەرەوە من کە تابەیانی لێرەدا ناجوڵێم تا لە نوێژەکەت دەبیتەوە کە کابرا ئەوەی بینی لایکردەوە بەلایدا، عومەر وتی: ئادەی جلەکانتم نیشان بدە! بردی و چی نەخشێنراویەکەی هەبوو دڕاندیو وتی: ئەوە جلەکەتە بیگرە.[1]

ئیبن عەساکیر ج١ ص٥٣ لە سەعیدی کوڕی سوفیانی قاریەوە هێناویەتی دەڵێت: براکەم مردووە وەسیەتی کرد بە سەد دینار لە ڕێی خوادا، منیش چووم بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه) و کەسێکی لەلابوو کە دانیشتبوو، منیش کەوایەکم لەبەربوو کە باخەڵ و لاکانی ئاوریشمی پێوەبوو، کە کابرا منی بینی هات و ویستی بیدڕێنێت، کە عوسمان ئەوەی بینی وتی: وازبێنە لەو پیاوە، ئەویش بەریدام، پاشان وتی: پەلەتان کرد، پرسیارم کرد لە عوسمان وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران براکەم مردووە وەسەیتی کرد بە سەد دینار لە ڕێی خوادا ئێستا چی بکەم؟ وتی: ئایا پێش من پرسیارت لە کەس کردووە؟ وتم: نا وتی: ئەگەر پێشتر پرسیارت لە کەسێك بکردایە ئینجا من فەتوایەکم بۆ بدایتایە جگە لەوەی کە پێت دەڵێم دەمدا لە ملت، خوای گەروە فەرمانی پێکردین بە ئیسلامەتی و ئێمەش هەموومان موسڵمان بووین، فەرمانی کۆچی پێکردین ئێمەش کۆچمان کرد(کۆچەرانی مەدینە) پاشان فەرمانی جیهادی پێکردین ئێوەش جیهادتان کردو موجاهیدانی شامن، ئەوە بۆ خەرجی خۆتو ژنو منالت و هەژارانی دەورت ببەخشە، چونکە ئەگەر درهەمێك ببەیت و بیدەیت بە گۆشتو خۆتو کەسوکارت بیخۆن حەوت سەد درهەمت بۆ دەنووسرێت، منیش لە لای چووم، پرسیارم لەسەر

[1] - (لە کنز العمال ج٨ ص٥٧ دا واهاتووە).

ئەو کابرا کرد کە هەڵمەتی بۆ بردم وتم: ئەوە کێ بوو؟ وترا: عەلی کوڕی ئەبوتالیب(ﷺ) بوو، منیش چوومە ماڵەکەیو وتم: چیت لە من بینی؟ وتی: بیستم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اوشك ان تستحل امتي فروج النساء والحرير)واتە(نزیکە ئوممەتەکەم داوێنی ئافرەتو ئاوریشم بە حەلاڵ بزانن) ئەوە یەکەم ئاوریشم بوو لەبەری موسڵمانێکدا بینیم، منیش لە لای چووم و فرۆشتم.[1]

عەبدولڕەزاق لە عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی عومەر(ﷺ) قودامەی کوڕی مەزعوونی(ﷺ) لەسەر بەحرەین دانا، ئەم کەسە خاڵۆی حەفسەو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوو، جاروودی گەورەی عەبدولقەیس لە بەحرەینەوە هات بۆ لای عومەر(ﷺ) وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران قودامە مەی خواردەوەو سەرخۆش بوو و پێموایە حەددێکی خواییم لەسەر تا بیگەیەنم بە تۆ، وتی: کێ لەگەڵت شایەتە؟ وتی: ئەبوهورەیرە(ﷺ). عومەر ئەبوهورەیرەی بانگکرد و وتی: شایەتی چی دەدەیت؟ وتی: نەمبینی بیخواتەوە بەڵام بینیم سەرخۆش بوو و دەڕشایەوە، عومەر وتی: شایەتیەکەت تەواو نەبوو، پاشان نامەی نووسی بۆ قودامە تا لە بەحرەینەوە بێت، ئەویش هاتو جاروود وتی: لەسەر ئەم مەسەلە کتێبی خوا پەیڕەو بکە، عومەر وتی: تۆ نەیاری یان شایەت؟ وتی: شایەت، وتی: دەی شایەتی خۆتت دا، جاروود بیدەنگ بوو، پاشان بەیانی هاتەوە بۆ لای عومەر و وتی: لەسەر ئەم کەسە سنوری خوا بەجێبگەیەنە، عومەر وتی: هەرچی سەیرت دەکەم تۆ نەیاریت و تەنها یەك کەس لەگەڵ تۆدا بینیویەتی، جاروود وتی: سوێندت دەدەم بەخوا، عومەر وتی: یان زمانت دەگریت یان خراپەت بەرامبەر دەنوێنم جاروود وتی: ئەی عومەر ئەمە حەق نیە ئامۆزاکەت مەی بخواتەوەو تۆش بەرامبەرم خراپە بنوێنی، ئەبوهورەیرە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر تۆ گومانت لە شایەتیەکەمان هەیە بنێرە بە دوای کچەکەی وەلیددا کە ژنی قودامەیەو

[1] – ضعيف.

پرسیاری لێبکەن عومەریش ناردی بە دوای هیندی کچی وەلیدداو سوێندی دا، ئەویش شایەتی لەسەر مێردەکەی دا، عومەر بە قودامەی وت: من لێت دەدەم(حەددی ئیسلام) ئەویش وتی: ئەگەر وەك ئەوەی دەیڵێت من خواردبێتمەوە بۆتان نیە لێمبدەن، عومەر وتی: بۆچی؟ وتی: خوا دەفەرموێت(ليس على الذين امنوا و عملوا الصالحات جناح فيما...)[1] ، عومەر وتی: لێکدانەوەکەت هەڵە بوو، تۆ ئەگەر لە خوا بترسایتایە لە حەرامی خوا دوور دەکەوتیتەوە، پاشان عومەر ڕوویکردە خەڵك و وتی: سەبارەت بە لێدانی قودامە چی دەڵێن؟ وتیان: مادەم نەخۆشە پێمان باشە لێی نەدەیت، عومەر چەند ڕۆژێك لەسەری وەستا، دواتر بڕیاریدا لێی بدات، هەمان شتی بە خەڵکەکە وت و هەمان وەڵامی وەرگت، عومەر وتی: ئەگەر لە ژێر ئەم قامچیانەدا بگاتەوە بە خوا(بمرێت) لام خۆشەویستترە لەوەی من بگەمەوە بە خوا و ئەمەم لە گەردن مابێت، ئادەی قامچیەکم بۆ نێنن، فەرمانیکرد و لێیدرا، قودامە لە عومەر تووڕەبوو و تۆراندی، عومەر حەجی کردو قودامەش حەجی کردو هەر ڕقی لێهەڵگرتبوو، کاتێك لە حەجەکەیان گەڕانەوە عومەر لە(السقيم) دابەزی خەوت، کە لەخەو هەستا وتی: زوو قودامەم بۆ بهێنن سوێند بەخوا لە خەومدا کەسێك هات و پێی وت: لەگەڵ قودامە ئاشتەوایی بکە چونکە براتە، زوو بیهێنن بۆم، کە چوون بۆ لای ئامادەنەبوو بێت عومەر فەرمانیکرد ئەگەر نەهات بە زۆر ڕاکێشی بکەن بۆ لای، قسەی لەگەڵ کردو داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد[2].[3]

بەیهەقی لە یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵا لە یەکێ لە هاوەڵانیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(رضي الله عنه) کەسێکی بینی لەسەر تەرمێك پێدەکەنی، وتی: تۆ لەگەڵ تەرمێکدایت و پێدەکەنیت؟ سوێند بە خوا تاماوم قسەت لەگەڵ ناکەم.[4]

---

[1] - المائده ٩٣

[2] - صحيح.

[3] - (ئەبوعەلی کوڕی سکن هێناویەتی، لە الاصابه ج٣ ص٢٩٩ دا هاتووە).

[4] - ( لە كنز العمال ج٨ ص١١٦ دا واهاتووە).

# (ترسی هاوەڵان لە کاتی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) )

ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی بەدردا بە هاوەڵانی فەرمووی(من دەزانم هەندێ لە کەسانی بەنی هاشم و جگە لەوانیش بە ناحەزی هاتوون و هیچ پێویستیەکیان بە شەڕی ئێمە نیە، هەرکامتان گەیشت بە یەکێ لە بەنی هاشم با نەیکوژێت، هەر کەس گەیشت بە ئەبولبوختەری کوڕی هیشامی کوڕی ئەسەد با نەیکوژێت، هەرکەس گەیشت بە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی پێغەمبەری خوا با نەیکوژێت چونکە بە زۆرو ناحەزی هاتووە) ئەبوحوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە(رضي الله عنه) وتی: باوك و براو کوڕانی خۆمان بکوژین و عەبباس نەکوژین؟ سوێند بەخوا ئەگەر پێی بگەم بە شمشێر پارچە پارچەی دەکەم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بیستەوەو بە عومەری(رضي الله عنه) فەرموو(ئەی ئەبوحەفص) عومەر وتی: بەخوا ئەوە یەکەم جار بوو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە ئەبوحەفص ناوم ببات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئایا بە شمشێر دەدرێت لە ڕووی مامی پێغەمبەری خوا؟) عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێمبدە با بە شمشێر بدەم لە ملی چونکە بەخوا دووڕوو بووە، ئەبوحوزەیفە وتی: من بڕوام بەو قسە نەبووە کە ئەو ڕۆژ وتم و بەردەوام لێی دەترسام بەڵام تەنها شەهیدی ئەو تاوانەم دەسڕێتەوە، ئەوە بوو ڕۆژی شەڕی یەمامە شەهید بوو.[1][2]

ئیبن ئیسحاق لە باوکیەوە لە مەعبەدی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی دەڵێت: بەنی قورەیزەی بۆ ماوەی بیست و پێنج شەو گەمارۆدا، تا فشاری لەسەر سەخت

---

[1] – ضعيف.

[2]– ( لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٨٤ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٤ ص٥ و حاکم ج٣ ص٢٢٣ لە ئیبن عەبباسەوە بەو جۆرە هێناویانە، حاکم دەڵێت: لەسەرمەجی موسلیم صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە).

کردن و ترسی خستە دڵیانەوە، گەورەکەیان کەعبی کوڕی ئوسەید پێشنیاری بۆ کردن باوەڕبهێنن یان ژن و منداڵەکانیان بکوژن و ئەوکات بچن بۆ شەڕ یان لە شەوی شەممەدا بدەن بەسەر موسڵماناندا، ئەوانیش وتیان: بڕواناهێنین و شەوی شەممەش ڕەواناکەین، ئەی دوای ژن و منداڵمان ژیان یانی چی؟ بۆیە هەواڵیان نارد بۆ ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونزیر کە هاوپەیمانی بوون و لەبارەی چوونە ژێر بڕیاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕاوێژیان پێکرد، ئەویش ئاماژەی بە قوڕگی کرد – واتە سەربڕین – پاشان پەشیمان بوویەوە و چوو بۆ مزگەوتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و خۆی بەستەوە تا خوای گەورە لێی خۆشبوو[1]،[2] لە البداية والنهاية ج٤ ص١١٩ یش لە موسای کوڕی عوقبەوە هێناویەتی و لە دەقەکەیدا هاتووە ئەی ئەبولوبابە تۆ ڕات چیە؟ دەڵێیت چی بکەین؟ چونکە توانای شەڕمان نیە، ئەبولوبابەش بە دەستی ئاماژەی بۆ قوڕگی کرد و پەنجەکانی پێدا دەهێنا و تێیگەیاندن کە کوشتن سەرەنجامیانە، کە ئەبولوبابە چوویەوە زانی تووشی فیتنەیەکی گەورە بووە وتی: بەخوا سەیری نێوچەوانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناکەم تا تەوبەیەکی یەکجارەکی لای پەروەردگارم بکەم کە خوای گەورە لێم وەربگرێت، گەڕایەوە بۆ مەدینە و دەستەکانی بەستەوە بە کۆڵەکەیەکی مزگەوتەکەدا، دەڵێن نزیکەی بیست شەو وابووە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کاتێك ئەبولوبابەی نەبینی فەرمووی(ئایا ئەبولوبابە لە هاوپەیمانەکانی ترساوە؟) باسیان کرد چی کردووە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بەڕاستی دوای من دوچاری فیتنەیەك بووە ئەگەر بهاتایە بۆ لام داوای لێخۆشبوونم بۆ دەکرد و ئەگەر ئەوەی کردووە هەرگیز لە شوێنیدا نایجوڵێنم تا خوای گەورە بە ویستی خۆی بڕیاری لەسەر دەدات).[3]

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( لە فتح الباري ج٧ ص٢٩١ دا هاتووە).

[3] – ئیبن کەسیر دەڵێت:( ئیبن لهیعە لە ئەبولئەسوەدەوە لە عروەوە بەو جۆرە هێناویەتی، هەروەها موحەممەدی کوڕی ئیسحاق بەو جۆرە هێناویەتی).

بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەیری کرد سابتی کوڕی قەیس(رضي الله عنه) دیارنیە، کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەچم هەواڵیت بۆ وەردەگرم، چوو سەیری کرد لەماڵەوە بە سەردانەواندنەوە دانیشتووە، وتی: ئەوە چیە؟ وتی: باش نیە! دەنگی بەسەر دەنگی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بەرزکردەوەو کاری پووچەڵ بوویەوەو دۆزەخیە، کابراش چوو هەواڵی بردەوە کەوای وتووە، موسای کوڕی ئەنەس دەڵێت: جاری کۆتایی بە موژدەیەکی گەورەوە گەڕایەوە و وتی: بڕۆ بۆ لای و پێی بڵێ(تۆ لە دۆزەخیەکان نیت، بەڵکو بەهەشتیەکانیت).

تەبەرانی لە عەتای خوراسانی لە سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسەوە هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە باوکم بوو دەیوت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)(ان الله لايحب كل مختال فخور) سابت ئەوەی لەسەر سەخت بوو ودەرگای لەسەر خۆی داخستو دەستیکرد بە گریان، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەواڵی بیستو ناردی بۆ لای و پرسیاری لێکرد، ئەویش وتی: چۆن لەوەدا تێکەوتووەو تووشی خۆبەزلزانین بووە و وتی: من کەسێکم حەزم لە جوانیەو حەزدەکەم پێشەنگی هۆزەکەم بم، وتی: تۆ لەوانە نیت، بەڵکو بە خێردەژیتو بەخێر دەمریتو خوا دەتخاتە بەهەشت، وتی: کاتێك خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند(يا ايها الذين امنوا لاترفعوا.... لە بالقول) ئەویش وایکرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەواڵی بیستەوەو ناردی بەدوایدا، ئەویش وتی: خۆبەزلزانی تووش بووەو دەنگی بەرزکردوەتەوەو دەترسێت لەو کەسانەبێت کە چاکەیان دەفەوتێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بل تعيش حميدا و تقتل شهيدا و يدخلك الله الجنة).[1] (بەڵکو بە بەختەوەری دەژیتو بە شەهیدی دەکوژرێیتو خوا دەتخاتە بەهەشت).

---

[1]- ( هەیسەمی ج٩ ص٣٢٢ دەڵێت: کچی سابتی کوڕی قەیس ناناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن، ڕاستتر وایە کچی سابت ئافرەتێکی هاوەڵ بێت چونکە دەڵێت لە باوکم بیست، تەواو. حاکم ج٣ ص٢٣٥ لە عەتا لە کچی سابتەوە بە کورتی بەو جۆرە هێناویەتی).

موحەممەدی کوڕی سابتی ئەنساری هێناویەتی سابتی کوڕی قەیس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ترسام قوڕبەسەر بم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بۆچی؟) وتی: خوا ڕێگری لێکردووین (حەزبکەین لەسەر شتێك کە نایکەین دەستخۆشیمان لێبکرێت منیش حەزم لە سوپاسە، ڕێگری لێکردووین لە خۆبەزلزانین و منیش حەزم لە جوانیە، ڕێگری لێکردوین لەوەی دەنگمان بەسەر دەنگتدا بەرزبکەینەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(یا ثابت الا ترضى ان تعيش حميدا و تقتل شهيدا و تدخل الجنة؟)(ئەی سابت ئایا رازی نابیت بە بەختەوەری بژیت و بە شەهیدی بکوژرێیت و بچیتە بەهەشت؟) وتی: ئەی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەبووبە بەختەوەری و جێ دەستخۆشی ژیا و بە شەهیدی لە ڕۆژی شەڕی موسەیلەمەی کەزابدا کوژرا[1،2].

## (شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ))

بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) حەسیرێکی هەبوو بەشەو ڕایدەخست و نوێژی لەسەر دەکرد، بە ڕۆژیش ڕایدەخست و لەسەری دادەنیشت، خەڵکی دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵ ئەو نوێژیان دەکرد تا زۆر بوون، پێغەمبەریش(ﷺ) سەیری کردن و فەرمووی(يا ايها الناس خذوا من الاعمال ما تطيقون فان الله لايمل حتة تميلوا و ان احب الاعمال الى الله مادام و ان قل)واتە(ئەی خەڵکینە هێندە کاربگرنەبەر کە دەرەقەتی بێن چونکە خوا ناسوێت تا ئێوە بسوێن، خۆویستترین کار لای خوا ئەوەیە بەردەوام بێت با کەمیش بێت) لە گێڕانەوەیەکدا ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) کە کارێکیان دەکرد لەسەری دەچوون.[3]

---

[1] – ضعيف.

[2] – (حاکم دەڵێت: لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحە و زەهەبیش لەسەری کۆکە).

[3] – ( لە الترغيب والترهيب ج٥ ص٨٩ دا واهاتووە).

ئەبوداود لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کە مۆرێکی لە وەرەقی لەیەك ڕۆژدا بە دەست پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) بینی، خەڵکی دروستیان کردو کردیانە دەست، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لایدەبرد ئەوانیش لایاندەبرد،( بوخاری بەو جۆرە هێناویەتی)، لە بوخاری و موسلیمەوە لە ئیبن عومەرەوە هاتووە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خاتەمێکی زێڕی لە دەستدا بوو لایبردو فەرمووی(هەرگیز نایکەمە دەست) خەڵکیش هەموویان خاتەمەکانیان فڕێدان[1][2].

ئیبن ئەبی شەیبە لە ئیاسی کوڕی سەلەمە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: قوڕەیش خاریجەی کوڕی کرزی نارد تا هەواڵێکیان بۆ وەربگرێت، بەجێ سوپاس و باش ناوهێنانەوە گەڕایەوە، وتیان: تۆ دەشتەکیت دەنگی چەکت بیست و دڵت فڕی، ئیدی نەتزانی چیت پێ وتراو چیت وت، پاشان عروەی کوڕی مەسعودیان نارد، هات و وتی: ئەی موحەممەد ئەم قسە چیە! بانگەواز بۆ خودی خوا دەکەیت دواتر تێکەڵەی خەڵکت بە ناسرا و نەناسراوەوە هێناوە تا پەیوەندییان بپچڕێ و خوێن و ئابڕوو و(هۆزەکەت) سامانیان حەڵاڵ بکەن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من نەهاتووم بۆ هۆزەکەم تەنها مەگەر بۆ گەیاندنی پەیوەندییان تا خوای گەورە ئایینیان بگۆڕێ بە ئایینێکی چاکتر لە ئایینیان و ژیانێکی باشتر لە ژیانیان) ئەویش بە هەمان شێوە گەڕایەوە، سەلەمە وتی: باری بەردەستی بێباوەڕان لای موسڵمانان خراپ بوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عومەری(رضي الله عنه) بانگ کردو فەرمووی(ئەی عومەر ئایا تۆ لە منەوە قسە بە برادیلە موسڵمانەکانتان دەگەیەنیت؟) وتی: نا ئەی پێغەمبەری خوا من لە مەککە هۆزم نیە، کەسێکی دیکە هەیە هۆزو پشتی زیاتری هەیە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عوسمانی بانگکردو ناردی بۆ لای قوڕەیش، عوسمانیش بە وڵاخەکەیەوە چوو تا گەیشتە لای سەربازگەی بێباوەڕان، لەوێ قسەی خراپیان

[1] – صحیح.
[2] – ( لە البدایە والنهایە ج٦ ص٣ دا واهاتووە).

لەڕوودا کرد، پاشان ئیبانی کوڕی سەعیدی ئامۆزای پەنای داو سواری کردو بەدوایدا چوو، کە چوو وتی: ئامۆزاگیان بۆچی هێندە پشێوو ناڕێك دەتبینم؟ جلەکەت درێژبکەرەوە، جلەکەی لە نێوەی لاقیدابوو، عوسمان پێی وت: جلی هاوەڵەکەمان وایە، هەرچی دیلی موسڵمانانی مەککە هەبوو فەرمایشتەکەی پێغەمبەری گەیاند پێیان، سەلەمە دەڵێت: ئێمە قسەمان دەکرد کە هەوارکەری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتی(ئەی خەڵکینە، بەیعەت، بەیعەت، روحولقودس دابەزی) ئێمەش چووین بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە لە ژێر درەختێکدا بوو، چووین بەیعەتمان پێدا، ئەوەش فەرمایشتی خوایە(لقد رضي الله عن المؤمنين اذ يبايعونك تحت الشجرة) دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ بەیعەتی عوسمان دەستێکی خستە سەر دەستەکەی دیکەی، خەڵکی وتیان: خۆزگە بە ئەبوعەبدوڵڵا تەواف بەیت دەکاتو ئێمەش لێرەداین؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەگەر ساڵێك بەو جۆرە بمێنێتەوە تەواف ناکات تا من تەواف نەکەم).[1] لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: وتی: ئامۆزام بۆ واتدەبینم کراسەکەت وەك جلی هۆزەکەت درێژبکەرەوە، ئەویش وتی: هاوەڵمان بەو جۆرە جلی تا نیوەی لاقیەتی، وتی: ئامۆزام تەوافی کەعبە بکە، وتی: ئێمە هیچ ناکەین تا هاوەڵمان دەیکات ئینجا شوێن پێی هەڵدەگرین.

تەیالسیو ئیبن سەعدو ئەحمەدو بوخاری و ترمزی و نەسائیو ئیبن حیببانو جگە لەویش لە زەیدی کوڕی سابتەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەبوبەکر(رضي الله عنه) مەسەلەی کوشتنی خەڵکی یەمامەی ناردە لامو عومەری کوڕی خەتتابیش لە لای بوو، وتی: ئەگەر ئەو هات بۆ لام پێم بڵێ لەو شوێنەدا کوشتن قورئانخوێنانی گرتەوە بۆیە دەترسم کوشتنی قورئان خوێنان شوێنانی تریش

[1]- لە كنز العمال ج١ ص٨٤ دا هاتووە، رەویانی و ئەبویەعلاو ئیبن عەساکیر لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە لە باوکیەوە بە کورتی هێناویانە، (لە كنز العمال ج٨ ص٥٦ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج١ ص٤٦١ لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە لە باوکیەوە بە کورتی هێناویەتی).

بگرێتەوەو قورئان نەمێنێ، پێم باشە کۆی بکەیتەوە، منیش بە عومەرم وت: چۆن شتێك بکەین کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەیکرد؟ عومەر وتی: وتم بەخوا خێر لەوەدایە، عومەر بەردەوام پێی دەوتمەوە تا خوای گەورە دەروونی هاوڕای دەروونمی عومەر کردو هەمان ڕای ئەوم هەبوو، زەید وتی: عومەری لە لای دانیشتبوو و هیچی نەدەوت، ئەبوبەکر وتی: تۆ گەنجێکی ژیریتو بە تۆمەتبارت نازانین، تۆ جاران سروشت بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەنووسیەوەو ئێستاش کۆی بکەرەوەن زەید وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەرکی گواستنەوەی کێوێکیان پێ بسپاردایەم لام ئاسانتر بوو لە ئەرکی کۆکردنەوەی قورئان، منیش وتم: چۆن شتێك دەکەم کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەیکرد؟ وتی: سوێند بەخوا ئەوە باشترە، ئەبوبەکر بەردەوام پێی دەوتمەوەو دەهات بۆ لام تا دڵم بوویە هاوڕای ئەبوبەکرو عومەرو کەوتمە کۆکردنەوەی قورئان لەسەر بەردو ئێسكو گەڵاوقەدی خورما و سنگی (مەردان) تا ئەوەی لەگەڵ خوزەیمەی کوڕی سابتی ئەنساریدا گەیشتمە کۆتای سوورەتی(براءة) و تەنها ئەوم بەدیکرد(لقد جائكم رسول من انفسكم عزيز عليه) تا کۆتایی سورەتەکە، ئەو پەڕاوانەی کە قورئانیان تێدا کۆکرایەوە لای ئەبوبەکر بوون تامرد، دواتر لای عومەر بوون تا مرد، دواتر لای حەفسەی کچی عومەر بوون.[1]

پێشتر قسەی ئەبوبەکرمان هێناو وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە حەزدەکەم لە ئاسمان فڕێ بدرێمە خوار بەڵام واز لە شەڕکردن لەسەر شتێ نەهێنم کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شەڕی لەسەر کردووە، بۆیە لەگەڵ عەرەبدا جەنگا تا گەڕانەوە بەرەو ئیسلام، عەدەنی لە عومەرەوە هێناویەتی، بوخاریو موسلیمو ئەحمەدیش لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە – فەرموودەکە دێنێت و تیایدا هاتووە – ئەبوبەکر وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بکات لە نێوان نوێژو زەکاتی ساماندا، سوێند بەخوا ئەگەر گوریسێك کە بە پێغەمبەریان دەدا

[1] – ( لە کنز العمال ج١ ص٢٧٩ دا واهاتووە).

نەیدەن بە منیش لەسەری دەجەنگم. هەروەها پێشتر هێنامان ئەبوبەکر وتی: سوێند بەو پەروەردگارەی تەنها و بێ هاوەڵە ئەگەر سەگ قاچی ژنانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕاکێشن سوپایەك ناگێڕمەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردوویەتی و ئاڵایەك لانابەم کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەڵیکردووە، بۆیە ئوسامەی نارد. بەیهەقی لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی سەیفیش لە عروەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر(رضي الله عنه) وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی ئەبوبەکری بەدەستە ئەگەر بزانم گورگ دەمڕفێنێ سوپای ئوسامە دەنێرم وەك چۆن پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکرد، با لەم شارەشدا تەنها خۆم بمێنمەوە جێبەجێی دەکەم.

ئیبن عەساکیر لە عروەوە هێناویەتی ئەبوبەکر وتی: من سوپایەك بهێڵمەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردی؟ بە ڕاستی ئەو کات بوێریم بۆ شتێکی گەورە هەیە، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر عەرەب بدەن بەسەرمدا لام خۆشترە لەوەی سوپایەك بهێڵمەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڕێی خستووە، ئوسامە بە سوپاکەتەوە بڕۆ بۆ ئەو ئاڕاستەی کە فەرمانت پێکراوە، پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چۆن فەرمانی پێکردیت لە فەلەستینەوە بەرامبەر بە خەڵکی موئتە بجەنگە چونکە خوا بەسە بۆ کارەکەت و ئاگای لەوە دەبێت کە بەجێتهێشتووە.

سەیفیش هێناویەتی ئەبوبەکر(رضي الله عنه) ڕیشی عومەری گرت و وتی: ئیبن خەتتاب دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات کەسێ دادەنێیت جیا لەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داینـاوە، پێشتر بە دوورو درێژی ئەم دەقانەمان هێناون.

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٤٨ لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویەتی دەڵێت: حەفسەی کچی عومەر بە عومەری وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی جلێك ناپۆشیت لەم جلەت باشتربێت و نانێکی چاکتر لەم نانەت ناخۆیت؟ وا خوای گەورە ڕۆزی و خێری زیادکردووە، عومەر وتی: دەتدەمەبەر دادگای خۆت، بیرت نایەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەتاو برسێتیدا چی بەسەرهات؟ بەردەوام بیری دەخستەوە تا

ئیبن کەسیر لە البدایە والنهایە ج٧ ص٣٨ دا دەڵێت: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) دەستەیەك لە گەورەکانی نارد، لەوانە نوعمانی کوڕی موقەڕین و فوراتی کوڕی حەببان و حەنزەلەی کوڕی ڕەبیعی تەمیمی و عەتاردی کوڕی صاجب و ئەشعەسی کوڕی قەیس و موغەیرەی کوڕی شوعبە و عەمری کوڕی مەعدی یەکرب (رضي الله عنه) تا بچن ڕۆستەم بانگ بکەن بۆلای خوا، ڕۆستەم پێی وتن بۆچی هاتوون؟ وتیان: بەپێی بەڵێنی خوا بۆ ئێمە هاتووین تا وڵاتتان بگرین و ژن و منالێتان بە کەنیزەك و کۆیلە بگرین و سامانتان ببەین و لەمەش زۆر دڵنیایین، ڕۆستەم لە خەویدا بینیبووی فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دابەزیوە و کۆتایی بە هەموو چەکی فارس هێنابوو و دایبووی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دابووی بە عومەر (رضي الله عنه) سەیف لە مامۆستاکانیەوە دەیهێنێت دەڵێت کاتێك هەردوو سوپا بەروو ڕووی یەك بوونەوە ڕۆستەم ناردی بۆلای سەعد (رضي الله عنه) تا کەسێکی ژیرو زانای بۆ بنێرێت تا پرسیاری بۆ بنێرێت، ئەویش موعەیرەی کوڕی شوعبەی بۆنارد، کاتێك چوو ڕۆستەم پێی دەوت: ئێوە دراوسێی ئێمەن و ئێمەش چاکەمان بۆتان هەبوو و ئازارمان لەسەر لادەبرن، دەی بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان و ڕێ لە بازرگانیتان ناگرین بێتە وڵاتمان بەڵام بۆ شوێنانی تر هەقمان نیە، موغەیرە پێی وت: ئێمە بۆ ویستی دونیا نەهاتووین، بەڵکو ویست و داوامان ڕۆژی دواییە، خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین، پێی وت: من ئەم دەستە زاڵ دەکەم بەسەر ئەوەدا کە ئایینم وەرناگرێت، بەمانە تۆڵەیان لێدەستێنم و زاڵ دەبم بەسەریاندا تا ئەوەی دانی پێدا دەنێن چونکە ئایینی حەقە و تەنها زەلیلی خۆی لێ بەدوور دەگرێت و هەرکەسیش پشتی پێببەستێت عیزەتمەندە، ڕۆستەم پێی وت: ئەو ئایینە چیە؟ وتی: ئەو پایەی کە بەبێ ئەو ناکرێت شایەتیدانە بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە و داننان بەوەی لە خواوە هاتووە، ئەویش وتی: چەند جوانە، چیتر؟ وتی: دەرکردنی بەندەکان لە پەرستشی بەندەکانەوە بۆ پەرستشی خوا، وتی ئەمیش باشە، چیتر؟ وتی: خەڵکی هەمووی نەوەی ئادەمن،

بران لـە دایـك و باوکـەوە، وتـیش ئـەمیش باشـە، دواتـر وتـی: ئەگـەر بێینـە نـاو ئایینتانـەوە لـە وڵاتمـان دەگـەڕێنـەوە؟ وتـی: ئـەرێ بـەخوا، پاشـان مەگـەر تـەنها بـۆ بازرگانی یان ئیشێك بێینە وڵاتتان، وتی: ئەمەش باشە، کاتێك موغەیرە لەلای چوو ڕۆستەم لەگەڵ گەورەکانی گەلەکەیدا لەسەر ئیسلام قسەی کرد، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون بێنە ناو ئیسلام (خوا ڕسواو سەرشۆڕیان بکات، وایشی پێکردن) پاشان سەعد نێردراوێکی دیکەی نارده لای لەسەر داوای ڕۆستەم، ئەویش ڕەبیعی کوڕی عامیر بوو، هات بۆلای و سەیردەکات بە پشتی زێڕین و ڕایەخی ئاوریشم و مرواری نیشاندان و شتی گرانبەها و ڕازاندنەوەیەکی گەورەوە شوێنەکەیان ڕازاندوەتەوە، و ڕۆستەمیش تاجەکەی خۆی لەسەرە لەگەڵ چەندین شتی دیکەی ڕازاندنەوەی گرانبەهادا، ڕۆستەم لەسەر ڕاخەرێکی زێڕین دانیشتبوون ڕەبیعی بە جلێکی سادەو شمشێرو ئەسپێکی کورتەوە چوو بۆلای، هێندە سواری ببو تا شوێن پێی چاك کوتابوویەوە، پاشان دابەزی و بەستیەوەو بەرەو پێش چوو، چەك و قەڵغان و کڵاوەکەی لەسەر سەری بوو، پێیان وت: چەکەکەت دابنێ، ئەویش وتی: من نەهاتووم بۆلاتان بەڵکو لەسەر داوای خۆتان هاتووم ئەگەر ڕێ دەدەن بەمجۆرەبم باشە ئەگەر نا دەگەڕێمەوە، ڕۆستەم وتی: ڕێی بدەن، ئەویش ڕمەکەی کردبوو بە گاڵۆك و لەسەر پشتیە دایدەنا هەموان بێزاربوون و پێیان وت: بۆچی هاتووی؟ وتی: خوای گەورە ئێمەی ناردووە تا بە ویستی خوا بەندەکان لە پەرستشی بەندەوە بەرەو پەرستشی خوا ببەین، لە تەنگەبەری دونیاوە بەرەو فراوانی دونیا ببەین، لە ستەمی ئایینەکانەوە بۆ دادوەری ئیسلام ببەین، بەم ئایینەی خۆیەوە بۆ بەدەکانی ئێمەی ناردووە تا بەندەکان بانگ بکەین بۆلای ئیسلام هەرکەس بەمە ڕازی بوو قبوڵمانەو وازی لێ دێنین، هەرکەسیش ڕازی نەبێت تاماوین بەشەڕدێین تا بەڵێنی خوا دێت، وتیان: بەڵێنی خوا چیە؟ وتی: بەهەشت بۆ ئەوەی لەسەر شەڕی نەیاران دەکوژرێت و سەرکەوتنیش بۆ ئەوەی دەمێنێتەوە. ڕۆستەم وتی قسەکم بیستن ئێستا دەکرێت ئەمە دوابخەن تا بیری لێ بکەینەوە؟ وتی: بەڵێ، چەند ڕۆژتان پێ

لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تەوافت نەکردووە؟ وتم: با، وتی: بینیت دەست بدات لە هەردوو ڕوکن؟ وتم: نا، وتی: دەی مەگەر ئەو پێشەنگی تۆ نیە؟ وتی: با، وتی: دەی وازبێنە.[1]

ئەحمەد لە بەکری کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەشتەکیەك بە ئیبن عەبباسی وت: باری بنەماڵەی موعاویە چۆنە وا ئاو و هەنگوینیش دەخۆنەوە، بنەماڵەی فلان شیر دەخۆنەوەو ئێوەش شەربەت دەخۆنەوە؟ ئەمە لە چروکیتانە یان لە پێویستیتانە؟ ئیبن عەبباس وتی: نە پێویستیەو نە چروکی، بەڵام پێغەمبەری خوا هات بۆ لامان و ئوسامەی کوڕی زەیدیشی لەگەڵدابوو، داوای ئاوی کردو ئێمەش لەمەمان پێدا – واتە شەربەت – ئەویش لێی خواردەوەو فەرمووی(احسنتم، هکذا فاصنعوا).(چاکتان کرد وابکەن).

ئیبن سەعد ج٤ ص١٦ لە جەعفەری کوڕی تەمامەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای ئیبن عەبباس و وتی: ئەرێ خەڵکی بۆچی لەم شەربەتی مێوژە دەخۆنەوە؟ ئایا سوننەتەو جێبەجێی دەکەن یان ئەمەتان لا باشترە لە شیرو هەنگوین؟ ئیبن عەبباس وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لای عەبباس کە ئەمەی بە خەڵك دەدا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اسقيني)(خواردنەوەم بۆ بێنە) عەبباسیش داوای قاپێکی گەورەی شەربەتی کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جامێکی لێ خواردەوەو دواتر فەرمووی(احسنتم هکذا اصنعوا) ئیبن عەبباس وتی: لەوکاتە بەدواوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وای فەرموو خواردنەوەی لەلام خۆشەویستربوو لە شیرو هەنگوین.[2]

ئەحمەد لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئیبن عومەر بووم لە عەرەفات، کە کاتی چوون هات لەگەڵی چووم تا هات بۆ لای ئیمام و نیوەڕۆ و عەسری لەگەڵ کردو دواتر وەستا و منو هاوەڵانێکیشم وەستاین کە چوو بۆ لای

[1] – ضعيف.

[2] – صحيح.

ئیمام لەگەڵی چووین تا گەیشتە گەروو، لەوێ دابەزیو ئێمەش دابەزین وامانزانی دەیەوێت نوێژبکات، ئەو غولامەی وڵاخەکەی ڕادەگرت وتی: نوێژ ناکات بەڵکو بیری کەوتەوە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە گەیشتە ئەم شوێنە دەستی بەئاوگەیاند، ئەویش حەزدەکات دەست بە ئاو بگەیەنێت.[1]

بەزار بە سەنەدێکی بێ گرفت لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی کە دەچوو بۆ لای درەختێك لە نێوان مەککەو مەدینەداو لەژێریدا ڕادەکشاو دەیوت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جاران وایدەکرد[2][3].

ئیبن عەساکیر لە نافعەوە هێناویەتی ئیبن عومەر شوێن پێی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) دەگرتەبەر، لە هەرکوێدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی بکردایە ئەویش دەیکرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ژێر درەختێکدا دابەزی ئیبن عومەر دەرچوو بۆ لای ئەو درەختەو ئاوی دەکردە بنی تا وشك نەبێت[4][5].

ئەحمەد و بەزار بەسەنەدی باش لە موجاهیدەوە هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ ئیبن عومەر بووین لە سەفەرێکیدا، دای بەلایەکدا چاوی بۆگێڕا، وتیان: بۆچی واتکرد؟ وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)م بینی وایدەکرد منیش وامکرد[6][7].

---

[1]- (لە الترغیب والترهیب ج١ ص٤٧ دا دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی و گێڕەرەوەکانی لە فەرموودەی صەحیحدا پشتیان پێ دەبەسترێت).

[2]- صحيح.

[3]- ( لە الترغیب و الترهیب ج١ ص٤٦ دا واهاتووە، هەیسەمی ج١ ص١٧٥ دەڵێت: کەسەکانی جێ متمانەن).

[4]- حسن.

[5]- (کنز العمال ج٧ ص)٥٩.

[6]- صحيح.

[7]- ( لە الترغیب والترهیب ج١ ص٤٦ دا هاتووە).

بۆچی هاتوون؟ وتی: ئێمە گەلێك بووین لە خراپەو گومڕاییدا بووین، خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین و بەهۆیەوە ڕێنمونی کردین و لەسەر دەستی ئەو ڕۆزی داین، لەوانە دانەوێڵەیەك کە لەم وڵاتەدا دەچێنرا، کە دەمانخواردو دەرخواردی کەس وکارمان دەدا دەیانوت خۆمان ناگرین بمانبەن بۆ ئەو ئەوخاکە تا لە دانەوێڵەبخۆین، ڕۆستەم وتی: دەی دەتانکوژین، ئەویش وتی: ئەگەر بمانکوژن دەچینە بەهەشت و ئەگەریش ئێمە ئێوە بگوژین دەچنە دۆزەخ، کەوتی دەبێت سەرانە بدەن هاواریان لێهەستا و وتیان هیچ ڕێککەوتنێك لە نێوان ئێمەو ئێوەدا نیە موغەیرە وتی یان ئێوە بپەڕنەوە بۆلامان یان ئێمە دەپەڕینەوە، ڕۆستەم وتی ئێمە دەپەڕینەوە بۆتان، موسڵمانان مانەوە تا ئەوان پەڕینەوە و هەڵمەتیان بردنە سەرو موسڵمانان ئەوانیان شکاندان،[1] حاکم ج۳ ص٤٥١ لە ڕێگەی حوصەینی کوڕی عەبدولڕەحمان لە ئەبووائیلەوە هێناویەتی دەڵێت: لە قادسیەدا بەژداریم کردو موغەیرەی کوڕی شوعبە(رضي الله عنه) چوو، ئینجا بە کورتی باسی دەکات.

حاکم ج۳ ص٤٥١ لە موعاویەی کوڕی قرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی قادسیەدا موغەیرەی کوڕی شوعبە(رضي الله عنه) نێردرا بۆلای بەرپرسی فارس، وتی: دە کەسم لەگەڵدا بنێرن، ئەوانیش ناردیان، کراسەکەی پەکی کەوتبوو، پاشان بەرگێکی هەڵگرت و چوو تا هاتەلای و وتی: شتێکم بۆ ڕاخەن لەسەری دابنیشم، کەڵەگەتێکیان وتی: ئەی کۆمەڵی عەرەب دەزانم بۆچی هاتوون بۆلامان، ئێوە لە وڵاتی خۆتاندا نانتان نیە تاتێر بخۆن دەی ها چەندەتان پێویستە خواردن ببەن، چونکە ئێمە مەجوسین و حەزناکەین بتانکوژین، ئێوە خاکمان پیس دەکەن، موغەیرەش وتی: سوێند بەخوا بۆ ئەوە نەهاتووین، بەڵام ئێمە جاران گەلێك بووین بەردو بتمان دەپەرست، کە بەردێکی باشترمان دەبینی ئەویترمان فڕێدەداو ئەممان دەپەرست و پەروەردگارمان نەدەناسی تا خوا لەناو خۆماندا پێغەمبەرێکی بۆ

---

[1] – لە البدایة و النهایة ج۷ ص٤٠دا واهاتووە.

ناردین و بانگی کردین بۆ ئیسلام ئێمەش شوێنی کەوتین، ئێمە بۆ خواردن نەهاتووین، بەڵکو ئەو فەرمانی پێ کردین تا لەگەڵ ئەو دوژمنانەمان بەشەڕبێین کە ئیسلام وەرناگرن، نەهاتووین بۆ خۆراك بەڵکو تا جەنگاوەرتان بکوژین و ژن و منالّتان بگرین، باسی ئەو خۆراکەش کە دەیکەیت سوێند بەخوا هێندە نانمان نیە تێربخۆین و ئاوی زۆریشمان نیە، سوێند بەخوا وازناهێنین تا یان بۆ ئێمە دەبێت یان بۆ ئێوە، فارسەکەش بە زمانی فارسی وتی: ڕاست دەکەیت، وتی: تۆ سبەینێ چاوت لە دەست دەدەیت، سبەینێ چاوی لە دەستدا تیرێکی بەرکەوت و چاوی کوێرکرد،[1]

لە البدایة والنهایة ج٧ ص٤١ لە سەیفەوە هێناویەتی کە سەعد (رضي الله عنه) دەستەیەکی هاوەڵانی نارد بۆلای کیسرا تا بانگی بکەن بۆلای خوا لە پێش ڕوودانی شەڕدا، چوون و داوایان کرد کیسرا ببینن، ڕێیان پێداو خەڵکی وڵات هاتنە دەرەوە تا شێوە و ڕوخسارو سەرو ملیان و قامچی دەستیان و نەعلی پێیان و ئەسپی لاوازیان و جێی کاریگەری زەوی لەسەر پێیان ببینن، لەوپەڕی سەرسوڕمانیاندا بوون چۆن کەسانی وا ژمارەی زۆری سوپای ئەوان بە ئامادەسازیەوە دەشکێنن، کاتێك چوونەلای یەزدگورد مۆڵەتی پێدان و لای خۆی دایینیشاندن، - کەسێکی خۆبەزلزانی کەم ئەدەب بوو- لەسەر جل و بەرگەکانیان پرسیاری لێ دەکردن کە ناویان چیە، پاشان هەرچیەکیان پێ دەوت لەو بارەیەوە دڵخۆش دەبوو خوای گەورەش دەیدایەوە بە دەم و چاویدا، پاشان پێی وتن بۆ چی هاتوون بۆ ئەم وڵاتە؟ وادەزانن لەبەرئەوەی کە سەر قاڵین بەخۆمانەوە پێمان دەوێرن؟نوعمانی کوڕی موقەرین(رضي الله عنه) پێی وت: خوا ڕەحمی پێ کردین و

---

[1]- فەرموودەکە غەریبە، حاکم دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت: صەحیحە، تەبەرانی لە موعاویەوە(رضي الله عنه) بەهەمان شێوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص٢٧٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن

# (ڕەچاوی پەیوەندی گەورەمان موحەممەد(ﷺ) بە هاوەڵان و ئالوبەیت و هۆز و ئوممەتەکەیەوە)

تەبەرانی لە کەعبی کوڕی عەجرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك لە مزگەوت لەگەڵ دەستەیەکی پشتیوانان و کۆچەران و بەنی هاشمدا لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین، لای پێغەمبەر(ﷺ) کەوتینە قسەو پرسیار لەسەر ئەوەی کاممان لە پێشترو خۆشەویستترن لای پێغەمبەر(ﷺ)؟ وتمان: ئێمەی کۆمەڵی پشتیوانان باوەڕمان پێ هێناو شوێنی کەوتین و لە تێکشکانی دوژمنیدا هێزو سوپای بووین، بۆیە ئێمە لە پێشترو خۆشەویستترین لای ئەو، برا کۆچەرەکانمان وتیان: ئێمە لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا کۆچمان کردو هۆزو ژن و منداڵ و سامانمان بەجێ هێشت، وەك ئێوە بەشداری شەڕبووین، بۆیە ئێمە لە پێشترو خۆشەویستترین لای، براکانمان لە بەنی هاشم وتیان: ئێمە خێڵی پێغەمبەری خواین وەك ئێوە بەشدابووین، ئێمە لە پێشترو خۆشەویستترین لای پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە لامان و سەیری کردین و فەرمووی(انكم لتقولن شيئا)واتە(دڵنیام شتێکیان دەوت) ئێمەش وتمان وت: پێغەمبەر(ﷺ) بە پشتیوانانی فەرموو(صدقتم من يريد هذا عليكم)واتە(ڕاست دەکەن کێ حاشا لەوانەتان دەکات) وتمان: برا کۆچەرەکانمان چییان وت: بەوانیشی فەرموو(صدقوا من يريد هذا عليكم) وتمان: بەنوهاشمیش وایان وت، فەرمووی(صدقوا ومن يرديد هذا عليكم) دواتر فەرمووی(الا اقضي بينكم)واتە(دادوەری نێوانتان بکەم؟) وتمان: بەڵێ بە دایك و باوکمانەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(ئێوە کۆمەڵی پشتیوانان من براتانم) وتیان الله اكبر، سوێند بەخوای کەعبە بردمانەوە، فەرمووی(ئێوەش ئەی کۆمەڵی کۆچەران من لە ئێوەم) وتیان: الله اكبر سوێند بەخوا

کەعبە بردمانەوە، فەرمووی(ئێوەش ئەی بەنی هاشم لە منو بۆ منن) هەموومان هەستاینو ڕازی بووین[1][2].

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی وەقاصەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سکاڵای لەسەر خالیدی کوڕی وەلید هەبوو، ئەویش فەرمووی(ئەی خالید! هیچ کەس لە ئەهلی بەدر ئازار مەدە، ئەگەر هێندەی شاخی ئوحود زێڕببەخشیت ناگەیتەوە بە کاری ئەودا) وتی: گرفت دێننەڕێمو منیش بەرپەرچیان دەدەمەوەن فەرمووی(ئازاری خالید مەدەن چونکە شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا، خوای گەورە بەرامبەر بێباوەڕان هەڵکێشراوە)[3][4].

ئیبن عەساکیر لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفو خالیدی کوڕی وەلید دەمەقاڵەیەك کەوتە نێوانیان، خالید وتی: ئیبن عەوف بەوە بەسەرمدا مەنازە کە ڕۆژ دوو ڕۆژێ پێش من موسڵمان بوویت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بیستەوە و فەرمووی(دعوا لی اصحابي فوالذي نفسي بيده لو انفق احدكم مثل احد ذهبا ما ادرك نصيفهم)(واز لە هاوەڵانم بهێنن، چونکە سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر یەکێکتان هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشێت ناگاتەوە پیایاندا)

---

[1] - ضعیف.

[2] - ( هەیسەمی ج١٠ ص١٤ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتیو لە سەنەدەکەدا ئەبومسکینی ئەنساری هەیە کە نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەنو هەندێکیشیان ڕاجیاوازییان لەسەرە، تەواو).

[3] - ضعیف.

[4] - ( هەیسەمی ج٩ ص٣٤٩ دەڵێت: تەبەرانی بە کورتی و بەزاریش بەو جۆرە هێناویانە، کەسەکانی سەنەدی تەبەرانی کەسانی جێمتمانەن، تەواو).(ئیبن عەساکیر و ئەبویەعلاش هێناویانە، لە کنز العمال ج٧ ص١٣٨ دا هاتووە، ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج١ ص٤٠٩ دا لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە هێناویەتی).

پاشـان چـۆن خۆتـان دەپـارێزن ئـەویش بپـارێزن، هەرکـەس ڕازی نـەبوو لەگـەڵی بەشـەڕبێن، مـن دادوەری و یەکلاکـەرەوەی نێوانتـانم، هـەرکامتان کـوژرا دەیخەمـە بەهەشتەکەمەوە، هەرکامیشتان مایەوە سەرکەوتن بەسەر نەیاراندا دەکەمە بەشی).

جا هەڵبـژێرە ئەگـەر دەتـەوێت سـەرانەبدەو ژێردەسـتەیت، ئەگـەرنا شمـشێر، یـان موسـڵمان ببـەو خـۆت ڕزگاربکـە، یـەزگورد وتـی: وابـەرەو ڕووم دێیـت؟ وتـی: بـەرەو ڕووی کـەس ناچم تـا نەمدوێنێت، ئەگەر کەسیتر بوایە واشم نەدەوت، وتـی: ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە نێـردراوان نـاکوژرێن دەمکوشـتن و هیـچتان لام نـەدەبوو، وتـی: بڕێك خۆڵم بۆ بهێنن و ببەن بۆ گەورەی ئەمانە، پاشان ببەن تا لـە ماڵەکانی مـەدائین دەچێتە دەرەوە، بگەڕێنـەوە بۆلای گەورەکـەتان و پێـی بڵێن ڕۆستەمی بۆ دەنێرم تـا خـۆی و سـەربازەکانی لـە خەنـدەقی قادسـیەدا بـە خـاك بـسپێرێت و ئـەو و ئێـوەش لـەناوببات، پاشـان بچێت بـۆ وڵاتتـان و خـراپتر لـەو بارەتـان بەسـەر بێنێـت کـە لەگـەڵ سابووردا نواندتان، پاشان وتـی: گـەورەتان کامەیـە؟ هـەموو بێدەنـگ بـوون، عاصـمی کوڕی عەمر (رضي الله عنه) هەستا و کوا باخۆڵەکە بێنێت من گەورەیانم دەی بیدەن بە من؟ وتی وایە؟ وتیان: بەڵێ، ئەویش خستیە سەر پشتی و لە هەیوان و خانووەکە بردیە دەرەوە تـا بردیـە لای وڵاخەکـەی و لەسـەری دانـا و خێـرا چـوو تـا گەیاندیـە لای سـەعد(رضي الله عنه) عاصـم پێشیانکەوت و لـە دەرگـای قـەدیس تێپـەڕی و دایخـست، وتـی: مژدە بدەن بە ئەمیرەکە سەردەکەوێت، پشت بەخوا سەرکەوتووین، پاشان چوو تـا خۆڵەکـەی بـردو گەڕایەوەو هاتـەوە لای سـەعد(رضي الله عنه) و هـەواڵی پێدا، ئەویش وتـی: موژدەتـان لێبێـت سوێند بەخوا بەسەریاندا سەردەکەوین (خوا کلیلی دەسەڵاتی ئەوانی پێداوین) بەوە دڵخۆش بوون و وڵاتیان گرت، تەواو.[1]

ئیبن جەریر (ج٤ ص١٨٦) لـە ڕێگـەی سەیفەوە لـە موحەمـەدو تەلحـەو کەسـانی دیکەوە هێناویانە دەڵێن: کاتێك ڕۆم بینیان – واتە لە ڕۆژی شەڕی تکریتدا– هـەرچی

[1] – تەبەری ج٤ ص٩٤ لە شوعبەی کوڕی سەیف لە عەمری شەیبیەوە بەوجۆرە هێناویەتی.

دەردەچن شکست دێنن وازیان لەسەرکردەکانیان هێنا و کەلوپەلەکانیان خستەناو کۆشیانەوە هەواڵگرانی تغلب و ئیاد و نەمیر هاتن بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی موعتەسەم و هەواڵیان پێداو داوایانکرد بەرامبەر عەرەب ئاشتی بنوێنێت، پێیانوت ئەوا هاتوون بە دەمیانەوە، ئەویش هەواڵی بۆ ناردن ئەگەر ڕاست دەکەن شایەتومان بهێنن و دان بنێن بەوەی پێغەمبەری خوا لەلایەن خواوە هێناویەتی پاشان ڕای خۆتمان پێ بڵێن، ئەوانیش بەو قسەوە گەڕانەوە و بە موسڵمانبوونەوە وەڵامیان بۆ ناردنەوە، ئینجا چیرۆکەکە باس دەکات.

ئیبن جەریر ج٤ ص٢٢٧ لە ڕێگەی سەیف لە ئەبوعوسمان لە خالید و عوبادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێن: عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) پاش ئەوەی عومەر گەڕایەوە بۆ مەدینە چوو بۆ میسر تا گەیشتە (باب ئەلیەن) زوبەیریش بە دوایدا چوو بەیەکگەیشتن، لەوێ ئەبو مریەم - جاسلیقی میسر- لەگەڵ ئوسقوف بە خەڵکی لیاتەوە کە مقوقس ناردبووی تا وڵاتیان بپارێزن بەرەو ڕوویان بوویەوە، عەمر (رضي الله عنه) کە دابەزی لەگەڵی جەنگان، ئەویش هەواڵی بۆ ناردن پەلە مەکەن تا پۆزشمان بۆتان هەبێت و ئێوەش سەیری ڕای خۆتان بکەنەوە، ئەوانیش دەستیان گرتەوە، عەمر هەواڵی بۆ ناردن من دیارم دەی با ئەبومریەم و ئەبومریامیش بێن، ئەوانیش ڕازی بوون، پەنای یەکتریاندا، عەمر پێی وتن: ئێوە ڕاهیبی ئەم وڵاتەن دەی گوێ بگرن، خوای گەورە موحەمەدی (رضي الله عنه) بە هەق ناردووە و فەرمانی پێ کردووە و ئەویش فەرمانی بە ئێمە کردووە و چی فەرمانی پێکرابوو پێی گەیاندین، پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد و لەسەر ڕێی ڕوون بەجێی هێشتین، لەوەی فەرمانی پێ کردین پۆزش خوازیین بۆ خەڵك، ئێمە بانگتان دەکەین بۆ ئیسلام، کامتان ڕازیبوو وەك ئێمە وایە، کامتان ڕازی نەبوو با سەرانە بدات و دەیپارێزین، پێمان وتراوە ئێمە وڵاتان فەتح دەکەین، وەسیەتی بۆ کردین (پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم) تا بتانپارێزین لەبەر تێکەڵی و سۆزمان لەگەڵتان، ئەگەر ئەمە بکەن زیمەتتان دەبێت، ئەوەی ئەمیرەکەمان پێی ڕاسپاردووین ئەوەیە لەگەڵ قیبتیەکاندا باشبن و باش بڵێن

تەبەرانی لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای ئیبن عەبباس(رضي الله عنه) و وتی: وەسیەتم بۆ بکە، وتی: وەسیەتت بۆ دەکەم لە خوا بترسە وریابە باسی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەکەیت(بە خراپە) چونکە تۆ نازانیت چەند لەپێشترن.[1]

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کۆتا فەرمایشتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوەبوو(اخلفوني اهل بيتي)(چاوتان لە ئالوبەیتم بێت)[2,3].

ئەبویەعلا لە ئوم سەلەمەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: فاتیمە(رضي الله عنها) ی کچی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و حەسەن و حوسەینی لەسەرشان نابوو، جامێکی لەدەستدا بوو کە هی حەسەن بوو و خواردنێکی گەرمی تێدابوو، هێنای بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و خستیە بەردەمی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(باوکی حەسەن لە کوێیە؟) وتی: لەماڵە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بانگی کردن ئینجا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و عەلی و فاتیمەو حەسەن و حوسەین دانیشتن و پێکەوە نانیان خوارد، ئوم سەلەمە وتی: پێش ئەو ڕۆژە هەرکات پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خواردنێکی بخواردایە و منیش لای بوومایە بانگی دەکردم، بەڵام ئەو ڕۆژە بانگی نەکردم، کە لێبوویەوە بە کراسەکەی ڕووی لە ڕوودا وەرگێڕان و فەرمووی(اللهم عاد من عادهم و وال من والاهم) واتە(خوایە دژایەتی ئەوە بکە کە دژایەتیان دەکات و ئەوەت خۆش بوێت کە خۆشی دەوێن)[4,5].

---

[1]- ( هەیسەمی ج١٠ ص٢٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عومەری کوڕی عەبدوڵڵای سەقەفی هەیە کە لاوازە. تەواو).

[2]- ضعيف.

[3]- (هەیسەمی ج٩ ص١٦٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عاصمی کوڕی عەبدوڵڵا هەیە کە لاوازە، تەواو).

[4]- حسن.

[5]- ( هەیسەمی ج٩ ص١٦٧ دەڵێت: سەنەدەکەی جەییدە).

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەی بەنی عەبدولموتەلیب من لای خوا نزای سێ شتم بۆ کردن، وەستاوتان چەسپاو بکات و نەزانتان فێربکات و گومڕاتان ڕێنموونی بکات، داواشم لێکرد بە بەخشندەی میهرەبان و سۆزدارتان ڕاگرێت، جا ئەگەر کەسێك لە نێوان ڕوکن و مەقامدا ڕیزببەستێ و نوێژبکات و ڕۆژوو بگرێت و دواتر بمرێت و ڕقی بێت لە ئالوبەیتی موحەممەد دەچێتە دۆزەخەوە)[1].[2]

تەبەرانی لە عوسمانەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من صنع الى احد من ولد عبدالمطلب يدا فلم يكافئه بها في الدنيا فعلي مكافاته غدا اذا لقيني)[3].[4](ئەگەر کەسێ لە دنیادا چاکەیەکی بۆ یەکێ لە کوڕانی عەبدولموتەلیب کردو لە دنیادا پاداشتی لەسەر وەرنەگرت سبەینێ کە گەیشتەوە بەمن پاداشتی بۆ هەیە).

تەبەرانی لە جابرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی بیستی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) ئەوکاتەی کچی عەلی بە هاوسەر گرت بە خەڵکی وت: پیرۆزباییم لێناکەن؟ گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو(لە ڕۆژی دواییدا هەموو سەبەب و نەسەبێك دەپچڕێت جگە لە سەبەب و نەسەبی من)[5].[6]

---

[1] – ضعيف.

[2] – ( هەیسەمی ج٩ ص١٧١ دەڵێت: تەبەرانی لە موحەممەدی کوڕی زەکەریای غولامی ماموستایەوە هێناویەتی کە لاوازە، ئیبن حیببان لە متمانەکاندا هێناویەت و دەڵێت: فەرموودەی جێ پەسەندە ئەگەر لەجێ متمانەکانەوە گێڕایەوە، منیش دەڵێم: ئەمەی لە سوفیانی سەوریەوە هێناوە کەسەکانی دیکەشی صەحیحن، تەواو).

[3] – ضعيف.

[4] – (هەیسەمی ج٩ ص١٧٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی زناد هەیە کە لاوازە، تەواو).

[5] – صحيح.

[6] – (هەیسەمی ج٩ ص١٧٣ دەڵێت: تەبەرانی لە دوو موعجەمی(الوسيط والكبير) دا بە کورتی هێناویەتی، کەسەکانی هەردوو سەنەدەکەشی کەسانی صەحیحن جگە لە حەسەنی کوڕی سەهل کە جێ متمانەشە).

# (چیرۆکی هاوەڵان لەو کارو ئاکارانەی بوونە هۆی ڕێنموونی خەڵك)

ئەبونەعیم لە الدلائل ج١٠٩ لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پشتیوانانی مەدینە هاتن لە دوای بەیعەتدانیان بە پێغەمبەر (ﷺ) ئیسلام لە ناو مەدینەدا دەرکەوت و هەندێکیش لەسەر ئاینی بێباوەڕی خۆیان مابوونەوە، لەوانە عەمری کوڕی جەموح، موعازی کوڕی لە عەقەبەدا ئامادەبوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر (ﷺ) و عەمریش گەورەیەکی بەنی سەلەمەو خانەدانێکیان بوو، لە ماڵ خۆیدا لەدار بتێکی داتاشیبوو پێی دەوترا (منات) خانەدانان بتەکانیان کە بەخوا دەزانی پاك ڕایان دەگرتن، کاتێك گەنجانی بەنی سەلەمە موعازی کوڕی جەبەل و موعازی کوڕی عەمری کوڕی بە دەستەیەکی دیکەی گەنجانەوە موسڵمان بوون و لە عەقەبەدا بەشدارییانکرد، دەچوونە لای بتەکەی عەمرو دەیانبرد و فڕێیان دەدایە ناو چاڵ و چۆڵی بەنی سەلەمە کە شەخەڵی تێدابوو و شەخەڵیان بەسەردا دەکرد، عەمریش بۆ بەیانی دەیوت قوڕتان بەسەر ئەمشەو کێ وای بە خواوەندەکەمان کردووە؟ پاشان خۆی دەچوو بۆی دەگەڕا تا دەیدۆزیەوە، دەیشۆرد و پاکیدەکردەوەو بۆنی خۆشی لێدەدا، پاشان دەیوت: ئەی بەخوا ئەگەر دەمزانی کێ وای پێ کردوویت سەرشۆڕم دەکرد، بۆ شەو عەمر دەخەوت و ئەوانیش دەهاتنەوە و هەمان شتیان دەکرد، چەند جارێك دووبارەبوویەوە، جارێکیان عەمر دەریهێناو شتی و پاکی کردەوەو بۆنی لێداو دواتر شمشێرەکەی هێناو هەڵیواسی پیایداو دواتر پێی وت: سوێند بەخوا نازانم کێ وات پێدەکات، ئەگەر خێرت تیایە بەو شمشێرە بەرگری لە خۆت بکە، شەو هات و خەوت و ئەوانیش هاتن بردیان و شمشێرەکەش لە ملیدا بوو، پاشان سەگێکی تۆپیویان بە پەتێکەوە بەستەوە بەو بتەوە، پاشان فڕێیاندایە چاڵە شەخەڵێکی بەنی سەلەمەوە، عەمری کوڕی جەموح کە بەیانی هەستا نەبینی چوو گەڕابۆی تا لەپاڵ سەگێکی تۆپیودا دۆزیەوە، کە بینی

لێـی ورد بوویــەوە و هەنـدێ لەوانــەی موسـڵمان ببـون داوانـدیان موسـڵمان بـوو (ڕەحمەتی خوای لێبێت) و بەباشیش ئیسلامی وەرگرت.

منجـاب لـە زیـاد لـە فەرموودەکـەی ئیبن ئیسحاقەوە ئەوەش دێنێت کە دەڵێـت: ئیسحاقی کوڕی یەسار لە کەسێکی بەنی سەلەمەوە بۆی گێڕامەوە کە وتـی: کاتێك گـەنجانی بـەنی سـەلەمە موسـڵمان بـوون ژنەکـەی عـەمری کـوڕی جەموح و کوڕەکـەی موسڵمان بوون، بە ژنەکەی وت: هیچ لە کەس وکارت بانگ مەکە تا بزانین ئەوانە چی دەکەن، وتی: باشە، بەڵام ئایا دەکرێ لە کوڕەکەتەوە ئەوەی فڵان ببیستیت کە لێوەی گێڕاوەتەوە؟ وتی: لەوانەیە هەڵخەڵەتابێت، وتـی: نا بەڵام لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بوو، ئەویش ناردی بە دوایداو وتی: پێم بڵێ چیت لە قسەی ئەو پیاوە بیستووە؟ ئـەویش سورەتی فاتیحـەی لـە سـەرەتاوە تـا (الـصراط المستقيم) بەسـەردا خوێندەوە، وتـی: چەند جوان و چاکە، هەمووی وایە؟ وتـی: بابە گیان لـەوەش باشترە، وتـی: ئـەی تـۆ بەیعەتی پێدەدەیت؟ هەموو هۆزەکەت ئەوەیان کردووە، وتی: نا تـا فـەرمان لـە مـەنات وەربگـرم بـزانم چـی دەڵێـت، ئەگـەر بیانویستایە لەگـەڵ مـەنات قـسەبکەن پیرەژنێـك دەهات لە پشتیەوە دەوەستا و وەڵـامی دەدایـەوە، کە ئـەو دەهـات پیرەژنەکـە نـەدەماو ئەمیش لای دەوەستاو سوپاسی دەکرد و دەیـوت: ئـەی مـەنات هەسـت دەکـەیت ئـەو پرسیاری لـە تـۆ کردووە و تـۆش بێئاگایت، کەسێك هـاتووە دەڵێـت تـۆ نەپەرستین و فەرمانمان پێدەکات تا لات ببەین، منیش حەزم نەکرد بەبێ فـەرمانی تـۆ بەیعـەتی پـێ بـدەم، زۆر دوانـدیو وەڵـامی نەدایـەوە، وتـی: وابـزانم توورەبوویـت خـۆ هیـچم نەکردووە، بۆیە هەستا و شکاندی.[1]

ئیبراهیمـی کـوڕی سـەلەمە لـە فەرموودەکـەی ئـیبن ئیـسحاقەوە ئەمەشـی هێنـاوە عەمری کوڕی جەموح کاتێك موسڵمان بوو و خوای ناسی بیری بتەکەی دەکردەوە و سوپاسی ئەو خوایەی دەکردکە لە گومڕایی و کوێربینی ڕزگاری کرد (رضي الله عنه) وتی:

[1] - ضعيف

ئەحمەد لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)هاتەژوورەوە بۆ لامو فەرمووی(ئەی عائیشە قەومەکەت لەناو ئومەتەکەمدا لە هەموان خێراتر پێم دەگەن) عائیشە دەڵێت کە دانیشت وتم:ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە بمکاتە قوربانت هاتیتو شتێکت فەرموو کە هەژاندمی، فەرمووی(چی بوو؟) وتم: وات وت کە قەومەکەت لە هەموان زوتر پێت دەگەن، فەرمووی(بەڵێ) وتم: دەی ئەمە لە چیەوە؟ فەرمووی(تستخلبهم المنايا و تنفس عليهم امتهم) واتە(مەرگ ئەوانە دروێنە دەکاتو ئومەتیشیان بەسەریاندا زاڵ دەبن)

وتم: ئەی دوای ئەوە خەڵکی چی دەکەن یان ئەو کات چۆن دەبن؟ فەرمووی(دوبێك کە بەهێزیان لاوازیان دەخوات تا قیامەتیان بەسەردا دێت).[1] لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا فەرمووی(ئەی عائیشە یەکەم کەس لەناو دەچن قەومەکەتن) وتم: خوا بمکاتە قوربانت ئایا بەهۆی ژەهرەوەیە؟ فەرمووی(لا، ولكن هذا الحي من قريش تستخلبهم المنايا و تنفس الناس عنهم اول الناس هلاكا) واتە(نا، بەڵام ئەم بەشەی قورەیش مەرگ دروێنەیان دەکاتوخەڵکی بەسەریاندا زاڵ دەبن پێش هەموان لەناو دەچن) وتم: ئەی دوای ئەوە خەڵکی چییان لێ دێت؟ فەرمووی(هم صلب الناس اذا اهلكوا هلك الناس)واتە(ئەوانە پشتی خەڵکن کە لەناوچوون خەڵکیش لەناودەچن)[2].[3]

ئەبویەعلا لە عومەری کوڕی خەتتابەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دانیشتبووم فەرمووی(انبؤني بافضل اهل الايمان ايمانا)(پێم بڵێن چاکترین باوەڕی باوەڕداران کامانەن) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا فریشتەکانن، فەرمووی(هم كذالك يحق لهم ذالك، وما يمنعهم من ذالك وقد انزلهم الله منزلة التي

---

[1] – صحيح.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج١٠ ص٢٨ دەڵێت: ئەحمەدو بەزار هەندێکیان هێناوە، تەبەرانیش هەندێکی هێناوە، سەنەدی گێڕانەوەی یەکەم لای ئەحمەد بە کەسانی صەحیح هاتووە، لە گێڕانەوەکانی دیکەدا قسە هەیە.

انزلهم بها؟ بل غيرهم)واتە(ئەوان وانو ئەوەیان شیاوە، چۆن وانەبن کە خوای گەورە لەو پلەدا دایناون کە داینـاون؟ بەڵکو جگە لەوانن) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پێغەمبەرانـەن کـە خـوای گـەورە بـۆ نـاردنی کتێـب و پێغەمبەرایـەتیش ڕێـزداری کـردوون، فـەرمووی(ئـەوان وان و ئوەیـان شـیاوە، بۆچـی وانـەبن لـە کاتێکـدا خـوا بەوپلەوی کە پێیداون ڕێزداری کـردوون؟) وتیـان: ئەی پێغەمبـەری خوا شەهیدانن ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەراندا شەهید بوون، فەرمووی(ئەوان وان ئەوەیان شیاوە، چۆن وانەبن کە خوا بە شەهیدی ڕێزداری کردوون؟ بەڵکو جگە لەوانن) وتیـان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئیتر ئەوانە کێن؟ فەرمووی(اقوام في اصلاب الرجال ياتون من بعدي يؤمنون بي ولم يروني، و يصدقوني ولم يروني، يجدون الورق المعق فيعملون بمافيه، هؤلاء افضل اهل الايمان ايمانا)واتـە(خـەڵکانێکن لـە پشتی پیاواندان دوای خۆم دێن، باوەڕم پێ دێننو هەرگیزیش نەیانبینیوم، بەڕاستم دەزاننو نەیانبینیوم، پـەڕەی هەڵواسـراو دەبیـننو کاردەکـەن بـەوەی تیایدایـە، ئەوانـە چاکترین بـاوەڕی باوەڕدارانیان هەیە).[1]

هەیـسەمی ج١٠ ص٦٥ دەڵێـت: ئەبویـەعلا هێناویـەتی بـەزاریش هێناویـەتی دەڵێت: لە عەمر لە پێغەمبـەرەوە(صلى الله عليه وسلم) کە فـەرمووی؟ (خبروني باعظم الخلق عند الله منزلة يوم القيامة) واتـە(پێم بڵێن گـەورەترین پلەوپایە بۆ دروستکراوەکان لای خوا لە ڕۆژی دواییدا هی کێیە) وتیان: فریشتەکان، فـەرمووی(بۆچی وانـەبن کە لـە پـەروەردگاریان نـزیکن؟ بـەڵکو جگەلـەوانن) وتیـان: پێغەمبـەران، فـەرمووی(چـۆن وانـەبن کـە سروشـیان دادەبەزێتەسـەر؟ بـەڵکو جگەلـەوانن) وتیـان: ئـەی کـێن ئـەی پێغەمبـەری خـوا ؟ فـەرمووی(خـەڵکانێکن دوای ئێـوە دێـن بـاوەڕم پـێ دێـننو نـەیانبینیومو پـەڕەی هەڵواسـراو دەبیـننو بـاوەڕی پـێ دێـنن، ئەوانـە گـەورەترین

[1] – ضعيف.

پایـــەیان لای خـــوا هەیـــە لـــەناو دروســـتکراواندا یـــان گـــەورەترین ئیمـــانی دروستکراوانیان هەیە لای خوا لە ڕۆژی دواییدا).[1]

ئەحمەد لە ئەبوجومعەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نانی بەیانیمان دەخواردو ئەبوعوبەیدەی جەراحمان لەگەڵدابوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەس هەیە لە ئێمە باشتربێت لەکاتێکدا لەگەڵتدا موسڵمان بووین و جیهادمان کـردووە؟ فـەرمووی(بـەڵێ، خـەڵکانێك دوای خـۆم دێـن و بـاوەڕم پـێ دێـنن و نەیانبینیوم).[2][3]

ئەحمەد لە ئەبی ئومامەوە(رضي الله عنه) هێناویـەتی: پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی(طوبى لمن راني وامن بي وطوبى لمن امن بي ولم يرني) واتـە(سـەرفرازی بۆ ئـەوەی منی بینیوەو باوەڕم پـێ دێنێت، سـەرفرازی بۆ ئـەوەی باوەڕم پـێ دێنێت و نـەیبینیوم) حەوت جار ئەوەی فەرموو.[4][5]

بەزار لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویـەتی: پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی)(ان قوم ياتون من بعدي يود احدهم ان يفتدي برايتي اهله وماله) واتە(دوای خۆم خەڵکانێك دێن هەرکامیان ئامادەیە بۆ بینینم ماڵ و منداڵ و سامانی ببەخشێت).[6][7]

---

[1]- دەڵێت: ڕاستتر وایە فەرموودەکە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە مورسەلە یەکێك لە سەنەدەکانی بەزار مەرفوعی حەسەنە. تەواو.

[2]- ضعيف.

[3]- هەیسەمی ج١٠ ص٦٦ دەڵێت: ئەحمەدو ئەبویەعلاو تەبەرانی بە چەند سەنەدێك هێناویانە، یەکێك لە سەنەدەکانی ئەحمەد کەسەکانی جێ متمانەن، تەواو.

[4]- صحيح.

[5]- (هەیسەمی ج١٠ ص٦٧ دەڵێت: ئەحمەدو تەبەرانی بە چەند سەنەدێك هێناویانەو کەسەکانی سەنەدەکەش صەحیحن جگە لە ئەیمەنی کوڕی مالیکی ئەشعەری کە ئەویش جێ متمانەیە، تەواو).

[6]- ضعيف.

[7]- هەیسەمی ج١٠ ص٦٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی زناد هەیە کە فەرموودەی حەسەنەو جۆرە لاوازیەکی تێدایە، کەسەکانی دیکە جێ متمانەن.

ئەحمەدیش لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (وددت اني لو رايت اخواني الذين امنوا بي ولم يروني) واتە (خۆزگە ئەو برایانەم دەبینی کە بڕوام پێ دێنن و نەشیانبینیوم)[1]

هەیسەمی ج١٠ ص٦٦ دەڵێت: ئەحمەدو ئەبویەعلاش هێناویانەو دەقەکەی ئەبویەعلا ئەمەیە (ومتى القى اخواني) واتە (کەی بگەم بە براکانم) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر ئێمە برات نین؟ فەرمووی (بەڵکو ئێوە هاوەڵانمن براکانیشم ئەوانەن کە باوەڕم پی دێنن و نەیانبینیوم) (بل انتم اصحابي و اخواني الذين امنوا بي ولم يراني)[2][3].

ئەحمەدو بەزارو تەبەرانی لە عەمماری کوڕی یاسرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (مثل امتي مثل المطر لايدري اوله خير ام اخره) واتە (نمونەی ئوممەتەکەم وەك باران وایە نازانرێت سەرەتاکەی خێرە یان کۆتای)[4][5].

---

[1] - صحيح.

[2] - صحيح.

[3]- لە سەنەدی ئەبویەعلادا موحتەسب ئەبوعائد هەیە کە ئیبن حیبان بە جێ متمانەو ئیبن عەدی بە لاوازی دەزانێت، کەسەکانی دیکەی سەنەدی ئەبویەعلا صەحیحن جگە لە فەزڵی کوڕی صەباح کە جێ متمانەشە، لە سەنەدی ئەحمەددا جسر هەیە کەلاوازە، تەبەرانی لە(الاوسگ) دا هێناویەتی جگە لە موحتەسیب کەسەکانی دیکەی صەحیحن، تەواو.

[4] - صحيح.

[5]- هەیسەمی ج١٠ ص٦٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی بەزار صەحیحن جگە لە حەسەنی کوڕی قەزعەو عوبەیدی کوڕی سولەیمانی ئەغەر کە هەردوکیان جێ متمانەن، بەڵام لەسەر عوبەید سوکە ناکۆکیەك هەیە، تەواو. بەزارو جگە لەویش لە عیمران و تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە، لە المجتمع ج١٠ ص٦٨ یشدا هاتووە، ئیبن حەجەر لە فتح الباری دا دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنەو چەند ڕێگەیەکی هەیە، کە دەیگەیەننە صەحیح، مناوی ج٥ ص٥١٧ ئەمە دەڵێت.

بەزار لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە(رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت(خوای گەورە هەندێ فریشتەی گەڕۆکی هەیە کە سلام لە ئوممەتەکەم دەگەیەنن،[1] دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(حياتي خير لكم تحدثون و تحدث لكم، و وفاتي خير لكم تعرض علي اعمالكم، فما رايت من خير حمدت الله عليه و ما رايت من شر استغفرت الله لكم) واتە(ژیانم خێرە بۆتان، قسەدەکەن و قسەتان بۆ دەکەن، مردنیشم خێرە بۆتان کارەکانتان بۆم دەخرێتەڕوو، چی خێرم بینی سوپاسی خوای لەسەر دەکەم و چی خراپیشم بینی لای خوا داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەم)[2][3].

بەیهەقی لە ئەبوبوردەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لای ئبن زیاد دانیشتبووم و عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدیش(رضي الله عنه) لەلای بوو، سەری خەواریجەکان دەهێنرا، کاتێك سەرێکیان دەهێنا وتم: بۆ دۆزەخ، پێی وتم: وامەکە برازاگیان، من گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو(یکون عڑاب هڑه الامه فی دنیاها) واتە(سزای ئەم ئوممەتە لە دنیادا دەبێت) لە کنز العمال ج٣ ص٨٥ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلیة ج٨ ص٣٠٨ لە ئەبی بوردەوە(رضي الله عنه) بەو جۆرە هێناویەتی، دەقەکەی لە مەرفوعیدا وایە(ان الله حعل عذاب هذه الامة في دالدنيا القتل) واتە(خوا گەورە سزای ئەم ئوممەتە لە دنیادا بە کوشتن دەدات)[4].[5] هەروەك هیسەمی ج٧ ص٢٢٥ دەڵێت:

---

[1] – صحیح.

[2] – ضعیف.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص٢٤ دەڵێت: بەزار هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، تەواو.

[4] – صحیح.

[5] – تەبەرانی لە دوو موعجەمی(الصغیر والکبیر) دا بە کورتی هێناویەتی، کەسەکانی سەنەدی المعجم الکبیر صەحیحن.

**تەبەرانیش لە ئەبی بوردەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد چووم و بینیم ئازارێکی سەختی دەدا، لای یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دانیشتم وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(عقوبة هذه الامة بالسيف) (سزای ئەم ئوممەتە بە شمشێرە)[1][2].**

[1] – صحيح.

[2] – هەیسەمی ج٧ ص٢٢٥ ئەمە دەڵێت.

# (حەرامی دەست خستنە خوێن و ماڵ و سامانی موسڵمانان)

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) کەسێك کوژراو نەزانرا بکوژەکەی کێیە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چوویە سەر مینبەرەکەی و فەرمووی(یا ایها الناس ایقتل قتیل و انا بین اظهرکم لا یعلم من قتله؟ لو ان اهل السماء و الارض اجتمعوا علی قتل مسلم لعذبهم الله بلا عدد و لاحساب) واتە(ئەی خەڵکینە ئایا کەسێك بکوژرێت و منیش لەنێوتاندابم و نەزانرێت کێ بکوژیەتی؟ئەگەر خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی کۆببنەوە لەسەر کوشتنی موسڵمانێك ئەوا خوای گەورە بەبێ ژمارە و حساب سزایان دەدات)[1][2].

بەزار لە ئەبی سەعیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) کەسێك کوژرا و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) چوویە سەر مینبەرو فەرمووی(ئەرێ نازانن کێ لەنێوانتاندا ئەم کوژراوەی کوشتووە؟) سێ جار ئەمەی فەرموو، وتیان: نەبەخوا، فەرمووی(سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر هەموو ئەوانەی ئاسمانەکان و زەوی کۆ(بەشدار) بن لەسەر کوشتنی باوەڕدارێك خوای گەورە هەموویان دەخاتە دۆزەخ و هەرکەسیش ڕق لە ئێمەی ئالوبەیت هەڵبگرێت خوای گەورە لە دۆزەخدا داخی دەکات(دەیسوتێنێت)[3][4].

ئەحمەد لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردینی بۆ(حورقە) لە جوهەینە، ئێمەیش بەیانی لەوێ بووین، هەیانبوو کە دەهات

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٧ ص٢٩٧ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە عەتای کوڕی ئەبوموسلیم کە ئیبن حەببان بە جێ متمانەو هەندێ بە لاوازی دەزانن.

[3] – ضعیف.

[4] – لە ج٧ ص٢٩٦ دا دەڵێت: لە سەنەدەکەدا داودی کوڕی عەبدولحەمید و جگە لەویش هەن کە لاوازن، تەواو.

لە هەموان توندتر بوو لە ڕوومان، کە هۆزەکەی پشتیان هەڵدەکردو دەچوون دەیپاراستن، منیش لەگەڵ کەسێکی پشتیوانان هەڵمانکوتایە سەری، کە چووین بۆی وتی:(لا إلـه الا الله) پشتیوانیەکە دەستی لێ گێڕایەوە و منیش کوشتم، پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی بیستەوەو فەرمووی(ئەی ئوسامە پاش ئەوەی وتی: لاالە الا الله کوشتت؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لە ترسی کوشتن وتی، پێغەمبەر(ﷺ) هێندە سەرکۆنەی کردم تائەوەی حەزم دەکرد ئەو ڕۆژە موسڵمان ببوومایە، بوخاری و موسولویمیش هێناویانە. ئیبن ئیسحاقیش هێناویەتی کە چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) پێمان وت چی بووە، فەرمووی(یا اسامة من لك بلاالە الا الله)(ئەی ئوسامە چی دەکەیت بە لاالە الا الله) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لە ترسی کوشتن وتی، فەرمووی(فمن لك یا اسامة بلاالە الا الله) سوێند بەوەی پێغەمبەری(ﷺ) بە حەق ناردووە هێندەی دووبارەکردەوە لەسەرم تائەوەی حەزم دەکرد موسڵمانبوونم ئەو کات بوایە بەڵام نەمکوشتایە، وتی: بەڵێن بە خوا دەدەم هەرگیز کەسێك نەکوژم کە بڵێت: لاالە الا الله، فەرمووی(دوای من ئەی ئوسامە!)(بعدي یا اسامة) وتم: دوای تۆیش.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: من و یەکێ لە پشتیوانان چووین بۆ مرداسی کوڕی نوهەیك، کە شمشێرمان لە ڕوودا هەڵکرد وتی: اشهد ان لااله الا الله بەڵام ئێمە کوشتمان، کە چووینەوە خزمەت پێغەمبەر – وەك فەرموودەکەی ئیبن ئیسحاق دەیهێنێت – هەروەها ئەبوداودو نەسائی و تەحاوی و ئەبوعودانەو ئیبن حیببان و حاکم و جگە لەویش هێناویانە، لە فەرموودەکەیاندا هاتووە پێغەمبەر فەرمووی(وتي لاالە الا الله و کوشتت ؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لە ترسی چەکەکە وتی: فەرمووی(فلا شققت عن قلبه حتى تعلم من اجل ذالك قالها ام لا؟ من لك بلاالە الا الله یوم القیامة؟) واتە(ئایا

[1] – لە البدایە والنهایە ج٤ ص٢٢٢ دا واهاتووە.

سنگیت لەت کردبوو تا بزانیت ئایا لەبەرئەوە وتی یان نا؟ لە ڕۆژی دواییدا چی دەکەیت بەو لااله الا الله یە ؟) بەردەوام دووبارەی دەکردەوە تائەوەی حەزم دەکرد ئەو ڕۆژە موسڵمان بوومایە[1].[2]

دولابی و ئیبن مندەو ئەبونەعیم لە بیکری کوڕی حارسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: من لەناو سریەیەکدا بووم کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردی، ئێمەو بێباوەڕان کەوتینە شەڕەوە، دام بەسەر یەکێ لە بێباوەڕاندا، کابرا هاواری موسڵمانبوونی کردو منیش کوشتم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ئەمەی بیستەوەو لێم تووڕەبوو و کەناری لێگرتم، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند(وماكان لمؤمن ان يقتل مؤمنا...)[3] ئەو کات پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕازیبوو و نزیکی کردمەوە.[4]

ئەبویەعلا لە عوقبەی کوڕی خالیدی لەیسیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سریەیەکی ناردو سریەکە دای بەسەر خەڵکێکدا، یەکێکیان ڕایکرد و یەکێ لە کەسەکانی سریەکە بە شمشێرەکەی دەستیەوە چوو بەدوایدا،یەکێ لە خەڵکەکە وتی: من موسڵمانم من موسڵمانم، بەڵام ئەو گوێی نەدا بە قسەکەی و لێیدا و کوشتی، ئەمەیان باسکرد بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش قسەیەکی توندی لەسەر کرد، ئەم قسەیەکە گەیشتەوە بە بکوژەکە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتاری دەفەرموو کە بکوژەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ترسی کوشتن ئەوەی وت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕووی لادا لەو و لەوانەی لەو ڕووەوەبوون و درێژەی دا بە وتارەکەی، دواتر هەمان شتی وتەوەو هەمان شت ڕویدایەوە، کابرا خۆی نەگرت و سێیەم جاریش وتیەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە بێزاری نواندن بە ڕوخساریەوە

---

[1] – صحيح.

[2] – لە كنز العمال ج١ ص٧٨ دا واهاتووە، بەیهەقیش ج٨ ص١٩٢ هێناویەتی.

[3] – النساء ٩٢.

[4] – لە كنز العمال ج٧ ص٣١٦ دا واهاتووە.

ڕوویتێکردو فەرمووی:ان الله عز وجل ابی علي ان اقتل مؤمنا) واته (خوای گەورە ڕێی نەداوم باوەڕدار بکوژم)سێ جار فەرمووی[1][2].

بەزار لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سریەیەکی ناردو تیایدا میقدادی کوڕی ئەسوەد(رضي الله عنه) هەبوو، کە گەیشتنە لای خەڵکەکە سەیریانکرد بڵاوەیان کردووەو کەسێك کە سامانی زۆری هەبوو مابوویەوە، وتی: اشهد ان لااله الا الله، میقداد چوو بۆیو کوشتی، یەکێك لە هاوەڵان وتی: کەسێك دەکوژیت کە شایەتی هێنا؟ بەخوا دەبێت ئەمە باس بکەم بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، کە چوون بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکی وا ڕوویداوە، فەرمووی(ادع لي المقداد! يا مقداد اقتلت رجلا يقول لااله الا الله؟ فكيف لك بلااله الا الله غدا؟) واته(میقدادم بۆ بانگ بکە، ئەی میقداد کەسێکت کوشت کە وتی: لااله الا الله؟ ئەی میقداد سبەینێ چی دەکەیت بە لااله الا الله؟) خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند(يا ايها الذين امنوا اذا ضربتم...... كنتم من قبل)[3] پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە میقدادی فەرموو(کەسێکی باوەڕدارت کوشت کە لەگەڵ خەڵکێکی بێباوەڕدا ئیمانەکەی خۆی شاردبوویەوە تۆ کوشتت، تۆ پێشتر خۆیشت لە مەککە وابوویت)[4][5].

---

[1] - صحيح.

[2] - هەیسەمی ج٧ ص٢٩٣ دەڵێت: ئەبویەعلا و ئەحمەد بە کورتی هێناویانە، بەڵام دەڵێت: لەبری عوقبەی کوڕی خالید عوقبەی کوڕی مالیك بووە، تەبەرانی بە دوورو درێژی هێناویەتی، کەسەکانی سەنەدەکەشی صەحیحن جگە لە بەشیری کوڕی عاصم کە جێی متمانەشە، تەواو. نەسائیو بەغەویو ئیبن حیببان لە عوقبەی کوڕی مالیکەوە هێناویانە، لە الاصابە ج٢ ص٤٩١ دا هاتووە، خەتیب لە المتفق والمفترق) هێناویەتی، لە کنز العمال ج١ ص٧٩ دا هاتووە، بەیهەقفی ج٩ ص١١٦ و ئیبن سەعد ج٧ ص٤٨ لە عوقبەی کوڕی مالیکەوە بەو جۆرە هێناویانە.

[3] - النساء: ٩٤.

[4] - صحيح.

[5] - هەیسەمی ج٧ ص٩ بەزار بە سەنەدی جەیید هێناویەتیودەڵێ تەبەرانی و دارقوتنیش هێناویانە.

ئیبن ئیسحاق لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی حەردەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە دەستەیەکی موسڵمانانەوە ناردینی بۆ(ئیزەم)، لەو موسڵمانانە ئەبوقەتادە حارسی کوڕی ربعی تێدا بوو لەگەڵ موحەلمی کوڕی جوسامەی کوڕی قەیس(رضي الله عنه) چووین تا گەیشتینە ئەوێ عامری کوڕی ئیزبەتی ئەشجەعی بە سواری ولاخێکەوە(وشترێك) کە کۆڵێکی پێبوو لەگەڵ قاپێ شیردا دای بەلاماندا، سەلامی ئیسلامی لێکردین، ئێمەش دەستمان لێهەڵگرت و موحەلم چوو بۆی و کوشتی لەبەر کێشەیەك کە لە نێوانیاندا هەبوو و وشترو شتەکەشی برد، کە چووینەوە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێمان وت چی بووە تا ئەم ئایەتەمان لەسەر دابەزی(یا اها الذین امنوا اذا ضربتم... خبیرا)[1][2].

عەبدولڕەزاق و ئیبن عەساکیر لە قوبەیسەی کوڕی زوئەیبەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دای بەسەر دەستەیەکدا کە شکابوو، یەکێ لە بێباوەڕان کە شکابوو کەوتە بەردەستی، کە ویستی بە شمشێرەکەی لێی بدات کابرا وتی: لااله الا الله، بەڵام ئەو هەر کوشتی، کابرا دڵی لە خۆی کرمۆبوو و چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: شتێ لەو جۆرە ڕوویداوە و کابرا لە ترساندا وتی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(فهلا شققت عن قلبه؟ فانما یعبر عن القلب باللسان) واتە(مەگەر دڵیت لەت کردبوو؟ بەڵکو زمان دەربڕی دڵە) هێندەی نەبرد تا ئەو بکوژە مرد و نرایە ناو خاك و زەوی فڕێی دایەوە، خزمانی ئەمەیان وت بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بیکەنەوە ژێر خاك) ئەوانیش وایانکردەوە و هەمووی وا ڕوویدا و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ان الارض ابت ان تقبله فاطرحوه في غار من الغیران) (زەوی ئامادەنیە لە خۆی بگرێت، فڕێی بدەنە ناو یەکێ لە ئەشکەوتەکان)[3].

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەحمەدیش لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٤ ص٢٢٤ یشدا واهاتووە، تەبەرانیش واهێناویەتی، هەیسەمی ج٧ ص٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، بەیهەقی ج٩ ص١١٥ و ئیبن سەعد ج٤ ص٢٨٢ بەو جۆرە هێناویانە.

[3] – لە کنز العمال ج٧ ص٣١٦ دا واهاتووە.

ئیبن ئیسحاق لە ئەبوجەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە کاتی فەتحی مەککەدا خالیدی کوڕی وەلیدی وەك بانگخواز نارد نەوەك بۆ جەنگ، هەندێ لە هۆزەکانی عەرەبی لەگەڵدابوو لەگەڵ سەلەیمی کوڕی مەنسوور و مودلجی کوڕی مورە، چووین بۆ بەنی جوزەیمەی کوڕی عامری کوڕی عەبدمەناتی کوڕی کینانە، کە خەڵکەکە بینییان چەکیان هەڵگرت، خالید وتی: چەك دانێن چونکە خەڵکی موسڵمان بوون، کە چەکیان دانا خالید فەرمانی کرد دەستیان بەستنەوەو دوایی دەستی لێنەگرتنەوە، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بیست دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو دواتر فەرمووی(اللهم اني ابرا اليك مما صنع خال بن الوليد) واتە(خوایە من پەنادەگرم بە تۆ لەوەی خالیدی کوڕی وەلید کردی) پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عەلی کوڕی ئەبوتالیبی(رضي الله عنه) بانگکردو فەرمووی (يا علي اخرج الى هؤلاء القوم فانظر في امرهم واجعل امر الجاهلية تحت قدميك) واتە(ئەی عەلی بڕۆ بۆ لای ئەوانە بزانە باریان چۆنەو باری نەفامی بخەرە ژێر پێت) عەلی چوو بۆ لایان و سامانێکی پێبوو کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دابوویە دەستی لەبری خوێن و ئەو سامانەی لەدەستیان دابوو پێیدانەوە تەنانەت قەرەبووی جامی ئاوخواردنەوەی سەگیشی کردەوە تا وتیان: نا، وتی: دەی ئەم زیادەیەشتان پێدەدەم لەبری ئەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئێوەش پێی نازانن(ئەو زیانەی کە لە بیرتان نەبووبێت) ئینجا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەواڵی پێدا، ئەویش فەرمووی(اصبت و احسنت) واتە(پێکات و چاکت کرد) پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا و ڕوویکردە ڕووگەو دەستەکانی بەرزکردەوە تا بنباڵەکانی دەرکەوتن فەرمووی(اللهم اني ابرا اليك مما صنع خالد بن الوليد) سێ جار ئەوەی فەرموو.[1]

---

[1] – ضعيف.

ئەحمەد لە فەرموودەکەی ئیبن عومەرەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی(ر) نارد بۆ جوزەیمەو بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش جوان نەیانوت موسڵمان بووین، دەیانوت(صبانا صبانا) خالیدیش کەوتە گرتن و کوشتنیان، بۆ هەرکاممان دیلێکی دایە دەستمان، کە بەیانی بوویەوە خالیدی فەرمانی کرد هەرکەسەو دیلەکەی بکوژێت، ئیبن عومەر وتی: وتم بەخوا منو هیچکام لە هاوەڵانیشم دیلەکانمان ناکوژین، چوونەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: خالید چی کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) دەستەکانی بەرزکردەوەو فەرمووی(اللهم اني ابرا اليك مما صنع خالد) دووجار ئەمەی فەرموو، بوخاری و نەسائیش بەو جۆرە لە فەرموودەکەی عەبدولڕەزاقەوە هێناویانە، ئیبن ئیسحاق دەڵێت: خالیدو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کێشەیەکیان لە نێواندا هەبوو، عەبدولڕەحمان پێی وت: کاری نەفامیت لەناو ئیسلامدا گرتەبەر، وتی: تۆڵەی باوکت کردەوە، عەبدولڕەحمان وتی: درۆدەکەیت من بکوژی باوکی خۆمم کوشت بەڵام تۆ تۆڵەی مامت دەکەیتەوە فاکیهی کوڕی موغیرە تا کێشە کەوتە نێوان هەردووکیان، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بیستەوەو فەرمووی(مهلا يا خالد دع اصحابي فوالله لوكان احد ذهبا ثم انفقته في سبيل الله ما ادركت غدوة رجل من اصحابي ولا روحته) واتە(لەسەرخۆبە خالید واز لە هاوەڵانم بهێنە، چونکە سوێند بەخوا ئەگەر ئوحود زێڕبێت دواتر لە ڕێی خوادا بیبەخشیت ناگەیت بە هەنگاوێك و تۆزی هەنگاوێکی یەکێ لە هاوەڵانمدا)[1][2].

ئەبوداود لە صەخری ئەحمەسیەوە(ر) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵمەتی بردە سەر سەقیف، کە صەخر ئەوەی بیست سواری ئەسپێ بوو تا بگاتە خەمەت پێغەمبەر(ﷺ)، سەیری کرد پێغەمبەریش(ﷺ) فەتحکردنی بەجێهێشتووە،

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البدايه والنهايه ج٤ ص٣١٣ دا واهاتووە.

صەخر ئەو ڕۆژ بەڵێنی دابوو ئێرە بەجێنەهێڵم تا بچینە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەوەشی کرد، صەخر بۆی نووسی: پاشان ئەی پێغەمبەری خوا سەقیف ڕازین بە حوکمی تۆ منیش دەیانهێنم بۆ لات بە ئەسپەکەمەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانیکرد نوێژبکەن، دە نزای بۆ ئەحمەس کرد(اللهم بارك لاحمس في خيلها و رجالها)(خوایە بەرەکەت بخەرە ئەسپ و سەربازانی ئەحمەسەوە) خەڵکەکە هاتن و موغیرەی کوڕی شوعبە قسەی کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صەخر پووری منی بردووەو پووریشم چووەتە ناو باری موسڵمانان، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) صەخری بانگکردو فەرمووی(ئەی صەخر خەڵکی کە موسڵمان بوون خوێن و سامانیان قەدەغەیە، بۆیە پووری موغیرە بگێڕەوە بۆی) ئەویش گێڕایەوەو داوای ئاوی بەنی سەلیمی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کرد کە لە دەست ئیسلام ڕایانکردبوو و ئەو ئاوەیان بەجێهێشتبوو، وتی: پێغەمبەری خوا خۆم و هۆزەکەم لەوێ دابنێ، فەرمووی: بەڵێ، لەوێ داینا، ئەسلەمیەکان موسڵمان بوون و هاتن بۆ لای صەخر و داوایانکرد صەخر ئاوەکەیان پێبدات بەڵام ئەو ئامادە نەبوو، چوون بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا موسڵمان بووین و هاتووین بۆ لای صەخر ئاومان ناداتێ فەرمووی(يا صخر ان القوم اذا اسلموا احرزوا اموالهم و دمائهم فادفع اليهم مائهم)(ئەی صەخر خەڵکی کە موسڵمان بوون سامان و خوێنیان دەپارێزن دەی ئاوەکەیان بدەرەوە) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، سەیرم کرد پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕەنگی سوور هەڵگەڕا لەبەرئەوەی کەنیزەکەکەو ئاوەکەشی لێسەندەوە.[١][٢]

---

[١] – ضعيف.

[٢] – ئەبوداود بە تەنها هێناویەتی و لە سەنەدەکەیدا ناکۆکی هەیە، لە البدايه والنهايه ج٤ ص٣٥١ دا هاتووە، ئەحمەدو دارمی و ئیبن راهەویەو ئیبن ئەبی شەیبەو تەبەرانی هێناویانە، لە نصب الرايه ج٣ ص٤١٢دا هاتووە، فریابی لە موسنەدەکەیدا و بەغەوی و ئیبن شاهین و بەیهەقی ج٩ ص١١٤ هێناویانە، لە الاصابه ج٢ ص١٨٠ دا هاتووە.

# (دوورگرتن لە کوشتنی موسڵمانان و خراپی شەڕکردن لەسەر دەسەڵات)

ئەحمەد و دارمی و تەحاوی و تەیالیسی لە ئەوسی کوڕی ئەوسی سەقەفیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لامان و ئێمەش لەناو گومەزی مزگەوتی مەدینەدا بووین، کابرایەك هات بۆ لای و چپەیەکی بۆ کرد نەمانزانی چی وت، فەرمووی(بڕۆ پێیان بڵێ بیکوژن) پاشان بانگیکرد و فەرمووی(لعله یشهد ان لااله الا الله)(لەوانەیە شایەتی لااله اله الا الله بدات) کابرا هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: بەڵێ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اذهب فقل لهم یرسلوه فاني امرت ان اقاتل الناس حتى یشهدوا ان لااله الا الله واني رسول الله) واتە(بڕۆ بڵێ بینێرن، چونکە من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵك بجەنگم تا شایەتی دەدەن هیچ پەروەردگارێك نیە جگە خوا و منیش پێغەمبەری خوام).[1]

عەبدولڕەزاق و حەسەنی کوڕی سوفیان لە عەبدوڵلای کوڕی عەددی ئەنساریەوە هێناویانە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەنێو خەڵکدا دانیشتبوو کە پیاوێك هات بۆ لای و داوای لێکرد سەبارەت بە کوشتنی یەکێ لە دووڕووەکان چپەی بۆ بکات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ قسەکەی فەرمووی(الیش یشهد ان لااله الا الله) واتە(مەگەر شایەتی لااله الا الله نادات؟) وتی: بەڵێ، شایەتی بۆ نی یە، فەرمووی(مەگەر شایەتی نادات من پێغەمبەری خوام؟) وتی: بەڵێ و شایەتی بۆ نی یە، فەرمووی: مەگەر نوێژ ناکات؟ وتی: بەڵێ و نوێژی بۆ نی یە، فەرمووی(اولائك الذین نهیت عنهم) واتە(ئەوانە ئەوانەن کە ڕێگریم لێکراوە لێیان)[2][3].

[1] – صحیح.

[2] – صحیح.

[3] – لە کنز العمال ج١ ص٧٨ دا واهاتووە.

ئەحمەد لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(یەکێ لە هاوەڵانمم بۆ بانگ بکەن) وتم: ئەبوبەکر؟ فەرمووی: نا، وتم: عومەر؟ فەرمووی: نا، وتم: عەلی ئامۆزات؟ فەرمووی: نا، وتم: عوسمان؟ فەرمووی بەڵێ، کە هات فەرمووی نزیك بەرەوە، چپەی بۆ کردو ڕەنگی عوسمان دەگۆڕا، لە ڕۆژی گەمارۆی عوسماندا وتمان ئەی ئەمیری باوەڕداران شەڕناکەیت؟ وتی: نا چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ڕایسپاردم بە شتێ و منیش لەسەری خۆڕاگرم[1].[2]

ئەحمەد لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی عوسمان گەمارۆ درابوو ڕوویکردە هاوەڵانی و وتی: لەسەر چی دەمکوژن؟ من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(لایحل دم امرئ الا باحدی ثلاث رجل زنی بعد احصانه فعلیه الرجم او قتل عمدا فعلیه القود او ارتد بعد اسلامه فعلیه القتل) واتە(خوێنی کەس ڕەوا نی یە تەنها بەسێ شت نەبێ، کەسێك پاش هاوسەرگیری زینا بکات ڕەجمی لەسەرە، یان دەست ئەنقەست کەسێ بکوژێ تۆڵەی لەسەرە، یان پاش موسڵمانبوونی هەڵگەڕێتەوە کوشتنی لەسەرە) سوێند بەخوا لە سەردەمی نەفامی و موسڵمانیشمدا زینام نەکرد کەسیشم نەکوشتووە تا تۆڵەم لێ بکەنەوە، لەو کاتەوەش شایتومانم هێناوە وازم لە ئیسلام نەهێناوە[3].[4]

هەروەها ئەحمەد لە ئەبی ئومامەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عوسمان(ﷺ)دابووم کە گەمارۆ درابوو، دەچووینە دەروازەیەك و دەنگێکی

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەحمەد بە تەنها هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٧ ١٢٨١ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص٤٦ لە ئەبی سەهلەوە بەو واتایەو بە دوورو درێژتر هێناویەتی و ئەوەش زیاد دەکات: ئەبوسەهلە وتی: پێیان وایە ئەو ڕۆژەیە.

[3] – صحیح.

[4] – نەسائی هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٧ ص١٧٩.

سەرووی(البلاط)[1]مان دەبیست، ڕۆژێك عوسمان بۆ پێویستی خۆی هاتە ژوورەوەو لای ئێمە دەرچوو و ڕەنگی گۆڕابوو، وتی: ئەوانە بەمزوانە دەنەونە کوشتار، وتمان: ئەی ئەمیری باوەڕداران خوا بەسە بۆیان! وتی: بۆچی دەمکوژن؟ من گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو(خوێنی کەسی موسڵمان ڕەوا نی یە بەبێ یەکێ لەم سێ شتە: کەسێ پاش موسڵمانبوونی بێباوەڕبێت، یان پاش هاوسەرگیری زینا بکات، یان بەبێ ڕەوایی کەسێك بکوژێت) سوێند بەخوا لە سەردەمی نەفامیو ئیسلامیشدا زینام نەکردووەو لەو کاتەوەی خوا ڕێنموونی کردووم بۆ ئیسلام دڵم هیچ لایەکی دیکەی ناوێ و کەسیشم نەکوشتووە، ئیتر بۆچی دەمکوژن[2]؟[3] هەروەها لە ج٣ ص٤٩ لە ئەبی لەیلای کندیەوە دەڵێت: عوسمانم(رضي الله عنه) بینی گەمارۆ درابوو لە کونێکی حەوشەکەوە دەیڕوانیو دەیوت: ئەی خەڵکینە مەمکوژنو داوای تەوبەم لێبکەن سوێند بەخوا ئەگەر بمکوژن هەرگیز پێکەوە بە کۆ نوێژ ناکەنو یەکدەست دژ بە دوژمن جیهاد ناکەنو هێندە ناکۆك دەبن تا واتان لێدێت – نێوانی پەنجەکانی بڵاودەکردەوە – پاشان وتی: خەڵکینە ناکۆکیتان بۆم دوور نی یە واتان تووش بکات کە تووشی قەومی نووح یان قەومی هود یان قەومی صالح یان قەومی لووت بوو. ناردی بە دوای عەبدوڵڵای کوڕی سەلامدا(رضي الله عنه) و وتی: چۆنی دەبینی؟ وتی: دەست بگرەوە، دەست بگرەوە، چونکە تۆ بەڵگەخوازی باشترە بۆت.

ئەحمەد لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی لە کاتی گەمارۆدا چوو بۆ لای عوسمان(رضي الله عنه) و وتی: تۆ پێشەوای خەڵکیت و دەبینیت کەوتوویتەتە چ بارێکەوە، منیش سێ شت دەخەمە بەردەستت یەکێکیان هەڵبژێرە، یان دەرچۆ تا

---

[1] البلاط: شوێنێکە لە مەدینەدا.

[2] – صحیح.

[3] – چوار زانای سونە هێناویانە، ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنە، لە البدایە والنهایە ج٧ ص١٧٩ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص٤٦ لە ئەبی ئومامەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

لەگەڵیان بجەنگین چونکە ژمارەو هێزێکت لەگەڵدایەو تۆیش لەسەر حەق و ئەوانیش لەسەر باتڵن، یان دەرگایەکی جیا لەو دەرگایەی ئەوانی لەسەرن ببڕەو بڕۆ بۆ مەککە چونکە ئەگەر لەوێ بیت هەرگیز خوێنت حەڵاڵ ناکەن، یان خۆت بگەیەنەرە شام چونکە ئەوانە خەڵکی شامن و موعاویەش لە نێونیاندایە، عوسمان وتی: ئەگەر دەرچم و بجەنگم بۆ ئەمە نابمە یەکەم کەس لە دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەناو ئوممەتەکەیدا بکەوێتە خوێن ڕشتن، بۆ چوون بۆ مەککەش من لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم)بیستووە کە دەیفەرموو کەسێ لە قورەیش لە مەککە دەنێژرێ کە نیوەی سزای جیهانی لەسەرە منیش هەرگیز ئەوە نابم، بۆ شامیش کە موعاویەیان تێدایە من شوێنی کۆچ و دراوسێیەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چۆڵ ناکەم[1][2].

ئیبن سەعد ج٣ ص٤٨ و ئیبن عەساکیر لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژی گەمارۆدانی عوسمان(رضي الله عنه) چووم بۆ لای عوسمان و وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران کاتی شەڕە، وتی: ئەی ئەبوهورەیرە حەزدەکەیت هەموو خەڵك بکوژرێت و منیش لەلایەك؟ وتم: نا، وتی: دەی بەخوا ئەگەر یەك کەس بکوژرێت وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکت کوشتبێت. منیش گەڕامەوە و شەڕم نەکرد، لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٢٥ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص٤٩ لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی وتی: بە عوسمانم(رضي الله عنه) وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران لەناو ئەم بینایەدا خەڵکانێك هەن ئامادەن بە پاڵپشتی خوا بە ژمارە کەترن لەوان سەرت بخەن دەی مۆڵەتم بدە بەخوا دەجەنگم، وتی: بۆ خاتری خوا وریابە بەرامبەر کەسێ لەبەر من خوێنی بڕژێ یان وتی: لەبەر من هیچ خوێنێك

---

[1] – ضعيف.

[2]– لە البدايە والنهايە ج٧ ص١٢٠ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٧ ص٢٣٠ دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوە و کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن بەڵام موحەممەدی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان نەمبیستووە لە موغیرەی بیستبێت.

بڕژێت. هەروەها هێناویەتی وتم: لەگەڵیان بجەنگم بە خوا خوای گەورە شەڕی ئەوانی بۆ حەڵاڵ کردوویت، وتی: نە بەخوا هەرگیز لەگەڵیان ناجەنگم.

هەروەها لە ج٣ ص٤٨ لە عەبدوڵڵای کوڕی عامرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی وتی: لە ڕۆژی گەمارۆدانەکەدا عوسمان(رضي الله عنه) وتی: دەوڵەمەندترینتان بۆ من ئەوەیە دەستو چەکی دەگرێتەوە، هەروەها لە ج٣ ص٤٣ لە ئیبن سیرینەوە دەڵێت: زەیدی کوڕی سابت(رضي الله عنه) هات بۆ لای عوسمانو وتی: ئەوە پشتیوانانن لەبەردەرگادان دەڵێن ئەگەر دەتەوێت ئێمە پشتیوانی خواین، دووجار وتیان، عوسمان وتی: بۆ شەڕ ڕازی نیم.[1] هەروەها لە ج٣ ص٤٩ لە ئیبن سیرینەوە لە ڕۆژی گەمارۆدانەکەدا چوار سەد کەس لەگەڵ عوسمان بوون ئەگەر وازی لێ بهێنایە پشت بەخوا لێیان دەدان تا لە بەشەکانی شاردا دەریان دەکردن، لەوانە ئیبن عومەرو حەسەنی کوڕی عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر(رضي الله عنهم).

هەروەها ج٥ ص٢٣ لە عەبدوڵڵای کوڕی ساعدەوە(رضي الله عنه) دەڵێت: سەعیدی کوڕی عاص هات بۆ لای عوسمان(رضي الله عنه) و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تاکەی دەستمان دەگریتەوە وا ئێمەیان خوارد، ئەوانە هەیانە تیربارانمان دەکەن، هەیانە بەردبارانمان دەکەن، هەیانە شمشێری هەڵکردووە، دەی فەرمانمان پێ بکە، عوسمان وتی: بەخوا من نامەوێت لەگەڵیان بجەنگم ئەگەر شەڕیانم بویستایە هیوام وابوو ڕێیان لێبگرم، بەڵام دەیاندەمە دەست خواو ئەوەش دەدەمە دەست خوا کە دژ بە من گەرمی کردوون چونکە هەموومان دواتر دەچینەوە خزمەت پەروەردگارمان، بۆ شەڕیش سوێند بەخوا فەرمانی شەڕت پێ نادەم، سەعید وتی: سوێند بەخوا ئیتر دوای ئەمە لەسەر کەس پرسیارت لێ ناکەم، چوو شەڕی کرد تا برینێکی کوشندە تووشی سەری بوو.

---

[1] – ضعیف.

ئەحمەد لە عومەری کوڕی سەعد لە باوکیەوە هێناویەتی عامری کوڕی هات بۆ لای و وتی: بابەگیان خەڵکی شەڕدەکەن و تۆ لێرەدایت! وتم: کوڕی شیرینم لەسەر فیتنە فەرمانم پێ دەکەیت تا تیایدا بەشدارو گەورەبم؟ نەبەخوا تا شمشێرێکم پێ بدرێ ئەگەر پێی دام لە باوەڕدار نەیبڕی و دای لە بێباوەڕ بیکوژم، لە پێغەمبەرم(عليه السلام) بیست فەرمووی(ان الله يحب الغني الخفي التقي)واتە(خوای گەورە کەسی دەوڵەمەندی نادیارو شاراوەی لە خواترسی خۆش دەوێت).[1]

تەبەرانی لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی کاتێك سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(رضي الله عنه) پێی وترا ئایا شەڕ ناکەیت؟ تۆ لە ئەهلی شورایت و شیاوتری لە خەڵکی تر تا بجەنگیت؟ وتی: ناجەنگم تا شمشێرەکەم بۆ بێنن کە دوو چاو و دوو زمان و دوو لێوی هەبن باوەڕدارو بێباوەڕ بناسێت، من جیهادم کردووەو جیهاد دەزانم.[2] [3]

ئیبن سەعد ج٤ ص٤٨ لە ئیبراهیمی تەیمی لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئوسامەی کوڕی زەید(رضي الله عنه) وتی: هەرگیز لەگەڵ کەسێ ناجەنگم کە وتبێتی لاالە الا اللە، سەعدی کوڕی مالیکیش هەمان شتی وت، کەسێك بە هەردووکیانی وت: مەگەر خوا نافەرموێت(وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة و يكون الدين كله لله) وتیان: ئێمە جەنگاین تا فیتنە نەبێت، ئاینیش هی خوایە.[4]

---

[1]- لە البدایە والنهایە ج٧ ص٢٨٢ دا هاتووە ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٩٤ لە عومەری کوڕی سەعد لە باوکیەوە هێناویەتی کە پێی وتم: کوڕی شیرینم لەسەر فیتنە فەرمانم پێ دەکەیت......بەو جۆرە فەرموودەکەی هێناوە.

[2]- مرسل.

[3]- هەیسەمی ج٧ ص٢٩٩ دەڵێت: تەبەرانی بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی، ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٩٤ لە ئیبن سیرینەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، ئیبن سەعد ج٣ ص١٠١ لە ئیبن سیرینەوە بەو واتایە هێناویەتی.

[4]- ئیبن مەردەویە لە ئیبراهیمی تەیمی لە باوکیەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ ص٣٠٩ دا واهاتووە.

بوخاری ص٦٤٨لە نافع لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی لە فیتنەی سەردەمی ئیبن زوبەیردا(رضي الله عنه) دوو کەس هاتن بۆ لای و وتیان: خەڵکی لەناوچوون‌و تۆش ئەی ئیبن عومەرو هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆچی دەرناچیت؟ وتی: ناتوانم چونکە خوای گەورە خوێنی براکەمی لێ حەرام کردووم، وتیان: مەگەر خوا نافەرمووێت(و قاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين كله لله) وتی: شەڕمان لەگەڵ کردن تا فیتنە نەبێت‌و ئاینیش هی خوایە، ئێوە دەتانەوێت بجەنگن تا فیتنە هەبێت‌و ئایین بۆ جگە لەخوا بێت. عوسمانی کوڕی صالح لە ڕێگەی بەکیری کوڕی عەبدوڵڵا لە نافعەوە ئەوەی زیادکردووە یەکێ هات بۆ لای ئیبن عومەرو وتی: ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان بۆچی ساڵێ حەج‌و ساڵێ عەمرە دەکەیت‌و وازت هێناوە لە جیهادی ڕێی خوا خۆ دەزانیت خوای گەورە لەسەر جیهاد چەندە هانمان دەدات؟ وتی: برازاگیان ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیاد نراوە، باوەڕ بەخواو پێغەمبەرەکەی، پێنج نوێژەکەو ڕۆژووی ڕەمەزان‌و زەکات دان و حەجی کەعبە. وتی: ئەبوعەبدولڕەحمان مەگەر نابینیت خوا لە قورئاندا دەفەرموێت(وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فاصلحوا بينهما فان بغت... لاتكون فتة) وتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) ئەوەمان کردو ئیسلام خەڵکی کەم بوو، کەس هەبوو لە ئاینەکەیدا دەکەوتە فیتنەوە یان دەیانکوشت یان سزایان دەدا تا ئیسلام خەڵکی زۆر بوو ئیتر فیتنە نەما.وتی: ئەی سەبارەت بە عەلی‌و عوسمان(رضي الله عنهما) چی دەڵێیت؟ وتی: بۆ عوسمان خوای گەورە لێی خۆش بێت‌و ئێوە حەزتان نەدەکرد خوا لێی خۆش بێت، بۆ عەلیش ئامۆزاو زاوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە دەستیشی ئاماژەی کرد ئەوەی دەیبینن ماڵەکەیەتی.[1]

بوخاریش لە ڕێگەی نافعەوە لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی کەسێك هات‌و وتی: ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان مەگەر فەرمانی خوا لە قورئاندا بەجێ ناگەیەنیت(وان

[1]– بەیهەقی ج٨ ص١٩٢ لە ڕێگەی نافعەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

طائفتان...) ئیتر بۆچی شەڕناکەیت؟ وتی: برازاگیان بەو ئایەتە خۆم لادەدەم‌و جەنگ ناکەم، حەزناکەم بەر ئەو ئایەتە بکەوم کە خوای گەورە دەفەرموێت(ومن یقتل مؤمنا متعمدا...) وتی: خوای گەورە دەفەرموێت(وقاتلوهم حتی لاتکون فتنة) ئیبن عومەر وتی: کردمان – هەمان فەرموودەی پێشوو دێنێت – هەروەها لە ڕێگەی سەعیدی کوڕی جەبەیرەوە دەڵێت وتی: دەزانیت فیتنە چی یە؟ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ بێباوەڕان دەجەنگاو چوونە ناویان فیتنە بوو جەنگی ئێوە نەبوو کە لەسەر دەستەڵاتە.[1]

بەیهەقی ج٨ ص١٩٢ لە ئەبولعالیە بەرائەوە هێناویەتی ڕۆژێك عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان(ﷺ) لە حیجردا دانیشتبوون، ئیبن عومەر(ﷺ) دای بەلایانداو تەوافی دەکرد، یەکێکیان بەوی دیکەی وت: کەس دەبینی لەم چاکتر بێت و مابێت؟ پاشان بە کەسێکی وت: ئەگەر تەوافەکەی تەواوکرد بانگی بکە بۆ لامان، کە لێبوویەوە دوو ڕکات نوێژی کرد نێردراوەکەیان هات بۆ لای‌و وتی: ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان بانگت دەکەن، ئەویش چوو بۆ لایان، عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان وتی: ئەبوعەبدولڕەحمان بۆچی بەیعەت نادەیت بە ئەمیری باوەڕداران – ئیبن زوەبەیر – وا خەڵکی مەککەو مەدینەو یەمەن(العروض) و عێراق‌و جەواوەری شام بەیعەتیان پێداوە، وتی: بەخوا بەیعەتتان پێ نادەم لە کاتێکدا شمشێرەکانتان لەسەر شان داناوەن‌و دەستتان تێکەڵە بە خوێنی موسڵمانان. ئەبونەعیم لە الحلیه ج١ ص٢٩٣ لە حەسەنەوە(ﷺ) هێناویەتی وتی: لە مەسەلەی فیتنەدا خەڵکی هاتن بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ﷺ) و وتیان: تۆ گەورەی خەڵك‌و کوڕی گەورەی خەڵکیت، هەموو پێت ڕازین دەرچۆ تا بەیعەتت پێ بدەین، وتی: نەبەخوا نابێت کەس لەسەر من مشتێ خوێن بڕێژێ‌و لەبەر من گیانی دەرچێ. دەڵێت: دواتر

[1]– لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ ص٣–٨ دا واهاتووە.

هێنراو ترسێنراو پێی وترا یان دەردەچیت یان لەسەر جێگەکەت دەکوژرێیت، ئەویش هەمان قسەی کردەوە، حەسەن دەڵێت: سوێند بەخوا مویەکیان لێ کەم نەکردەوە تا گەیشتەوە بە پەروەردگاری.[1]

ئیبن سەعد ج٤ ص١١١ لە خالیدی کوڕی سومەیرەوە هێناویەتی بە ئیبن عومەر(رضي الله عنه) وترا: بۆچی باری خەڵك ڕێك ناكەیتەوە خەڵكی هەموویان بە تۆ ڕازین؟ ئەویش پێی وتن: ئەگەر کەسێك لە ڕۆژهەڵات لایدا؟ وتیان: هەرکەس لایدا دەکوژرێت، کوشتنی کەسێك لە بەرژەوەندی موسڵماناندا چی تیایە، وتی: سوێند بەخوا حەزناکەم ئەگەر ئوممەتی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)دەستی ڕمێك بگرن و منیش دەسکەکەی بگرم و کەسێك لە موسڵمانان بکوژرێت بەرامبەر بەوە دونیا و چی تیادا هەیە بۆ من بێت.

ئیبن سەعد ج٤ ص١١١ لە قەتەنەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای ئیبن عومەر(رضي الله عنه) و وتی: کەس لە تۆ زیاتر خراپەی ئوممەتی موحەممەدی ناوێ. وتی: بۆ چی؟ بەخوا خوێنیانم نەڕشتووە و دووبەرەکیم تێ نەخستوون و سەرکەش نەبووم، وتی: ئەگەر بتویستایە کەس لەسەر تۆ ڕاجیا نەبوو، وتی: ئایا حەزبکەم وابێت و یەکێ بێت و بڵێ ناو ئەوی دی بێت و بڵێ بەڵێ؟!.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٩٤ لە قاسمی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە دەڵێت: لە فیتنەی یەکەمدا بە ئیبن عومەریان وت: ئەرێ ناچی بۆ شەڕ؟ وتی: من شەڕم کرد و بتەکان لە نێوان ڕوکن و دەرگادا بوون تا خوای گەورە لە خاکی عەرەب دەریکردن، من حەزناکەم لەگەڵ کەسێ بجەنگم کە دەڵێت: لااله الا الله، وتیان: بەخوا ئەمە ڕای تۆ نی یە بەڵام دەتەوێت هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یەکدی لەناوببەن و کە هیچ کەسیان نەما بڵێن بەیعەت بدەن بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر تا ببێتە ئەمیری باوەڕداران. وتی: سوێند بەخوا ئەوەم ناوێت بەڵام ئەگەر بڵێن(حي علی الصلاة)

[1] – ئیبن سەعد ج٤ ص١١ لە حەسەنەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

دێم بەدەم هاوارەکەتانەوە، بڵێن(حي على الفلاح) دێم بەدەم هاوارەکەتانەوە، بەڵام کە ناکۆك و دووبەرەك بوون کۆتان ناکەمەوە و بەشدارتان نابم و ئەگەریش یەکدەنگ بن نابمە هۆی جیاوازی و لێتان جیانابمەوە.

نافع هێناویەتی لە سەردەمی ئیبن زوبەیردا کە خەواریج و خەشەبیە هەبوون بە ئیبن عومەر وترا: ئەرێ لەگەڵ ئەوانە نوێژ دەکەیت و کەچی ئەوان لە یەکتر دەکوژن؟ وتی: هەرکەس بڵێ: حي على الصلاة دەچم بەدەمیەوە هەرکەس بڵێ حي على الفلاح دەچم بە دەمیەوە، هەرکەس بڵێ وەرە بۆ کوشتنی برا موسڵمانەکەت و سامانی ببە دەڵێم: نا.[1]

حاکم ج٣ ص١٧٥ لە ئەبولعریفەوە هێناویەتی دەڵێت: لە پێشەوەی ریزی حەسەنی کوری عەلیدا(رضي الله عنه) دوانزە هەزار کەس بووین و شمشێرەکانمان بۆ شەری خەڵکی شام بزیسکەیان دەداو ئەبولعەمتەرەمان لەسەر بوو(سەرکردەمان بوو) کە رێککەوتنی حەسەن و موعاویە هات وەك ئەوەی پشتمان بشکێت وابوو، کە حەسەنی کوری عەلی هات بۆ کوفە یەکێ لە ئێمە کە پێی دەوترا ئەبوعامر سوفیانی کوری لەیل وتی: سەلامت لێ بێت ئەی سەرشۆرکەری موسڵمانان. حەسەن وتی: ئەبوعامر وا مەڵێ من هەرگیز باوەرِدارانم سەرشۆر نەکردوو، بەڵام حەزم نەکردووە لەپێناو دەستەڵاتدا بجەنگم.[2]

ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج١ ص٣٧٤ لە شەعبیەوە دەڵێت: لە رێککەوتنی حەسەن و موعاویەدا(رضي الله عنهما) موعاویە پێ وت: هەستە وتاربدە بۆ خەڵك و باسی باری خۆت بکە بۆیان، حەسەن هەستاو وتی:(سوپاس بۆ ئەو خوایەی یەکەمەکانی ئێوەی بۆ هۆی ئێمەوە رێنموونی کردو ئەوانی دواترتانی بە هۆی

[1] – ئیبن سەعد ج٤ ص١٢٥ لە نافعەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

[2] – ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج١ ص٣٧٢ دا بە هەمان شێوە هێناویەتی. خەتیبی بەغدادی هێناویەتی و لە البدایە والنهایە ج٨ ص١٩ یشدا هاتووە.

ئێمەوە لە خوێن ڕژان پاراست، بزانن ژیرترین کەس لە خوا ترسانن، پەککەوتەترینەکانیش لادەرانن، ئەم بارەی کە منو موعاویە لەسەری ناکۆکین یان من پێی شیاوترم یان ئەو شیاویەتی، بەجێمان هێشت لەبەر خواو لەرژەوەندی ئوممەتی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)و خوێن نەڕژانیان. پاشان لایکردەوە بەلای موعاویەداو وتی: وایدەبینم تاقیکردنەوەیەك بێت بۆتانو حەسانەوەیەکی کاتی بێت، پاشان دابەزیو عەمر بە موعاویەی وت: تەنها ئەم قسانەم ویست.[1]

حاکم ج٣ ص١٧٠ لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بە حەسەنی کوڕی عەلیم وت: خەڵکی دەڵێن تۆ خیلافەتت دەوێت، وتی: گەورەکانی عەرەب لە دەستمدا بوون شەڕیان دەکرد لەگەڵ ئەوەی کە من لەگەڵی بجەنگم و ئاشتییان لەگەڵ ئەوەبوو کە من لە پێناو خوادا و بۆ پاراستنی خوێنی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)گرتمەبەر، پاشان بەناحەزی بۆ بێهیوایی ئەهلی حیجاز شتێکی هەڵگرت، حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە لە سەر مەرجی بوخاریو موسلیم صەحیحەو خۆیان نەیانهێناوە و زەهەبی لەسەری کۆکە.

ئەبویەعلا لە عامری شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك مەڕوان لەگەڵ زوحاکی کوڕی قەیس جەنگا ناردی بە دوای ئەیمەنی کوڕی خوزەیمی ئەسەدیدا و وتی: ئێمە حەزدەکەین لەگەڵمان بجەنگێت، وتی: باوکمو مامم شەهیدی بەدرن و ڕایانسپاردوم تا لەگەڵ کەسێك نەجەنگم شایەتی لااله الا الله بدات، ئەگەر بەڵێنی دووری دۆزەخم پێدەدەیت با لەگەڵت بجەنگم، وتی: بڕۆ، کێشەی لەگەڵ دروست بوو و قسەی پێ وت، ئەیمەنیش ئەم شیعرەی وت:[2]

---

[1] - حاکم ج٣ ص١٧٥و بەیهەقی ج٨ ص١٧٣ لە شەعبیەوە هێناویانە.

[2] - صحیح.

و لست مقاتلا رجلا يصلي على سلطان اخر من قريش
اقاتل مسلما في غير شيء فليس بنافعي ما عشت عيشي
له سلطانه و علي اثمي معاذ الله من جهل و طيش[1]

تەبەرانی لە ئیبن عەبدولحەکەمی کوڕی عەمری غیفاریەوە هێناویەتی دەڵێت: باپیرم بۆی گێڕامەوە وتی: من لای حەکەمی کوڕی عەمر(رضي الله عنه) بووم کە نێردراوی عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) هات بۆ لایو وتی: تۆ لە هەموان شیاوتری تا لەم کارەدا یارمەتیمان بدەیت، ئەویش وتی: لە خۆشەویستم ئامۆزاکەت(موحەممەد) م بیستووە دەیفەرموو(اذا كان هكذا او مثل هذا اتخذ سيفا من خشب) واتە(ئەگەر وابوو یان وەك ئەوە بوو شمشێرێکی تەختە هەڵبگرە) منیش وامکردووە[2][3].

بەزاز لە ئەبی ئەشعەسی صەنعانیەوە هێناویەتی دەڵێت: یەزیدی کوڕی موعاویە ناردمی بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا(رضي الله عنه) هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەریشم لەگەڵدا بوو، وتم: فەرمانی چی بە خەڵك دەکەن؟ وتی: ئەبولقاسم(صلى الله عليه وسلم) وەسیەتی بۆ کردم ئەگەر بە بارێکی وا گەیشتم بچم بۆ ئوحودو شمشێرەکەم بشکێنمو لەماڵەوە دابنیشم، ئەگەر کەس هاتەژوورەوە بۆم وتی: لە حوجرەکەتدا دابنیشە ئەگەر کەس هات بەسەرتدا لەسەر ئەژنۆ دابنیشەو بڵێ

[1]- هەیسەمی ج٧ ص٢٩٦ دەڵێت: ئەبویەعلاو تەبەرانی بەو جۆرە هێناویانە بەڵام دەڵێت: لەگەڵ کەسێك ناجەنگم کە نوێژ دەکات کەسەکانی سەنەدی ئەبویەعلا صەحیحن جگە لە زەکەریای کوڕی یەحیای ڕەحمەویە کە جێ متمانەیە، تەواو. بەیهەقی ج٨ ص١٩٣ لە قەیسی کوڕی ئەبی حازم و شەعبیش بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٧ ص٣٠١ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و لە سەنەدەکەیدا کەسی وا هەیە کە نایناسم.

تاوانی خۆم و خۆت ببەو دۆزەخی بە، ئەوە پاداشتی ستەمکارانە، منیش شمشێرەکەمم شکاندووەو هەرکەس هات بەسەرمدا وادەکەمو وا ئەڵێم[1].[2]

تەبەرانی لە موحەممەدی کوڕی مەسلەمەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اذا رايت الناس يقتلون على الدنيا فاعمد بسيفك على اعظم صخرة في الحرة فاضربه بها حتى ينكسر ثم اجلس في بيتك حتى تاتيك يد خاطئة او منية قاضية) واتە(ئەگەر بینیت خەڵك لەسەر دونیا دەجەنگن شمشێرەکەت ببە بۆ گەورەترین بەردی ناوچەکە(الحرة) و پێی لێیدە تا دەشکێت ئینجا لە ماڵەکەتدا دابنیشە تا دەستێکی هەڵەکار یان مەرگی لەناوبەر دێت بۆت) منیش وامکردووە، هەیسەمی ج٧ ص٣٠١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن.

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٠ لە موحەممەدی کوڕی مەسلەمەوە دڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شمشێرێکی پێدام و(فەرمووی ئەی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بەم شمشێرە لە ڕێی خوادا جیهاد بکە تا ئەوەی ئەگەر بینیت دوو دەستەی موسڵمانان پێکەوە دەجەنگن بیدە بە بەردا تا دەیشکێنیت دواتر زمانت و دەستت بگرەوە تا مەرگی لەناوبەر یان دەستێکی هەڵەکارت پێ دەگات) کە عوسمان(رضي الله عنه) کوژراو باری خەڵك وابوو چوو شمشێرەکەی دا لەبەرد تا شکاندی.

ئەحمەد لە ربعیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە بەخاك سپاردنی حوزەیفەدا(ر) لە کەسێکم بیست دەیوت خاوەنی ئەم جێگەیە دەیوت: گرفتم نیە بیستم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو(ولئن اقتلتم لادخلن بيتي، فان ادخل علي فلاقولن ها بؤ باثمي و اثمك) واتە(ئەگەر شەڕتان کرد دژ بەیەك دەچمە ماڵەکەمو هەرکەس هات بۆم دەڵێم ها تاوانی من و خۆیشت ببە بۆ خۆت)[3].[4]

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٧ ص٣٠٠ دەڵێت: بەزار هێناویەتی و هەندێ لە سەنەدەکەدا هەن کە نایانناسم.

[3] – صحیح.

[4] – هەیسەمی ج٧ ص٣٠١ دەڵێت: ئەحمەد بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی جگە لە کەسێکی ناو سەنەدەکە کە جێی ئاماژەیە.

بەیهەقی ج٨ ص٩٣ لە ئەبولمنهالەوە هێناویەتی دەڵێت: لە سەردەمی ئەخرەجی کوڕی زیادەدا مەڕوان لە شام زاڵبوو، ئیبن زوبەیریش(رضي الله عنه) لە مەککە، ئەوانیش کە بە(قورراء) ناسرابوون لە بەسرە بوون دەڵێت: باوکم تەواو بێزار بوو، وتی: بێ باوک کەوتوو بڕۆ بۆ لای ئەو کەسەی ناو هاوەڵانی پێغەمبەر(عليه السلام) بۆ لای ئەبوبەرزەی ئەسلەمی، دەڵێت: لەگەڵی چووم تا چووینە ماڵی و سەیرمانکرد لە ژێر سێبەری کەپرە قامیشیەکەیدا دانیشتبوو، لای دانیشتین باوکم داوای نان خواردنی لێ کردو وتی: ئەبوبەرزە نابینی؟ دەڵێت: یەکەم قسەی کردی ئەوەبوو وتی: من وا لای خوا چاوەڕێم کە بەرامبەر لایەنەکانی قوڕەیش تووڕەم، ئێوە کۆمەڵانی عەرەب کە لەو بارە نەفامیەی کەمی و سەرشۆڕیو گومڕاییەدا بوون کە دەیزانن و خوای گەورە بە ئیسلام و موحەممەد(عليه السلام) ئێوەی بەرزکردەوە تا گەیشتنە ئەو بارەی دەیبینن، ئەم دنیایەی کە نێوانتانی تێکداوە ئەگەر ئەوەی لە شامە واتە مەڕوان سوێند بەخوا تەنها لەسەر دونیا دەجەنگێ، ئەوەش لە مەککەیە سوێند بەخوا لەسەر دونیا دەجەنگێ، ئەوانەش لە دەورتانداندو بە قورراو ناویان دەبەن سوێند بەخوا تەنها لەسەر دونیا دەجەنگن، کاتێك بەو جۆرە هەموویانی تێوەگلاند باوکم پێ وت: ئەی ئێستا دەڵێیت چی بکەین؟ وتی: پێم وایە ئەمڕۆ باشترین کەس ئەوانەن کە بۆ خۆیان دایانکوتاوەو دەستیان دوورە لە ماڵی خەڵكو دوورن لە خوێنی خەڵك.[1] ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٨٠ لە شیمری کوڕی عەتیەوە هێناویەتی دەڵێت: حوزەیفە(رضي الله عنه) بە کەسێکی وت: ئایا حەزدەکەیت خراپترینی خەڵك بکوژیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی تۆ لەو خراپتر دەبیت.

[1]- بوخاریو ئیسماعیلیو یەعقوبی کوڕی سوفیانیش لە مێژووەکەیدا لە ئەبولمنهالەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە فتح الباری ج١٣ ص٥٧ دا هاتووە.

## (خۆ دوورگرتن لە لەناوبردنی کەسی موسڵمان)

بەیهەقی ج٩ ص٩٢ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ﷺ) هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ) پرسیاری لێکرد ئەگەر گەمارۆی شارتاندا چی دەکەن؟ وتی: کەس دەنێرین و چەند پارچە پشکێکی بۆ دادەنێین، وتی: ئەگەر بەردباران کرا؟ وتی: دەکوژرێت، وتی: وامەکەن، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە حەزناکەم شارێکی چوار هەزار جەنگاوەری بە لەناوبردنی کەسێکی موسڵمان فەتح بکەن.[1]

## (دەربازکردنی موسڵمانان لە دەست بێباوەڕان)

ئیبن ئەبی شەیبە لە عومەرەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر موسڵمانێك لەدەست بێباوەڕان دەربازبکەم لام خۆشترە لە نیمچە دوورگەی عەرەب. لە کنز العمال ج٢ ص٣١٣ دا واهاتووە.

## (تۆقاندنی موسڵمانان)

تەبەرانی لە ئەبولحەسەنەوە(ﷺ) هێناویەتی کە کەسێکی بەدری بوو، دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین کەسێك هەستا و نەعلەکانی بیرچوو، کەسێ نەعلەکانی خستە ژێری، کابرا گەڕایەوە و وتی: نەعلەکانم،خەڵکی وتیان: نەمانبینیون، وتی: ئەی وای، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(فکیف بروعة المؤمن) واتە(ئەی چۆن بۆ تۆقاندنی(ڕاچڵەکاندنی) باوەڕدار) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تەنها بۆ گاڵتە وامکرد، فەرمووی(فکیف بروعة المؤمن)(ئەی چی دەڵێیت بەرامبەر تۆقاندنی موسڵمان) دوو یان سێ جار فەرمووی.[2][3]

---

[1] – شافعی بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٣ ص١٦٥ دا هاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٦٣ دا واهاتووە. هەیسەمی ج٦ ص٢٥٣ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا حوسەینی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای هاشمی هەیە کە لاوازە. ئیبن سکنیش بەو جۆرە هێناویەتی. لە الاصابە ج٤ ص٤٣ دا هاتووە.

بەزارو تەبەرانی و ئەبوشەیخی کوڕی حەییان لە عامری کوڕی ڕەبیعەوە(ﷺ) هێناویانە: کەسێك نەعلەکانی کەسێکی شاردەوەو گاڵتەی لەگەڵ دەکرد ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرد، ئەویش فەرمووی(لا تروعوا المسلم فان روعة المسلم ظلم اعظم)[1].[2](موسڵمان مەتۆقێنن، چونکە تۆقاندنی موسڵمان ستەمێکی زۆر گەورەیە).

تەبەرانی – گێڕەرەوەکانی جێ متمانەن – لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕێگەیەکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، کابرایەك لە وڵاخەکەی دابەزیو کەسێك تیرێکی لە تیردانەکەیدا برد، کابرا ڕاچڵەکاو ترسا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لایحل لرجل ان یروع مسلما).[3](بۆ کەس ڕەوا نیە موسڵمانێ بتۆقێنێت).

ئەبوداود لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلاوە دەڵێت: هاوەڵانی موحەممەد(ﷺ) بۆیات باسکردین لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووین یەکێکیان خەوتو هەندێکیان بەردێکیان برد، ئەویش ترسا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لایحل لمسلم ان یروع مسلما)[4].[5]

تەبەرانی لە سولەیمانی کوڕی صورەدەوە هێناویەتی دەشتەکیەك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کردو قۆچێکی پێبوو، یەکێ لە کەسەکان بردی، کە پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی دایەوە دەشتەکیەکە وتی: کوا قۆچەکەم؟! خەڵکەکە بزەو پێکەنینیان نواند، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلا یروعن مسلما) واتە(هەرکەس بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با هیچ موسڵمانێ نەتۆقێنێ(ڕانەچڵەکێنێ))[6].[7]

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٦٣ دا هاتووە، هەیسەمی ج٦ ص٢٥٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عاصمی کوڕی عەبدوڵڵا هەیە کە لاوازە.

[3] – صحیح.

[4] – صحیح.

[5] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٦٢ دا واهاتووە.

[6] – ضعیف.

[7] – هەیسەمی ج٦ ص٢٥٤ دەڵێت: تەبەرانی لە گێڕانەوەی ئیبن عویەینە لە ئیسماعیلی کوڕی موسلیمەوە هێناویەتی. ئەگەر عەبدی بێت ئەوا صەحیحە، ئەگەر مەککی بێت لاوازە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو.

## (بەکەمدانان و سووکدانانی موسڵمانان)

ئیبن سەعد ج٤ ص٤٣ لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: ئوسامە دای بەلای دەرگاداو تەوێڵی خوێناوی بوو وتی: ئەی عائیشە خوێنەکەی لێ لابە عائیشەش بێزی کردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بۆی پاککردەوەو دەیفەرموو(ئەگەر ئوسامە کچ دەبوو جلم دەکردە بەری و بە خشڵ دەمڕازاندەوەو دەمدا بە شوو))[1][2].

واقیدی و ئیبن عەساکیر لە عەتای کوڕی یەسارەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئوسامەی کوڕی زەید(رضي الله عنه) یەکەمجار کە هاتە مەدینە تووشی نەخۆشی بەڵەك بوو ئەو کات گەنجێ بوو کەلیکی دەهات بەسەر دەمیدا عائیشە بێزی لێدەکردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ژوورەوەو خۆی دەموچاوی دەشت و ماچی دەکرد، عائیشە(رضي الله عنها) وتی: سوێند بەخوا دوای ئەمە هەرگیز خۆمی لێ دوور ناگرم[3][4].

ئیبن سەعد ج٤ ص٤٤ لە عروەوە() هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئیفازەی عەرەفەی لەپێناو ئوسامەی کوڕی زەیددا دواخست و چاوەڕێی ئوسامەی کرد، گەنجێکی تەپیوی ڕەش هات، خەڵکی یەمەن وتیان: لەبەرئەمە وەستاوین؟! فەرمووی(دەی لەبەرئەمە ئەهلی یەمەن کوفریان کرد ؟) دەڵێت: هەڵگەڕانەوەکەیان لە سەردەمی ئەبوبەکردا(رضي الله عنه) لەبەر بەکەمدانانی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئیبن عەساکیر لە عروەوە بەو جۆرە هێناویەتی و تیایدا عروە دەڵێت: یەمەن دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ئوسامە بێباوەڕبوون[5][6].

---

[1] – صحيح.

[2] – ئیبن ئەبی شەیبەش هێناویەتی، لە المنتخب ج٥ ص١٣٥ یشدا هاتووە.

[3] – صحيح.

[4] – لە المنتخب ج٥ ص١٣٦ دا واهاتووە.

[5] – ضعيف.

[6] – لە المنتخب ج٥ ص١٣٥ دا واهاتووە.

ئەبوعوبەیدیش لە حەسەنەوە هێناویەتی دەستەیەك هاتن بۆ لای ئەبوموسا(رضي الله عنه) ئەویش بەخششی عەرەب و مەوالی کرد، عومەر(رضي الله عنه) بۆی نووسی: ئایا یەکسانیت کرد لە نێوانیاندا؟ بەشە خراپەکە بۆ کەسێك کە براکەی بەکەم بزانێت.[1]

## (تووڕەکردنی موسڵمانان)

موسلیم ج٢ ص٣٠٤ لە عائیزی کوڕی عەمرەوە هێناویەتی ئەبوسوفیان هات بۆ لای سەلمان و صوهەیب و بلال بە دەستەیەکەوە، وتیان: شمشێری خوا نەخرایە گەردنی دوژمنی خوا، ئەبوبەکر وتی: ئەوە قسە بە گەورەی قوڕەیش دەڵێن؟ چوویە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەوەی پێ وت، ئەویش فەرمووی(ئەی ئەبوبەکر لەوانەیە تووڕەت کردبن، ئەگەر تووڕەت کردبن ئەوا پەروەردگارتت تووڕەکردووە). ئەبوبەکریش چوویەوە بۆ لایان و وتی: برا شیرینەکانم تووڕەم کردن؟ وتیان: نا، خوا لێت خۆش بێت برا گیان.[2]

ئیبن عەساکیر لە صوهەیبەوە هێناویەتی ئەبوبەکر دای بە لای دیلێکیدا کە داوای لێدەکرد لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سکاڵای بۆ بکات، صوهەیبیش لە مزگەوتدا دانیشتبوو بە ئەبوبەکری وت: ئەوە کێیە لەگەڵتدا؟ وتی: دیلێکی بێباوەڕانە هێناومە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داوای پەنای بۆ بکەم، ئەویش وتی: ئەمە دەبێت شمشێر بچێتە ملی، ئەبوبەکر تووڕەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی و فەرمووی(بۆچی دەتبینم زۆر تووڕەیت ؟) وتی: دیلەکەمم هێناو دام بە لای صەهەیبداو ئەویش وای وت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لەوانەیە ئازارت دابێت) وتی: نە بەخوا، فەرمووی(ئەگەر ئازارت دابێت بە دڵنیاییەوە ئازاری خواو پێغەمبەرەکەیت داوە).[3]

---

[1]- لە کنز العمال ج٢ ص٣١٩ دا واهاتووە، ئەحمەد لە الزهد لە عومەرەوە(رضي الله عنه) دەڵێت: بۆ کەسێك خراپە بەسە برا موسڵمانەکەی بەکەم دابنێ. لە کنز العمال ج٢ ص١٧٢ دا واهاتووە.

[2]- ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٤٦ و ئیبن عەبدولبر لە الاستیعاب ج٢ ص١٨١ لە عائیزی کوڕی عەمرەوە بەو جۆرە هێناویانە.

[3] - لە کنز العمال ج٧ ص٤٩ دا واهاتووە.

# (نەفرینی موسڵمانان)

بوخاری و ئیبن جەریر و بەیهەقی لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویان کەسێك لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) ناوی عەبدوڵلا بوو و پێی دەوترا(حمار) کەر، پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) دەخستە پێکەنین، لەسەر مەی خواردنەوە جەلدی لێدا، ڕۆژێك هێنراو فەرمانی جەلدی دراو لێیدەدرا، کەسێك وتی: نەفرینی خوات لیْ بێت چۆن دەستی لیْ هەڵناگری، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(نەفرینی لیْ مەکەن، چونکە سوێند بەخوا ئەوەی من بزانم ئەو خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت) ئەبویەعلاو سەعیدی کوڕی مەنسور و جگە لەوانیش هێناویانە، کابرایەك کە بە کەر ناسرابوو جامە ڕۆن و هەنگوینی بە دیاری دەهێنا بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، کە هاوەڵەکەی دەهات سکالای لێدەکرد دەیهێنا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا پارەی ئەم کابرا بدە، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) زەردەخەنەی دەکردو پارەکەی دەدا، ڕۆژێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و مەی خواردبوویەوە، کەسێك نەفرینی لێکرد – فەرموودەکە وەك پێشتر دەهێنێت –.[1][2]

عەبدولڕەزاق لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن نوعمان(رضي الله عنه) هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و جەلدی لێداو چوار پێنج جار ئەمە دووبارە بوویەوە کەسێك وتی: نەفرینی خوای لیْ بێت چەند جار دەخواتەوەو لێی دەدرێت! پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(نەفرینی لیْ مەکە چونکە ئەو خواو پێغەمبەرەکەی خۆشدەوێت).[3]

---

[1] – حسن.

[2] – لە كنز العمال ج٣ ص١٠٧ دا واهاتووە.

[3]– لە كنز العمال ج٣ ص١٠٨ دا هاتووە. ئیبن سەعد ج٣ ص٥٦ لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: نوعەیمان یان ئیبن نوعەیمان هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) – ئینجا بەهەمان شێوە فەرموودەکە دێنێت –.

ئیبن جەریر لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی مەی خۆرێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمانی بە هاوەڵان کرد جەڵدی لێبدەن، هەیانبوو بە نەعلەکەی، هەیانبوو بە دەست، هەیانبوو بە کراسەکەی، پاشان فەرمووی(ارفعوا) واتە(دەست هەڵگرن) پاشان فەرمانی پێکردن دەستیان دایە بەرشانی، وتیان: شەرم ناکەیت لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وا دەکەیت؟ پاشان ناردی کە کابرا ڕووی وەرگێڕا خەڵکەکە کەوتنە نزالێکردن و قسە پیٚ وتنی، هەبوو دەیوت: خوایە سەرشۆڕی بکە، خوایە نەفرینی لیٚ بکە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لاتقولوا هذا ولاتکونوا عونا للشیطان علی اخیکم، ولکن قولوا اللهم اغفر له اللهم اهده) وفي لفظ(لاتقولوا هکذا ولاتعینوا الشیطان ولکن قولوا رحمك الله) واتە(وامەڵێن و مەبنە یارمەتیدەری شەیتان دژ بە براکەتان، بەڵکو بڵێن خوایە لێی خۆش بە، خوایە ڕێنموونی بکە) یان لە دەقێکی تردا(وا مەڵێن و یارمەتی شەیتان مەدەن، بەڵکو بڵێن خوا ڕەحمەت پیٚ بکات).[1]

تەبەرانی بە سەنەدی جەید لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر کەسێکمان ببینیایە نەفرینی لە براکەی بکردایە واماندەزانی تووشی یەکیٚ لە تاوانە گەورەکان بووە.[2][3]

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٠٥ دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٥١ دا واهاتووە.

# (جنێودان به موسڵمانان)

ئەحمەد و ترمزی لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویانە دەڵێت: کەسێك هات و لە بەردەم پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) دانیشت و وتی: من دوو کۆیلەم هەن درۆم لەگەڵ دەکەن و لەگەڵم ناپاکن و لە قسەم لادەدەن و منیش جنێویان پێ دەدەم و لێیان دەدەم، ئایا تاوانم بەرامبەریان هەیە؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اذا كان يوم القيامة يحسب ما خانوك و عصوك و كذبوك و عقابك اياهم بقدر ذنوبهم كان كفافا لالك ولاعليكن و ان كان عقابك اياهم فوق ذنوبهم اقتص لهم منك الفضل) واتە(ئەگەر رۆژی دوایی هات لەسەر ئەوەی ناپاك بوون بەرامبەرت و لە قسەت لایانداوە و درۆیان لەگەڵ کردوویت لێپێچینەوە دەکرێن و سزای تۆش بۆیان بەپێی تاوانیانە ئەوە بەسە نە بۆ تۆ و نە لە دژ تر، ئەگەریش سزادانی تۆ لە تاوانیان زیاتربووبێت ئەوا لە زیادە و چاکەی تۆ دەسێنن بۆ ئەوان و بەوە تۆڵەیان بۆ دەکرێتەوە) کابرا سەری دانەواند و دەگریا،[1] پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(مەگەر فەرمانی خوات نەخوێندۆتەوە) واتە(و نضع الموازين القسط ليوم القيامة... حاسبين) الفرقان ٤٧ کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاکترین شت وایە لێیان جیابمەوە تۆ بە شایەت دەگرم هەموویان ئازادن.[2]

ئەحمەد و تەبەرانی لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە کەسێك جنێوێکی دا بە ئەبوبەکر(رضي الله عنه) و پێغەمبەری خوایش(صلى الله عليه وسلم) دانیشتبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەری لێی سوورما و زەدەخەنەی کرد، کە زۆرتر وتی: ئەبوبەکر هەندێ قسەی وەڵام دایەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تووڕەبوو و هەستا و ئەبوبەکریش چوو بە دوایدا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو جنێوی پێدام و تۆیش دانیشتبوویت، کە وەڵامم دایەوە

---

[1] – صحیح.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٣ ص٤٩٩ دا هاتووە و لە ج٥ ص٤٦٤ دا دەڵێت: سەنەدەکەی ئەحمەد و ترمزی موتەسیلن و گێڕەرەوەکانی هەردووکیشیان جێ متمانەن.

تووڕەبوويت و هەستايت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (انه كان معك ملك يرد عنك، فلما رددت عليه بعض قوله وقع الشيطان فلم اكن لاقعد مع الشيطان) واتە(لەگەڵتا فريشتەيەك هەبوو وەڵامی بۆ دەدايتەوە، كە تۆ وەڵامی هەندێكت دايەوە شەيتان هات، منيش لەگەڵ شەيتان دانانيشم) پاشان فەرمووی(يا ابابكر ثلاث كلهن حق: ما من عبد ظلم بظلمة فيغضى عنها لله عز وجل الا اعز الله بها نصره، وما فتح رجل باب عطية يريد بها صلة الا زاده بها كثرة، وما فتح باب مسالة يريدها بها كثرة الا زاده الله قله) واتە(ئەی ئەبوبەكر سێ شت هەموويان حەقن: هەر بەندەيەك ستەمێكی لێ بكرێت و بيداتە دەست خوا ئەوا خوای گەورە بەوە سەركەوتنی خۆی پێ دەدات و عيزەتمەندی دەكات، هەركەسێك دەرگای بەخششێك بكاتەوە و مەبەستی پێی پەيوەندی بێت خوای گەورە بۆی زياد دەكات، هەر دەرگايەكی داواكاريش بكاتەوە و مەبەستی پێی زيادكردن بێت خوای گەورە زياتر بۆی كەم دەكاتەوە)[1][2].

ئەحمەد و لالەكائی و ئەبولقاسمی كوڕی بشران و ئيبن عەساكير لە بەهی يەوە هێناويانە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر(رضي الله عنه) جنێوی دا بە ميقداد(رضي الله عنه) عومەر وتی: ئەگەر زمانت نەبڕم نەزرم لەسەر بێ، هاوەڵان دواندیان و لێی پاڕانەوە، عومەر وتی: وازم لێ بێنن تا زمانی ببڕم تا ئيتر جنێو بە يەك هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەدات، ئيبن عەساكير هێناويەتی لە بەهيەوە دەڵێت: لە نێوان ئيبن عومەر و ميقداددا كێشەيەك ڕوويداو عەبدوڵڵا قسەی پێ وت و ئەويش لای باوكی شكاتی لێكرد، عومەر نەزری كرد زمانی ببڕێت، كە ئيبن عومەر ترسا باوكی وابكات پياوانی برد بۆ لای، عومەر وتی: وازبێنن تا زمانی ببڕم و ببێتە سوننەتێك دوای خۆم ئيشی پێ بكرێت هەركەس جنێوبدات بە هاوەڵان زمانی ببڕن.[3]

---

[1] – صحيح.

[2]– هەيسەمی ج٨ ص١٩٠ هێناويەتی و دەڵێت: كەسەكانی سەنەدەكەی ئەحمەد صەحين، ئەبوداوديش هێناويەتی بەڵام ئەوەی تێدانيە، پاشان فەرمووی ئەی بەبوبەكر.

[3] – لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٤٢٤ دا واهاتووە.

# (کەوتنە ویزەی موسڵمانان)

ئەبونەعیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) کەوتە کەسێکی ترەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(قم لاشهادة لك) واتە(هەستە تۆ هیچ شایەتیت بۆ نیە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ناگەڕێمەوە، فەرمووی(اصبحت تهزا بالقران ما امن بالقران من استحل محارمه)(گاڵتە بە قورئان دەکەیت، ئەوەی حەرامەکانی قورئان بە ڕوا بزانێت بڕوای بە قورئان نەهێناوە).[1]

ئەبونەعیم لە الحلیه ج١ ص٩٤ لە تاریقی کوڕی شەهابەوە هێناویەتی دەڵێت: لە نێوان خالیدو سەعددا(ر) قسەیەك بوو، کەسێك لای سەعد کەوتە باسی خالید بە خراپە، ئەویش وتی: بەسە مەڵێ، ئەوەی لە نێوانماندا ڕوویدا نەگەیشتە ئایینەکەمان.[2]

# (غەیبەتکردنی موسڵمانان)

عەبدولڕەزاق و ئەبوداود لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەسلەمی هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و شایەتی لەسەر خۆی دا کە لەگەڵ ئافرەتێکی ناحەڵاڵدا چوار جار تووش بووە و هەموو جارێك وازی بۆ لێدەهێنا، فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە: فەرمانی کرد و ڕەجم کرا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بیستی دوو هاوەڵ پێکەوە بوون یەکێکیان بەوی دیکەی دەوت: سەیری ئەوەکە خوای گەورە پەردەپۆشی کرد کەچی وازی نەهێنا تا خۆی ڕەجم کرد ڕەجمی سەگ بێ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەریان بێدەنگ بوو و دوای ماوەیەك چوو تا دای بەلای کەلاکی کەرێکدا کە بەپێ لێیدا، فەرمووی(فلان و فلان کوان؟) وتیان: ئەمەتاین ئەی

---

[1] – لە کنز العمال ج١ ص٢٣١ دا واهاتووە.

[2] – تەبەرانی لە تاریقەوە بەو جۆرە هێناویەتی، هەیسەمی ج٧ ص٢٢٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، تەواو.

پێغەمبەری خوا، فەرمووی(دابەزن و لە کەلاکی ئەو گوێدرێژە بخۆن) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە لێت خۆش بێت کێ لەوە دەخوات؟ فەمووی(فلما نلتما من عرض اخيكما انفا اشد من اكل الميتة، والذي نفسي بيده انه الان لفي انهار الجنة، ينغمس فيها)واتە(دەی ئەوەی پێشتر لەسەر ئابڕووی براکەتان تووشی بوون سەختترە لە خواردنی مردارەوە بوو، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەو ئێستا لەناو ڕووبارەکانی بەهەشتدا مەلە دەکات)[1][2].

عەبدولڕەزاق لە ئیبنولمونکەدیرەوە هێناویەتی: پێغەمبەر(عليه السلام) ڕەجمی ئافرەتێکی کرد، یەکێ لە موسڵمانان وتی: ئەم ئافرەتە کارەچاکەکانی لەدەستدا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بل هذه كفارة لما عملت و تحاسب انت بما عملت) واتە(بەڵکو ئەوە سڕەرەوەی ئەو کارەیە کە کردی و تۆیش لەسەر ئەو کارەی کردت لێپێچینەوە دەکرێیت)[3][4].

ئەبوداودو ترمزی و بەیهەقی لە عائیشەوە(رضي اله عنها) هێناویانە دەڵێت: بە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) وت: بەسە بۆ صەفیە ئاواو ئاوایە، هەندێ لە گێڕەرەوەکان دەڵێن واتە کورتە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لقد قلت كلمة لو مزجت بماء البحر لمزجته) واتە(بە ڕاستی قسەیەکت وت ئەگەر تێکەڵ بە ئاوی دەریا بکرێت(پیسی دەکات) هەمووی تێکەڵ دەکات). عائیشە دەڵێت: باسی کەسێکم لاکرد،

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص٩٣ دا هاتووە، ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی، لە الترغيب والترهيب ج٤ ص٢٨٨ دا هاتووە، بوخاری لە الادب المفرد ص١٠٨ بەو جۆرە بە کورتی هێناویتی، ئیبن حیببان بە صەحیحی دەزانێ وەك ئیبن حەجەر لە فتح الباری ج١٠ ص٣٦١ دەیڵێت.

[3] – ضعیف.

[4] – لە کنز العمال ج٣ ص٩٣ دا هاتووە.

فەرمووی(ما احب ان حكيت لي انسانا و ان لي كذا و كذا)(حەزناکەم باسی کەسێکم لابکەیت و خۆم ئەوەو ئەوەم هەیە)[1][2].

ئەبوداودیش لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی کە وشترێکی صەفیەی کچی حویەی لابوو و زەینەبیش زیادە کۆڵێکی هەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە زەینەبی فەرموو لەبری وشترەکە، وتی: من بیدەم بەو جولەکە؟پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تووڕەبوو و لە ماوەی مانگی زی الحجە و موحەرەم و هەندێکی صەفەریشدا بەجێی هێشت.[3]

ئیبن ئەبی دونیا لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی وتی: جارێکیان لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە ژنێکم وت: بە ڕاستی چاك و جلی درێژە، فەرمووی(الفظي الفظي فلفظت بضعة من لحم) (فڕێی دە، فڕێی دە، منیش پارچەیەك گۆشتم فڕێ دا)[4][5].

ئیبن سەعد ج٨ ص١٢٨ لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەو نەخۆشیەیدا بوو کە تیایدا مرد، ژنەکانی کۆبوونەوە، صەفیە وتی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا حەزدەکەم ئەو نەخۆشیەی هەتە بە منەوە بوایە، ژنەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بزە دایگرتن و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەیری کردن و فەرمووی(مضمضن) ئەوانیش وتیان لەچی ئەی پێغەمبەری خوا؟فەرمووی(من تغمزكن بصاحبتكن و الله انها لصادقة) واتە(لەو بزەگرتنەتان بەرامبەر هاوەڵەکەتان، سوێند بەخوا ئەو ڕاست دەکات)[6][7].

---

[1] – صحيح.

[2] – ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە صەحیحە.

[3] – لە الترغيب والترهيب ج٤ ص٢٨٤ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٨ ص١٢٧ بەو جۆرە هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوو یان سێ مانگ نەچوو بۆ لای، زەینەب وتی: تائەوەی لێی بێهیوا بووم.

[4] – ضعيف.

[5] – لە الترغيب والترهيب ج٤ ص٢٨٤ دا هاتووە.

[6] – ضعيف.

[7] – سەنەدەکەی حەسەنە لە الاصابە ج٤ ص٣٤٨ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٢ ص٣١٢ لە ڕێگەی عەتای کوڕی یەسارەوە بەو واتایە هێناویەتی.

ئەبویەعلاو تەبەرانی لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین کەسێك هەستا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کابرا چەند لاوازە، فەرمووی(غەیبەتی براکەتانتان کردو گۆشتیتان خوارد) لە لادەقی تەبەرانیدا هاتووە: کابرایەك لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستاو لاوازیەك بە هەستانەوەکەیەوە دیاربوو، وتیان: چەندە لاوازە، فەرمووی(براکەتانتان خوارد و غەیبەتتان کرد)[1][2].

تەبەرانی لە موعازی کوڕی جەبەلەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکمان وت کە وایە، فەرمووی(ئەگەر شتێك بڵێن کە تیایدا نەبێت ئەوا بوهتانتان بۆ کردووە)[3][4].

ئەسبەهانی بە سەنەدی حەسەن لە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی: لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باسی کەسێکیان کردو وتیان: تا نانی نەدەنێ ناخواو تا سواری بۆ نەبەن ناڕوا، فەرمووی(غەیبەتتان کرد) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکمان وت کە تیایدایە، فەرمووی(هێندە بەسە کە باسی براکەت بکەیت بەوەی تیایدایە)[5][6].

ئیبن ئەبی شەیبەو تەبەرانی – دەقەکە هی ئەوەو گێڕەرەوەکان صەحیحن – لە ئیبن مەسعودەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بووین کەسێك هەستاو لە دوایەوە کەسێك قسەی لەسەر کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)

---

[1] – ضعیف.

[2]– لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٨٥ دا هاتووە، هەیسەمی ج٨ ص٩٤ دەڵێت: لە سەنەدی هەردووکیاندا موحەممەدی کوڕی ئەبی حەمید هەیە کە پێی دەوترێ حەماد و زۆر لاوازە.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص٩٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەلی کوڕی عاصم هەیە کە لاوازە.

[5] – حسن.

[6] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٨٥ دا هاتووە.

فەرمووی(تحلل) واتە(دان پاك بکەرەوە) وتی: لە چی؟ فەرمووی(تۆ گۆشتی براکەتت خوارد)[1][2].

ئەبوداود و تەیالیسی و ئیبن ئەبی دونیاو بەیهەقی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد ڕۆژێك بە ڕۆژوو بین و فەرمووی(کەستان ڕۆژوو نەکاتەوە تا مۆڵەتی پێبدەم) خەڵکی بەڕۆژوو بوون تا ئێوارە هات، کەس دەهات و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا من بەڕۆژوو بوومو مۆڵەتم بدە تا ڕۆژوو بکەمەوە، یەك یەك مۆڵەتی پێدەدان تا کەسێك هاتو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوو ئافرەتی بنەماڵەت بەڕۆژوونو شەرم دەکەن بێن بۆ لات مۆڵەتیان بدە تا ڕۆژووبکەنەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕووی لێ وەرگێڕا، کابرا دووبارەی کردەوەو سێ جار ئەوە ڕوویدا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(انهما لم يصوما و كيف صام م ظل هذا اليوم ياكل لحوم الناس؟ اذهب فمرهما ان كانتا صائمتين فلتستقيئا) واتە(ئەو دووانە بەڕۆژوو نەبوون، چۆن بەڕۆژووە کەسێك کە ئەمڕۆ گۆشتی خەڵکی خواردووە؟ بڕۆ بیانبە ئەگەر بەڕۆژوو بوون با بڕشێنەوە) ئەویش چوو پێ وتن، هەردووکیان هەوڵی خۆڕشاندنەوەیان دا هەرکامیان مشتێ خوێنی هێنایەوە، کابرا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و پێی وت: ئەویش فەرمووی(سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ئەگەر لە سکیاندا بمایەتەوە ئاگر هەردووکیانی دەخوارد) ئەحمەدو ئیبن ئەبی دونیاو بەیهەقیش لە گێڕانەوەی کەسێکەوە کە ناوی نەهاتووە لە عوبەیدی مەولای پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) هێناویانە بەڵام ئەحمەد دەڵێت: بەیەکێکیانی فەرموو(قیئی) واتە(بڕشێرەوە) ئەویش ڕشایەوەو خوێنو گۆشتی هێنایەوە تا نیوەی قاپەکەی پڕکرد، پاشان بەوی

---

[1] – صحیح.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٨٥ دا هاتووە، لە نەقلی هەیسەمی ج٨ ص٩٤ دا(تخلل) هاتووە، وتی: لە چی ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر گۆشتم خواردووە؟

تریشی وا فەرموو، ئەویش نیوەکەی تری پڕکرد، پاشان فەرمووی(ئەم دووانە ڕۆژوویان گرت لەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردبوون و ڕۆژوویان کردەوە لەوەی خوا لێی حەرام کردبوون، یەکێکیان لەپاڵ ئەوی تریاندا دانیشت و گۆشتی خەڵکیان دەخوارد)[1].[2]

زیائی مەقدیسی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە سەفەردا عەرەب خزمەتی یەکتریان دەکرد لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەردا کەسێ هەبوو خزمەتی دەکردن و نانی بۆ ئامادە نەکردبوون، وتیان: ئەم کابرا زۆر خەواڵووە، بەخەبەریان کردەوە و وتیان: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بڵێ سەلامت لێ دەکەن و داوای نانت لێ دەکەن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(انهما قد ائتدما) واتە(ئەوان نانیان خواردووە) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چیمان خواردووە؟ فەرمووی( بە گۆشتی براکەتان، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە من گۆشتەکەی لەنێوان دانەکانتاندا دەبینم) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە، فەرمووی(بۆ لای با ئەو داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکات).[3]

[1] - ضعیف.

[2] - الترغيب والترهيب ج٤ ص٢٨٤.

[3] - لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص٢١٦ دا واهاتووە.

# (چوون بە دوای عەیبو عاری موسڵماناندا)

عەبدولڕەزاق و عەبدی کوڕی حەمید و خەرائیتی لە میسوەری کوڕی مەخرەمە لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویانە کە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا شەو لە مەدینە پاسەوان بوون، بەڕێدا دەچوون کە لە ماڵێکدا چرایەك دەرکەوت و ئەوانیش چوون نزیك بوونەوە سەیریان کرد دەرگایەك لە ڕووی خەڵکیدا داخراوە کە دەنگیان بەرزو پرژاوەژاوە، عومەر دەستی عەبدولڕەحمانی گرت و وتی: دەزانیت ئەمە ماڵی کێیە؟ وتی: ماڵی ڕەبیعی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەفەو ئێستا مەی دەخۆنەوە دەڵێت: چی بکەین؟ وتی: وادەبینم تووشی ڕێگری خوا بووین کە دەفەرموێت(ولاتجسسوا) جاسوسیمان کرد، عومەر چوو و بەجێی هێشتن.

عەبدولڕەزاق لە تاوسەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) شەوێك چوو بۆ پاسەوانی و لە بەشێکی مەدینە دەگەڕایەوە لە درەنگانێکی شەودا دای بە لای ماڵێکدا خەڵکێکی تێدابوو مەیان دەخواردەوە، وتی: لادان هەی لادان؟ ئەوانیش وتیان: خوا ڕێگری لەم کارەت کردووە، عومەریش گەڕایەوەو وازی لێهێنان.[1]

خەرائیتی لە سەوری کندیەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بە مەدینەدا دەگەڕا(شەو) دەنگی پیاوێکی بیست لە ماڵدا گۆرانی دەوت، عومەر بەسەر دیوارەکەدا سەیری کردو وتی: ئەی دوژمنی خوا وادەزانیت لەتاواندا بیت خوا داتدەپۆشێت؟ وتی: تۆ ئەی ئەمیری باوەڕداران پەلەم لێ مەکە ئەگەر من یەك سەرکەشیم بەرامبەر خوا بووبێت تۆ سێ سەرکەشیت هەبوو، خوا دەفەرموێت(ولاتجسسوا) تۆ کردت، دەفەرموێت(واتوا البیوت من ابوابها) تۆ بەسەر دیوارەکەدا هەڵزنیت و بەبێ مۆڵەت هاتیت، خوا دەفەرموێت(لاتدخلوا بیوتا غیر

---

[1] – کنز العمال ج٢ ص١٤١.

بیوکتم حتی تستانسوا و تسلموا علی اهلها) عومەر وتی: ئەگەر لێت خۆش بم خێرت لا هەیە؟ وتی: بەڵێ، ئەویش لێی خۆش بوو و چووە دەرەوە.[1]

ئەبوشەیخ لە سوددیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر دەرچوو و سەیری کرد تیشکی ئاگرێك دیارە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیشی لەگەڵدا بوو، چوو تا گەیشتە ماڵێك چرایەکی تێدابوو، لە تاریکی شەودا چوویە ژوور سەیری کرد پیرێکە دانیشتووەو مەی لەبەردەمدایەو کەنیزەکێك گۆرانی بۆ دەڵێت، ئاگای لە خۆی نەبوو تا عومەر هەڵی کوتایە سەری، عومەر وتی: تا ئەمشەو دیاردەی ناشیری وام لە پیرێك نەدیبوو کە چاوەڕێی سەرەمەرگیەتی، کابرا سەری بەرزکردەوەو وتی: با ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوەی تۆ کردت ناشیرینتر بوو، جاسووسیت کرد کە خوا ڕێی پێ نەداویت، بەبێ مۆڵەتیش هاتیتە ژوورەوە، عومەر وتی: ڕاست دەکەیت، دواتر قەپی کرد بە کراسەکەیداو بە گریانەوە چوویە دەرەوەو وتی: عومەر دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات ئەگەر خوا لێت خۆت نەبێت ئەو کابرا لە ماڵی خۆیدا بە نهێنی سەرقاڵ بوو، ئێستا دەڵێت عومەر منی بینی و لەسەری دەڕوات، پیرەکە ماوەیەك کۆڕەکەی عومەری بەجێهێشت، دوای ئەوە عومەر دانیشتبوو کە کابرا بە شێوە شاراوەییەك هات و لە کۆتای ڕیزەکاندا دانیشت، عومەر ئەوی بینی و وتی: با ئەو پیرە بێت بۆ لام، لای خۆی دانیشاندو و وتی: گوێت نزیك بکەرەوە، چپاندی بە گوێیداو وتی: سوێند بەوەی موحەممەدی بە حەق بە پێغەمبەر نارد من و ئیبن مەسعودیش کە لەگەڵمدا بوو سەبارەت بەوەی شەو بینیمان هیچمان بە کەس نەوتووە، کابرا وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران گوێت بێنە! چپاندی بە گوێیدا و وتی: سوێند بەوەی موحەممەدی بەحەق ناردووە لەو کاتەوە تا ئەم کۆڕەم نەچوومەتەوە سەری، عومەریش دەنگی بەرزکردەوەو وتی: الله اکبر، خەڵك نەیزانی بۆچی الله اکبری کرد.[2]

[1] - لە کنز العمال ج٢ ص١٦٧ دا واهاتووە.

[2] - لە کنز العمال ج٢ ص١٤١ دا واهاتووە.

تەبەرانی لە ئەبی قولابەوە هێناویەتی عومەر(رضي الله عنه) بیستی ئەبومیحجەنی سەقەفی لە ماڵەکەی خۆیدا لەگەڵ هاوەڵانێکیدا مەی دەخواتەوە، عومەر چوو تا چوو بۆ ماڵی و سەیری کرد تەنها کەسێکی لایە، ئەبومیحجەن وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە بۆ تۆ حەڵاڵ نیە و خوا ڕێی نەداوە جاسوسی بکەیت، عومەر وتی: کێ ئەوە دەڵێت؟ زەیدی کوڕی سابت و عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەرقەم وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕاست دەکات ئەوە جاسوسی بوو، عومەریش چوو و بەجێهێشت[1] [2].

## (داپۆشینی موسڵمانان)

هەناد و حارس لە شەعبیەوە هێناویانە کەسێك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب و وتی: من کچێکم هەبوو لە سەردەمی نەفامیدا زیندە بە چاڵم کرد پێش ئەوەی بمرێت دەرمانهێناو دواتر موسڵمان بوو، کە موسڵمان بوو حەددێکی خوای بەسەردا چەسپا، ئویش چەقۆی دەرهێنا تا خۆی سەرببڕێت و پێی گەیشتین و بەشێ لە ملی خۆی بڕیبوو، برینپێچمانکرد تا چاك بوویەوە، دواتر تەوبەیەکی چاکی کردو ئێستا خەڵکی داوای کردووەو منیش وتوومە چی بووە، عومەر وتی: ئەرێ دەست ئەنقەست دەتەوێت ئەوەی خوای گەورە شاردویەتیەوە ئاشکرای بکەیت؟ ئەگەر جارێکی تر لای یەك کەس باسی بکەیت دەتکەم بە پەندی خەڵکی ناوچەکان بەڵکو وەك ئافرەتی پاکی موسڵمانان مارەی دەبڕم.[3]

سەعیدی کوڕی مەنسوور و بەیهەقی لە شەعبیەوە هێناویانە کەنیزەکێك لایداوەو حەددی لێدرا، پاشان کۆچیان کردو ئافرەتەکە تەوبەی کرد، لای مامی

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە كنز العمال ج٢ ص١٤١ دا واهاتووە.

[3] – لە كنز العمال ج٢ ص١٥٠ دا واهاتووە.

داوا دەکراو ئەویش حەزی نەدەکرد مارەی بکات لە کەس، تائەوەی پێشتری پێ نەڵێت، حەزیشی نەدەکرد ئەوە بڵاوبێتەوە، بۆیە لای عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) باسی کرد، عومەر وتی: وەك چۆن ئافرەتە صاڵحەکانتان مارە دەبڕن ئەمیش مارەبکەن.[1]

بەیهەقی لە شەعبیەوە هێناویەتی: ئافرەتێك هات بۆ لای عومەی کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من منداڵێکم بینی و جلێکی قبتیشم بینی سەد دیناری تێدابوو هەڵمگرت و بۆ شیرپێدانی هەوڵمدا کەسی بۆ بەکرێ بگرم چوار ئافرەت دەهاتن و ماچیان دەکرد و نەمزانی کامیان دایکیەتی؟ عومەر وتی: کە هاتن بۆی پێم بڵێ، ئەویش وایکرد، عومەر بە ژنێکیانی وت: کامتان دایکی ئەم منداڵەیە؟ وتی: بەخوا چاك نازانم ئەی عومەر دەتەوێت ئافرەتێك خوا پەردەپۆشی کردووە تۆ ئابڕووی ببەیت، عومەر وتی: ڕاست دەکەیت، پاشان بە ژنەکەی وت: کە هاتن بۆ لات هیچ پرسیاریان لێ مەکەو بۆ منداڵەکەیان باش بە، پاشان چوو.[2]

عەبدولڕەزاق لە صاڵحی کوڕی کرزەوە هێناویەتی: کەنیزەکێکی خۆی هێنا بۆ لای حەکەمی کوڕی ئەییوب کە زینای کردبوو، دەڵێت: من دانیشتبووم کە ئەنەسی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) هات و دانیشت و وتی: صاڵح ئەم کەنیزەکە لەگەڵتا چیە؟ وتم: کەنیزەکێکمە لایداوەو دەمەوێت بەرزی بکەمەوە بۆ لای ئیمام تا سنوری خوای بەسەردا بسەپێنێ، وتی: وامەکە و کەنیزەکەکەت بگێڕەوە لە خوا بترسەو پەردەپۆشی بکە، وتم: من وانەکەم؟ وتی: نا مەیکەو بە گوێم بکە، بەردەوام پێی دەوتمەوە تا گێڕامەوە[3].[1]

---

[1] – کنز العمال ج٨ ص٢٩٦.

[2] – کنز العمال ج٧ ص٣٢٩.

[3] – ضعیف.

ئەبوداودو نەسائى لە ئەبولهەيسەمى نووسەرى عوقبەى كوڕى عامرەوە(رضي الله عنه) هێناويەتى دەڵێت: بە عوقبەى كوڕى عامرم وت: ئێمە دراوسێمان هەن مەى دەخۆنەوەو منيش پۆليسيان بۆ بانگ دەكەم تا بيانبەن، وتى: وامەكەو هەڕەشەيان لىٚ بكە، وتى: من ڕێگريم لىٚ كردوون بەڵام وازناهێنن بۆيە وادەكەم، عوقبە وتى: قوڕبەسەر وامەكە، من بيستوومە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەيفەرموو(من ستر عورة فكانما استحيا موئودة في قبرها) واتە(هەركەس عەيبەيەك داپۆشێت وەك ئەوە وايە ئافرەتێكى زيندە بەچاڵى لە گۆڕەكەيدا زيندوو كردبێتەوە).[٢]

بوخارى لە الادب المفرد ص١٨٨ لە بيلالى كوڕى سەعيدى ئەشعەريەوە هێناويەتى موعاويە نامەى نووسى بۆ ئەبودەردا: فاسقانى ديمەشق بنووسە، وتى: دەى من چۆن بيانناسم و چوزانم كامانەن، بيلالى كوڕى وتى: من دەيياننوسم و نووسينى، وتى: چۆن دەزانيت؟ نەتزانيوە مەگەر ئەوەى خۆيشت لەوان بيت، بۆيە يەكەمجار ناوى خۆت بنووسە، ئەويش ناوى نەناردن.

ئيبن سەعد لە شەعبيەوە هێناويەتى: عومەرى كوڕى خەتتاب(رضي الله عنه) لە ماڵێكدا بوو و جەريرى كوڕى عەبدوڵلاى لەگەڵدا بوو، عومەر بۆنێكى بيستو وتى: دەبێت بزانم خاوەنى ئەو بۆنە كێيە كە هەستا دەستنوێژى گرت، جەرير وتى: ئەى ئەميرى باوەڕداران ئايا هەموويان دەستنوێژبگرن؟ وتى: ڕەحمەتى خوات لىٚ بێت! تۆ لە سەردەمى نەفامى و سەردەمى ئيسلاميشدا گەورەيەكى چاك بوويت.[٣]

---

[١] – كنز العمال ج٣ ص ٩٤.

[٢] – الترغيب والترهيب ج٤ ص١٧ دەڵێت: ئەبوداودو نەسائى بە باسى چيرۆكەكە و بە جياش هێناويانە، ئيبن حيببان لە صەحيحەكەيدا هێناويەتى و دەقەكەش هى ئەوە، حاكم هێناويەتى و دەڵێت: سەنەدى صەحيحە، مونزيرى دەڵێت: كەسەكانى سەنەدەكانيان جىٚ متمانەن، بەڵام لەسەر ئيبراهيمى كوڕى نەشيت ناكۆكيەكى زۆر هەيە.

[٣] – كنز العمال ج٢ ص١٥١.

# (لێبوردەیی و لێخۆشبوون لە موسڵمانان)

بوخاری لە عەلیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) من و زوبەیر و میقدادی(ﷺ) نارد و فەرمووی(انطلقوا حتی تاتوا روضة خاخ فان بها ظعینة معها کتاب فخذوه منها) واتە(بڕۆن تا دەگەنە روچە خاخ(لە نێوان مەککەو مەدینە) لەوێ ئافرەتێك هەیە نامەیەکی پێیە لێی وەربگرن) ئێمەش چووین و پەلەمان کرد تا چووین و ئافرەتەکەمان بینی و وتمان نامەکە دەربێنە، وتی: پێم نیە، وتمان: یان دەیهێنیت یان جلت ناهێڵین، ئەویش لە پرچەکانیدا دەریهێنا، بردمان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نامەی حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەی تێدابوو بۆ خەڵکێکی بێباوەڕی ناو مەککە کە هەواڵی چەند کارێکی پێغەمبەری خوای پێدەدان، فەرمووی(ئەی حاتیب ئەمە چیە؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەرم پەلەمەکە، من لەناو قوڕەیشدا کەسێکم خۆم هەڵواسیبوو، دەیانوت تۆ هاوپەیمان بوویت و لە خۆیان نەبوویت، تۆ لە کۆچەرانیت و ئەوانیش نزیك و خزمیان هەن تا ماڵ و منالیان بپارێزن، منیش حەزم کرد ئەگەر ئەمەم نەبوو لەلایان دەستێکم هەبێت تا کەسانم بپارێزن و ئەمەم لەبەر هەڵگەڕانەوەم لە ئیسلام و ڕازیبوونم لە کوفر نەکردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اما انه صدقکم) واتە(ئەو ڕاستتان لەگەڵ دەکات) عومەر وتی: پێغەمبەری خوا ڕێم بدە تا بدەم لە ملی ئەو دوو ڕووە، فەرمووی(انه قد شهد بدرا و ما یدریك لعل الله قد اطلع علی من شهد بدرا فقال اعلموا ما شئتم فقد غفرت لکم)واتە(ئەو بەشداری بەدربووە و چوزانیت لەوانەیە خوا کە بە باری بەشداربوانی بەدر شارەزایە فەرمووبێتی چی دەکەن بیکەن لێتان خۆش بووم) ئەو کات ئەم ئایەتە دابەزی(یا ایها الذین امنوا لاتتخذوا عدوي و عدوکم اولیاء.... فقد ضل سواء السبیل).[1]

---

[1]- ئەوانی دیکەش هێناویانە جگە لە ئیبن ماجە، ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی صەحیحە. لە البدایه والنهایه ج٤ ص٢٨٤ دا هاتووە.

ئەحمەد لە فەرموودەکەی جابرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی و تیایدا هاتووە من وەك ناپاکی بەرامبەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەمکردووەو لە دووڕووییەوە نەبووەو زانیومە خوا پێغەمبەرەکەی سەردەخات بەڵام من لەنێویاندا نامۆم و دایکم لەگەڵیانە، ویستم لەلایان پشتێکم هەبێ، عومەر پێی وت: ئایا نەدەم لە ملی! فەرمووی(اتقتل رجلا من اهل بدر؟ و مایدریك لعل الله قد اطلع اهل بدر فقال اعملوا ما شئتم)[1].[2] هەروەك هەیسەمی لە ج٩ ص٣٠٣ داو ئەبویەعلا لە ئەبی مەتەرەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلیم(رضي الله عنه) بینی کەسێك هێنرا بۆ لای و وتیان: ئەمە وشترێکی دزیوە، وتی: ئایا دزیوتە؟ وتی: بەڵێ، وتی: لەوانەیە هاوشێوە بووبێت بۆت؟ وتی: ناخۆم بووم دزیم، وتی: دەی بیبە ئەی قونبور؟ پەنجەکانی ببەستەو ئاگربکەرەوە جەزار بانگ بکە تا بیبڕێت، ئینجا چاوەڕێ بە تادێم، کە چوون پێی وت ئایا دزیوتە؟ وتی: نا، ئەویش وازی لێهێنا، وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی وازت لێ هێنا خۆ پێشتر دانی پێدانا؟ وتی: بەقسەیەکی دەیگرم و بە قسەیەکیشی وازی لێ دێنم پاشان عەلی(رضي الله عنه) وتی: دزێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد دەستی بڕدرا، پاشان گریا، وتم: بۆچی دەگریت؟ فەرمووی چۆن نەگریم کە ئوممەتم لەبەردەمتاندا دەستی دەبڕدرێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی لێی خۆش نابیت، فەرمووی(ذاك لسلطان سوء الذي يعفو عن الحدود، ولكن تعافوا الحدود بينكم)واتە(ئەوە سوڵتانی خراپە کە لێبوردن لە سنورەکانی خوادا بەکاردێنێ، بەڵام لە سنوری نێوان خۆتاندا لێبوردەبن)[3].

---

[1] – صحيح.

[2]– لەم ڕووەوە ئیمامی ئەحمەد بە تەنها هێناویەتی و سەنەدەکەی لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە، لە البدايه والنهايه ج٤ ص١٨٤ دا هاتووە، هەیسەمی ج٩ ص٣٠٣ دەڵێت: ئەحمەد و ئەبویەعلا هێناویانەو کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد صەحیحن، تەواو. حاکمیش هێناویەتی، هەروەك لە کنز العمال ج٧ ص١٣٧ دا هاتووە، هەروەها ئەبویەعلا و بەزارو تەبەرانی لە عومەرەوە هێناویانە، هەیسەمی ج٩ ص٣٠٤ دەڵێت: کەسەکانی صەحیحن، ئەحمەد و ئەبویەعلا لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانەو کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد صەحیحن.

[3] – ضعيف.

عەبدولڕەزاق و ئیبن ئەبی دونیا و ئیبن ئەبی حاتەم و تەبەرانی و حاکم و بەیهەقی لە ئەبی ماجدی حەنەفیەوە هێناویانە کەسێك برازاکەی هێنا بۆ لای ئیبن مەسعود کە برازاکەی سەرخۆش بوو، وتی: ئەمەم بە سەرخۆشی بینی، وتی: بیتەکێنن و بیجووڵێنن تا هەناسە بکێشێ بزانن بۆنی عارەقی لێ دێت، کەوایانکرد بۆنی عارەقیان لێ بەدیکرد، عەبدوڵڵا فەرمانی کرد بیکەنە بەندینخانە، دواتر بەیانی هێنایەدەر، دواتر فەرمانی کرد بە قامچی لێیبدەن، خوارەوەی پێچدا تا ئازاری کەم بێت، بە جەللادەکەی وت: لێیدەو دەستت بگێڕەوەو بۆ هەرکامیان ماف خۆی پێبدە، عەبدوڵڵا دانەیەکی لێدا کە توندنەبوو و گێڕایەوە، وترا: ئەبوماجید؟ ئەو لێدانە چی بوو؟ وتی: لێدانی سەرکردەکان، وترا: ئەی دەستت بگێڕەوە چی بوو؟ وتی: تا بنباڵی دەرنەکەوێت. عەبدولڕەزاق لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: یەکەم حەددی ناو ئیسلام جێبەجێ کرا کابرایەك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و شایەتی لەسەر درا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد دەستی ببڕن، لە کاتی حەددەکەدا کابرا سەیری پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) کرد وەك حاڵێکی بێزاری، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا دەڵێیت بڕینی دەستیت لا سەختە؟ فەرمووی(وما يمنعني و انتم اعوان الشيطان على اخيكم) واتە(ئەی چۆن کە ئێوە دژ بە براکەتان یارمەتی شەیتان دەدەن) وتیان: دەی بینێرەوە، فەرمووی(فهلا قبل ان تاتيني به ان الامام اذا اتي له بحد لم ينبغي له ان يعطله) واتە(با پێش ئەوەی بتانهێنایە بۆ لام، ئیمام کە حەددێکی هێنرایەلا نابێت لەکاری بخات)[١،٢].

---

[١] - حسن.

[٢] - لە کنز العمال ج٣ ص٨٢و ٨٩ داهاتووە.

بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عومەر لە حەجێك یان عەمرەیەکدا بووم سوارێکیان بینی عومەر وتی: وادەزانم بە دوای ئێمەدا دێت، کابرا هات و گریا، وتی:چی بووە؟ ئەگەر بارت سەختە یارمەتیت دەدەین، ئەگەر ترسایت پەنات دەدەین، مەگەر کەسێکت کوشتبێت ئەو کات لەسەری دەکوژرێیتەوە ئەگەر ڕقت لە هاودەمی کەسانێکە شوێنت دووردەگرین لێیان، وتی: مەیم خواردووەتەوەو یەکێکم لە بەنی تیم و ئەبی مووسا جەلدی لێدام و سەری تاشیم ڕووی ڕەش کردم و لەناو خەڵکدا گەڕاندمی و وتی: لەگەڵی دامەنیشن و نانی لەگەڵ مەخۆن، منیش وتم: یەکێ لەم سێ شتە دەکەم، یان شمشێرێ هەڵگرم و ئەبوموسا بکوژم، یان بێم بۆ لات و بمنێریت بۆ شام چونکە نامناسن، یان بچم بۆ لای دوژمن و لەگەڵ ئەوان بخۆم و بخۆمەرەوە، عومەر گریا و وتی: باش بوو ئەمەیانت کرد عومەر وای بەسەربێت، من لە سەردەمی نەفامیدا لە هەموان زیاترم دەخواردەو و وەك زینا نیە، نامەی نووسی بۆ ئەبومووسا: سەلامت لێ بێت، پاشان فڵانی کوڕی فڵانی تەیمی ئەوەی پێ وتم ئەی هاوار بۆت، ئەگەر بێیتەوە ڕووت ڕەش دەکەم و لەناو خەڵکدا دەتگێڕم، ئەگەر ویستت بزانیت حەقی قسەکەم بزانیت وەرەوە فەرمان بە خەڵك بکە لەگەڵی دابنیشن و بخۆن، ئەگەر تەوبەی کرد شایەتی قبووڵ بکەن) نامەکەی پێداو دوو سەد درهەمیشی پێدا.[1]

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٠٧ دا واهاتووە

## (پاساوهێنانەوە بۆ کاری موسڵمانان)

ئیبن سەعد لە ئەبی عەون و جگە لەویشەوە هێناویەتی خالیدی کوڕی وەلید(رضي الله عنه) بانگەشەی کرد مالیکی کوڕی نوەیرە بە قسەیەك کە لێوەی پێمکەیشتبوو لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، مالیك بەوە ناڕازی بوو و وتی: من لەسەر ئیسلامم و نەگۆڕاوم، ئەبوقەتادە و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(رضي الله عنه) شایەتییان بۆ دا، خالید چوو بۆ لای و فەرمانی کرد بە زیراری کوڕی ئەزوەری ئەسەدیو زیرار دای لە ملی مالیك، خالید ژنەکەی مالیکی(ئوم موتمم)ی برد و لە خۆی مارەکرد، عومەر کوشتنی مالیكو هێنانی ژنەکەی بیستو بە ئەبوبەکری وت: ئەو زینای کردووە ڕەجمی بکەن، ئەبوبەکر وتی: من ڕەجمی ناکەم پاساوی هێناوەتەوەو نەیپێکاوە، وتی: ئەو موسڵمانێکی کوشتووە بیکوژەرەوە، وتی: نایکوژم پاساوی هێناوەتەوەو نەیپێکاوە، وتی: دەی لایبە، وتی: شمشێرێك خوا دژ بە بێباوەڕان هەڵیکردووە هەرگیز نایخەمەوە ناو کالان.[1]

## (ڕقبوون لە تاوان نەوەك تاوانکار)

ئیبن عەساکیر لە ئەبی قولابەوە هێناویەتی ئەبودەردا(رضي الله عنه) دای بە لای کابرایەکدا کە تاوانێکی کرد، خەڵکی قسەیان پێدەوت، وتی: ئەگەر لەناو چاڵێکدا بتانبینیایە ئایا دەرتان نەدەهێنا؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دەی قسە مەڵێن بە براکەتانو سوپاسی خوا بکەن کە ئێوەی پاراستووە وتیان: تۆ ڕقت لێی نیە؟ وتی: ڕقم لە کارەکەیەتی، ئەگەر وازی لێهێنا برامە،[2] هەروەها لە ج٤ ص٢٠٥ لە ئیبن مەسعودەوە دەڵێت: ئەگەر براکەتان بینی تاوانێکی تووش بوو یارمەتی شەیتان مەدەن دژ بە براکەتان و بڵێن خوایە سەرشۆڕی بکەیت، نەفرینی خوای لێ بێت،

---

[1] - کنز العمال ج٣ ص١٣٢.

[2] - لە کنز العمال ج٢ ص١٧٤ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٢٥ لە ئەبی قولابەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

بەڵکو نزای سەلامەتی لای خوا بۆ بکەن، چونکە ئێمەی هاوەڵانی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بەرامبەر کەس شتێکمان نەدەوت تا بمانزانیایە لەسەر چی دەمرێت، ئەگەر بەخێر بڕۆیشتایە دەمانزانی خێری پێکاوە، ئەگەریش بە خراپە بڕۆیشتایە دەمانشاردەوەو جاڕمان نەدەدا.

## (سەلامەتی دەروون لە دەست ناپاکی و حەسوودی)

ئەحمەد بە سەنەدی حەسەن و نەسائی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دانیشتبووین فەرمووی(ئێستا کەسێکتان لێ بەدیار دەکەوێت کە لە ئەهلی بەهەشتە) یەکێك لە پشتیوانان دەرکەوت کە لە دەستنوێژەکەیەوە ڕیشی تەڕببوو و نەعلەکانی بە دەستی چەپیەوە بوون، بۆ بەیانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەمان شتی وت: کابراش هەروەك خۆی دەرکەوتەوە، ڕۆژی سێیەم ئەمە دووبارە بوویەوە، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا عەبدوڵڵای کوڕی عەمر وتی: لەگەڵ باوکم ڕقەبەریم کردو سوێندم خواردووە سێ ڕۆژ نەچمەوە ماڵ، ئەگەر پێت باشە پەنام بدەیت تا ئەم ماوە لات بم، وتی: باشە، ئەنەس دەڵێت: عەبدوڵڵا باسی دەکرد ئەو سێ شەوە لە لای مایەوەو نەیبینی شەو نوێژی هەبێ مەگەر ئەوەی کە بێداردەبوویەوە وەردەچەرخاو زیکری خوای دەکرد و الله اكبری دەوت تا نوێژی بەیانی، عەبدوڵڵا وتی: بەڵام هەردەم جگە لە قسەی خێر هیچم لێ نەدەبیست، کە سێ شەوەکە تەواو بوو خەریکبوو کارەکەیم بەکەم دەزانی وتی: ئەی بەندەی خوا من و باوکم هیچ کێشەمان لەنێواندا نەبوو بەڵام بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سێ جار بە تۆی فەرموو(يطلع عليكم الان رجل من اهل الجنة) ئەو سێ جارە تۆ دەرکەوتیت وتم: دێم بۆ لات تا بزانم چی دەکەیت منیش پێشەنگیت پێوەبکەم بەڵام کارێکی گەورەم لێ بەدی نەکردیت کە بگاتە ئاستی ئەو فەرموودەیە؟ وتی: دەی هەرئەوەیە کە بینیت، کە چووم بانگی کردم و وتی: هەر

ئەوەم هەیە بەڵام لە دەروونمدا هیچ کینەو حەسودیەکم بۆ هیچ موسڵمانێك نیە کە خوا پێی بەخشیوە، عەبدوڵڵا وتی: دەی ئەوەیە گەیاندویتیە ئەوە. ئەبویەعلاو بەزار بەو جۆرە هێناویانە ناوی کەسە نادیارەکەشیان بە سەعد هێناوە و لە کۆتاییەکەیدا دەڵێن: سەعد وتی: برازاگیان هەر ئەوەیە کە بینیت بەڵام من هەرگیز ڕقم بەرامبەر هیچ موسڵمانێك نەهێشتووەتەوە – نەسائی لە گێڕانەوەیەکیدا و بەیهەقی و ئەسبەهانیش هێناویانە. عەبدوڵڵا وتی: دەی ئەوە تۆی گەیاندووەتە ئەوێ و ئێمەش دەرەقەتی نایەین.[1]

ئیبن عەساکیریش بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی و ناوی کابرای بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هێناوە و لە کۆتاییەکەیدا هێناویەتی وتی: هەر ئەوەیە کە دەیبینیت بەڵام لە دەروونمدا خراپەم بۆ یەك موسڵمان نەبووەو نەوتووە، وتی: دەی ئەوەبووە تۆی گەیاندووەتە ئەوێ و منیش دەرەقەتی نایەم[2].[3]

ئیبن سەعد ج٣ ص١٠٢ لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: هاتن بۆ لای ئەبودوجانە ئەو کات نەخۆش بوو و ڕووخساری پرشنگی دەدایەوە، پێی وترا: چیە ڕووخسارت وایە؟ وتی: لە کارمدا شتێکی وانیە جگە لە دوو شت کە لام هەن، یەکێکیان ئەوەیە لە شتێکدا لام گرنگ نیە قسە ناکەم، دووەم دڵم بۆ موسڵمانان سەلامەتە.

---

[1]– لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٣٢٨ دا هاتووە، هەیسەمی ج٨ ص٧٩ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد لەگەڵ سەنەدێکی بەزاردا صەحیحن بەڵام دەقی فەرموودەکە هی ئیبن لوهەیعەیە. ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا ج٤ ص٣٣٨ بۆ فەرموودەکەی ئەحمەد دەڵێت: سەنەدەکەی لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحە.

[2] – ضعیف.

[3] – کنز العمال ج٧ ص٤٣.

## (دڵخۆشبوون بە چاکی باری موسڵمانان)

تەبەرانی لە ئیبن بورەیدەی ئەسلەمیەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك قسەی وت بە ئیبن عەبباس، ئیبن عەبباس وتی: تۆ قسەم پێ دەڵێیت و من سێ خەسڵەتم تێدایە، دەچمە سەر ئایەتێکی قورئان حەزدەکەم هەموو خەڵك ئەوە بزانن کە من دەیزانم، کە دەبیستم فەرمانڕەوایەکی موسڵمانان دادپەروەرە پێی دڵخۆش دەبم و لەوانەشە هەرگیز کارم تێی نەکەوێت، کە دەبیستم بارانی ڕەحمەت وڵاتێکی موسڵمانانی گرتووەتەوە دڵخۆش دەبم و هیچ پشکێکیشم نیە تیایدا.[1]

## (هەڵکردن لەگەڵ خەڵکدا)

ئەحمەد لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك مۆڵەتی لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) وەرگرت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بئس ابن العشيرة) (خراپترینی هۆزەکە) کە هاتە ژوورەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕووی هەستا و ڕێی کردەوە، دواتر چوو و کەسێکی تر داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(نعم ابن العشيره) واتە(چاکترینی هۆزەکە) کە هاتە ژوورەوە پێغەمبەر(ﷺ) نەجووڵا و خۆی نەشڵەژاند، کە چوویە دەرەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا فلان هات و وات فەرموو و خۆت گۆڕی، ئەمەش هات و وات فەرموو و هیچت نەکرد؟ فەرمووی(يا عائشة ان من اشرار الناس من اتقي لفحشه) واتە(عائیشە خراپترینی خەڵك ئەوەیە لە خراپەی خۆپارێزی بکرێ).[2][3] ئەبونەعیم لە الحليه ج٤

---

[1]- هەیسەمی ج٩ ص٢٨٢ دەڵێت: تەبەرانی بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی. بەیهەقیش هێناویەتی هەروەك لە الاصابه ج٢ ص٣٣٤ دا هاتووە، ئەبونەعیم لە الحليه ج١ ص٣٢٢ دا بەو جۆرە هێناویەتی.

[2]- صحيح.

[3]- هەیسەمی ج٨ ص١٧ دەڵێت: ئەحمەد بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی. بوخاری لە الادب المفرد ص١٩٠ بە کورتی هێناویەتی.

ص١٩١ لە صەفوانی کوڕی عەسالەوە دەڵێت: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین کە کابرایەك هات، کە سەیری پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) کرد پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بئس اخو العشيرة و بئس الرجل) کەلێی نزیك بوویەوە لە لای خۆی دانیشاند، کە کابرا هەستا و چوو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کە بینیت وات پێ فەرموو کەچی دواتر نزیکت کردەوە لە خۆت؟ فەرمووی(انه منافق اداريه عن نفاقه فاخشى ان يفسد علي غيره) واتە(ئەوە دووڕوویەکە لەسەر دووڕوویییەکەی لەگەڵی هەڵدەکەم دەترسم خەڵکی ترم لێ دڵ کرمۆڵ بکات).[1]

ئەبونەعیم لە الحليه ج١ ص٢٢٢ لە ئەبودەردائەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئێمە ڕوومان لە ڕووی کەسانێکدا گەش دەکرد کە دڵەکانمان نەفرینیان لێدەکردن.[2]

## (هەوڵی ڕازیکردنی موسڵمانان)

بوخاری لە ئەبودەردائەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) دانیشتبووم کە ئەبوبەکر(رضي الله عنه) هات و لایەکی جلەکەی گرتبوو تائەوەی هەردوو ئەژنۆی دەرکەوتبوون، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اما صاحبكم فقد غامر فسلم) واتە(هاوڕێکەتان ناکۆکی و کێشەیەکی هەبوو سەلامەت بوو) وتی: من و ئیبن خەتتاب شتێکمان لە نێواندا بوو زوو چووم بە ڕوویدا و دواتر پەشیمان بوومەوە و داوام لێکرد لێم خۆش بێت ئەویش ئامادەنەبوو، بۆیە هاتم بۆ لات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر) سێ جار فەرمووی، پاشان عومەر پەشیمان بوویەوە و هات بۆ لای ئەبوبەکرو وتی: هەمتر ئەبوبەکر؟ وتیان: نا، چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ڕووخساری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕەنگی دەگۆڕا تائەوەی ئەبوبەکر ترسا و لەسەر ئەژنۆ کەوت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من

---

[1] – ئەبونەعیم دەڵێت: ئەم فەرموودە غەریبە.

[2] – ئیبن ئەبلی دونیا و ئیبراهیمی حەربی و دەینەوەری هێناویانە. لە فتح الباری ج١٠ ص٤٠٣ دا هاتووە، ئیبن عەساکیر هێناویەتی و لە کنز العمال ج٢ ص١٦٢ دا هاتووە.

ستەمم کرد، دوو جار وتی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خوا منی نارد بۆ لای ئێوە ئێوەش وتتان درۆدەکەیت، ئەبوبەکر وتی ڕاست دەکەیتو بە گیانو ماڵی دڵنەوایی کردم، دەی ئێوە واز لەم هاوەڵەم دێنن؟) دوو جار فەرمووی دوای ئەوە ئەبوبەکر ئازارنەدرا.[1]

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لەگەڵ عومەر شتێکی بوو بە عومەری وت: لێم خۆش بە براگیان، عومەر تووڕە بوو و ئەبوبەکر چەند جار دووبارەی کردەوەو عومەر تووڕە دەبوو، ئەبوبەکر لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) ئەمەی باسکرد و هەردووکیان چوونە خزمەتی و دانیشتن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(یسالك اخوك ان تستغفر له فلا تفعل؟) واتە(براکەت داوات لێدەکات لێی خۆش بیتو تۆیش نایکەیت؟) ئەویش وتی: سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە هەرچی جاری تر بووە وتوومە بەڵێ، لەناو دروستکراوانی خوادا لە دوای تۆ ئەو خۆشەویستترین کەسمە، ئەبوبەکریش وتی: منیش سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە دوای تۆ لە دروستکراوانی خوادا ئەو خۆشەویستترین کەسە لام، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(لا تؤذوني في صاحبي، فان الله عز وجل بعثني بالهدى و دين الحق فقلتم كذبت و قال ابوبكر صدقت ولولا ان الله عز وجل سماه صاحبا لاتخذته خليلا ولكن اخوه الله، الا فسدوا كل خوخة الا خوخة ابن ابي قحافة) واتە(لەمەڕ هاوەڵەکەم ئازارم مەدەن، چونکە خوای گەورە منی بە ڕێنموونی و ئایینی حەق نارد و ئێوە وتتان درۆدەکەیت و ئەبوبەکریش وتی: ڕاست دەکەیت، ئەگەر خوای گەورە بە صاحب ناوی نەهێنایە بە(خلیل)م دەگرت بەڵام برایەکی ڕێی خوایە، دەی بزانن هەموو خەیمەکان داخەن جگە لە چادری ئیبن ئەبی قوحافە).[2][3]

---

[1] - لە صفه الصفوه ج١ ص٩٢ دا هاتووە.

[2] - صحيح.

[3] - هەیسەمی ج٩ ص٤٥ دەڵێت: تەبەرانی بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی.

ئیبن سەعد ج٨ ص١٠٠ لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: ئوم حەبیبە(رضي الله عنها) خێزانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە سەرەمەرگیدا بانگی کردم و وتی: لەوانەیە جاران لە نێوان من و تۆدا شتێ بووبێت خوا لێم خۆش بووەو تۆش ماوی، وتم: خوا لە هەموو ئەوانەت خۆش بێت و حەڵاڵت ڕاگرێ، وتی: دڵخۆشت کردم خوا دڵخۆشت بکات، ناردی بە دوای ئوم سەلەمەشدا و هەمان شتی وت.

بەیهەقی ج٦ ص٣٠١ لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: کە فاتیمە(رضي الله عنها) نەخۆشکەوت ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) هات بۆ لای و مۆڵەتی وەرگت بچێت بۆ لای، عەلی(رضي الله عنه) وتی: فاتیمە ئەوە ئەوبەکرە داوای مۆڵەتت لێ دەکات، فاتیمە وتی: حەزدەکەیت مۆڵەتی بدەم؟ وتی: بەڵێ، ئەویش مۆڵەتی داو ئەبوبەکر چوو بۆ لای دڵی ڕازی بکات، وتی: بەخوا ماڵ و سامان و کەس و هۆز و خێڵم لەبەر ڕەزامەندی خواو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئێوەی ئالوبەیت بەجێهێشت، زۆر لەسەری چوو تا فاتیمە ڕازیبوو.[1]

ئیبن مونزیر لە شەعبیەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: من زۆر ڕقم لە فلان کەسە، بە کابرا وترا: بۆچی عومەر ڕقیەتی لێت؟ کە خەڵکی زۆر بوون هات و وتی: ئەی عومەر ئایا لە ئیسلامدا پەنێکم داوە(دەرچووم)؟ وتی: نا، وتی: ئەی تاوانێکم کردووە؟ وتی: نا، وتی: ئەی بیدعەم داهێناوە؟ وتی: نا، وتی: ئەی بۆچی ڕقتە لێم؟ مەگەر خوا نافەرموێت(والذين يؤذون.... مبينا) الاحزاب ٥٨ دەی تۆ منت ئازار دا خوا لێت خۆش نەبێت، عومەر وتی: بەخوا ڕاست دەکەیت هیچکام لەوانەت نەکردووە دەی لێم خۆش بە، بەردەوام پێی دەوت تا لێی خۆش بوو.[2]

---

[1] – بەیهەقی دەڵێت: ئەم فەرموودە مورسەلی حەسەنە بە سەنەدێکی صەحیح، ئیبن سەعد ج٨ ص٢٧ لە عەمرەوە بەو جۆرە بە کورتی هێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج١ ص٢٦٠ دا واهاتووە.

بەزار لە ڕەجائی کوڕی ڕەبیعەوە دەڵێت: لە مەدینە لە مزگەوتی پێغەمبەردا(ﷺ) لە بازنەیەکدا بووم کە ئەبوسەعیدو عەبدوڵڵای کوڕی عەمری تێدابوو، حەسەنی کوڕی عەلی دای بەلاماندا و سەلامی کردو خەڵکەکە جوابیان دایەوەو عەبدوڵڵای کوڕی عەمر بێدەنگ بوو دواتر کەوتە شوێنی و وتی: علیك السلام و رحمة الله، دواتر وتی: ئەمە خۆشەویستترین کەسی سەرزەویە لە ئاسماندا سوێند بەخوا لە شەوانێکی صفیندا نەمدواندووە، ئەبوسەعید وتی: بۆچی ناچیت و پۆزشی بۆ بهێنیتەوە؟ وتی: باشە، هەستاو ئەبوسەعید چوو مۆڵەتی وەرگرت و چوویە ژوورەوە، دواتر مۆڵەتی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەمر وەرگرت و هاتە ژوورەوە، ئەبوسەعید بە عەبدوڵڵای وت: کاتێ حەسەن تێپەڕی ئەوەی وتت پێمان بڵێ، وتی: بەڵێ دەیڵێم ئەو خۆشەویستترین کەسی سەرزەویە لە ئاسماندا، حەسەن پێی وت: ئەگەر ئەوە دەزانیت دەی بۆچی شەڕت لەگەڵ کردین لە ڕۆژی صفین؟ وتی: بەخوا من لەگەڵ ئەوانەی خەڵکی سواد نەبووم و لەگەڵیان شمشێرم نەوەشاند، بەڵام لەگەڵ باوکم هاتبووم – یان وشەیەکی لەو جۆرە – وتی: مەگەر نازانیت لەسەرپێچی خوادا گوێڕایەڵی بۆ دروستکراو نیە؟ وتی: بەڵێ بەڵام من لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بەردەوام ڕۆژووم دەگرت، باوکم لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ڕۆژ بە ڕۆژووە و شەویش شەونوێژ دەکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ڕۆژوو بگرەو بخەوە، چونکە کەم نوێژدەکەمو دەخەومو ڕۆژوو دەگرمو ڕۆژووش دەکەمەوە، پاشان پێی فەرمووم ئەی عەبدوڵڵا گوێڕایەڵی باوکت بکە، ئەویش لە ڕۆژی صفین دەرچوو و منیش لەگەڵی دەرچووم[1][2].

---

[1] – صحيح.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص١٧٧ دەڵێت: بەزار هێناویەتی و کەسەکانی سنەدەکەشی صەحیحن جگە لە هاشمی کوڕی برید کە جێ متمانەشە، تەواو.

تەبەرانی لە ڕەجائی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی دەڵێت: من لە مزگەوتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بووم، کە حوسەینی کوڕی عەلی(رضي الله عنه) هات و سەلامی کرد و خەڵکەکە وەڵامیان دایەوە و عەبدوڵڵای کوڕی عەمر بێدەنگ بوو، دواتر دەنگی بەرزکردەوە پاش بێدەنگ بوونی خەڵکەکە وتی: و عليك السلام و رحمة الله وبركاته، پاشان ڕوویکردە خەڵکەکە و وتی: پێتان بڵێم کێ خۆشەویستترین کەسی سەر زەویە لای ئاسمانیەکان؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەوەی کە چوو سوێند بەخوا لە شەوانێکی صفینەوە تا ئێستا هیچکاممان یەکترمان نەدواندووە، ئەگەر لێم ڕازی بێت لام خۆشترە لەوەی هێندەی ئوحود سامانم هەبێ، ئەبوسەعید(رضي الله عنه) پێی وت: دەی بۆچی ناچیت بۆ لای؟ وتی: باشە دەچم، بەڵێنیان دا بچن بۆ لای و منیش لەگەڵیان چووم، ئەبوسەعید مۆڵەتی وەرگرت و چوویەژوورەوە و ئێمەش چووینەژوورەوە و مۆڵەتیشی بۆ ئیبن عەمر وەرگرت و زۆر داوای کرد تا حەسەن مۆڵەتی پێدا، هاتەژوورەکە بینی ئەو کات لەپاڵ حوسەیندا دانیشتبوو خۆی کشاندە ئەولاوە، حوسەین ڕایکێشا بۆ لای و ئیبن عەمر هەستا و دانەنیشت، کە ئەوەی بینی لای ئەبی سەعیدی چۆڵ کرد و کشایە ئەولاوە لەنێوانیاندا دانیشت، ئەبوسەعید چیرۆکەکەی گێڕایەوە و وتی: وایە ئیبن عەمر؟ تۆ دەزانیت من ئازیزترین کەسی سەر زەویم لای ئاسمانیەکان؟ وتی: ئەرێ بەخوای کەعبە، وتی: دەی بۆچی لە ڕۆژی صفین لەگەڵ من و باوکم جەنگایت؟ خۆ باوکم لە من باشتر بوو، وتی: بەڵێ بەڵام عەمری لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شکاتی کردم و وتی: عەبدوڵڵا بەڕۆژ بەڕۆژووە و بەشەو شەونوێژ دەکات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(نوێژ بکە و بخەوە و ڕۆژوو بگرە و بەربانگیش بکەرەوە و گوێڕایەڵی عەمریش بە، ڕۆژی صفین بەخوا سوێندی دام، بەخوا هیچ یارمەتیم نەدان و شمشێرم بۆ نەوەشاندن و ڕمێکم نەخستەکار و تیرێکم نەوەشاند، حەسەن وتی: مەگەر نازانی لە سەرپێچی خوادا گوێڕایەڵی دروستکراو نیە؟[1]

---

[1]- هەیسەمی ج٩ ص١٨٧ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و لە سەنەدکەدا عەلی کوڕی سەعیدی کوڕی بەشیرە هەیە کە نەرمی لێ بەدیدەکرێت، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو.

## (بەجێگەیاندنی پێویستی موسڵمان)

نوسی لە عەلیەوە هێناویەتی دەڵێت: نازانم کام دوو بەخشە لەسەرم گەورەترن لەوەی کەسێك جوانی ڕووی بخاتە گەڕ بۆم و لە کاتی پێویستیدا بمبینێ و خوای گەورە پێویستیەکەی بۆ بەجێ بگەیەنێت یان لەسەر دەستی من ئاسانی بکات، ئەگەر پێویستی موسڵمانێك بەجێ بگەیەنم لام خۆشەویستترە لەوەی پڕی دونیا زێڕو زیوم هەبێت.[1]

## (وەستان بۆ پێویستی موسڵمان)

ئیبن ئەبی حاتەم و دارمی و بەیهەقی لە ئەبی یەزیدەوە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) گەیشت بە ئافرەتێك کە پێی دەوترا(خەولە) لەگەڵ خەڵك دەچوو و داوای کرد عومەر بوەستێ، ئەویش بۆی وەستا و لێی نزیك بوویەوە و سەری بۆ دانەواندو دەستەکانی خستە سەرشانی تائەوەی پێویستیەکەی بەجێگەیاند و ژنەکە چوو، کەسێك پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران خەڵکانێکی قوڕەیشت لەبەر ئەو پیرەژنە وەستاند؟ وتی: قوڕبەسەر دەزانیت ئەوە کێ بوو؟ وتی: نا، وتی: ئەوە ئافرەتێك بوو خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە سکاڵای بیست، ئەوە خەولەی کچی سەعلەبەیە، سوێند بەخوا ئەگەر تا ئەویش نەچوایە نەدەچووم تا ئیشەکەی تەواو بوایە.

بوخاری و ئیبن مەردەویە لە سومامەی کوڕی حەزنەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: عومەر لەسەر گوێدرێژەکەی دەچوو کە ئافەرتێکی پێگەیشت، وتی: عومەر بوەستە، عومەر وەستا و ژنەکە بە ڕەقی دواندی، کەسێك وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە، وتی: دەی چی ڕێگرە تا گوێی لێنەگرم کە خوا گوێی لێگرتووە و لەسەری قورئانی دابەزاندووە(قد سمع اله قول التي...)[1،2].

---

[1] - کنز العمال ج٣ ص٣١٧.

[2] - المجادله ١

# (ڕێکردن بۆ پێویستی موسڵمانان)

تەبەرانی و بەیهەقی – دەقەکە هی ئەوە – و حاکم بە کورتی هێناویەتی و دەڵێت: سەنەدەکە صەحیحە لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە کە لە مزگەوتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئیعتیکافی دەکرد کەسێك هات و سەلامی لێکرد، دواتر دانیشت، ئیبن عەبباس پێی وت: فلان کەس بە غەمبارو دڵتەنگ دەتبینم، وتی: بەڵێ ئامۆزای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فلان کەس مافی هۆگری و حورمەتی خاوەنی ئەو گۆڕەی هەیە لەسەرم و منیش توانایم نیە، ئیبن عەبباس وتی: چۆنە لەسەر تۆ قسەی لەگەڵ بکەم؟ وتی: ئەگەر پێت خۆشە، ئیبن عەبباس نەعلەکانی کردەپێی و لە مزگەوت دەرچوو، کەسێك پێی وت: بیرت چوو لەچیدایت(ئیعتیکاف؟) وتی: نا بەڵام لە خاوەنی ئەم گۆڕەم بیست کە سەرەمەرگی نزیك بوو چاوەکانی فرمێسکیان لێهات و دەیفەرموو(من مشى في حاجة اخيه وبلغ فيها كان خيرا له من اعتكاف عشر سنين و من اعتكف يوما ايتغاء وجه الله تعالى جعل الله بينه و بين النار ثلاث خنادق ايعد مما بين الخافقين) واتە(هەرکەس بۆ پێویستی براکەی ڕێ ببڕێت و پێی بگات لە ئیعتیکافی دە ساڵ بۆی باشترە، هەرکەس ڕۆژێك لەبەر خوای گەورە ئیعتیکاف بکات خوای گەورە نێوانی ئەو و ئاگر سێ خەندەق دادەنێت کە دوورترە لە نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا(ئاسمان و زەوی))[٢،٣].

---

[١] – لە کنز العمال ج١ ص٢٦٨ دا واهاتووە.

[٢] – ضعیف.

[٣] – لە الترغب والترهیب ج٢ ص٢٧٢ دا واهاتووە.

# (سەردانی موسڵمان)

ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی قەیسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زۆر سەردانی پشتیوانانی دەکرد بە تایبەت و بە گشتی، ئەگەر بەتایبەت سەردانی بکردایە دەچوو بۆ لای کەسێك لەماڵەکەیدا، ئەگەر بە گشتی بوایە دەچوو بۆ مزگەوت.[1][2]

بوخاری لە الادب المفرد ص٥٢ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە سەردانی ماڵێکی پشتیوانانی بکردایە لەلایان نانی دەخوارد کە دەچوو داوای دەکرد لەلایەکی ماڵەکەدا شتێکیان بۆ ڕادەخست و نوێژی لەسەر دەکردو نزای بۆ دەکردن.[3]

تەبەرانی لە عەونەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن مەسعود(رضي الله عنه) کاتێك هاوەڵان هاتن بۆ لای پێی وتن: پێکەوە دادەنیشن؟ وتیان: دەستبەرداری نابین، وتی: ئەی سەردانی یەکدی دەکەن؟ وتیان: بەڵێ ئەبوعەبدولڕەحمان کەسمان هەیە بۆ براکەی دەگەڕێت تائەوپەڕی کوفە بەپێ دەڕوات تا دەیبینێت، وتی: تاوابن لە خێردا دەمێننەوە.[4]

بوخاری لە الادب المفرد ص٥٢ لە ئوم دەرائەوە هێناویەتی دەڵێت: سەلمان(رضي الله عنه) لە مەدائینەوە بۆ شام بەپێ هات بۆ سەردانمان و جلی(ئەندوزد)[5]ی لەبەردابوو.[6]

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص١٧٣ دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی و لە سەنەدەکەیدا کەسێك هەیە کە ناوی نەهاتووە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحین، تەواو.

[3] – صحیح.

[4] – ئەمە مونقەتیعە لە الترغیب والترهیب ج٤ ص١٤٤ دا هاتووە.

[5] جۆرێکی جلە کە تاخوار ئەژنۆ دێت.

[6] – ضعیف.

# (ڕێزگرتنی سەردانکەر)

ئەحمەد لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پشتیەکی بۆ فڕێدام کە ناواخنەکەی ڕیشاڵی دارخورما بوو لەسەری دانەنیشتم و لەنێوانماندا مایەوە[1,2].

تەبەرانی لە ئوم سەعدی کچی ئیبن ڕەبیعەوە هێناویەتی کە چوو بۆ لای ئەبوبەکر، ئەویش بەرگەکەی بۆ هەڵدا تا لەسەری دابنیشێ، عومەر(رضي الله عنه) هاتەژوور و پرسیاری لە ئەبوبەکر کرد، ئەویش وتی: ئەمە کچی کەسێکە کە لە من و تۆ باشترە، وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوە کێیە؟ وتی: کەسێك لە سەردەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرد کە شوێنی لە بەهەشتدایە و من و تۆیش ماینەتەوە[3,4].

حاکم ج٣ ص٥٩٩ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سەلمانی فارسی(رضي الله عنه) چوو بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) کە پاڵی دابوویەوە بە سەرینێکەوە، سەرینەکەی فڕێدا بۆ سەلمان، ئەویش وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە، عومەر وتی: ئەبوعەبدوڵڵا پێمان بڵێ چیە، وتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و پاڵی دابوویەوە بەسەرینێکەوە بۆی فڕێدام و پاشان پێی فەرمووم(یا سلمان ما من مسلم یدخل علی اخیه فیلقي له وسادة اکراما له الا غفر الله له) واتە(ئەی سەلمان هەرکەس بچێ بۆ لای براکەی و ئەویش وەك ڕێز لێگرتنی سەرینێکی بداتێ خوای گەورە لێی خۆش دەبێت).[5]

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص١٧٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن.

[3] – ضعیف.

[4] – لە الاصابە ج٢ ص٢٧ دا هاتووە، هەیسەمی ج٩ ص٣١٠ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا ئیسماعیلی کوڕی قەیسی کوڕی سەعد هەیە کە لاوازە، حاکم ج٣ ص٦٠٧ هێناویەتی و بە صەحیحی دەزانێت، زەهەبی دەڵێت: بەڵکو ئیسماعیل بە لاواز دادەنێن.

[5] – ضعیف.

تەبەرانی لە ئەنەسی کوڕی مالیەکەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: عومەر هات بۆ لای سەلمانی فارسی(ﷺ) و سەلمان سەرینێکی بۆ دانا، ئەویش وتی: ئەبوعەبدوڵڵا ئەمە چیە؟ وتی:لە پێغەمبەرم(ﷺ)بیست فەرمووی(هەر موسڵمانێك برا موسڵمانەکەی بێت بۆ لای و ئەویش وەك ڕێزگرتن و بە گەورەدانانی سەرینێکی بۆ دابنێ خوای گەورە لێی خۆش دەبێت)[1].[2]

تەبەرانی لە ئیبراهیمی کوڕی نەشیتەوە هێناویەتی چوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی حارسی کوڕی جزئی زوبەیدی ئەویش سەرینێکی بۆ فڕێ دا کە لای خۆی بوو و وتی: هەرکەس ڕێزی میوانی نەگرێت لە ئەحمەد و ئیبراهیم(علیهما السلام) بەدوورە[3].[4]

## (ڕێزگرتنی میوان)

بوخاری لە الادب المفرد ١١٠ لە سەهلی کوڕی سەعدەوە(ﷺ) هێناویەتی ئەبوئوسەیدی ساعدی(ﷺ) لە کاتی ئاهەنگی بوکێنیدا پێغەمبەری(ﷺ) بانگکرد و ژنەکەی کە بووك بوو خزمەتی دەکردن، ژنەکە وتی: دەزانن چیم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دانا؟ چەند خورمایەکم لە شەودا لە قاپێکدا بۆ دانا.

ئیبن جەریری تەبەری لە ئیبراهیمی کوڕی شەیبان لە کەسێکەوە هێناویەتی دەڵێت: دوو کەس چوون بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی حارسی کوڕی جزئی زوبەیدی(ﷺ) ئەویش سەرینێکی لەژێردابوو دای بەوان، وتیان: ئەمەیان ناوێت تا شتێك ببیستین سوودمەند بین، وتی: هەرکەس ڕێزی میوانی نەگرێت لە ئوممەتی

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە سەنەدەکەدا عیمرانی کوڕی خالیدی خوزاعی هەیە کە لاوازە.

[3] – ضعیف.

[4] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص١٤٦ دا هاتووە و دەڵێت تەبەرانی بە مەوقوفی هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەش جێ متمانەن.

موحەممەد و ئیبراهیم(علیهما السلام) نیە، سەربەرزی بۆ بەندەیەك ئێوارە بكاتەوە دەستی لە ڕەشمەی ئەسپەكەی بێت لەڕێی خوادا بە پارچەنانێك و ئاوێكی سارد ڕۆژوو بكاتەوە، هاوار و مەرگان بۆ ئەوانەی وەك مانگا هەمەچەشنەی زۆر دەخۆن(ئەی غوڵام ئەوە لابەو ئەوە دابنێ) لەوەشدا یادی خواناكەن[1,2].

## (ڕێزگرتنی گەورەو بەڕێزی دەستەیەك)

تەبەرانی لە جەریری كوڕی عەبدوڵڵای بەجلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی كە چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كە لە ماڵێكی قەرەباڵەغدا بوو، لەبەردەرگادا وەستا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەیری ڕاستو چەپی كرد و هیچی بەیدنەكرد، بۆیە عەباكەی هەڵگرتو دەقیكردو فڕێیداو فەرمووی(لەسەری دانیشە) جەریر هەڵیگرتو ماچیكرد و دواتر گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەك چۆن ڕێزت لێگرتم خوا ڕێزدارتر بكات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اذا اتاكم كريم قوم فاكرموه) واتە(ئەگەر ڕێزداری دەستەیەك هات بۆ لاتان ڕێزی بگرن)[3,4].

تەبەرانیش لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی جەریری كوڕی عەبدوڵڵا(رضي الله عنه) چوویەژوو و ماڵ پڕبوو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شوێنی بۆ دانیشتنی بەدینەكرد بۆیە جلەكەی خۆی یان عەباكەی خۆی بۆ فڕێداو فەرمووی(لەسەر ئەوە دانیشە) ئەویش گرتیو ماچی كرد و پێیدایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەك چۆن ڕێزت لێگرتم خوا ڕزدارت بكات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەگەر ڕێزداری دەستەیەك هات بۆ لاتان ڕێزی بگرن)[5].

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە كنز العمال ج٥ ص٦٦ دا واهاتووە.

[3] – ضعيف.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص١٥ دەڵێت: لە سەنەدەكەدا عەونی كوڕی عەمری قەیسی هەیە كە لاوازە.

[5] – هەیسەمی ج٨ ص١٦ دەڵێت: تەبەرانی لە الاوسگ و بەزار بە كورتی یەكی زۆر هێناویەتی و لە سەنەدەكەدا كەسی وا هەن كە نایانناسم. تەواو.

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عویەینەی کوڕی حصن(رضي الله عنه) هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر و عومەری لابوو و هەموویان لەسەر زەوی دانیشتبوون. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داوای ڕاخەرێکی کرد بۆ عویەیەنەو لەسەری دانیشاند و فەرمووی(ئەگەر ڕێزداری هۆزێك هات بۆ لاتان ڕێزی لێ بگرن)[1،2].

دولابی لە الکنی ج١ ص٢١ لە ئەبوڕاشیدی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ سەد کەسی هۆزەکەمدا چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نزیك بووینەوە وەستاین و پێیان وتم: تۆ ئەی ئەبوموعاویە پێش بکەوە ئەگەر شتێکی باشت بینی وەرە بۆ لامان تا ئێمەش بچین بۆ لای، ئەگەر شتێکی ناحەزت بینی وەرەوە و ئێمەش ناچین، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بچوکترینی هۆزەکەم بووم، وتم: بەیانیت باش ئەی موحەممەد، فەرمووی(لیس هذا بسلام المسلین بعضهم علی بعض) واتە(ئەمە سەلامی موسڵمانان نیە بۆ یەکتر) منیش پێم وت: ئەی چۆنە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی(ئەگەر هاتی بۆ لای دەستەیەکی موسڵمانان بڵێ السلام علکم و رحمه الله) منیش وتم: سەلامی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(و علیك السلام و رحمة الله و برکاته) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم(ناوت چیەو تۆ کێیت؟) وتم: من ئەبوموعاویەی کوڕی عەبدلات و عوززام، پێی فەرمووم(بەڵکو تۆ ئەبوڕاشد عەبدولڕەحمانیت) ڕێزی گرتم و لە پاڵ خۆیدا دایینشاندم و جلەکەی بەری بۆ دانام و نەعلەکەی پێدام و گۆچانەکەی دەستی پێدام و منیش موسڵمان بووم، لەناو ئەوانەیدا دانیشتبوون بە پێغەمبەری فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بینیمان

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص١٦ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و کەسی وا لە سەنەدەکەدا هەیە کە نایانناسم.

ڕێزی ئەو کابرات گرت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون(هذا شریف قومه فاذا اتاکم شریف قومه فاکرموه) واته(ئەوه گەورەو بەڕێزی هۆزەکەیەتی، ئەگەر گەورەو بەڕێزی هۆز هات بۆ لاتان ڕێزی بگرن) فەرموودەکە دێنێت.[1]

## (دڵڕاکێشانی سەردەسته)

ئەبونەعیم ج۱ ص۳۵۲ له ئەبوزەرەوه(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(کیف تری جعیلا) واته(جوعەیل چۆن دەبینیت؟) وتم: هەژارێکی وەك خەڵك، فەرمووی(ئەی فلان کەس چۆن دەبینیت؟) وتم: گەورەیەکی خەڵکه، فەرمووی(جعیل خیر من مثل هذا ملء الارض) واته(دەی جوعەیل باشتره له نمونەی پڕی دونیا لەو جۆره کەسه) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەی فلان کەوایه تۆ وا ڕێزی دەگریت و وای لەگەڵ دەکەیت؟ فەرمووی(انه راس قومه فانا اتالفهم) واته(ئەو سەردەستەی هۆزەکەیەتی و من ڕایان دەکێشم)[2] ئیبن ئیسحاقیش له موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی تەیمیەوه هێناویەتی دەڵێت: به پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وترا: سەد سەدت دا به عویەینەی کوڕی حصن و ئەقرەعی کوڕی حابس و به جوعەیلت نەدا؟ فەرمووی(والذي نفسي بيده لجعيل بن سراقة خير من طلاع الارض مثل عيينة والاقرع لكني اتالفهما و اكل جعيلا الى ايمانه) واته(سوێند بەوەی گیانمی بەدەسته به دڵنیاییەوه جوعەیلی کوڕی سوراقه زۆر باشتره له پڕی دونیای

---

[1]- ئیبن منده لەم ڕووەوه بەکورتی هێناویەتی، ئیبن سکن هێناویەتی و له الاصابه ج۲ ص۴۰۹ دا هاتووەن له منتخب کنز العمال ج۵ ص۲۱٦ یشدا هاتووه.

[2]- له کنز العمال ج۳ ص۳۲۰ دا هاتووه. ڕەویانی له موسنەدەکەیدا و ئیبن عەبدولحەکەم له فتوح مصردا به سەنەدی صەحیح هێناویەتی، ئیبن حیببان لەلایەکی دیکەوه له ئەبوزەرەوه هێناویەتی بەڵام ناوی جوعەیلی نەهێناوه، بوخاریش له فەرموودەی سەهلی کوڕی سەعدەوه هێناویەتی، جوعەیلی لەگەڵ ئەبوزەردا ناو نەبردووه.

پێغەمبەری(ﷺ) دڵخۆش دەکرد، ڕۆژێك عەبباس هات و ئەبوبەکریش شوێنەکەی بۆ چۆڵ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ما لك ؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مامت هات، پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کرد، پاشان زەردەخەنەی کردو سەیری ئەبوبەکری کردو فەرمووی(هذا عباس قد اقبل و علیه ثیاب بیض و سیلبس ولده من بعده السوداء و یملك منهم اثنا عشر رجلا) واتە(ئەوە عەبباسە و هاتو جلێکی سپی لەبەرەو دواتر کوڕەکەی خاکی سواد دەگرێتە دەستو دوانزە کەسیان بە مەملوك دەگرێت) کە عەبباس هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چیت وت بە ئەبوبەکر؟ فەرمووی(ما قلت الا خیرا) واتە(تەنها خێرم وت) فەرمووی ڕاست دەکەیت بە دایكو باوکمەوە بەقوربانت بم تەنها خێر دەڵێیت. فەرمووی وتم: عەبباسی مامم هاتو جلێکی سپی لەبەرەو دواتر کوڕەکەی لە دوای خۆی خاکی سواد دەگرێتە دەست و دوانزە کەسیان بە کۆیلە دەگرێت.[1,2]

ئیبن عەساکیریش لە جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە لە باپیریەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆڕێکدا بوایە ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە ڕاستیەوە و عومەر(رضي الله عنه) لە چەپیەوە بوو، عوسمانیش(رضي الله عنه) لە بەردەستیدا بوو و نووسەری نهێنیەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون کە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب(رضي الله عنه) دەهات ئەبوبەکر کەناری دەگرت و عەبباس(رضي الله عنه) دەچوویە شوێنی.[3]

حاکم لە موتەلیبی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبباس(رضي الله عنه) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و توورەکرابوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(چیتە؟) وتی: ئەی

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٢٧٠ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و لە سەنەدەکەیدا کەسانێك هەن کە نایانناسم، تەواو. ئیبن عەساکیریش لە عەبباسەوە بە کورتی هێناویەتی، لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٢١١ دا هاتووە و دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا کەس نابینم کە قسەی لەسەر بێت.

[3] – لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٢١٤ دا واهاتووە.

وەك عویەینەو ئەقرەع بەڵام من دڵی ئەم دوانە ڕادەكێشم و جوعەیل دەسپێرم بە ئیمانەكەی)[1].[2]

## (ڕێزگرتنی ئالوبەیتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

موسلیم لە یەزیدی كوڕی حەییانەوە هێناویەتی دەڵێت: من و حوصەینی كوڕی سەبرە و عەمری كوڕی موسلیم چووین بۆ لای زەیدی كوڕی ئەرقەم(رضي الله عنه) كە لەلای دانیشتین حوصەین پێی وت: ئەی یەزید خێرێكی زۆرت هاتەڕێ، پێغەمبەرت(صلى الله عليه وسلم) بینیو فەرموودەیت بیستو لەگەڵیدا غەزات كردو لە دوایەوە نوێژت كرد، بەڕاستی ئەی زەید خێرێكی زۆرت هاتە ڕێ، ئەی زەید فەرموودەمان بۆ بگێڕەوە، وتی: برازاگیان، تەمەنم زۆر بووەو سەرەمەرگم وا دێتو هەندێ لەوەی لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) وەرمگرتبوو لە بیرم چووەتەوە، ئەوەی بۆم گێڕانەوە وەریبگرنو ئەوەی نایگێڕمەوە زۆری تێدامەكەن، پاشان وتی: ڕۆژێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لای ئاوێك كە پێی دەوترا(خوم) لە نێوان مەككەو مەدینەدا وتارێكی بۆ خوێندینەوە و تیایدا سوپاسو ستایشی پەروەردگاری كردو ئامۆژگاری كردینو یادی خوای كرد، دواتر فەرمووی:(پاشان بزانن ئەی خەڵكینە من مرۆڤێكم خەریكە نێردراوی پەروەردگارم بێتو منیش وەڵامی بدەمەوە، من دوو شت لەناوتاندا بەجێ دەهێڵم، یەكەمیان كتێبی خوا كە ڕێنموونیو نووری تێدایە، بۆیە دەستبگرن بە كتێبی خواوەو پەیوەستی بن) ئینجا لەسەر قورئان هانیداین، پاشان فەرمووی(وە ئالوبەیتم، لەبەردەم خوادا بیرتان دەخەمەوە بەرامبەر ئالوبەیتم، لەبەردەم خوادا بیرتان دەخەمەوە بەرامبەر ئالوبەیتم). حوصەین پێ وت: ئەی زەید ئالوبەیت كێن؟ مەگەر ژنەكانی ئالوبەیت نین؟ وتی: ژنەكانی ئالوبەیتی ئەون، بەڵام

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەم فەرموودە حەسەنی مورسەلە. لە الاصابەدا هاتووە، ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٥٢ لە موحەممەدی كوڕی ئیبراهیمەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

ئالوبەیتی ئەوان کە لە دوای خۆی صەدەقەیان بۆ حەرامە، وتی: ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە بەنەماڵەی عەلی و بنەماڵەی عەقیل و بنەماڵەی جەعفەرو بنەماڵەی عەبباسن، وتی: هەموو ئەوانە صەدەقەیان بۆ نیە، وتی: بەڵێ.[1]

بوخاری لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر(رضي الله عنه) وتی: وریای موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بن لە بەرامبەر ئالوبەیتیدا، عائیشە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هاوەڵاندا دانیشتبوو و ئەبوبەکر و عومەریش(رضي الله عنه) لەپاڵیدا دانیشتبوون، عەبباس(رضي الله عنه) هات و ئەبوبەکریش ڕێ بۆ کردەوە و عەبباس لە بەردەم پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) و لە نێوان ئەبوبەکردا دانیشت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە ئەبوبەکری فەرموو(انما يعرف الفضل لاهل اهل الفضل) واتە(خاوەن فەزڵ فەزڵی خاوەن فەزڵ دەزانێت) پاشان عەبباس(رضي الله عنه) پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) دەدواند، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تەواو دەنگی نزم کردەوە، ئەبوبەکر بە عومەری وت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شتێکیەتی دڵم خورتەیەتی، عەبباس ئەوکات لە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو تا ئیشەکەی تەواو بوو و چوو، ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کات شتێکی نائاسای ڕوویدا؟ فەرمووی(نەخێر) وتی: دەی من بینیم زۆر دەنگت نزم کردەوە، فەرمووی(جبریل فەرمانی کرد ئەگەر عەبباس ئامادە بوو دەنگم نزم بکەمەوە وەك چۆن فەرمانی بە ئێوە کرد لە لای من دەنگتان نزم بکەنەوە)[2].[3]

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر لە کۆڕی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) شوێنێکی هەبوو تەنها بۆ عەبباس چۆڵی دەکرد، ئەوەش

---

[1]– لە رياض الصالحين دا واهاتووە. ئیبن جەریریش هێناویەتی، هەروەك لە منتخب كنز العمال ج٥ ص٩٥ دا هاتووە.

[2] – موضوع.

[3] – لە كنز العمال ج٧ ص٦٨ دا واهاتووە.

پێغەمبەری(صلی الله علیه وسلم) دڵخۆش دەکرد، ڕۆژێك عەبباس هات و ئەبوبەکریش شوێنەکەی بۆ چۆڵ کرد، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(ما لك ؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مامت هات، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) سەیری کرد، پاشان زەردەخەنەی کردو سەیری ئەبوبەکری کردو فەرمووی(هذا عباس قد اقبل و علیه ثیاب بیض و سیلبس ولده من بعده السوداء و یملك منهم اثنا عشر رجلا) واتە(ئەوە عەبباسە و هاتو جلێکی سپی لەبەرەو دواتر کوڕەکەی خاکی سواد دەگرێتە دەستو دوانزە کەسیان بە مەملوك دەگرێت) کە عەبباس هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چیت وت بە ئەبوبەکر؟ فەرمووی(ما قلت الا خیرا) واتە(تەنها خێرم وت) فەرمووی ڕاست دەکەیت بە دایكو باوکمەوە بەقوربانت بم تەنها خێر دەڵێیت. فەرمووی وتم: عەبباسی مامم هاتو جلێکی سپی لەبەرەو دواتر کوڕەکەی لە دوای خۆی خاکی سواد دەگرێتە دەست و دوانزە کەسیان بە کۆیلە دەگرێت[1][2].

ئیبن عەساکیریش لە جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە لە باپیریەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە کۆڕێکدا بوایە ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە ڕاستیەوە و عومەر(رضي الله عنه) لە چەپیەوە بوو، عوسمانیش(رضي الله عنه) لە بەردەستیدا بوو و نووسەری نهێنیەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بوون کە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب(رضي الله عنه) دەهات ئەبوبەکر کەناری دەگرت و عەبباس(رضي الله عنه) دەچوویە شوێنی.[3]

حاکم لە موتەلیبی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبباس(رضي الله عنه) هات بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و تووڕەکرابوو، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(چیتە؟) وتی: ئەی

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٢٧٠ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و لە سەنەدەکەیدا کەسانێك هەن کە نایانناسم، تەواو. ئیبن عەساکیریش لە عەبباسەوە بە کورتی هێناویەتی، لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٢١١ دا هاتووە و دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا کەس نابینم کە قسەی لەسەر بێت.

[3] – لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٢١٤ دا هاتووە.

پێغەمبەری خوا ئێمەو قورەیش چیمانە لەیەك؟ تۆو ئەوان چیتانە لەگەڵ یەك؟ هەندێکیان بە ڕوویەکی گەش بە هەندێکی دیکەی دەگەن، کە بە ئێمە گەیشتن وا نابن، پێغەمبەر(ﷺ) تووڕەبوو تا نێوچەوانی سوور بوو و عارەقی کرد، کە هاتەوە سەرخۆ فەرمووی(والذي نفس محمد بيده لايدخل قلب امرئ الايمان حتى يحبكم لله و رسوله) واتە(سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئیمان ناچێتە دڵی کەسێك تا لەبەر خواو پێغەمبەرەکەی ئێوەی خۆش بوێت) پاشان فەرمووی(ما بال رجال يؤذونني في العباس؟ عم الرجل صنو ابيه ؟) واتە(چیە کەسانێك بەهۆی عەبباسەوە ئازارم دەدەن، مامی کەسێك جێی باوکیەتی ؟)حاکم ج٣ ص٣٢٣ هێناویەتی لە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورەیش کە بەیەکدی دەگەن ڕوویان خۆشە، کە بە ئێمە ڕوخسارێکی نائاساییان هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر تووڕەبوو و فەرمووی(والذي نفس محمد بيده لايدخل قلب رجل الايمان حتى يحبكم لله و لرسوله).[1]

تەبەرانی لە عیسمەتەوە هێناویەتی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب(رضي الله عنه) ڕۆژێك هاتە مزگەوت و سەیری ناحەزی نێو ڕووخساریانی کردو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی دەچمە مزگەوت ناحەزی لە ڕووخساری خەڵکدا بەدیدەکەم؟ پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مزگەوت و فەرمووی(ئەی کۆمەڵی خەڵکان باوەڕتان نەهێناوەو باوەڕدار نین تا عەبباستان خۆش نەوێت)[2].[3]

ئیبن عەساکیریش لە ئیبن مەسعودەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عومەری کوڕی خەتتابی(رضي الله عنه) نارد بۆ کۆکردنەوەی صەدەقە، یەکەم کەس کە پێی

---

[1] – ضعيف.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص٢٦٩ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا فەزڵی کوڕی موختار هەیە کە لاوازە.

گەیشت عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو، پێی وت: ئەی ئەبولفەزڵ ئادەی صەدەقەی سامانت بدە، ئەویش وتی: ئەگەر وابوویتایەو وابوویتایە، ئیتر قسەی ڕەقی لە ڕوویدا کرد، عومەریش پێی وت: ئەگەر خواو پلەو پایەت لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) نەبوایە بەرامبەر بەوە شتێکم لە ڕوودا دەکردیت، هەردوو جیابوونەوەو هەرکامیان ڕێگەیەکیان گرتەبەر، عومەر هاتو چوویە لای عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) و بۆی باسکرد، عەلی دەستی عومەری گرتو چوون بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ منت نارد تا سەدەقە کۆبکەمەوە، یەکەم کەس کە پێی گەیشتم عەبباسی مامت بوو، وتم: ئەبوفەزل ئادەی صەدەقەی سامانت بدە، ئەویش ئەوەو ئەوەی پێی وتمو قسەی ڕەقی کرد، منیش لە وەڵامدا وام وت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اكرمته اكرمك الله اما علمت ان عم الرجل صنو ابيه؟ لا تكلم العباس فانا قد تعجلنا منه صدقة سنتين) واتە(ڕێزت لێگرتووە خوا ڕێزت لیّ بگرێت، ئایا دەزانیت مامی کەسێك جێگرەوەی باوکیەتی؟ لەوەدا هیچ بە عەبباس مەڵێ چونکە ئێمە صەدەقەی دوو ساڵیمان پێشتر خستووە).[1]

حاکم ج٣ ص٣٢٩ لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێك باسی ئەبولعەبباسی کردو قسەیەکی لە ڕوودا کردو عەبباس بۆکسێکی لێدا، خەڵکی کۆبوونەوەو وتیان: بەخوا دەبێت بەهەمان شێوە لە عەبباس بدەیتەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بیستەوەو وتاری خوێندەوەو فەرمووی(ڕێزدارترین کەس لای خوا کێیە؟) وتیان: تۆ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(دەی عەبباس لە منەو منیش لەوم، قسە مەڵێن بە مردووەکانمان چونکە بەوە زیندووەکانمان ناڕەحەت دەکەن)[2]

---

[1]- لە المنتخب ج٥ ص٢١٤ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٤ ص٢٧ بە کورتی لە قەتادەوە هێناویەتی.

[2]- حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە.زەهەبیش دەڵێت صەحیحە.

ئیبن عەساکیریش لە ئیبن عەبباسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیادکردووە: وتیان ئەی پێغەمبەری خوا پەنادەگرین بەخوا لە توورەیی تۆ، دەی داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە، ئەویش داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئیبن شەهابەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر و عومەر(رضي الله عنهما) لە سەردەمی خیلافەتیانندا هەرکامیان بگەیشتایە بە عەبباس و سواربوایە دادەبەزی و عەبباسی سواردەکردو خۆی بەپێ دەچوو تا عەبباسی دەگەیاندە شوێنی خۆی ئینجا جیادەبوویەوە.[2]

ئیبنولئەعرابی لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە مزگەوتدا دانیشتبوو و هاوەڵانی تەواف پێ دەکرد کە عەلی(رضي الله عنه) هات و سەلامی کرد، دواتر وەستا و ویستی لە شوێنێکدا دابنیشێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەیری هاوەڵانی کرد تا بزانێت کامیان ڕێ دەکەنەوە بۆ عەلی، ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە لای ڕاستەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دانیشتبوو، ئەبوبەکر لاچوو و وتی: ئالێرەدا ئەبولحەسەن، ئەویش لە نێوان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکردا دانیشت، خۆشیمان لە ڕووخساری پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بەدیکرد، پاشان سەیری ئەبوبەکری کردو فەرمووی(ئەی ئەبوبەکر تەنها خاوەن فەزڵ فەزڵی خاوەن فەزڵ دەزانێت).[3][4]

ئەحمەدو تەبەرانی لە ڕیاحی کوڕی حارسەوە هێناویانە دەڵێت: دەستەیەك لە ڕەحبە هاتن بۆ لای عەلی(رضي الله عنه) وتیان: سەلامت لێ بێت ئەی مەولامان، وتی: چۆن من مەولاتانم کە ئێوە هۆزێکی عەرەبن؟ وتیان: ڕۆژی لە غەدیری خومدا لە

---

[1]- لە منتخب كنز العمال ج٥ ص٢١١ دا واهاتووە، ئیبن سەعد ج٤ ص٢٤ لە ئیبن عەبباسەوە بە هەمان شێوەی گێڕانەوەی ئیبن عەساکیر هێناویەتی.

[2] – لە كنز العمال ج٧ ص٦٩ دا واهاتووە.

[3] –موضوع.

[4] – لە البدايە والنهايە ج٨ ص٣٥٨ دا واهاتووە.

پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بیست فەرمووی(من کنت مولاه فهو مولاه) من مەولای هەرکەس بم ئەویش مەولایەتی(عەلی)) رباح دەڵێت: کە چوون کەوتمە شوێنیان وتم: ئەمانە کێ بوون؟ وتیان: دەستەیەکی پشتیوانان بوون کە ئەبوئەیوبی ئەنساریش لە نێوانیاندا بوو.[1][2]

بەزار لە بورەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە سریەیەکدا ئێمەی ناردو عەلی کرد بە بەرپرسمان، کە هاتین(کیف رایتم صاحبکم؟) واتە(هاوەڵەکەتان چۆن دەبینن ؟) یان من یان کەسی تر سکاڵای هەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەری بەرزکردەوەو منیش کەسێ بووم هەمیشە سەیری زەویم دەکرد، کتوپڕ هەستمکرد ڕەنگی ڕووخساری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)گۆڕاو فەرمووی(من کنت ولیه فعلي ولیه) واتە(من وەلی کێ بم عەلیش وەلیەتی) وتم: ئیتر هەرگیز لە ڕووتدا خراپە نانوێنم.[3][4]

ئیبن ئیسحاق لە عەمری کوڕی شاسی ئەسلەمیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کە یەکێکە لە هاوەڵانی حودەیبیە، وتی: من لەگەڵ عەلیدا بووم لەو دەستەیەدا کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆ یەمەن، عەلی جۆرە ڕقێکی لە ڕوودا نواندم و منیش گرتمە دڵ، کە هاتمەوە مەدینە لە کۆڕەکانی مەدینەو لای هەرکەس بمدیایە سکاڵام لەسەر عەلی دەوت ڕۆژێك چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە مزگەوت دانیشتبوو، کە منی بینی سەیری ناوچەوانیم دەکرد چوومە خزمەتی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اما انە و الله یا عمرو لقد اذیتني) واتە(بەخوا ئەی عەمر بەڕاستی ناڕەحەتت کردم) منیش وتم: انا لله وانا الیه راجعون پەنادەگرم بەخوا و ئیسلام

---

[1] – صحیح.
[2] – هەیسەمی ج٩ ص١٠٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد جێ متمانەن.
[3] –صحیح.
[4] – هەیسەمی ج٩ ص١٠٨ دەڵێت: بەزار بە سەنەدی صحیح هێناویەتی.

لەوەی ئازاری پێغەمبەری خوا بدەم، فەرمووی(هەرکەس عەلی ناڕەحەت بکات منی ناڕەحەت کردووە)[1,2].

ئەبویەعلا لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لە مزگەوت لەگەڵ دوو کەسدا دانیشتبووم کە لەسەر عەلی قسەمان کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات و تووڕەیی لە ڕووخساریدا بەدی دەکرا، پەنام گرت بەخوا لە تووڕەیی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش فەرمووی(مالكم ومالي من اذى عليا فقد اذاني) واتە(چیتانە بە منەوە، هەرکەس عەلی ئازار بدات منی ئازارداوە)[3,4].

ئیبن عەساکیر لە عروەوە هێناویەتی کەسێك لە کۆڕێکی عومەردا قسەی لەسەر عەلی کرد، عومەر وتی: خاوەنی ئەو گۆڕە دەناسیت موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیب و عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کوڕی عەبدولموتەلیبیش دەناسیت؟! تەنها بە چاکە باسی عەلی بکە، ئەگەر عەلیت ئازاردا ئەوا پێغەمبەرت لە گۆڕەکەیدا ئازارداوە.[5]

ئەبویەعلا لە ئەبی بەکری کوڕی خالیدی عەرتەفەوە هێناویەتی هات بۆ لای سەعیدی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) و وتی: بیستوومە لە کووفە قسە دەڵێن بە عەلی(رضي الله عنه) تۆیش قسەت پێ وتووە؟ وتی: پەنا بەخوا سوێند بەوەی گیانی سەعدی بەدەستە

---

[1] –صحیح.

[2] – ئیمامی ئەحمەدیش لە عەمری کوڕی شاسیەوە هێناویەتی. لە البدایە والنهایە ج٧ ص٣٤٦ دا هاتووە. هەیسەمی ج٩ ص١٢٩ دەڵێت: ئەحمەد و تەبەرانی بە کورتی و بەزاریش بە کورتتر هێناویەتی، کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەدیش جێ متمانەن، تەواو.

[3] – حسن.

[4] – لە البدایە والنهایە ج٨ ص٣٤٦ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٩ ص١٢٩ دەڵێت: ئەبویەعلا و بەزار بە کورتی هێناویانە، کەسەکانی ئەبویەعلا صەحیحن جگە لە مەحمودی کوڕی خداش و قنان کە هەردووکیشیان جێ متمانەن، تەواو.

[5] لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٤٦ دا واهاتووە.

لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیستووە کە لەسەر عەلی شتێکی دەوت ئەگەر مشار بخرێنە سەرشانەکانم هەرگیز قسەی پێ ناڵێم[1][2].

ئەحمەدو موسلیم و ترمزی لە عمری کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە لە باوکیەوە هێناویانە دەڵێت: موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان(رضي الله عنه) فەرمانی کرد بە سەعد و وتی: بۆچی قسە ناڵێیت بە ئەبوتوراب؟ وتی: بیری سێ شتم کردەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی دەفەرموو ئەگەر یەکێك لەوانە بووما یە لە وشتری سوور لام خۆشترو ئازیزتر بوو، بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە چەند غەزایەکدا کە عەلی نەدەهێنا عەلی دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا لەلای ژن و مناڵەکانت دامدەنێیت؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی دەفەرموو(اما ترضى ان تكون مني بمنزلة هارون من موسى الا انه لا نبي بعدي) واتە(ئەرێ ڕازی نابێت لای من پایەت وەك پایەی هارون لای موسا بێت بەڵام ئەوە هەیە لە دوای من هیچ پێغەمبەرێك نیە) هەروەها دەمبیست لە ڕۆژی خەیبەردا دەیفەرموو(لاعطين الراية رجلا يحب الله و رسوله و يحبه الله و رسوله) واتە(بە دڵنیاییەوە ئاڵاکە دەدەمە دەست پیاوێك خواو پێغەمبەری خوای خۆشدەوێت و خواو پێغەمبەری خوایش ئەویان خۆش دەوێت) دەڵێت: پاشان کە ماوەیەکی بەسەرداچوو فەرمووی(عەلیم بۆ بانگ بکەن) عەلی هێنرا چاوی ئازاری هەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تفی دا لە چاوی و ئاڵاکەی دایە دەست و خوا لەسەر دەستی عەلی قەڵاکەی فەتح کرد، کە ئەم ئایەتە دابەزی(فقل تعالوا ندع ابنائنا و ابنائكم و نسائنا و نسائكم و انفسنا و انفسكم) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەینی(رضي الله عنهم) بانگکرد و پاشان فەرمووی(اللهم هؤلاء اهلي) واتە(خوایە ئەمانە کەس و بنەماڵەی منن).

---

[1] – حسن.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص١٣٠ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە.

ئەبوزەرعەی دیمەشقی لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبونەجیح لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: کە موعاویە حەجی کرد دەستی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی گرت و وتی: ئەی ئەبوئیسحاق ئێمە کۆمەڵێکین ئەو شەڕە خەریك بوو لە حەجی دەکردین تائەوەی خەریکبوو هەندێ سوننەت لەبیربکەین دەی تۆ تەواف بکە با ئێمەش لەگەڵتدا تەواف بکەین، دەڵێت کە لێبوویەوە بردیە(دارالندوە) و لەگەڵ خۆی لەسەر جێگەکەی داینیشاندو دواتر باسی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کردو قسەی لە ڕوودا کرد، ئەویش وتی: منت هێنایە ماڵت و لەسەر جێگەکەت داتنیشاندم دواتر بەرامبەر عەلی قسە دەڵێیت! سوێند بەخوا ئەگەر یەکێ لە سێ سیفەتی ئەوم هەبوایە خۆشتر بوو لە هەموو دونیا و ئەوەم دەبوو کە لە غەزای تەبووکدا پێی وترا(الا ترضى ان تكون مني بمنزلة هارون من موسى الا انه لا نبي بعدي)(ئایا رازی نیت پلەت لای من وەك پلەی هاروون بێت لای مووسا، تەنها ئەوە نەبێت کە دوای من هیچ پێغەمبەرێ نیە)ئەوەم لە هەموو دونیا لا خۆشتر دەبوو، یان ئەوەم دەبوو کە لە خەیبەردا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم(لاعطين الراية رجلا يحب الله و رسوله يفتح الله على يديه ليس بفرار)(ئاڵاکە دەدەمبە کەسێك کە خاو پێغەمبەرەکەی خۆشدەوێت و خوا لەسەر دەستی فەتح دەبەخشێت، ڕاکردنی نیە) لە هەموو دونیا لام خۆشتر دەبوو، یان زاوای بوومایە و لەو کچەی منداڵم هەبوایە لام خۆشتر دەبوو لە بوونی هەموو دونیا لەمڕۆ بەدواوە نایەمە هیچ ماڵ و شوێنێکتەوە، پاشان عەباکەی دا بەشانیدا و چوویە دەرەوە.[1]

ئەحمەد لە ئەبوعەبدوڵڵای بەجلیەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای ئوم سەلەمە(رضي الله عنها) ئەویش پێی وتم: لەماڵتاندا قسە بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەوترێت؟ پەنا بەخوا، یان وتم: سبحان الله، یان وشەیەکی لەو جۆرە، ئوم سەلەمە وتی: لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(من سب عليا فقد سبني) واتە(هەرکەس قسە بڵێت بە عەلی قسەی بە من وتووە)[2][3].

---

[1] – لە البدايه والنهايه ج٧ ص٣٣٩ – ٣٤٠ دا واهاتووە.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص١٣٠ دەڵێ کەسەکانی صەحیحن جگە لە ئەبوعەبدوڵڵای جەدلی کە جێمتمانەشە.

تەبەرانی و ئەبویەعلا لە ئەبوعەبدوڵڵای جەدلیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئوم سەلەمە(رضي الله عنها) وتی: ئەی ئەبوعەبدوڵڵا ئایا لە نێوانتاندا قسە دەوترێت بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)؟ وتم: چۆن قسە دەوترێت بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)؟ وتی: مەگەر قسە ناوترێت بە عەلی و ئەوەی خۆشی دەوێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆشی دەویست.[1]

ئەبونەعیم و جابر لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەسبەهانەوە هێناویانە دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه) هات بۆ لای ئەبوبەکر(رضي الله عنه) کە لەسەر مینبەری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، وتی: لە شوێنی باوکم دابەزە،وتی: ڕاست دەکەیت ئەوە شوێنی باوکتە. لە ژوورەکەیدا دایبنیشاندو گریا، عەلی وتی: بەخوا من پێم نەوتووە وابکات، وتی: بەخوا ڕاست دەکەیت من تۆم تۆمەتبار نەکردووە، ئیبن سەعد لە عروەوە هێناویەتی ئەبوبەکر ڕۆژێك وتاری دەخوێندەوە، حەسەن هات و چوویەسەر مینبەر بۆ لای و وتی: لە مینبەری باوکم دابەزە، عەلی وتی: ئەمە بە فەرمانی ئێمە نەبووە.[2]

ئیبن عەساکیر لە ئەبولبوختەریەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) لەسەر مینبەر وتاری دەدا، حوسەینی کوڕی عەلی چوو بۆ لای و وتی: لە مینبەری باوکم دابەزە، عومەر وتی: مینبەری باوکتە مینبەری باوکی من نیە! کێ فەرمانی پێکردیت بەوە؟ عەلی(رضي الله عنه) هەستا و وتی: کەس فەرمانی ئەوەی پێ نەکردووە، ئازارت ئەدەم ئەی لاسار(ناپاك)، وتی: برازاکەم ئازار مەدە، ڕاست دەکات، مینبەری باوکیەتی.[3]

---

[1]– هەیسەمی دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی تەبەرانی صەحیحن جگە لە ئەبوعەبدوڵڵا کە جێ کتمانەشە، ئیبن ئەبی شەیبە لە ئەبوعەبدوڵڵاوە بەو جۆرە هێناویەتی، هەروەك لە النتخب ج٥ ص٤٦ دا هاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٣٢ دا واهاتووە.

[3] – ئیبن کەسیر دەڵێت: سەنەدەکەی لاوازە، لە کنز العمال ج٧ ص١٠٥ دا واهاتووە.

ئیبن سەعدو ئیبن راهەویەو خەتیب لە حوسەینی کوڕی عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: چووم بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب کە لەسەر مینبەر بوو پێم وت: لەسەر مینبەری باوکم دابەزە و بڕۆرە سەر مینبەری باوکت، وتی: باوکی من مینبەری نەبوو، لەگەڵ خۆی داینیشاندم، کە دابەزی چوو بۆ ماڵی خۆی و وتی: کوڕی شیرینم کێ ئەمەی فێرکردیت؟ وتم: کەس فێری نەکردم، وتی: کوڕی شیرینم وەرە بۆ لامان، منیش ڕۆژێك چووم موعاویەی لەلابوو و ئیبن عومەر لەبەردەرگادا بوو مۆڵەتی پێ نەدراو منیش گەڕامەوە، دواتر منی بینی و وتی: کوڕی شیرینم نەمبینی بێیت بۆ لامان؟ وتم: هاتم و تۆ لەگەڵ موعاویە بوویت و ئیبن عومەرم بینی گەڕایەوە منیش گەڕامەوە، وتی: تۆ لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر شیاوتری بۆ مۆڵەت پێدان، ئەوەی دەیبینیت خوا بەسەر سەرمانەوە ڕواندوویەتی و دواتر ئێوەن، دەستی خستە سەر سەری.[1]

ئیبن سەعد و ئەحمەد و بوخاری و نەسائی و حاکم لە عوقبەی کوڕی حارسەوە هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە نوێژی عەسر دوای مردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە چەند شەوێك دەرچووین و عەلیش(رضي الله عنه) بەلایدا دەڕۆیشت دای بە لای حەسەنی کوڕی عەلیدا لەگەڵ هەندێ منداڵدا یاری دەکرد، خستیە سەر کۆڵی و دەیوت:

بابي شبيه بالنبي          ليس شبيها بعلي[2]

ئەحمەد لە عومەیری کوڕی ئیسحاقەوە دەڵێت: ئەبوهورەیرەم(رضي الله عنه) بینی گەیشت بە حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه) و وتی: ئادەی سکتم بۆ نیشان بدە کە دەمبینی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ماچی دەکرد ئەویش نیشانی داو ئەبوهورەیرەش ماچی کرد، لە گێڕانەوەیەکیشدا ناوکی ماچکرد[3].[4]

---

[1]- لە كنز العمال ج٧ ص١٠٥ دا واهاتووە، لە الاصابە ج١ ص٢٣٣ دا دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە.

[2] – عەلیش پێدەکەنی. لە كنز العمال ج٧ ص١٠٣ دا واهاتووە.

[3] –صحيح.

[4]– هەیسەمی ج٩ ص١٧٧ دەڵێت: ئەحمەد و تەبەرانی هێناویانە بەڵام تەبەرانی دەڵێت: سکی نیشاندا و دەستی خستیە سەر ناوکی، کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە عومەیری

تەبەرانی لە مەقبریەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئەبوهورەیرە(رضي الله عنه) بووین کە حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه) هات و سەلامی کردو خەڵکی وەلامیان دایەوەو ئەبوهورەیرەمان لەگەڵدا بوو بەوەی نەزانی، پێی وترا ئەوە حەسەنی کوڕی عەلی بوو سەلامی کرد، ئەبوهورەیرە چوو بە دوایدا و وتی: علیك السلام ئەی گەورە پێی وترا: دەڵێیت ئەی گەورە؟ وتی: شایەتی دەدەم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو(انه سید) واتە(ئەو گەورەیە)[1].[2] هەروەك لە تەبەرانی لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی لەو نەخۆشیەیدا کە تیایدا مرد مەروان هات بۆ لای، مەڕوان بە ئەبوهورەیرەی وت: لەو کاتەوەی پێکەوە بووین هیچم لە ڕوونەدیویت جگە لە خۆشەویستیت بۆ حەسەن و حوسەین، ئەبوهورەیرەش خۆی ڕێککردو دانیشت و وتی: شایەتی دەدەم لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەرچووین لە نیوەی ڕێگەدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بیستی حەسەن و حوسەین کە لەگەڵ دایکیان بوون دەگریان، زوو چوو بۆ لایان و بیستم دەیفەرموو(دوو کوڕەکەم چییانە؟) فاتیمە(علیها السلام) وتی: تینوویانە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە بۆ لای جامێ کە ئاوێ تێدابوو ئەو کات دانیسقەبوو و خەڵکی پێویستیان پێی بوون پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بانگی کرد کەستان ئاوی پێیە؟ هەرکەس دەنگی ببیستایە دەچوو بزانێ ئاوی پێیە کەچی پێی نەبوو، کەسیان ئاوی لانەبوو، ئەو کات پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ناولینی احدهما) واتە(یەکێکیان بدەرە باوەشم) فاتمە لەژێر عەباکەوە دایەدەستی، سپیایی باڵەکانیم بینی کە پێمدا گرتی بە سنگیەوەو منداڵەکەش هاواری دەکرد، ئەویش زمانی دەرهێناو زمانی

---

کوڕی ئیسحاق کە جێ متمانەشە، ئیبن نەجار لە عومەرەوە هێناویەتی، هەروەك لە کنز العمال ج٧ ص١٠٤ دا هاتووەو تیایدا هاتووە دەمی خستەسەر ناوکی.

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص١٧٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن. ئەبویەعلاو ئیبن عەساکیریش لە سەعیدی موقبوریەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

پێدادەهێنا تا بێدەنگ بوویەوەو گریانی نەبیستر‌ا، دووەمیش بەو جۆرە، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بکەونەڕێ) بەڕاستو چەپدا بە لای وشترەکاندا تێپەڕ بووین، تا لە ڕێ خۆشیو فراوانی باردا پێی گەیشتین، ئێستا من ئەو دووانەم خۆش نەوێت کە ئەوەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بینی؟[1].[2]

## (ڕێزگرتنی زانایانو گەورەو خاوەن فەزڵەکان)

ئیبن عەساکیر لە عەمماری کوڕی ئەبی عەممارەوە هێناویەتی زەیدی کوڕی سابت(رضي الله عنه) ڕۆژێك سواری وڵاخ بوو، ئیبن عەبباس(رضي الله عنه) ڕەشۆی وڵاخەکەی گرتو وتی: ئەی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: وا فەرمانمان پێکراوە بەرامبەر زانایانو و گەورەکانمان وابکەین، زەید وتی: ئادەی دەستتم نیشان بدە، کە نیشانی دا ماچی کرد و وتی: وا فەرمانمان پێکراوە بەرامبەر ئالوبەیتی پێغەمبەرمان وا بکەین.[3]

یەعقوبی کوڕی سوفیان بە سەنەدی صەحیح لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: زەیدی کوڕی سابت(رضي الله عنه) چوو تا سواربێت، ئیبن عەبباس ڕەشۆی وڵاخەکەی بۆ گرت، وتی:کەناربگرە ئەی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: نا، وتی: وافەرمانمان پێکراوە بەرامبەر زاناو گەورەکانمان وابین،[4] ئیبن سەعدیش ج٤ ص١٧٥ بە هەمان

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص١٨١ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

[3] – لە کنز العمال ج٧ ص٣٧ دا واهاتووە.

[4] – لە الاصابە ج١ ص٥٦١ دا واهاتووە، تەبەرانیش لە شەعبیەوە بەو جۆرە هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە رزینی رمانی کە جێ متمانەشە وەك هەیسەمی لە ج٩ ص٣٤٥ دا دەڵێت.

شێوە هێناویەتی کە ڕەشوەی وڵاخەکەی زەیدی کوڕی سابتی گرت و دواتر وتی: ئێمە فەرمانمان پێکراوە جڵەوی وڵاخی مامۆستاو دیارەکانمان بگرین.[1]

تەبەرانی لە ئەبوئومامەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە ئەبوبەکرو عومەرو ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح و دەستەیەکی هاوەڵانی لەگەڵدا بوو کە قاپێ خواردنەوە هێنرا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دای بە ئەبوعوبەیدە، ئەبوعوبەیدە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پێی شیاوتری و لەپێشتری، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اشرب فان البركة مع اكابرنا فمن لم يرحم صغيرانا و يجل كبيرنا فليس منا) واتە(بخۆرەوە چونکە بەرەکەت لەگەڵ گەورەکاندایە، جا هەرکەس ڕەحم نەکات بە بچوکمان و گەورەمان بەرز ڕانەگرێت لە ئێمە نیە)[2][3].

بوخاری لە رافعی کوڕی خودەریج و سەهلی کوڕی ئەبی حەسیمەوە هێناویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەیصەی کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) هاتن بۆ خەیبەرو لەناو خورماکاندا جیابوونەوەو عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژراو عەبدولڕەحمانی کوڕی سەهل و حوەیصەی دو کوڕی مەسعود هاتن بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و لەسەر هاوەڵەکەیان قسەیان کرد، عەبدولڕەحمان کە بچوکی هەموویان بوو دەستیکرد بە قسەکردن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)(كبر كبر) واتە(با گەورە قسەبکات)، یەحیا وتی: با گەورە قسەبکات، ئینجا قسەیان لەسەر هاوەڵەکەیان کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەم خوێنەی هاوەڵی کوژراوتان بە سوێندی پەنجاکەستان بەدەست دێنن) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە بێباوەڕن؟ پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) لەلای خۆیەوە خوێن باییەکەی بۆ دان.

---

[1] – لە كنز العمال ج٧ ص٣٨ دا هاتووە.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٨ ص١٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەلی کوڕی یەزیدی ئەلهانی هەیە کە لاوازە.

تەبەرانی لە وائیلی کوڕی حیجرەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەویش فەرمووی(ئەوە وائیلی کوڕی حەجەرە هاتووە بۆ لاتان و بە حەزو ترس نەهاتووە بەڵکو لە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەیەکەوە هاتووە) عەباکەی بۆ بڵاوکردەوەو لەپاڵ خۆیدا داینیشاندو دای بە لای خۆیداو بردیە سەر مینبەرو وتاری بۆ خەڵك خوێندەوەو فەرمووی(ارفقوا هذا بالملك) ئەویش وتی: کەسوکارم دەستیان گرتووە بەسەر ئەوەیدا هەمبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(انا اعطیکە و اطعیك ضعفة) واتە(من دەتدەمەوەو دوو بەرامبەریشت دەدەمێ)[1،2].

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٤٦ لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك دەستی سەعد پڕ خوێن بوو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا بۆ لای و لە کۆشی گرت و خوێن لە ڕوخساری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ڕیشیدا دەچوو و هەرکەس دەیویست خوێن لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەدوور بگرێت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زیاتر لە خۆی نزیك دەکردەوە تا سەعد گیانی سپارد.

لە کەسێکی پشتیوانانەوە دەڵێت: کاتێ سەعد لە بەنی قورەیزە گەڕایەوە برینەکەی تەقی و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بیست و چوو بۆ لای و سەری گرت و خستیە کۆشی و کراسێکی سپی دا بەسەریدا کە دەیدا بەسەر دەموچاویدا پێی دەردەکەوت، سەعد کەسێکی کەڵەگەتی سپی بوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(خوایە سەعد لە ڕێی تۆدا جیهادی کردو پێغەمبەرەکەتی بەڕاست زانی و ئەوەی لەسەری بوو بەجێیگەیاند دەی بە چاکترین شێوەی پێشوازی لە گیانی بکە) کە سەعد قسەکەی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) بیست چاوەکانی کردەوەو وتی: سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوایت، کە خزمانی سەعد

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٣٧٤ دەڵێت: تەبەرانی لە ڕێگەی مەیمونەی کچی حیبری کوڕی عەبدولجەبار لە پوریەوە ئوم یەحیای کچی عەبدولجەبارەوە هێناویەتی و نایناسم و کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو.

وەیان بینی ترسان، لەلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باسکرا کە کاتێ سەری سەعدت خستە کۆشت کەسوکاری سەعد لەوە ترسان، ئەویش فەرمووی(خوای گەورە مۆڵەتی ژمارەی ئێوەی لە ماڵدا لە فریشتەکان وەرگرت تا شایەتی مردنی سەعد بن، دەڵێت: دایکیشی دەگریاو دەیوت:

ویل امك سعدا حزامة و جدا

پێی وترا: شیعر لەسەر سەعد دەڵێیت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(دعوها فغیرهاکذب) واتە(وازی لێ بهێنن چونکە شاعیرانی جگە لە ئەم درۆزنن) ئیبن سەعد ج٤ ص٨٧ لە خاریجەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی عومەر(رضي الله عنه) خواردنی لەگەڵ خەڵکدا بۆ دانرا نانی شێوانیان دەخوارد، ئەویش دەرچوو و بە موعەیقبی کوڕی ئەبوفاتیمەی دەوسی - کە هاوەڵ بوو و لە کۆچەرانی حەبەشە بوو) وت: نزیك ببەرەوەو دابنیشە، ئەی بەخوا ئەگەر جگە لە تۆ و بارەی تۆدا بوایە هێندەی ڕمێك لێم نزیك نەدەبوویەوە.

هەروەها لەلایەکی دیکەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بۆ نانی بەیانی بانگهێشتی کردن و لە نێوانیاندا موعەیقیب بوو کە نەخۆشیی بەڵەکی لەگەڵدا بوو، موعەقیب لەگەڵیاندا نانی دەخوارد، عومەر پێی وت: لەبەردەم خۆتەوە بخۆ، ئەگەر جگە لە تۆ بوایە کەس لە قاپێکدا نانی لەگەڵ نەدەخواردم و هێندەی ڕمێك نێوانیان دوور دەبوو.

ئیبن سەعد و ئیبن عەساکیر لە عەبدولواحیدی کوڕی عەونی دەوسیەوە هێناویانە دەڵێت: توفەیلی کوڕی عەمر(رضي الله عنه) گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە مەدینە لەگەڵیدا بوو تا مرد، کە عەرەب هەڵگەڕانەوە لەگەڵ موسڵماناندا چوو بۆ یەمامە و عەمری کوڕی توفەیلی کوڕیشی لەگەڵدا بوو، توفەیل لە یەمامە شەهید بوو و عەمری کوڕی دەرچوو لەگەڵیدا دەستی بڕا، لای عومەری کوڕی خەتتاب بوو خواردنی بۆ هێنرا، خۆی دوورخستەوە، عومەر وتی: بۆچی دەستت لێ دوورگرت؟ وتی: بەڵێ، وتی: نەبەخوا لێی ناخۆم بە دەستت لێی نەخۆیت چونکە سوێند

بەخوا لەناو ئەمانەدا تەنها تۆیت کە بەشێکت لە بەهەشتدایەن پاشان لە ساڵی یەرموك لەگەڵ موسڵمانان دەرچوو شەهید بوو.

دەینەوەری لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری(رضي الله عنه) بیستم مۆڵەتی لێبوردن بە هەموان دەدەیت، ئەگەر ئەم نامەت گەیشتەدەست لە خاوەن فەزڵ و ناودارانەوە دەست پێبکە کە شوێنی خۆیان گرت ئینجا مۆڵەتی خەڵك بدە.[1]

بوخاری لە الادب المفرد ص٥٤ لە حەکیمی کوڕی قەیسی کوڕی عاصمەوە هێناویەتی باوکی لەسەرمەرگیدا وەسیەتی بۆ کوڕەکانی کردو وتی:(لەخوا بیترسن و گەورەترنتان بکەنە پێشەنگ، چونکە هەر کۆمەڵێ گەورەیان کردە پێشەنگ بەشوێن باوکیاندا دەچن ئەگەریش بچووکیان کردە پێشەنگ ئەوە لە توانایان دادەرمێنێ، ئاگاداری سامانو دەستخستنی بن چونکە بۆ بەخشندە دەستگرە(یارمەتی) و لەسەر کۆنەکارو چروك بێباکتان دەکات، وریابن سەبارەت بە داواکردن لە خەڵك چونکە ئەوە کۆتا دەستخستنی کەسە، ئەگەر مردم لەسەرم شیوەن مەکەن چونکە لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەکرا، ئەگەر مردم لە خاکێ بمنێژن کە بەکری کوڕی وائیل هەست نەکەن بە بە خاك سپاردنم چونکە من لە سەردەمی نەفامیدا خۆم لێ بێئاگا دەرخستن).[2]

[1] – لە کنز العمال ج٥ ص٥٥ دا واهاتووە.

[2]– ئەحمەدیش هێناویەتی لە الاصابە ج٣ ص٢٥٣ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٧ ص٣٦ بەو جۆرە هێناویەتی.

# (ڕێزگرتن لەگەڵ جیاوازی ڕا و کاردا)

بەیهەقی ج٨ ص١٨٠ لە یەحیای کوڕی سەعید لە مامیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی جەمەل کە وەستاین و عەلی(رضي الله عنه) ڕیزی دەکردین بەناو خەڵکدا هاواری دەکرد کەس تیرو ڕم نەوەشێنێ و شمشێر نەخاتەکارو سەرەتا دەست بەشەڕ مەکەن و بە نەرمترین شێوە قسەیان لەگەڵ بکەنن وابزانم وتی: چونکە ئێرە شوێنێکە هەرکەس تیایدا شەل بێت لە ڕۆژی دوایدا شەل دەبێ، بەو جۆرە وەستاین تا خۆر بەرزبوویەوە تا هەموو هاواریان کرد ئەی تۆڵەسێنانی عوسمان، عەلی(رضي الله عنه) موحەممەدی کوڕی حەنەفی بانگکرد کە لە پێشمانەوە بوو ئاڵاکەی پێ بوو، عەلی وتی: ئەی ئیبن حەنەفیە چی دەڵێن؟ موحەممەد سەیری کردین و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەڵێن ئەی تۆڵەسێنانی عوسمان، عەلی(رضي الله عنه) دەستەکانی بەرزکردەوەو وتی: خوایە ئەمڕۆ بکوژانی عوسمان بدە بە زەویدا.

هەروەها لە ج٨ ص١٨١ لە موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە هێناویەتی: عەلی(رضي الله عنه) لەگەڵ خەڵکی جەمەل شەڕی نەکرد تا خەڵکی سێ جار هاواریان کرد لە ڕۆژی سێیەمدا حەسەن و حوسەین و عەدبوڵڵای کوڕی جەعفەر چوون بۆ لای و وتیان بریندواریان زۆر کردوین، وتی: برازاگیان سوێند بەخوا لەبەریان بێئاگانیم، وتی: ئاو بکەن بەدەستمدا، دەستنوێژی گرت و دوو ڕکات نوێژی کرد کە لێبوویەوە دەستەکانی بەرزکردەوەو لە پەروەردگاری پاڕایەوەو پێی وتن: ئەگەر داتان بەسەریاندا ڕامەکەن بە شوێن ڕاکردوودا و بریندواریان مەکوژن و بزانن چی بۆ جەنگ هێناوە بیگرن و ئەوی تری بۆ میراتگرەکانی. بەیهەقی دەڵێت: مونقەتیعەو دروست ئەوەیە هیچی لێ هەڵنەگرتووەو شتی هیچ گوژراوێکی نەبردووەن.

هەروەها لە ج٦ ص١٨١ لە عەلی کوڕی حوسەینەوە هێناویەتی دەڵێت: چوومە لای مەڕوانی کوڕی حەکەم وتی: کەسم نەبینی لە باوکت بەڕێزتر بێت لە کاتی

سەرکەوتنیدا لە ڕۆژی جەمەل کە ڕامانکرد هاوارکەرەکەی هاواری کرد نەکەونە شوێن ڕاکردوو و بریندار مەکوژن.

هەروەها لە ج٨ ص١٨٢ لە عەبدخەیرەوە هێناویەتی پرسیارکرا لە عەلی(رضي الله عنه) سەبارەت بە خەڵکی جەمەل، وتی: برامانن لێمان یاخی بوون، لەگەڵیان جەنگاین‌و دواتر گەڕانەوە بۆ حوکمی خواو ئێمەش لێمان قبوڵ کردن.

لە موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە دەڵێت: عەلی لە ڕۆژی جەمەلدا وتی: بە شایەتی لااله الا الله منەتباریان دەکەین‌و میراتی باوکان بۆ کوڕان بە میرات دەگرین.

لە ج٨ ص١٧٣ لە ئەبولبوختەریەوە دەڵێت: پرسیار کرا لە عەلی(رضي الله عنه) سەبارەت بە ئەهلی جەمەل ئایا ئەوانە بێباوەڕن؟ وتی: ئەوان لە بێباوەڕی ڕایانکرد، وتیان: دووڕوون؟ وتی: دووڕووەکان بە کەمی یادی خوا دەکەن، وترا: ئەی چین؟ وتی: برامانن لێمان یاخی بوون.

هەروەها ج٨ ص١٧٣ لە ئەبوحەبیبەی مەولای تەلحەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای عەلی(رضي الله عنه) لەگەڵ عیمرانی کوڕی تەلحەدا دوای ئەوەی لە شەڕی جەمەل بوویەوە دەڵێت: پێشوازی لێ کردو لە خۆی نزیک کردەوەو وتی: هیوام وایە خوای گەورە من‌و باوکت لەوانە دابنێ کە دەفەرموێت(و نزعنا ما في صدورهم من غل اخوانا على سرر متقابلين) وتی: برازاگیان فلانە ئافرەت و فلانە کەس چۆنن؟ سەبارەت بە دایکەکانی کوڕانی باوکی پرسیاری لێکرد، پاشان وتی: ئەم سالانە لە ترسی تالانکردنی لەلایەن خەڵکەوە خاکتان گیراوە، ئەی فلان لەگەڵی بڕۆ بۆ لای ئیبن قورزەبیبە با بەرهەمی ئەم سالانەی بداتێ‌و زەویەکەشی بداتەوە، دوو پیاو دانیشتبوون یەکێکیان حارسی ئەعوەر بوو وتی: خوا لەوە دادپەروەرترە کە شەڕیان لەگەڵ بکەین‌و لە بەهەشتدا برامان بن، عەلی وتی: خەڵکی لە دوورترین‌و نزم ترین خاکی خوادا ئەگەر من‌و تەلحە نەبین برازاگیان کێ بێت؟ ئەگەر پێویستیەکت هەبوو وەرە بۆ لامان.

ئیبن سەعد ج۳ ص۲۲٤ لە ئەبوحەبیبەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە ربعی کوڕی حەراشەوە بەو واتایە هێناویەتیو تیایدا هاتووە عەلی هاوارێکی کرد کە کۆشکەکە دەنگی دایەوە، ئەگەر ئێمە ئەوانە نەبین ئیتر کێ بێت؟

هەروەها لە ج۳ ص۱۱۳ لە ئیبراهیمەوە دەڵێت: ئیبن جرموزە هاتو مۆڵەتی داواکرد لە عەلی، ئەویش ڕقی بۆ نواند، ئەویش وتی: ئەی هاوەڵی چەرمەسەری، عەلی وتی: خۆڵ بەدەمت من هیوام وایە منو تەلحەو زوبەیر لەوانەبین کە خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێت(و نزعنا ما في صدرورهم من غل اخوانا على سرر متقابلين).

لە جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) وتی: هیوام وایە منو تەلحەو زوبەیر لەوانەبین کە خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێت(و نزعنا ما في صدرورهم من غل اخوانا على سرر متقابلين).

ئیبن عەساکیر لە عەمری کوڕی غالبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەمماری کوڕی یاسر(رضي الله عنه) لە کەسێکی بیست کە قسەی دەکرد لە ڕووی دایکی ئیمانداران عائیشەدا(رضي الله عنها) ئەویش پێی وت: وس بە ئەی بێزراوی جنێزپێدراو، من شایەتی دەدەم ئەوە خێزانی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) خوایە لە بەهەشتدا.[1]

ئیبن سەعد ج٦ ص٦٥ بەو جۆرە هێناویەتی، ترمزیش هێناویەتیو لە فەرموودەکەیدا هاتووە وتی: ون بە لەبەرچاو بێزراو ئایا خۆشەویستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئازار دەدەیت؟![2]

ئیبن عەساکیر و ئەبویەعلا لە عەممارەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: دایکمان عائیشە(رضي الله عنها) بڕێی خۆیدا چوو و ئێمە دەمانزانی ژنی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) لە دونیاو دواڕۆژدا، بەڵام خوای گەورە تاقی کردینەوە تا بزانێ ئایا ئێمە گوێڕایەڵی خواین یان دایکمان عائیشە[3].[4]

---

[1] – لە کنز العمال ج۷ ص۱۱٦ دا واهاتووە.

[2] – لە الاصابە ج٤ ص۳٦۰ دا واهاتووە.

[3] – صحيح.

[4] – لە کنز العمال ج۷ ص۱۱٦ دا واهاتووە.

بەیهەقی ج٨ ص١٥٤ لە ئەبووائیلەوە دەڵێت: کە عەلی عەمماری کوڕی یاسرو حەسەنی کوڕی عەلی نارد بۆ کوفە تا بانگیان بکەن بۆ شەڕ عەممار وتاری داو وتی: من دەزانم عائیشە(رضي الله عنها) ژنی پێغەمبەرە(ﷺ) لە دونیاو قیامەتدا بەڵام خوای گەورە بەو تاقیکردنەوە تا بزانێت ئایا شوێن فەرمانی خوا دەکەون یان شوێن فەرمانی عائیشە(رضي الله عنها)[1].[2]

## (فەرمانکردن بە شوێنکەوتنی گەورەکان لەسەر جیاوازی ڕای)

ئیبن سەعد ج٣ ص٣١٧ لە زەیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای مەسعود(رضي الله عنه) تا داوای لێبکەم ئایەتێکی قورئانم بۆ بخوێنێتەوە ئەویش ئەوەو ئەوەی بۆ خوێندمەوە، وتم: عومەر(رضي الله عنه) جیا خوێندنەوەی عەبدوڵڵا ئەوەو ئەوەی بۆ خوێندمەوە، ئەویش گریا فرمێسکەکانیم لەسەر گۆچانەکە دیو دواتر وتی: وەك ئەوەی عومەر بیخوێنەرەوە ئەو ڕوونبیرترە لە ڕێگەی دواتردا، عومەر قەڵایەکی پتەو بوو بۆ ئیسلام کە ئیسلام دەچوویە ناوی و لێی نەدەهاتەدەر، کە عومەر کوژرا قەڵاکە داکەوت و لێی دەرچوو و چوونە ناوەوەی نەبوو.

## (تووڕەبوون بۆ گەورەکان)

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢١٠ لە شورەیحی کوڕی عوبەیدەوە هێناویەتی: کەسێك بە ئەبودەردائی وت: ئەی کۆمەڵی قورئان خوێنان چیتانە لە ئێمە ترسنۆکترو چروکترن ئەگەر داواتان لێکراو ئەگەریش خواردتان تیکەتان لە

---

[1] - صحیح.

[2] - بەیهەقی دەڵێت: بوخاری لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی.

هەمووان گەورەترە ئەبودەردا هیچ وەڵامی نەدایەوە و کەسێ ئەوەی بە عومەر وتی، عومەر(رضي الله عنه) پرسیاری لە ئەبودەردا کرد لەسەری و ئەویش وتی: خوا لێی خۆش بێت هەرچیمان لێ بیستن لە دڵی بگرین؟ عومەر(رضي الله عنه) چوو بۆ لای کابراو کراسەکەی و یەخەی گرت و بردی بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و کابراش وتی: ئێمە گاڵتەمان کرد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند(ولئن سالتهم ليقولن انما نغوض و نلعب...)[1]

ئەبونەعیم لە فضائل الصحابة لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە هێناویەتی دەستەیەك بە عومەری کوڕی خەتتابیان وت: بەخوا کەسمان نەبینیوە لە تۆڵەدا لەو باشترو لە حەقدا نەترسترو دژ بە دووڕووان لەتۆ توندتربێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، بۆیە دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تۆ چاکترین کەسی، عەوف کوڕی مالیك وتی: بەخوا درۆدەکەن، ئێمە کەس دەناسین دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەو باشترە، وتی: کێیە ئەی عەوف؟ وتی: ئەبوبەکر، عومەر وتی: عەوف ڕاست دەکات و ئێوە درۆتان کرد، ئەبوبەکر لە بۆنی میسك پاکترو بۆن خۆشتربوو و منیش لە وشتریماڵەکەم گومڕاترم.[2]

ئوسەیدی کوڕی موسا لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) چاودێرو هەواڵگری لەسەر خەڵك هەبوو، هاتن و هەواڵیان پێدا دەستەیەك کۆبوونەتەوەو فەزڵی ئەو دەدەن بەسەر ئەبوبەکردا، ئەویش تووڕەبوو و ناردی بەشوێنیانداو هێنران، وتی: ئەی خراپترین دەستەو کۆمەڵ، ئەی خراپەکاران، وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی ئەمەمان پێ دەڵێیت؟ ئەویش سێ جار پێی وتنەوە، دواتر وتی: بۆچی نێوانی من و ئەبوبەکری صدیق دەخەن؟ سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە وایدەبینم لە بەهەشتدا بم بە دووری بینینی چاو ئەبوبەکری تێدا دەبینم. لالەکائی لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چاکترینی ئەم

---

[1] – التوبه ٦٥.

[2] – ئیبن کەسیر دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە. منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٥٠ دا واهاتووە.

ئومەتە ئەبوبەکرە، هەرکەس دوای ئەم قسەم چی دەڵێت هەڵبەستەو چی لەسەر هەڵبەستەکار هەیە(درۆزن) لەسەری هەیە.

خەیسەمە لە زیادی کوڕی علاقەوە هێناویەتی عومەر کەسێکی بینی دەیوت: ئەمە دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چاکترینی ئوممەتە عومەریش بە گۆچان لێیداو دەیوت: درۆی کرد، ئەبوبەکر لە من و باوکیشت باشترە.[1]

خەیسەمە و ئیبن عەساکیر لە زنادەوە هێناویانە دەڵێت: کەسێك بە عەلی(رضي الله عنه) وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە چیە کۆچەران و پشتیوانان ئەبوبەکر پێش دەخەن لە کاتێکدا تۆ لەو لەپێشتری لە وەفاداو لە ئاشتیشدا؟ ئەویش وتی: ئەی ئەگەر قورەیشی بوویتایە لە(عائذة) م ئەژمارد دەکردیت، وتی: بەڵێ، وتی: ئەگەر باوەڕدار جێ پەنای خوا نەبوایە دەمکوشتیت و ئەگەریش بمێنم بیمێکی گەورەت لە منەوە بۆ دێت، قوڕت بەسەر ئەبوبەکر بە چوار جار لەپێش منە، پێش من کەوت بۆ ئیمامەت و بۆ کۆچ و بۆ ئەشکەوت و بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام، قوڕبەسەر خوای گەورە سەرکۆنەی هەموو مرۆڤەکانی کردووەو مەدحی ئەبوبەکری کردووە(الا تنصروه فقد نصره الله).[2]

ئیبن عەساکیر لە ئەبی وائیلەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن مەسعود کەسێکی بینی جلەکەی لە خوار قولەپێی بوو، وتی: جلەکەت بێنەسەرەوە، وتی: ئەی ئیبن مەسعود تۆیش بیهێنە سەرەوە، عەبدوڵڵا پێی وت: وەك تۆ نیم دەسەپاچەبم بۆ چاکە من پێشەنگی خەڵکم، عومەر ئەوەی بیستەوەو دای لە کابراو وتی: وەڵامی ئیبن مەسعود دەدەیتەوە؟ لە کنز العمال ج٧ ص٥٥ دا واهاتووە.

---

[1] - لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٥٠ دا واهاتووە.

[2] - لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٥٥ دا هاتووە، عشاری لە ئیبن عومەرەوە بەو واتایە هێناویەتی، لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٤٧یشدا هاتووە.

یەعقوبی کوڕی سوفیان و ئیبن عەساکیر لە عەلائەوە هێناویانە لە چەند ماموٚستایەکیانەوە دەڵێت: عومەر لە لای مالیکی ئیبن مەسعود بوو لە مەدینە سەیری بیناکەی دەکرد، کەسێك لە قوڕەیش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران هێندەت بەسە، ئەویش خشتێکی هەڵگرت و تیوەی پێچا و وتی: دەتەوێت پێش عەبدوڵڵام بخەیت(لە عەبدوڵڵام بکەیت)؟ لە کنز العمال ج۷ ص۵۵ دا واهاتووە.

ئەبوعوبەیدو سوفیانی کوڕی عویەبەنەو لالەکائی لە ئەبووائیلەوە هێناویانە کەسێك ماڤ بەسەر ئوم سەلەمەوە هەبوو سوێندی خوارد، عومەر سێ قامچی لێدا کە پێستی دەقڵیشاندو خوێناوی دەکرد، لە منتخب ج۵ ص۱۲۰ دا واهاتووە.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج۸ ص۲۵۳ لە ئوم موساوە هێناویەتی عەلی بیستی ئیبن سەبەو فەزڵی دەدات بەسەر ئەبوبەکرو عومەردا، عەلی بڕیاریدا بیکوژێت پێی وترا: کەسێك دەکوژیت کە بەرزو بەڕێزت ڕادەگرێت. وتی: لە شارێکدا منی تێدابێت نابێت لەگەڵم دابنیشێ.

عساری و لالەکائی لە ئیبراهیمەوە هێناویانە عەلی(رضي الله عنه) بیستی عەبدوڵڵای کوڕی ئەسوەد ڕەخنە لە ئەبوبەکرو عومەر دەگرێت، بۆیە داوای شمشێری کرد تا بیکوژێت، بەڵام لەسەر ئەوە قسەی لەگەڵ کرا، وتی: نابێت لە شارێکدا بێت کە منی تێدام، بۆیە دووری خستەوە بۆ شام.[1]

عشاری لە حەسەنی کوڕی کەسیر لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای عەلی و وتی: تۆ چاکترینی خەڵکی، وتی: ئایا پێغەمبەرت(صلى الله عليه وسلم) بینیوە؟ وتی: نا، وتی: ئەی ئەبوبەکر؟ وتی: نا، وتی: ئەی عومەر؟ وتی: نا، وتی: ئەگەر بتوتایە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بینیوە دەمکوشتی، ئەگەریش بتوتایە ئەبوبەکرو عومەرم بینیوە قامچیم لێدەدایت.

---

[1] - المنتخب ج٤ ص٤٤٧.

ئیبن ئەبی عاصم و ئیبن شاهین لالەكائی و ئەسبەهانی و ئیبن عەساكیر لە عەلقەمەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) وتاری بۆ داین و سوپاسی خوای كردو دواتر وتی: بیستوومە خەڵكانێ فەزڵم دەدەن بەسەر ئەبوبەكرو عومەردا، ئەگەر پێشتر قسەم لەسەر بكردایە لەسەری سزام دەدا، بەڵام حەزناكەم پێش هیچ وتن سزابەكاربێنم، هەركەس دوای ئەمە هەرچی وت: ناڕاستی وتووەو سزای هەڵبەستەكاری(مفتری) هەیە، دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چاكترین كەس ئەبوبەوكر و دواتر عومەر، پاشان بەزمێكمان ناوەتەوە خوای گەورە بە ویستی خۆی دادوەری تێدا دەكات.

خەیسەمە و لالەكائی و ئەبولحەسەنی بەغدادی و شیرازی و ئیبن مندە و ئیبن عەساكیر لە سوەیدی كوڕی غەفلەوە هێناویانە دەڵێت: دام بەلای خەڵكێكدا بە كەمی باسی ئەبوبەكرو عومەریان دەكرد، چووم بۆ لای عەلی و بۆم باسكرد، ئەویش وتی:نەفرین لەوكەسەی بەدەر لە باشەو جوانی ناویان ببات، دوو براو وەزیری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەو دووانە بوون، پاشان چوویە سەر مینبەرو وتارێكی بەهێزی خوێندەوەو وتی:(ئەوە چیە كەسانێ بەو جۆرە باسی دوو گەورەی قوڕەیش و دوو باوكی موسڵمانان دەكەن كە من خۆمی لێ دووردەگرم لەوەی دەیڵێن بەدەرم و لەسەر ئەوەی دەیڵێن سزا دەرم؟ سوێند بەوەی تۆوی دەرهێناو ئاوی مەنی لە هیچەوە كرد بە شت، تەنها باوەڕداری لە خواترس ئەو دووانەی خۆش دەوێت و لادەری ڕیسوا ڕقیەتی لەو دووانە، ئەوان هاوەڵی ڕاستگۆو بە وەفای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوون و فەرمان و ڕێگری و سزادانیان بەجێدەگەیاند، لە ڕای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لایاننەدەداو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هیچ ڕایەكی وەك ڕای ئەوان لا گرنگ نەبوو و كەسی هێندەی ئەوان خۆش نەدەویست، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كۆچی دوایی كردو لێیان ڕازی بوو و خەڵكی ڕازی بوون، دواتر ئەبوبەكر بەرنوێژی كرد كە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرد موسڵمانان كردیان بە خەلیفەو زەكاتیان دایە دەست چونكە ئەو دووانە نزیكی یەك بوون و من یەكەم كەس بووم لە بەنی عەبدولموتەلیب ناوی

بۆ ئەو دەچوو ئەویش ڕقی بوو لەوە، حەزی دەکرد کەسی تر بیکات، سوێند بەخوا ئەو باشترین کەس بوو لە ئەمینداریو میهرەبانترینو ژیرترینو دونیانەویستترین بوو وە پێش هەمووان موسڵمان بوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە سۆزو میهرەبانیدا دەیچواند بە میکائیلو لە لێبوردنو لەسەرخۆییدا دەیچواند بە ئیبراهیم، بە شوێن ژیانی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) چوو تا گیانی سپارد(ڕەحمەتی خوای یێت) پاشان دوای ئەو عومەری کوڕی خەتتاب هاتو ڕای خەڵکی لەسەر وەرگرت، هەبوو حەزی دەکرد و هەبوو حەزی نەدەکرد، من لەوانەبووم کە ڕازی بوون، سوێند بەخوا عومەر دونیای بەجێ نەهێشت تا ئەوەی لێی ناڕازی بوو لێی ڕازی بوو، بارەکەی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵکەی بردەسەرو شوێن پێی ئەوانی گرت وەك چۆن كۆرپە شوێن پێی دایکی دەگرێتەبەر، سوێند بەخوا ئەو چاکترین کەس بوو کە مابوو نەرمونیانو میهرەبان، سەرخەری ستەملێکراو بەرامبەر بە ستەمکار، پاشان خوای گەورە زمانی بەحەق خست تا بینیمان فریشتەیەك لەسەر زاری ئەو قسەی دەکرد، خوای گەورە بە موسڵمانبوونی ئەو ئیسلامی عیززەتمەند کردو کۆچکردنی ئەوی کرد بە بەهێزی بۆ ئایینو خۆشەویستی ئەوی لە دڵی باوەڕداران و ترسی لە دڵی دووڕووەکاندا دانا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیچواند بە جبریل بەرامبەر بە دوژمنانو توندو ڕەق رضي الله عنه بەنووح توندو گرژ بوو بەرامنبەر بێباوەڕان، دەی کێ هەیە وەك ئەو دووانە؟ تەنها بە خۆشەویستی بۆیانو شوێنکەوتنیان پێیان دەگەین، کێ ئەو دوانەی خۆش دەوێت منیشی خۆش دەوێت، کێ ڕقی لەو دوانە بێت ڕقیشی لە منەو منیش لێی بەریم، ئەگەر پێشتر لەسەریان ئەمەم دەوت سزای سەختی ئەوەم دەدا لە ڕوویان هیچ بڵێ، دوای ئەمە هەرکەسم دی هەرچی لە ڕوویاندا وت چی لەسەر هەڵبەستەکار هەیە لەسەر ئەویشە، بزانن چاکترینی ئەم ئومەتە دوای

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەبوبەکرو عومەرن، پاشان خوای گەورە چاکتر دەزانێت کێ باشترە، ئەمە دەڵێم و خوا لە من و ئێوەش خۆش بێت.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئەبوئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك بە عەلی کوڕی ئەبوتالیبی وت: عوسمان لە ئاگردایە، ئەویش وتی چووزانیت؟ وتی: چونکە چەند بیدعەیەکی داهێنا، عەلی پێی وت: ئەگەر تۆ کچت هەبوایە دەتکرد بە هاوسەری عوسمان تا ڕاوێژو پرس نەکەیت؟ وتی: نا، وتی: ئەی چاکتر لە ڕای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەیە بۆ دوو کچەکەی؟ لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێم بڵێ ئەگەر کارێکی بویستایە دەیخستە بەر ویستی خوا یان نا؟ وتی: دەیخست، وتی: ئایا خوا خێری بۆ دادەنا یان نا؟ وتی: بەڵکو بۆی دادەنا، وتی: دەی لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێم بڵێ خوای گەورە لەوەدا چاکی بۆ هەڵبژارد کە کچەکەی دا بە عوسمان یان نا؟ وتی: خەریکە بێم بدەم لە ملت بەڵام خوا ڕێ نادات سوێند بەخوا ئەگەر جگە لەوەت بوتایە دەمدا لە ملت.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج٩ ص٢٣٥ لە سالم لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە زمانیەوە قورسیەکی بۆ نیشاندام کە قسەی ڕوون نەبوو، باسی عوسمانی کرد، عەبدوڵڵا وتی: منیش وتم بەخوا نازانم چی دەڵێیت بەڵام ئێوە ئەی هاوەڵانی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) دەزانن ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) دەمانوت ئەبوبەکر و عومەرو عوسمان، ئێستا ئەم سامانە خراوەتەڕوو،کە ئەگەر بەخشی ڕەزامەندی تێدا دەبێ و ئەگەرنا نابێ.

تەبەرانی لە عامری کوڕی سەعدەوە دەڵێت: سەعد دەڕۆیشت کە دای بە لای کابرایەکدا قسەی دەوت بە عەلی و تەلحەو زوبەیر، سەعد پێی وت: تۆ قسە بە کەسێك دەڵێیت کە پێشتر لای خوا ڕێزدارن سوێند بەخوا یان دەست هەڵدەگریت لە

[1] – لە کنز العمال ج٤ ص٤٤٦ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٥ ص١٨ دا واهاتووە.

قسه پێوتنیان یان لای خوا نزات لەڕوودا دەکەم، ئەویش وتی: وا دەمترسێنیت دەڵێیت پێغەمبەریت، سەعد وتی: خوایە ئەگەر قسە بە کەسانێك دەڵێت کە لای تۆ لە پێشترن ئەمڕۆ بیکە بەپەن، خێرا وشترێ هات و خەڵکی ڕزگاریان دەکرد کەچی شێلای بینیم خەڵکی دەکەوتنە شوێن سەعدو دەیانوت ئەی ئەبوئیسحاق خوا نزاکەی گیراکردیت.[1]

حاکم ج٣ ص٤٩٩ لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی: کەسێك قسەی بە عەلی وت، سەعدیش نزای لێکرد، وشترێ هات و کابرای کوشت، سەعد کەسێکی ڕزگارکرد و سوێندی خوارد ئیتر نزا لە کەس نەکات.

هەروەها لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە هێناویەتی دەڵێت: لە مەدینە بووم لە بازاڕدا دەگەڕام کە گەیشتمە بەردەزەیتەکان کۆمەڵێکم بینی لە دەوری سوارێك کۆ ببوونەوە کە جنێوی دەدا بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و خەڵکیش لە دەوری بوون، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هات و لەسەریان وەستا و وتی: ئەوە چیە؟ وتیان: کەسێکە جنێودەدات بە عەلی، سەعد چوو بۆی و ڕێیان بۆ کردووەو گەیشتە لای، وتی: ئەی کابرا لەسەر چی قسە بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەڵێیت؟ مەگەر یەکەمینی موسڵمانبوان نیە، مەگەر یەکەم کەس نیە لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی کرد؟ مەگەر دونیانەویستترینی خەڵکان نیە؟ مەگەر زاناترینی خەڵکان نیە؟ هێندەی وت تا وتی: مەگەر زاوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نیە؟ مەگەر هەڵگری ئاڵای کاتی جەنگەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەبوو، پاشان ڕوویکردە قیبلەو دەستی بەرزکردەوەو وتی: خوایە ئەگەر ئەمە جنێودەدات بە وەلیەکی تۆ خوایە ئەم کۆڕە بەجێ نەهێڵێ

[1] - هەیسەمی ج٩ ص١٥٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن.

تا توانای خۆتیان پێ نیشان بدەیت، قەیس دەڵێت: سوێند بەخوا نەچووین تا وڵاخەکەی خستی و دای بەسەر ئەو بەردانەدا و دەماغی پژاو مرد.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٩٥ لە ڕباحی کوڕی حارسەوە هێناویەتی موغیرە(ﷺ) لە مزگەوتی گەورەدا بوو و خەڵکی کوفە لە ڕاست و چەپیەوە بوون، کەسێك پێی دەوترا سەعیدی کوڕی زەید هات بۆ لای، موغیرە بەخێرهاتنی کرد و لە لای خۆی لەسەر جێگەکەی داینیشاند، کەسێك لە خەڵکی کوفە هات و موغیرە چوو بەدەمیەوە، قسەی وت، وتی: ئەوە قسە بەکێ دەڵێت ئەی موغیرە؟ وتی: ئەوە قسە بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب وت وتی: ئەی موغیرە(سێ جار وتی) لەلای تۆ بیستم قسە بە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەوترێ و تۆ هیچ ناکەیت و ناگۆڕێیت و منیش شایەتی دەدەم ئەم دوو کوێچکەم لە پێغەمبەریان(ﷺ) بیست و دڵم لێی تێگەیشت، من درۆی بۆ هەڵنابەستم کەپێی گەیشتم پێی فەرمووم(ئەبوبەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوسمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، تەلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، سەعدی کوڕی مالیك لە بەهەشتە، نۆیەمی باوەڕدارانش لە بەهەشتە) ئەگەر بمویستایە ناوی ببەم ناوم دەبرد، دەڵێت خەڵکی مزگەوت تکایان لێ دەکرد نۆیەم کێیە؟ ئەویش وتی: بەخوا سوێندتان دام ئەگەر نا نەمدەوت، من نۆیەمی باوەڕدارانم و پێغەمبەر(ﷺ) دەیەم،پاشان سوێندێکی بەدوادا هات و وتی: دیمەنێك کە کەسێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بینی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ڕووخساری گۆڕابێ باشترە لەکاری هەرکامتان ئەگەر تەمەنیشی هێندەی تەمەنی نووح بێت.[2]

---

[1] – حاکم ج٣ ص٥٠٠ دەڵێت: زەهەبی لەسەری کۆکە و لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحە، ئەبونەعیم لە الدلائل ص٢٠٦ هێناویەتی.

[2] – صحیح.

هەروەها لە ج١ ص٩٦ لە عەبدوڵڵای کوڕی زالمی مازنیەوە دەڵێت کە موعاویە لە کوفە چوو موغیرەی کوڕی شوعبەی دانا، ئەویش هەندێ وتاربێژی دانا کە قسەیان بە عەلی دەوت و منیش لەپاڵ سەعدی کوڕی زەیددا بووم، سەعد تووڕەبوو و دەستی گرتم و شوێنی گەوتم، وتی: دەبینیت ئەو کابرا ستەمکارە کە ستەم لە خۆی دەکات و فەرمان دەکات بە نەفرینی کەسێ کە لە بەهەشتیەکانە؟ شایەتی بۆ نۆدانە دەدەم کە لە بەهەشتن ئەگەر شایەتی بۆ دەیەمیش بدەم لۆمە ناکرێم.[١]

# (گریان بۆ مەرگی گەورەکان)

ئیبن سەعد ج٣ ص٣٦٢ لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عومەر برینداربوو خواردنەوەیەکی بۆ هێنراو لە شوێنی برینداریەکەوە ڕژا، صوهەیب وتی: عومەرم ڕۆ دوای تۆ چی بکەین؟! عومەر پێی وت: بەسە براگیان مەگەر نازانی هەرکەس شینی لەسەر بکرێ سزا دەدرێ لە ئەبوبوردە لە باوکیەوە دەڵێت: کە عومەر پێکرا صوهەیب دەگریا و دەنگی بەرزکردەوە، عومەر وتی: بۆ من وادەکەیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: مەگەر نازانیت پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت(من یبك علیه یعذب) واتە(هەرکەس لەسەری بگرین سزا دەدرێت) لە میقدادی کوڕی مەعدیەکریبەوە دەڵێت: کە عومەر پێکرا حەفسە چوویە ژوور و وتی: هاوەڵی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەی خزمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر بە عەبدوڵڵای کوڕی وت: عەبدوڵڵا دامنیشێنە، لەسەر ئەوەی دەیبیستم ئارامم لێبڕا، ئەویش دای بەلای سنگیداو عومەریش بە حەفسەی وت: من بەو مافەی هەمە لەسەت داوام لێتە داوی ئەم دانیشتنەت، بەڵام بۆ چاوەکانت خاوەنیان نیم، چی مردوو هەیە ئەوەی تیایدا نیە لەسەری بوترێ فریشتەکان دەینوسن.

[١]- ئەحمەد و ئەبونەعیم و ئیبن عەساکیریش لە بارحەوە هێناویانە، لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٧٩ دا هاتووە.

ئیبن سەعد ج٣ ص٣٧٢ لە عەبدولمەلیکی کوڕی زەید لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: سەعیدی کوڕی زەید گریا و کەسێ پێی وت: ئەبوئەعوەر بۆچی دەگریت؟ وتی: لەسەرم، عومەر کە مرد ئیسلام گوورزێکی بێچارەسەری تا قیامەت بەرکەوت(کونێکی تێکەوت کە پڕناکرێتەوە) لە ئەبووائیلەوە دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود هات بۆ لامان و تەرمی عومەری بینی، ڕۆژی وام نەدیبوو هێندە گریاناوی و غەمبار بێت، پاشان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بمزانیبایە عومەر سەگێکی خۆشدەوێت خۆشم دەویست سوێند بەخوا وادەزانم درەختەگەورەش هەست بە لە دەستدانی عومەر دەکات.

ئیبن ئەبی دونیا لە ئەبی عوسمانەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەرم بینی کە مەرگی نوعمانی بینی دەستی لەسەر سەری دانا و دەگریا.[1]

ئەبونەعیم لە ئەبونەشعەسی صەنعانیەوە هێناویەتی کە ئەمیری صەنعا پێی دەوترا سومامەی کوڕی عەددی و هاوەڵ بوو، کە مەرگی عوسمان هات گریا و وتی: ئەم کاتە تەواو بوونی خیلافەتی پێغەمبەرایەتی و هاتنی پاشایەتی و خۆسەپێنیە، هەرکەس بەسەر شتێکدا زاڵ بێت دەیخوات[2]

ئیبن سەعد ج٣ ص٨١ لە زیدی کوڕی عەلیەوە هێناویەتی: زەیدی کوڕی سابت(ﷺ) لە ڕۆژی گەمارۆی عوسماندا لەسەر عوسمان دەگریا، لە ئەبوصالحەوە دەڵێت: ئەبوهورەیرە کە دەیبیست چی کرا بە عوسمان دەگریا و دەیوت: وەك ئەو کاتەیە دەیوت(هاە هاە) کڵپەی گریان دەیگرت. لە یەحیای کوڕی سەعدەوە ئەبوحەومیدی ساعید کە مەرگی عوسمانی بیست - لە بەشداربوانی بەدر بوو - وتی: خوایە مەرج بێت ئیتر ئەوە و ئەوە نەکەم و تا دەگەمەوە بە تۆ پێنەکەنم.

---

[1] - لە کنز العمال ج٨ ص١١٧ دا واهاتووە.

[2] - منتخب کنز العمال ج٥ ص٢٧، ئیبن سەعد ج٣ ص٨٠ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

# (بێزاری بە مەرگی گەورەکان)

بەزار لە ئەبوسەعیدەوە هێناویەتی وتی: کە پێغەمبەرمان(ﷺ) خستە ناو خاك دڵەکانمان بێزار کەوتن(خۆمان لا بێزرا).[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٥٤ لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە(ﷺ) دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین‌و یەك ڕووخساربووین تا لێمان جیابوویەوە بەڕاست‌و چەپدا کەوتین، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین یەك ڕووخسار بووین کە مرد ئاواو ئاوا سەیرمان دەکرد.

ئیبن سەعد ج٢ ص٢٧٤ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: ئەو ڕۆژەی تیایدا پێغەمبەر(ﷺ) مرد مەدینە [illegible] یك داگەڕا(بێزاربووین) و دەستەکانمان نەیاندەتوانی بیخەنە ژێر خاك [illegible] ی لە دڵمان بێزاربووین.

هەروەها لە ج [illegible] ص ٣٤ [illegible] ەوە لە فەرموودەی کۆچدا دەڵێت: ئەو ڕۆژەی هات بۆ مەدینە [illegible] م هەرگیز نەدیبوو کە ئەو ڕۆژەی هاتە مەدینە ڕۆژی لەوە پرشنگدارتر نەبوو، ئەو ڕۆژەش مرد هەرگیز ڕۆژی لەوە بێتامترو تاریکترم نەدیبوو.

ئیبن سەعد ج٣ ص٣٧٤ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: هاوەڵانی شوورا کۆبوونەوە، کە ئەبوتەلحە بینی چی دەکەن وتی: من دەترسام ئەوان کاری خیلافەت بدەن بەیەکدی تا ئەوەی ڕکەبەری لەسەر بکەن، سوێند بەخوا چی ماڵی موسڵمانان بوو مەرگی عومەر کەمیی خستبوویە ناو ئایین‌و دونیایان.

# (ڕێزگرتنی لاوازان‌و هەژارانی موسڵمانان)

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٧٦ لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و شەش کەس دا بووین کە بێباوەڕان وتیان: ئەوانە

---

[1] – هەیسەمی ج٩ ص٣٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن.

لە خۆت دووربخەرەوە چونکە ئەوانە ئاواو ئاوان، دەڵێت: منو ئیبن مەسعودو کەسێکی هۆزی هوزەیلو بیلالو دوو کەس بووین ناویانم بیرنەماوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شتێ لەوبارەوە کەوتە دەروونیەوە، خوای گەورە بێداری کردەوەو فەرمووی(ولاتطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه)[1،2،3].

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٤٦ لە ئیبن مەسعودەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دەستەیەکی قورەیش دایان بە لای پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) و ئەویش صوهەیبو بیلالو عەممارو هاوشێوەی ئەوانو دەستەیەکی لاوازانی موسڵمانانی لابوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ڕازیت بەوانەی ناو هۆزەکەت؟ ئایا ئێمە شوێنکەوتەی ئەوانەین؟ ئایا ئەوانە خوا منەتباری کردوون؟ ئەوانە دووربخەرەوە بەڵکو ئەگەر دەرت کردن شوێنت بکەوین! خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند(و انذر به الذين يخافون ان يحشروا الى ربهم.....) تا(فتكون من الظالمين)[4،5].

ئەبویەعلا لە ئەنەسەوە هێناویەتی سەبارەت بە فەرمایشتی(عبس و تولى) ئیبن مەکتوم(رضي الله عنه) هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ئوبەی کوڕی خەلەف دەدواند، وەڵامی ئیبن ئوم مەکتوومی نەدایەوە، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند(عبس و تولى، ان جاءه الاعمى) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داوی ئەوە ڕێزی دەگرت.[6] ئەبویەعلاو ئیبن جەریر لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویانە

[1] – الانعام ٥٢.

[2] – حاکم ج٣ ص٣١٩ لە سەعدەوە بە کورتی هێناویەتی و دەڵێت: لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە.

[3] – صحيح.

[4] – صحيح.

[5] – ئەحمەدو تەبەرانیش بەو شێوەیە هێناویانە، هەیسەمی ج٧ ص٢١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد صەحیحن جگە لە کردوس کە جێ متمانەشە، تەواو.

[6] – صحيح.

دەڵێت:(عبس و تولی) لەسەر ئوم مەكتومی كوێر دابەزی كە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و دەیوت: ڕێنمونیم بكە، عائیشه(رضي الله عنها) دەڵێت: یەكێ لە بێباوەڕان لەلای پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی لە ئیبن مەكتوم وەرچەرخاندو ڕووی كردە ئەوی نرو دەیوت ئەوەی دەیڵێم هیچ گرفت و خراپەیەكی لێ بەدیدەكەیت؟ ئەویش دەیوت: نا، لەمبارەوە ئایەت دابەزی(عبس و تولی)[1].[2]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص١٤٦ لە خەبابی كوڕی ئەرەتەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەقرەعی كوڕی حابسی تەمیمی و عویەینەی كوڕی حصنی فەزاری هاتن و پێغەمبەریان(ﷺ) بی لەگەڵ عەممارو صوهەیب و بیلال و خەبابی كوڕی ئەرەتدا(رضي الله عنهم) و لەگەڵ هەندێ لە هەژارە باوەڕدارەكاندا دانیشتبوون كە ئەوانیان بینی گاڵتەیان بە موسڵمانان كردو بە تەنیا دواندیان و وتیان وەفدەكانی عەرەب دێن بۆ لات و ئێمە شەرم دەكەین عەرەب بمانبینن لەگەڵ ئەم كۆیلانەدا دادەنیشین، ئەگەر هاتین بۆ لات لەلایان لاچۆ، وتی: بەڵێ، وتیان: دەی نامەیەكی خۆتمان بۆ بنووسە، ئەویش داوای پەڕەی كردو عەلی بانگكرد تا بنوسێت – ئێمەش لەلایەكەوە دانیشتبووین – كە جبریل(علیە السلام) دابەزی و ئەم ئایەتەی هێنا(و تطرد الذین یدعون ربهم...) (٥٢– ٥٤ الانعام) پێغەمبەر(ﷺ) پەڕەكەی فڕێداو بانگی كردین و ئێمەش چووین و ئەویش فەرمووی(سەلامتان لێ بێت) لەگەڵی نزیك بووینەوە تا ئەژنۆمان بەر ئەژنۆی دەكەوت، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵمان دادەنیشت، ئەگەر بیویستایە هەستێت هەڵدەستا و بەجێی دەهێشتین، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند(واصبر نفسك مع الذین یدعون ربهم....) الكهف ٢٨دوای ئەوە

---

[1] – صحیح.

[2] – ترمزیش بەمجۆرە هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن كەسیر ج٤ ص٤٧٠ دا واهاتووە.

لەگــەڵ پێغەمبــەردا(ﷺ) دادەنیــشتین، کــە دەگەیــشتینە کــاتی هەســتانی هەڵدەستاین و دەچووین ئەگەر نا خۆی ڕادەگرت تا ئێمە هەستین[1].[2]

ئەبونەعیم لە ج١ ص٣٤٥ لە سەلمانەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەوانە تازە دڵیان بە ئیسلام پەیوەست بوو هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) عویەینەی کوڕی حصین و ئەقرەعی کوڕی حابس و هاوشێوەکانیان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە نێوەندی مزگەوتدا دابنیشیت و ئەوانەمان لێ دووربگریت – مەبەستیان ئەبوزەرو سەلمان و موسڵمانە هەژارەکان بوو کە جلی خورییان لەبەربوو تەنها ئەوەیان هەبوو – لە لات دادەنیشین و دڵسۆزت دەبین و قسەت لێ وەردەگرین، خوایش ئەم ئایەتەی دابەزاند(وتل ما اوحي اليك من كتاب ربك..... سرادقها)[3] بە ئاگر دەیترساندن، پێغەمبەر(ﷺ) هەستا بە دوایاندا دەگەڕا تا لە کۆتایی مزگەوتەکەدا بەدیکردن یادی خوایان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(الحمد الله الذي لم يمتني حتى امرني ان اصبر نفسي مع قوم من امتي معكم المحيا و معكم الممات) واتە(سوپاس بۆ ئەو خوایەی نەیمراندم هەتا فەرمانی پێکردم لەگەڵ دەستەیەکی ئوممەتەکەمدا خۆڕاگربم، ژیان لەگەڵ ئێوەو مردن لەگەڵ ئێوە).

ئیبن عەساکیر لە مالیك لە زوهری لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت: قەیسی کوڕی متاتیە هات بۆ ناو بازنەیەك کە سەلمانی فارسی و صوهەیبی ڕۆمی و بیلالی حەبەشی تێدابوو، وتی: ئەوانە ئەوس و خەزرەجن هەستان بەسەرخستنی ئەم کابرا ئەی ئەمانە چین؟ موعاز هەستا یەخەی

---

[1] – صحيح.

[2] – ئیبن ماجە لە خەبابەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٦ ص٥٦ دا هاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەش لە ئەقرەعی کوڕی حابس و عویەینەی کوڕی حصینەوە بەو جۆرە تا کۆتایی ئایەتەکەی هێناوەو ئەوەی دواتری نەهێناوە، لە کنز العمال ج١ ص٢٥٤ دا هاتووە.

[3] – الكهف ٢٧-٩٢.

گرت تا بردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێی وت: چی وتووە، پێغەمبەر(ﷺ) بە تووڕەییەوە عەباکەی ڕاکێشا تا هاتە مزگەوت، دواتر بانگ درا بۆ نوێژ، سوپاس و ستایشی خوای کردو دواتر فەمووی(ئەی خەڵکینە پەروەردگار یەك پەروەردگارە و باوك یەك باوکەو ئایین یەك ئایینە، بزانن بە باوك و دایکتان نیە، بەڵکو زمانێکەو هەرکەس قسە بە عەربی بکات ئەوە عەرەبیە) موعاز یەخەی کابرای گرت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سەبارەت بەم دووڕووە چی دەڵێیت؟ فەرمووی(وازی لێ بێنە بۆ دۆزەخ) دەڵێت: ئەوە یەکێك بوو لەوانەی هەڵگەڕایەوەو کوژرا[1][2].

## (ڕێزگرتنی دایك و باوك)

تەبەرانی لە بورەیدەوە هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دایکی خۆمم لەسەر مل بۆ دوو سەفەری سەخت لە شوێنێکی سەختی وادا گێڕاوە ئەگەر پارچە گۆشتت لەسەر دابنایە دەبرژا ئایا سوپاسیم بەجێگەیاندووە؟ فەرمووی(لعله ان یکون لطقة واحدة) واتە(لەوانەیە بۆیەك جار)[3].

تەبەرانی لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لەگەڵ پیرێکدا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش پێی فەرموو(ئەی فلان ئەوە کێیە لەگەڵتدا ؟) وتی: باوکمە، فەرمووی(دەی لەپێشیەوە مەڕۆ بەرێدا لەپێشیدا دامەنیشە و بەناوی خۆیەوە ناوی مەبەو وامەکە جنێوی بۆ بڕوات)[1][4].

---

[1] – ضعیف.

[2] – کنز العمال ج٧ ص٤٦.

[3] – هەیسەمی ج٧ ص١٣٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا حەسەنی کوڕی ئەبوجەعفەر هەیە کە لاوازە بە درۆزن نەناسراوە، لەیسی کوڕی ئەبی سەلیم هەیە.

[4] – ضعیف.

تەبەرانی لە ئەبوغەسانی ضەبییە وە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ باوکم لە دەرەوەی ناوچەی(الحرة) دەچووم کە ئەبوهورەیرەم پێ گەیشت پێی وتم: ئەوە کێیە؟ وتم: باوکمە، وتی: لەبەردەم باوکدتدا مەڕۆ و لە دوایەوە یان لەپاڵیدا برۆ، ڕێ مەدە کەس بکەوێتە نێوانتانەوەو بەسەر سێبەری باوکتا مەڕۆ تا بیترسێنی و شتێ کە باوکت سەیری دەکات مەیخۆ نەوەك ئەو حەزی پێ بکات.[2]

شەش زانای فەرموودە جگە لە ئیبن ماجە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و داوای مۆڵەتی لێکرد بۆ جیهاد، فەرمووی(ئایا دایك و باوکت زیندوون؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(ففیهما فجاهد) واتە(دەی جیهادت لای ئەوان بکە)[3] لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا وتی: کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: لەسەر کۆچ و جیهاد بەیعەتت پێدەدەم و چاوەڕێی پاداشتم لای خوا، فەرمووی(ئایا دایك و باوکت هیچکامیان زیندوون؟) وتی: بەڵێ هەردووکیان زیندوون، فەرمووی(فتبتغي الاجر من الله) واتە(بۆ پادشتی لای خوایش دەگەڕێیت؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(فارجع الى والدیك فاحسن صحبتهما) واتە(دەی بگەڕێرەوە بۆ لای دایك و باوکت و لەگەڵیان چاکە بنوێنە) لە گێڕانەوەیەکی ئەبوداودا وتی: هاتووم لەسر کۆچ بەیعەتت پێ

---

[1]- هەیسەمی ج٨ ص١٣٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەلی کوڕی سەعیدی کوڕی بەشیری مامۆستای تەبەرانی هەیە کە نەرمی نوێنە، ئیبن دەقیقی عید هێناویەتی کە جێ متمانەیە، موحەممەدی کوڕی عروەی کوڕی برندیش لە سەنەدەکەدایە کە ناینناسم، کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، تەواو.

[2]- هەیسەمی ج٨ ص١٣٧ دەڵێت: ئەبوعەسان و ئەبوغونەیمی ڕاوی هەن کە نایانناسم و کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن.

[3] - صحیح.

بدەم و دایك و باوکم بەجێ هێشتن کە دەگریان، فەرمووی(بگەڕێرەوە بۆ لایان چۆن گریاندنت ئاوایش بیانخەرە پێکەنین).[1]

هەروەها لە فەرموودەکەی ئەبوسەعیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی یەکێك لە خەڵکی یەمەن کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەر(عليه السلام) و ئەویش فەرمووی(هل لك احد باليمن)(کەست هەیە لە یەمەن ؟) وتی: دایك و باوکم، فەرمووی(مۆڵەتیان دایت؟) وتی: نا، فەرمووی(بگەڕێرەوە بۆ لایان ئەگەر مۆڵەتیان پێدایت جیهاد بکە، ئەگەر نا لەگەڵیان چاکە بکە)[2] ئەبویەعلا و تەبەرانی بە سەنەدی جەید لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(عليه السلام) و وتی: من حەزم لە جیهادە و توانایم نیە، فەرمووی(لە دایك و باوکت کەسیان ماوە؟) وتی: دایکم، فەرمووی(قابل الله في برها فاذا فعلت ذالك فانت حاج و معتبر و مجاهد) واتە(لە چاکەیدا خوا ڕازی بکە ئەگەر ئەوەت کرد ئەوا تۆ حەج و عەمرە و جیهادیشت کردووە)[3].[4]

تەبەرانی لە ئەبوو ئومامەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی(بەرەو ڕووی ئەم گوندە کە خەڵکەکەی ستەمکارن ئامادەبن،چونکە پشت بەخوا خوای گەورە بۆتان فەتح دەکاتکەسێ کە وشترەکەی یاخی و لادەر یان لاواز بێت با لەگەڵ من نەیەت)ئەبووهورەیرە چوو بۆ لای دایکی و وتی کەلوپەلەکەم ئامادەبکە، پێغەمبەری خوا فەرمانی جیهادی داوە، دایکی وتی: دەچیت؟دەزانیت من بێ تۆ ناچەمەژور، ئەبووهورەیرە وتی من لە فەرمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)لانادەم،ئەوکات دایکی ئەبووهورەیرەی(رضي الله عنه)سوێند دا بەو شیرەی

---

[1] – صحيح.

[2] – صحيح.

[3] – ضعيف.

[4] – لە الترغيب والترهيب ج٤ ص٩٣ دا واهاتووە.

پێیداوە،پاشان بە نهێنی چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەی لەلا باسکرد، ئەویش فەرمووی(بڕۆ کێشەکەت چارەسەر بوو)،پاشان ئەبووهورەیرە هات و پێغەمبەر(ﷺ)رووی لێ وەرگێڕا، ئەبووهورەیرە(رضي الله عنه) وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبینم رووم لێ وەردەگێڕیت،دڵنیام شتێکم کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(تۆ کەسێکیت کە دایکت سوێندی دایت و مەمکەکانی دەرهێنا و بە شیرێ کە لێت خواردبوو سوێندی دایت،ئایا کەستان بروای وایە کە ئەگەر لای دایکی یان باوکی بێت ئەوە لەڕێی خوادانیە؟بەڵکو کاتێ چاکەیان لەگەڵ بکات و مافیان بدات ئەوە لەڕێی خوادایە)ئەبووهورەیرە دەڵێت دوای ئەوە دوو ساڵ لە غەزاکاندا بەشداریم نەکرد تا دایکم مرد.[1]

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر سقایە بوو کە ئافرەتێك کوڕێکی خۆی هێناو وتی: ئەم کوڕەم دەیەوێت غەزا بکات و منیش لەگەڵیدام، فەرمووی(لاتبرح من امك حتى تاذن لك او يتوفاعا الموت لانه اعظم لاجرك) واتە(لە دایکت دوور مەکەوەرەوە تا مۆڵەتت دەدات یان دەمرێت، چونکە ئەوە پاداشتی گەورەتری بۆت هەیە)[2] هەروەها هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لەگەڵ دایکی هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و دەیویست جیهاد بکات و دایکی ڕێی نەدەدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لای دایکت بمێنەوە چونکە لای ئەو پاداشتت بۆ هەیە وەك ئەوەی لە جیهاددا بۆت هەیە)[3][4].

١ – ضعيف.

[2] – ضعيف.

[3] – ضعيف.

[4] – لە هەردوو سەنەکەدا رشدینی کوڕی کریب هەیە کە لاوازە. هەروەك هەیسەمی ج٥ ص٣٢٢ دەیڵێت.

هەروەها لە تەلحەی کوڕی موعاویەی سولەمیەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەمەوێت لەڕێی خوادا جیهاد بکەم، فەرمووی(دایکت زیندووە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(الزم رجلها فثم الجنة) واتە(پەیوەستی قاچی بە بەدوایدا بەهەشتە)[1][2].

هەروەها لە موعاویەی کوڕی جاهمەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و لەسەر جیهاد ڕاوێژم لەگەڵ کرد، فەرمووی(ئایا دایك و باوکت هەن؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(پەیوەستی ئەوان بە چونکە بەهەشت لە ژێرپێیاندایە)[3][4].

ئیبن سەعد ج٤ ص١٧ لە موعاویەی کوڕی جاهمەی سولەیمیەوە هێناویەتی جاهمە چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ویستم غەزابکەم و هاتمە خومەتت تا ڕاوێژت پێبکەم، فەرمووی(ئایا دایکت هەیە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(دەی پەیوەستی بە چونکە بەهەشت لە ژێرپێیدایە) دووەم و سێیەمیش لە چەند شوێنێکدا هاتووە بە هەمان شێوە فەرمایشت.

ئەبویەعلا لە نەعیمی مەولای ئوم سەلەمەوە(رضی الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر(رضی الله عنه) چوو بۆ حەج تا لە نیوەی مەککە و مەدینەدا گەیشتە لای درەختێك و ناسیەوەو لە ژێریدا دانیشت، پاشان وتی: پێغەمبەرم(صلی الله علیه وسلم) بینی لە ژێر ئەم درەختەدا دانیشت گەنجێکی ئەم شێوە هات تا لە خزمەت پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم تا لەگەڵ تۆدا لەڕێی خوادا لەبەر خواو ڕۆژی دوایی جیهادبکەم،

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص١٣٨ دەڵێت: تەبەرانی لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی لەحوممەدی کوڕی تەلحەوە نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن، تەواو.

[3] – صحیح.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص١٣٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن.

فـەرمووی(ئایـا دایـك و باوكـت هـەردووكیان زینـدوون ؟) وتـی: بـەڵێ فـەرمووی(دەی بگەڕێرەوە و چاكەیان لەگەڵ بكە) ئەویش لە كوێوە هاتبوو گەڕایەوە[1،2].

بەیهـەقی لـە حەسـەنی كـوڕی حەسـەن لـە باوكیـەوە هێناویـەتی عومـەری كـوڕی خەتتاب داوای ئوم كەلسومی كرد، عـەلی پێـی وت: ئـەوە لـەوە بچوكترە، عومـەر وتـی: لـە پێغەمبـەرم(صلى الله عليه وسلم) بیسـت دەیفـەرموو(كل سـبب و نـسب منقطـع یـوم القیامـة الا سـببي و نسبي) منیش حەزم كرد لـە ڕەچەڵەكی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) پشكم هـەبێ، عـەلی بـە حەسـەن و حوسەینی وت: بیدەن بە مامتان، ئەوانیش وتیـان: ئـەو ئافرەتێكـەو خۆی هەڵدەبژێرێت، عـەلی بـە تووڕەییـەوە هەسـتاو حەسـەنیش كراسـەكەی گـرت و وتـی: بابـەگیان بەرگـەی دووری تۆ ناگرم، وتی: دەی لێی مارە بكەن[3،4].

ئیبن سەعد ج٤ ص٤٩ لە موحەممەدی كوڕی سیرینەوە هێناویـەتی دەڵێـت: لـە سـەردەمی عوسمـانی كـوڕی عەففانـدا(رضي الله عنه) خورمـا گەیـشتە هـەزار درهـەم، ئوسامە چوو بۆ دارخورمایەك و گوشی و ڕۆنەكەی دەریهێنا و دەرخواردی دایكی دا، پێیـان وت: بۆچـی وادەكـەیت كـە دەزانیـت دارخورمـا بـووە بەهـەزار درهـەم؟ وتـی: دایكـم داوای ئەوەی لێكردم و داوای هەرچی بكات و بتوانم بیكەم دەیدەمێ.

## (سۆز بۆ منداڵان و یەكسانی نواندن لەنێوانیاندا)

تەبـەرانی لـە عەبـدوڵڵای كـوڕی عومـەرەوە(رضي الله عنه) هێناویـەتی دەڵێـت: پێغەمبـەرم(صلى الله عليه وسلم) بینی لەسـەر مینبـەر كە وتـاری بۆ خـەڵك دەدا، حوسـەینی كوڕی عەلی دەرچوو و پارچەیەك لە ملیدا بوو كە ڕایدەكێشا، كـەوت بەسـەر دەموچاویدا،

---

[1] – صحيح.

[2] – هەیـسەمی ج٨ ص١٣٨ دەڵێـت: لـە سـەنەدەكەدا ئـیبن ئیـسحاق هەیـە، كەسـەكانی دیكـە صەحیحن ئەگەر مەولای ئوم سەلەمە ناعم بێت كە صەحیحە ئەگەریش نەعیم بێت نایناسم.

[3] – ضعيف.

[4] – لە كنز العمال ج٨ ص٢٩٦ داو هاتووە.

پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەرەکە دابەزیو چوو بۆ لای، کە خەڵکی بینیان حوسەینیان گرتو بردیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش هەڵیگرتو فەرمووی((خوا شەیتان بکوژێ منداڵ تاقیکردنەوەیە، سوێند بەخوا نەمزانی لە مینبەر دابەزیوم تا هێنرا بۆم).[1]

بەزار لە ئەبوسەعیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەسەن(رضي الله عنه) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە سوجدەدا بوو، چوویە کۆڵی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی گرت هەتا هەستا، ئینجا چوویە سەر پشتەملی، کە هەستا ناردی و ئەویش چوو.[2][3]

بەزار لە بەهیەوە هێناویەتی دەڵێت: بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرم وت: پێم بڵێ کێ زیاتر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچێ، وتی: حەسەنی کوڕی عەلی لە هەمووان زیاتر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو و لای خۆشەویستتر بوو، دەچوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە سوجدەدا بوو دەچوویە سەر پشتی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵنەدەستا تا حەسەن خۆی دەچوو، دەهات بە ژێر سنگیدا پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بۆ بەرزدەکردەوە تا بە ژێریدا بڕوات(قاچەکانی بڵاودەکردەوە).[4][5]

ئەبویەعلا لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی دەکرد، لە سوجدەدا حەسەن و حوسەین دەچوونە سەر پشتی، کە دەیانەویست لایانببەن پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ دەکردن وازیان لێ بێنن، کە لە

---

[1] – هەیسەمی ج٨ ص١٥٥ دەڵێت: تەبەرانی لە حەسەنی مامۆستایەوە هێناویەتیو لە عەبدوڵڵای کوڕی عەلی جارودیەوە نەیهێناوەو هیچکامیان ناناسمو کەسەکانی دیکە جێ متمانەن، تەواو.

[2] – ضعیف.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص١٠٥ دەڵێت: بەزار هێناویەتیو لەسەر سەنەدەکەی ناکۆکی هەیە.

[4] – ضعیف.

[5] – هەیسەمی ج٩ ص١٧٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەلی کوڕی عابس هەیە کە لاوازە، تەواو.

نوێژ دەبوویەوە دەیخستنە سەر کۆشی و دەیفەرموو(هەر کەس منی خوشدەوێت با ئەم دووانەی خۆش بوێت)[1].[2]

ئەبویەعلا لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کڕنووشی دەبرد وحەسەن و حوسەین دەچوونە سەر پشتی و ئەویش سوجدەکەی درێژدەکردەوە، دەواتر ئەی پێغەمبەری خوا سوجدەکەت درێژکردەوە، دەیفەرموو(ارتحلني ابني فكرهت ان اعجله) واتە(کوڕەکەم هاتە سەر پشتم حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەم)[3].[4]

بوخاری لە ئەبوقەتادەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لامان و ئومامەی کچی ئەبولعاص لەسەر شانی بوو، نوێژی بۆ کردین کە ڕکوعی دەبرد دایدەنا و کە هەڵدەستا دەیگرتەوە کۆش.[5]

ئەحمەد لە ئەبی هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ حەسەن و حوسەین هات بۆ لامان و هەرکامیان لەسەر شانێکی بوون، هەر جارە و یەکێکیانی ماچدەکرد تا هاتە لامان، کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زۆرت خۆش دەوێن، فەرمووی(هەرکەس ئەو دوانەی خۆش بوێت منی خۆشتویستووە، هەر کەس ڕقی لەم دوانەبێت ڕقی لە منە)[1].[6]

---

[1] – حسن.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص١٧٩ دەڵێت: ئەبویەعلاو بەزار هێناویانە دەڵێت: کە لە نوێژ دەبوویەوە دەیگرتنە خۆ، تەبەرانی بە کورتی هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی ئەبویەعلا جێ متمانەن و ڕاجیاوازی لەسەر هەندێکیان هەیە، تەواو.

[3] – حسن.

[4] – هەیسەمی ج٩ ص١٨١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەممەدی کوڕی زکوان هەیە کە ئیبن حەببان بەجێ متمانەو جگە لەویش بەلاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن، تەواو.

[5] – ئیبن سەعد ج٨ ص٣٩ لە ئەبی قەتادەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[6] – صحيح.

ئەحمەد لە موعاویەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)م بینی زمانی یان لێوی حەسەنی کوڕی عەلی دەلێسایەوەو زمانو زمان یان لێوێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لێسابێتیەوە هەرگیز سزا نادرێت[2][3].

تەبەرانی لە سائیبی کوڕی زەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حەسەنی(رضي الله عنه) ماچکردو ئەقرەعی کوڕی حابس(رضي الله عنه) پێی وت: من دە منداڵم هەیەو هیچکامیانم ماچ نەکردوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی)(لایرحم الله من لایرحم الناس) (خوا ڕەحم بە کەسیّ ناکات کە ڕەحمی بۆ خەڵك نەبێت[4].

بوخاری ج٢ ص٨٨٧ لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی بەزار لە ئەسوەدی کوڕی خەلەفەوە لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی کە حەسەنی ماچکرد و دواتر ڕووی کردە ئەوانو فەرمووی(ان الولد مبخلة مجهلة مجبنة) واتە(منداڵ بەخیلکەرو بێئاگاکەرو ترسنۆککەرە)[5][6].

بوخاری لە الادب المفرد ص٥٦ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەرامبەر بە ماڵو منداڵ بەسۆزترین بوو، لەلایەکی مەدینەوە کوڕێکی شیرەخۆرەی هەبوو، دەچووین بۆ لای ماڵەکەی دووکەڵاوی کردبوو، ماچی دەکردو بۆنی دەکرد[7][1].

---

[1]- هەیسەمی ج٩ ص١٧٩ دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتیو کەسەکانی جیّ متمانەنو ڕاجیاوازی لەسەر هەندێکیان هەیەو بەزارو ئیبن ماجەش بە کورتی هێناویانە تەواو.

[2] – صحيح.

[3]– هەیسەمی ج٩ ص١٧٧ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوعەوف کە جیّ متمانەشە، تەواو.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص١٥٦ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جیّ متمانەن، تەواو.

[5] – صحيح.

[6] – کەسەکانی سەنەدەکە جیّ متمانەن وەك هەیسەمی لە ج٨ ص١٥٥ دا دەیڵێت.

[7] – ضعيف.

بەزار لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: ئافرەتێك هات بۆ لای عائیشە(رضي الله عنها) و دوو كچی لەگەڵدا بوو، عائیشە سێ خورمای پێ دا، ئەویش بۆ هەریەكەیان و خورمایەكی پێدا، خورمایەكیشی گرت تا بیخوات، دوو منداڵەكە سەیریان كرد، ئەویشی كرد بە دوو بەشەوەو دای بە هەردووكیان و چوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتەوەو عائیشە وتی چی كردووە – ئافرەتەكە – پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فورمووی(بە ڕاستی بەوە چووە بەهەشت).[2]

تەبەرانی لە حەسەنی كوڕی عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و دوو كچی لەگەڵدابوو، داوای لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كردو ئەویش سێ خورمای پێدا بۆ هەركامیان و خورمایەك، ئەویش یەكی دانەیەكی پێدان و خواردیان، دواتر سەیری دایكیان كرد، دایكیان خورماكەی خۆی لەت كردو دای بە هەردووكیان، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(قد رحمها برحمتها ابنيها)[3].[4](بە سۆزی بۆ دوو كورەكەی رەحمی پێكرد).

بوخاری لە الادب المفرد ص٥٦ لە ئەبی هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: كەسێك لەگەڵ منداڵێكیدا هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و منداڵەكەی بەخۆیدا دەگوشی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اترحمه؟) واتە (سۆزت بۆی هەیە؟)وتی: بەڵێ، فەرمووی(فالله ارحم بك منك به و هو ارحم الراحمين) واتە(دەی خوا لە تۆ زیاتر سۆزی بۆت هەیەو میهرەبانترینی میهرەبانانە).[5]

---

[1] – ئیبن سەعد ج١ ص٨٧ لە ئەنەسەوە بەو واتایە هێناویەتی.

[2]– هەیسەمی ج٨ ص١٥٨ دەڵێت: لە سەنەدەكەدا عوبەیدوڵڵای كوڕی فوزالە هەیە كە نایناسم و كەسەكانی دیكەی سەنەدەكە صەحیحن، تەواو.

[3] – ضعيف.

[4]– هەیسەمی ج٨ ص١٥٨ دەڵێت: لە سەنەدەكەدا خودەیجی كوڕی موعاویەی جەعفی هەیە كە لاوازە.

[5] – صحيح.

بەزار لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: کەسێك لەلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو کوڕێکی هات و ئەویش ماچی کردو لەسەر ڕانی داینا و کچێکیشی هات و لەبەردەمیدا داینا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(الا سویت بینهم؟) واتە(بۆچی یەکسانیت نەکرد لە نێوانیاندا؟)[1] [2].

## (ڕێزگرتنی دراوسێ)

تەبەرانی لە موعاویەی کوڕی حیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) وت: ئەی پێغەمبەری خوا ماف دراوسێکەم چیە؟ فەرمووی(ان مرض عدته و ان مات شیعته و ان ستقرضل اقرضته و ان اعوز سترته وان اصابه خیرا هنأته وان اصابته مصیبة عزیته ولاترفع بناءك فوق بنائه فتسد علیه الریح ولاتؤذه بریح قدرك الا ان تغرف له منها) واتە(ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکەیت، ئەگەر مرد لەگەڵ تەرمی بچیت، ئەگەر داوای قەرزی کرد بیدەیتێ، ئەگەر هەژار کەوت دایپۆشیت، ئەگەر تووشی خێرێك بوو پیرۆزبایی لێبکەیت، ئەگەر تووشی موصیبەتێك بوو سەرەخۆشی لێبکەیت، بیناکەت بەسەر بیناکەیدا بەرزمەکەرەوە تا ئەوەی هەوای لێبگریت، بە بۆنی چەوری وبەز ناڕەحەتی مەکە مەگەر ئەوەی لێی بنێریت بۆی)[3] [4].

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص١٥٦ دەڵێت: بەزار هێناویەتی و دەڵێت: یەکێ لە هاوەڵانمان بۆی گێڕاینەوەو ناوی نەهێناوەو کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص١٦٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئەبوبەکر هوزەیلی هەیە کە لاوازە، بەیهەقی لە شعب الایمان لە موعاویەوە بەو جۆرە هێناویەتی بەڵام تیایدا هاتووە(وان عری سترته) واتە(ئەگەر بێبەرگ کەوت دایپۆشیت) لە کنز العمال ج٥ ص٤٤ دا واهاتووە.

ئەبونەعیم لە المعرفە لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە هێناویەتی هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: دراوسێکەم ئازارم دەدات، فەرمووی(خۆڕاگربە) پاشان جاری دووەم وابوو، بۆ جاری سێ یەم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اعمد الى امتعتك فاقذفه في السلة فاذا اتى عليك ات فقل اذاني جاري، فتحقق عليه اللعنة، من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليكرم جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليكرم ضيفه، ومن كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليقل خيرا او يسكت) واتە(بڕۆ شتەکانت فڕێ بدە کۆڵان و هەرکەس هات بۆ لات بڵێ دراوسێکەم ئازاری داوم، بەوە نەفرینی تووش دەکەیت، هەرکەس بڕوای بە خواو بەڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی دراوسێکەی بگرێت، هەرکەس بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی میوانی بگرێت، هەرکەس بڕوای بە خواو بەڕۆژی دوایی هەیە با خێربڵێت یان بێدەنگ بێت).[1]

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە غەزایەکدا دەرچوو و فەرمووی(ئەمڕۆ هەر کەس ئازاری دراوسێکەی داوە لەگەڵمان نەیەت) یەکێ لە خەڵکەکە وتی: من میزم کردە بنەڕەتی دیواری دراوسێکەمان، فەرمووی(ئەمڕۆ لەگەڵمان مەیە)[2].[3]

ئەحمەدو تەبەرانی لە میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵانی فەرموو(لە بارەی زیناوە چی دەڵێن؟) وتیان: حەرامێکە خواو پێغەمبەرەکەی تا ڕۆژ دوایی حەرامیان کردووە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەگەر کەسێك لەگەڵ ئافرەتێك زینا بکات لەسەری سوکترە لەوەی لەگەڵ

---

[1] - لە کنز العمال ج٥ ص٤٤ دا واهاتووە.

[2] - ضعیف.

[3]- هەیسەمی ج٨ ص١٧٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەحیای کوڕی عەبدولحەمیدی حەمانی هەیە کە لاوازە.

ئافرەتە دراوسێکەیدا زینا بکات) فەرمووی(سەبارەت بە دزی چی دەڵێن؟) وتیان حەرامێکە خواو پێغەمبەرەکەی بە حەرامیان داناوە، فەرمووی(ئەگەر کەسێك دزی بکات لەسەری سوکترە لەوەی دزی لە دراوسێکەی بکات).[1]

ئەحمەدو تەبەرانی – دەقەکە هی ئەمە – لە میترەفی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویانە دەڵێت:لە ئەبوزەر فەرموودەیەکم دەبیستو حەزم دەکرد بیبینم، وتم: ئەی ئەبوزەر فەرموودەیەکی تۆم بیستو حەزم کرد بتبینم، وتی: خوا ئاگای لە باوکت بێ، پێمگەیشت فەرموودەیەکم وت کە بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموویت، وتی: خوای گەورە سێ کەسی خۆشدەوێتو ڕقی لە سیانە، دەڵێت: من وامنەدەزانی درۆم بەدەم پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) بکەم وتم: ئەو سانە کێن؟ کە خوا خۆشی دەوێن؟ وتی: کەسێك بە خۆگریو چاوەڕێی پاداشتەوە لە ڕێی خوادا بجەنگێت تا دەکوژرێت، ئێوە لە قورئاندا دەبینن کە دەفەرموێت(ان الله يحب الذين يقاتلون في سبيله صفا كانهم بنيان مرصوص) وتم: کێی تر؟ وتی: کەسێ دراوسێیەکی خراپی هەبێتو ئازاری بدات و ئەویش خۆڕاگربێت خوای گەورە بە ژیان یان مەرگ دەستگرۆی دەبێت، فەرموودەکە تەواو دەکات.[2]

ئیبن موبارەكو ئەبوعوبەیدەو خەرائیتی و عەبدولڕەزاق لە عەبدولڕەحمانی کوڕی قاسم لە باوکیەوە هێناویانە ئەبوبەکر دای بە لای عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکردا کە دەمەقاڵەی بوو لەگەڵ دراوسێیەکیدا، وتی: لەگەڵ دراوسێکەت دەمەقاڵە مەکە، چونکە دەمبینیو خەڵکی دەچن[3].[4]

---

[1]– هەیسەمی ج٨ ص ١٦٧ دەڵێت: ئەحمەدو تەبەرانی هێناویانەو کەسەکانی سەنەدەکەی تەبەرانی جێ متمانەن.

[2]– هەیسەمی ج٨ ص١٧١ دەڵێت: سەنەدەکەی تەبەرانی و یەکێ لە دوو سەنەدی ئەحمەد کەسەکانی صەحیحن، نەسائیو جگە لەویش بەبێ باسی دراوسێ هێناویانە.

[3] – صحيح.

[4] – لە كنز العمال ج٥ ص٤٤ دا واهاتووە.

## (ڕێزگرتنی هاوڕێی چاك)

تەبەرانی لە رباحی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) غەزامان کردو بۆ هەرسێ کەس و وشترێکی پێدابن، دوان سواردەبووین و یەکێ لە بیاباندا دەیبردو لە شاخدا دادەبەزین، پێغەمبەر(ﷺ) دای بە لامداو من پیادەبووم، پێی فەرمووم(ئەی رباح دەتبینم پیادەیت!) وتم: ئێستا دابەزیم و ئەو دوو هاوەڵەم سواربوون، دای بە لای دوو هاوەڵەکەمدا وشترەکەیان وەستاندو دابەزین، کە گەیشتمە لایان وتیان: سواری ئەو وشترە ببە، بەردەوام لەسەری دەبیت تا دەگەڕێینەوە، وتم: بۆچی؟ وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ان لكما رفيقا صالحا فاحسنا صحبته) واتە(هاوڕێیەکی باشتان هەیە هاوەڵێتی باشی بکەن)[1].[2]

## (هەرکەس و بەپێی خۆی بدوێنە)

خەتیب لە المتفق لە عەمری کوڕی مخراقەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێکی بە شان و شکۆ دای بە لای عائیشەداو ئەویش نانی دەخوارد کابرای بانگکردو لەگەڵیدا دانیشت و یەکێکی تر هات و پارچەنانێکی پێدا، پێی وترا: بۆچی واتکرد، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردین هەر کەسەو بەپێی خۆی لەگەڵی بجوڵێینەوە.[3] ئەبوداود و ئیبن خوزەیمە لەصەحیحەکەیدا و بەزارو ئەبویەعلاو ئەبونەعیم لە المستخرج و بەیهەقی لە الادب و عەسکەری لە الامثال لەڕێگەی مەیمونی کوڕی ئەبوشەعبیەوە هێناویانە دەڵێت: کەسێك هات داوای شتی لە عائیشە کرد ئەویش پارچە نانێکی پێدا، کەسێکی بەشان و شکۆش هات عائیشە لەگەڵ خۆی دینیشاند، وترا: بۆچی وات کرد؟ وتی: فەرمانی پێکردین......

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە كنز العمال ج٥ ص٤٢ دا واهاتووە.

[3] – لە كنز العمال ج٢ ص١٤٢ دا واهاتووە.

دەقەکەی ئەبونەعیم لە الحلیە ج٤ ص٣٧٩ دا وایە: عائیشە لە سەفەرێکدا بوو، خەڵکی قورەیشی فەرمان پێکرد بۆ نانی بەیانی، کەسێکی دەوڵەمەندو بە شان و شکۆ هات عائیشە وتی: بانگی بکەن، کابرا دابەزیو نانی خواردو چوو، کەسێکی سوڵکەر هات عائیشە وتی: پارچە نانێکی بدەنێ، وتی: ئەو دەوڵەمەندە تەنها بەوەی لەگەڵمان کرد هیچی تری بەست نەبوو، ئەو هەژارەش داوای کرد منیش هێندەم پێدا کە ڕازی کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی وای پێکردین، حاکم لە معرفە علوم الحدیث و جگە لەوەشدا بە صەحیحی زانیوە. سەخاوی دەڵێت: بە گشتی فەرموودەکەی عائیشە حەسەنە، لە شرح الاحیائی زوبەیدیدا(ج٦ ص٢٦٥) واهاتووە، پێشتریش هێنامان عەلی(رضي الله عنه) کڵاوێك و سەد دیناری دا بە کەسێك، پێی وترا: بۆچی؟ وتی: لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(انزلوا الناس منازلهم) ئەوەش پلەو پایەی ئەوکەسەیە لەلای من.[1]

## (سەلامکردن لە موسڵمانان)

تەبەرانی لە المعجم الکبیر والمعجم الوسیط دا: یەکێ لە سەنەدەکانی المعجم الکبری کەسەکانی لە بواری فەرموودەی صەحیحدا پشتیان پێ دەبەسترێت لە ئەغەرەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردم بەبارێ خورما لای کابرایەکی پشتیوانان، ئەویش بەڵێنی دواتری پێدام، منیش لە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قسەم لەلاکرد، فەرمووی(اغد یا ابابکر فخذ له تمرة) واتە(بڕۆ ئەی ئەبوبەکر خورماکەی بۆ وەرگرە) ئەبوبەکر بەڵێنی کاتی نوێژی بەیانی لە مزگەوتدا داناو منیش ئەو کات بینیم، چووین و کە ئەبوبەکر لە دوورەوە کەسێك دەیدی سەلامی لێدەکرد، ئەبوبەکر وتی: نابینی خەڵکی چ ڕێزێکت لێ دەنێن کە لە سەلامدا کەس پێشت

[1] – ضعیف.

ناکەوێت، کە کەسێك لە دوورەوە دەردەکەوت پێش ئەوەی سەلام بکات ئێمە سەلاممان دەکرد[1][2].

ئیبن ئەبی شەیبە لە زوهەیری کوڕی خومەیسەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئەبوبەکر بووم هەرکات دەماندا بەلای خەڵکێکدا سەلامامان لێ دەکردن و ئەوانیش بە زیاتر وەڵامیان دەدایەوە، ئەبوبەکر وتی: تا ئەمڕۆیش خەڵك لەلامان زاڵترن، لە دەقێکی تردا خەڵکی ئەمڕۆ بە خێرێکی زۆر فەزڵیان بەسەرماندا هەبوو.

بوخاری لە الادب المفرد لە عومەرەوە هێناویەتی من لە دوای ئەبوبەکرەوە بووم کە دەیدا بە لای دەستەیەکدا دەیوت: السلام علیکم، ئەوانیش دەیانوت: السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتهن ئەبوبەکر وتی: ئەمڕۆ خەڵکی بەشێوەیەکی زۆر زیاد فەزڵیان لێمان زیاتر بوو[3][4].

ئیبن عەساکیر لە ئەبی ئومامەوە هێناویەتی کە ئامۆژگاری دەکردو دەیوت: لەوەی حەزتان پێیە یان ڕقتان لێیە خۆڕاگربن، چونکە خۆڕاگری سیفەتێکی زۆر باشە، دونیا سەرسامی کردوون و دڵی ڕاکێشاون و بەرگ و جوانی خۆی پۆشیوە، هاوەڵانی موحەممەد لە کەنارماڵیاندا دادەنیشتن و دەیانوت دادەنیشین و سەلام دەکەین و سەلامامان لێدەکرێت[5][6].

[1] – حسن.

[2] – لە النرغیب والترهیب ج٤ ص٢٠٦ دا واهاتووە، بوخاریش لە الادب المفرد ص١٤٥ داو ئیبن جەریرو ئەبونەعیم و خەرائیتی هێناویانە، لە کنز العمال ج٥ ص٥٢ دا هاتووە.

[3] – صحیح.

[4] – کنز العمال ج٥ ص٥٢-٥٣.

[5] – صحیح.

[6] – لە کنز العمال ج٢ ص١٥٦ دا واهاتووە.

تەبەرانی بە سەنەدی حەسەن لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم)بووینایە درەختێك بکەوتایەتە نێوانمان و یەکترمان بدیایەتەوە سەلاممان لە یەکدی دەکرد.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣١٠ لە توفەیلی کوڕی ئوبەی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی دەچوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو لەگەڵی دەچوو بۆ بازاڕ، وتی: کە دەچووین بۆ بازاڕ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بیدایە بەلای هەردووکاندارو خاوەن کاڵاو هەژارو کەسێکدا سەلامی لێدەکرد، وتم: تۆ لەبازاڕ چی دەکەیت لە کاتێکدا لەسەر هیچ شتێ ناوەستیو نرخی کاڵا ناپرسیو لە کۆڕدا دانانیشیت؟ وتی: دەڵێم لێرەدا قسە دەکەین، عەبدوڵڵا وتی: ئەی ورگن – توفەیل ورگی هەبوو – ئێمە لەبەر سەلام دەردەچین و سەلام لە هەرکەس بکە کە پێی دەگەیت. مالیك لە توفەیلی کوڕی ئوبەی کوڕی کەعبەوە بەو جۆرە هێناویەتی. لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا وتی: لەبەر سەلام دەردەچین، سەلام دەکەین لە هەرکەس کە پێمان دەگات[2].[3]

تەبەرانی لە ئەبوئومامەی باهیلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کە بە هەر کەس بگەیشتایە سەلامی لێدەکرد، دەڵێ نەمبینیبوو کەس پێش ئەو سەلام بکات یەکجار جوولەکەیەك نەبێت کە لە پشت دیوارێکەوە خۆی حەشاردابوو هاتەدەرەوەو سەلامی کرد، ئەبوئومامە پێی وت: قوڕبەسەر جولەکە بۆ واتکرد؟ پێی وت: بینیم زۆر سەلامت دەکرد زانیم گەورەییە ویستم بیبەم، ئەبوئومامە پێی وت: هاوار بۆت

[1]– لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٢٠٧ دا هاتووە. بوخاری لە الادب المفرد ص١٤٨ بەو شێوە هێناویەتی.
[2] – صحیح.
[3]– لە جمع الفوائد ج٢ ص١٤١ دا هاتووە، بوخاری لە الادب المفرد ص٤٨ لە توفەیلی کوڕی ئوبەیەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

من گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو خوا سەلامی کردووە بە ڕێزگرتنی ئوممەتمان و پەناو پاراستن بۆ ئەهلی زیممەمان[1][2].

ئەبونەعیم لە الحلیە ج٦ ص١١٢ لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە هێناویەتی دەڵێت: من دەستی ئەبوئومامەم گرتبوو کە دەچوویەوە بۆماڵەوە، دەیدا بە لای هەر موسڵمان و نەسرانیو گەورەو بچوکێکدا سەلامی لێدەکرد، کە گەیشتنە بەردەگا سەیری کردینو وتی: برازاگیان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردین لەنێو خۆماندا سەلام بڵاوبکەینەوە.

بوخاری لە الادب المفرد ص١٤٥ لە بەشیری کوڕی یەسارەوە هێناویەتی دەڵێت: کەس نەبوو پێش ئیبن عومەر بکەوێت لە سەلامدا.

## (وەڵامدانەوەی سەلام)

تەبەرانی لە سەلمانەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و وتی: سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(وعلیك السلام و رحمة الله وبرکاتە) کەسێکی تر هات و وتی: سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا ڕەحمەتی خوات لێ بێت، فەرمووی(وعلیك السلام ورحمة الله وبرکاتە)، کەسێکی تر هاتو وتی: سەلامو ڕەحمەتو بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(وعلیك) کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فلانو فلان هاتن و چاکتر لە من وەڵامت دانەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(تۆ هیچت نەهێشتەوە) خوا دەفەرموێت(واذا حییتم بتحیة فحیوا باحسن منها او ردوها)

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٣٣ دەڵێت: تەبەرانی لە مامۆستاکەیەوە بەکری کوڕی سەهلی دمیاتیەوە هێناویەتی نەسائی بە لاوازی دەزانێ.

(ئەگەر سەلامێکتان لێکرا بە چاکتر یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە)منیش وەڵامم دایتەوە[1] .[2]

تەبەرانی لە عائیشەوە(ﷺ) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(ئەی عائیشە ئەوە جبریلە سەلامت لێ دەکات) منیش وتم: علیك السلام ورحمة الله وبركاته، زیاتری دەوت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(الی هذا انتهی السلام فقال رحمة الله وبركاته اهل البیت) واتە(لێرەدا سەلام تەواو بوو فەرمووی ورحمة الله وبركاته وبركاته اهل البیت).[3]

ئەحمەد لە سابتی بەنانی لە ئەنەسەوە یان جگە لەوەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی سەعدی کوڕی عوبادەی وەرگرت و فەرمووی(السلام علیكم ورحمة الله) سەعد وتی: وعلیك السلام ورحمة الله، پێغەمبەر(ﷺ) نەیبیست تا سێ جار سەلامی کردو سەعدیش سێ جار وەڵامی دایەوەو پێغەمبەر(ﷺ) نەیبیست، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوەو سەعد کەوتە شوێنی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم چی سەلامت کرد بیستم و وەڵامم دایتەوەو نەمهێشت بیبیستیت، حەزمنەدەکرد زیاتر سەلام بکەیت، پاشان بردیە ژوورەوەو زەیتی هێناو پێغەمبەر(ﷺ) خواردی، کە لێبوویەوە فەرمووی(چاکەکاران نانتان بخۆن و مەلائیکەکان صەلەواتتان لەسەربدەن و ڕۆژووەوانان ڕۆژووتان لابکەنەوە)[4] .[5]

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٣٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا هیشامی کوڕی لاحق هەیە کە نەسائی بە بەهێزی دەزانێ و ئەحمەد فەرموودەی وەرناگرێ و کەسەکانی دیکەی صەحیحن، تەواو.

[3] – هەیسەمی ج٨ ص٣٣ دەڵێت: تەبەرانی بە سەنەدی صەحیح بە کورتی هێناویەتی، تەواو.

[4] – صحیح.

[5] – ئەبوداود هەندێکی هێناوە.

بەزار لە ئەنەسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی پشتیوانانی دەکرد کە دەهات بۆ کۆڕیان پشتیوانان لە دەوری بوون نزای بۆ دەکردن و دەستی دەهێنا بەسەریانداو سەلامی لێدەکردن، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە بەردەگای ماڵی سەعدو فەرمووی(السلام علیکم ورحمة الله) سەعد بە سوکی وەڵامی دایەوەو پێغەمبەر(ﷺ) نەیبیست، سیٚ جار ئەوە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لە سیٚ جار زیاترسەلامی نەدەکرد، ئەگەر مۆڵەتی پێبدرایە باشە ئەگەرنا دەچوو، بەهەمان شێوەی پێشوو دەیهێنێت[1][2].

ئەبویەعلا لە موحەممەدی کوڕی جوبەیرەوە هێناویەتی عومەر دای بە لای عوسماندا و سەلامی لێکردو ئەویش وەڵامی نەدایەوە، چوو بۆ لای ئەبوبەکرو سکاڵای کرد، ئەبوبەکر وتی: بۆچی وەڵامی براکەتت نەدایەوە؟ وتی: بەخوا نەمبیست خۆمم دەدواند، ئەبوبەکر وتی: لەسەر چی خۆتت دواند؟ وتی: پێچەوانەی شەیتان، هەندیٚ شتی خستە دەروونمەوە کە حەزناکەم بیڵێم ئەگەرچی لەسەر زەویدا هەیە پێمبدرێت، لە دەروونی خۆمدا کە شەیتان ئەوەی دەخستە دڵم دەموت: بریا داوام لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد چی لەو قسانەی دەربازمان دەکات کە شەیتان دەیانخاتە دڵمانەوە، ئەبوبەکر وتی: بەخوا من ئەو سکاڵام لای پێغەمبەر(ﷺ) کرد، فەرمووی(ینجیكم من ذالك ان تقول مثل الذي امرت به عمي عند الموت فلم يفعل) واتە(ئەوەی فەرمانم کرد بە مامم لەسەرەمەرگ و نەیکرد) وتنی ئەوە لەوە ڕزگارتان دەکات[3][4].

---

[1] – صحیح.

[2] – سەنەدەکان صەحیحن وەك هەیسەمی ج٨ ص٣٤ دەڵێت.

[3] – صحیح.

[4] – لە کنز العمال ج١ ص٧٤ داهاتووەو دەڵێت: بوصیری دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە.

ئیبن سەعد ج٢ ص٣١٢ لە عوسمانەوە بە دوورو درێژتر هێناویەتی، عومەر(رضي الله عنه) چوو تا چوو بۆ لای ئەبوبەکرو وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەرت سوڕنامێنێ دام بە لای عوسماندا و سەلامم لێکردو وەڵامی نەدامەوە؟ ئەبوبەکر هەستاو دەستی عومەری گرت‌و هەردوو هاتن تا هاتن بۆ لام، ئەبوبەکر پێی وتم: عوسمان براکەت هاتووە بۆ لام و دەڵێ وەڵامی سەلامت نەداوەتەوە، بۆچی؟ وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەیکردووە، عومەر وتی: بەرێ بەخوا، بەڵام خۆبەزلزانینتانە ئەی بەنی ئومەییە، وتم: بەخوا هەستم نەکرد تۆ داوتە بەلامداو سەلامت لێ کردووم، ئەبوبەکر وتی: ڕاست دەکەیت، بەخوا وای دەبینم سەرقاڵ بویت‌و خۆتت دواندووە، وتم: بەڵێ، وتی: چی بوو؟ وتم: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مردو پرسیاری ڕزگاری ئەم ئوممەتەم لێ نەکرد لە دەست ئەوەی لە دەروونمدا هەیەو سەرم سوڕدەمێنێ لە کەمتەرخەمیم لەوبارەیەوە، ئەبوبەکر وتی: پرسیارم لێکرد ئەویش وتم: عوسمان وتی: چی بوو؟ ئەبوبەکر وتی: پرسیارم لێکرد ئەی پێغەمبەری خوا ڕزگاری ئەم ئوممەتە چیە؟ فەرمووی(من قبل مني الكلمة التي عرضتها على عمي فردها علي فهي له نجاة) واتە(هەرکەس ئەو وشەم لێ قبووڵ بکات کە بۆ مامم پێشنیارکرد و لێی وەرنەگرتم ڕزگاریە بۆی) ئەو وشەش خستیەڕوو بۆ مامی شایەتی(لااله الا الله محمد رسول الله) یە.[1]

ئەحمەد لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویەتی دەڵێت: لە مزگەوتدا دام بە لای عوسمانی کوڕی عەففاندا و سەلامم لێکرد و چاوەکانی تێرمنیان دەبینی کەچی وەڵامی نەدامەوە، چووم بۆ لای ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب و وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا لە ئیسلامدا دوو جار شتێ ڕوودەدات؟ وتی: چیە؟ وتم: هیچ بەڵام کەمێ لەمەوبەر لە مزگەوت دام بە لای عوسماندا و تێر سەیری کردم‌و وەڵامی سەلامی نەدامەوە، عومەر ناردی بەشوێن عوسماندا‌و بانگیکردو وتی: بۆچی وەڵامی سەلامی براکەتت نەدایەوە؟ عوسمان وتی: وام

[1] - ضعيف.

نەکردووەو دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا، تۆ کەمێ لەمەوبەر داوتە بەلامدا من خۆمم دەدواند لەسەر شتێ کە لە پێغەمبەرم(صلی الله علیه وسلم) بیستبوو، سوێند بەخوا هەرچی بیرم دەکەوێتەوە چاو و دڵم پەردەپۆش دەبن، سەعد وتی: من هەواڵیت پێ دەدەم، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) یەکەم نزای بۆ باس کردین، پاشان دەشتەکیەك هات و سەرقاڵی کردو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەستا و منیش کەوتمە شوێنی و ترسام پێشتر بگاتە ماڵ، پێم هەڵگرت و قاچم دابەزەویدا، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لایکردەوەو فەرمووی(ئەوە کێیە؟ ئەبوئیسحاق؟) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(فمە؟) وتم: نەبەخوا، بەڵام تۆ یەکەم نزات لا باسکردین دواتر ئەو دەشتەکیە هات و سەرقاڵی کردیت، فەرمووی(بەڵێ نزاکەی زنون کە لەناوسکی حوتەکەدا بوو(لااله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين) چونکە هەر موسڵمانێك بەوە لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە بۆ شتێ خوای گەورە لێی وەردەگرێت)[1].[2]

## (سەلام ناردن)

تەبەرانی لە ئەبولبوختەریەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەشعەسی کوڕی جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی هات بۆ لای سەلمانی فارسی و لە قەڵایەکی ناوچەی مەدائیندا بوو سەلامیان لێکرد، پاشان وتیان: تۆ سەلمانی فارسیت؟ وتی: بەڵێ، وتیان: تۆ هاوەڵی پێغەمبەریت(صلی الله علیه وسلم)؟ وتی: نازانم، ئەوانیش وتیان: لەوانەیە ئەوە نەبێت کە دەمانەوێت، ئەویش پێی وتن: من ئەوەم کە دەتانەوێت، من پێغەمبەرم(صلی الله علیه وسلم) بینیوەو لەگەڵی دانیشتووم، هاوەڵی ئەوەیە لەگەڵی دەچێتە

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٧ ص٦٨ دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کە جێ متمانەشە، ترمزیش بەشێکی کۆتای هێناوە، هەروەها ئەبویەعلاو تەبەرانی هێناویانەو بە صەحیحی لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویانە لە کنز العمال ج١ ص٢٩٨ یشدا هاتووە.

بەهەشت، ئیشتان چیە؟ وتیان: لەلای برایەکتەوە لە شامەوە هاتووین، وتی: کێیە؟ وتیان: ئەبودەردا، وتی: ئەو دیاریەی ناردی پیاتاندا کوا؟ وتیان: هیچ دیاری لەگەڵ نەناردین، وتی: لە خوابترسن و سپاردە بگەیەنن، هەرکەس لە لای ئەوەوە هاتووە بۆ لام دیاریەکی ئەوی پێ گەیاندووم، وتیان: شتی وا ینە، ئێمە سامانێکمان هەیە خۆت بڕیاری لەسەر بدە، وتی: سامانی ئێوەم ناوێت ئەو دیاریەی ئەوم دەوێت، وتیان: بەخوا هیچی نەنارد تەنها پێی وتین کەسێکتان لایە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی بوایە جگە لەوی لەبیرنەبوو، ئەگەر ئەوتان بینی سەلامی منی پێبگەیەنن، وتی: دەی جگە لەوە چ دیاریەکم لێتان دەوێت، لە سەلام جوانتر چیە سەلامێ لای خواوە بە بەرەکەت و پاك[١][٢].

## (تەوقەو دەست لە ملکردن)

تەبەرانی لە جوندوبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەگەیشت بە هاوەڵانی تەوقەی لەگەڵ نەدەکردن تا سەلامی لێدەکردن.[٣]

ئەحمەدو رەویانی لە ئەبوزەرەوە هێناویانە کە پێی وترا: دەمەوێت پرسیارت لێ بکەم لەسەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش وتی: پێت دەڵێم، بەڵام با نهێنی بێت. پێغەمبەر(ﷺ) کە پێی دەگەیشتین تەوقەی دەکرد، وتی: هەرچی پێی دەگەیشتم تەوقەی لەگەڵ دەکردم[٤][١].

[١] - صحيح.

[٢]- هەیسەمی ج٨ ص٤٠ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە یەحیای کوری ئیبراهیمی مەسعودی کە جێ متمانەشە، تەواو. ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٠١ لە ئەلبوختەریەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[٣] - هەیسەمی ج٨ ص٣٦ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو کەسی وای تێدایە کە نایناسم.

[٤] - ضعيف.

بەزار لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گەیشت بە حوزەیفە(رضي الله عنه) و ویستی تەوقەی لەگەڵ بکات، حوزەیفە دوورکەوتەوەو وتی: من لەشگرانم فەرمووی(ان المسلم اذا صافح اخاه تحاتت خطایاهما کما یتحات ورق الشجرة) واتە(موسڵمان کە لەگەڵ براکەی تەوقەی کرد تاوانەکانیان دەکەون وەك چۆن گەڵای درەخت دەکەوێت)[٢].[٣]

دارقوتنی و ئیبن ئەبی شەیبە لە ئەنەسەوە هێناویانە کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسمان هەیە دەگات بە براکەی یان هاوڕێکەی سەری بۆ دانەوێنێ؟ فەرمووی(نا)، وتی: ئەی باوەشی پیابکات و ماچی بکات؟ فەرمووی(نا)، وتی: ئەی تەوقەی لەگەڵ بکات؟ فەرمووی(بەڵێ) ئەنەس هێناویەتی کەسێك پرسی ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك لە ئێمە دەگات بە براکەی یان هاوڕێکەی، ئایا بەرامبەر ئەو بچەمێتەوە؟ فەرمووی نا، کابرا وتی ئەی بیگرێتەخۆو ماچی بکات؟ فەرمووی نا، کابرا وتی ئەی دەستی بگرێت و هەواڵی بپرسێت؟ فەرمووی(بەڵێ).ترمزی دەڵێت: ئەم فەرموودە حەسەنە، رزین دوای باسی ماچکردنی ئەوەی هێناوە(نا مەگەر لە سەفەرێك بێتەوە)[٤].[٥]

ترمزی ج٢ ص٩٧ لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: زەیدی کوڕی حارسە(رضي الله عنه) هاتە مەدینەو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ماڵی من بوو، تەقەی دا لە

---

[١] – لە کنز العمال ج٥ ص٥٤ دا واهاتووە.

[٢] – ضعیف.

[٣] – هەیسەمی ج٨ ص٣٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موصعەبی کوڕی سابن هەیە کە ئیبن حیببان بەجێ متمانەو زۆرینە بە لاوازی دەزانن.

[٤] – ضعیف.

[٥] – لە جمع الفوائد ج٢ ص١٤٢ دا هاتووە.

دەرگا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا و جلەکەی ڕادەکێشا و سوێند بەخوا نەپێشترو نەدواتر بەو کەمجیلیەوە نەمدیبوو دەستی کردە ملی و ماچیکرد[1].[2]

تەبەرانی لە ئەنەسەوە هێناویەتی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە بەیەك دەگەیشتن تەوقەیان دەکرد، کە لەسەفەر دەهاتنەوە دەستیاندەکردە ملی یەکدی[3].[4]

محاملی لە حەسەنەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) باسی یەکێ لە براکانی لە شەودا دەکرد دەیوت: ئای لە درێژی شەو ئەگەر نوێژە فەرزەکانی دەکرد خۆی کۆدەکردەوەو کەپێی دەگەیشت دەستی دەکردە ملی و باوەشیان دەکرد بەیەکدا،[5]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ص١٠١ لە عروەوە هێناویەتی دەڵێت: کە عومەر هاتە شام خەڵکی و گەورەکان چوون بەدەمیەوە، عومەر وتی: براکەم کوا؟ وتیان: کێ؟ وتی: ئەبوعوبەیدە، وتیان: ئێستا دێت، کە هات دابەزی و باوەشی پیاکرد، فەرموودەکە دێنێت وەك دواتر دەیهێنین.[6]

# (ماچکردنی دەست و پێ و سەری موسڵمانان)

ئیبن سەعد ج٤ ص٣٤ لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە خەیبەر گەڕایەوە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبی پێ گەیشت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گرتیەخۆی و نێوچەوانی ماچکردو فەرمووی(نازانم بەکامیان دڵخۆش بم، بە هاتنی جەعفەر یان فەتحی خەیبەر) لە گێڕانەوەیەکی تردا کۆشی پیاکردو دەستی کردە ملی.[7]

[1] – ضعیف.
[2] – ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی غەریبە.
[3] – حسن.
[4] – هەیسەمی ج٨ ص٣٦ دەڵێت: تەبەرانی بە سەنەدی صحیح هێناویەتی، تەواو.
[5] – لە کنز العمال ج٥ ص٤٢ دا هاتووە.
[6] – منقطع.
[7] – ضعیف.

تەبەرانی لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە هێناویەتی دەڵێت: بەم دەستانەم بەیعەتم دا بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و ماچمکردو هیچی نەوت.[1]

لە جمع الفوائد ج٢ ص١٤٣ لە عومەرەوە هێناویەتی دەستی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) ماچکردووە.[2]

تەبەرانی لە کەعبی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی کاتێك بیانوەکەی وەرگێڕا چوو دەستی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) ماچکرد[3،4].

بوخاری لە الادب المفرد ص١٤٤ لە ئوم ئبانی کچی وازع لە باپیریەوە هێناویەتی وازعی کوڕی عامری باپیری وتی: چووین و وترا: ئەوە پێغەمبەری خوایە، ئێمەش دەستو قاچمان ماچکرد، لە ص٨٦ لە مزیدەی عەبدیەوە دەڵێت: ئەشجەعی دەچوو تا دەستی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) گرتو ماچی کرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اما ان فيك لخلتين يحبهما الله ورسوله) واتە(دوو سیفەتت هەن خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێن) وتی: خوویەکە لەسەری ڕاهاتووم یان ئاکارێکە لەگەڵم؟ فەرمووی(لا، بل جبلا جبلت عليه)(شتێکە لەسەری فێرم) وتی: سوپاس بۆ خوا کە لەسەر ئەوە ڕایهێناوم.[5]

ئیبن عەساکیر لە ئەبورەجائی عەتاردیەوە هێناویەتی دەڵێت: چوومە مەدینەو خەڵکی لەوێ کۆببوونەوەو لەنێوەندیاندا کەسێك هەبوو سەری کەسێکی ماچکردو

---

[1]- هەیسەمی ج٨ ص٤٢ دەڵێت: کەسەکانی جێ متمانەن. ئەبویەعلا لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەستی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) ماچکردووە. هەیسەمی ج٨ ص٤٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەزیدی کوڕی ئەبوزیاد هەیە کە نەرمی نوێنە لە فەرموودەدا، کەسەکانی دیکەی صەحیحن.

[2] – ئەبوداود لە ئیبن عومەرەوە بە سەنەدی حەسەن هێناویەتی وەك عێراقی ج٢ ص١٨١ دەڵێت.

[3] – ضعيف.

[4]- هەیسەمی ج٨ ص٤٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەحیای کوڕی عەبدولحەمیدی حەمانی هەیە کە لاوازە. ئەبوبەکری کوڕی مقری بە سەنەدی لاواز هێناویەتی، عێراقی ج٢ ص١٨١ دەیڵێت.

[5] – صحيح.

دەیوت: من فیدات بم ئەگەر تۆ نەبوویتایە لەناودەچووین، وتم: ماچکەرو ماچکراوەکە کێن؟ وتی: ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە ئەبوبەکر ماچ دەکات لەسەر شەڕی هەڵگەڕاوەکان کە زەکاتیان نەدەدا.[1]

عەبدولڕەزاق و خەرائیتی لە مکارم الاخلاق و بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە تەمیمی کوڕی سەلەمەوە هێناویانە دەڵێت: کە عومەر(رضي الله عنه) هاتە شام ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح چوو بەدەمیەوەو تەوقەی لەگەڵ کرد و دەستی ماچکرد، دواتر دەگریان تەمیم دەیوت: ماچکردنی دەست سوننەتە.[2]

تەبەرانی لە یەحیای کوڕی حارسی زماریەوە هێناویەتی دەڵێت: گەیشتم بە واسلەی کوڕی ئوسقوع و وتم: بەم دەستەت بەیعەتت دا بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)؟ وتی: بەڵێ، وتم: دەستتم بدەرێ تا ماچی بکەم، دەستی دامێ و ماچم کرد[3].[4]

ئەبونەعیم لە الحلیه ج٩ ص٣٠٦ لە یونسی کوڕی مەیسەرەوە دەڵێت: چووین بۆ لای یەزیدی کوڕی ئەسوەد، واسلەی کوڕی ئەسقەع هات بۆ لای، کە سەیری کرد دەستی بۆ درێژکرد و ئەویش هێنای بە دەموچاو و سنگیدا چونکە بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئەی زەید گومانت بەرامبەر پەروەدگارت چۆنە؟ وتی: باشە، وتی: دەی موژدەبێت لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(ان الله تعالى يقول انا عند ظن عبدي بي، ان خيرا فخير و ان شرا فشر) واتە(خوای گەورە دەفەرموێت

---

[1] – لە المنتخب ج٤ ص٣٥٠ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٥ ص٥٤ دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص٤٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدولمەلیکی قاری هەیە کە نایناسم و کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن، تەواو.

من لەگەڵ گومانی بەندەکەمم بۆم، ئەگەر باش بێت باشەو ئەگەر خراپ بێت خراپە).[1]

بوخاری لە الادب المفرد ص١٤٤ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی رزینەوە هێناویەتی دەڵێت: بەرەبزەدا تێپەڕبووین‌و پێمان وترا: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع(ﷺ) لێرەیە، چووین بۆ لای‌و سەلامان لێکردو ئەویش دەستەکانی دەرهێناو وتی: بەم دەستانەم بەیعەتمدا بە پێغەمبەر(ﷺ)، دەستێکی دەرهێنا کە گەورە بوو وەك هی وشتر وابوو، هەستاین و ماچمانکرد[2][3].

بوخاری لە الادب المفرد ص١٤٤ لە ئیبن جودعانەوە هێناویەتی سابت بە ئەنەسی وت: ئەو دەستەت بەر پێغەمبەر(ﷺ) کەوتووە؟ وتی: بەڵێ، ئەویش ماچیکرد.

بوخاری لە ص١٤٤ لە صوهەیبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلیم(ﷺ) بینی دەست‌و قاچەکانی عەبباسی ماچدەکرد.

## (هەستان لەبەری موسڵمانان)

بوخاری لە الادب المفرد ص١٣٨ لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کەسم نەدەدی لە قسەکردن‌و دانیشتندا هێندەی فاتیمە(رضي الله عنها) لە پێغەمبەر(ﷺ) بچێت، پێغەمبەر(ﷺ) کە دەیدی بەخێرهاتنی دەکردو دواتر هەڵدەستا ماچیدەکرد و دواتر دەستیدەگرت‌و دەیهێنا لە شوێنی خۆیدا دایدەنیشاند. کە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ لای فاتیمە خێرا فاتیمە بەخێرهاتنی دەکردو ماچیدەکرد، لە نەخۆشی پێغەمبەردا(ﷺ) کە تیایدا فاتیمە بەخێرهاتنی

---

[1] – صحیح.

[2] – صحیح.

[3] – ئیبن سەعد ج٤ ص٣٩ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی عێراقیەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

دەکردو ماچیدەکرد، کە فاتیمە هات پێغەمبەر(ﷺ) بەخێرهاتنی کردو ماچی کردو چپەیەکی بۆ کرد فاتیمە گریا چپەیەکی تری بۆ کرد فاتیمە پێکەنی، پرسیارم لە فاتیمە کرد چی پێ وتی؟ بۆ من قوەدەرم، کە پێغەمبەر(ﷺ) مرد وتی: چپەیەکی بۆ کردم کە دەمرێت منیش گریام، پاشان چپەیەکی بۆ کردم فەرمووی لەناو کەسوکارمدا تۆ یەکەم کەسیت پێم دەگەیتەوە، منیش بەوە دڵخۆش و سەرسام بووم.[١] بەزار لە موحەممەدی کوڕی هیلال لە باوکیەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەچوو بۆی هەڵدەساین تا دەچوویە ماڵی خۆی.[٢]

تەبەری لە ئەبوئومامەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر گاڵۆکەکەی وەستابوو و هاتە دەرێ بۆ لامان لە ڕوویدا هەستاین، فەرمووی(لاتقوموا كما يقوم الاعاجم يعظم بعضها بعضا) واتە(هەڵمەسن وەك عەجەمەکان هەڵدەستن و یەکدی گەورە ڕادەگرن).[٣،٤]

ئەحمەد لە عوبادەی کوڕی صامتەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و ئەبوبەکر وتی: هەستن تا هانا ببەینە لای پێغەمبەر(ﷺ) لەدەست ئەم دووڕووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لايقام، انما يقام لله تبارك وتعالى).[٥،٦]

بوخاری لە الادب المفرد ص١٣٦ لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: کەس نەبوو هێندەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستریان لاهەبێت، کە دەیانبینی هەڵنەدەسان

---

[١] – صحيح.

[٢] – هەیسەمی ج٨ ص٤٠ دەڵێت: لەوەیدا کۆمکردوەتەوە وامبینیوە.

[٣] – ضعيف.

[٤] – لە كنز العمال ج٥ ص٥٥ دا واهاتووە، ئەبوداود بەهەمان شێوە هێناویەتی، لە جمع الفوائد ج٢ ص١٤٣ دا واهاتووە.

[٥] – ضعيف.

[٦] – هەیسەمی ج٨ ص٤٠ دەڵێت: گێڕەرەوەیەکی تێدایە کە ناوی نەهاتووە، ئیبن لوهەیعەشی تێدایە.

چونكه دەیانزانی حەزی پێ ناكات، ترمزی بە صەحیحی دەزانێ و دەیهێنێ، وەك عێراقی دەیلێت[1][2].

بوخاری لە الادب المفرد ص١٦٩ لە نافع لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) رێگری دەكرد كەسێك لە كۆڕی هەستێ و دواتر تیایدا دابنیشێ، ئیبن عومەر كە كەسێك بۆی هەڵدەستا لەوێ دانەدەنیشت[3][4].

ئیبن سەعد ج٦ ص٢٨ لە ئەبوخالیدی والیبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی كوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) هات بۆ لامان و ئێمە هەستاین چاوەڕێی بووین تا بێت، وتی: چیە دەتانبینم قیت وەستاون[5].

بوخاری لە ئەبومجلەزەوە هێناویەتی موعاویە دەرچوو و عەبدوڵڵای كوڕی عامرو عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر دانیشتبوون، ئیبن عەمر هەستا و ئیبن زوبەیر كە قورستر بوو دانیشت، موعاویە وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت(من سره ان یمثل له عباد الله قیاما فلیتبوا مقعده من النار) واتە(هەركەس حەزدەكات بەندەكانی خوا بۆی ڕاوەستن با لە دۆزەخماڵێ ئامادەبكات)[6].

## (جووڵان بۆ موسڵمانان)

بەیهەقی و ئیبن عەساكیر لە واسلەی كوڕی خەتتابی قورەیشیەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: كەسێك هاتە مزگەوت و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەتەنها بوو، جووڵا بۆی،

---

[1] – صحیح.

[2] – له البدایه والنهایه ج٦ ص٥٧ دا هاتووه.

[3] – صحیح.

[4] – ئیبن سەعد ج٤ ص١٢٠ لە نافع لە ئیبن عومەرەوە بە كورتی هێناویەتی.

[5] – صحیح.

[6] – صحیح.

وترا: ئەی پێغەمبەری خوا شوێن فراوانە، پێی فەرموو(ان للمؤمن حقا اذا راه اخوه ان یتزحزح له) واتە(مافی باوەڕدارە ئەگەر براکەی بینی بۆی بجووڵێت)[1][2].

تەبەرانی لە واسلەوە هێناویەتی دەڵێت: چوویە مزگەوت و پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنها لەوێ بوو بۆی جووڵا، کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێ فراوانە، فەرمووی(ان للمسلم حقا)[3][4].

پێشتر لە باسی ڕێزی ئالوبەیتدا هێنامان ئەبوبەکر جووڵا بۆ عەلی کوڕی ئەبوتالیب و وتی: ئائیرە ئەبولحەسەن، ئەویش لە نێوان پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکردا دانیشت.

## (ڕێزگرتنی دانیشتوو)

بوخاری لە الادب المفرد ص١٦٧ لە کەسیری کوڕی مورەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژی هەینی چوومە مزگەوت و عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعیم بینی لە کۆڕێکدا دانیشتبوو قاچی ڕاکێشابوو، کە منی بینی قاچی هەڵکرد و وتی: دەزانیت بۆچی قاچم ڕاکێشابوو؟ تا کەسێکی صاڵح بێت و دابنیشێت.[5]

لە موحەممەدی کوڕی عبادی مو جەعفەرەوە دەڵێت: بەڕێزترین کەس لام ئەوەی پاڵمە کە خەڵکی بپەڕێنێ تا لە لای من دابنیشێ.[6]

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٥ ص٥٥ دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص٤٠ دەڵێت: کەسەکانی جێ متمانەن بەڵام ئەبوعومەیر عیسای کوڕی موحەمەدی کوڕی نحاس نەمبیستووە لە ئەبوئەسوەدی بیستبێ، خوایش زاناترە، تەواو.

[5] – حسن.

[6] – صحیح.

## (قبوڵکردنی ڕێزگرتنی موسڵمانان)

ئیبن ئەبی شەیبەو عەبدولڕەزاق لە ئەبوجەعفەرەوە هێناویانە دەڵێت: دوو کەس هاتن بۆ لای عەلی، ئەویش ڕاخەرێکی بۆ دانان، یەکێکیان لەسەری دانیشت و ئەوی تر لەسەر زەوی، عەلی بەوەی وت کە لەسەر زەوی دانیشتبوو: هەستە لەسەر ڕاخەرەکە دابنیشە چونکە تەنها کە ئامادەنیە ڕێز قبوڵ بکات.[1]

## (پاراستنی نهێنی موسڵمانان)

ئەوبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٦١ لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەفسەی کچی عومەر(ر)بێوەژن کەوت لە خونەیسی حوزافەی سەهمی کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بەشداری بەدر بوو لە مەدینە مرد، گەیشتم بە ئەبوبەکرو وتم: ئەگەر پێت باشە حەفسەی کچی عومەرت لێ مارەدەکەم، ئەویش وەڵامی نەدامەوە، چەند شەوێکی بردو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داوای کردو منیش مارەم کرد لێی، ئەبوبەکر گەیشت پێم و وتی: لەوانەیە کاتێ ئەوەت پێ وتم وەڵامم نەدایتەوە دڵت شتێکی کردبێت؟ وتم: بەڵێ، وتی: تەنها لەبەر ئەوە هیچم نەوت چونکە لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست باسی دەکرد، منیش نهێنی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) ئاشکرا نەدەکرد ئەگەریش نەیهێنایە من مارەم دەکرد.[2]

بوخاری لە الادب المفرد ص١٦٩ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك خزمەتی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) کرد تا لە خزمەتی بوومەوە وتم: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ئێستا دەخەوێت،، لە لای دەرچووم هەندێ منداڵ یارییان دەکرد، وتم: سەیری یاریەکەیان دەکەم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات و سەلامی لێکردن و دواتر منی بانگکردو ناردمی بۆ

[1] – عەبدولڕەزاق دەڵێت: ئەم فەرموودە مونقەتیعە، لە کنز العمال ج٥ ص٥٥ دا واهاتووە.

[2] – ئەحمەدو ئیبن سەعدو بوخاری و نەسائی و بەیهەقی و ئەبویەعلاو ئیبن حیببان بە زیادەیەکەوە هێناویانە، لە المنتخب ج٥ ص١٢٠ دا هاتووە.

شتێك وەك ئەوەی لە دەممدا بێت(لەسەر زارم بێت) تا چوومە لای و درەنگ چوومەوە بۆ لای دایکم، وتی: بۆچی وا درەنگ؟ وتم: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردمی بۆ شتێك، وتی: چی بوو؟ وتم: ئەوە نهێنی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم)، وتی: دەی نهێنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بپارێزە، منیش بە کەسم نەوتووە ئەگەر بە کەسم بوتایە پێم دەوتیت.[1]

## (ڕێزگرتنی هەتیو)

ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی کەسێك سکاڵای دڵ ڕەقی خۆی لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کرد، ئەویش فەرمووی(امسح راس اليتيم و اطعم المسكين) واتە(دەست بێنە بەسەر هەتیوداو نانی هەژاربدە)[2][3].

تەبەرانی لە ئەبودەردائەوە هێناویەتی کەسێك هات و سکاڵای دڵ ڕەقی خۆی کرد، ئەویش فەرمووی(ئایا دەتەوێت دڵت نەرم بێت و بە پێویستیت بگەیت؟ ڕەحم بە هەتیو بکەو دەست بێنە بە سەریداو لە نانی خۆت نانی دەرخوارد بدە، دڵت نەرم دەبێت و بە پێویستیت دەگەیت)[4][5].

بەزار لە بەشیری کوڕی عەقرەبەی جوهەینیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا گەیشتم بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتم: باوکم چی لێهات؟ وتی:(شەهید بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) منیش گریام، ئەویش گرتمی و دەستی هێنا بەسەرمداو لەگەڵ خۆیدا بردمی و فەرمووی(ئایا ڕازی نیت من باوکت و عائیشە دایکت بێت؟)[1][6].

---

[1]– بوخاری لە صەحیحەکەیداو موسلیم لە ئەنەسەوە بەو شێوەیە بە کورتی هێناویەتی، لە جمع الفوائد ص١٤٨ دا هاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – هەیسەمی ج٨ ص١٦٠ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن.

[4] – ضعیف.

[5]– لە سەنەدەکەیدا کەس هەیە ناوی نەهاتووەو ئەوانی دیکەس مودەلەسن، وەك هەیسەمی ج٨ ص١٦٠ دەیڵێت.

[6] – ضعیف.

# (ڕێزگرتنی هاوڕێی باوك)

ئەبوداودو ترمزیو موسلیم لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە کە دەچوو بۆ مەککە گوێدرێژێکی هەبوو ئەگەر لە سواری وڵاخ ماندووبوایە سواری دەبوو، مێزەرێکیشی هەبوو سەری پێدەبەست، ڕۆژێك لەسەر ئەو گوێدرێژەبوو کە دەشتەکیەك دای بە لایداو وتی: تۆ فلان کەس نیت؟ وتی: با، گوێدرێژەکەی پێداو وتی: سواربە، مێزەرەکشی پێداو وتی: سەرت ببەستە، یەکێك لە هاوەڵانی پێی وت: ئەو گوێدرێژەی پێی دەچوویتو مێزەرەکەش کە سەرت پێدەبەست دات بەو دەشتەکیە؟ وتی: لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(ان من ابر البرصلة الرجل اهل ود ابیه بعد ان تولی) واتە(لە چاکترینی چاکەکان گەیاندنی پەیوەندیو سۆزی کەسێکە بۆ کەسانی هاوڕێی باوکی پاش ئەوەی باوکی نەما). باوکی دۆستی عومەر(رضي الله عنه) بوو.[2]

بوخاری لە الادب المفرد بە کورتی بەو شێوەیە هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە: یەکێك لەوانەی لەگەڵی بوو وتی: دوو درهەمی بەس نەبوو؟ وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی(افحظ ود ابیك لاتقطعه فیطفئ الله نورك) واتە(دۆستایەتی باوکت بپارێزەو مەیپچڕێنە گەرنا خوا ڕووناکیت دەکوژێنێتەوە).

ئەبوداود لە ئەبی ئوسەیدی سەعدیەوە هێناوەیەتی کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە چاکەی دایكو باوکم هیچ ماوە تا پاش مردنیان لە ڕوویاندا بینوێنم؟ فەرمووی(نعمن الصلاة علیهما والاستغفار لهما و انفاذ عهدهما من بعدهما وصلة الرحم التي لاتوصل الا بهما واکرام صدیقهما) واتە(سەڵەواتدان لەسەریانو

---

[1]- هەیسەمی ج٨ ص١٦١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەس هەیە کە نەناسراوە، بوخاری لە مێژووەکەیدا لە بەشیرەوە بەو جۆرە هێناویەتی: لە الاصابە ج١ ص١٥٣ دا واهاتووە، ئیبن مندەو ئیبن عەساکیر بە دوورو درێژتر هێناویانە، لە المنتخب ج٥ ص١٤٦ دا واهاتووە.

[2] – لە جمع الفوائد ج٢ ص١٦٩ دا واهاتووە.

داوای لێخۆشبوون بۆیان و بەجێگەیاندنی بەڵێنیان دوای خۆیان و گەیاندنی ئەو پەیوەندیەی کە تەنها بەوانەوە هەبوو وە ڕێزگرتنی هاوڕێکانیان).[1]

## (بەدەمەوەچوونی بانگهێشتی موسڵمان)

بوخاری لە الادب المفرد ص١٣٤ لە زیادی کوڕی ئەنعەمی ئەفریقیەوە هێناویەتی کە لە سەردەمی موعاویەدا(رضي الله عنه) جەنگاوەری دەریابوون دەڵێت: کەشتیەکەمان گەیشتە لای کەشتی ئەبوئەیوبی ئەنصاری(رضي الله عنه) کە نانمان ئامادەبوو ناردمان بە شوێنیدا ئەویش هات و وتی: بانگتان کردم و من بەڕۆژووبووم ناچاربووم بێم چونکە لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(ان للمسلم علی اخیه ست خصال واجبة، ان ترك منها شیئا فقد ترك حقا واجبا لاخیه علیه: یسلم علیه اذا لقیه ویبجه اذا دعاه ویشمته اذا عطس و یعوده اذا مرض ویحضره اذا مات وینصحه اذا استنصحه) واته(موسڵمان شەش ماف واجبی لەسەر براکەی هەیە، ئەگەر یەکێکیانی نەکرد مافێکی واجبی براکەی لەسەری پشتگوێ خستووە: ئەگەر پێی گەیشت سەلامی لێ بکات و ئەگەر بانگهێشتی کرد بچێت بەدەمیەوە و ئەگەر پژمی وەڵامی بداتەوە و ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکات و ئەگەر مرد ئامادەی سەر تەرمی بێت و ئەگەر داوای ئامۆژگاری کرد ئامۆژگاری بکات).[2]

ئیبن موبارەك و ئەحمەد الزهد لە حەمیدی کوڕی نەعیمەوە هێناویانە: عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنهما) بانگکران بۆ خوانێك و ئەوانیش چوون، کە دەرچوون عومەر بە عوسمانی وت: خواردنێکم بینی حەزمدەکرد نەیبینم، وتی: چی بوو؟ وتی: ترسام شانازی و بەخۆدانازیم بێت.[3]

---

[1] - ضعیف.

[2] - ضعیف.

[3] - کنز العمال ج٥ ص٦٦.

ئەحمەد لە الزهد لە عوسمانەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: موغەیرەی کوڕی شوعبە(رضي الله عنه) هاوسەرگیری کردو عوسمانی بانگکرد کە ئەمیری باوەڕداران بوو، کە هات وتی: من بەڕۆژووم بەڵام حەزم کرد وەڵامی بانگهێشتنەکەت بدەمەوەو نزاو پشکی بەرەکەت بگرمەبەر.[1]

عوبدولڕەزاق لە سەلمانی فارسیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر هاوڕێ یان دراوسێیەکی ئیشکەر یان کەسێکی ئیشکەری نزیکت هەبوو دیاریەکی پێدایت یان بانگهێشتی کردیت بۆ خواردنێك قبوڵی بکە چونکە خۆشی و خێرەکەی بۆ تۆو خراپەکەی بۆسەر ئەوە.[2]

## (لابردنی سەختی لەسەر ڕێی موسڵمان)

بوخاری لە الادب المفرد ص٨٧ لە موعاویەی کوڕی قورەوە هێناویەتی دەڵێت: من لەگەڵ مەعقەلی موزەنی بووم کە سەختیەکی لەسەر ڕێ لابرد، منیش شتێکم بینی پێش ئەو لامبرد، وتی: برازاگیان چی وایکرد وابکەیت؟ وتم: بینیم تۆ واتکرد منیش وامکرد، وتی: ئافەرین برازام، لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(من اماط اذى عن طريق المسلين كتب له حسنة، ومن تتقبلت له حسنة دخل الجنة) واتە(هەرکەس سەختیەك لەسەر ڕێی موسڵمانان لاببات چاکەیەکی بۆ دەنووسرێت، هەرکەسیش چاکەیەکی بۆ قبوڵ بکرێت دەچێتە بەهەشتەوە).[3]

[1] – لە کنز العمال ج٥ ص٦٦ دا واهاتووە.

[2] – کنزالعمال ج٥ ص٦٦.

[3] – حسن.

# (وەڵامدانەوەی پژمین)

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین کە پژمی، وتیان(یرحمك الله) فەرمووی(یهدیکم الله ویصلح بالکم).[1]

ئەحمەدو ئەبویەعلا لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) پژمی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بڵێم؟ فەرمووی(بڵێ الحمد لله) وتیان: ئەی ئێمە چی بڵێین؟ فەرمووی بڵێن یرحمك الله، وتی: ئەی من چییان پێ بڵێمەوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی پێیان بڵێ(یهدیکم الله ویصلح بالکم).[2][3]

تەبەرانی لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فێری کردین ئەگەر هەرکاممان پژمی وەڵامی بدەینەوە.[4][5]

هەروەها هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فێری دەکردین(هەرکامتان پژمی با بڵێ، الحمد لله رب العالمین ئەگەر ئەوەی وت با ئەوەی لەلایەتی بڵێ یرحمك الله، ئەگەر ئەوەی وت با ئەویش بڵێ، یغفر الله لی ولکم) هەیسەمی دەڵێت لە سەنەدەکەدا عەتائی کوڕی سائیب هەیە کەشت تێکەڵ دەکات.[6]

---

[1] – هەیسەمی ج٨ ص٥٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئەسباتی کوڕی عزرە هەیەو کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن.

[2] – ضعیف.

[3] – هەیسەمی ج٨ ص٥٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئەبومیعشەری نەجیح هەیە کە نەرمی نوێنە لە فەرموودەدا، کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، ئیبن جەریرو بەیهەقی لە عائیشەوە هێناویانە، لە کنز العمال ج٥ ص٥٦ دا واهاتووە.

[4] – صحیح.

[5] – سەنەدەکەی جەییدە وەك هەیسەمی ج٨ ص٥٧ دەیڵێت.

[6] – ضعیف.

ئیبن جەریر لە ئوم سەلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: لە پاڵ ماڵی پێغەمبەردا(عليه السلام) کەسێك پژمی و وتی: الحمد لله، پێغەمبەر(عليه السلام) فەرمووی(یرحمك الله) کەسێکی تریش پژمی و وتی: الحمد الله رب العالمین حمدا کثیرا طیبا مبارکا فیه) پێغەمبەر(عليه السلام) فەرمووی(ئەمە نۆزدەپلە بەسەر ئەودا بەرزبوویەوە).[1]

بوخاری و موسلیم و ئەبوداودو ترمزی لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: دووکەس لە خزمەت پێغەمبەردا(عليه السلام) پژمین، وەلامی یەکێکیانی دایەوەو وەلامی ئەوی دیکەی نەدایەوە، پێی وترا، ئەویش فەرمووی(ئەویان سوپاسی خوای کردو ئەوەیان سوپاسی خوای نەکرد).[2]

ئەحمەد و تەبەرانی لە ئەبوهورەیرەوە هێناویانە دەڵێت: دوو کەس لە خزمەت پێغەمبەردا(عليه السلام) پژمین، یەکێکیان لەوی دی پایەبەرزتربوو، ئەوەیان پژمی و سوپاسی خوای نەکرد، پێغەمبەر(عليه السلام) وەلامی نەدایەوە، ئەوی دیکەش پژمی و سوپاس و ستایشی خوای کردو پێغەمبەر(عليه السلام) وەلامی دایەوە، خانەدانەکە وتی: من لەلات پژمیم و هیچت پێ نەوتم و ئەوەش پژمی و وەلامت دایەوە پێغەمبەر(عليه السلام) فەرمووی(ان هذا ذکر الله فذکرته وانت نسیت الله فنسیك) واتە(ئەو یادی خوای کردو منیش یادم کردو تۆش خوات لەبیرکرد منیش لەبیرم کردیت).[3][4]

بوخاری لە الادب المفرد ص١٣٧ لە ئەبوبوردەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای ئەبوموسا لە ماڵی ئوم فەزڵی کچی عەبباس بوو، وەلامی پژمەی نەدامەوە ئوم فەزڵ پژمی و وەلامی دایەوە، بە دایکمم وت چی بووە، کە هات بۆ لای پێی وت

---

[1] – لە کنز العمال ج٥ ص٥٦ دا هاتووەو دەڵێت: گرفت لە سەنەدەکەیدا نیە.

[2] – جمع الفوائد ج٢ ص١٤٥.

[3] – حسن.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص٥٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەی ئەحمەد صەحیحن جگە لە ڕبعی کوڕی ئیبراهیم کە جێ متمانەی مەئمونە بوخاریش لەگەڵ بەیهەقی و ئیبن شاهین هێناویانە. لە کنز العمال ج٥ ص٥٧ دا هاتووە.

کوڕی من پژمی و وەڵامت نەدایەوەو ئەو ئافرەتە پژمی وەڵامت دایەوە، ئەویش بە دایکمی وت: لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(اذا عطس احدكم فحمد الله فشمتوه وان لم يحمد الله فلافتمتوه) کوڕی تۆ پژمی و سوپاسی خوای نەکردو منیش وەڵامم نەدایەوە، ئافرەتەکە پژمی و سوپاسی خوای کردو منیش وەڵامم دایەوە، دایکم وتی: ئافەرین.[1]

بوخاری لە مەکحولی ئەزدیەوە هێناویەتی دەڵێت: من لە لای ئیبن عومەر بووم کە کەسێك لە سوچی مزگەوتەوە پژمی، ئیبن عومەر(رضي الله عنه) وتی: ئەگەر سوپاسی خوات کردبێت ڕەحمەتی خوات لێ بێت.[2] بەیهەقی لە نافعەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی ئیبن عومەر(رضي الله عنه) کە دەپژمی پێی دەوترا: يرحمك الله، دەیوت(يرحمنا الله واياكم وغفر لنا ولكم).[3]

بەیهەقی لە نافعەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لە لای ئیبن عومەر(رضي الله عنه) پژمی و سوپاسی خوای کرد، ئیبن عومەر پێی وت: پیسکەبوویت، دەی با لەگەڵ سوپاسی خوادا صەلەواتێکیشت لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بدایە. لە زوحاکی کوڕی قەیسی یەشکریەوە دەڵێت: کەسێك لای ئیبن عومەر پژمی و وتی: الحمد لله رب العالمين، عەبدوڵڵا وتی: با بە سەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تەواوت بکردایە[4].[5]

بوخاری لە الادب المفرد ص١٣٥ لە ئەبوجەمرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ئیبن عەبباسم بیست کە وەڵامی کاتی پژمەی دەدایەوە دەیوت:(عافانا الله واياكم من النار يرحمكم الله).[6]

---

[1] – صحيح.
[2] – ضعيف.
[3] – كنز العمال ج٥ ص٥٧.بوخاری لە الادب المفرد ص١٣٦ بەو شێوەیە هێناویەتی.
[4] – صحيح.
[5] – لە كنز العمال ج٥ ص٥٧ دا واهاتووە.
[6] – صحيح.

## (سەردانی نەخۆش و ئەوەی پێی دەوترێت)

ئەبوداود لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئازارێکی چاوم هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی کردم.[1]

بوخاری ج١ ص١٧٣ دەقەکە هی ئەمەو موسلیم ج٢ ص٣٩ لە عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە لە باوکیەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا لەسەر نەخۆشیەکم سەردانی کردم، منیش وتم: ئازارم زۆرەو سامانم هەیەو تەنها کچێکم هەیە میرات وەربگریٚ ئایا سامانم بکەم بەخێر؟ فەرمووی(نا) وتم: ئەی بەشێکی؟ فەرمووی(نا) پاشان فەرمووی(الثلث والثلث كبير، انك ان تذر ورثتك اغنياك خير من ان تذرهم عالة يتكففون الناس وانك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله الا اجرت بها ما تجعل في فم امرأتك) واتە(سیٚ یەك، سیٚ یەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر میراتگرەکەت بە دەوڵەمەندی وازلیٚ بێنیٚ باشترە بۆت تا بە هەژاری لەبەردەم خەڵکدا دەست پان بکەنەوە، تۆ هەر خەرجیەك لەپێناو خوادا بکەیت پاداشتی پیٚ وەردەگریت تەنانەت ئەوەش دەیخەیتە دەمی ژنەکەت) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دوای هاوەڵانم بەجێدەمێنم؟ فەرمووی(انك لن تخلف فتعمل عملا صالحا الا ازددت به درجة و رفعة ثم لعلك ان تخلف حتى ينتفع بك اقوام و يضربك اخرون، اللهم امض اصحابي هجرتهم ولاتردهم على اعقابهم لكن الباس سعد بن خولة)( ئەگەر دوای ئەوان بمێنیو کاری چاکە بکەیت بەوە پلەت زیادو بەرز دەبێتەوە، پاشانبەڵکو بەجێبمێنیو خەڵکانیٚ پێت سوودمەندو خەڵکانیٚ پێت زیادمەند بن،خوایە کۆچی هاوەڵانم بەرێخەو بەروویاندا مەیانگێرەوە، بەردەستیش سەعدی کوڕی خەولە بێت) پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دەهۆنیەوە و خەمی بۆ دەخوارد کە لە مەککە مرد.

[1] – لە جمع الفوائد ج١ ص١٢٤ دا هاتووە.

بوخـاری لـه صـەحیحەکەیدا ج٢ ص٨٤٣ لـه جـابری کـوڕی عەبـدوڵڵاوە هێناویـەتی دەڵێـت: نـەخۆش کـەوتمو پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبـەکر هـاتن بـۆ لام، دەچوون بە ڕێدا کە منیان بینی لە هۆش دەچووم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستنوێژی گرتو ئاوی دەستنوێژەکەی کرد بـە سـەرمدا، هەستام سـەیرم کـرد پێغەمبـەری خوایە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چی بکەم بە سامانم؟ ئەویش وەڵامی نەدامەوە تا ئایەتی میرات دابەزی.[1]

بوخاری ج٢ ص٨٤٥ لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسـەر کۆپـانی وڵاخ لەسـەر گوێدرێـژێ سـواربوو، کۆپانەکـە بـەرگی(قطیفـە ی فەدەکی) بوو، ئوسامە لە دوایەوە بوو سەردانی سەعدی کوڕی عوبادەی کرد پێش ڕووداوی بـەدر، چـوو تـا دای بـە لای کۆڕێکـدا عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلوولی تێـدابوو لەگـەڵ تێکەڵەیـەکی موسـڵمانانو بێبـاوەڕانی بتپەرسـتو جوولەکە، لـە کۆڕەکـەدا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحـەش هـەبوو، کـە تـۆزی وڵاخەکـەی چوو بەسەر کۆڕەکەدا عەباکەی دا بەسەر لووتیداو وتـی: تۆزمـان بەسـەردا مەکـەن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەلامی کردو وەستاو لەلایان دابەزیو بانگی کـردن بـۆ لای خـواو قورئـانی بەسـەردا خوێنـدن، عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەی پێـی وت: کـابرا ئـەوەی تـۆ دەیڵێیت جوانترینە، ئەگەر حەقە بەوە لـە کۆڕەکانمانـدا ئازارمـان مـەدەو بگـەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆت، هەرکـەسمان هـات بـۆ لات بـۆی بخوێنـەرەوە، ئیبن ڕەواحە وتـی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا لە کۆڕەکانماندا ئەوەمان بەسـەردا بخوێنـەرەوە چونکە حـەزمان لێیـەتی، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) بەردەوام دەیهێنانـەوە سـەرخۆ تـا بێـدەنگ بـوون، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سواری وڵاخەکەی بوو و چوو بۆ لای سەعدی کـوڕی عوبـادەو پێـی فـەرموو(ئـەی سـەعد نەتبیـست ئـەبوحباب چـی وت؟) مەبەسـتی عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبەی بـوو، سـەعد وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا لێبوردەبـەو لێـی خـۆش بە،خوای

[1] - لە الادب المفرد ص٧٥ یشدا هاتووە.

گەورە پێی بەخشیویت، خەڵکی ئەم ناوچە یەکدەنگ بوون ئەو بکەنە گەورە کە خوای گەورە وەڵامی دایەوە بەو حەقەی کە بە تۆی بەخشی پێی تێکچوو، ئەمە لەبەر ئەوەیە بینیت وایکرد.

بوخاری لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەچوو بۆ لای نەخۆشێك پێی دەفەرموو(لابأس طهور ان شاء الله تعالى) واتە(هیچ نیە، پشت بە خوای گەورە پاکبوونەوەیە) دەڵێت: وتم پاك، نەخەیر بەڵکو تایەکە کە پیرێکی پەکخستووە بەرەو گۆڕستانی دەبات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرووی(فنعم اذا).

بوخاری ج٢ ص٨٤٤ لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ مەدینە ئەبوبەکرو بیلال نەخۆش کەوتن، عائیشە دەڵێت: چووم بۆ لایان و وتم: بابەگیان بارت چۆنە؟ ئەبوبەکر ئەگەر تای هەبوایە دەیوت:

کل امرئ مصبح في اهله		والموت ادنى من شراك نعله

بیلالیش لەو بارەیدا دەیوت:

الا ليت شعري هل ابيتن ليلة		بواد و حولي اذ خر و جليل
وهل اردن يوما مياه مجنة		وهل يبدون لي شامة وطفيل

عائشە دەڵێ: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێموت چی بووە، ئەویش فەرمووی(اللهم حبب الينا المدينة كحبنا مكة او اشد، اللهم و صححها وباركلنا في مدها و صاعها وانقل حماها فاجعلها) واتە(خوایە مەدینەمان لاخۆشەویست بکە وەك مەککە یان زیاتر، خوایە ساغ و تەندروستی بکەو بەرەکت بخەرە ڕۆزیەوە بۆمان و تا و گەرماکەی بگوازەرەوە و بیخەرە جوحفەوە).

بوخاری لە الادب المفرد ص٧٥ لە ئەبی هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەمڕۆ کامتان بەڕۆژووە؟) ئەبوبەکر وتی: من، فەرمووی(ئەمڕۆ کامتان سەردانی نەخۆشی کردووە؟) ئەبوبەکر وتی: من، فەرمووی(ئەمڕۆ کامتان لەسەر تەرمێك ئامادەبووە؟) ئەبوبەکر وتی: من، فەرمووی(ئەمڕۆ کامتان نانی هەژارێکی داوە؟) ئەبوبەکر وتی: من، مەڕوان وتی:

بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەو خەسڵەتانە لە ڕۆژێکدا لەهەرکەسێکدا کۆببنەوە دەچێتە بەهەشت).[1]

ئیبن جەریرو بەیهەقی لە عەبدوڵڵای کوڕی نافعەوە هێناویانە دەڵێت: ئەبوموسا سەردانی حەسەنی کوڕی عەلی کرد، عەلی وتی: هەر موسڵمانێك سەردانی نەخۆشێك بکات لەگەڵیدا حەفتا هەزار فریشتە سەردان دەکەن و داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن بەیانی تا ئێوارەو لە بەهەشتدا خەریفێکی دەبێت، یان لە ئێوارەوە تا بەیانی نزای بۆ دەکەن و لە بەهەشتدا خەریفێکی دەبێت[2][3].

ئیبن سەعد ج١ ص١٢ لە عەبدوڵڵای کوڕی نافعەوە هێناویەتی ئەبوموسای ئەشعەری سەردانی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کرد، عەلی پێی وت: بۆ سەردانی نەخۆشی هاتوویت یان بۆ سەردانی ئاسایی؟ وتی: بەڵکو بۆ سەردانی نەخۆشی. عەلیش وتی- بە هەمان شێوە فەرموودەکەی پێشوو هێناویەتی -.[4]

ئەحمەد ج١ ص٩١ لە ئەبی قوحافەوە هێناویەتی: ئەبوموسای ئەشعەری سەردانی حەسەنی کوڕی عەلی کرد، عەلی هاتەژوور و وتی: سەردانی نەخۆشە ئەبوموسا یان سەردانی ئاسایی؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بەڵکو سەردانی نەخۆشە، عەلی وتی: دەی من لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(ماعاد مسلم مسلما الا صلى عليه سبعون الف ملك من حين يصبح الى ان يمسي جعل الله تعالى له خريفا في الجنة) واتە(هەر موسڵمانێك سەردانی نەخۆشێکی موسڵمان بکات

---

[1] - صحيح.

[2] - صحيح.

[3] - لە كنز العمال ج٥ ص٥٠ دا هاتووە. ئەبوداودیش لە عەبدوڵڵای کوڕی نافعەوە بەو جۆرە بە مەوقوفی هێناویەتی و دەڵێت: ئەمە لە عەلی لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە لە چەند لایەکی صەحیحەوە.

[4] - صحيح.

حەفتا هەزار فریشتە صەلەواتی لەسەر دەدەن لە بەیانیەوە تا ئێوارە، خوای گەورە لە بەهەشتدا خەریفێکی دەداتیٚ) وتمان: ئەی ئەمیری ئیماندارانی خەریف چیە؟ وتی: ئەوەی ئاوی دارخورما دەدات.[1]

ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی یەسارەوە هێناویەتی عەمری کوڕی حەریس سەردانی حەسەنی کوڕی عەلی کردو عەلی پێی وت: ئایا سەردانی حەسەن دەکەیت هیچ لە دەروونتدا هەیە؟ عەمر پێی وت: بە خوای خۆم تۆ ئەوەنیت بە ویستی خۆت دڵم بگۆڕیت، عەلی وتی: ئەوە ڕێگرمان نیە تا ئامۆژگاریت بکەین، لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست فرمووی(هەر موسڵمانیٚ سەردانی برا نەخۆشەکەی بکات خوای گەورە حەفتا هەزار فریشتەی بۆ دەنێرێت کە لەهەر کاتێکی ڕۆژدا صەلەواتی لەسەردەدەن تا ئێوارە دێتو لەهەر کاتێکی شەودا بێت تا ڕۆژ دەبێتەوە[2][3].

بوخاری لە الادب المفرد ص٧٢ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سەعید لەباوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ سەلمان بووم کە لە کیندە سەردانی نەخۆشێکی کرد، کە چوو بۆ لای وتی: موژدەبێت نەخۆشی باوەڕدار خوای گەورە دەیکاتە سڕینەوەی تاوان بۆیو پارمەتیدانی، نەخۆشی لادەرو خراپەکار وەك نەخۆش وایە کە خاوەنەکەی دەیبەستێتەوەو دواتر دەینێرێتو نازانێت بۆچی بەستراوەتەوەو بۆچی نێردراوە.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٠٦ لە سەعیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ سەلمان چووین بۆ لای هاوڕێیەکی لە کیندەو سەردانی کرد، سەلمان پێی وت: خوای گەورە بەندەی باوەڕداری تووش دەکاتو دواتر چاکی دەکاتەوەو

---

[1] - ضعیف.

[2] - صحیح.

[3] - بەزار هێناویەتیو هەیسەمی ج٣ ص٣١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد جیٚ متمانەن.

دەیکاتە مایەی سڕینەوەی تاوانی ڕابردووی و لەسەر ئەوەی ماوە لێپێچینەوە دەکرێت، خوای گەورە ناوی شکۆدارە بەندەی خراپەکاری تووش دەکات و دواتر چاکی دەکاتەوە و وەك وشترێ وایە کەسەکانی دەیبەستنەوە دواتر بەری دەدەن، نازانێ بۆچی بەستراوەتەوە و بۆچی بەردراوە.

بوخاری لە الادب المفرد ص٧٨ لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر کە دەچوو بۆ لای نەخۆشێك دەیوت: چۆن بووە، کە لەلای هەڵدەستا دەیوت خوای گەورە خێر بێنێتە ڕێت و زیاتری پێ نەدەوت.[1]

لە ص٧٨ لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی هوزەیلەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود چوو بۆ لای نەخۆشێك تا سەردانی بکات و هەندێکەسی لەگەڵدابوو و لە ماڵدا ژنی هەبوو، یەکێ لەوانە سەیری ژنەکەی دەکرد، عەبدوڵلا پێی وت: ئەگەر چاوت کوێربێت بۆت باشترە.[2]

بوخاری ص٧٩ لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە سەردانی نەخۆشی دەکرد لە لای سەری دادەنیشت و دواتر حەوت جار دەیفەرموو(اسال الله العظيم رب العرش العظيم ان يشفيك) واتە(لە خوای گەورە پەروەردگای عەرشی گەورە دەپاڕێمەوە شیفات بدات) ئەگەر سەرەمەرگی نەهاتبوایە لە نەخۆشیەکەی ڕزگاری دەبوو.[3]

ئیبن ئەبی شەیبە لە عەلیەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بچوایە بۆ لای نەخۆش دەیفەرموو(اذهب الباس واشف انت الشافي لاشافي الا انت)[4].[5]

[1] – ضعيف.

[2] – صحيح.

[3] – صحيح.

[4] – صحيح.

[5] – ئەحمەدو ترمزی هێناویانە و ترمزی دەڵێت: حەسەنی غەریبە، دەورەقی و ئیبن جەریر هێناویانە، صەحیحی بەم دەقە(لاباس اذهب البأس رب الناس اشف انت الشافي لايكشف الضر الا انت).

ئیبن ئەبی شەیبە لە ئەنەسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە دەچوویە لای نەخۆشێك دەیفەرموو(اذهب البأس رب الناس واشف انت الشافي لاشافي الا انت شفاء لایغادر سقما)[1،2].

ئەبویەعلا لە عائیشەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە دەچوو بۆ لای نەخۆشێك دەستی دەخستە سەر ئەو شوێنەی ئازاری دەداو دەیوت(بسم الله لابأس)[3،4].

تەبەرانی لە سەلمانەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتەلام و سەردانی کردم، کە ویستی بچێت فەرمووی(یا سلمان کشف الله ضرك و غفرالله ذنبك وعافاك في دینك و جسدك الی اجلك)[5،6].

بوخاری لە صەحیحەکەیدا ج٢ ص٨٧٤ لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە دەچوویە لای نەخۆشێك یان بهێنرایە بۆ لای دەیفەرموو(اذهب الباس رب الناس اشف وانت الشافي لاشفاء لىلا شفاؤك لایغدر سقما) ئیبن سەعد ج٢ ص١٤ هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەو شتانەی دەفەرموو، ئەوەش زیاد دەکات(شفاء لایغادر سقما) عائیشە دەڵێت: کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئازاری نەخۆشیەکەی سەرەمەرگی زیادی کرد دەستیمگرت و دەمهێنا بەسەر خۆیداو ئەو نزام دەخوێند، دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی لێ لابردم و فەرمووی(رب اغفرلي والحقني بالرفیق) عائیشە دەڵێت: ئەمە کۆتا قسەی بوو بیستم.

---

[1] – صحیح.

[2] – کنز العمال ج٥ ص٥١.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٢ ص٢٩٩ دەڵێت: کەسەکانی جێ متمانەن.

[5] – ضعیف.

[6] – لە سەنەدەکەدا عەمری کوڕی خالیدی قورەشی هەیە کە لاوازە، هەروەك هەیسەمی ج٢ ص٢٩٩ دەیڵێت.

# (مۆڵەت وەرگرتن)

بوخـــاری لـــە صـــەحیحەکەیدا ج٢ ص٩٢٣ لـــە ئەنەســـەوە هێناویـــەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر سەلامی بکردایە سێ جار دەیکردو ئەگەریش قسەی بکردایە سێ جار دەیوتەوە.

ئەبوداود لە قەیسی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەوە سەردانی کردین و فەرمووی(السلام علیکم و رحمة الله)باوکم بە نزمی وەڵامی دەدایەوە، وتم: ئایا مۆڵەتی پێغەمبەر(ﷺ) نادەیت؟ فەرمووی(وازبێنە با سەلامی زۆرمان لێ بکات، دووبارەبوویەوە، دوای سێ یەم جار پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوەو سەعد کەوتە شوێنی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من سەلامەکەتم بیست و بە هێواشی وەڵامم دەدایتەوە وتم با زیاتر سەلامان لێ بکەیت، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی چوو و سەعد وتی: دەست شۆرێك بێننن هێنایان و دەستی شت و دواتر خاولیەکی زەعفەران ڕەنگی یان وەرسی بۆ هێنا و دایە دەستی و دواتر پێغەمبەر(ﷺ) دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی(اللهم اجعل صلواتك و رحمتك علی سعد) واتە(خوایە سەلەوات و ڕەحمەتت ببارێنە بەسەر سەعددا) پاشان نانی خوارد، کە ویستی بڕوات سەعد گوێدرێژێکی بۆ هێنا و کورتانێکی بۆ ولاخەکە دانا و سەعد وتی: ئەی قەیس لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بڕۆ، منیش لەگەڵی چووم، پێی فەرمووم(ارکب معی) واتە(لەگەڵم سواربە) من سوارنەبووم، فەرمووی(اما ان ترکب واما ان تنصرف) واتە(یان سواربە یان بگەڕێرەوە) منیش گەڕامەوە[١،٢].

بوخاری لە الادب المفرد ص١٥٨ لە ربعی کوڕی حەراشەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکێ لە بەنی عامر قسەی بۆ دەکردم چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: بێمەژوورەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) بە کەنیزەکەکەی فەرموو بڵێت:(السلام علیکم بێمە ژوورەوە؟ چونکە

---

١ – ضعیف.

٢ – لە جمع الفوائد ج٢ ص١٤٣ دا واهاتووە.

بەجوانی داوای مۆڵەتی نەکرد) دەڵێت: منیش پێش ئەوەی کەنیزەکەکە بێت بیستمو وتم: السلام علیکم بێمەژوورەوە؟ فەرمووی(وعلیك وەرە ژوورەوە)[1].[2]

ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی عومەر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ژوورەوە بوو وتی: السلام علیك ئەی پێغەمبەری خوا السلام علیکم! عومەر بێتە ژوورەوە؟[3].[4]

ئەبوداودو نەسائی لە عومەرەوە هێناویانە و خەتیبیش هێناویەتیو دەقەکەی ئەوەیە: السلام علیك ئەی پێغەمبەری خوا ڕەحمەتو بەرەکەتی خوات لێ بێت، سەلامتان لێ بێت عومەر بێتە ژوورەوە؟[5] بەیهەقی لە عومەرەوە هێناویەتی سێ جار داوای مۆڵەتم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش مۆڵەتی دام[6].[7]

ئەبویەعلا لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە شوێنمدا، هاتین و داوای مۆڵەتمان کرد[8].[9]

تەبەرانی لە سەفینەوە هێناویەتی دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووم کە عەلی(رضي الله عنه) هاتو داوای مۆڵەتی کرد، لەسەرخۆ تەقەی دا لە دەرگا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بۆی بکەرەوە)[10].[11]

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەبوداود هێناویەتی وەك لە جمع الفوائد ج٢ ص١٤٣ دا هاتووە.

[3] – صحیح.

[4] – هەیسەمی دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن.

[5] – ترمزی هێناویەتی، لە کنز العمال ج٥ ص ٥١ دا هاتووە.

[6] – صحیح.

[7] – بەیهەقی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی غەریبە. لە کنز العمال ج٥ ص٥١ دا هاتووە.

[8] – صحیح.

[9] – هەیسەمی ج٨ ص٤٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە ئیسحاقی کوڕی ئەبوئیسرائیل کە جێ متمانەشە.

[10] – ضعیف.

[11] – هەیسەمی ج٨ ص٤٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا زیراری کوڕی صورە هەیە کە لاوازە.

تەبەرانی لە سەعدی کوڕی عوبادەوە هێناویەتی مۆڵەتی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەرگرت و ڕوویکردبوویە دەرگا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(لاتستأذن وانت مستقبل الباب) واتە(مۆڵەت وەرمەگرەو ڕووت لە دەرگابێت) لە گێڕانەوەیەکدا وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و لەماڵدا بوو، هەستام و بەرامبەر دەرگاکە وەستام و داوای مۆڵەتم کرد، ئاماژەی پێکردم کە دووربگرە، پاشان هاتم و داوای مۆڵەتم کرد، فەرمووی(وهل الاستئذان الا من اجل النظر)[1].[2](مەگەر مۆڵەت وەرگرتن لەبەر ڕوانین نیە).

بوخاری ج٢ ص٩٢٢ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی کەسێك هاتەبەر ژوورێکی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە دەسە ڕەمێکەوە هات بۆی منیش سەیرمدەکرد کە بۆ کابرا دەچوو تاڵی بدات.

هەروەها لە ج٢ ص١٠٢٠ لە سەهلی کوڕی ساعدیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێك لە بەردەرگای پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) دەیڕوانی بەسەر ژوورێکیدا و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) شوڵێکی پێ بوو دەیهێنا بەسەرسەریدا، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی فەرمووی(ئەگەر بزانم تۆ چاوەڕێی من دەکەیت پێی دەدەم لە چاوت) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(انما جعل الاذن من قبل البصر)(مۆڵەت لەبەر چاو دانراوە).

بوخاری ج٢ ص٩٢٣ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە کۆڕێکی پشتیواناندا بووم کە ئەبوموسا(رضي الله عنه) هات وەك ئەوەی ترسابێت، وتی: داوای مۆڵەتم لە عومەر کرد سێ جار کە چی مۆڵەتی نەدام و گەڕامەوە، وتم: بۆچی؟ وتی: سێ جار داوای مۆڵەتم کرد وەڵامی نەدامەوەو پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(هەرکامتان سێ جار داوای مۆڵەتتان کردو مۆڵەتی پێ نەدرا با بگەڕێتەوە) وتی: بەخوا بەڵگەو ڕوونخوازیەکی لەسەردێنیت، ئایا کەستان ئەمەی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بیستووە؟ ئوبەی کوڕی کەعب وتی: بەخوا تەنها بچوکی

---

[1] - حسن.

[2] - کەسەکانی گێڕانەوەی دووەم کەسانی صەحیحن وەك هەیسەمی ج٨ ص٤٤ دەیڵێت.

خەڵكەكە لەگەڵت دێت، منیش بچووكی هەموویان بووم و هەستام لەگەڵی و بە عومەرم وت كە پێغەمبەر(ﷺ) وای فەرمووە.

بوخاری لە الادب المفرد ص١٥٧ لە ئەبوموساوە هێناویەتی دەڵێت: سێ جار داوای مۆڵەتم لە عومەر كرد مۆڵەتی نەدام، منیش چووم، عومەر ناردی بە شوێنمدا و وتی: عەبدوڵڵا نەتدەتوانی لەبەردەرگا بوەستی، بزانە خەڵكی بەو جۆرە لەسەریان سەختە لەبەردەرگات بوەستن، وتم: من سێ جار داوای مۆڵەتم كردو تۆ مۆڵەتت نەدام و منیش گەڕامەوە، عومەر وتی: ئەمەت لە كێ بیستووە؟ وتم: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست، وتی: تۆ شتێكت لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە كە ئێمە نەمانبیستووە؟ یان بەڵگەیەكم بۆ دێنیت یان دەتكەم بەپەن، منیش چووم تا گەیشتمە كۆمەڵێكی پشتیوانان كە لە مزگەوت دانیشتبوون، پرسیارم لێكردن وتیان: مەگەر كەس گومانی لەوەدا هەیە؟وتم: عومەر وای وتووە؟ وتیان: دەبێت بچوكترینمان لەگەڵت بێت، ئەبوسەعیدی خودری یان ئەبومەسعود لەگەڵم هات بۆ لای عومەر و وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووین بۆ لای سەعدی كوڕی عوبادە تا گەیشتە ئەوێ سەلامی كردو ئەویش مۆڵەتی نەدا، لە دوای سێیەم كە مۆڵەتی نەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(قضینا ماعلینا) واتە(ئەوەی لەسەرمان بوو بەجێمان گەیاند) پاشان گەڕایەوە و سەعد خۆی گەیاندە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە چی سەلامت كرد بیستم و وەڵامم دایتەوە بەڵام بە نزمی، حەزمكرد زۆر سەلام لە خۆم و ماڵم بكەیت، ئەبوموسا وتی: بەخوا بە جوانی فەرموودەی پێغەمبەرت(ﷺ) پاراستووە، وتی: بەڵێ، بەڵام حەزمكرد هەوڵی سەلماندنی بدەم.[1] بەیهەقی لە عامری كوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی مەولایەكی كچی زوبەیری برد بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب و وتی: بێمەژوورەوە؟

[1] – صحيح.

وتی: نا، گەڕایەوە، عومەر وتی: بانگی بکەن، ئەمجا بڵێ السلام علیکم بێمەژوورەوە؟[1]

ئیبن سەعد لە ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) پێی وتم: ئەی ئەسلەم لەبەردەرگا بوەستەو لە کەس هیچ وەرمەگرە، ڕۆژێك جلێکی تازەی لەبەردا بینیم وتی: ئەمەت لە کوێ بوو؟ وتم: عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر پێیدام، وتی: عوبەیدوڵڵا لێی وەربگرە بەڵام جگە لەو هیچی لێ وەرمەگرە، ئەسلەم دەڵێت: زوبەیر(رضي الله عنه) هات و من لەبەردەرگابووم داوای کرد بچێتەژوورەوە، وتم: ئەمیری باوەڕداران ساتێك سەرقاڵە، دەستی بەرزکردەوەو دای لە بناگوێم بە جۆرێك هەژاندمی، چووم بۆلای عومەر وتی: چیتە؟ وتم: زوبەیر بەو جۆرەی کرد، عومەر دەیوت زوبەیر بەخوا دەبینم، پاشان وتی: بیکەرە ژوورەوە، کردمە ژوورەوە، وتی: بۆچی دات لەو غولامە؟ وتی: دەیەوێت ڕێ نەدات بێینە ژوورەوە بۆ لات، وتی: تا ئێستا ڕێی لێگرتوویت؟ وتی: نا، عومەر وتی: ئەگەر پێی وتی تاوێ خۆبگرە چونکە ئەمیری باوەڕداران سەرقاڵە بیانووم بۆ مەهێنەرەوە، سوێند بەخوا شێر بۆ شێر خوێن دەڕێژێ و دەیخۆیت[2].[3]

بوخاری لە الادب المفرد ص٨٩ لە زەیدی کوڕی سابتەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) ڕۆژێك هات بۆ لای داوای مۆڵەتی کردو سەری لە دەستی کەنیزەکێکدا بوو(سەری دادەهێنا)، سەری دانا، عومەر پێی وت: وازی لێ بێنە با قژت دابێنێ، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر بتناردایە بە شوێنمدا دەهاتم، عومەر وتی: ئیشەکە هی منە.[4]

---

[1] – لە کنز العمال ج٥ ص٥١ دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – لە کنز العمال ج٥ ص٥١ دا واهاتووە.

[4] – حسن.

تەبەرانی لە کەسێکەوە هێناویەتی دەڵێت: دوای نوێژی بەیانی داوای مۆڵەتمان لە ئیبن مەسعود(رضي الله عنه) کرد، ئەویش مۆڵەتی دایەن و شتێکی دابەسەر ژنەکەیدا و وتی: حەزمنەکرد لەبەردەرگا ڕاتانوەستێنم[1].[2]

بوخاری لە الادب المفرد ص١٥٥ لە موسای کوڕی تەلحەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ باوکم چووم بۆ لای دایکم، چوویە ژوورەوەو منیش چووم بە دوایداو باوکم لایدەکردەوەو دای بەسنگمدا تا لەسەر چۆك دینیشاندم، وتی: بەبێ مۆڵەت دەچتە ژوورەوە؟[3].[4]

هەروەها لە ص١٥٩ هێناویەتی موسلیمی کوڕی نەزیر وتی: کەسێك داوای مۆڵەتی لە حوزەیفە کردو بەرزبوویەوە، وتی: بێمە ژوورەوە؟ حوزەیفە وتی: چاوت هاتووەتە ژوورەوە بەڵام سمتت نەهاتووەتەوە ژوورەوە، کەسێك وتی: کە بچم بۆ لای دایکیشم داوای مۆڵەت بکەم؟ وتی: داوای مۆڵەت نەکەیت ئەوەی پێت ناخۆشە دەیبینیت.[5]

ئەحمەد لە ئەبوسوەیدی عبدیەوە هێناویەتی دەڵێت: هاتین بۆ لای ئیبن عومەرو لەبەردەرگای دانیشتین تا مۆڵەتمان بۆ وەربگرن، درەنگ مۆڵەتمان درا، هەستامە بەردەرگای ژوورێكو سەرم بەرزکردەوەو منی بینی،کە مۆڵەتیان داو چووینە ژوورەوەو دانیشتین، وتی: کامتان ئێستا سەری بەرزکردەوە بۆناو ماڵەکەم؟ وتم: من، وتی: بە چ شتێ ئەوەت ڕەوازانی سەیری ماڵم بکەیت؟ وتم: درەنگیان خستینو بە مەبەست ئەوەم نەکرد، دەڵێت: دواتر لەسەر چەند شتێ

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٤٦ دەڵێت: کەسەکە ناناسم و کەسەکانی دیکە صەحیحن.

[3] – صحیح.

[4] – ئیبن حەجەر لە فتح الباری ج١١ ص٢٠ سەنەدەکەی بە صەحیح داناوە.

[5] – صحیح.

پرسیاریان لێکرد، وتم: ئەبوعەبدولڕەحمان لەسەر جیهاد چی دەڵێت؟ وتی: هەرکەس جیهاد دەکات بۆ خۆی دەکات[1].[2]

## (خۆشەویستی موسڵمانان لەبەر خوا)

ئەحمەد لە بەرائی کوڕی عازبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین فەرمووی(اي عري الاسلام اوثق) واتە(چ بەشێکی ئیسلام بەهێزترو پتەوترە) وتیان: نوێژ، فەرمووی(حسنة و ماهي بها؟) واتە(چاکەو ئەوە نیە) وتیان: ڕۆژووی ڕەمەزان، فەرمووی(باشەو ئەوە ینە) وتیان: جیهاد، فەرمووی(باشەو ئەوە نیە) فەرمووی(ان اوثق عري الايمان ان تحب الله و تبغض في الله) واتە(لەبەر خوا کەست خۆش بوێت و لەبەر خوا ڕقت لە کەس بێت)[3].[4]

هەروەها لە ئەبوزەڕەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆمان و فەرمووی(ئایا دەزانن چ کارێك لای خوا خۆشەویسترینە؟) کەسێك وتی: نوێژو زەکات، یەکێکی تر وتی: جیهاد، فەرمووی(خۆشەویسترینی کارەکان لای خوای گەورە خۆشەویستیە لەبەر خواو ڕقبوونە لەبەر خوا)[5].[6]

---

[1] – ضعیف.

[2]– هەیسەمی ج٨ ص٤٤ دەڵێت: ئەبولئەسوەدو بەرەکەی کوڕی یەعلای تەمیمی هیچکامیان ناناسم.

[3] – حسن.

[4] – لە سەنەدەکەدا لەیسی کوڕی ئەبی سەلیم هەیە کە زۆرێك بە لاوازی دەزانن.

[5] – ضعیف.

[6]– لە سەنەدەکەدا کەسێك هەیە کە ناوی نەهاتووە ئەبوداود بەشێکی هێناوە، لە مجمع الزوائد ج١ ص٩٠ دا واهاتووە.

ئەبویەعلا لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) تەنها کەسی لەخواترسی خۆشدەویست[1].

ئیبن عەساکیر لە عوسمانی کوڕی ئەبولعاصەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) مرد و دوو کەسی خۆشدەویست عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و عەمماری کوڕی یاسر.

هەروەها لە حەسەنەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کوڕی عاصی بە سەرکردەیی سوپایەك نارد کە زۆرینەی هاوەڵانی تێدابوو، بە عەمر وترا: پێغەمبەر(ﷺ) تۆ بەکاردێنیٚ و نزیکت دەکاتەوە و تۆی خۆش دەوێت، وتی: کارم پیٚ دەسپێرێت نازانم دڵم ڕادەکێشێت یان منی خۆش دەوێت، بەڵام دوو کەستان پیٚ دەڵێم کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆشیدەویستن، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و عەمماری کوڕی یاسر.[2]

ئیبن سەعد ج٣ ص١٨٨ لە حەسەنەوە بەو جۆرە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد کردووە وتیان: دەی بەخوا ئەوە بکوژی ڕۆژی صفینتان بوو، وتی: بەخوا ڕاست دەکەیت کوشتمان.

تەیالیسی و ترمزی – بە صەحیحی داناوە – و ڕەویانی و بەغەوی و تەبەرانی و حاکم لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: دانیشتبووم کە علی و عەبباس(رضي الله عنهما) داوای مۆڵەتیان کرد، وتیان: ئەی ئوسامە لای پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتمان بۆ وەربگرە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا عەلی و عەبباس داوای مۆڵەت دەکەن، فەرمووی(نازانی بۆچی هاتوون؟) وتم: نا، فەرمووی(بەڵام من دەزانم، مۆڵەتیان بدە) هاتنەژوورەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووین پرسیارت لیٚ بکەین چ کەسێکت لاخۆشەویستترە؟ فەرمووی(فاتیمەی

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە منتخب كنز العمال ج٥ ص٢٣٨ دا واهاتووە.

کچی موحەممەد) وتیان: نەهاتووین پرسیار لەسەر نزیکانت بکەین، فەرمووی(دەی خۆشەویستترینی خەڵك لام ئەوەیە کە خوا بەخششی بەسەردا ڕژاندوەو منیش بەخششم بەسەردا ڕژاندووە ئوسامەی کوڕی زەید). وتیان: دواتر کێ؟ فەرمووی(دواتر عەلی کوڕی ئەبوتالیب) عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مامت دواخست، فەرمووی(عەلی بە کۆچکردن پێشت کەوت)[1,2].

ئیبن عەساکیر لە عەمری کوڕی عاصەوە هێناویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا خۆشەویستترین کەس لای تۆ کێیە؟ فەرمووی(عائیشە) وتیان: لە پیاواندا؟ فەرمووی(ئەبوبەکر) وتیان: دواتر کێ؟ فەرمووی(پاشان ئەبوعوبەیدە)[3].

ئیبن سەعد ج٨ ص٦٨ لە عەمرەوە هێناویەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خۆشەویستترین کەس لات کێیە؟ فەرمووی(عائیشە) وتی: من لە پیاواندا دەڵێم؟ فەرمووی(ابوها) واتە(باوکی عائیشە).

ئەبوداود لە ئەنەسەوە هێناویەتی کەسێك لە خزمەت پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بوو کە کەسێك تێپەڕی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەوکەسەم خۆش دەوێت، فەرمووی(ئایا پێت وتووە؟) واتە(اعلمته؟) وتی: نا، فەرمووی(فاعلمه) واتە(دەی پێی بڵێ) ئەویش چوو و پێی وت من لەبەر خوا تۆم خۆشدەوێت، ئەویش وتی: ئەو کەسە تۆی خۆش بوێت کە منت لەبەر ئەو خۆشدەوێت[4,5].

---

[1] - ضعيف.

[2] - لە المنتخب ج٥ ص١٣٦ دا واهاتووە.

[3] - لە المنتخب ج٤ ص٣٥١ دا هاتووە.

[4] - حسن.

[5] - لە جمع الفوائد ج٢ ص١٤٧ دا هاتووە، ئیبن عەساکیرو ئیبن نەجار لە ئەنەسەوەو ئەبونەعیم لە حارسەوە بە هەمان شێوە هێناویانە، لە کنز العمال ج٥ ص٤٢ دا هاتووە.

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی من لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دانیشتبووم کە کەسێك هات بۆ لای و سەلامی کردو دواتر چوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەو کەسەم خۆشدەوێت، فەرمووی(هل اعلمته؟) وتم: نا، فەرمووی(فاعلم ذاك اخاك) واتە(دەی پێی بڵێ ئەوە براتە) منیش سەلامم لێکردو دەستم خستنە سەر شانی و وتم: بەخوا لەبەر خوا خۆشم دەوێیت، ئەویش وتی: منیش لەبەر خوا خۆشم دەوێیت، وتم: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێنەکردایەم نەمدەوت.[1] [2]

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی سرجسەوە هێناویەتی دەڵێت: بە پێغەمبەرم(ﷺ) وت: من ئەبوزەرم خۆشدەوێت فەرمووی(ئایا ئەوەت پێ گەیاندووە؟) وتم: نا، فەرمووی(دەی پێی بگەیەنە(پێی بڵێ))، گەیشتم بە ئەبوزەر و وتم: لەبەر خوا خۆشمدەوێیت، وتی: ئەو کەسە خۆشی بوێیت کە منت لەبەر ئەو خۆشدەوێت. گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێموت، ئەویش فەرمووی(اما انجر) واتە(ئەوە پاداشتە بۆ کەسێك کە دەیڵێت).[3] [4]

ئەبویەعلا لە موجاهیدەوە هێناویەتی کەسێك دای بە لای ئیبن عەبباسداو وتی: ئەمە منی خۆش دەوێت، وتیان: چووزانیت ئەبولعەبباس؟ چونکە من خۆشم دەوێت.[1] [5]

---

[1] – حسن.

[2] – هەیسەمی ج١٠ ص٢٨٢ دەڵێت: تەبەرانی لە المعجم الكبير والمعجم الوسيک دا هێناویەتی سەنەدەکانی هەردووکیان صەحیحن جگە لە ئەزرەقی کوڕی عەلیو حەسانی کوڕی ئیبراهیم کە هەردووکیان جێ متمانەن.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج١٠ ص٢٨٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی وا هەیە کە نایناسم.

[5] – صحیح.

بوخاری لە الادب المفرد ص٨٠ لە موجاهیدەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گەیشت بە من و لە پشتەوە شانی گرتم و وتی: من تۆم خۆش دەوێت، وتم: ئەو کەسە تۆی خوش بوێت کە منت خۆش دەوێت لەبەر ئەو. وتی: ئەگەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەیفەرمووایە (اذا احب الرجل الرجل فلیخبره انه احبه) واتە(ئەگەر کەسێك کەسێکی خۆش ویست با پێی بڵێت خۆشی دەوێت) پێمنەدەوتیت، دەڵێت پاشان پێشنیاری ئافرتێکی بۆ کردم و وتی: ئێمە کچێکمان هەیە.[2]

تەبەرانی لە موجاهید لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێی وتم: لەبەرخوا کەست خۆش بوێت و لەبەر خوا ڕقت لە کەس بێ و لەبەر خوا سەردان بکە، چونکە خۆشەویستی خوا تەنها بەوە دەست دەکەوێت، هەرکەسیش با نوێژو ڕۆژووی زۆر بێت تامی ئیمان نازانێ تاوانەبێت و نەبێتە بنەمای برایەتی خەڵك لە بواری دونیادا[3].[4]

## (تۆران لە موسڵمانان)

بوخاری ج٢ ص٨٩٧ لە عەوف کوڕی توفەیلی برازای عائیشەی ژنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)(برا لە دایکیەوە) هێناویەتی عائیشە بیستی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر لە فرۆشتن یان بەخششێکدا کە بە عائیشەی بەخشیبوو وتی: سوێند بەخوا

[1]- لە سەنەدەکەدا موحەمەدی کوڕی قودامەی مامۆستا ی ئەبویەعلا هەیە کە زۆرینە بە لاوازو ئیبن حیببان بەجێ متمانەی دەزانێت و کەسەکانی دیکەش جێ متمانەن، هەیسەمی ج١٠ ص٢٧٥ دەیڵێت.

[2]- صحیح.

[3]- ضعیف.

[4]- لە سەنەدەکەدا لەیسی کوڕی ئەبی سەلیم هەیە کە زۆرینە بەلاوازی دەزانن وەك هەیسەمی ج١ ص٩٠ دەڵێت.

یان عائیشه وازدێنێ یان لێی ده‌گرمه‌وه، وتی: ئایا ئه‌وه‌ی وتووه؟ وتیان: به‌ڵێ، وتی: ده‌ی نه‌زربێ هه‌رگیز له‌گه‌ڵ ئیبن زوبه‌یر قسه‌نه‌که‌م، ئیبن زوبه‌یر چوو سکاڵای لاکرد کاتێك زۆر نه‌یدواند، عائیشه وتی: به‌خوا هه‌رگیز قسه وه‌رناگرم له‌سه‌ری و ده‌ستبه‌رداری نه‌زره‌که‌م نابم، که ئه‌وه زۆری خایاند ئیبن زوبه‌یر میسوه‌ری کوڕی مه‌خره‌مه‌و عه‌بدولڕه‌حمانی کوڕی ئه‌سوه‌دی کوڕی عه‌بدیه‌غوسی(که له به‌نی زه‌هره‌بوون) دواندو پێی وتن: بۆ خاتری خوا بمبه‌ن بۆ لای عائیشه چونکه بۆی دروست و ڕه‌وانیه نه‌زربکات بۆ نه‌دواندنم، میسوه‌رو عه‌بدولڕه‌حمان دایانپۆشیبوو و بردیان و مۆڵه‌تیان وه‌رگرت لای عائیشه‌و وتیان: السلام علیك ورحمة الله وبركاته، بێینه ژووره‌وه؟ وتی: به‌ڵێ، وتیان: هه‌موومان؟ وتی: به‌ڵێ هه‌مووتان وه‌رنه‌ژووره‌وه – نه‌یزانی ئیبن زوبه‌یریان له‌گه‌ڵه – که چوونه ژووره‌وه ئیبن زوبه‌ریر خۆی خسته‌به‌رده‌م عائیشه‌و ده‌پاڕایه‌وه‌و ده‌گریا و میسوه‌رو عه‌بدولڕه‌حمانیش لێی ده‌پاڕانه‌وه تا قسه‌ی له‌گه‌ڵ بکات و ده‌یانوت پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) ڕێگری کردووه وه‌ك ده‌زانیت له نه‌دواندنی موسڵمان و دروست نیه له سێ شه‌و زیاتر ببات، که زۆریان پێ وت بیری ده‌خستنه‌وه‌و ده‌گریا و ده‌یوت: من نه‌زرم کردووه‌و نه‌زریش سه‌خته، به‌رده‌وام پێیان وت تا ئیبن زوبه‌یری دواند بۆئه‌وه‌ی بۆ ئه‌و نه‌زره‌ی چل کۆیله‌ی ئازاد کرد، دوای ئه‌وه بیری ئه‌و نه‌زره‌ی ده‌کرده‌وه‌و ده‌گریا تا فرمێسکه‌کانی ڕووخساریان ته‌ڕده‌کرد[1,2].

بوخاری له ج١ ص٤٩٧ له عروه‌ی کوڕی زوبه‌یره‌وه هێناویه‌تی ئیبن زوبه‌یر دوای پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) و ئه‌بوبه‌کر خۆشه‌ویسترین که‌س بوو لای عائیشه‌و زیاترین چاکه‌ی بۆ عائیشه ده‌نواند، عائیشه چی بۆ بهاتایه نه‌یده‌هێشته‌وه‌و ده‌یبه‌خشی، ئیبن زوبه‌یر وتی: پێویسته له ده‌ستی بسه‌نرێت، عائیشه وتی: له ده‌ستی من بسه‌نرێت؟ نه‌زربێت

---

[1] – صحيح.

[2] – بوخاری له الادب المفرد ص٥٩ له عه‌وف کوڕی حارسی کوڕی توفه‌یله‌وه هێناویه‌تی.

نەیدوێنم، ئیبن زوبەیر چەند کەسێکی ناو قورەیش و خاڵوانی پێغەمبەری(ﷺ) بەتایبەت نارد بۆ لای تا سکاڵای بۆ بکەن، عائیشە ڕازی نەبوو، زوهریەکان کە خاڵوانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون لەوانە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغوس و میسوەری مو مەخرەمە وتیان: ئەگەر داوای مۆڵەتمان کرد پەردەکە بپەڕەو بڕۆ، ئەویش وایکردو دە کۆیلەی بۆ ناردو ئازادی کردن، پاشان عائیشە بەردەوام کۆیلەی ئازاد دەکرد تا گەیشتە چل، وتی: خۆزگە کاتێ سوێندی کارێکم دەخوارد بیکەم و لێی ببمەوە.

## (چاککردنی نێوانی لە یەك تۆراوان)

بوخاری ج١ ص٣٧١ لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی خەڵکی قوبا کە بەردەکەیان فڕێ دا کەوتنە شەڕ، هەواڵی ئەوە درا بە پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی(اذهبوا بنا نصلح بينهم) واتە(با بڕۆین نێوانیان چاك بکەینەوە) هەروەها لە ص٣٧٠ هێناویەتی هەندێ لە بەنی عەمری کوڕی عەوف کێشەیەکیان کەوتە نێوان پێغەمبەر(ﷺ) بە هەندێ هاوەڵەوە چوو بۆ لایان تا نێوانیان چاك بکاتەوە.

بوخاری ج١ ص٣٧٠ لە ئەنەسەوە هێناویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) وترا بۆچی ناچیت بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، پێغەمبەر(ﷺ) سواری گوێدرێژێك بوو و چوو بۆ لای و موسڵمانانیش لەگەڵی دەچوون و زەوی خوێیاوی بوو(شۆرەکات) کە پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لای وتی: خۆتم لێ دووربگرە بەخوا بۆنی گوێدرێژەکەت ئازاری دام، یەکێك لە پشتیوانان وتی: سوێند بەخوا بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە بۆنی تۆ خۆشترە، یەکێ لە کەسانی هۆزەکەی لەبەر عەبدوڵڵا خۆی تووڕەکردو قسەی پێ وت و هەرلایەو خەڵکی لەسەری هاتەقسە تا کەوتنە لێدانی یەك بەدەست و نەعل و گەڵای خورما بیستمان ئەم ئایەتە دابەزی(وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فاصلحوا بينهما) پێشتریش لە باسی سەردانی نەخۆشدا فەرموودەکەی ئوسامەمان هێنابووی تیایدا هاتووە: موسڵمان و بێباوەڕەکان و جولەکەکان کەوتنە قسەوتن تا خەریك بوو بدەن بەیەکدا، پێغەمبەر(ﷺ) دەیهێنانەوە سەرخۆ تا بێدەنگ بوون.

تەبەرانی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناوەتی ئەوس و خەزرەج دوو بەشی پشتیوانان بوون و لە سەردەمی نەفامیدا دوژمنایەتیەکیان هەبوو، کە پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لایان ئەوەنەما و خوا نێوان دڵی هەموویانی یەکخست و لە کۆڕێکدا دانیشتبوون کە یەکێ لە ئەوس دێڕە شیعرێکی وت تیایدا هێرش کردن بوو بۆسەر خەزرەج و یەکێك لە خەزرەجیەکان بە دێڕێکی هێرش بۆ سەر ئەوس وەڵامی دایەوە، بەو جۆرە شەڕە شیعر بوو تا خەریکبوو بدەن بەیەکدا و چەکیان هەڵگرت تا شەڕبکەن، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بیست و خێرا هات وپێ خاوس بوو، کە ئەوانی بینی بانگی کردن(یا ایها الذین امنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن الا وانتم مسلمون)تا ئایەتەکەی خوێندەوە، ئەوانیش چەکەکانیان فڕێداو دەستیانکردە ملی یەکترو دەستیانکرد بە گریان[1][2].

# (بەڵێنی ڕاست بۆ موسڵمانان)

ئیبن عەساکیر لە هاوونی کوڕی ڕەبابەوە هێناویەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر کە سەرەمەرگی هات وتی: بڕۆن بۆ لای فلان چونکە من لەسەر کچەکەم شتێکم وت کە جۆرە بەڵێنێك بوو، حەزناکەم بەسێ یەکی دووڕوویی بگەمەوە بەخوا، من بە شایەتتان دەگرم کە کچەکەمم لێ مارەکرد.[3]

# (دوورگرتن لە بەدگومانی بەرامبەر بە موسڵمانان)

[1] – ضعیف.

[2]– هەیسەمی ج٨ ص٨٠ دەڵێت: تەبەرانی لە المعجم الصغیر هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا غەسانی کوڕی ڕەبیع هەیە کە لاوازە.

[3] – لە کنز العمال ج٢ ص١٥٩ دا واهاتووە.

ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێك دای بە لای کۆڕێکدا لە سەردەمی پێغەمبەردا) و کابرا وەڵامیان دایەوە، کە تێپەڕی یەکێکیان وتی: من زۆر ڕقمە لەم کەسە، وتیان: بەسە، بەخوا پێی دەڵێین، فلان برۆ پێی بڵێ چی وت، کابرا چوو بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و پێی وت چی بووە، کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بنێرە بە دوایدا بزانە بۆچی ڕقیەتی لێم؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو (لم تبغضه ؟) واتە(بۆچی ڕقتە لێی) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دراوسێی ئەوم و ئاگام لێیەتی، نەمبنیوە نوێژێك بکات جگە لەو نوێژەی چاك و خراپ دەیکەن، کابرا پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ئایا دەستنوێژی خراپم بۆ گرتووە یان لە کاتی خۆی دوام خستووە؟ وتی: نا، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دراوسێی ئەوم و ئاگام لێیەتی هەرگیز نەمبینیوە نانی هەژارێك بدات جگە لەو زەکاتەی چاك و خراپ دەیدەن، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ئایا هەرکەس داوای کردبێت لێم ڕێگربووم بیدەمی؟ پرسیاری لێکرد، وتی: نا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دراوسێی ئەوم و ئاگام لێیەتی نەمبینیوە هەرگیز جگە لە مانگی ڕەمەزان کە چاك و خراپ دەیگرێت ڕۆژووی تر بگرێت، کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ئایا بینیویەتی هەرگیز ڕۆژێ ڕۆژوو بشکێنم بەبێ ئەوەی نەخۆش بم یان لە سەفەردابم؟ وتی: نا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من نازانم لەوانەیە لە تۆ باشتربێت)[1].[2]

## (وەسفی چاکی موسڵمان و ئەوەی لێی بێزارە)

تەبەرانی لە عوبادەی کوڕی صامتەوە هێناویەتی یەکێ لە بەنی لەیس هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێندت دەدەم – سێ جار –

---

[1] – صحیح.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص١٧٠ دا واهاتووە.

جاری چوارەم وتی: بۆ وەسفکردنی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ان كان احد من الشعراء يحسن فقد احسنت) واتە(ئەگەر یەکێ لە شاعیران چاك بکات تۆ چاك دەکەیت)[1][2].

تەبەرانی لە خەللادی کوڕی سائیبەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای ئوسامەی کوڕی زەیدو وتی: ڕووبەڕوو وەسفی کردمو بۆیە ڕووبەڕوو وەسفم کردیت چونکە لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو(اذا مدح المؤمن في وجهه ربا الايمان في قلبه) واتە(ئەگەر باوەڕدار لە ڕوو وەسف کرا ئیمان لە دڵیدا زیاد دەکات)[3][4].

ئەبوداود و ترمزی لە مترەفەوە هێناویەتی دەڵێت: باوکم وتی: لەگەڵ وەفدی بەنی عامر چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتمان: تۆ گەورەمانیت، فەرمووی(السيد الله) وتمان: خاوەن فەزڵترینمان و پشودرێژترینمان، فەرمووی(قولوا بقولكم او بعض قولكم ولايستجرينكم الشيطان) واتە(قسەتان بڵێن یان هەندێکی قسەتان بڵێن و شەیتان بەسەرتاندا زاڵ نەبێ زۆر لەخۆبەکەن) ئیبن رزین بەو جۆرە لە نەسائیەوە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیادکردووە فەرمووی(من نامەوێت بەرزم بکەنەوە بۆ سەرو پلەیەك کە خوای گەورە لەوێ دایناوم، من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا بەندەو نێردراوی خوام)[5][6].

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص١١٩ دەڵێت: تیایدا گێڕەرەوەیەك هەیە کە ناوی نەهاتووەو عەتای کوڕی سائیبیش هەیە کەشت تێکەڵ دەکات.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص١١٩ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبن لوهەیعە هەیەو کەسەکانی دیکە جێ متمانەن.

[5] – صحیح.

[6] – لە جمع الفوائد ج٢ ص١٥٩ دا واهاتووە.

ئیبن نەجار لە ئەنەسەوە(ﷺ) هێناویەتی کەسێك بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: ئەی چاکترینمان و کوڕی چاکترینمان و گەورەمان و کوڕی گەورەمان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(قولوا ما اقول لکم ولایستهوینکم الشیطان، انزلوني حیث انزلني الله انا عبد الله و رسوله) واتە(ئەوە بڵێن من پێتان دەڵێم و شەیتان لاتاننەدات، لەو پلەدا دامبنێن کە خوا دایناوم، من بەندەو نێردراوی خوام)[1][2].

بوخاری و موسلیم و ئەبوداود لە ئەبی بەکرەوە(ﷺ) هێناویانە دەڵێت: کەسێك لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) وەسفی کەسێکی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(قوڕت بەسەر، ملی هاوڕێکەت بڕی، هاوڕێکەت بڕی) سێ جار فەرمووی، پاشان فەرمووی(من کان منکم مادحا اخاه لامحالة فلیقل احسب فلانا والله حسیبه، ولایزکي علی الله احدا احسب کذا و کذا ان کان یعلم ذالك منه) واتە(هەرکامتان وەسفی براکەی کرد بە ناچار با بڵێ فلان وادەبینم خوا چاك ببینێ، کەس خۆی پێش خوا نەخات واو وا دەبینم، ئەگەر ئەوەی لێ بزانێ)[3].

بوخاری لە ئەبوموساوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) بیستی کەسێك وەسفی کەسێکی دەکردو زۆر پیایدا هەڵیدەدا، فەرمووی(اهلکتم، او قطعتم – ظهر الرجل) واتە(پشتی کابراتان شکاند)[4].

بوخاری لە الادب المفرد ص٥١ لە ڕەجائی کوڕی ئەبورەجا لە میحجەنی ئەسلەمیەوە(ﷺ) هێناویەتی ڕەجا وتی: لەگەڵ میحجەن ڕۆژێك چووین تا گەیشتینە مزگەوتی خەڵکی بەسرە، بورەیدەی ئەسلەمی لەبەر دەرگایەکی

---

[1] – صحیح.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص١٨٢ دا هاتووە، ئەحمەد لە ئەنەسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٦ ص٤٤ دا واهاتووە.

[3] – لە جمع الفوائد ج٢ ص١٥٠ دا واهاتووە.

[4] – ئیبن جەریر بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٢ ص١٨٢ دا هاتووە.

مزگەوتدا دانیشتبوو، کاتێك لە مزگەوتدا بوو پێی دەوترا(سکبە) زۆر نوێژی درێژدەکردەوە، کە گەیشتینە بەردەرگای مزگەوت عەبایەکی لەسەربوو، بورەیدە تاقەتی خۆش بوو و وتی: ئەی میحجەن وەك سەکبە نوێژدەکەیت؟ میحجەن وەڵامی نەدایەوەو گەڕایەوە، میحجەن وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی گرتمو چووین تا چووینە سەر ئوحودو ڕوانی بەسەر مەدینەدا و فەرمووی(ویل امها من قرية يتركها اهلها كأعمر ماتكون ياتيها الدجال فيجد على كل باب من ابوابها ملكا فلا يدخلها) پاشان دابەزی تا لە مزگەوت بووین پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کەسێکی بینی نوێژی دەکردو رکوعو کڕنووشی دەبرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەوە کێیە؟ منیش پیایدا هەڵمداو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو فلانەو ئەوە فلانە فەرمووی(امسك لاتسمعه فتهلكه) واتە(بەسە بانەیبیستێ قوڕی بەسەردا بکەیت) دەڵێت: چوو تا گەیشتینە لای ژوورەکەی، بەڵام دەستەکانی جووڵاندو پاشان فەرمووی(ان خير دينكم ايسره، ان خير دينكم ايسر)(چاکترینی ئاینداریتان ئاسانتریەتی، چاکترینی ئاینداریتان ئاسانتریەتی) سێ جار فەرمووی.[1]

ئیمامی ئەحمەدیش ج٥ ص٣٢ لە ڕەجائەوە بەو شێوەیە بە دوورو درێژی هێناویەتی بەڵام لە گێڕانەوەکەی ئەودا هاتووە وتی: منیش پیایدا هەڵمدەدا، دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە فلانە ئاواو ئاوایە، فەرمووی(بێدەنگ بە با نەیبیستێ ماڵوێرانی بکەیت) پاشان چوو کە گەیشتە بەردەرگاکەی دەستی گێڕامەوەو دواتر فەرمووی(ان خير دينكم ايسره، ان خير دينكم ايسره، ان خير دينكم ايسره).[2]

ئەحمەد لە ڕێگەی عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق لە میحجەنەوە هێناویەتی و لە گێڕانەوەکەیدا هاتووە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە فلان کەسە ئاواو ئاوایە لە چاکترینی خەڵکی مەدینەیە، یان وتی: لە هەموو خەڵکی مەدینە زیاتر نوێژدەکات،

---

[1] – حسن.

[2] – صحيح.

فەرمووی(لاتسمعه فتهلكه) سێ جار(انكم امة اريد بكم اليسر) واتە(ئێوە ئوممەتێكن ئاسانیتان بۆ ویستراوە)[1].[2]

ئیبن ئەبی شەیبەو بوخاری لە الادب المفرد لە ئیبراهیمی تەیمی لە باوكیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەلای عومەری كوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وەستابووم كەسێك هات بۆ لای و سەلامی لێكرد، كەسێك ڕووبەڕوو وەسفی كرد، عومەر وتی: كابرات سەربڕی خوا سەرت بڕێ، ڕووبەڕوو و لەسەر ئایینی وەسفی دەكەیت ؟![3]

ئیبن ئەبی دونیا لە حەسەنەوە هێناویەتی كەسێك وەسفی عومەری كرد، عومەر وتی: من و خۆیشت ماڵ وێران دەكەیت.[4]

ئیبن ئەبی دونیا لە حەسەنەوە هێناویەتی عومەر(رضي الله عنه) دانیشتبوو و گۆچانێكی پێبوو، خەڵكی لە دەوری بوون كە جاروود(رضي الله عنه) هات، كەسێك وتی: ئەوە گەورەی ڕەبیعەیە، عومەر و ئەوانەی دەوروبەری جاروودیش بیستیان، كە لێی نزیك بوویەوە بە گۆچانەكەی لێیدا، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی لێمدەدەیت؟ وتی: من و تۆ چیمان بەچی؟ مەگەر نەمبیست؟ وتی: دەی بیستت چی بوو؟ وتی: ترسام شتێ لەوە تێكەڵ بە دڵت بێت و بۆیە حەزمكرد دووری بخەمەوە لێت.[5]

موسلیم ج٢ ص٤١٤ – دەقەكە هی ئەوە – و ئەبوداود ج٥ ص٢٤١ لە همامی كوڕی حارسەوە هێناویەتی كەسێك وەسفی عوسمانی(رضي الله عنه) دەكرد، میقداد چوو و لەسەر ئەژنۆ كەوت و كەسێكی زەبەلاح بوو، بە گۆچان دەیدا لەناوچەوانی، عوسمان پێی وت: ئەوە چیتە؟وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی(اذا رايتم المداحين فاحثوا في وجوههم التراب) (ئەگەر ئەوانەتان بینین زۆر مەدح دەكەن خۆڵ بكەن بە ڕوویاندا).

---

[1] – صحيح.

[2] – ئیبن جەریرو تەبەرانی بە كورتی هێناویانە، لە كنز العمال ج٢ ص١٨٢ دا هاتووە.

[3] – كنز العمال ج٢ ص١٨٢.

[4] – لە كنز العمال ج٢ ص١٦٧ دا هاتووە.

[5] – لە كنز العمال ج٢ ص١٦٧ دا هاتووە.

موسـلیمو ترمـزی ج٢ ص٦٢ و بوخـاری لـە الادب المفـرد ٥٠ لـە ڕێگـەی ئەبوموعەممـەرەوە هێناویـەتی کەسێك هەستا وەسفی ئـەمیرێکی دەکـرد، میقداد خـۆڵی بـە ڕوویـداکردو وتـی: پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فـەرمانی پـێ کـردین خـۆڵ بـە ڕووی ئەوانەدا بکەین کە زۆر پیاهەڵدەرن.

بوخـاری لـە الادب المفـرد ص٥١ لـە عـەتای کوڕی ئـەبی رباحـەوە هێناویـەتی کەسێك وەسفی کەسێکی دەکرد لای ئیبن عومـەر(رضي الله عنه) ئیبن عومـەر خـۆڵی پڕاند بـە دەموچـاویدا و وتـی: پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی(اذا رایـتم المـداحین فـاحثوا في وجوههم التراب).[1]

ئەحمەد و تەبەرانی لە عەتای کوڕی رەباحەوە هێناویانە کەسێك وەسفی ئیبن عومـەری دەکـرد، ئـەویش خـۆڵی کـرد بـە ڕوویـدا و وتـی: بیـستم پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویێت(اذا رایتم المداحین فاحثوا في وجوههم التراب)[2].[3]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٠٧ لە نافعو جگە لەویشەوە هێناویـەتی کەسیك بە ئیبن عومەری وت: ئەی چاکترینی خەڵك یان ئەی کوڕی چاکترینی خەڵك، ئیبن عومەر وتی: من چاکترینی خەڵكو کوڕی چاکترینی خەڵك نیم، من بەندەیەکی خوام هیوام لای خوایەو لێی دەترسم، سوێند بەخوا واز لە کەس ناهێنن تا قوڕبەسەری دەکەن.

تەبەرانی لە تاریقی کوڕی شەهابەوە هێناویەتی عەبدوڵڵا وتـی: کـەس دەچێتە دەرەوەو ئایینی پێیە، بەڵام دەگەڕێتەوەو هیچی پێ نیە، دەچێت بۆ لای کەسێ کە هیچی بەدەست نیە بۆخۆی و ئەویش، نەسوودو نە زیان، سوێندی بۆ دەخوات تۆ

[1] – صحیح.
[2] – صحیح.
[3] – هەیسەمی ج٨ ص١١٧ دەڵێت: ئەحمەدو تەبەرانی هێناویانەو سەنەدەکەی صەحیحە.

ئاواو ئاوایت، دەگەڕێتەوەو هیچی لە پێویستیەکەی بەدینەهێناوەو خوای گەورەش لێی تووڕە دەبێت.[1]

## (پەیوەندی خزمایەتی‌و پچڕاندنی)

بەزار لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: تەنگەژەیەکی سەخت تووشی قوڕەیش بوو تا ئەوەی ئێسکی ڕزیویان دەخوارد، کەس نەبوو هێندەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب سادەترین، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە عەبباسی فەرموو(یا عم! ان اخاك ابا طالب قد علمت كثرة عياله وقد اصاب قريشا ماترى فاذهب بنا اليه حتى نحمل عنه بعض عياله) واتە(ئەی مامە گیان! ئەبوتالیبی برات دەزانێت منداڵی زۆرەو قوڕەیش تووشی ئەوە بووە کە دەیبینیت، بمانبە بۆ لای تا هەندێ لە منداڵەکانی بگرینەخۆ) چوون بۆ لای وتیان: ئەبوتالیب باری هۆزەکەت ئەوەیە دەبینیت‌و ئێمە دەزانین تۆ یەکێکیت لەوانە، هاتووین تا هەندێ لە منداڵەکانت لە ئەستۆ بگرین، ئەبوتالیب وتی: عەقلیم بۆ بهێنەو چیتان پێ خۆشە بیکەن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عەلی بردە لای خۆی‌و عەبباسیش جەعفەری بردە لای خۆی، بەردەوام لەگەڵیاندا بوون تا کەوتنە سەرپێ، سولەیمانی کوڕی داود دەڵێت: جەعفەر بەردەوام لەگەڵ عەبباس بوو تا چوو بۆ خاکی حەبەشەو کۆچی کرد بۆ ئەوێ[2][3].

---

[1]- هەیسەمی ج٨ ص١١٨ دەڵێت: تەبەرانی بە چەند سەنەدێك هێناویەتی‌و کەسەکانی سەنەدێکیان صەحیحن.

[2]- ضعیف.

[3]- هەیسەمی ج٨ ص١٥٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی واهەن کە نایانناسم.

بەزار لە جابرەوە هێناویەتی جوەیریە بە پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) وت: من دەمەوێت ئەو غوڵامە ئازاد بکەم، وتی: بیدە بەو خاڵۆیەت کە لەناو دەشتەکیەکاندایە تا شوانی بۆ بکات چونکە ئەوە بۆ پاداشتت باشترە[1].[2]

حاکم لە مێژووەکەیداو ئیبن نەجار لە ئەبوسەعیدەوە هێناویەتی کە ئەم ئایەتە دابەزی(و ات ذا القربى حقه) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(یا فاطمة لك فدك)[3].[4]

موسلیم ج٢ ص٣١٥ لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نزیکایەتیەکم هەیەو سەردانیان دەکەمو ئەوان نایەن، من چاکم لەگەڵیانو ئەوان خراپن لەگەڵم، لەبیریاندامو ئەوان منیان لەبیر نیە، فەرمووی(لئن كنت كما قلت فكأنما تسفهم الملل ولايزال معك من الله ظهير عليهم مادمت على ذالك) واتە(ئەگەر وابیت تۆ دەیڵێیت وەك ئەوە وایە لمی گەرمیان بەسەردا بکەیتو بەردەوام پشتگیری خوات لەگەڵە بەسەریانداو زاڵیت تا کاتێ لەسەر ئەوە بەردەوام بیت).[5]

ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من خزمی نزیکم هەیەو دەچم بۆ لایانو ئەوان نایەنو من لێبووردەمو ئەوان ستەمم لێدەکەنو بەرامبەریان چاکمو لەگەڵم خراپن ئایا دەستگرۆیان بم؟ وتی: دەی هەمووتان بەشدارن، بەڵام فەزڵەکە

---

[1] – صحيح.

[2] – کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، وەك هەیسەمی ج٨ ص١٥٢ دەڵێت.

[3] – ضعيف.

[4] – حاکم دەڵێت: ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی مەیمون لە عەلی کوڕی عابسەوە بە تەنها هێناویەتی. لە کنز العمال ج٢ ص١٥٨ دا واهاتووە.

[5] – بوخاری لە الادب المفرد ص١١ لە ئەبی هورەیرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

وەربگرەو سەردانیان بکە چونکە بەردەوام فریشتەیەکی سەرخەر لەلایەن خواوە لەگەڵتە تا بەو جۆرە بیت.[1]

بوخاری لە الادب المفرد ص١٢ لە ئەبوئەیوب سولەیمانی مەولای عوسمانی کوڕی عەففانەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوهورەیرە ئێوارەی پێنج شەممە شەوی هەینی هات بۆ لامان وتی: هەرکەسێ خزمایەتی بپچڕێنێ با لەلامان هەستێ، کەس هەڵنەسا تا سێ جار وتی، گەنجێ هەستا پوورێکی هەبوو دوو ساڵ بوو نەچووبوو بۆ لای، چوو بۆ لای و ژنەکە وتی: برازاگیان چۆن هاتیت؟ وتی: گوێم لە ئەبوهورەیرە بوو ئاوای وت، وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای بڵێ بۆچی وای وت؟ وتی: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست فەرمووی(ان اعمال بني ادم تعرض على الله تبارك وتعالى عشية كل خميش ليلة الجمعة فلا يقبل عمل قاطع رحم)(کاری مرۆڤەکان ئێوارەی هەموو پێنج شەممەیە شەوی هەینیەك دەخرێتە ڕوو لە خزمەت پەروەردگاردا، کارو کردەوەی ئەو کەسە قبوڵ ناکرێت کە خزمایەتی دەپچڕێنێت).[2]

تەبەرانی لە ئەعمەشەوە هێناویەتی ئیبن مەسعود دوای نوێژی بەیانی لە بازنەیەکدا دانیشتبوو وتی: سوێندی هەرکەس دەدەم پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندووە کە لە لامان هەستێ، چونکە ئێمە دەمانەوێت لەخوا بپاڕێینەوەو دەرگاکانی ئاسمان بۆ ئەو کەسانە داخراون[3].[4]

---

[1]– لە سەنەدەکەدا حەجاجی کوڕی ئەتەئە هەیە کە مودەللەسەو کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، وەك هەیسەمی ج٨ ص١٥٤ دەڵێت.

[2] – ضعيف.

[3] – ضعيف.

[4]– هەیسەمی ج٨ ص١٥١ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن بەڵام ئەعمەش ئیبن مەسعودی نەبینیوە، تەواو.

# (بەشی دەیەم)

## (ئاکاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵان و ڕەوشتیان چۆن بوو و چۆن لە نێوان خۆیاندا بە جوانترین ئاکار ڕەفتاریان دەکرد)

# (بەشی دەیەم)

# (ئاکاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵان و ڕەوشتیان چۆن بوو و چۆن لە نێوان خۆیاندا بە جوانترین ئاکار ڕەفتاریان دەکرد)

## (ڕەوشتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

موسلیم لە سەعدی کوڕی هیشامەوە هێناویەتی دەڵێت: پرسیارم کرد لە دایکی باوەڕداران عائیشە(رضي الله عنها) وتم: سەبارەت بە ڕەوشتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قسەم بۆ بکە، وتی: مەگەر قورئانت نەخوێندۆتەوە؟ وتم: با، وتی: ئاکاری قورئانی بوو[1]. [2] ئیبن سەعد ج١ ص٩٠ لە سەعدی کوڕی هیشام لە عائیشەوە بەو جۆرە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد کردووە قەتادە وتی: قورئان جوانترین ئاکاری مرۆڤەکانی هێناوە.[3]

یەعقوبی کوڕی سوفیان لە ئەبی دەرداوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە لەسەر ئاکاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئاکاری قورئانی بوو بۆ ڕەزامەندی قورئان ڕازی و بۆ توورەیی قورئان توورە دەبوو، بەیهەقی لە زەیدی کوڕی باینووسەوە هێناویەتی بە عائیشەمان وت: ئەی دایکی باوەڕداران ئاکاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چۆن بوو؟ ئەویش باسی کرد و تیایدا هاتووە پاشان وتی: سورەتی(مؤمنون)ت خوێندووەتەوە(قد افلح المؤمنون) تا دە ئایەت، وتی: ئاکاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەو جۆرە بوو.[4]

---

[1] – صحيح.

[2] – ئەحمەدو جوبەیری کوڕی نەفیرو حەسەنی بەسری لە عائیشەوە بەو جۆرە هێناویانە، لە البدايه والنهايه ج٦ ص٣٥ دا هاتووە.

[3] – ئەبونەعیم لە الدلائل النبوه ص٥٦ لە جوبەریر لە عائیشەوە بەو جۆرە هێناویەتی و ئیبن سەعد ج١ ص٩٠ لە مەسروق لە عائیشەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[4] – نەسائی هێناویەتی وەك لە البدايه والنهايه ج٦ ص٣٥ دا هاتووە.

ئەبونەعیم لە الدلائل ص٥٧ لە عروەوە لە عائیشەوە( رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کەس لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئاکاری جوانتر نەبوو، هیچکام لە هاوەڵان و ژنو کەسو کاری بانگیان نەکردووە مەگەر ئەوەی دەیوت بەڵێ بەسەرچاو بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت(وانك لعى خلق عظيم)(بەراستی تۆ لە بەرزترین پلی ئاکاری بەرزدایت).

ئەبی شەیبە لە قەیسی کوڕی وەهب لە کەسێکی بەنی سراتەوە دەڵێت: بە عائیشەم وت: لەسەر ئاکاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قسەم بۆ بکە، وتی: قورئانت خوێندوەتەوە(وانك لعى خلق عظيم) وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هاوەڵانی بوو، خواردنێکم بۆ ئامادەکردو حەفسەش بۆی ئامادەکردو ئەو پێشکەوت، منیش بە کەنیزەکەکەم وت برۆ قاپە خواردنەکەی قوڵپ بکەرەوە، خەریکبوو بیخاتە بەردەم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە قوڵپی کردەوەو خواردنەکە ڕژا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خواردنەکەی سەرزەوی کۆکردەوەو خواردیان، دواتر قاپەکەی خۆمم نارد پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆ حەفسەو فەرمووی(خذوا ظرفا مكان ظرفكم وكلوا ما فيها)(قاپێ بگرن لەبری قاپەکەتانو چی تیادایە بیخۆن) دەڵێت: لە ڕوخساری پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) هیچم بەدینەکرد[1][2].

ئەبونەعیم لە الدلائل ص٥٧ لە خارجەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی دەستەیەك هاتن بۆ لای باوکی زەیدی کوڕی سابت و وتیان: لەسەر هەندێ ڕەوشتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قسەمان بۆ بکە، وتی: من دراوسێی بووم ئەگەر سروشی بۆ دابەزیایە دەینارد بە شوێنمدا دەچووم بۆ لای و سروشم دەنووسیەوە، ئەگەر باسی دونیامان بکردایە باسی دەکردو ئەگەر باسی ڕۆژ دواییمان بکردایە لەگەڵماندا

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٤ ص٤٤ دا هاتووە.

باسی دەکردو ئەگەر باسی خواردنمان بکردایە باسی دەکرد، هەموو ئەوەم بۆ وتن بەسە.[1]

تەبەرانی لە صەفیەی کچی حەییەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کەسم نەدی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئاکار جوانتر بێت، دەمدی لە خەیبەر بەشەو لەسەر پشتی وشترەکەی سواربوو، من باوێشکم دەدا سەرم دای لە پشتەوەی بارەکە، بە دەستی گرتمی فەرمووی(یا هذه مهلا یا بنت حيي مهلا) واتە(ئەی فلان کچ لەسەرخۆ، ئەی کچی حویەی لەسەرخۆ) تائەوەی گەیشتینە(صه هباء) فەرمووی(اني اعتذر اليك يا صفية مما صنعت بقومك انهم قالوا لي كذا) واتە(ئەی صەفیە من پۆزشت بۆ دێنمەوە کە وامکرد بە هۆزەکەت ئەوان وایان پێ وتم)[2][3].

ئەبونەعیم لە الدلائل ص٥٧ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە هەموان بە سۆزتر بوو، سوێند بەخوا لە ڕۆژی سارددا باکی نەبوو بۆ کۆیلەو بێوەژن و منداڵ تا ئاوی بۆ بێنێ و دەست و دەموچاوی بشوات، هەرکەس پرسیاری لێی هەبوایە گوێی لێ دەگرت و دەوەستا تا ئەو دەچوو، هەرکەس دەستی بۆ ببردایە دەستی پێ دەداو لاینەدەبرد تا ئەو کەسەی تر دەستی لاببردایە.

موسلیم ج٢ ص٢٥٦ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر نوێژی بەیانی بکردایە خزمەتکارانی مەدینە قاپی خۆیان

---

[1]- ترمزی ص٢٥ بە هەمان شێوە هێناویەتی بەیهەقیش هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٦ ص٤٢ دا هاتووە، تەبەرانی هێناویەتی، لە الجمع ج٩ ص١٧ دا هاتووەو دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە. ئیبن ئەبی داود و ئەبویەعلا و ڕەویانی و ئیبن عەساکیر هێناویانە، لە المنتخب ج٥ ص١٨٥دا هاتووە، ئیبن سەعد ج١ ص٩٠ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] - ضعیف.

[3]- هەیسەمی ج٩ ص١٥ دەڵێت: ڕەویانی و ئەبویەعلا بە کورتی هێناویانەو کەسەکانی سەنەدەکانیان جێ متمانەن جگە لە ڕەبیعی برازی صەفیە کە نایناسم.

دەهێنا و ئاوی تێدابوو، چی قاپێ بهێنرایە دەستی دەخستە ناوی، جار هەبوو لە بەرەبەیانی سارددا دەهێنرا دەستی تێدا دەشۆرد.

یەعقوبی کوڕی سوفیان لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر تەوقەی لەگەڵ پیاوێ بکردایە دەستی لانەدەبرد تا ئەو دەستی لابردایە، ئەگەر ڕووی بکردایەتە کەسێ ڕووی لانەدەبرد تا کابرا لای بکردایەتەوە، نەدەبینرا ئەژنۆکانی پێش بخات لەبەردەم کەسێکدا کە لە لای دانیشتووە[1,2].

ئەبوداود لە یەعقوب لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هەرگیز کەسم نەدیوە چپە بکات بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تا ئەوەی سەری بۆ دەچەماندەوە تا کابرا سەری لار دەکردەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی هەر کەسی بگرتایە بەری نەدەدا تا کابرا دەستی لابردایە[3,4].

بەزار و تەبەرانی لە ئەبو هوورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی هەرکەسی بگرتایە دەستی لانەدەبرد تا کابرا دەستی لادەبرد، ئەژنۆیشی لە ئەژنۆی ئەوەی پاڵی زیاتر نەدەچوو، هەرکەس تەوقەی لەگەڵ بکردایە ڕووی تێوە دەکرد و ڕووی وەرنەدەچەرخاند تا کابرا لە قسەکەی دەبوویەوە.[5]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی ئەگەر پیرەژنێك لە مەدینە بهاتایە دەستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ی دەگرت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەستی لا نەدەبرد تا ئەو دەستی

---

[1] - ضعیف.

[2] - ترمزی و ئیبن ماجە هێناویانە، هەروەك لە البدایە والنهایە ج٦ ص٣٩ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج١ ص٩٩ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[3] - حسن.

[4] - ئەبو داود بە تەنها هێناویەتی، البدایە و النهایە ج ٦ ص٣٩.

[5] - سەنەدەکەی تەبەرانی حەسەنە وەك هەیسەمی ج٩ ص١٥ دەیڵێت.

لادەبرد،[1] ئیبن ماجە هێناویەتی، ئەحمەد هێناویەتی ئەگەر کەنیزەکێکی مەدینە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ی بگرتایە دەیبر تا پێویستی یەکەی بەجێ بگەیەنێت.[2]

موسلیم لە صەحیحەکەیدا ج٢ص٢٦٦ لە ئەنەسەوە هێناویەتی ئافرەتێک عەقڵی تەواو نەبوو وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیشم پێتە، فەرمووی(ئەی دایکی فلان بزانە چ کۆڵانێکت دەوێت تا پێویستیەکەت بەجێ بگەیەنم) لەگەڵی بە چەند ڕێگایەکدا چوو تا ئیشەکەی تەواو بوو.[3]

تەبەرانی لە موحەممەدی کوڕی مەسلەمەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە سەفەرێك هاتمەوە و پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرتم و دەستی لا نەبرد تا من دەستم لابرد.[4]

مالیك لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوو کاردا سەرپشك بوایە ئاسانەکەی دەکرد ئەگەر تاوان نەبوایە، ئەگەر تاوان بوایە لە هەمووان زیاتر لێی بە دوور دەبوو، هەرگیز ڕێی بە دەروونی نەدەدا سنووری خوا بشکێنێ تا خوای لێ برەنجێ.[5]

ئەحمەد لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی هەرگیز نەیداوە لە خزمەتکارێك و ژنێك و بە دەستی نەیداوە لە هیچ مەگەر لە جیهادی ڕێی خودا، ئەگەر سەرپشکی دووشت بوایە ئاسانترینیان لای

---

١ - صحيح.

[2]- بوخاری لە صەحیحەکەیدا بە موعەللەقی هێناویەتی، لە البدایە و النهایە ج٦ ص٣٩ دا هاتووە.

[3] - ئەبو نەعیم لە دلائل النبوە ص٥٧ لە ئەنەسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[4] - لە سەنەدەکەدا جلدی کوڕی ئەیوب هەیە کە لاوازە وەك هەیسەمی ج٩ ص١٧ دەڵێت.

[5]- بوخاری و موسلیم هێناویانە. هەروەك لە البدایە و النهایە ج ٦ ص٣٦ دا هاتووە، ئەبو داود و نەسائی و ئەحمەد هێناویانە، لە کنز العمال ج٤ ص٤٧ دا هاتووە، ئەبو نەعیم لە الدلائل ص٥٧دا هێناویەتی.

خۆشەویستتربوو بە مەرجێك تاوان نەبووایە، ئەگەر تاوان بووایە لە هەمووان لێی دوور تر دەبوو، ڕێی بە دەروونی خۆی نەدەدا بۆ شکاندنی سنووری خودا بەڵکو بڕیاری خوای پێشدەخست.[1]

ترمزی لە الشمائل ص٢٥ لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)م نەدەبینی ئەگەر ستەمێکی لێبکرایە هەوڵی تۆڵەی بدایە ئەگەر شکاندنی سنوری خوای تێدا نەبوایە، ئەگەر سنوری خوا بشکێنرایە لە هەمووان زیاتر توورە دەبوو، لە نێوان دووکاردا سەرپشك بکرایە ئاسانترینیانی هەڵدەبژارد بە مەرجێك تاوان نەبوایە[2].[3]

ئەبو داودو تەیالسی لە ئەبوعەبدوڵڵای جەدەلیەوە هێناویانە دەڵێت: لە عائیشە پرسی بیستم لەسەر ئاکاری پێغەمبەر(ﷺ) دەیوت خراپەکار و هاوارکەری ناوبازاڕ نەبوو، بەرامبەر خراپە خراپەی نەدەنواند، بەڵکو لێبوردە بوو، یان لێخۆشبوونی هەبوو- ئەبو داود دوودڵ بوو-[4].[5]

یەعقوبی کوڕی سوفیان لە صاڵحی مەولای تونئەمەوە هێناویەتی ئەبو هورەیرە وەسفی پێغەمبەری دەکرد و دەیوت یەکپارچە لایدەکردەوە، بە دایك و

---

[1]- لە البدایە و النهایەج٦ص٣٦دا هاتووە. موسلیم ج٢ص٢٥٦ و ئەبو نەعیم لە دەلائل بە کورتی و عەبدوڕەزاق و عەبدی کوڕی حمید و حاکم وەك فەرموودەکەی ئەحمەد هێناویانە، هەروەك لە کنز العمال ج٤ ص٤٧ دا هاتووە.

[2] - صحیح.

[3] - ئەبویەعلا و حاکم هێناویانە، لە کنزالعمال ج٤ ص٤٧دا هاتووە.

[4] - صحیح.

[5]- ترمزی هێناویەتی و دەڵێت حەسەنی صەحیحە، لە البدایە و النهایە ج٦ ص٣٦ دا هاتووە و ئیبن سەعد ج١ ص٩٠ لە ئەبوعەبدوڵلا لە عائیشەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەحمەد و حاکمیش هێناویانە لە کنزالعمال ج٤ ص٤٧دا واهاتووە.

باوکمەوە بە قوربانی بم خراپەکار و خراپەنوێن و هاوارکەری بازاڕ نەبوو، ئادەم ئەمەی بۆ زیاد کردووە، پێشتریش و دواتریش کەسی وام نەدیوە[1].

ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جنێو بڵێ و نەفرینکار و خراپەکار نەبوو، لە کاتی سەرکۆنەدا پێی دەفەرموین(ماله تربت جبينه) بوخاری هێناویەتی، بوخاری لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: خراپەکار و خراپەنوێن نەبوو و دەیفەرموو(ان من خياركم احسنكم اخلاقا)(لە چاکترینتان ئەوانەن چاکترین ئاکارتان هەبێ)[2].

موسلیم ج٢ ص٢٥٣ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چوویە مەدینە ئەبوتەلحە دەستانی گرتم و بردمی بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەنەس کوڕێکی ژیرە با خزمەتت بکات، دەڵێت لە ماڵ و لە سەفەردا خزمەتم کرد، سوێند بەخوا هەرچیم کردبێت نەیفەرمووە بۆچی واتکرد؟ یان شتێ نەمکردبێ نەیفەرمووە بۆچی ئەوەت نەکرد؟ هەروەها لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جوانترین ئاکاری هەبوو، ڕۆژێك ناردمی بۆ کارێك وتم بەخوا ناچم بۆ ئەو کارەی پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردم، چووم دام بەلای منداڵاندا لە بازاڕدا یارییان دەکرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە پشتەوە سەرشانەکانی گرتم، سەیر دەکەم پێدەکەنی و دەیفەرموو(ئەی ئەنەس بڕۆ بۆ ئەوەی فەرمانم پێ کردیت) منیش وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا دەچم دەڵێت: سوێند بەخوا نۆ ساڵ خزمەتم کرد نەمبینی شتێ بکەم بڵێ بۆچی واتکرد یان شتێ نەکەم بڵێ بۆچی ئەوەت نەکرد؟ هەروەها لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)م کرد سوێند بەخوا هەرگیز ئۆفێکی پێ نەوتم و نەیدەوت بۆ ئەوەت کرد یان ئەوەت نەکرد؟

---

[1] – صحيح.

[2] – موسلیم هێناویەتی، لە البدايه و النهايه ج٦ ص٣٦ دا هاتووە.

بوخاری لە ئەنەسەوە بەو شێوە هێناویەتی، ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)م کرد هەر فەرمانێکی پێ کردبم و نەمکردبێ سەرکۆنەی نەکردووم، ئەگەریش یەکێك لە کەس وکاری سەرکۆنەی بکردمایە دەیفەرموو(دعوه، فلو قدر ان یکون کان) (وازی لێ بێنن ئەگەر قەدەر وابوایە ببوایە دەبوو).[1]

ئەبو نەعیم لە الدلائل ص٥٧ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ساڵانێك خزمەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)م کرد و هەرگیز قسەیەکی پێ نەوتم و لێی نەدام و دڵی نەڕەنجاندوم و پیامدا هەڵنەشاخاوە و مۆنیی نەنواند و فەرمانێکی پێ نەکردم کەمترخەمی بنوێنم و لەسەری سەرکۆنەم بکات، ئەگەر کەسیان سەرکۆنەیان بکردمایە دەفەرموو(دعوه فلو قدر شيء لكان)(وازی لێبێنن ئەگەر قەدەری شتێ بوایە دەبوو).

ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ مەدینە و من ئەو کاتە هەشت ساڵان بووم، دایکم بردمی بۆ لای و وتی ئەی پێغەمبەری خوا پیاوان و ژنانی پشتیوانان خەڵاتیان کردوویت جگە لە من منیش بەس ئەم کوڕەم هەیە لێم قبوڵ بکە تا خزمەتت بکات، دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)م کرد هەرگیز لێ نەدام و قسەی پێ نەوتم و مۆنیی لە ڕوومدا نەنواند.[2]

[1] – لە البدایە و النهایە ج٦ ص٣٧دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٧ ص١١.

[2] – لە کنزالعمال ج٧ ص٩دا واهاتووە.

# (ڕەوشتی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئـەبو نـەعیم لـە الحلیـە ج١ ص٥٦ لـە عەبـدوڵلای كـوڕی عومـەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سێ كەس لە قورەیش بوونە ڕوو و دیاری خەڵك و جوانترین ئاكاریان هەبوو و لە هەمووان شەرمنتر بوون ئەگەر قسەیان بۆ بكردیتایە درۆیان نـەدەكرد و ئەگـەر قسەت بـۆ بكردنایـە بـە درۆیـان نەدەخـستیتەوە، ئەبوبـەكری صدیق(رضي الله عنه) و عوسمانی كوڕی عەففان(رضي الله عنه) و ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاح(رضي الله عنه).

تەبـەرانی لـە عەبدوڵلای كـوڕی عـەمرەوە هێناویـەتی دەڵێـت: سـێ كەسـی قورەیش دیارترینی خەڵك و بە ئاكارترین و بەشەرمترین بوون، ئەبوبەكر و عوسمان و ئەبوعوبەیدە[1][2].

یـەعقوبی كـوڕی سـوفیان لـە حەسـەنەوە هێناویـەتی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ما من احد من اصحابی الا لو شئت لاخذ علیه خلقه لیس اباعبیده بن الجراح)(هەركام لە هاوەڵانم بتەوێت لە ئاكاریدا شتێكی لێ بە ڕەخنە دەگریت جگە لە ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاح)[3].

تەبەرانی لە عەبدوڕەحمانی كوڕی عوسمانی قورەیشیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ لای كچەكەی كە سەری عوسمانی دەشۆرد، فەرمووی(یا بنته احسنی الی ابی عبدالله فانه اشبه اصحابی بی خلقا) (كچی شیرینم لەگەڵ

---

[1] - ضعیف.

[2] - لە الاصابە ج٢ ص٢٥٣دا هاتووە دەڵێت لە سەنەدەكەیدا ئیبن لوهەیعە هەیە.

[3] - لە الاصابە ج٢ ص٢٥٣دا دەڵێت: ئەم فەرموودە مورسەلە و كەسەكانی جێ متمانەن، حاكم ج٣ ص٢٦٦ لە حەسەنەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و دەڵێت: فەرموودەكە مورسەلی غەریبە و گێڕەرەوەكانی جێ متمانەن.

ئەبوعەبدوڵڵا چاکەکار بە چونکە لەناو هاوەڵانمدا لە هەمووان زیاتر ئاکاری لە من دەچێت)[1].[2]

هەروەها لە ئەبی هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای ڕوقیەی کچی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ژنی عوسمان(رضي الله عنه) کە شانەیەکی لە دەستدا بون، وتی: ئێستا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە لام چوو سەریم بۆ داهێنا فەرمووی(ئەبو عەبدوڵڵا چۆن دەبینیت؟) وتم: چاکە، فەرمووی(فاكرميه فانه من اشبه اصحابي بي خلقا) (دەی ڕێزی بگرە چونکە لە هەموو هاوەڵانمدا زیاتر لە من دەچێت لە ئاکاردا)[3].[4]

ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی کە مەولای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە جەعفەری فەرموو(اشبهت خلقي و خلقي) (لە ڕووخسار و ئاکاردا لە من دەچیت)[5] ئەویش لە خۆشیدا هەڵقونی، پاشان بە جەعفەری فەرموو(تۆ برا و مەولامانیت) ئەویش لە خۆشیدا هەڵقونی، پاشان بە منی فەرموو(انت مني و انا منك)(تۆ لە منیت و منیش لە تۆم) منیش بە دوای حەعفەردا لە خۆشیدا هەڵقونیم[6].[7]

تەبەرانیش لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە جەعفەری فەرموو(خلقك كخلقي و اشبه خلقي خلقك فانت مني و انت يا علي فمني

---

[1] – حسن.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص١١ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن.

[3] – ضعيف.

[4] – هەیسەمی ج٩ ص٨١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا هەیە لە موتەلیبەوە هێناویەتی کە نایناسم، کەسەکانی دیکە جێ متمانەن، حاکم و ئیبن عەساکیر هێناویانە وەك لە المنتخب ج٥ ص٤دا هاتووە.

[5] – ضعيف.

[6] – ضعيف.

[7] – لە المنتخب ج٥ ص١٣٠دا هاتووە.

و ابو ولدی) (شێوەت لە شێوەی من دەچێت و زیاترین ئاكارت لە ئاكاری من دەچێت بۆیە تۆ لە منیت، تۆیش ئەی عەلی لە منیت و باوكی كوڕەكەمیت).[1]

عقیلی و ئیبن عەساكیر لە عەبدوڵلای كوڕیجەعفەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: فەرمایشتێكم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بیست لەو شتەی سوور لام ئازیزتر بوو، بیستم فەرمووی(جعفر اشبه خلقی و خلقی، و اما انت یا عبدالله فاشبه خلق الله بابیك)(جەعفەر تۆ لە شێوە و ئاكاردا زۆر لە من دەچیت، تۆیش ئەی عەبدوڵلا لە دروستكراوەكانی خوادا لە هەمووان زیاتر لە باوكت دەچیت).[2][3]

ئیبن سەعد ج٧ ص٥٧ لە بەحرییەوە هێناویەتی دەڵێت: خداشی مامم داوای قاپێكی كرد لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی تیایدا دەخوات لە لای ئێمە بوو، عومەر دەیوت بیهێنن بۆم تا پڕی بكەین لە ئاوی زەمزەم و بیهێنین و لێی بخواتەوە و بیكات بەسەر سەر و دەموچاویدا پاشان دزێ هەڵمەتی هێنایە سەرمان و لەگەڵ هەندێ شتی تردا بردی، عومەر هات بۆ لامان دوای ئەوەی دزرابوو، داوای كرد قاپەكەی بۆ بێنینن وتمان: ئەی ئەمیری بڕوادارن لەگەڵ هەندێ شمەكی ترماندا دزرا،وتی: هاوار بۆ باوكی قاپی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەدزێ، سوێند بەخوا قسەی پێ نەوت و نەفرینی لێ نەكرد.[4]

بوخاری و ئیبن مونزیر و ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن مەردەویە و بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویانە دەڵێت: هویەینەی كوڕی حصنی كوڕی بەدر(رضي الله عنه) هات و لای حەرری كوڕی قەیسی برازای دابەزی كە یەكێك بوو لەوانەی عومەر(رضي الله عنه) لە

---

[1] – هەیسەمی ج٩ ص٢٧٢ دەڵێت: تەبەرانی لە مامۆستاكەیەوە ئەحمەدی كوڕی عەبدڕەحمانی كوڕی عقال هێناویەتی كە لاوازە، تەواو.

[2] – ضعیف.

[3] – لە المنتخب ج٥ ص٢٢٢دا هاتووە.

[4] – ئیبن بشران هێناویەتی، لە المنتخب ج٤ ص٤٠٠دا هاتووە.

خۆی نزیك دەكردنەوە و قورئان خوێنانیش لە كۆڕی عومەردا بوون هەر جۆری بن، عویەینە بە برازاكەی وت: برازا گیان لای ئەم ئەمیرە قسەت دەڕوات لە لای مۆڵەتم بۆ وەربگرە ئەویش مۆڵەتی بۆ وەرگرت و چوون بۆ لای، كە چوویە ژوورەوە وتی ئەی كوڕی خەتتاب بەخوا زیادەمان پێنادەیت و بە دادپەروەریش حوكممان ناكەیت، عومەر تووڕە بوو تا خەریك بوو بچێت بۆ لای، حەر وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران خوا بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی فەرموو(خذ العفو و امر بالعرف و اعرض عن الجاهلين) ئەمەش لە نەفامانە بەخوا عومەر هیچی نەكرد تا ئەمەی بەسەردا خوێندەوە و لە بەردەم كتێبی خواشدا بێدەنگ دەوەستا.[1]

ئیبن سەعد لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: هەرگیز نەمدیبوو عومەر تووڕە ببێت، لە لای یادی خوا بكرایە یان بترسێنرایە بە خوا یان كەسێك ئایەتێكی قورئانی لە لا بخوێندایە وازی دەهێنا لە خواستی خۆی، ئەسلەم دەڵێت: بیلال(رضي الله عنه) وتی: ئەی ئەسلەم عومەرتان چۆن دەبینی؟ وتی: چاك بوو ئەگەر تووڕە بوایە زۆر سەخت بوون بیلال وتی: ئەگەر من لە لای بوومایە كاتێ تووڕە دەبوو قورئانم بەسەردا دەخوێند تا تووڕەییەكەی نەمێنێت.

مالیكودار دەڵێت: عومەر ڕۆژێك دەنگی بەسەرمدا بەرز كردەوە و گۆچانێكی بۆ بەرز كردمەوە منیش وتم: خوات بە بیر دێنمەوە، گۆچانەكەی فڕێ دا و وتی شتێكی گەورەت هێنایەوە یادم.[2]

ئیبن سەعد ج٣ ص٨٢ لە عامری كوڕی ڕەبیعەوە دەڵێت: موسعەبی كوڕی عومەیر(رضي الله عنه) خزم و هاوەڵم بوو لەو كاتەوەی موسڵمان بوو تا كوژرا لە ئوحود، لەگەڵمان بۆ هەردوو كۆچەكە هات لە خاكی حەبەشە، لە نێویاندا هاوڕێی من بوو، كەسم نەدی هێندەی ئەو ئاكار جوان بێ و لادانی كەم بێ.

---

[1] – لە المنتخب ج٤ ص٤١٦دا هاتووە.

[2] – لە المنتخب ج٤ ص٤١٣دا واهاتووە.

ئیبن سەعد ج٣ ص١١٠ لە حەببەی کوڕی جوەینەوە هێناویەتی دەڵێت: لە لای عەلی(رضي الله عنه) بووین هەندێ قسەی ئیبن مەسعوودمان هێنا و خەڵکی وەسفیان کرد و وتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران کەسمان نەدی لە ئاکار جوانتر و لە فێرکردندا نەرمتر و لە دانیشتندا باشتر و لە خواترسیدا بەهێزتر بێت لە ئیبن مەسعوود، عەلی وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا لە دڵەوە دەیڵێن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دەی خوایە من بە شایەتت دەگرم منیش وەك ئەوان یان باشتری لەسەر دەڵێم، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا قورئانی خوێند و حەڵاڵی بە حەڵاڵ و حەرامی بە حەرام دانا، شارەزای ئایین و زانای فەرموودە و سوننەت بوو.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٤٧ لە زوهریەوە لە سالمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر(رضي الله عنه) هەرگیز نەفرینی لە هیچ خزمەتکارێ نەکردووە مەگەر ئەوەی ئازادی دەکرد، زوهری دەڵێت: ئیبن عومەر ویستی نەفرین لە خزمەتکارەکەی بکات وتی: خوایە(نەف) تەواوی نەکرد، وتی: ئەوە وشەیەکە حەزناکەم بیڵێم، پێشتریش فەرموودەکەی جابرمان هێنایەوە لەسەر هاندانی هاوەڵان لەسەر بەخشین وتی: موعازی کوڕی جەبەل لە چاکترینی خەڵك بوو لە ڕوودا و لە ئاکاریشدا چاکتر و لە دەست و پەنجەدا لە هەموان باشتر بوو.[1]

---

[1] – حاکم بە دورو درێژی هێناویەتی.

# (نەرمونیانی و لێبوردەیی)

## (نەرمونیانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

بوخاری لە عەبدوڵڵاوە هێناوەیەتی دەڵێت: لە ڕۆژی حونەیندا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەخششی هەندێ کەسی کرد، سەد وشتری دا بە ئەقرەعی کوڕی حابس و هێندەشی دا بە عویەینە و بە هەندێکی دیکەشی بەخشی، یەکێ لەوانە وتی: ئەو دابەشکردنەی لەبەر خوا نیە، وتم: ئەوە دەڵێم بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، چووم و پێم وت، فەرمووی(رحم الله موسى، قد اوذي باكثر من هذا فصبر) (ڕەحمەتی خوا لە موسا لەوە زیاتر ئازار درا، خۆی ڕاگرت).

لە بوخاری و موسلیمدا لە ئەبو سەعیدەوە(رضي الله عنه) هاتووە دەڵێت: لە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین کە شتی دابەشدەکرد خەولخویسرە کەسێکی بەنی تەمیم بوو هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دادپەروەر بە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(هاوار بۆت ئەگەر من دادپەروەر نەبم ئیتر کێ دادپەروەر بێت، بە ڕاستی دۆڕاند و زیانمەندبوو، ئەگەر دادپەروەر نەبم کێ دادپەروەر بێت) عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێم بدە تا بدەم لە ملی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(وازی لێ بێنە، چونکە هاوڵانی دەبن هەرکامتان لە کاتی نوێژی ئەواندا گاڵتەی بە نوێژ و ڕۆژووی خۆی دێت، قورئان دەخوێنن و لە قوڕقوڕاگەیان لانادات، لە ئیسلام دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت سەیری دەکات هیچی تێدا بەدی ناکات دواتر سەیری دەکات هیچی تێدا نابینێ، پاشان سەیری دەکات کە قاچیەتی هیچی تێدا بەدی ناکات پاشان سەیری دەکات هیچی تێدا بەدی ناکات، پێش پیسی و خوێن دەکەوێت بەڵگە و نیشانەیان کەسێکی ڕەشە یەکێ لە بازووەکانی وەك مەمکی ژن یان وەك پارچە گۆشت وایە دێت و دەچێت، لە کاتی پەرش و بڵاوەی خەڵکدا دەردەچن) ئەبو سەعید دەڵێت: شایەتی دەدەم ئەمەم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بیست و شایەتی دەدەم عەلی کوڕی ئەبوتالیب شەڕی کرد لەگەڵیان

و منیش لەگەڵیان بووم، گەڕا بۆ ئەو کەسە و هێنرا، سەیرمکرد وەسفەکەی پێغەمبەر(ﷺ)م بەدیکرد.[1]

بوخاری و موسلیم لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە هێناویەتی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کە مرد کوڕەکەی هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: کراسەکەتم بدەریّ تا تێیدا کفنی بکەوم و نوێژی لەسەر بکەو و داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم، پێغەمبەر(ﷺ) کراسەکەی پێدا و فەرمووی(اذني اصلي عليه) واتە(مۆڵەتمبدە نوێژی لەسەر بکەم) مۆڵەتی بۆ کردەوە، کە ویستی نوێژی لەسەر بکات عومەر رایکێشا و وتی: ئایا خوا ڕێگری نەکردیت کە نوێژ لەسەر دووڕووەکان بکەیت؟ فەرمووی(من لە نێوان دوو سەرپشکدام) خوا فەرمووی(استغفر لهم او لا تستغفر لهم) نوێژی لەسەر کرد، ئەو ئایەتە دابەزی(ولا تصل على احد منهم مات ابدا)(هەرگیز نوێژ مەکە لەسەر یەکێکیان کە دەمرێت)

ئەحمەد لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی مرد پێغەمبەر(ﷺ) بانگکرا تا نوێژی لەسەر بکات، ئەویش چوو کە لەسەری وەستا تا نوێژی لەسەر بکات چووم تا لەبەردەمی وەستام و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نوێژ دەکەیت لەسەر دوژمنی خوا عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کە ڕۆژی فلان و فلان دەیوت – ڕۆژەکانی دەژمارد– دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەی دەکرد تا کە زۆر لەسەری چووم فەرمووی(اخر عني يا عمر اني خيرت فاخترت قد قيل لي استغفر لهم...)(و اعلم اني لوزدت على السبعين غفر له لزدت) دەڵێت: پاشان نوێژی لەسەر کرد و لەگەڵی چوو و لەسەر گۆڕەکەی وەستا تا لێبوویەوە، وتی: سەرم سوڕما چۆن وێرام بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی دانا ترن، سوێند بەخوا هێندەی نەبرد ئەم دوو ئایەتە دابەزین(ولا تصل على احد منهم مات ابدا) پێغەمبەر(ﷺ) دواتر نوێژی لەسەر هیچ دووڕوویەك نەدەکرد و لەسەر گۆڕەکەی

[1] – لە البدایه و النهایه ج٤ ص٣٦٢دا واهاتووە.

نەدەوەستا تا خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی، ترمزی بەو جۆرە هێناویەتی و وتی حەسەنی صەحیحە، بوخاری بە هەمان شێوە هێناویەتی، ئەحمەد لە جابرەوە هێناویەتی ودەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کە مرد کوڕەکەی هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر نەیەیت بۆسەر تەرمەکەی بەردەوام لەسەر ئەوە بە کەم سەیر دەکرێین، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لای و بینی خراوەتە ناو گۆڕەکەی، فەرمووی(افلا قبل ان تدخلوه) (واتەبا پێش ئەوەی بیخەنە ناو بتانوتایە) لە گۆڕەکەی دەرهێنرا و لە پێیەوە تا قاچی و کراسەکەی بە بەردا کرد، نەسائی هێناویەتی، بوخاری لێوەی هێناوە دەڵێت: پاش ئەوەی خرایە ناو گۆڕەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات و فەرمانی کرد دەرهێنراو لەسەر ئەژنۆی دانیشت و جلەکەی کردە بەری[1][2].

ئەحمەد لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەڵێت: کەسێ لە جوولەکە جادووی کرد لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەویش چەند ڕۆژێك بە دەستییەوە دەینالاند، جبریل(علیه السلام) هات بۆ لای و وتی: یەکێ لە جوولەکە جادووی لێ کردوویت و لە فلان بیردا جادووی بۆ داناویت، کەسێ بنیرە با بیهێنێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناردی و دەریانهێنا و هێنایان و کردیەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا وەك ئەوەی کۆڵی سەرشانی لابرێت تا مرد ئەوەی بۆ جوولەکەکە باس نەکرد و نەیدایەوە بە پوویدا(لە ڕوودا بۆی نەڕوانی)[3] نەسائی هێناویەتی: بوخاریش لە عائیشەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جادووی لێکرا تا وای دەبینی چووەتە لای ئافرەتان و نەشدەچوو، سوفیان وتی: ئەوە سەختترین جۆری جادوو بوو؟ فەرمووی(ئەی عائیشە ئایا دەزانیت خوا وەڵامی دامەوە لەو وەڵامەی داوام لێکرد،، دوو کەس

---

[1] – صحیح.

[2] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ ص٣٧٨دا هاتووە.

[3] – صحیح.

هاتن بۆ لام یەکێکیان لای سەرمو ئەوی دیکەش لە خوار پێمەوە، ئەوەی لای سەرم بوو وتی کابرا چیەتی، وتی جادوو لێکراوە، ئەویش وتی کێ جادووی لێکردووە، وتی لوبەی کوڕی ئەعصەم کەسێ لە بەنی زورەیق هاوپەیمانی جوولەکە کە دووڕوو بوو، وتی لە چیدا؟ وتی لە شانەدا، وتی ئەی لە کوێیە؟ وتی لای کونجی شکۆفەو میوەی خورما واتە ناوەکەی، لە ژێر بەردێکدایە لە بیری زەروان، ئینجا چوو بۆ ئەو بیرەو دەریهێناو وتی ئەوە ئەو بیرەیە کە نیشانم درا،دەڵێیت ئاوەکەی تێکەڵ بە خەنە کراوە، درەختەکانی خورماکەشی وەك شاخە شەیتان(سەری شەیتانەکان) دەڵێت کە هێنایە دەر وتم بۆچی ناخەیتەڕوو؟فەرمووی خوا منی شیفا بەخشی و حەز ناکوم لەگەڵ کەسێك شەڕ راگەیەنم).

موسلیم و ئەحمەد هێناویانە، ئەحمەد لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شەش مانگ وای دەزانی دەچێتە لای ژن و نەدەچوو دوو فریشتە هاتن بۆ لای، فەرموودەکە دێنێت.[1]

بوخاری و موسلیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویانە: ئافرەتێکی جوولەکە مەڕێکی ژەهراوی هێنا بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش لێی خوارد، ئافرەتەکە هێنرا بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پرسیاری کرد لەسەری، وتی: ویستم بتکوژم، فەرمووی(ماکان الله لیسلطك علي- او قال علی ذالك) (خوا زاڵت ناکات بە سەرمدا یان فەرمووی بەسەر ئەوەدا) وتیان: دەیکوژیت؟ فەرمووی: نا، ئەنەس وتی: من بەردەوام لە تافەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دا دەمناسیەوە. بەیهەقی لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی: ژنێکی جولەکە مەڕێکی ژەهراوی بەخشی بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش بە هاوەڵانی فەرموو(لایبەن ئەمە ژەهراویە) بە ژنەکەی فەرموو(چی وایکرد دوا بکەیت؟) وتی: ویستم بزانم ئەگەر پێغەمبەر بێت خوا دەتپارێزێت لێی ئەگەریش درۆزن بیت خەڵکی لە دەستت ڕزگاری دەبێت، دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەرەو ڕووی

[1] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص٥٧٤دا واهاتووە.

هیچی نەکرد، ئەبوداود بە هەمان شێوە و ئەحمەد و بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە بە دوورو درێژی هێناویانە، ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە لە لای بەیهەقیەوە هێناویەتی و ئەوەشی زیاد کردووە: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر شتێ لەوەی بەدی بکردایە کەڵەشاخی دەکرد، جارێک سەفەری کرد کە ئیحرامی بەست شتێکی لەو ژەهرە بەدیکرد کەڵەشاخی کرد.[1]

ئەبوداوود لە جابرەوە(ﷺ) هێناویەتی ئافرەتێکی جوولەکە لە خەڵکی خەیبەر مەڕێکی برژاوی ژەهراوی کرد و دواتر خەڵاتی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) باڵەکانی گرت و لیێ خوارد و هەندێ لە هاوەڵانی لەگەڵیاندا خواردیان، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون(دەست هەڵگرن) پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە شوێن ئافرەتەکەدا و پێی فەرمووی(ئەم مەڕەت ژەهراوی کردووە؟) وتی: کێ پێی وتی؟ فەرمووی(اخبرني هذه التي في يدي) واتە(ئەوەی لە دەستمدایە پێی وتم) باڵی مەڕەکە، وتی: بەڵێ، فەرمووی(بەوە چیت دەویست؟) وتی: وتم ئەگەر پێغەمبەر نەبیت زیانمەند نابیت، ئەگەریش پێغەمبەر بیت لە دەستت ڕزگارمان دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) لێی خۆش بوو و سزای نەدا، هەندێ لە هاوەڵان کە لەو مەڕەیان خوارد مردن و پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر خواردنی ئەو خوارادنە لەسەر شانی کەڵەشاخی کرد، ئەبوهیند بە شاخ و شفرە کەڵەشاخەکەی بۆ کرد، ئەبوهیند مەولای بەنی بیازە بوو لە پشتیوانان،[2] ئەبوداوود لە ئەبوسەلەمەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی جابری هێناوە و تیایدا هاتووە بەیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعرور(ﷺ) مرد، تیایدا هاتووە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد ئەو ئافرەتە کوژرا[3] ئیبن ئیسحاق لە مەروانی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەبی سەعیدی کوڕی موعەلاوە

---

[1] - ئەحمەد بە سەنەدی حەسەن هێناویەتی.

[2] - ضعيف.

[3] - صحيح.

هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە نەخۆشی سەرەمەرگیدا کە خوشکی بەیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعرور چوو بۆ لای فەرمووی: ئەی ئوم بیشر(ان هذا الاوان و جدت انقطاع ابهری من الاکله التی اکلت مع اخیك بخیبر) واتە(ئەم ساتانە پچڕانی ئەبهورم بەدی دەکەم لە دەست ئەو خواردنەی لە خەیبەر لەگەڵ براکەت خواردم) ئیبن هیشام وتی: ئەبهور ڕەگی پەیوەست بە دڵە، وتی: موسڵمانان پێیان وایە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوەی خوا بە پێغەمبەرایەتی بەڕێزداری کرد شەهیدیشی پێ بەخشی.[1]

ئەحمەد لە جەعدەی کوڕی خالیدی کوڕی صوممەی خەشنیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی قەڵەوی بینی دەیدا بە سکیدا و دەیفەرموو(لو کان هذا في غیر هذا لکان خیرا لك) (ئەگەر ئەوە جگە لەوە بوایە بە دڵنیاییەوە بۆت باشتر بوو) دەڵێت: کەسێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: ئەم کابرا دەیویست تۆ بکوژێت، فەرمووی(لم ترع و لو اردت ذلك لم یسلطك الله علي) واتە(مەترسە، ئەگەریش بتویستایە ئەوە بکەیت خوا ڕێی پێ نەدەدایت).[2][3]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی حودەیبیە هەشتا کەسی مەککە بە چەکەوە لە بەرەی شاخی(تەنعیم)ەوە دابەزین بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لێیان خۆش بوو و ئەم ئایەتە دابەزی(و هو الذي کف ایدیهم و عنکم و ایدیکم عنهم ببطن مکة من بعد ان اظفرکم علیهم).[4]

---

[1] – موسای کوڕی عوقبە لە زوهری لە جابرەوە بەو شێوە هێناویەتی، تەواو. لە البدایە و النهایە ج٤ ص٢٠٨دا بە کورتی هاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – خەفا ج٢ ص٢٥ دەڵێت: ئەحمەد و تەبەرانی بە سەنەدی صەحیح هێناویانە.

[4] – موسلیم و ئەبو داود و ترمزی و نەسائی هێناویانە.

ئەحمەد و نەسائی لە فەرمووودەکەی عەبدوڵلای کوڕی موغلەفەوە بە دوورو درێژی هێناویانە و تیایدا هاتووە ئێمە بەو جۆرە بووین کەسی(٣٠) گەنج بەرەو ڕوومان هات و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نزای لێکردن و خوای گەورە کەڕی کردن، چووین و گرتنمان پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(هل جئتم في عهد احد؟ او هل جعل لكم احد امانا؟) (ئایا لە بەڵێنی کەسەوە هاتون یان کەس پەنای پێداون؟) وتیان: نا، ئەویش ئازادی کردن، خوایش ئەم ئایەتەی دابەزاند(وهو الذي كف...)[1].[2]

بوخاری و موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە: نوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی هات بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و وتی: دەوس سەرکەش بوون دەی نزایان لێ بکە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕوویکردە قیبلە و دەستەکانی بەرز کردەوە، خەڵکی وتیان: دەوس قوڕ بەسەر بوون، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(خوایە دەوس هیدایەت بدە و بیانهێنە) سێ جار فەرمووی.

---

[1] – صحيح.

[2] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص١٩٢دا هاتووە.

## (نەرمونيانى هاوەڵانى پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

عەبدولغەنى كوڕى سەعيد لە ايضاح الاشكال لە ئەبو زەعراوە هێناويەتى: عەلى كوڕى ئەبوتاليب دەيوت: من و پاكترينى ژنەكانم و چاكەكانى بنەماڵەم بۆ بچووكى نەرمونيانترين بووين و بۆ گەورەيى لە هەمووان داناتر بووين، خوا بە ئێمەوە ڕێگرى لە درۆ كردووە و بە ئێمەوە خوا گەردنى گورگى سەك دەبڕێ و بە ئێمەوە خواى گەورە كۆتى گەردنتان ناهێڵێ و فەتح و داخستن پەيڕەو دەكات، لە منتخب كنزالعمال ج٥ ص٥٠ دا هاتووە، پێشتر قسەى سەعدى كوڕى ئەبى وەقاصمان هێنا: كەسم نەبينيوە خێرا تێگەيشتوو و زۆر ژیر و وردبين و داناتر و زياتر نەرمونيانتربێت لە ئيبن عەبباس(رضي الله عنه).[1]

## (بەزەيى و سۆز)

## (بەزەيى پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

بوخارى و موسليم لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناويانە: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەيفەرموو(اني لادخل الصلاة و انا اريد ان طيلها فاسمع بكاء الصبي فاتجوز في صلاتي مما اعلم من شدة وجد امه من بكائه)(من دەچمە ناو نوێژ و دەمەوێت درێژەى پێ بدەم دەنگى گريانى منداڵ دەبيستم بۆيە لە نوێژەكەم كورت دەكەمەوە لەبەر ئەوەى توندى شەيدايى ديدارى لە تاو گريانى دەزانم).[2]

موسليم لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناويەتى: كەسێك بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ى وت: باوكم لە كوێيە؟ فەرمووى(لە دۆزەخدا) كە كە ڕووخسارى كابراى بينى فەرمووى(باوكى من و باوكى تۆيش لە دۆزەخدان).[3]

---

[1] – ئيبن سەعد لە ڕاوێژى خاوەن ڕاكاندا هێناويەتى.

[2] – لە صفه الصفوه ص٦٦دا واهاتووە.

[3] – موسليم بە تەنها هێناويەتى، لە صفه الصفوه ج١ ص٦٦دا واهاتووە.

بــەزار لــە ئــەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویــەتی: دەشــتەكیەك هــات بــۆ لای پێغەمبــەر(صلى الله عليه وسلم) و لــە شــتێكدا داوای یارمــەتی لــێ كرد،عیكرەمــە دەڵێت: وابـزانم لەسەر خوێن بوو، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) شتێكی پێدا و دواتر فەرمووی(احسنت الیك) واتە(چاكم لەگەڵ نواندی) كابرا وتی: نا، جوانت نەنواند، هەندێ لە موسڵمانان تووڕە بوون و ویستیان هەستن بۆی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی كرد دەست هەڵگرن، كە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا و گەیشتە ماڵەوە دەشتەكیەكەی بانگ كرد بۆ ماڵ و فەرمووی(تۆ هاتیت داوامان لێ بكەیت ئێمەیش پێمان بەخشیت تۆیش ئەوەت وت كە وتت) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شتێكی زیاتری پێ بەخشی فەرمووی(چاكم لەگەڵ نواندی) دەشتەكیەكە وتی: بەڵێ، خوا لە كەس‌وكار و خێڵت پاداشتی خێرت بداتەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(تۆ هاتیت داوامان لێ بكەیت ئێمەیش پێمان بەخشیت تۆیش ئەوەت وت كە وتت و هاوەڵانم لە دەروونیاندا بەرامبەرت شتێكیان هەیە كە چوویت لە بەردەمیاندا ئەوە بڵێ كە لە بەردەم مندا وتت تا ئەوە لە دەروونیانـدا بڕوات)وتی: بەڵێ، كە دەشتەكیەكە هات پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(هاوڕێكەتان هاتبوو بۆ لامان و داوایكرد و ئێمەش پێمان بەخشی، ئەوەی وت كە وتی، ئێمە بانگمان كرد و پێمان بەخشی، بانگەشەی ئەوە دەكات ڕازی بووە، وایە ئەی دەشتەكی؟) وتی: بەڵێ، خوا لە كەس‌وكار و خێڵت پاداشتی خێرت بداتەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(نموونەی من و ئەو دەشتەكییە وەك كەسێك وایە وشترێكی بووبێت لە دەستی ڕایكردبێت خەڵكی شوێنی دەكەون و زیاتر ڕاوەدووی دەنێن، خاوەنی وشترەكە پێیان دەڵێت: ڕێم بدەن لەگەڵ خۆم و وشترەكەم چونكە من نەرم‌ونیانترم لەگەڵی من چاكتر شارەزای هەم بەرەو ڕووی دەڕوات و لە قوشامی زەوی بۆ هەڵگرێ و بانگی دەكات تا دێت وەڵامی دەداتەوە و ڕەشۆكەی دەگرێت،(بارەكەی لەسەر دادەنێ) من ئەگەر گوێڕایەڵی ئێوەم بكردایە كاتێ كابرا ئەوەی وت كە وتی بە دڵنیاییەوە دەچوویە دۆزەخ)[1].[2]

---

[1] – ضعیف.

[2] – بەزار دەڵێت: تەنها لەم ڕووەوە دەیبینین، منیش دەڵێم: لاوازە بە حاڵی بوونی ئیبراهیمی كوڕی حەكەمی كوڕی ئبانەوە. لە تەفسیری ئیبن كەسیر ج٣ ص٤٠٤دا واهاتووە، ئیبن حبان لە

## (بەزەیی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

دەینەوەری لە ئەصمەعیەوە هێناویەتی دەڵێت: خەڵکی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیان(رضي الله عنه) دواند تا عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بدوێنێ لەسەر ئەوەی نەرمونیان بێت لەگەڵیان تا ئەوەی کیژان لە کونجیماڵیاندا دەترسان، عەبدوڕەحمانیش دواندی، ئەویش وتی: من هەر ئەمەم هەیە بۆیان سوێند بەخوا ئەگەر بزانن چ سۆز و میهر و بەزەییەکم هەیە بۆیان کراسەکەم لە گەردنم لادەبەن.[1]

## (شەرم و ئابڕوو)

## (شەرم و ئابڕووی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

بوخاری لە ئەبو سەعیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە بووکی ناو کەژاوە بە شەرمتر بوو لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا ئەگەر ڕقی لە شتێ بوایە لە ڕووخساریدا بەدەر دەکەوت.[2]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناحەزیەکی لە کەسێکدا بەدیکرد پێی ناخۆش بوو، کە هەستا فەرمووی(لو امرتم هذا ان يغسل

---

صەحیحەکەیدا و ئەبو شەیخ و ئیبن جەوزی لە(الوفاو) دا هێناویانە، وەك لە خەفاجی ج٢ ص٧٨ دەڵێت.

[1] – لە منتخب كنزالعمال ج٤ ص٤١٦دا واهاتووە.

[2]– موسلیم هێناویەتی. لە البدایە و النهایە ج٦ ص٣٦دا هاتووە، ترمزی لە الشمل ص٢٦ و ئیبن سەعد ج١ ص٩٢ هێناویانە تەبەرانی لە عمرانی کوڕی حوصەینەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص١٧ دەڵێت: تەبەرانی بە دوو سەنەد هێناویەتی وکەسەکانی سەنەدێکیان صەحیحن، بەزار لە ئەنەسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی وئەوەشی بۆ زیاد کردووە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(الحيا و خير كلە) واتە(شەرم و ئابڕوو هەمووی خێرە) هەیسەمی ج٩ ص١٢ دەڵێت: کەسەکانی هەموویان صەحیحن جگە لە موحەممەدی کوڕی عومەری موقەدمی کە جێ متمانەشە.

عنه هذه الصفرة) دەڵێت: ئەگەر شتێكی لە كەسێ بەدیبكردایە حەزی پێی نەبوایە بەرەو ڕووی نەدەبوویەوە[1].[2]

ئەبوداوود لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر شتێكی لەسەر كەسێك ببیستایە نەیدەفەرموو بۆچی فلان وادەڵێت؟ بەڵكو دەیفەرموو بۆچی كەسانی ئاوا و ئاوا دەڵێن[3]؟[4]

ترمزی لە الشمائل ص٢٦ لە موسای كوڕی عەبدوڵڵای یەزیدی خەتمیەوە لە مەولایەكی عائیشەوە هێناویەتی عائیشە(رضي الله عنها) وتی: سەیری داوێنی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) نەكردووە، یان وتی: هەرگیز سەیری داوێنی پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) نەكردووە.[5]

## (شەرم و ئابڕووی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئەحمەد لە سەعیدی كوڕی عاصەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی عائیشەی ژنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و عوسمان(رضي الله عنه) پێیان وت: ئەبوبەكر داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كرد كە لەسەر جێگەكەی ڕاكشابوو و عەباكەی عائیشەی لەبەر كردبوو، مۆڵەتی ئەبوبەكری دا و هەر وابوو، كاری خۆی بەجێ گەیاند و چوو، عومەر هات و داوای مۆڵەتی كرد و بە هەمان شێوە بوو، عوسمان(رضي الله عنه) دەڵێت: دواتر من داوای مۆڵەتم لێ كرد و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دانیشت و فەرمووی(اجمعي علیك ثیابك) (جلەكەت كۆ بكەرەوە) كارەكەم بە جێ گەیاند و دواتر چووم، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئەبوبەكر و عومەر نەمدی ڕاچڵەكێیت كەچی بۆ

---

[1] - ضعیف.
[2] - ئەبوداود و ترمزی و نەسائی هێناویانە.
[3] - صحیح.
[4] - لە البدایە و النهایە ج٦ ص٣٨دا واهاتووە.
[5] - ضعیف.

عوسمان(رضي الله عنه) واتکرد؟ فەرمووی(ان عثمان رجل حيي و اني خشيت ان اذنت لع على تلك الحالة لا يبلغ الى حاجته)(عوسمان کەسێکی زۆر بە شەرمە و من ترسام ئەگەر لەو بارەدا مۆڵەتی بدەم نەیەت بە دەم پێویستییەکەیەوە) لەیس دەڵێت: دەستەیەکی خەڵك وتیان: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە عائیشەی فەرموو(ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتەکان شەرمی لیٚ دەکەن؟).[1]

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دانیشتبوو و عائیشەش لە پشتیەوە بوو کە ئەبوبەکر داوای مۆڵەتی کرد و هاتە ژوورەوە، پاشان عومەر داوای مۆڵەتی کرد و هاتە ژوورەوە، پاشان سەعدی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) مۆڵەتی وەرگرت و هاتە ژوورەوە، پاشان عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه) داوای مۆڵەتی کرد و هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قسەی دەکرد و ئەژنۆکانی دەرکەوتبوون خێرا ئەژنۆی داپۆشی و کاتیٚ عوسمان(رضي الله عنه) داوای مۆڵەتی کرد بە ژنەکەی فەرموو(استاخري) (وەدواکەوە) بڕێك قسەیان کرد دواتر چوون، عائیشە(رضي الله عنها) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم و هاوەڵانت هاتن و جلەکانت نەخستە سەر ئەژنۆت و منت دوور نەخستەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتەکان شەرمی لیٚ دەکەن؟ سوێند بەوەی گیانمی بە دەستە فریشتەکان بە ڕاستی شەرم دەکەن لە عوسمان وەك چۆن شەرم دەکەن لە خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەگەر کە هاتە ژوورەوە تۆ لە من نزیك بوویتایە هیچ قسەی نەدەکرد و سەری بەرز نەدەکردەوە تا دەچوویە دەرەوە).[2,3]

---

[1]- موسلیم و ئەبویەعلا لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویانە و ئەحمەدیش لە لایەکی دیکەوە فەرموودەکەی عائیشەی هێناوە.

[2]- ضعیف.

[3]- ئەم فەرموودە لەم ڕووەوە غەریبە و زیادەیەکی لەوەی پێشووی هەیە و لاوازییەکیش لە سەنەدەکەیدا هەیە، لە البدایە و النهایە ج٧ ص٢٠٢دا هاتووە، فەرموودەکەی حەفسەش تەبەرانی بە دوورو درێژی و ئەبویەعلا بە کورتی و بە سەنەدی حەسەن هێناویانە و لە

ئەحمەد ج١ ص٧٤ لە حەسەنەوە هێناویەتی و باسی عوسمان(رضي الله عنه) و شەرمی زۆری دەکات و دەڵێت: ئەگەر لە ماڵدا بوایە و دەرگای لەسەر دابخرایە جلەکەی لانەبرد تا ئاو بکات بە خۆیدا شەرم نەیدەهێشت پشتی ڕاست بکاتەوە.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٥٦ بە هەمان شێوە هێناویەتی، سوفیان لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر(رضي الله عنه) وتی: شەرم لە خوا بکەن چونکە من دەچمە سەرئاو و لە تاو شەرمی خوادا سەر دادەنەوێنم.[2]

ئیبن سەعد ج١ ص٢٨٧ لە سەعدی کوڕی مەسعودو و عەمارەی کوڕی غورابی یەحصبیدەوە هێناویانە کە عوسمانی کوڕی مەزعون(رضي الله عنه) هات بۆ لای پێغەمبەر(عليه السلام) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەزناکەم ژنەکەم شەرمگەم ببینێت، فەرمووی(بۆچی؟) وتی: شەرمی لیّ دەکەم و حەزناکەم، فەرمووی(ان الله جعلها لك لباسا و جعلك لها لباسا و اهلي یرون عورتی و انا اری ذالك منهم) (خوا ژنەکەتی کردووە بە پۆشاك بۆ تۆ و تۆی کردووە بە پۆشاك بۆ ئەو و ژنانی من شەرمگەی من دەبینن ومنیش ئەوەیان لیّ دەبینم) وتی: تۆ دەیکەیت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی ئەی ئیتر دوای تۆ کێ بێت؟ کە لای کردەوە و چوو پێغەمبەر(عليه السلام) فەرمووی(ان ابن مظعون لحیي ستیر) واتە(ئیبن مەزعون زۆر شەرمنە و پەردە پۆشکارە).[3]

ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٦ لە ئەبو مجلزەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبو مووسا وتی: من لە ماڵی تاریکدا خۆم دەشۆم و ڕێك ناوەستم تا لەتاو شەرمکردنم

---

هەیسەمی ج٩ ص٨٢ دەڵێت: فەرموودەکەی ئیبن عومەریش ئەبو یەعلا بە هەمان شێوە هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا ئیبراهیمی کوڕی عومەری کوڕی ئبان هەیە کە لاوازە، وەك هەیسەمی ج٩ ص٨٢ دەڵێت.

[1] – هەیسەمی ج٩ ص٨٢ دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

[2] – لە کنزالعمال ج٢ ص١٤٤دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

لە خوای گەورە جلەکەم هەڵدەگرم، ئیبن سەعد ج٤ ص٨٤ لە ئەبومجلزەوە بە هەمان شێوە و لە ئیبن سیرینەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، هەروەها لە قەتادەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبو مووسا ئەگەر لەماڵێکی تاریکدا خۆی بشۆردایە و خۆی دەچەماندەوە تا جلەکەی هەڵدەگرت و بەردەوام نەدەوەستا، هەروەها لە ج٤ ص٨٢ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) دەڵێت: ئەبومووسای ئەشعەری کە دەخەوت لە کاتی خەودا جلێکی دەپۆشت لە ترسی ئەوەی نەوەك شەرمگەی دەربکەوێت، هەروەها لە ج٤ ص٨٤ لە عوبادەی کوڕی نسیەوە هێناویەتی: ئەبومووسا خەڵکێکی بینی بەبێ جل لە ئاودا دەوەستان، وتی: ئەگەر بمرم و دواتر زیندوو ببمەوە و سێ جار ئەوە ڕووبداتەوە لام خۆشترە لەوەی شتی وا بکەم.

ئیبن ئەبی شەیبە و ئەبو نەعیم لە ئەشەج عەبدولقەیسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ان فيك لخلقين يصبهما الله) (دوو ئاکارت تێدایە خودا خۆشی دەوێن) وتم: چین؟ فەرمووی(الحلم و الحياء) (نەرمی و شەرم) وتم: لە کۆنەوە یان تازەی؟ فەرمووی(نا بەڵکو لە کۆنەوە) وتم سوپاس بۆ خوا کە لەسەر دوو ئاکار ڕایهێناوم کە خوا خۆشی دەوێن[1] [2].

---

[1] - صحيح.

[2] - لە المنتخب ج٥ ص١٤٠دا واهاتووە.

# (خاكی بوون)
# (خاكی بوونی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: جبریل(علیه السلام) لە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دا دانیشت و سەیری ئاسمانی كرد فریشتەیەك دابەزی، جبریل وتی: ئەوە فریشتەیە كە لەو كاتەوەی دروستكراوە دادەبەزێت، كە دابەزی وتی: ئەی موحەممەد خوا منی ناردووە بۆ لات حەزت لێیە بتكەمە پاشایەكی پێغەمبەر یان بەندەیەكی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ؟جبریل وتی: لەبەردەم خواتدا خاكی بە ئەی موحەممەد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بل عبدا رسولا) (بەڵكو بەندەیەك وپێغەمبەر)[1].[2]

هەیسەمی لە عائیشەوە(رضي الله عنها) بەو واتایە لەگەڵ زیادەیەك لە كۆتاییەكەی و زیادەیەكی كۆتاییەكەشی هێناویەتی دەڵێت: دوای ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە پاڵدانەوەوە نانی نەدەخوارد و دەیفەرموو(اكل كما ياكل العبد و اجلس كما يجلس العبد) (وەك كۆیلە دەخۆم و وەك كۆیلە دادەنیشم)[3] پێشتریش فەرموودەكەی ئیبن عەبباسمان بەو واتایە لە تەبەرانی و جگە لەویشەوە هێناوە.

تەبەرانی لە ئەبو غالبەوە هێناویەتی دەڵێت: بە ئەبو ئومامەم(رضي الله عنه) وت: فەرموودەیەكمان بۆ بگێڕەوە كە لە پێغەمبەرت(صلى الله عليه وسلم) بیستبێت، وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زیاتر قورئانی دەخوێند و زۆر یادی خوای دەكرد و كەم وتاری

---

[1] – صحيح.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص١٩ دەڵێت: ئەحمەد و بەزار و ئەبویەعلا هێناویانە و كەسەكانی سەنەدی یەكەم و دووەم صەحیحن و ئەبویەعلاش بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی.

[3] – ضعيف.

دەدا و نوێژی درێژ دەکردەوە و حەزی بە خۆبەزلزانی نەبوو لەوەی لەگەڵ هەژار و لاوازدا بگەڕێت تا لە پێویستی و کاری بێتەوە[1][2].

تەیالسی لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) زۆر یادی خوای دەکرد و کەم قسە و گاڵتەی هەبوو و سواری گوێدرێژ دەبوو و جلی خوری دەپۆشی و وەڵامی بانگەوازی مەملووکی دەدایەوە، ئەگەر ڕۆژی خەیبەر لەسەر گوێدرێژێك دەتبینی کە کۆپانەکەی لە لیف بوو.[3] لە البدایە و النهایە ج٦ ص٤٥ دا واهاتووە، وتم: ترمزی لە ئەنەسەوە ئەوەی زیاد کردووە، سەردانی نەخۆشی دەکرد و لەسەر تەرم ئامادە دەبوو.[4]

بەیهەقی لە ئەبوموسا‌وە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) سواری گوێدرێژ دەبوو و خوری دەپۆشی و مەڕی دەدۆشی وخۆی سەرپەرشتی میوانی دەکرد[5]،[6].

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) دەڵێت: لەسەر زەوی دادەنیشت و لەسەر زەوی نانی دەخوارد و مەڕی دەدۆشی و دەچوو بەدەم میوانداری کۆیلەوە لەسەر نانی جۆ[7].[8]

---

[1] – صحیح.

[2] – سەنەدەکەی حەسەنە وەك هەیسەمی ج٩ ص٢٠ دەڵێت: بەیهەقی نسائی لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفاوە بە هەمان شێوە هێناویانە، وەك لە البدایە و النهایە ج٦ ص٤٥ دا هاتووە.

[3] – ترمزی و ئیبن ماجە لە ئەنەسەوە هەندێکی هێناوە.

[4] – ئیبن سەعد ج٢ ص٩٥ لە ئەنەسەوە بە دووورودرێژی هێناویەتی.

[5] – حسن.

[6] – ئەم فەرموودە لەم ڕووەوە غەریبە و نەیانهێناوە و سەنەدەکەی جەییدە، لە البدایە و النهایە ج٦ ص٤٥دا واهاتووە، تەبەرانی بە هەمان شێوە لە ئەبوموساوە هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، وەك هەیسەمی ج٩ ص٢٠ دەڵێت.

[7] – صحیح.

[8] سەنەدەکەی حەسەنە.

هەیسەمی ج٩ ص٢٠ دەڵێت: هەروەها لەوەوە هێناویەتی وتی: کەسی دوورەدەست لە نیوەی شەودا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ خواردنی نانی جۆ میوانداری دەکرد ئەویش دەچوو.[1]

ترمزی لە الشمائل ص٢٣ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) بە هەمان شێوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ نانی جۆ و شتی ڕەقی بە ڕۆن چەور کراو میوانداری دەکرا، ئەویش دەچوو، لە لای جوولەکەیك قەڵغانێکی هەبوو و هیچی بۆ گەڕاندنەوەی بەدی نەکرد تا مرد.[2]

ئەبویەعلا لە عومەری کوڕی خەتابەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێك سێ جار پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بانگ کرد لە هەرسێ جارەکەدا دەیفەرموو(لبیك. لبیك) واتە(بەڵێ قوربان، بەڵێ قوربان).[3][4]

تەبەرانی لە ئەبوو ئومامەوە هێناویەتی دەڵێت ژنێك هەبوو لەگەڵ پیاوان زمانی درێژ بووو جنێوی دەدەا، دای بەلای پێغەمبەردا() کاتێك لە بەرزاییەکدا دانیشتبوو و ئاوگۆشتی دەخوارد، ژنەکە وتی سەیری بکەن وەك کۆیلە دادەنیشێت و دەخوات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (چ بەندەیەك لە من بەندەترە؟) ژنەکە وتی سەیرکەن خۆی دەخوات و بەشی من نادات، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی بخۆ، ژنەکە وتی بە دەستەکانی خۆت بیکە بە دەممەوە، ئەویش وایکرد، ژنەکە وتی

---

[1] – کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، وەك هەیسەمی ج٩ ص ٢٠ دەڵێت.

[2] – صحیح.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٩ ص٢٠ دەڵێت: ئەبویەعلا لە جەبارەی کوڕی مغلسی مامۆستایەوە گێڕاویەتیەوە، ئیبن عومەیر بەجێمتمانە و زۆرینە بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەش صەحیح و جێمتمانەن، ئەبونەعیمیش لە الحلیە و تەمام و خەتیب هێناویانە وەك لە کنزالعمال ج٤ ص٤٥ داهاتووە.

لە پارووی ناودەمی خۆت، ئەویش پێیدا و ژنەکەش خواردی، بەوە ئابروو دایگرت، دوای ئەوە تا مردنی قسەیەکی خراپی بەرامبەر کەسێك نەکرد.[1]

تەبەرانی لە جەریرەوە هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و رەعدە روتێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(هوّن علیك فاني لست بملك انما انا ابن امراة من قريش تاكل القدير) (لەسەر خۆ، وا مەکە، من پاشا نیم، من کوڕی ئافرتێکم لە قورەیش کە گۆشتی وشك دەخوات).[2] بەیهەقی لە ئیبن مەسعوودەوە هێناویەتی کەسێك لە ڕۆژی فەتحدا پێغەمبەری(ﷺ) دواند.[3][4]

بەزار لە عامری کوڕی ئەبی ڕەبیعەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا چووم بۆ مزگەوت و قایشی نەعلەکەی پچڕان نەعلەکەییم هەڵگرت تا چاکی بکەمەوە لە دەستی گرتم و فەرمووی(انها اثرة ولا احب الاثرة)(ئەوە بە چاکترو لەپێشتر دانانەو منیش حەزم لەوە نیە).[5][6]

تەبەرانی لە عەبدوڵلای کوڕی جوبەیری خوزاعیەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەناو هەندێ لە هاوەڵانیدا دەچوو بە ڕێدا جلێکی بە خۆدا دابوو، کاتێ سێبەرەکەی بینی سەری بەرز کردەوە سەیری کرد کەسێ سێبەری بۆ کردووە، وتی مەکە و جلەکەی گرت و لایبرد و فەرمووی(انما انا بشر مثلكم)(منیش کەسێکم وەك ئێوە).[7]

---

[1] – هەیسەمی ج٩ص٢١ دەڵێت سەنەدەکەی لاوازە.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٢٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەس هەیە کە نایناسم.

[3] – صحيح.

[4] – ( بە هەمان شێوە هێناویەتی لە البدايه و النهايه ج٤ ص٢٩٣دا واهاتووە).

[5] – ضعيف.

[6] – (هەیسەمی ج٩ ص٢١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی واهەیە کە نایناسم).

[7] – (کەسەکانی صەحیحن وەك هەیسەمی ج٩ ص٢١ دەڵێت).

بەزار لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی عەبباس وتی: نازانم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەناوماندا مابوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەڵکو کەپرێ دروست بکەین تا سێبەرت بۆ بکات، فەرمووی(لا ازال بين اظهرهم يطاون عقبي و ينازعون ردائي حتى يكون الله يريحني منهم)(بەردەوام بەم شێوە لە نێویاندا دەبم تا پشتم پێشێل بکەن و عەباکەم رابکێشن تا خوا لەدەستیان دەربازم دەکات)[1].[2]

دارمی لە عکرەمەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی عەبباس(رضي الله عنه) وتی: چاك دەزانم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ناوماندا مابوویەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەیانبینم ئازارت دەدەن و تۆزیان ئازارت دەدات، بۆچی کەپرێك دانانێیت تا لەوێدا بیاندوێنیت؟ فەرمووی(لا ازال...) فەرموودەکەی هێناوە، ئەوەشی بۆ زیاد کردووە زانیم کەم لە نێوانماندا دەمێنێتەوە.[3]

ئەحمەد لە ئەسودەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بە عائیشە(رضي الله عنها)م وت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە دەهاتەماڵەوە چی دەکرد؟ وتی: لە یارمەتیدانی ماڵ و خێزانیدا بوو، کە کاتی نوێژ دەهات دەچوو نوێژی دەکرد، (بوخاری و ئیبن سەعد ج١ ص٩١ بە هەمان شێوە هێناویانە)، بەیهەقی لەم ڕووەوە دەڵێت: کەسێك پرسیاری کرد لە عائیشە(رضي الله عنها): ئایا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ماڵەوەیدا ئیشی دەکرد؟ وتی: بەڵێ، نەعلەکانی بەرگ و جلی خۆی دەدوورییەوە وەك هەرکامتان کە لە ماڵەوە دەیکەن.

بەیهەقی لە عروەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بە عائیشەم وت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ماڵەوە چی دەکرد؟ وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مرۆڤێك بوو جلی خۆی پاك و چاك ڕادەگرت و مەڕەکەی دەدۆشی و خزمەتی خۆی دەکرد.[4]

---

[1] – صحيح.

[2] – (کەسەکانی صەحیحن وەك هەیسەمی ج٩ ص٢١ دەڵێت).

[3] – لە المجمع ج٢ ص١٨٠دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٢ ص١٩٣ لە عکرەمەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[4] – (ترمزی لە الشمائل هێناویەتی، لە البدایە و النهایە ج٦ ص٤٤دا هاتووە)، قەزدینی بە لاوازییەك لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پاك و خاوێنی و کاری خۆی

بوخاری لە جابرەوە‌ﷺ هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هات و سەردانی دەکردم و سواری وڵاخ و سواری ئەسپی تاتاری نەدەبوو.[1]

ترمزی لە الشمائل ص٢٤ لە ئەنەسەوەﷺ هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر وڵاخێکی لاواز حەجی کرد و کۆپانێك لەسەر وڵاخەکە بوو کە چوار درهەمی دەکرد، فەمووی(اللهم اجعله حجا لارياء فيه ولا سمعة)(خوایە بە حەجێکی بگێڕە بۆم کە هیچ رووپامایی و ویستێکی دەرکەوتنی تێدا نەبووبێت).[2]

ئەبویەعلا لە ئەنەسەوەﷺ هێناویەتی دەڵێت کە پێغەمبەر(ﷺ) چوویە مەککە خەڵکیی دەوریان دا، سەری لەسەر وڵاخەکەی داناوە لە نیشاندانی لەخواترسی.[3][4]

بەیهەقی لە ئەنەسەوەﷺ هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی فەتحدا هاتە مەککە و وەك ملنەواندن بۆ خوا لەسەر وڵاخەکەی سەری چەماندبوویەوە.[5]

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرﷺ پێی وتم: پێغەمبەر(ﷺ) کە گەیشتە(ذي طوى) لەسەر وڵاخەکەی وەستا و مێزەرەکەی بەسەر و ڕووخسارییەوە پێچابوو و عەبایەکی حبری سوور بوو پێغەمبەر(ﷺ) کە بینی خوا بە فەتح ڕێزداری کرد وەك ملکەچی نواندن بۆ خوا سەری دانەواند تا ئەوەی ڕیشی خەریك بوو دەگەیشتە لا سکی وڵاخەکە.[6][7]

---

نەدەدایە دەس کەست و ئەو سەدەقەش کە دەیبەخشی خۆی بەجێی دەگەیاند، (لە جمع الفوائد ج٢ ص١٨٠دا واهاتووە).

[1] – (لە صفه الصفوه ج١ ص٦٥ دا وهاتووە).

[2] – صحيح.

[3] – ضعيف.

[4] – (هەیسەمی ج٦ ص٦٩ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری مقدمی هەیە کە لاوازە).

[5] – ضعيف.

[6] – صحيح.

[7] – (لە البدايه و النهايه ج٤ ص٢٩٣دا واهاتووە).

تەبەرانی و ئەبویەعلا لە ئەبوهورەیرەوە(ﷺ) هێناویانە دەڵێت: ڕۆژێك چوومە بازاڕ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا لە لای جل و پێخەف فرۆشان دانیشت و شەڕواڵی بە چوار درهەم کڕی و خەڵکی بازاڕیش پێوانەکارییان هەبوو، پێی فەرموو(بیکێشەو زیاتر بیدە بە لای فرۆشیاردا)) پێغەمبەر(ﷺ) شەڕواڵەکانی هەڵگرت و منیش چووم تا لە دەستی بگرم فەرمووی(صاحب الشيء احق بشيئه ان يحمله الا ان يكون ضعيفا فيعجر عنه فيعينه اخوه(المسلم) (خاوەنی شتێك شیاوترە بە شتەکەی تا هەڵیگرێت مەگەر لاواز بێت و نەتوانێت ئەو کاتە برا موسڵمانەکەی یارمەتی بدات) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ شەڕواڵ دەپۆشی؟ فەرمووی(بەڵێ، لە سەفەر و دانیشتن و شەو و ڕۆژ، چونکە من فەرمانم پێ کراوە بە داپۆشین و هیچیش بەدی ناکەم لەم داپۆشەرتر بێت)[1][2].

هەیسەمی لە المجمع ج٥ ص١٢١ لە ئەبوهورەیرەوە(ﷺ) بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەوەی بۆ زیاد کردووە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(بیکێشەو زیاتر بدە بە لای فرۆشیاردا)) پێوانەکار وتی: ئەم قسەم لە کەس نەبیستووە، ئەبوهورەیرە وتی: پێم وت ڕەقی و وشکی لە ئایینتدا بەسە پێغەمبەرەکەت ناناسیت؟! ئەویش خۆی دا بەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) دا تا ماچی بکات، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کشاندەوە و فەرمووی(ئەمە چییە؟ عەجەمەکان ئەوە لەگەڵ پاشاکانیان دەکەن و من پاشا نیم من کەسێکم لە ئێوە) کابراش کارەکەی خۆی کرد[3][4].

---

[1] – موضوع

[2]– ( لە ڕێگەی ئیبن زیادی واستیەوە هێناویەتی و ئەحمەد هێناویەتی و لە سەنەدەکەیدا ئین زیاد هەیە کە خۆی و مامۆستاکەسی لاوازن،لە نسيم الرياچی ج٢ ص١٠٥دا هاتووە).

[3] – ضعيف.

[4]– (هەیسەمی دەڵێت: ئەبو یەعلا و تەبەرانی هێناویانە و لە سەنەدەکەدا یوسفی کوڕی زیاد هەیە کە لاوازە).

# (خاکیبوونی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئیبن عەساکیر لە ئەسلەمەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) هات بۆ شام بە وشترێکەوە، لە نێو خۆیاندا قەسەیان دەکرد، عومەر وتی چاویان لای سوار و کاروێنێکە کە هی بێ ڕەوشتانە.[1]

ئیبن سەعد لە حزامی کوڕی هشام لە باوکییەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری خوڕی خەتتابم(رضي الله عنه) بینی دای بە لای ئافرەتێکدا کە گەنمی دەهاری، وتی: ئاوا ناکرێ، پاشان دارەکەی گرت و وتی: بەو جۆرە، فێری کرد، لە هیشامی کوڕ خالیدەوە دەڵێت: لە عومەری کوڕی خەتتابم بیست دەیوت: هەرکامتان دەست لە گەنم هەڵنەگرێ تا دەچێتە ناو ئاو دواتر کەمەکەمە دەستی لێ هەڵگرێ و بە دارەکەی تێکی بدات، چونکە وا باشترە بۆ کار و گەرمتر و باشتری لەوەدایە بە تەنها بێت.[2]

مروزی لە العیدین لە رزەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتابم(رضي الله عنه) بینی بەپێی پەتی دەچوو بۆ جەژن.[3]

دەینەوەری لە موحەممەدی کوڕی عومەری مەخزومیەوە لە باوکییەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) هاواری کرد نوێژی جەماعەتە،کە خەڵکی کۆ بوونەوە و زۆر بوون چوویە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی پەروەردگای کرد و صەلەواتی دا لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و دوایی وتی: ئەی خەڵکینە بیرم دێ شوانەنیم دەکرد بۆ پوورانم لە بەنی مەخزووم، ئەوانیش مشتێ خورما و مێووژیان پێدەدام منیش هەموو ڕۆژێك وابووم، ئەویش چ ڕۆژێ، دواتر دابەزی و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران زۆر خۆتت

---

[1] – (ئیبن موبارەك هێناویەتی، لە المنتخب ج٤ ص٤١٧دا واهاتووە).

[2] – (لە منتخب کنزالعمال ج٤ ص٤١٧دا واهاتووە).

[3] – (لە المنتخب ج٤ ص٤١٨دا واهاتووە).

عەیبدار کرد، وتی: ئیبن عەوف قوڕت بەسەر بە تەنها بووم دەروونم شتێکی پەیدا کرد، وتی: تۆ ئەمیری باوەڕدارانیت لە تۆ چاکتر کێیە؟ ویستم خۆی بناسێت.[1]

ئیبن سەعد ج۳ ص۲۹۳ لە ئەبوعومەیر حارسی کوڕی عومەیر لە کەسێکەوە بەو واتایە هێناویەتی و لە گێڕانەوەکەیدا هاتووە: ئەی خەڵکینە بیرم دێ هیچ نەبوو بیخۆم بەڵام پوورەکانم لە بەنی مەخزووم بوون، من ئاوم بۆ هەڵدەگۆزین و ئەوانیش بڕێ مێووژیان پێدەدام، لە کۆتاییەکەدا هاتووە من شتێکم لە دەروونمدا بەدی کرد ویستم ئەوەی لە لا نەهێڵم.

دەینەوەری لە حەسەنەوە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) لە ڕۆژێکی گەرمدا دەرچوو و عەباکەی بە سەریەوە بوو غوڵامێك بە گوێدرێژێکەوە هات، عومەر وتی: ئەی غوڵام لەگەڵ خۆت سوارم بکە، ئەویش دابەزی و وتی: سواربە ئەی ئەمیری باوەڕدارارن، وتی: نا، تۆ سوار بەو و منیش لە دواوە، دەتەوێت لەسەر شوێنی خۆش سوارم بکەیت و شوێنە ناخۆشەکەش بۆ خۆت بێت، غوڵامەکە سوار بوو و ئەویش لە دواوە سوار بوو، هاتنە ناو مەدینە و خەڵکی سەیریان دەکرد.[2]

ئیبن سەعد ج۷ ص۹۰ لە سنانی کوڕی سەلەمەی هوزەلیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ هەندێ غوڵامدا چوومە دەر و لە مەدینە بووین، خورمای کەوتووی چێر دارخورماکانمان کۆدەکردەوە، عومەری کوڕی خەتتابمان بە گۆچانەوە بینی، غوڵامەکان کە بینیان بە ناو دارخورماکاندا بڵاوەیان لێکرد، منیش بڕێکم لە چا دانابوو هەستام و وتم: ئەی ئەمیری بڕوادارن ئێستا غوڵامەکانم لەگەڵ بوون و چیم پێیە دەیبەن وتی: نا، بڕۆ لەگەڵم هاتەوە تا لایماڵەوە.

بەیهەقی لە مالیك لە مامیەوە لە باوکییەوە هێناویەتی: عومەر و عوسمانی بینی(رضي الله عنه) لە مەککەوە هاتن و لە(معرس) دابەزین، کە سوار بوون تا بێنە ناو مەدینە

---

[1] – (لە المنتخب ج٤ ص٤١٧دا واهاتووە).

[2] – (لە المنتخب ج٤ ص٤١٧دا واهاتووە).

هەموو کەس غلامێکی بە دواوە بوو، بەو بارەوە هاتنە ناو مەدینەن عومەر و عوسمانیش وایاندەکرد، پێم وت: ویستی خاکیبونە؟ وتی: بەڵێ، لەگەڵ حەزی ئەوەی پیاو شت هەڵگرێت تا وەك پاشاکانی تر نەبن، دواتر باسی کرد خەڵکی چی یان لێهاتووە بەوەی غولامەکانیان لە دوایانەوە دێن و خۆیان سوار بوون، ئەوەی بە عەیەب دانا لەسەریان.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٦٠دا لە مەیموونەی کوڕی مهرانەوە هێناویەتی دەڵێت: هەمەدانی پێی وتم: عوسمانی کوڕی عەففانی(رضي الله عنه) بینی کە لەسەر ولاغێ بوو و غولامێ لە دوایەوە هەبوو ئەو کاتیش خەلیفە بوو.

ئیبن سەعد و ئەحمەد لە الزهد و ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵلای ڕۆمییەوە هێناویانە دەڵێت: عوسمان(رضي الله عنه) خۆی دەست نوێژی شەوی دەگرت، پێی وترا بە خزمەتکارێ بڵێ یارمەتیت بدات، وتی: نا، شەو بۆ ئەوانە لە شەودا پشوو دەدەن،[2] ئیبن موبارەك لە الزهد لە زوبەیری کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی: دایەگەورەی کە خزمەتکاری عوسمان بوو وتی: عوسمان خەوتووانی ماڵی بێدار نەدەکردەوە مەگەر بیزانیایە تەواو بێدارە ئەوکات بانگی دەکرد تا ئاوی دەست نوێژی بدات ساڵیش بە ڕۆژوو بوو.[3]

ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص٦٠ لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانم لە مزگەوتدا بینی ئەمیری باوەڕداران بوو و کەس لە دەوری نەبوو.

ئیبن سەعد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەنیزەکەکانی ناوچەکە مەڕەکانیان دەبرد بۆ لای ئەبوبەکری صدیق، ئەویش پێی دەوتن حەز دەکەم بدۆشم

---

[1] – ( لە کنزالعمال ج٢ ص١٤٣دا واهاتووە).

[2] – ( لە کنزالعمال ج٥ ص٤٨دا هاتووە).

[3] – ( لە الاصابە ج٢ ص٤٦٣ دا واهاتووە).

بەڵام ئیبن عەفر دۆشی؟[1] پێشتر لە ژیانی خەلیفەکاندا ئیبن سەعد و جگە لەویش لە عائیشە و ئیبن عومەر و ئیبن موسەیب و جگە لەوانیشەوە هێناویانە تیایدا هاتووە، کەسێك بازرگان بوو ڕۆژان دەچوو بۆ بازاڕ و کڕین و فرۆشی دەکرد و ڕانە مەڕێکی هەبوو دەیبردن، خۆی دەیبردن و هەندێ جار کەسی تر بۆی دەلەوەڕاندن، مەڕەکانی ناوچەکەی دەدۆشی، کە بەیعەتی خیلافەتی پێدرا یەکێك لە کەنیزەکەکان وتی: ئێستاش شیردەرەکانی ماڵمان بۆ دەدۆشی، ئەبوبەکر وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا دەیدۆشم بۆتان و هیوام وایە ئەوەی چووومەتە ناوی ئاکاری جارانم نەگۆڕێت، مەڕی بۆ دەدۆشین، بە کەنیزەکەکەی وت: حەز دەکەیت بە شێوەی ئیرغا یان تەسریح بیدۆشم ؟ جاریێ دەیوت:بە شێوەی ئیرغاو جاریێ دەیوت بە شێوەی تەسریح، هەرکامیانی بوتایە دەیکرد.

بوخاری لە الادب المفرد ص٨١ لە صاڵحەوە لە دایە گەورەیەوە هێناویەتی عەلیم(رضي الله عنه) بینی بەرهەمێك خورمای کڕی و لەناو توێشوویەکدا هەڵیگرت و پێم وت – یان کەسێ پێی وت – ئەی ئەمیری بڕواداران با هەڵیگرم بۆت، وتی: نا، خاوەن ماڵ(خاوەن شت) شیاوترە بەوەی هەڵگرێت.[2][3] هەروەك لە البدایە و النهایە(ج٨ ص٥) لە صاڵحەوە بە هەمان شێوە ئیبن عەساکیر لە زازان لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی بە تەنها بە بازاڕدا دەگەڕاو والی بوو، ڕێی نیشانی کەس دەدا و بە دوای ونبوودا دەگەڕا و دەچوو بەدەم لاوازەوە و دەچوو بۆ لای بەقاڵ و فرۆشیار و قورئانی بەسەریاندا دەخوێندەوە(تلك الدار الاخرة نجعلها للذين لا يريدون علوا في الارض ولا فسادا)[4] دەیوت: ئەو ئایاتە لەسەر دادپەروەران و خاکیبوانی والیەکان و بەتواناکان بەسەر خەڵکدا دابەزی.[5]

---

[1] – ( لە المنتخب ج٤ ص٣٩١دا هاتووە).

[2] – ضعيف.

[3] – (ئیبن عەساکیر هێناویەتی لە المنتخب ج٥ ص٥٦٠ داهاتووە، ئەبولقاسمی بەغەوی هێناویەتی).

[4] – (الانفال ٨٣).

[5] – (لە منتخب ج٥ ص٥٦دا هاتووە، ئەبولقاسمی بەغەوی بە هەمان شێوە هێناویەتی هەروەك لە البدایە و النهایە ج٨ ص٥دا هاتووە).

ئیبن سەعد۳ ص۱۸ لە جرموزەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلیم(ﷺ) بینی کە لە کۆشك دەردەچوو و دوو پارچە جلی(قوتری) لەبەردا بوو جلیٚ تا نیوەی قاچی، عەباکەشی و گۆچانێکیشی پیٚ بوو بە بازاڕدا دەگەڕا و فەرمانی پیٚ دەکردین لەخوا بترسن و چاك کڕین و فرۆش بکەن و دەیوت: وریای کێشان و تەرازوو بن، دەیوت: فوو مەکەن بە گۆشتدا(گەنی مەکەن).[1]

ئیبن ڕاهەویە و ئەحمەد لە الزهد و عەبدی کوڕی حەمید و ئەبویەعلا و بەیهەقی و ئیبن عەساکیر – بە لاوازی داناوە – لە ئەبومەتەرەوە هێناویانە دەڵێت: لە مزگەوت دەرچووم کەسێك لە دوامەوە هاواری دەکرد جلەکەت هەڵکە چونکە ئەوە بەرامبەر بەخوا نواندنی زیاتری لە خوا ترسیە و بۆ جلەکەشت باشترە، ئەگەر موسڵمانیت لەسەرت هەڵگرە(شتیٚ لە قژت لابە) سەیرم کرد عەلییە و گۆچانێکی پێیە، گەیشتە بازاڕی وشتر فرۆشی و وتی: بفرۆشن و سوێند مەخۆن چونکە سوێند داهات دەبەخشیٚ و بەرەکەت ناهێڵێت، پاشان چوو بۆ لای خاوەن خورما سەیری کرد خزمەتکارێك دەگری، وتی: چیتە؟ وتی: ئەمە خورمایەکی بە درهەمێك پیٚ فرۆشتوم و مەولاکەشم قبووڵی ناکات، وتی: بیبە و درهەمەکەی بدەرەوە چونکە ئەو هیچ بەدەستە وەك ئەوەی ڕازی نەبیٚ، وتم: ئەزانیت ئەمە کێیە؟ وتی: نا، وتم: عەلی ئەمیری بڕواداران، ئەویش خورماکەی ڕشت و درهەمەکەی پێدا و وتی: دەتەوێت ئەمیری بڕوادارانم لیٚ بتۆرێنیت؟ وتی: ئەگەر بیاندەیتەوە لێت نارەنجم و لێت ڕازیم، پاشان دای بە لای خورما فرۆشانی دیکەدا و وتی: لە بازاڕی ئێمەدا ماسی سەرئاو کەوتوو نافرۆشریٚ، پاشان هات بۆ بازاڕی لۆکە فرۆشان وتی: ئەی پیاوی پیر لە فرۆشتنی کراسێکدا بە سیٚ درهەم باشە بجووڵێرەوە، کە زانی کێیە هیچی لیٚ نەکڕی، دواتر چوو بۆ لای یەکێکی دیکە و هەروا بوو، پاشان چوو بۆ لای غولامێك و ئەویش بە سیٚ درهەم کراسێکی لیٚ کڕی و نێوانی ناوکی تا

---

[1] – ( ئیبن عەبدولبر لە الاستیعاب ج۳ ص٤٨دا هێناویەتی).

قولەپێی داپۆشی، خاوەنی جلەکە هات وترا: کوڕەکەت بە سێ درهەم مامەڵەی کراسێکی لەگەڵ ئەمیری باوەڕدارانـدا هەبوو، وتی دەی با دوو درهەمت لێ وەربگرتایە؟ درهەمێکی برد و چوو بۆ لای عەلی و وتی: ئەو دەرهەمە بگرە، وتی: بۆ چی؟ وتی: جلێك بە دوو درهەمە کوڕەکەم بە سێ درهەم پێی فرۆشتیت، وتی: بە ڕەزامەندی خۆم پێی دام، منیش بە ڕەزامەندی ئەو بردم.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج٣ ص٣١٢ لە عەتاوە هێناویەتی دەڵێت: فاتیمەی کچی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەویری دەشێلا و گیسوەکەی خەریکبوو دەگەیشت بە تەشتەکە.

ئیبن سەعد ج٨ ص٦٤ لە موتەلیبی کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی دەڵێت: خوشکەزایەکم لە لادێوە هات بۆ لام کە پێی دەوترا قودامە، پێی وتم: حەزدەکەم سەلمانی فارسی ببینم و سەلامی لێبکەم، چووین بۆ لای و سەیرمانکرد لە مەدائینە و ڕۆژ بیست هەزاری لەگەڵە، بینیمان لەسەر ڕاخەرێکی چنراو لە گەڵای دارخورمایە، سەلاممان لێکرد، وتم: ئەی ئەبوعەبدوڵلا ئەمە خوشکەزایەکمە لە بیابانەوە هاتووە حەزی کرد سەلامت لێ بکات، وتی:(علیە السلام و رحمة الله) وتم: دەڵێ تۆی خۆشدەوێت، وتی: خوای گەورە ئەوی خۆش بوێت.

ئیبن عەساکیر لە حارسی کوڕی عومەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای سەلمان(رضي الله عنه) لە مەدائین و بینیم لە پێستەخۆشکردنیدایە بە دەستەکانی خۆی سەرقاڵە، کە سەلامم لێکرد وتی: لەوێ بە ئێستا دێم بۆ لات، وتم: بەخوا بڕواناکەم بمناسێتەوە، وتی: بەڵێ دەتناسمەوە گیانم گیانتی ناسیەوە پێش ئەوەی بتناسم، چونکە گیانەکان سەربازی بەسەربازکراون و لەبەر خوا ناسان دڵ دەیگرێ و ئەوەی بۆ خوانەبوو ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان.[2]

[1] – (لە المنتخب ج٥ ص٥٧).

[2] – ( لە المنتخب ج٥ ص١٩٦ دا هاتووە، ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص١٩٨ لە حاریسەوە بەدووررو درێژی هێناویەتی).

ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٠١ لە ئەبو قەلابەوە هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای سەلمان(رضي الله عنه) کە هەویری دەشێلا، وتی ئەوە چییە، وتی خزمەتکارەکەمان نارد بۆ کارێك حەزمان نەکرد دووکاری بەسەردا کۆبکەینەوە، وتی، فلأن سەلامت لێدەکات، وتی کەی هاتیت؟ وتم لەوکاتەوە، وتی ئەگەر سەلامەکەت نەگەیاندبایەوە دەبوو بە سپاردەیەك لە لات کەنەت گەیاندبێت.[1]

ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص١٩٨، لە عەمری کوڕی ئەبو قورەی کندیەوە هێناویەتی دەڵێت باوکم پێشنیاری خوشکی خۆی بۆ سەلمان(رضي الله عنه) کرد تا بە هاوسەری بگرێت، ئەویش ئامادە نەبوو مەولایەکی هێنا کە پێی دەگوترا بوقەیرە، ئەبو قورە بیستی کە لە نێوان حوزیفە و سەلماندا شتێ هەبووە، هات بۆ لای و بە دوایدا گەڕا، هەواڵی پێدا کە لە سەوزەکەیدایە، چوو بەرەو ئەوی و پێی گەیشت و زەنبیلێکی پێ بوو کە سەوزەی تێدابوو، تێدابوو گۆچانەکەی کردبوو بەجێدەستی زەمبیلەکەداو لەسەرشانی دانابوو، چووین بۆ لای ماڵی سەلمان چووینە ژوورەوەو وتی: السلام علیکم، پاشان مۆڵەتی ئەبوقورەی دا سەیری کرد ڕاخەرێك هەیە لە سەرەوەی چەند خشتێك هەن و شتێکی کەم هەبوو، وتی: لەسەر ڕاخەری مەولاکەت دانیشە کە بۆ خۆی ئامادەکردبوو.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص١٩٩ لە مەیمونی کوڕی مەهران لە کەسێکی بەنی عەبدولقەیسەوە هێناویەتی دەڵێت: سەلمانم(رضي الله عنه) لەناو سریەکەیدا بینی کە ئەمیری سریەکەبوو لەسەر گوێدرێژێك بوو شەرواڵی پۆشیبوو و قاچەکانی دەهاتن و دەچوون و سەربازانیش دەیانوت ئەمیر هات، سەلمان وتی: خێرو شەڕ دوای ئەمڕۆیە، ئیبن سەعد ج٤ ص٦٣ لە کەسێك لە عەبدولقەیسەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ سەلمانی فارسی بووم کە ئەمیری سریەیەك بوو دای بە لای دەستەیەکی

[1]- (ئیبن سەعد ج٤ ص ٦٤ و ئەحمەد هێناویانە، وەك لە صفە الصفوە ج١ ص ٢١٨ لە ئەبو قولابەوە بە هەمان شێوە هاتووە).

سەربازاندا پێکەنین و وتیان: ئەوە ئەمیرەکەتانە وتم: ئەبوعەبدوڵڵا نابینی چی دەڵێن؟ وتی: وازیان لێ بهێنە چونکە خێرو شەڕ لە دوای ئەمڕۆیە ئەگەر توانیت لە خۆڵ بخۆیت لێی بخۆ و مەبە بە ئەمیری دووان، لە نزای ستەملێکراو و موحتاج بترسە چونکە پەردەی لەنێواندا نیە، هەروەها لە سابتەوە هێناویەتی سەلمان ئەمیری مەدائین بوو بە ئەندەروود و عەبایەکەوە دەچوویەناو خەڵکەوە کە دەیانبینی دەیانوت: کرك امد کرك امد، سەلمان وتی: چی دەڵێن؟ وتیان: دەتچوێنن بە یارییەکی خۆیانەوە. سەلمان وتی: گرفت نیە خێر لەمڕۆ بە دوایە. لە هورەیمەوە دەڵێت: سەلمانی فارسیم لەسەر گوێدرێژێکی بێ بەرگ و کورتان بینی و سەلمان جلێکی کورتی سونبولانی لەبەردابوو کە لە خوارەوە تەسك بوو، سەلمان کەسێك بوو قاچەکانی درێژو قژی زۆر بوو، جلێکە هێندە بەرزبوو نزیکی ئەژنۆکانی بوو، دەڵێت: بینیم منداڵان لە دوایەوە کۆدەبوونەوە، وتم: لە ئەمیر دوورناگرێ، وتی: وازیان لێ بێنە خێرو شەڕ لە ئەمڕۆ بەدواوەیەوە.

ئیبن سەعد ج٤ ص٦٣ لە سابتەوە هێناویەتی سەلمان(رضي الله عنه) ئەمیری مەدائین بوو کەسێکی خەڵکی شام لە بەنی(تیم الله) هات و بارێکی هەنجیری پێبوو، سەلمان ئەندەروەرد و عەبایەکی لەبەربوو، بە سەلمانی وت: وەرە هەڵگرە، سەلمانی نەناسی، سەلمانیش هەڵیگرت، خەڵکی بینیان و ناسیانەوە و وتیان: ئەوە ئەمیرە، وتی: ئەمناسیت؟ سەلمان پێی وت: دەبێت بیگەیەنمە شوێنەکەت. هەروەها لە لایەکی دیکەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەمەشی لەگەڵە: نیەتم لێ هێناوە و دایانانێم تا نەیگەیەنمە ماڵەکەت.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٠٠ لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: سەلمان(رضي الله عنه) بە دەستەکانی خۆی ئیشی دەکرد ئەگەر شتێکی دەست بکەوتایە گۆشت یان ماسی پێیدەکڕی و دواتر توشبوانی نەخۆشی بەڵەکی بانگ دەکرد لەگەڵیان نانی دەخوارد.

ئیبن سەعد لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) ئەگەر کاربەدەستێکی بناردبایە بۆی دەنووسی: گوێڕایەڵی بن تا کاتێك لەگەڵتاندا دادپەروەر بێت، کاتێك حوزەیفەی لەسەر مەدائین دانا نووسی گوێی لێ بگرن و چی لێ داواکردن گوێڕایەڵی بن، حوزەیفە لە لای عومەر بە گوێدرێژێکەوە چوو و کۆڵەکەشی لەسەر گوێدرێژەکە بوو کە گەیشتە مەدائین خەڵکی و دیهقانەکان پێشوازیان لێ کرد؟ وتیان: چیت دەوێ داوامان لێ بکە، وتی: خواردنێك تا بیخۆم و ئالفی ئەم گوێدرێژەم تا کاتێ لەناوتاندام، ماوەیەك لەناویاندا بوو، دواتر عومەر نامەی بۆ نووسی وەرەوە، کە عومەر بیستی دێتەوە لەسەر ڕێگە لە شوێنێکدا کە کەس نەیبینێ قەرەوڵی بۆ گرت، کە عومەر بینی بە هەمان باری سەرەتایەوە هاتووەتەوە چوو بۆ لای و دەستی کردە ملی و وتی: تۆ برای منی و منیش برای تۆم،[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج٢ ص٢٧٧ لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: حوزەیفە(رضي الله عنه) کە هاتە مەدائین لەسەر گوێدرێژێك بوو و بە دەستیەوە نان و پارچە گۆشتێ بوو و لەسەر گوێدرێژەکە نانی دەخوارد. تەلحەی کوڕی مصرف لە گێڕانەوەکەیدا ئەوەشی زیاد کردووە قاچەکانی لە لایەکەوە بەرەو خواربووبوونەوە.

تەبەرانی لە سەلیمی ئەبولهوزەیلەوە هێناویەتی دەڵێت: لە بەردەرگای جەریری کوڕی عەبدوڵلا(رضي الله عنه) بووم کە دەرچوو سواری وڵاخێ دەبوو و غوڵامەکەشی لە دواوە سوار دەکرد.[2]

تەبەرانی بە سەنەدی حەسەن لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە هێناویەتی بە بازاڕدا چوو و کۆڵێ داری پێ بوو، پێی وترا: بۆچی وادەکەیت کە خوا بێباکی

[1] – ( لە کنز العمال ج٧ ص٢٣ دا هاتووە).

[2]– ( هەیسەمی ج٩ ص٣٧٢ دەڵێت: سەلەمە و موحەممەدی کوڕی مەنسوری کولەیبی ناناسم و کەسەکانی دیکە جێ متمانەن، تەواو).

کردوویــت لــەوە؟ وتــی: ویــستم خۆبــەزلزانی دووربخەمــەوە لــە خــۆم، لــە پێغەمبــەرم(صلى الله عليه وسلم) بیــست دەیفــەرموو(لایـدخل الجنـة مـن في قلبـه مثقـال خردلـة مـن کـبر)(ناچــێتە بەهەشــتەوە ئــەوەی وردیلەیــەك خۆبــەزلزانی لــە دڵیــدا هەبێت)(ئەسبەهانیش هێناویەتی بەڵام ئەو دەڵێت:(مثقال ذرة من کبر)[1][2].

عەسکەری لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سێ شت سەری خاکی بوونن بە هەرکەس گەیشتی پێشتر سەلام بکەیت، بە دانیشتنل لە خوارەوەی مەجلیس ڕازی بیت، ڕقت لە ڕووپامایی و ناوبانگ پەیداکردن بێت.[3]

## (گاڵتەو بزەبەخشی)

## (بزەبەخشی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم))

ترمزی لە الشمائل لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ گاڵتەمان بۆدەکەیت؟ فەرمووی (اني لاقول الا حقا)واتە (من تەنها حەق دەڵێم)[4][5].

ئیبن عەساکیر بە لاوازی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێ پرسیاری کردو وتی: ئەرێ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بزەبەخشی هەبووە. وتی: بەڵێ، وتی: چیبووە. ئیبن عەبباس وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جلێکی گەورەی کردەبەری یەکێ لە ژنەکانی و فەرمووی(البسيه واحمدي الله و جري من ذيلك هذا كذيل العروس)واتە(بیکەبەرت و سوپاسی خوا بکەو لە زیادە خشاوی جلەکەت ڕاکێشە وەك هی بووك)[1][6].

---

[1] – صحیح.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٤ ص٣٤٥ دا واهاتووە).

[3] – ( لە کنز العمال ج٢ ص١٤٣ دا واهاتووە).

[4] – صحیح.

[5] – ( بوخاری لە الادب المفرد ص٤١ لە ئەبوهورەیرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[6] – ضعیف.

ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جوانترین ئاکاری هەبوو و برایەکم هەبوو پێی دەوترا ئەبوعومەیر، دەڵێت: وابزانمبرای شیری بوو کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بینی فەرمووی(ئەبوعومەیر نوغەیر چی کرد ؟) (قەناریەکی هەبوو) وتی: یاری پێ دەکات، وتی: کاتێك کاتی نوێژ دەهات و لە ماڵمان دەبوو، ڕاخەرەکەی ژێری بەکاردەهێنا و دواتر ئاوپرژێن دەکرا، پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەڵدەسا و ئێمەش لە دوایەوە دەوەستاین و نوێژی بۆ دەکردین، ڕاخەرەکەیان گەڵای دارخورما بوو.[٢]

بوخاری لە الادب المفرد ص٤٢ بەو دەقە هێناویەتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) تێکەڵی دەکردین تا بە برایەکی بچوکمی فەرموو(ئەی ئەبوعومەیر نوغەیر چی کرد؟)( ئەوە دەقەکەی ترمزیە)، ئیبن سەعد ج٣ ص٥٠٦ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ لای ئەبوتەلحە و کوڕێکی بینی ناوی ئەبوعومەیر بوو بە خەمباری بینی، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی بزەبەخشی لەگەڵ کرد و فەرمووی(چیە ئەبوعومەیر بە خەمبار دەتبینم؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باڵندەکەی کە یاری لەگەڵ دەکرد مرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەبوعومەیر نوغەیر چی کرد؟).

ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویتی کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و داوای کرد شتێکی پێبدات تا بۆ سواری بەکاری بێنێ، فەرمووی(نا حاملوك علی ولد ناقة)واتە(منداڵی وشترێکت پێ دەدەین) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بکەم لە منداڵی وشتر؟ فەرمووی(وهل تلد الابل الا النوق)واتە(مەگەر وشتر هەر لە وشترەوە لە دایك نابێت)[١،٣].

---

[١] – (لە کنز العمال ج٤ ص٤٣ دا واهاتووە).

[٢] – (فەرموودەناسان جگە لە ئەبوداود لە ڕێگەگەلێکەوە لە ئەنەسەوە بە هەمان شێوە هێناویانە. لە البدایەو النهایە ج٦ ص٣٨ دا هاتووە).

[٣] – صحیح.

ئەبوداود لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی وتم:(ئەی دوو گوێ)[2][3].

ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێکی دەشتەکی ناوی زاهر بوو لە لادێوە دیاری دەهێنا بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بیویستایە دەربچێت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئامادەسازی بۆ دەکرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ان زاهرا باديتنا و نحن حاضروه) (زاهر لادێ نشینمانەو ئێمەش شارنشینی ئەوین) ئەو کەسێکی ناشیرین بوو، بەڵام پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خۆشی دەویست، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لای و ئەو شمەکی دەفرۆشت. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە پشتەوە دەستی کردە ملی و کابرا نەیبینی، وتی: بەرمدە ئەوە کێیە، لایکردەوە سەیری کرد پێغەمبەری خوایە، کە پێغەمبەری ناسیەوە پشتی بەسەر سنگی پێغەمبەرەوە نەدەجوڵاند، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو(من يشري العبد) ( کێ کۆیلە دەکڕێت؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من بەبێ نرخ دەبینیت؟ فەرمووی(لكن عند الله لست بكاسد – او قال لكن عند الله انت غال) (تۆ لای خوا بێ نرخ و کەم نیت – یان فەرمووی تۆ لای خوا گرانبەهایت)[4][5].

---

[1]–( ئەبوداودو ترمزی هێناویانەو ترمزی دەڵێت: صەحیحی غەریبە، لە البدایە و النهایە ج٦ ص٤٦ دا هاتووەو بوخاری لە الادب المفرد ص٤١ لە ئەنەسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، ئیبن سەعد ج٨ ص٢٢٤ لە موحەممەدی کوڕی قەیسەوە هێناویەتی بەڵام ئوم ئەیمەنی لە ناوەکەدا واکارەکە بێت).

[2] – صحيح.

[3] – ( لە البدایە والنهایە ج٦ ص٤٦ دا هاتووە)، ترمزی لە الشمائل ص١٥ هێناویەتی و دەڵێت: ئەبوئوسامە دەڵێت واتە بزەبەخشی لەگەڵ کردووە، (ئەبونەعیم و ئیبن عەساکیر هێناویانە وەك لە المنتخب ج٥ ص١٤٣ دا هاتووە).

[4] – صحيح.

[5] – ( سەنەدەکەی جێ متمانەیە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم، ترمزی لە الشمائل و ئیبن حەببان لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی. لە البدایە والنهایە ج٦ ص٤٦ دا هاتووە)، بەزارو

ئەبوداود لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی وەرگرت و دەنگی عائیشەی بیست بەسەر پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بەرزبوویەوە، کە چوویە ژوورەوە گرتی تا لێی بدات و وتی: دەتبینم دەزانیت دەنگ بەرزبکەیتەوە بەسەر پێغەمبەری خوادا، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ڕێی پێ نەدا، ئەبوبەکر بە توورەیی دەرچوو، کە دەچوویەدەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بینیت چۆن ڕزگارم کردیت لە دەست کابرا، ئەبوبەکر چەند ڕۆژێ مایەوە و دواتر مۆڵەتی وەرگرتەوە و چوویەوە سەیری کرد ئاشت بوونەتەوە، پێ وتن: وەك چۆن لە شەڕتاندا بەشدارتان کردم لە خۆشیشتاندا بەشدارم بکەن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(قد فعلنا قد فعلنا)واتە(کردمان کردمان)[1، 2].

ئەحمەد لە عائیشەوە(رضـي الله عنهـا) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بۆ چەند سەفەرێکی چووم و من کیژ بووم و قەڵەو نەبووم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەخەڵکی فەرموو(تقدموا) (پێشکەون) ئەوانیش بڕییان و دواتر بە منی فەرموو(تعالی حتی اسابقك)واتە (وەرە با پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم) پێشبڕکێم لەگەڵ کرد و بردمەوە، لێم بێدەنگ بوو تا گۆشتم گرت بیرم چوویەوە و لەگەڵی چووم بۆ سەفەرێ، بە خەڵکەکەی فەرموو پێشکەون، پێشکەوتن و دواتر فەرمووی(وەرە با پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم) لێی بردمەوە و پێکەنی و دەیفەرموو(هذه بتلك)واتە(ئەوە لەبری ئەوە).[3]

---

تەبەرانی لە سالمی کوڕی ئەبو جەعد لە کەسێك لە ئەشجەعەوە هێناویەتی کە پێی دەوترا ئەزهەری کوڕی حەرامی ئەشجەعی کەسێکی دەشتەکی بوو بەردەوام دیاریەکی دەهێنا بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) – بە هەمان شێوە فەرموودەکە دێنێت – (هەیسەمی ج٩ ص٣٦٩ دەڵێت: بەزار و تەبەرانی هێناویانە و کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن).

[1] – صحیح.

[2] – ( لە البدایە والنهایە ج٦ ص٤٦ دا واهاتووە).

[3] – صحیح.

ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ڕێیەکیدا بوو و چڵەوگریٚ جڵەوی وڵاخی ئافرەتەکانی دەگرت، ئافرەتەکانی لەبەردەمیدا دەچوون، فەرمووی(ئەی ئەنجەشە هاوار بۆت لەگەڵ مرواریەکاندا نەرمو نیان بە)(مەبەستی ژنەکانە)[1] بوخاری لە الادب المفرد ص٤١ لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لای هەندیٚ ژنی و ئوم سولەیمان لەگەڵیدا بوون، فەرمووی(یا انجشة رویدا سوقك بالقوارير) ئەبوقولابە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) قسەیەکی کرد هەرکامتان بتانکردایە سەرکۆنەتان دەکرد(سوقك بالقوارير).[2]

ترمزی لە الشمائل ص١٧ لە حەسەنەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پیرەژنێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نزابکە خوا بمخاتە بەهەشت، فەرمووی(ئەی ئوم فلان پیرەژن ناچێتەناو بەهەشت)، ئەویش چوو و گریا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(پێی بڵێن بەو پیرەژنیەی ناچێتە ناوی، خوا دەفەرموێت(انا انشأناهن نشاءا فجلعناهن ابكارا)).[3]

---

[1]- ( لە بوخاری و موسلیمدا بە هەمان شێوە لە ئەنەسەوە هاتووە، وەك لە البدایە والنهایە ج٦ ص٦٧ دا هاتووە).

[2] - صحیح.

[3] - ضعیف.

## (بزەبەخشی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم))

ئەبوداود لە عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)لەشەڕی تەبووکدا کە لە چادرێکی پێستەدابوو، سەلامم لێکرد و وەڵامی دامەوەو فەرمووی(وەرە ژوورەوە) دەڵێت: وتی:(هەمووم ؟) فەرمووی(هەموت) منیش چوومە ژوورەوە، وەلیدی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەبولعایە دەڵێت: وتی: هەمووم بێتە ژوورەوە؟ لەتاو بچوکی چادرەکە.[1][2]

بوخاری لە الادب المفرد ص٤١ لە ئیبن ئەبی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عائیشە(رضي الله عنها) لە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گاڵتەی کردو دایکی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە هەندێ قسەو گاڵتەی ئەم ناوچەی کینانەیە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بل بعض مزحنا هذا)واتە(بەڵکو ئەوە هەندێ لە بزەبەخشیمانە).[3]

زوبەیری کوڕی بەکارو ئیبن عەساکیر لە ئەبولهەیسەم لەوەوەی بۆی باسکردووە هێناویەتی بیستی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب(رضي الله عنه) لە ماڵی ئوم حەبیبەی کچیدا گاڵتەی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکردو دەیوت: بە خوا ئەگەر دەستت لێ بەردەم عەرەبیش دەست لێ بەردەدەن ئیتر لەبارەتەوە شاخە جەنگێ نابێ، وتیان: بێ شاخە نەوەك شاخدار، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێکەنی و فەرمووی(تۆ ئەوە دەڵێیت ئەی ئەبوحەنزەلە).[4]

بوخاری لە الادب المفرد ص٤١ لە بەکری کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سێویان بۆ یەك دەوەشاند، کە دەگەیشتە باری ڕاستی مەردی مەیدان بوون.[5]

---

[1] – صحيح.

[2] – ( لە البدايە والنهايە ج٦ ص٤٦ دا واهاتووە).

[3] – ضعيف.

[4] – (لە كنز العمال ج٤ ص٤٣ دا واهاتووە).

[5] – صحيح.

هەیسەمی ج٨ ص٨٩ لە قوررەوە هێناویەتی دەڵێت: بە ئیبن سیرینم وت: ئایا گاڵتەیان هەبوو؟ وتی: وەك خەڵك بوون ئیبن عومەر گاڵتەی دەکردو دەیوت:

یجب الخمر من مال الندامي و یکره ان تفارقه الفلوس[1]

ئەحمەد لە ئوم سەلەمەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی ئەبوبەکر(ﭬ) بۆ بازرگانی چوو بۆ بوسراو نوعەیمان و سوەیبتی کوڕی حەرمەلەی لەگەڵدابوو کە هەردووکیان بەدری بوون، سوەیبت لەسەر خواردن و شمەکەکە بوو، نوعەیمان پێی وت: نانم بدەرێ وتی: دەبێت ئەبوبەکر بێت، نوعەیمان پێکەنێنەرێکی گاڵتەچی بوو، چوو بۆ لای خەڵکێك کە ئاژەڵیان هێنابوو بۆ فرۆشتن، وتی: غوڵامێکی عەرەبیم لێ بکڕن، وتیان: باشە، وتی: ئەو زمانی درێژەو لەوانەیە بڵێ من ئازادم ئەگەر لەسەر ئەوە ناتانەوێت وازم لێ بێنن و لە منیشی خراپ مەکەن، وتیان: نا، دەیکڕین، بە دە وشتری گەنج و بەتوانا لێیان کڕی، ئەویش بردی و وتی: ئائەمەیە، سوەیبت وتی: درۆدەکات من کەسێکی ئازادم وتیان: هەواڵی تۆمان بیستووە، پەتیان خستە گەردنی و بردیان، ئەبوبەکر هاتەوەو بیستی و لەگەڵ هاوەڵانیدا چوو بۆ لایان پشکەکەی دانەوەو گێڕایەوە، پاشان گێڕایانەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش لەگەڵ هاوەڵانی دەوریدا پێکەنین[2][3].

ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج٣ ص٥٧٥ لە ڕەبیعی کوڕی عوسمانەوە(ﭬ) هێناویەتی دەڵێت: دەشتەکیەك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هاتە مزگەوت و لە لای

---

[1] – (هەیسەمی بەبێ سەنەد هێناویەتی و باسی هێنانەکەی نیە).

[2] – ضعیف.

[3] – (ئەبوداود و تەیالیسی و ڕەویانی هێناویانە)، ئیبن ماجە هێناویەتی و گاڵتەجارەکەی بە سوەیبت و فرۆشراوەکەی بە نوعەیمان داناوە. زوبەیری کوڕی بەکار لە ڕێی ئوم سەلەمەوە هێناویەتی بەڵام بە سولەیتی کوڕی حەرمەلە ناوی هێناوەن ئیبن عەبدولبیرو جگە لەویش چون بەدوایدا، لە الاصابە ج٢ ص٩٨ دا هاتووە، ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج٢ ص١٢٦ و ج٣ ص٥٧٢ دا فەرموودەکەی ئوم سەلەمەی لە چەند ڕێیەکەوە هێناوە).

مزگەوتەوە وشترەکەی دانیشاند، هەندێ لە هاوەڵان وتیان: بە نوعەیمانی کوڕی عەمری ئەنساری کە پێی دەوترا نوعەیمان بۆچی سەری نابڕیت تا بیخۆین چونکە حەزمان لە گۆشتە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پارەکەی دەدات، ئەویش سەری بڕی، پاشان دەشتەکیەکە هات و سەیری کرد وشترەکەی سەربڕاوە، هاواری کرد وەی وشترەکەم ئەی موحەممەد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات و فەرمووی(کێ ئەوەی کرد ؟) وتیان: نوعەیمان، ئەویش لەسەری پرسیاری کرد تا لە ماڵی زوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموتەلی بینی خۆی لە چاڵێکدا شاردووەتەوەو گەڵای خورمای داوە بەسەر خۆیدا، کابرایەك ئاماژەی بۆ کردو دەنگی بەرزکردەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمبینیوە، بەڵام بەدەست ئاماژەی کرد کە لەوێدایە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)هێنایەدەرو ئەویش بەهۆی گەڵای دارخورماکەی سەر سەریەوە ڕەنگی گۆڕابوو، چونکە کەوتبوو بەسەریدا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(بۆچی واتکرد؟) وتی: ئەوانەی تۆیان هێنا بۆ لای من ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان وتیان وابکە، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ڕووخساری دەسڕی و پێدەکەنی، پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پارەکەی دا.[1]

زوبەیر لە موصعەبی کوڕی عەبدوڵڵای مامی عەبدوڵڵای کوڕی موصعەبی باپیریەوە هێناویەتی دەڵێت: مەخرەمەی کوڕی نەوفەلی کوڕی وەهبی زوهری(رضي الله عنه) پیرێکی گەورەی مەدینەبوو، کوێربوو تەمەنی سەدو پانزە ساڵ بوو، ڕۆژێ لە مزگەوت ویستی میزبکات خەڵکی هاواریان لێکرد، نوعەیمانی کوڕی عەمری ڕوفاعەی کوڕی حارسی کوڕی سوادی نەجاری هات و بردیەلایەکی مزگەوت و وتی: ئا لێرەدا، ئەویش دانیشت تا میز بکات و نوعەیمان بەجێی هێشت، میزی کردو خەڵکی هاواریان لێکرد، کە لێبوویەوە وتی: هاوار بۆتان کامتان منی هێنایە ئێرە؟ وتیان: نوعەیمانی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)، وتی: خوا ئاواوو ئاوای پێ بکات، بەخوا ئەگەر

[1] – (لە الاصابە ج٣ ص٥٧٠ دا لە زوبەیری کوڕی بەکار لە ڕەبیعەی کوڕی عوسمانەوە هاتووە).

دەستم پێی بگات دەبێت بەم گۆچانەم والێی بدەم دەردی منی تووش بێت، ماوەیەکی خایاند تا مەخرەمە بیری چوویەوە، ڕۆژێ هات بۆ لای عوسمان و لە لایەکی مزگەوتەوە نوێژی دەکرد، عوسمان کە نوێژی دەکرد لای نەدەکردەوە، پێی وت: نوعەیمانت دەوێت؟ وتی: بەڵێ لە کوێیە بمبە بۆ لای، ئەویش بردیە لای عوسمان و وتی: ئەوەیە خۆیەتی، مەخزەمەش بە دوو دەستی گۆچانەکەی گرت و دای لە عوسمان، پێی وترا: دات لە ئەمیری باوەڕداران عوسمان، بەنوزوهرە ئەوەیان بیست و لەسەری کۆبوونەوە، عوسمان(رضي الله عنه) وتی: نوعەیمان(رضي الله عنه) بانگ بکەن نەفرینی خوا لە نوعەیمان خۆ ئەو لە بەدردا بەشداربووە بۆ وای کرد؟[1]

## (بەخشندەیی)

## (بەخشندەیی گەورەمان موحەممەد پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم))

بوخاری و موسلیم لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەخشندەترین کەس بوو، لە ڕەمەزاندا، زیاتر کاتێ جبریل(علیه السلام) دەهات بۆ لای، جبریل هەموو شەوێکی ڕەمەزان دەهات بۆ لای و پێکەوە قورئانیان دەخوێندەوە، بەخوا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە بۆنی ڕۆشیتوو بۆ خێر بەخشندەترو خێراتر بوو.[2]

بوخاری و موسلیم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داوای هەرچی لێ بکرایە هەرگیز نەیدەفەرموو نا.[3]

---

[1] – ( لە الاستیعاب ج٣ ص٥٧٧ دا هاتووە، لە الاصابە ج٣ ص٥٧٠ لە بەککارەوە هێناویەتی).

[2] – (لە صفە الصفوە ج١ ٦٩ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٢ ص١٩٥ بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[3] – ( لە البدایە والنهایە ج٦ ص٤٢ دا واهاتووە).

ئەحمەد لە فەرموودەیەکی دوورو درێژ لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرەوە(ﷺ) هێناویەتی ئەبو ئوسەیدە دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) چی لێ داوا بکرایە ڕێگر نەدەبوو دەیبەخشی.[1]

تەبەرانی لە فەرمودەیەکی دورودرێژ لە عەلیەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر داوای شتێکی لێبکردایەو بیویستایە بیکات دەیفەرموو بەڵێ، ئەگەر بیویستایە نەیکات بێدەنگ دەبو نەیدەفەرموو نا.[2]

تەبەرانی لە ڕەبیعی کچی موعەوزی کوڕی عەفراوە هێناویەتی دەڵێت: موعەوزی کوڕی عەفر(مشتێ خورمای پێناردم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە کۆتاییەکەی کەلەبەربوو پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لەوە دەکرد، کاتێ کاڵایەك بو لە بەحرەینەوە هاتبوو، دەستی لێ پڕکردو بەخشی بە من، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا مشتی پڕکردم لەجەواهیر یان زێڕ. (ئەحمەد بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیادکردوە فەرمووی(تعالی بهذا)[3][4].

تەبەرانی لە ئوم سونبولەوە هێناویەتی دیاریەکی برد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ژنەکانی ڕازی نەبوون قبوڵی بکات وتیان ئێمە وەری ناگرین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد وەریان گرت، پاشان دۆڵێکی بۆ بڕیەوەو عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لە حەسەنی کوڕی عەلی کڕی[5][6].

---

[1]- (هەیسەمی ج٩، ص٣ دەڵێت: کەسەکانی جێی متمانەن، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئوسەیدی نەی بیستووە).

[2]- (هەیسەمی ج٩، ص١٢ دەڵێت لە سەنەدەکەدا موحەمەدی کوڕی کەڵیری کوفی هەیە کە لاوازە).

[3]- ضعیف.

[4]- (هەیسەمی ج٩، ص١٣ دەڵێت: هەردوو سەنەدەکە حەسەنن. ترمزی لە ڕەبیعەوە بە کورتی هێناویەتی. وەك لە البدایە والنهایە ج٦، ص٥٦ دا هاتووە).

[5]- ضعیف.

[6]- (هەیسەمی ج٩، ص١٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەمری کوڕی قەیزی هەیە کە نایناسم، کەسەکانی دیکە جێی متمانەن پێشتریش سەبارەت بە ماڵ بەخشین پێغەمبەرمان هێناوە).

# بەخشندەیی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)

زوبەیری کوڕی بەکارو ئیبن عەساکیر لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی من نیەتم هێناوە ئەم جلە بدەم بە بەڕێزدارترینی عەرەب، فەرمووی بیدە بەوغولامە، واتە سەعیدی کوڕی عامی کە وەستابوو، بۆیە بەو جلە وترا جلی سەعدیە.[1]

# لەخۆبووردن

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی سەردەمێکمان بەسەردا هات و کەسمان وای نەدەزانی لەبرا مسوڵمانەکانەکەی شیاوترە بە دینارو درهەم. لە سەردەمی دینارو درهەمدا وامان لێ هاتووە لە برا مسوڵمانەکەمان لامان خۆشەویسترە.[2]

# خۆڕاگری

# (خۆڕاگری لە سەر نەخۆشییەکان بەگشتی)

# (خۆڕاگری گەورەمان موحەمەد پێغەمبەری خوا(ﷺ))

ئیبن ماجەو ئیبن ئەبی دنیا لە ئەبی سەعیدەوە(رضي الله عنه) هێناویانە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و تای بوو پارچەیەکی بەسەرەوەبوو، دەستی خستە سەر پارچە قەتیفەکەو وتی تاکەی زۆر زۆرە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(اناكذالك سيدد علينا البلاء ويضاعف لنا الاجر)واتە(ئێمە واین سەختیمان لەسەر توندتر دەبێ و

---

[1] – (المنتخب ج٥، ص١٨٩ دا هاتووە پێشتریش لەم بارەوە فەرموودەیان لەسەرهاتووە).

[2] – (هەیسەمی ج١، ص٣٨٥ دەڵێت تەبەرانی بە چەند سەنەدێك هێناویەتی و هەندێکیان حەسەنن. پێشتریش لەسەر سەختی تینوێتی و کەمی جل وبەرگ و باسی پشتیوانان لە بەخشین لەگەڵ پێویست پێبونیاندا فەرموودەمان لەسەر هێناون).

پاداشتمان زیاتر دەکرێت) پاشان وتی ئەی پێغەمبەری خوا سەختی کێ زۆرترە؟ فەرمووی پێغەمبەران پاشان کێ؟ فەرمووی زاناکان، وتی پاشان کێ،(الصالحون کان احدهم یبتلی بالقمل حتی یقتله ویبتلی احدهم بالفقر حتی مایجد الا العباءة یلبسها ولاحدهم کان اسد فرحا بالبلاء من احدکم بالعطاء)واته(پیاو چاکان هەیانە توشی نەخۆشی دەبێت تادەیکوژێت، هەیانە توشی هەژاری دەبێت تائەوەی تەنها عەبایەك شك دەبات تا بیپۆشێت، بەخوا هەرکامیان لە خۆشحاڵی ئێوە بۆ بەخشین خۆشحاڵترە بەتوشبوون)[1].[2]

بەیهەقی لەئەبوعوبەیدەی کوڕی حوزەیفەوە لە فاتیمەی پوریەوە هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتانێ چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) سەردانمان کرد تووشی تاببوو، داوای کرد هەڵواسرا بەدارێکدا دواتر خرایە ژێری، پێغەمبەر(ﷺ) لەتاو سەختی تاکەی عارەقی دەردەدا، وتم ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی نزا ناکەیت خوا دەربازت بکات، فەرمووی(ان اشفا الناس بلاء الانبیاء ثم الذین یلونهم ثم الذین یلونهم ثم الذین یلونهم) سەختترینی توشبووانی ناو پێغەمبەرانن، دواتر ئەوانەی بە دوایاندا دێن، دواتر ئەوانەی بە دوای ئەواندا دێن، دواتر ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن)[3].[4]

ئیبن سەعدو حاکم و بەیهەقی لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویانە پێغەمبەر(ﷺ) تووشی ئازارێکی زۆر بوو ناڵەی بوو لەسەر جێگەکەی ئەمدیوو ئەودیوی دەکرد، عائیشە پێی وت: ئەگەر هەر کاممان ئەوەی بکردایە چیت دەکرد، فەرمووی(ان المؤمنین لسیدد علیهم وانه لیس عن المؤمن تصیبه نکبة سوکة

---

[1] – صحیح.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٥، ص٢٤٣ دا هاتووە بەیهەقی هێناویەتی وەك لەکنزالعمال ج٢، ص١٥٤ دا هاتووە. ئەبو نەعیم لە(الحلیه ج١، ص٣٧٠) دا بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[3] – صحیحز

[4] – لەکنزالعمال ج٢ص١٤٥ دا هاتووە. ئەحمەدو تەبەرانی بە هەمان شێوە هێناویانە.(هەیسەمی ج٢، ص٢٩٢ دەڵێت لە سەنەدەکەی ئەحمەد حەسەنە).

ولاوجع الا كفرالله عنه بها خطيئة ورفع له بها درجة)واتە(باوەڕداران باریان سەخت دەکرێت، هەر باوەڕدارێ نوکە دڕکێ یان ئازارێکی توش بێت خوای گەورە بەوە تاوانێکی بۆ دەسڕێتەوەو پلەیەکی پێبەرز دەکاتەوە)[1].[2]

## خۆڕاگری هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەحمەد لەجابرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: تا داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر کرد فەرمووی(ئەوە کێیە؟) وتی ئوم مەلدوم، ئەویش ناردی بۆ لای خەڵکی قوباو لێیەوە توشی ئەوەبوون کە خوا دەزانێت، هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای ئەوەیان لاکرد ئەویش فەرمووی(ماشئتم ا شئتم دعوت الله فكشفها عنكم وان شئتم ان تكون لكم طهورا)واتە(چیتان دەوێت، ئەگەر دەتانەوێت لە خوا دەپاڕێمەوە لەسەرتان لاباتو ئەگەریش دەتانەوێت با ببێتە پاککەرەوە بۆتان) وتیان ئەوە دەکەیت؟ فەرمووی بەڵێ وتیان دەی وازی لێبێنە[3].[4]

تەبەرانی لە سەلمانەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: تاهات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی کرد، پێی فەرموو تۆ کێیت؟ وتی من تام گۆش دەشێوێنمو خوێن دەمژم، فەرمووی(بڕۆ بۆ لای خەڵکی قوبا) چوو بۆ لایان ئەوانیش هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ڕەنگیان زەرد ببوو سکاڵایان لە لاکرد، فەرمووی(ئەگەر دەتانەوێت لە خوا دەپاڕێمەوە لەسەرتان لادەبات ئەگەریش دەتانەوێت وازی لێبهێننو

---

[1] - صحیح.

[2] - (لە کنزالعمال ج٢، ص١٥٤ دا هاتووە، ئەحمەد هێناویەتی،هەیسەمی ج٢، ص٢٩٢ دەڵێت کەسەکانی جێی متمانەن).

[3] - صحیح.

[4] - ( لەالترغيب والترهيب ج٥، ص٢٦٠ دا دەڵێت ئەحمەد بە سەنەدی صەحیح هێناویەتیو ئەبو یەعلاو ئیبن حبان لە صەحیحەکەیدا هێناویانە).

تاوانەکانی دیکەتان دەکەوە(نامێنن)) وتیان بەڵێ، دەی وازی لێ بهێنە ئەی پێغەمبەری خوا[1].[2]

بەیهەقی لە ئەبو هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: تا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا بمنێرە بۆ لای ئازیزترین کەسانت لە لات، یان خۆشەویسترین هاوەڵانت- قوررە دوودڵ بوو کامیان بوو- فەرمووی(بڕۆ بۆ لای پشتیوانان) ئەویش چوو بۆ لایان و توشیان بوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا تامان توش بووە لەخوا بپاڕێوە با شیفامان بدات، نزای بۆ کردن و لەسەریان لاچوو، ژنێك کەوتە شوێنی و وتی ئەی پێغەمبەری خوا لای خوا بۆ منیش بپاڕێوە منیش لە پشتیوانانم نزام بۆبکە وەك ئەوان، فەرمووی(کامیانت لا خۆشەویسترە، نزات بۆبکەم و لەسەرت لابچێت یان خۆڕابگریت و بەهەشتت بۆ واجب بێت؟) وتی نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا خۆم ڕادەگرم، سێجار وتی هیچ مەترسیەك بۆ ڕێی بەهەشتی دانانێم[3].[4]

تەبەرانی لە عائیشەوە(رضي الله عنها)هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە دوای پیاوێکدا دەگەڕا کە دەهات بۆ لای، فەرمووی(چیە فلان نابینم؟) وتیان تووشی تا بووە، فەرموی هەستین بچین بۆ لای کە چوو بۆ لای غولامەکەو گریا و

---

[1] - صحیح.

[2]- (هەیسەمی ج٢ص٣٠٦) دەڵێت: لە سەنەدەکەدا هشامی کوڕی لاحق هەیە کە نەسائی متمانەی پێدەدات و ئەحمەد و ئیبن حبان بە لاوازی دەزانن. بەیهەقی لە سەلمانەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە(البدایە والنهایە ج٦، ص١٦٠) دا هاتووە).

[3] - صحیح.

[4]( لە البدایە والنهایەج٦، ص١٦٠ دا هاتووە، بوخاری لە الادب المفروص٧٣ لە ئەبو هورەیرەوە بەو واتایە هێناویەتی).

پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(مەگری چونکە جبریل هەواڵی پێدام تا پشکی ئومەتەکەمە لە دۆزەخ)[1] [2].

ئیبن سەعد ج٣ص١٤١ و ئیبن ئەبی شەیبەو ئەحمەد لەالزهدو ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١ص٣٤و هناد لە ئەبو سەفەرەوە هێناویانە دەڵێت: هەندێ چوون بۆ سەردانی ئەبوبەکر لە کاتی نەخۆشیدا وتیان ئەی پێغەمبەری خوا باپزیشکت بۆ بانگ بکەین سەیرێکت بکات؟ وتی: سەیری کردووم، وتیان ئەی چی پێوتیت؟ وتی فەرموویەتی(من ئەوەدەکەم کە دەمەوێت).[3]

ئەبو نەعیم لەالحلیة ج١، ص٢١٨ لە موعاویەی کوڕی قررەوە هێناویەتی ئەبو دەردا سکاڵای بوو، هاوەڵان چون بۆ لای وتیان سکاڵای چیتە ئەبو دەردا؟ وتی سکاڵای تاوانەکانمە، وتیان دەی ئێستا چی دەڵێیت؟ وتی حەزم بۆ بەهەشت دەبزوێ، وتیان پزیشکێکت بۆ بانگ نەکەین؟ وتی هەر ئەوەیە کە خستومیەتە جێگە.[4]

ئیبن خوزەیمەو ئیبن عەساکیر لە عەبدوڕەحمانی کوڕی غەنیمەوە هێناویەتی دەڵێت: لە شام تاعون ڕوویداو عەمری کوڕی عاص وتی ئەم تاعونە پیسە لە دەستی ڕاکەن بۆ دۆڵو دەشتەکان. شەرحەبیلی کوڕی حەسەن ئەوەی بیستو توڕەبوو وتی عەمری کوڕی عاص درۆ دەکات، من لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووم ئەوکات عەمر لە وشتری ماڵەوەیان گومڕاتر بوو، ئەو تاعونە نزای پێغەمبەرەکەتانو ڕەحمەتی خواتانو مەرگی پیاوچاکانی پێش ئێوەیە، موعاذ ئەوەی بیست وتی:

---

[1] – ضعیف.

[2] – (لە سەنەدەکەدا عومەری کوڕی ڕاشد هەیە کە ئەحمەدو جگە لەویش بەلاوازو عجلی بەجێ متمانەی دەزانێت وەك المجمع ج٢، ص٣٠٦ دا هاتووە).

[3] – لە کنزالعمال ج٢، ص١٥٣ دا هاتووە.)

[4] – ئیبن سەعدج٧، ص١١٨ لەموعاویەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

خوایە باپشکی ماڵی موعاذ زیاتر بێت. ئەوەبوو دوو کچەکەی مردن و عەبدوڕەحمانی کوڕیشی توش بوو، وتی ﴿الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ ئەویش وتی ﴿سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾ پشت بەخوا دەمبینن لەخۆڕاگران دەبم) موعاذیش ڕووی دەستیەوە توش بوو دەیوت ئەمەم لە وشتری سور لاخۆشەویستترە، بینی کەسێك لە لای دەگریت، وتی بۆچی دەگریت؟ وتی بۆ ئەو زانستەی لە تۆم وەردەگرت، وتی دەی مەگری، چونکە ئیبراهیم لەسەر زەویدا بوو دونیا زانایەکی تیانەبوو خوا زانستی بۆ نارد، ئەگەر من مردم لای چوارکەس داوای زانست بکە، عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو عەبدوڵلای کوڕی سەلام و سەلمان و ئەبودەردا.[1]

حاکم ج١، ص٧٦و ئەبو نەعیم لە الحلیة ج٢٤٠ لە عەبدوڕەحمانەوە هێناویانەو بە دەقی ئەبونەعیم هێناویەتی: موعاذو ئەبوعوبەیدەو سۆرحەبیلی کوڕی حەسەنەو ئەبو مالیکی ئەشعەری لەیەك ڕۆژدا تووشی تاعوون بوون، موعاذ وتی ئەمە ڕەحمەتی پەروەردگارتانەو نزای پێغەمبەرتانەو پێش ئێوە پیاوچاکانی بردووەتەوە. خوایە پشکی بنەماڵەی موعاذ زیاتر بێت لەو ڕەحمەتەدا. ئێوارە نەهات عەبدوڕەحمان بەکرەی کوڕی کونیەی بەوەوە بوو خۆشەویستترین کەس بوو لە لای توشی بوو، لە مزگەوت گەڕایەوە سەیری کرد توش بووەو بە ئازارە، وتی عەبدوڕەحمان تۆ چۆنیت؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی بابەگیان حەق لە لای پەروەردگارتە دەی لە ناڕازییان مەبە، موعاذ وتی: منیش پشت بەخوا دەمبینیت لە خۆڕاگرانم. شەوێ هێشتیەوەو بۆ بەیانی بە خاکی سپارد.

---

[1]- لە(کنزالعمال ج٢ص٣٢٥) دا هاتووە، ئەحمەد لە عەبدەڕەحمانی کوڕی غەنیمەوە بە کورتی هێناویەتی بەزار بە دوورو درێژی لێوەی هێناوە. هەیسەمی ج٢ص٣١٢ باسی دەکات و دەڵێت: سەنەدەکانی ئەحمەد حەسەن صەحیحن

موعاذ تووش بوو کە سەرەمەرگ زۆری بۆ هێنا، هەناسەیەکی دا کە کەس شتی وای نەبووە، هەرکە بەهۆش دەهاتەوە دەمی دەکردەوە، دواتر وتی خوایە پێم ببەخشە، چونکە سوێند بە عیزەتت تۆ دەزانیت دڵم تۆی خۆش دەوێت.[1]

ئیبن ئیسحاق لە شەهری کوڕی حەوشەب لە کەسێکی هۆزەکەیەوە هێناویەتی کە دەردەکەوت ئەبو عوبەیدە لەناو خەڵکدا وتاری دا و وتی خەڵکینە ئەم دەردە ڕەحمەتە بۆتان و نزای پێغەمبەرتان و مەرگی پیاو چاکانی پێش ئێوەیە و وتی: لە خوا دەپاڕێمەوە پشکی بنەماڵەی موعاذ ببەخشێ، عەبدوڕەحمانی کوڕی تووش بوو مرد، پاشان هەستا و نزای بۆ خۆی کرد و توش بوو، بینیم سەیری دەکرد و دواتر پشت دەستی وەردەچەرخاند دەیوت: چی لەم دنیادا هەیە هێندەی ئەو دەردەی تۆ لام ئازیز نیە. کە مرد عەمری کوڕی عاصی لەسەر خەڵك دانا، ئەویش هەستا وتاری خوێندەوە و وتی ئەی خەڵکینە ئەم دەردە توشی هەرچی بوو وەك ئاگر تەشەنە دەکات، دەی خۆتانی لێ بپارێزن و بچنە شاخەکان، ئەبو وائیلی هوزەلی وتی بەخوا درۆدەکەیت من هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بووم ئەوکاتە تۆ لەم کەرەی من خراپتربوویت، و وتی بەخوا وەڵامت نادەمەوە، هاوار بۆی لەڕووی ناوەستین پاشان دەرچوون و بڵاوەیان لێکرد و وا لێی دورخستنەوە، عومەر ئەو ڕایەی عەمری کوڕی عاصی بیست بەخوا سەرکۆنەی نەکرد.[2]

ئەحمەد لە ئەبو قولابەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی لە شام تاعوون دەرکەوت و عەمری کوڕی عاص وتی: ئەمە پیسەو هاتووە دەی بدەن بەشیوو دۆڵەکاندا، موعاذ ئەوەی بیست و پاڵپشتی قسەکەی نەکرد، وتی بەڵکو شەهیدی و ڕەحمەت و نزای پێغەمبەرەکەتانە خوایە لە ڕەحمەتی خۆت بەشی موعاذ و بنەماڵەکەی بدە، شەوێك

---

[1] – ئەحمەد لە ئەبو مونیبەوە بە کورتی هێناویەتی کەسانی جێمتمانەو سەنەدی موتتەسیل هێناویەتی وەك هەیسەمی ج٢، ص٣١١ دەیڵێت.

[2] – لە البدایە والنهایە ج٧، ص٧٨ دا هاتووە.

نوێژی دەکرد لە نزاکەیدا فەرمووی(فعمی اذا او طاعونا)(دەی تا یان تاعوونە) سێ جار وتی بەڵێ فەرمووی(انی سالت ربی عزوجل ان الا یهلك امتی بنسبتة فأعطانیها وسألت الله ان لایسلط علیهم عدوا یبیسهم وسألته ان لا یلبسهم.........ویذیق بعضهم بأس بعض فأبی علی فنعمت فعلت حمی اذا اوطاعونا یعنی ثلاث مرات) (داوام لە پەروەردگارم کرد بە یەك ساڵ ئومەتم لەناو نەبات پێی بەخشیم، لە خوا پاڕامەوە دوژمنێکیان بەسەردا زاڵ نەکات کە لەناویان ببات و داوام لێکرد بەش بەشیان نەکات و لەناویەکدا بدەن بەیەکدا ئەوەیانی پێنەبەخشیم، منیش دەستم هەڵگرت وتم دەی تا یان تاعون سێجار)[1][2].

# خۆڕاگرتن لەسەر لەدەستدانی بینایی

## خۆڕاگرتنی هاوەڵان(رضي الله عنهم) لەسەر لەدەستدانی بینایان

بوخاری لەالأدب المفرد ص٧٨ لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە(رضي الله عنه) هێناویە دەڵێت: چاوەکانم ئازاریان هەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەردانی کردم و دواتر فەرمووی(یازید لوان عینك لما بها کیف کنت تصنع) واتە(ئەی زەید ئەگەر چاوت نەبوایە چیت دەکرد؟) وتی خۆم ڕادەگرت و چاوەڕێی پاداشت دەبووم، فەرمووی(لو ان عینك لما بها صبرت واحتسبت کان ثوابك الجنة) واتە(ئەگەر چاوت نەبوایە و پاشان خۆت ڕابگرتایە و چاوەڕێی پاداشت بویتایە پاداشتت بەهەشت دەبوو)[3] ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) چوین سەردانی زەیدی کوڕی ئەرقەم بکەین کە ئازاری چاوی هەبوو، فەرمووی(ئەی زەید ئەگەر بینیت(چاوت) نەبوایە و

[1] - ضعیف.

[2] - هەیسەمی ج٢ص٣١١دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی ئەبو قولابە موعاژی کوڕی جەبەلی نەدیوە.

[3] - ضعیف.

خـۆت ڕابگرتایـەو چـاوەڕێی پاداشـت بویتایـە بـەدڵنیایی یـەوە دەگەیـشتیتەوە بەخوای گەورەو هیچ تاوانێکت لەسەر نەبوو)[1].[2]

ئـەبو یـەعلاو ئـیبن عەسـاکیر لـە زەیـدی کـوڕی ئەرقەمـەوە(رضي الله عنه) هێناویانـە پێغەمبـەر(ﷺ) چـوو بـۆ لای لەسـەر نەخۆشـیەکی سـەردانی کـرد، فـەرمووی(ئـەم نەخۆشیە هیچ نیە بۆ سەرت، بەڵام چۆن دەبێت ئەگەر دوای من تەمەنت کردو کوێر بویت؟) وتی دەی خۆم ڕادەگرمو چاوەڕێی پاداشت دەبم فەرمووی(اذا تـدخل الجنة بغـير حـساب) واتـە(دەی وابـێ بـەبێ لێپێـچینەوە دەچیتە بەهەشـت) دوای مردنـی پێغەمبەر(ﷺ) کوێر بوو[3].[4]

تەبەرانی لە زەیدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتیو ئەوەی بۆ زیاد کردووەو پاش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) کوێر بوو دواتر خوای گەورە چاوی بۆ گێڕایەوە، پاشان مرد ڕەحمەتی خوای لێ بێت.[5]

بوخـاری لـە الآدب والمفرد ص٨٧ لـە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە هێناویـەتی یەکێ لە هـاوەڵانی پێغـەمبـەر(ﷺ) چاوی لەدەستدا سـەردانی کـرد و وتـی من بۆیـە دەمویست تا پێغەمبەر(ﷺ) ببینم کە پێغەمبـەر(ﷺ) مـرد بـەخوا حـەز ناکـەم شـاری تەبالەیان هەبێ.[6]

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیـسەمی ج٢، ص٣٠٨ دەڵێـت لـە سـەنەدەکەدا جـەعفی هەیـە کـە قـسەیەکە زۆری لەسەرە.....شوعبە متمانەی پێدەدەن تەواو.

[3] – ضعیف.

[4] – بەیهەقی لە زەیدەوە بەو واتایە هێناویەتی، لە کنزالمال ج٢ص١٥٧ دا واهاتووە.

[5] – هەیسەمی ج٢، ص٢٠٩ دەڵێت: نەباتەی کچی بەریر باسیم نەدیوە.

[6] – ئیبن سەعدج٢، ص٨٥ لە قاسمەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

# خۆڕاگری لەسەر مەرگی منداڵ و نزیك و خوێش و ئازیزان
# خۆڕاگری گەورەمان موحەمەدی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)

ئیبن سەعدج۱، ص۹۰ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئیبراهیمم بینی لەبەردەم پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) گیانی دەدا، چاوەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فرمێسکیان ڕشت و فەرمووی(تدمع العين ويحزن القلب ولا نقول الا مايرضي ربنا والله يا ابراهيم ان بك لمحزونون) (چاو فرمێسك دەڕێژێ و دڵ خەمبار دەبێ و تەنها ئەوە دەڵێین کە جێی ڕەزامەندی پەروەردگارمانە، سوێند بەخوا ئەی ئیبراهیم ئێمە بۆتۆ دڵ گرانین).

هەروەها لەج۱، ص۸۸ لە مەکحوولەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتە ژوور بۆ لای عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه) و ئیبراهیمیش گیانی دەدا، کە مرد چاوەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فرمێسکیان دەڕشت. عەبدوڕەحمان پێی وت ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئەوەیە کە بە خەڵکت دەکرد مەیکەوە کە مسوڵمانەکان دەتبینن دەگریت دەگرین، کە هاتەوە سەرخۆی فەرمووی(ان هذا رحم وان من لايرحم انما ننهى الناس عن النياحة وان يندب الرجل بما ليس فيه) واتە(ئەوە سۆزەو هەرکەس سۆزی نەبێ سۆزی بۆنییە، ئێمە ڕێگری خەڵك دەکەین لە شیوەن و باسکردنی کەسێ بەوەی تیایدا نیە) پاشان فەرمووی(لولا انه وعدجامع وسبيل مئتاء وان اخرنا لاحق بأولنا لوجدنا عليه ودا غير هذا وإناعليه لمحزونون تدمع العين ويحزن القلب، ولا نقول مايسخط الرب وفضل الرضاعة في الجنة).[1]

ئەحمەدو ئەبودەرداو ترمذی و ئیبن ماجەو ئیبن حبان لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بوین کچێکی خۆی نارد تا پێی بڵێت منداڵێکیان لەسەرەمەرگدایە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(إرجع إليما فأخبرها ان الله مأخذ وله ماأعطى وكل شىء عندى بأجل مسمى...... فلتصبر ولتحتسب)

---

[1] – لە ج۱، ص۸۹ لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە بەو واتایە بە دوورو درێژتر هێناویەتی.

واته(بگەڕێرەوه بۆ لای و پێی بڵێ خوا چی دەباتەوه بۆ خۆیەتی و چی دەباتەوه بۆخۆیەتی و هەموشت لای خوا بەوادەی دیاری کراوه، دەی لەگەڵی بڕۆ تا خۆڕاگربیت و چاوەڕێی پاداشت بیت) هاتەوه بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی سوێندی خواردووه بێت بۆ لای، پێغەمبەر(ﷺ) هەستا و سەعدی کوڕی عوبادەو موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابت و کەسانێکی دیکە لەگەڵیدا هەستان و منیش لەگەڵیا چووم و منداڵەکە بەرزکرایەوه بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و گیانی دەدا وەك ئەوەی لە جوڵانەدا بێت، چاوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فرمێسکاوی بوون، سەعد پێی وت ئەوه چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی(هذه رحمة جعلها الله فی القلوب العبادة وعندما یرحم الله من عباده الرحماء)(ئەوه سۆزێکه خوا لەدڵی بەندەکانیدا ایناوەو خوا ڕەحم بەبەندە بەسۆزەکانی دەکات).[1]

بەزارو تەبەرانی لە ئەبو هورەیرەوه(رضي الله عنه) هێناویانە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب وەستا کاتێ شەهید ببوو جەستەی شێوێنرابوو فەرمووی(رحمة الله علیك إن كنت ماعملت لوصولا للرحم فعولا للغیرات والله لولا حزن من بعدك علیك یسرنی إن تركت یعشرك الله من بطون السباع والله علی ذالك لأمثلت بسبعین كمیتتك)واتە(ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەوەی من لە تۆ دەیزانم پەیوەندیی و سۆزت زۆر بوو لە خێرکردندا زۆر کارا بویت و سوێند بەخوا ئەگەر خەفەتی دوای خۆت نەبوایە بۆت حەزم دەکرد وازت لێبێنم تاخوا لەناو سکی دڕندەکاندا حەشرت بکات، سوێند بەخوا لەسەر ئەوه دەبێت جەستەی حەفتای وەك تەرمی تۆ(دوژمنانت) بشێوێنم جبریل(علیه السلام) دابەزی و ئەم سورەتەی دابەزاند(وإن عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم بە) تاکۆتایی ئایەتەکە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کەفارەتی سوێندەکەی داو دەستی لەو کارە دورگرت[2].[1]

---

[1] – (لەکنزالعمال ج٨، ص١١٨) دا هاتووه.)

[2] – ضعیف.

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر تەرمی حەمزە وەستا و بینی چی لێکراوە فەرمووی(ئەگەر لەبەر دڵتەنگی و خەفەتی ژنەکانمان نەبوایە دام نەدەپۆشی و بەجێم دەهێشت تا لەسکی دڕندەکان و ناوسکی باڵندە دابێت خوا لەوێوە زیندووی بکاتەوە) کە بەوجۆرە بینی غەمباربوو و فەرمووی(ئەگەر بەسەریاندا زاڵ بم تەرمی(٣٠) کەسیان دەشێوێنم خوای گەورە لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی دبەزاند(وإن عاقبتم.....یمکرون) پاشان فەرمانی پێکرد ڕوو بە قیبلە ئامادەبوو نۆجار الله اکبری لەسەرکرد و دواتر شەهیدەکانی لاکۆکرایەوە و هەرکە شەهیدێك دەهێنرا لە پاڵی دادەنراو نوێژی لەسەر ئەوو شەهیدەکان دەکرد حەفتاو دوو نوێژ، پاشان هەستاو بۆ لای هاوەڵانی و کە قورئان دابەزی پێغەمبەر(ﷺ) لەو بڕیارەی خۆشبوو وازی هێنا لە تەرم شێواندن[1][2].

ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن ئەبی مونیع و بەزارو باوەردی و قوتنی و سەعیدی کوڕی مەنسور لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کە باوکم کوژرا چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە منی بینی گریا، بۆ بەیانی چووم بۆ لای فەرمووی(لاقی منك الیوم مالاقیت منك أمس)واتە(ئەمڕۆ شتێکم لە تۆ بەدیدکرد کە دوێنێ لێم بەدی نەکردیت)[4] ئیبن سەعدج٣، ص ٣٢ لە خالیدی کوڕی شمیرەوە هێناویەتی کە زەیدی کوڕی حارثە بەرکەوت پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لایان و کچی زەید بە پرمەی گریانەوە بەرەو ڕووی پێغەمبەر(ﷺ) چوو، پێغەمبەریش(ﷺ) گریا تا پرمەی کرد

---

[1]– ( لەسەنەدەکەدا صاڵحی کوڕی بەشیری موزەنی هەیە کە لاوازە. وەکهەیسەمی ج٦، ص١٩٧) بەوسەنەدە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[2] – ضعیف.

[3]– لە سەنەدەکەدا ئەحمەدی کوڕی ئەییوبی ڕاشید هەیە کە لاوازە،وەك هەیسەمی ج٦، ص١٢٠ دەڵێت.

[4] – (لە المنتخب ج٥، ص١٣٦ دا هاتووە).

سەعدی کوڕی عوبادە پێی وت ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چیە؟ فەرمووی(هذا شوق الحبیب إلی حبیبه)واته(ئەوە تاسەی خۆشەویستە بۆ خۆشەویستەکەی).

ترمذی له عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عوسمانی کوڕی مەزعونی ماچکرد کاتێ مردبوو، لەسەری گریا و چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت،[1] ئیبن سەعد ج٣، ص٢٨٨ له عائیشەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و له گێڕانەوەیەکدا هاتووە فرمێسکەکانی پێغەمبەرم(ﷺ) بینی کە بەسەر کولمی عوسمانی کوڕی مەزعوندا دەڕژان).[2]

## خۆڕاگری هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مەرگ

بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە حارثەی کوڕی سوراقە لە ڕۆژی بەدردا کوژراو لەبەرچاوبوو تیرێکی بەرکەوت و کوشتی، دایکی هات و وتی ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر حارثە هەواڵم پێبدە، ئەگەر لە بەهەشتە خۆڕادەگرم ئەگر نا باخوا پێم نیشان بدات چی بکەم- واتە شیوەن کە ئەو کاتە حەرام نەبووە- پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(ویحك! اهبلت انسا جنات ثمان وإن ابنك اصاب الفردوس الأعلی)واته(هاوار بۆت ڕۆڵە ڕۆبکەیت ئەوە هەشت بەهەشتە و کوڕەکەت فیردەوسی باڵای بەدەست هێناوە)،[3] لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە ئەگەر لە بەهەشتدایە خۆم ڕادەگرم ئەگەر ئەوەنیە تەواو بۆی دەگریم، فەرمووی(ئەی ئوم حارثە ئەمە بەهەشتانێکن لەناو بەهەشتاو کوڕەکەت فیردەوسی باڵای بەدەست هێناوە)[4] وەك لە

[1] – (لەالاصابە ج٢، ص٦٤ داهاتووە).

[2] – صحیح.

[3] – ( له البدایه والنهایه ج٣، ص٢٧٤) داهاتووە، بەیهەقی ج٩، ص١٦٧ له ئەنەسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[4] – ئیبن ئەبی شەیبە هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٥ص٢٧٣ و حاکم ج٣، ص٢٠٨ و ئیبن سەعدج٣، ص٦٨ له ئەنەسەوە بەو واتایە و تەبەرانیش هێناویانە).

کنزالعمال ج٥، ص٢٧٥ دا لە حەصەنی کوڕی عەوفی.......بەو واتایە هێناویەتی تیایدا هاتووە فەرمووی(ئەی ئوم حارثە یەك بەهەشت نییەو چەندین بەهەشتن، ئەو لە فیردەوسی بالآدایە) وتی دەی خۆڕادەگرم،[1] لە فەرمودەیەکدا هاتووە وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە بەهەشت دابێت ناگریمو خەفەت ناخۆم، ئەگەر لە دۆزەخدا بێت تاماوم دەگریم، فەرمووی(یاام حارثة إنما لیست بجنة ولکنها جنة في الجنات والحارث في الفردوس الآعلی) ئەویش بە پێکەنینەوە گەڕایەوەو دەیوت بەخ بەخ حارث.

ئیبن سەعدج٣، ص٨٣ لە موحەمەدی کوڕی ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسەوە هێناویەتی لە ڕۆژی شەڕی قورەیزە یەکێ لە پشتیوانان کە پێی دەوترا خەللادە کوژرا، وتی دایکی هاتو پێی وترا ئەی ئوم خەللادە کورەکەت کوژرا، ئەویش دەموچاوی داپۆشی بوو پێی وترا تۆ پەچەت داداوەو خەللادە کوژراوە، وتی ئەگەر خەلادم لە دەست چوو ئابڕوم لە دەست نادەم، هەواڵی ئەوە درا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی(اما لە اجر الشهیدین) واتە(ئەوە پاداشتی دوو شەهیدی هەیە) دەڵێت: وترا بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی(چونکە ئەهلی کیتاب کوشتیان).[2][3]

---

[1]-.( ئیبن نەجار لە ئەنەسەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٧، ص٧٦ دا هاتووە.

[2] – ضعیف.

[3]- ئەبونەعیم لە عەبدولغەیری کوڕی قەیسی کوڕی شەمالس لە باوکی لە باپیری یەوە هێناویەتی. لە کنزالعمال ج٢، ص١٥٧ داهاتووە، ئەبو یەعلایش لە ڕێگەی عەبدولغەیری کوڕی قەیسی کوڕی پابتی کوڕی شەمالس لە باوکی لە باپیری یەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی. هەروەك لە الآصابە ج١، ص٤٥٤ داهاتووە دەڵێت: ئیبن مندە دەڵێت غەریبەو تەنها لەم ڕووەوە بەدی دەکەین.

بەزار لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئوم سولەیمە هات بۆ لای ئەبوئەنەس وتی ئەمڕۆ هاتم بەشتێکەوە کە پێت ناخۆشە، وتی بەردەوام لە لای ئەو دەشتەکیەوە بەشتێ دێیت کە جێی ناحەزیمە، وتی: دەشتەکیەکە لە خوا هەڵی بژاردووەو کردوویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ)، وتی پێی ئەوت هێناوە؟ وتی مەی حەرام کردووە، وتی دەی ئەوە جیاکاری نێوان منو تۆیە، بە بێباوەڕی مرد. ئەبو تەلعە هات بۆ لای ئوم سولەیم وتی من شوت بۆ ناکەم تاکاتێ بێباوەڕبیت. وتی بەخوا ئەمە کاتی تۆ نییە وتم ئەی چی یە؟ وتی لە زەردو سپیدایە، وتی دەی من تۆو پێغەمبەری خواش بەشایەت دەگرم ئەگەر مسوڵمان بویت بە ئیسلام بونت ڕازی دەبم، وتی دەی چی بکەم؟ وتی ئەی ئەنەس هەستە لەگەڵ مامت بڕۆ، ئەویش هەستاو دەستی خستە سەرشانمو چووین تا لە پێغەمبەر(ﷺ) نزیك بووینەوە دەنگی بیستین فەرمووی ئەوە ئەبو تەلعەیە عیزەتی ئیسلام لەنێو چاوانیدایە، سەلامی کرد لە پێغەمبەری خوا، وتی(اشهد ان لاإله إلاالله وان محمد عبده ورسوله) پێغەمبەریش(ﷺ) لەسەر بنەمای ئیسلام لێی مارەبڕی ژنەکە منداڵێکی لەو بوو دواتر غوڵامەکە لە لایەن باوکییەوە جێی سەرنج بوو، خوای گەورە بردییەوە بۆ لای خۆیو ئەبو تەلعە هات وتی: ئەی ئوم سولەیمە کوڕەکەم چی کرد؟ وتی: باشە وتی نان ناهێنێت ئەمڕۆ نانت درەنگ هێنا؟ ئوم سولەیمە وتی: نانم بۆبرد وتم ئەبو تەلعە خەڵکی شتێکیان بەئەمانەت داناوو تاکاتێو دواتر ناردیان بۆ ئەمانەتەکەیانو بردیانەوە ئایا هیچیان لەسەرە؟ وتی نا، وتی دەی کوڕەکەت دنیای بەجێهێشت؟ وتی ئەی کوا؟ وتی ئائەوەتا لە ویدایە، ئەویش چوو سەری دەرخستو گەڕایەوەو چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و قسەکەی ئوم سولەیمی بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی(والذی بعثنی بالحق لقد قذف الله تبارك وتعالى فی رحمها ذكرا على ولدها) واتە(سوێند بەوەی منی بەحەق نارد خوای گەورە لەبەر خۆڕاگری لەسەر خۆڕاگری بۆ کوڕەکەی کوڕێکی خستوەتە ناو ڕەحمیەوە) ئوم سولەیم کوڕەکەی بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەی ئەنەس بڕۆ بۆ لای دایکتو

پێی بڵێ ئەگەر ناوکی کوڕەکەت بڕی هیچی پێمەدە تابینێری بۆ لام) دەڵێت: ئەویش دایە باوەشی تاهێنایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و خستمە بەردەستی، ئەویش فەرمووی(سێ خورمای عەجوەم بۆ بهێنە) منیش بۆم هێناو پێغەمبەر(ﷺ) ناوکەکەی فڕێداوو تەڕییەکەی خستە ناو دەمی و دواتر دەمی منداڵەکەی کردەوەو خستیە ناودەمی و زمانی بە دەمیدا دەهێناو دەیفەرموو(انصاری یحب التحر) (پشتیوانی خورمای خۆش دەوێت) فەرمووی(بڕۆ بۆ لای دایکت و بڵێ(بارك لله الك فیە وجعلە برا تقیا) (خوا بەرەکەتی بخاتە ناو بۆتو بیکات بە چاکەکاری لەخواترس).[1]

بوخاری ج٢، ص٨٢٢ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبو تەلعە کوڕێکی هەبوو کە نەخۆش بوو، ئەبو تەلعە دەرچوو کوڕەکەی مرد. کە ئەبوتەلعە گەڕایەوە وتی کوڕەکەم چی دەکات؟ ئوم سولەیم وتی لە جارانی ئارامترە، نانی شەوی بۆ هێناو دواتر چوویە لای، کە لێبویەوە وتی کوڕەکەم بێنن کە بەیان بویەوە ئەبوتەلعە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت چی بووە، فەرمووی(اعرستم لیلة) واتە(ئەمشەو چونەتە لای یەکتر؟) وتی بەڵێ، فەرمووی(اللهم بارك لهما)(خوایە بەرەکەتیان بۆ دابنێ) ئەوەبوو ئوم سولەیم منداڵێکی بوو، ئەبوتەلعە وتی بیپارێزە تا دەیبەیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هێنای بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لەگەڵیدا حەوت خورمای نارد پێغەمبەر(ﷺ) گرتی و فەرمووی هیچی لەگەڵە؟ وتیان بەڵێ خورما پێغەمبەر(ﷺ) خورماکەی گرت و......دواتر خستیە ناودەمی و دواتر خستیە

---

[1]- هەیسەمی ج، ص(٢٦١) دەڵێت: بەزار هێناویەتی و کەسەکانی صەحیحن جگە لە ئەحمەدی کوڕی مەنسوری ڕومادی کە جێ متمانەیە، لە گێڕانەوەیەکی دیکەی بەزاردا ئوم سولەیم پێی وت: شوو بە تۆ بکەم کە دارێك دەپەرستیت کە فلان بەندەی مـن تاشیویەتی، کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، ئیبن سەعد ج٨، ص٣١٦ لە ئەنەسەوە بەبێ باسی چیرۆکی مسوڵمانبوونی ئەبو تەلعە هێناویەتی.

ناودەمی منداڵەکەو پیایدا هێناو ناوی نا عەبدوڵلا، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا ج١، ص١٧٤ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لعل الله ان يبارك لهما في ليلتها) واتە(بەڵکو خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ئەمشەویان) سوفیان دەڵێت یەکێ لە پشتیوانان وتی نۆ کوڕیم بینین هەمویان قورئانیان خوێندبوو.

حاکم ج٣، ص٤٧٧ لە قاسمی کوڕی موحەمەدەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە ڕۆژی تائیف تیرێکی بەرکەوت و چل شەو پاش مەرگی پێغەمبەر(ﷺ) مرد، ئەبوبەکر چوو بۆ لای عائیشەو وتی کچە شیرینەکەم بە خوا وەك ئەوە وایە بەگوێی مەڕێکی گیرابێت و لە ماڵمان دەرکرابێت، وتی سوپاس بۆ خوا کە دڵی ڕاگرتیت و پێگەیشتووی پێبەخشیت. چوویە دەرو دواتر هاتە ژورەوە وتی کچەکەم دەترسی عەبدوڵلاتان خستبێتە ژێرگڵ و زیندوو بێت؟ وتی بابەگیان(إنالله وإنا إليه راجعون) وتی دەی کچی شیرینم من لە دەست شەیتانی دەرکراو پەنادەگرم بە خوای بیسەری دانا، هەرکەس دوو هاندەری هەیە یەکیان فریشتەیە دووەمیان شەیتان دەڵێت وەفدی ثەقیف هاتن بۆ لای و هێشتا ئەو تیرەی لابوو، هێنای بۆیان وتی کەستان ئەم تیرە دەناسێ؟ سەعدی کوڕی عوبەید لە بەنی عەجلان وتی ئەوە تیرێکە من تراشم کردبوو،چووم بە دوایداو وەشاندم، ئەبوبەکر وتی دەی ئەم تیرە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری کوشت، سوپاس بۆ خوا دەستی تۆ ڕێزداری کردو بە دەستی خۆی لەناو نەچوو، چونکە تای زۆربوو.[1]

ئیبن سەعید لە عەمری کوڕی سەعیدەوە هێناویەتی عوسمان(رضي الله عنه) ئەگەر کوڕێکی ببوایە داوای دەکرد بیهێنن کە هێشتا لەناو بەرگدابوو بۆنی دەکرد، پێی وترا بۆچی وادەکەیت؟ وتی حەزدەکەم ئەگەر شتێکی توش ببوو لە دڵمدا شتێکی بچێتە دڵم واتە خۆشەویستی.[2]

---

[1] – بەیهەقی ج٩، ص٩٨.

[2] – لە کنزالعمال ج٢ص١٥٧ دا واهاتووە.

ئەبونەعیم لە ئەبوزەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێی وترا تۆ کەسێکیت کوڕت بۆ نەماوە، وتی سوپاس بۆ خوا کە لە ماڵی لە ناوچونەوە دەیان باتو لە ماڵی مانەوەدا دایان دەنێت.[1]

حاکم ج٣، ص٢٢٧ لە عومەری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتابەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر تووشی موسیبەتێك دەبوو دەیوت موسیبەتی زەیدی کوڕی خەتتاب تووش بووم خۆم ڕاگرت، عومەر بکوژێ زەیدی بینی پێی وت هاوار بۆت برایەکی منت کوشت هەردەم یادی دەکەم.

بەیهەقی ج٩، ص١٩٧ لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: کە حەمزە لە ڕۆژی ئوحود کوژرا صەفیە هات بە دوایدا دەگەڕاو نەیدەزانی چی بووە، گەیشت بە عەلیو زوبەیرو عەلی بە زوبەیری وت: باسی بکە بۆ دایکت زوبەیر بە عەلی وت نا تۆ باسی بکە بۆ پورت، صەفیە وتی حەمزە چی لێهات؟ ئەوانیش وایان نیشاندا کە نازانن، صەفیە هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی(إني اخاف على عقلها) واتە(ترسم هەیە بەرامبەر بە عەقڵی) دەستی خستە سەر سنگی صەفیەو نزای کرد، ئەویش گەڕایەوەو گریاو دواتر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتو لەسەر تەرمی حەمزە وەستا کە شێوێنرابوو، فەرمووی(فلولا جزع النساء لتركته حتى يحصل من حواصل الطير وبطون السباع) واتە(ئەگەر لەبەر ئازاری ژنان نەبووایە وازم لێدەهێنا تا لەناو سکی باڵندەکانو سکی ئاژەڵە دڕندەکاندا بێت) پاشان فەرمانی کرد کوژراوەکان بهێنن، نوێژی لەسەریان دەکردو نۆنۆ دایان دەنانو حەمزەش لەناویاندابوو الله اکبری لەسەریان دەکرد حەوت جار، پاشان لادەبرانو حەمزە دەهێڵرایەوە پاشان نۆی تر دەهێنران. بەوشێوەیە دەبرانو حەمزە دەهێڵرایەوە تا هەموویان تەواوبوون[2][3].

---

[1] – لەکنزالعمال ج٢، ص١٥٧ دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

[3]– ئیبن ئەبی شەیبەو تەبەرانی بە هەمان شێوە لە ئیبن عەبباسەوە هێناویانە. وەك المنتخب ج٥، ص١٧٠ داهاتووە، بەزاریش هێناویەتی، وەك لە المجمع ج٦، ص١٨١ دا هاتووەو دەڵێت: لە سەنەدەکەی بەزارو تەبەرانیدا یەزیدی کوڕی ئەبوزیاد هەیە کە لاوازە.

بەزارو ئەحمەدو ئەبویەعلا لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە هێناویانە لە ڕۆژی ئوحوددا ئافرەتێك دەهات و دەچوو خەریکبوو بەسەر کوژراوەکاندا بگەڕێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حەزی نەکرد ژنەکە کوژراوەکان ببینێت فەرمووی(ئەو ژنە ئەو ژنە) زوبەیر وتی سەیرم کرد صەفیەی دایکمە، وتی چووم بە دویداو پێی گەیشتم پێش ئەوەی بگات بە کوژراوەکان، ئەویش پاڵی ناو دای لە سنگم- ئافرەتێکی زەبر بەدەست بوو- وتی بڕۆ دور بگرە لێت ڕازی نابم، وتم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕێت پێنادا، ئەویش وەستاو دوو جلی پێبو دەری هێناو وتی ئەم دوو جلەم هێناون بۆ حەمزەی برام بیستومە کوژراوە بەمانە کفنی بکەن. دەڵێت دوو جلەکەمان برد تاحەمزە بخەینە ناویان لە پاڵیدا یەکێ لە پشتیوانان کوژرابوو وەك حەمزەی پێکرابوو، وتمان جلێ بۆ حەمزەو جلێ بۆ پشتیوانیەکە، پێوانەمان کرد یەکێکیان لەوی دیکە گەورەتر بوو، قورعەمان کرد لە نێوانیانداو هەریەکەیانمان خستە ناو ئەوجلەی بۆ دەرچوو[1،2].

ئیبن ئیسحاق لە زوهریو عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەو موحەمەدی کوڕی یەحیا و جگە لەویشەوە لەسەر کوشتنی حەمزە هێناویەتی دەڵێت: صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب هات هەتا سەیری براکەی بکات، زوبەیر پێی گەیشت و وتی دایەگیان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانت پێدەکات بگەڕێیتەوە وتی بۆچی خۆ بیستوومە تەرمی براکەم شێوێنراوە، ئەمەش لەبەر خوا. لەسەر ئەمە پشت بەخوا خۆمدەگرم و چاوەڕێی پاداشتم، زوبەیر هات و هەواڵی دایە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی(خل بسبيلها) (ڕێی بدە) ئەویش هات بۆ لایو داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد، پاشان فەرمانی کرد خرایە ژێر خاك.[3]

---

[1] –حسن.

[2] – هەیسەمی ج٦ص١١٨ دەڵێت لە سەنەدەکەدا عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوزناد هەیە کە لاوازەو متمانەشی پێدراوە تەواو.

[3] – لە الأصابە ج٤، ص٣٤٩ دا واهاتووە.

ئەحمەد لە ئوم سەلەمەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت ئەبوسەلەمە(رضي الله عنه) ڕۆژێك لە لای پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لام وتی قسەیەکم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیست کە پێی دڵخۆشبوم فەرمووی(لايصيب احدا من المسلمين مصيبة فيرتجع عند مصيبة ثم يقول اللهم آجرني من مصيبتي واخلف لى خيرامنها إلا فعل به) (هەرمسوڵمانێك تووشی موسیبەتێك بێت‌و لە کاتی موسیبەتەکەدا بەخۆدا بچێتەوەو دواتر بڵێت خوایە لەو موسیبەتەم پاداشتم بدەرەوە چاکترم لەمە بۆ بەدوادا بێنە خوا لەگەڵیدا دەکات) ئوم سەلەمە دەڵێت: ئەوەم لە لا لەبەرکرد. کە ئەبوسەلەمە مرد بەخۆدا چوومەوەو ئەوەم وت. پاشان گەڕامەوە بۆ لای خۆم وتم من لە ئەبوسەلەمە چاکترم چۆن دەست کەوێت؟ کە ماوەکەم تەواوبوو پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی لاکردم منیش سەرقاڵی خۆشەی پێستەیەك بووم، دەستم شۆردو مۆڵەتم داو ڕاخەرێکی پێستەم بۆ دانا کە ناوەکەی لیف بوو، لە سەری دانیشت‌و لای خۆم داوای کردم، کە لە قسەکەی بویەوە وتم ئەی پێغەمبەری خوا بەخوا هیچم نییە لەوەی حەزم بۆ تۆ هەبێت، بەڵام من ژنێکم غیرەیەکی زۆرم هەیە دەترسم شتێ لەوم لێ ببینی‌و خوا لەسەر ئەوە سزام بدات، من ژنێکم بە تەمەندا چووم‌و مناڵم هەیە، فەرمووی(ئەوەی باسی غیرەت کرد خوا لێت لادەبات، ئەوەی باسی تەمەنت کرد منیش وەك تۆم، ئەوەی باس ماڵ‌و مناڵت کرد ماڵ‌ومناڵی تۆ ماڵ‌و مناڵی منە) وتی: منیش قسەی پێغەمبەرم(ﷺ) وەرگرت، ئوم سەلەمە وتی: خوای گەورە لە بری ئەبوسەلەمە چاکتر لەوی پێدام کە پێغەمبەری خوا بوو[1].[2]

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەحمەد وئیبن عەساکیر لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: لە حەجێك یان لە عەمرەیەکەوە دەهاتین‌و گەیشتین بە(ذی لعولیفە) کە منداڵانی

---

[1] – صحیح.

[2] – نەسائی‌و ئیبن ماجەو ترمڤی هێناویانە دەڵێت: حەسەنی غەریبە. لە البدایە والنهایە ج٤، ص٩١ دا هاتووە ئیبن سەعد ج٨، ص٦٣و ٦٤ هێناویەتی.

پشتیوانان لەوێ بە کەس‌وکاریان دەگەیشتن بە ئوسەیدی کوڕی.....سەرەخۆشیان لێکرد لەسەر ژنەکەی، ئەویش سەری داپۆشی و کەوتە گریان، وتم خوا لێت خۆشبێ تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوایت و پێشینەت هەیە بۆچی بۆ ژنێك دەگریت؟ ئەویش سەری لابرو وتی بەخوا ڕاست دەکەیت دەبوو لە دوای سەعدی کوڕی موعاذ بۆ کەس نەگریم کە پێغەمبەر(ﷺ) وای لەسەر فەرموو، وتم چی لەسەر فەرموو، وتی فەرمووی(لقد هتز العرش لوفاة سعدبن معاذ) واتە(عەرشی خوا بۆ مەرگی سەعدی کوڕی موعاذ لەریەوە) عائیشە دەڵێت: ئەو لە نێوان من و پێغەمبەر(ﷺ) دا دەچوو[1][2].

ئەبونەعیم الحلیة ج٤، ص٢٥٣هێناویەتی دەڵێت کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(رضي الله عنه) هاتە سەر مەرگی عوتبەی برای و گریا، پێی وترا دەگریت؟ وتی برامە لە ڕەچەڵەکدا و هاوەڵمە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەمەشدا حەزناکەم پێش ئەو بوومایە، بمرێت و خۆڕابگرم لام خۆشترە لەوەی من بمرم و ئەو خۆبگرێ. لە ئیبن سەعد ج٤، ص٩٤ لە خەیسەمەوە هێناویەتی کە هەواڵی مەرگی عوتبە گەیشت بە ئیبن مەسعودی برای چاوەکانی فرمێسکیان ڕشت و وتی ئەمە سۆزێکە خوای گەورە دایناوە و مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەریدا نییە.

---

[1] – صحیح.

[2]– لە کنزالعمال ج٧، ص٤٢ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٣، ص١٢ و حاکم ج٣، ص٢٨٩ لە عائیشەوە بەوجۆرە هێناویانە، حاکم دەڵێت لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە و بوخاری و موسلیم نەیان هێناوە، زەهەبی دەڵێت صەحیحە، ئەبونەعیم لە عائیشەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە کنزالعمال ج٨، ص١١٨ دا هاتووە بەڵام لە لای ئەو دەڵێت: ئایا حەقە نەگریم کە بیستم پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو(اهتز العرش اعواده لموت سعد بن معاذ) تەبەرانی هێناویەتی وەك المجمع ج٩، ص٣٠٩ دا هاتووە وتی چۆن نەگریم کە بیستوومە بە هەمان شێوە دەیهێنێت سەنەدەکان هەموویان حەسەنن.

ئیبن سەعید ج٨، ص٨٠ لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سولەیتەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوئەحمەدی کوڕی جەحشم بینی پشتیەکەی زەینەبی کچی جەحشی دەگرت و دەگریا و بینی عومەر وتی ئەبو ئەحمەد ئەو سەرینە دووربخەرەوە تا خەڵکی تێنەکەون و قەرەباڵغی لەسەر سەرینی بکەن، ئەبوئەحمەد وتی ئەی عومەر ئەمە بوو کە بەهۆیەوە هەموو خێرێکمان بەرکەوت ئەمەش گەرمی بارم سارد دەکاتەوە. عومەر وتی دەی بیگرە کۆش، بیگرە کۆش.

ئیبن سەعد ج٤، ص ١٩ و ئیبن مونیع و ئیبن عەساکیر لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە هێناویانە دەڵێت: بیستم عومەری کوڕی خەتتاب دەیوت: قوڕەیش سەرکردەی خەڵکن هەرکامیان بچێت بە دەرگایەکدا دەستەیەکی خەڵك لەگەڵیدا دەچنە ژوور، نەمزانی واتای قسەکەی چیبوو تا پێکرا، کە سەرەمەرگی هات فەرمانی کرد بە صوهەیب بەرنوێژی بکات بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، فەرمانی کرد نان بۆ خەڵك دابنێن تا نان بخۆن تا کەسێك دەکەن بە خەلیفە، کە لەخستنە ژێر خاکی بوونەوە نان هێنراو سفرە ڕاخراو خەڵکی لەبەر دڵتەنگیەك کە هەیانبوو بۆی نانیان نەخوارد، عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب وتی: خەڵکینە پێغەمبەر(ﷺ) مردو دوای ئەو نان و ئاومان خوارد، بۆ ئەبوبەکریش هەروابووین، ئێستاش دەبێت نان بخۆین دەی لەم نانە بخۆن پاشان عەبباس دەستی بردو نانی خواردو خەڵکیش دەستیان بردو نانیان خوارد. ئینجا لەوقسەی عومەر تێگەیشتم.[1,2]

ئیبن ئەبی خەیسەمەودەینەوەری لە المجالسە وئیبن عەساکیر لە ئەبی عوبەیبنەوە هێناویانە دەڵێت ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) ئەگەر سەرەخۆشی لە

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە(کنزالعمال ج٧، ص٦٧) دا هاتووە، تەبەرانی بە هەمان شێوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٥، ص١٩٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەلی کوڕی زەید هەیەو فەرموودەی حەسەنەو کەسەکانی دیکەی صەحیحن.

هەرکەس بکردایە دەیوت لەگەڵ پرسەو سوکترو ئەدەی دواتری سەخت ترە، بیری لە دەستدانی پێغەمبەر بکەنەوە موسیبەتتان لا بچووك دەبێتەوە، خواپاداشتان بەرز ڕاگریٚ.[1]

ئیبن عەساکیر لە سوفیانەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوتالیب سەرەخۆشی لە ئەشعەسی کوڕی قەیس کرد لەسەر مردنی کوڕەکەی وتی ئەگەر خەفەت بخۆیت ئەوا سۆزداری بۆتان شیاوە، ئەگەر خۆڕابگریت خوا بە دوای کوڕەکەتدا چاکتر دێنیٚ، ئەگەر خۆت ڕاگرت قەدەر بەسەرتدا هەنگاو دەنیٚ و پاداشت وەردەگریت. ئەگەریش نارەحەت بیت قەدەر هەر دەڕوات بەسەرتداو تۆ تاوانبار دەبیت.[2]

## خۆڕاگرتن لەسەر نارەحەتیەکان بە گشتی

بەزار لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە بوو ژنێکی پشتیوانان هات و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەم پیسیە بەسەرمدا زاڵ بووە، پێی فەرموو(إن تصبری علی ما انت علیە تجیئی یوم القیامة لیس علیك ذنوب ولا حساب) (ئەگەر خۆڕاگربیت لەسەرئەوەی لەسەریتی لەڕۆژی دوایدا دێیت و هیچ تاوان و لێپێچینەوەیەکت لەسەر نیە) وتی سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە خۆم ڕادەگرم تا دەگەمەوە بەخوا، وتی دەترسم ئەم پیسیە جلم لەبەر لابات، پێغەمبەر(ﷺ) نزای بۆ کرد کە توش بوو بە پەردە پۆشی کەعبە داپۆشریٚ و ئەویش پێی دەوت: دەست دابخە، بەوەی لەسەری نەدەما. ئەحمەد لەعەتاوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عەبباس پێی وتم ئایا ژنێکت نیشان بدەم لەئەهلی بەهەشتە؟ وتم بەڵیٚ، وتی ئەو ڕەشە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی من پەرکەمم هەیە و بەرگم لەبەر نامێنیٚ لای خوا نزام بۆ بکە فەرمووی(ئەگەر دەتەوێت

[1] – لە کنزالعمال ج٨ ص١٢٢ داهاتووە.

[2] – لە کنزالعمال ج٨، ص١٢٣ دا هاتووە.

خۆڕابگرەو بەهەشتت بۆ هەیە، ئەگەریش دەتەوێت لای خوا نزات بۆ دەکەم تا چاکت بکاتەوە) وتی نا خۆم ڕادەگرم دەی لای خوا نزام بۆ بکە لەشم دەرنەکەوێت، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای بۆ کرد. بوخاری و موسلیم بەو شێوەیە هێناویانە دواتر بوخاری لە عەتاوە دەڵێت: ئوم زوفری بینی ئەو ژنە ژنێکی ڕەشی درێژبوو لەبەر سێبەری کەعبەدا[1، 2].

بەیهەقی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەغلەفەوە هێناویەتی ئافرەتێك لە سەردەمی نەفامیدا یاخی ببوو کەسێك دەیدا بەلایدا یان ئەو دەچوو بۆ لای دەستی بۆ دەکردەوە ژنەکەی دەیوت بەسە خوا هاوەڵدانانی نەهێشتو ئیسلامی هێنا، پیاوەکە وازی هێناو چوو سەیری کرد تا ڕووی دای لە دیوار، پێغەمبەر(ﷺ) هاتو ئەوەی بۆ باسکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(انت عبدا اراداللە بك خیرا، إن الله اذا اراد بعبد خیرا عجل له عقوبة ذنبه واذا اراد بعبد شرا امسك علیه بذنبه حتی یوافی به یوم القیامة) واتە(تۆ بەندەیەك بویت خوا چاکەی بۆ ویستیت خوا ئەگەر چاکەی بۆ بەندەیەکی بوێت سزای تاوانی بۆ پێش دەخاتو ئەگەر خراپەی بەبەندەیەك بوێت تاوانەکەی لەسەر دەهێڵێتەوە تا لە ڕۆژی دواییدا سزای بدات)[3].

ئیبن سەعدو ئیبن ئەبی شەیبەو عەبدی کوڕی حەمیدو ئیبن مونزیرو بەیهەقی لە عەبدوڵڵای کوڕی خەلیفەوە هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ عومەر لە مەراسیمێکی بە خاك سپاردندا بووین کە قایشی نەعلەکەی دڕا، ویستی بگەڕێتەوە پاشان وتی چی ئازاری دایت موسیبەتە بۆت..... لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە دەڵێت: قایشی نەعلی عومەر دڕاو وتی(إنا لله وإنا إلیه راجعون، وتیان ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ وا دەڵێیت؟ وتی هەرشتێ ئازاری مسوڵمانان بدات موسیبەتە.[4]

---

[1] – صحیح.

[2] – لە البدایە والنهایە ج٦، ص١٦٠ دا واهاتووە.

[3] – لە کنزالعمال ج٢، ص١٥٥ دا هاتووە.

[4] – لە کنزالعمال ج٢، ص١٥٤ دا واهاتووە

مالیك و ئیبن ئەبی شەیبە و ئیبن جەریرو حاکم و بەیهەقی لە ئەسلەمەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەبو عوبەیدە(رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ عومەر(رضي الله عنه) کە ڕۆم کۆبونەتەوە و ترسیان هەیە، عومەر نامەی بۆ نووسی: پاشان هەرکات بەندەیەکی باوەڕدار سەختیەکی بۆ دابەزێتە سەر خوای گەورە بە دوای دا دەربازبوون دەهێنێت، هەرگیز سەختی بەسەر دوو ئاسانیدا سەرناکەوێت، خوا لە قورئاندا دەفەرموێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص٥٨ لە عەبدوڕەحمانی کوڕی مەهدیەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمان دوو شتی هەبوو کە ئەبوبەکرو عومەر وەك ئەو نەیان بوو، خۆڕاگری لەسەرخۆی تا بە ستەملێکراوی کوژارو کۆکردنەوەی یەك دەنگ کردنیان لەسەر قورئان.

# سوپاسکردن

## سوپاسکردنی گەورەمان موحەمەدی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)

ئەحمەد لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەرچوو و ڕووی کردە قیبلەو سوجدەیەکی دووروودرێژی برد تا وام زانی خوای گەورە گیانی کێشاوە، لێی نزیك بومەوە سەری بەرزکردەوەو فەرمووی ئەوە کێیە؟ وتم عەبدوڕەحمان فەرمووی ئیشت چیە؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا سوجدەیەکت برد ترسام خوای گەورە تیایدا گیانی کێشابیت، فەرمووی(إن الجبريل اتاني فبشرني فقال إن الله عزوجل يقول من صلى عليك صليت عليه ومن سلم عليك سلمت عليه فسجدت لله شكرا)(جبریل هات بۆ لام وتی خوای گەورە دەفەرموێت هەرکەس سەلەوانت لەسەر بدات سەلەواتی لەسەردەدەم و هەرکەس سەلامت

---

[1] – لە کنزالعمال ج٢، ص١٥٤ دا واهاتووە.

لێبكات سەلامی لێدەكەم، منیش سوجدەی سوپاس و شوكرانە بژێریم بۆ خوا برد)[1][2].

تەبەرانی لە موعازی كوڕی جەبەلەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت بەرەو لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چووم سەیرم كرد نوێژ دەكات تا بەیانی بەپێوەبوو، سوجدەیەكی برد وامزانی تیایدا گیانی كێشراوە، فەرمووی(تدری لم ذاك) (دەزانیت لەبەرچی؟) وتم خواو پێغەمبەرەكەی باشتر دەزانن، سێ یان چوار جار لێی دوبارەكردمەوەو دواتر فەرمووی(إن صليت ماكتب لربى واتانى ربى، فقال لى فى ما اخرها ما اخفعل بأمتك؟ قلت إى رب انت اعلم، فأعادها على ثلاثا او ورابعافقالى فى اخرها فقال لى فى اخرها ما افعل بأمتك؟ قلت انت اعلم يارب قال إنى لااحزنك فى امتك فسجدنى لربى وربى شاكر يجيب الشاكرين)واته(من خوا چەندەی بۆ نوسیم نوێژم كردو چی پەروەردگارم بۆی هێنابووم، لە كۆتاییدا پێی فەرمووم چی بكەم لەگەڵ ئومەتەكەت؟ وتم ئەی پەروەردگارم تۆ داناتریت، فەرمووی لەسەر ئومەتەكەت ناهێڵم خەمباربیت، منیش سوجدەم برد بۆ پەروەردگارم و پەروەردگارم سوپاسكارەو سوپاس گوزارانی خۆش دەوێت)[3].

تەبەرانی لە عەبدورەحمانی كوڕی ئەبوبەكرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت چووم سەردانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بكەم سەیرم كرد سروشتی بۆ دادەبەزێت، كە تەواوبوو بە عائیشەی فەرموو (عەباكەمم بدەرە دەست) چوو بۆ مزگەوت و خەڵكانێ لە مزگەوتدا بوون و تەنها ئەوان لەوێبوون، لەكەناریاندا دانیشتن پاشان بیرهێنانەوەكەی بەسەربردو بە سوجدە بردنەوە لە خوێندندا بوو سوجدەیەكی

---

[1] – حسن.

[2] – (هەیسەمی ج٢، ص٢٨٧ دەڵێت ئەحمەد گێڕاویەتیەوە).

[3] – (هەیسەمی ج٢، ص٢٨٨ دەڵێت: تەبەرانی لە.....كوڕی عوسمانی سەكسەسی لە موعازەوە هێناویەتی و موعازی نەبینیوە. ئیبن حبان لەناو تابعینی تابعیندا ناوی هێناوە).

دووررودرێژی برد تا ئەوانەی لە دووری دوومیل بوون و هاتن و خەڵکی ئاگاداری سوجدەکەی بوون، مزگەوتەکە پڕبوو کەسی نەدەگرت عائیشە کەسی نارد کە بچن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) شتێکم لێبینی کە پێشتر لێم نەبینی بوو، سەری بەرزکردەوە، ئەبەبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا سوجدەکەت درێژ کردەوە، فەرمووی(سجدت لربی شکرا فیهما اعطانی من امتی سجدت الفا یدخلون الجنة بغیر حساب)واتە(سوجدەی شوکرم بۆ پەروەردگارم برد لەسەرئەوەی حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم بەبێ حساب دەچنە بەهەشتەوە) ئەبوبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئوممەتەکەی تۆ زیاترو چاکترن دەی نزا بکە خوا زیاتری بکات، دوو یان سێ جار وتی بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا بە ڕاستی ئومەتەکەتت ویست.[1][2]

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کەسێك دای بەلایدا کە لەشی تەواو نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دانەوی و سوجدەی برد، ئەبەبەکر دای بەلایداو دانەوی و سوجدەی بردو عومەریش وایکرد[3][4].

بەیهەقی لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەستەیەکی لە کەس و ئەهلی خۆی ناردو فەرمووی (اللهم إن لك علی إن رددتهم سالمین ان اشکرك حق اشکرك)واتە(خوایە بەڵێنت دەدەمێ ئەگەر بە سەلامەتی گێڕانتەوە سوپاسی شیاو بە خۆت بکەم) بە سەلامەتی هاتنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(الحمدلله سابغ نعم الله)واتە(سوپاس بۆ خوا لەسەر بەخششەکانی خوا) وتم ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر تۆ وات نەفەرموو؟ فەرمووی(اولم افعل؟)واتە (دەی مەگەر نەمکرد).[5]

---

[1] – ضعیف.

[2] – (لە سەنەدەکەدا موسای کوڕی عوبەیدە هەیە کە لاوازە. وەك لە(المجمع ج٢، ص٢٨٩ داهاتووە).

[3] – ضعیف.

[4] – (لە سەنەدەکەدا عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵلا هەیە کە لاوازە وەك لە المجمع ج٢ص٢٨٩ دا هاتووە).

[5] – (لەکنزالعمال ج٢، ص١٥١ دا واهاتووە).

# سوپاسگوزاری هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)

بەیهەقی لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و داوای شتی کرد، ئەویش فەرمانی کرد خورمایەکی بدەنێ، ئەویش فڕێی دا، کەسێکی تر هاتو فەرمانی کرد خورمایەکی بدەنێ، وتی سوبحانەڵلا خورمایەك کە پێغەمبەری خوا بت داتێ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە کەنیزەکەکەی فەرمووی(إذهبی إلى ام سلمة فمريها فلتعطه الأربعين درها التی عندها)واتە(بڕۆن بۆ لای ئوم سەلەمەو بیبە بۆ لای با ئەو چل درهەمەی بداتێ کە لایەتی) هەروەها لە حەسەنەوە هێناویەتی کەسێ هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و داوای شتی کرد پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خورمایەکی پێدا، ئەویش وتی سوبحانەڵلا یەکێ لە پێغەمبەران خورمایەك دەبەخشێ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(اوماعلمت ان فيهامثاقيل ذر كثير؟)واتە(مەگەر نازانیت لەناویدا چەندین مثقال و وردیلە هەیە) کەسێکی تر هاتو داوای لێکردو خورمایەکی پێبەخشی وتی خورمایەکی پێغەمبەرێکی خوا تا ماوم ئەم خورمایە لە خۆم دورناخەمەوەو بەردەوام هیوای بەرەکەتیم هەیە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد چاکەی لەگەڵ بنوێنن و هێندەی نەبرد کابرا دەوڵەمەندبوو پێویستی نەما.[1]

ئیبن سەعدو ئیبن عەساکیر لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت عومەری کوڕی خەتتاب دای بە ناوچەی(اجنان) دا وتی بیرم دێ من لەم شوێنەدا ئاژەڵم دەلەوەڕاند بۆ خەتتاب و سوێند بەخوا ئەوەی بیزانم توندو ڕەق بوو، پاشان هاتمە ناو ئوممەتی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) پاشان ئەم شیعرەی وت:

لاشيء فيما ترى إلا بشاشة    يبقى الأ له ويودى المال والولد

پاشان بەوشترەکەی وت خوب.[2]

---

[1] – ( لەکنزالعمال ج٤، ص٤٢ دا واهاتووە).

[2] – (المنتخب كنزالعمال ج٤، ص٤١٧ دا هاتووە).

ئیبن عەساکیر لە عومەرەوەﷺ هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر دوو سوارم هەبوایە سواری سوپاس و سواری خۆڕاگری باکم نیە سواری کامیان بم.[1] عەبدوڵلای کوڕی حەمید لەعیکرمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب دای بە لای کەسێکدا کە نەخۆشی و بەڵەکی هەبوو کوێرو کەڕو لاڵ بوو، بەوانەی وت لەگەڵیدا بوون لەم کەسەدا هیچ نیعمەتێکی خوا دەبینین؟ وتیان نا، وتی با مەگەر نابینین میز دەکات و بەبێ ئەملاو ئەولا بە ئاسانی میزەکەی دەردەچێت، دەی ئەوە بەخششێکی خوایە.[2]

ئەبو نەعیم لە الحلیة لە ئیبراهیمەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتابﷺ بیستی کەسێك دەیوت خوایە من هیوام وایە خۆم و ماڵم لەپێناوو تۆ ببەخشم، عومەر وتی ئەرێ کەستان بێدەنگ نابن ئەگەر توش بوو باخۆی ڕابگرێ و ئەگەریش توش نەبوو با سوپاسی خوا بکات.[3]

مالیك و ئیبن موبارەك و بەیهەقی لە ئەنەسەوەﷺ هێناویانە بیستی عومەری کوڕی خەتتاب کەسێك سەلامی لێکرد ئەویش وەڵامی دایەوە پاشان عومەر لێی پرسی چۆنیت؟ وتی سوپاسی خوا دەکەم، عومەر وتی ئەوەم لێدەویستیت.[4]

ئیبن ئەبی حاتەم لە حەسەنی بەسریەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری: بەڕۆزیت لە دنیادا ڕازی بە، چونکە خوای بەخشندە لە ڕۆزیدا فەزڵی هەندێکی بەسەر هەندێ بەندەی تریدا داوە و بەڵایەکی تاقیکردنەوەیە، هەرکەس پێی بدرێ پێی تاقی دەکرێتەوە چۆن سوپاسی خوا بکات. سوپاسکردنی خوا دانەوەی ئەو مافەیە کە لەسەریەتی

---

[1] – ( لەالمنتخب ج٤، ص٤١٧) دا وا هاتووە).

[2] – (لەکنزالعمال ج٢ص١٥٤ داهاتووە).

[3] – (لەکنزالعمال ج٢، ص١٥٤ دا هاتووە).

[4] – (لەکنزالعمال ج٢، ص١٥١ دا هاتووە).

بەرامبەر ئەو ڕۆزییەی پێی بەخشیوە.[1] دەینەوەری لە عومەرەوە هێناویەتی وتی: سوپاس گوزاران لەگەڵ بەخششی زیاتری خوادای بۆیە هەوڵی زیار بدەی، خوا دەفەرموێت ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ﴾.[2]

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص٦٠ لە سولەیمانی کوڕی موساوە هێناویەتی عوسمانی کوڕی عەففان بانگ کرا بۆ لای کەسانێ کە کارێکی ناشرینیان هەبوو، چوو بۆ لایان سەیری کرد بلاوەیان لێکردووەو شوێنەواری ناشرینیەکەی بینی، سوپاسی خوای کردکە پێیان گەیشتو کۆیلەکەشیان ئازادکرد.

بەیهەقی لە عەلی یەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت: بەخشین پەیوەستە بە سوپاسەوەو سوپاس پەیوەستە بە زیاترەوە. هەردووکیان پەیوەستی یەکن و زیاتر ناپچڕێ لە لایەن خواوە دێت تا ئەوکاتەی سوپاسگوزاری بەندە هەبێ.

ئیبن ماجەلە موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەزیەوە هێناویانە عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی: خوای گەورە دەرگای سوپاس گوزاری ناکاتەوەو دەرگای زیادکردن لاببات، خوای گەورە نزای کردەوە دەرگای دەرگرتن و وەڵامدانەوە داناخات، کە دەرگای تەوبەکردنی کردەوە دەرگای لێخۆشبون داناخات، فەرمایشتی ناو قورئانتان بەسەردا دەخوێنمەوە(ادعونی إستجب لكم)(لئن شكرتم لئزيدنكم) ﴿ذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾(﴿مَن يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُوراً رَّحِيماً﴾.[3]

ئیبن عەساکیر لە ئەبی دەردا ئەوە هێناویەتی دەڵێت: هەرشەوێ یان ڕۆژێ خەڵکی تیایدا گەورەیی یەکیان بەڕوودا نیشان دابم بەبەخششێکی گەورەی خواییم

---

[1] – ( لەکنزالعمال ج٢، ص١٥١دا هاتووە)

[2] – ( لەکنزالعمال ج٢، ص١٥١ دا واهاتووە).

[3] – (لەکنزالعمال ج٢، ص١٥١ دا هاتووە).

داناوە لەسەرخۆم، هەروەها هێناویەتی هەرکەس وای نەبینی بەخششی خوای لەسەرە تەنها خواردن و خواردنەوە بێت ئەوا تێگەیشتنی کەم و سزای ئامادەیە.[١]

ئیبن ئەبی دنیا و ئیبن عەساکیر لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: سوپاس گوزاری لەسەر واجبە.[٢]

تەبەرانی لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق(رضی الله عنهما) هێناویەتی کاتێ ئیبن زوبەیر کوژرا شتێکی لە لابوو، لەقاپێکدا دایە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بە دوایدا گەڕاو کاتێ دۆزیەوە سوجدەی برد.[٣]

# پاداشت

## پاداشتی گەورەمان موحەمەدی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

ئەحمەد لە ئیبن مەسعودەوە(رضی الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی بەدردا هەرسێ کەس و لەسەر وشترێ بوین، ئەبولوبابە و عەلی هاوڕێی پێغەمبەر(ﷺ) بوون لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوون وتیان ئێمە بەپێ دەچین، فەرمووی(ما انتما بأقوى مني ولا انا بأغنى عن الأجرمنكما)واتە(ئێوە لە من بەهێزترنین و منیش لەپاداشتدا لە ئێوە دەوڵەمەندترو بێباکترنیم)[٤].[٥]

---

[١]- (لەکنزالعمال ج١، ص١٥٢ دا هاتووە، ئەبو نەعیم لەالحلیە ج١، ص٢٢٠و ٢١٠ دا بە هەمان شێوە لە دوو لاوەهاتووە).

[٢]- ( کنزالعمال ج٢ص١٥٢).

[٣]- (هەیسەمی ج٢، ص٢٩٠ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە و قسەیەك لەسەر هەندێ کەسی هەیە).

[٤]- صحیح.

[٥]- ( نەسائی هێناویەتی، لهالبدایه والنهایه ج٢، ص٢٦١ دا هاتووە). بەزار هێناویەتی و دەڵێت لە دوای پێغەمبەرەوە دەبوون وتیان تۆ سواربە ئێمە بەپێ دەچین، ئەوی تری بە هەمان شێوە هێناوە لەالمجمع ج٦، ص٦٩ دا هاتووە و دەڵێت لە سەنەدەکەدا عاصمی کوڕی بهولە هەیە و فەرموودەی حەسەنە و کەسەکانی دیکەی سەنەدی ئەحمەد صەحیحن).

# پاداشتی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)

تەبەرانی لە موتەلیبی کوڕی ئەبو وداعەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی بینی بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، فەرمووی(صلاة القاعد علی النصف من صلاة القائم)(نوێژی دانیشتو لەسەر نیوەی نوێژی وەستاوە) خەڵکی بەرزەپێ هەستانەوە[1][2].

ئەحمەد لە ئیبن شەهابەوە لە ئەنەسەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ مەدینەو گەرم بوو، خەڵکی گەرمیان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چویە مزگەوتو خەڵکی بە دانیشتنەوە نوێژیان دەکرد، فەرمووی(صلاة القاعد نصف الصلاة القائم)[3].

زیاد لە ئیبن ئیسحاقەوە دەڵێتو ئیبن شەهابی زوهری لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە هێناویانە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە هاتە مەدینە تووشی گەرمای مەدینەبوون تابەرەو نەخۆشی چوونو خوا ئەوەی لەپێغەمبەرەکەی دورگرت تا ئەوەی بەدانیشتنەوە نوێژیان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوونەوان بەوجۆرە نوێژیان دەکرد پێی فەرموون(بزانن نوێژی دانیشتو و نیوەی نوێژی وەستاوە) هەموو مسوڵمانان بەولاوازیەشیانەوە هەستانە سەرپێ[4][5].

ئەحمەد لە ڕەبیعی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی دەڵێت: من بەڕۆژ خزمەتی پێغەمبەرم(ﷺ) دەکرد تا نوێژی عیشای دەکرد لە بەردەرگای دادەنیشتم، کە

---

[1] – صحیح.

[2] – (هەیسەمی ج٢، ص١٥٠) دەڵێت: لە سەنەدەکەدا صاڵحی کوڕی ئەبوئەخچە ر هەیە کە زۆرینە لاوازی دەزانن. ئەحمەد دەڵێت فەرمودەی وەردەگیرێت.

[3] – کەسەکان جێی متمانەن وەك لە ئیبن حەجەر لە فتح الباری ج٢، ص٣٩٥ دا دەڵێت.

[4] – صحیح.

[5] – (البدایه والنهایه ج٣، ص٢٢٤).

دەچویەماڵەوەی دەمووت بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) پێویستی و کارێکی هەبێت، بەردەوام گوێم لێبو دەیفەرموو(سبحان الله وبحمده) تا هیلاك دەبووم یان چاوەکانم بەسەرمدا زاڵ دەبون و ڕادەکشام، ڕۆژێك کە مافی بۆی و خزمەتکردنی منی بۆی بەدیدکرد فەرمووی(ما ربيعت بن كعب سلني اعطك)واتە(ئەی ڕەبیعی کوڕی کەعب داوام لێبکە تا پێت ببەخشم) وتم ئەی پێغەمبەری بیری لێدەکەمەوە دواتر پێت دەڵێم بیرم کردەوە دنیا دادەبڕێ و دەڕوات و چی تێدایە بەشی منی تیایە، داوای ڕۆژیی دوایی لای پێغەمبەر دەکەم چونکە لای خوا پلەوپایەی بەرزە، چووم بۆ لای و فەرمووی ئەی ڕەبیعە چیت کرد؟ وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا داوات لێدەکەم لای پەروەردگار شەفاعەتم بۆ بکەیت تا لە دۆزەخ بمپارێزیت، فەرمووی(ئەی ڕەبیعە کێ فەرمانی پێکردیت بەوە؟ وتم سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردوە کەس پێی نەوتوم بەڵام کاتێ فەرموت داوام لێبکە؟ تاپێت ببەخشم تۆلای خوا ئەو پایەت هەیە سەیری باری خۆمم کرد زانیم دنیا تەواو دەبێ و دەڕواو بەشی منیشی تیادا هەیە وتم داوای ڕۆژی دوایيم دەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بێدەنگ بوو، پاشان پێی فەرمووم(إنی فاعل فأعنی علی نفسك بكثرة السجود)واتە(من ئەوە دەکەم، دەی بە سوجدەی زۆر بردن بۆ خۆت یارمەتیم بدە).[1]

موسلیم و ئەبودەردا بە کورتی هێناویانە و دەقەکەی موسلیم دەڵێت: من لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) شەو دەمامەوە و ئاوی دەست نوێژو کاروباریم ڕادەپەڕاند پێی فەرمووم(سلنی)واتە(داوام لێبکە) وتم داوات لێدەکەم لە بەهەشتدا هاودەمت بم فەرمووی(او غيرذلك)واتە(جگە لەوە ناکرێ؟) وتم ئەوەم دەوێت، فەرمووی(دەی بەسوجدەبردنی زۆر یارمەتیم بدە بۆ خۆت).[2]

---

[1]- لە البدایە والنهایە ج٣ص٣٩٥ دا واهاتووە، تەبەرانی لە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاق بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] - (لەالترغیب والترهیب ج١، ص٢١٣دا واهاتووە).

ئـیبن منـدەو ئـیبن عەسـاكیر هێناویانـە دەڵێـت فەرموودەكـە غەریبـەو لـە عەبدولجەباری كوڕی حارثی‌كوڕی مالیكی پاشان مناریەوە هێناویەتی دەڵێت: لە خاكی سوراتەوە بەوەفد هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سەلامی عەرەبم لێكرد و وتم بەیانیت باش فەرمووی(إن الله عزوجل قد حيا محمدا وامته بغير هذه التعبة بعضها عاى بعض)(خوای گەورە سەلامی موحەمەدو ئوممەتەكەی بە سەلامی جگە لەوە هێناوە، ئەوان سەلام لە یەكدی دەكەن) وتم السلام عليك ئەی پێغەمبەری خوا، پێی فەرمووم عليك السلام، پاشان فەرمووی ناوت چییە؟ وتم جەباری كوڕی حارث، فەرمووی تۆ عەبدولجەباری كوڕی حارثیت، وتم من عەبدولجەباری كوڕی حارثم، مسوڵمان بووم‌و بەیعەتم پێدا، پێی وترا ئەو مناریە یەكێكە لە سوارچاكەكانی هۆزەكەی، پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپێكی پێدام‌و لە لای پێغەمبەر(ﷺ) مامەوەو لەگەڵی جەنگم دەكرد، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی حیلەی ئەو ئەسپەم ببیستێ كە پێیدام فەرمووی(بۆچی حیلەی ئەسپەكەی حەرثی نابیستم؟) وتم ئەی پێغەمبەری خوا بیستم بەبیستنی حیلەی بێزار بویت بۆیە دەنگیم بڕی، پێغەمبەر(ﷺ)ڕێگری لەو كارە كرد،پێم وترا ئەگەر داوای نامەیەكت لە پێغەمبەر(ﷺ) بكردایە وەك چۆن ئامۆزاكەت تەمیمی داری داوای كرد، وتم ئایا زوو داوای لێكرد یان درەنگ؟ وتیان خێرا داوای لێكرد، وتم حەزم لە پەلەیە بەڵام داوا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەكەم سبەینێ لەبەردەم خوای گەورە دا بێت بەهانامەوە.[1]

بوخاری لە عەمری كوڕی تغلبەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بەخششی هەندێكی كردو بە هەندێكی نەبەخشی ئەوانیش گلەییان كرد، فەرمووی (من دەبەخشم بە هەندێ دەترسم ناڕەحەت‌و دڵگران‌و هیلاك بن‌و بۆ هەندێكیش ڕایان

[1] – (لە المنتخب ج٥ص٢١٥ دا واهاتووە).

دەگرم بۆ ئەوەی خوا خێرو دەوڵەمەندی خستووەتە دڵیان لەوانە عەمری کوڕی تەغلیب) عەمر وتی: ئەو وتەی پێغەمبەر(ﷺ) لەوشتری سوور لام ئازیزتربوو.[1]

بەیهەقی لە عەمری کوڕی حەمادەوە هێناویەتی دەڵێت کەسێك بۆی گێڕاینەوە وتی: عەلی و عومەر لە تەواف دەرچوون دەشتەکیەکەیان بینی دایکێکی لەگەڵ بوو لە کۆڵی نابوەوەو دەیوت:

انا مطیتها لاانضر وإذ لرکاب ذعدت لا اذعد

وما حملتنی وارضعتن اکثر

لبیك اللهم لبیك: عەلی وتی ئەبوحەفس بمانبە بۆ تەواف بەڵکو ڕەحمەت دابارێ و ئێمەش بگرێتەوە، ئەویش تەوافی پێدەکردو هەمان شیعرو قسەی پێشوی دەوت.

عەلیش دەیوت:

ان تبرها فالله اشکر یجزیك بالقلیل الأکثر[2].[3]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ص٣٠٠ لە مەیمونی کوڕی مهرانەوە هێناویەتی دەڵێت هاوەڵانی نەجدەی حروری دایان بە لای وشترێکی عەبدوڵلای کوڕی عومەرداو بردیان لەگەڵ خۆیانداو شوانەکەی هات و وتی ئەی ئەبەعەبدوڕەحمان چاوەڕێی وشترەکەت مەبە؟ وتی بۆچی؟ وتی هاوەڵانی نەجدە دایان بەلایداو بردیان، وتی چۆن بردیان و تۆیان واز لێ هێنا؟ وتی منیان لەگەڵی برد من لەدەستیان ڕامکرد، وتی بۆچی کە ئەوانت بەجێهێشت هاتی بۆ لام؟ وتی تۆ لەوان بۆ من خۆشەویستری، وتی خوایەك یەك هاوەڵی نیەو تەنهایە من لەوان لات خۆشەویسترم؟ ئەویش سوێندی بۆ خوارد، ئەویش وتی دەی بۆ پاداشتی تۆیش

---

[1] – (لەالبدایە والنهایە ج٢، ص٥١٨ لەڕێگەی عەمری کوڕی تغلبەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] – ضعیف.

[3] – (لەکنزالعمال ج٨ص ١٣٠ دا واهاتووە).

چاوەڕێم وەك ئەو، بۆیە ئازادی کردو ئەویش هێندەی مایەوە مایەوەو دواتر کەسێ هات بۆ لای وتی فلان وشترت دەوێت، ناوەکەی برد؟) ئەوەتا لە بازاڕدایە، وتی ئادەی عەباکەم نیشان بدە، کاتێ خستیە سەرشانی و هەستا دانیشت و عەباکەی دانا، پاشان وتی من چاوەڕێی پاداشتی بووم لە ڕۆژی دواییدا بۆیە ناچم بۆی.[1]

ئیبن سەعد ج٤ص١٢٥ لە عەمری کوڕی دینارەوە هێناویەتی ئیبن عومەر(رضي الله عنه) ویستی هاوسەرگیری نەکات، حەفصە پێی وت هاوسەرگیری بکە ئەگەر مردن لەسەریان پاداشت وەردەگریت و ئەگەریش بمێننەوە نزات بۆ دەکەن(منداڵی مەبەست بوو).

ئیبن سەعد(ج٣، ص٢٨٥) لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزاوە لە عەماری کوڕی یاسرەوە هێناویەتی کە لە کەناری فوراتەوە بۆ صەفین دەچوو وتی: خوایە ئەگەر بزانم وا زیاتر ڕازی دەبیت لەم شاخەوە خۆم بخەمە ناوی دەیکەم. خوایە ئەگەر بزانم ڕەزامەندی زیاتر بەوەڕازیت ئاگرێکی گەورە بکەمەوەو بخنکێم دەیکەم. چونکە من تەنها لەبەر تۆ دەجەنگم و من هیوام وایە زیان مەندو ماڵ وێرانم نەکەیت و من تەنها نیازی تۆم مەبەستە.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص٢٨٧ لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە هێناویەتی دەڵێت: خێرێ ئەمڕۆ دەیکەم لام خۆشەویست ترە کە دوو بەرامبەری لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بکەم چونکە ئێمە کاتێ لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین ڕۆژی دواییمان لا گرنگ بووو دنیامان لە لا گرنگ نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ دنیا ڕووی تێکردووین.[3]

---

[1]– ( لەالاصابە ج٢، ص٣٤٨ دا هاتووە. سراج و ئەبونەعیم بە سەنەدی صەحیح لە مەیمونەوە هێناویەتی).

[2]– (ئەبونەعیم لەالحلیە ج١، ص١٤٣ لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا لە عەممارەوە بە هەمان شێوە بە کورتی هێناویەتی).

[3]– ( تەبەرانی لە عەبدوڵڵاوە بە هەمان شێوە هێناویەتی،هەیسەمی ج٩، ص٣٥٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن).

# ئیجتیهاد لە پەرستندا

## ئیجتیهادی پێغەمبەر(ﷺ) لە پەرستندا

بوخاری و موسلیم لە عەلقەمەوە رضي الله عنه هێناویانە دەڵێن: پرسیارم کرد لە عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت) ئایا پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژانە شتێکی تایبەت دەکرد؟ وتی نا کارەکانی هەمیشە بوون، کامتان هەیە بەرگەی ئەوە بگرێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرگەی دەگرت.[1]

بوخاری و موسلیم لە موغەیرەی شوعەیبەوە رضي الله عنه هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەستا تاقاچەکانی سکالأیان هەستا پێی وترا مەگەر خوا لەڕابردوو داهاتووی تاوانت خۆش نەبووە؟ فەرمووی(اخلا اکون عبدا شکورا)(ئایا بەندەیەکی سوپاس گوزارنەبم)[2] لەباسی نوێژدا زیاتری لەسەری دەچین.

## ئیجتیهادی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەبونەعیم ل(الحلية ج١، ص٥٦ لە زوبەیری کوڕی عەبدوڵڵا لە دایەگەورەیەوە کە پێی دەوترا زهمیە هێناویەتی دەڵێت: عوسمان لە ساڵدا بەڕۆژوبوو بەشەو هەڵدەسا مەگەر سەرەتای شەو. ئیبن ئەبی شەیبە بە هەمان شێوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن زوبەیر لە پەرستشدا گەیشتە ئاستێ کەس پێی نەدەگەیشت، لافاوێك هات و خەڵکی تەواف دووری گرت ئیبن زوبەیر هات و حەفتەیەك بەمە لە تەوافی دەکرد.[3]

ئیبن جەریر لەقەتەنی کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن زوبەیر حەوت ڕۆژ بەردەوام بوو تا وشك دەبوونەوە، هەروەها لە هیشامی کوڕی عرەوەوە دەڵێت:

---

[1] – (لە الصفه الصفوه ص٧٤ دا واهاتووە).

[2] – ( لەالبدایە والنهایە ج٦، ص١٥٨ دا واهاتووە، ئیبن سەعد ج١، ص٣٨٤لە موغەیرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[3] – (لە المنتخب ج٥، ص٢٢٦ دا واهاتووە).

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر حەوت ڕۆژ بەردەوام بوو کە تەواو بوو پیربوو کردی بەسێ ڕۆژ.[1]

# دلێری

## دلێری گەورەمان موحەمەدی پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵانی

بوخاریو موسلیم دەقەکەی هی موسلیمە= لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) چاکترینی خەڵکو بەخشندەترین بوو. خەڵکی مەدینە شەوێك ترسانو هەندێ کەس بەرەو لای دەنگەکە چوونو پێغەمبەر(ﷺ) دەگەڕایەوە گەیشت پێیان ئەویش بەرەو لای دەنگەکە چووبوو لەسەر ئەسپێکی ئەبوتەلحە بوو کە شمشێری لە گەردندابوو دەیفەرموو(نەترسن، نەترسن) فەرمووی(ئەمە دەریایە) دەڵێت ئەسپەکە سوك دەڕۆیشت. موسلیم هێناویەتی ناڵەیەك هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئەسپێکی ئەبوتەلحەی کرد کە پێی دەوترا(مەندوب) سواری بووو فەرمووی(ترسمان بەدینەکردو بە دەریامان بینی) دەڵێت کە سەختی توندی دەکرد خۆمان دەخستە پەنای پێغەمبەر(ﷺ) ئەحمەدو بەیهەقی لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە هێناویانە دەڵێت: لە ڕۆژی بەدر بۆ خۆپاراستن لە بێباوەڕان خۆمان دەدایە بەر پێغەمبەر(ﷺ )و ئەو لە هەمووان بەهێزترو سەرسەختربوو.[2]

بوخاری لەئەبوئیسحاقەوە هێناویەتی لە بەرائی کوڕی عازبی بیستو یەکێ لە قەیس پرسیاری لێکرد ئایا لەڕۆژی حونەین ڕاتان دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ )؟ وتی بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕای نەکرد. هەوەزان تیرهاوێژبوونو ئێمە کە هەڵمەتمان بۆ بردن ڕایان کردو ئێمەش دامان بەسەر دەستکەوتدا، ئەوانیش تیر بارانیان کردین، پێغەمبەر(ﷺ)م لەسەر وڵاخە سپیەکە بینی ئەبوسوفیان ڕەشۆکەی گرتبوو ئەویش

---

[1] - ( لەالمنتخب ج٥، ص٢٢٦ دا واهاتووە)، دواتر چیرۆکی ئەو دوانەو هاوەڵانی دیکەش لە نوێژکردندا باس دەکەین.

[2] - لە(البدایە والنهایە ج٦، ص٣٧) دا هاتووە.

دەیفەرموو(انا النبی لاکذب) (من پێغەمبەرم درۆ نیە) لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا کە فەرمووی(انا النبی لا کذب انا إبن عبدالمطلب) لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا لەسەر ولاخەکەی دابەزی.[1] لای موسلیم لە بەرائەوە هاتووە پاشان دابەزیو داوای کرد سەری بخەن دەیفەرموو:

انا النبی لاکذب انا إبن عبد المطلب

اللهم نزل نصرك

بەڕاء دەڵێت: ئێمە کە سەختی بهاتایە خۆمان دەخستە پەنای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)چونکە دلێرێك بوو پەنای دەدرایە بەر.[2] پێشتریش چیرۆکی دلێری ئەبوبەکرو عومەرو عەلیو تەلحەو زوبەیرو سەعدو ئەبو..... وخالیدی کوڕی وەلیدو میقدادی کوڕی عەمرو موعاذو بەرائی کوڕی مالیكو عەمماری کوڕی یاسرو عەمری کوڕی مەعدیەکریبو ئیبن زوبەیرمان باسکرد لەباسی دلێری هاوەڵان لە جیهاددا.

مالیكو بەیهەقی لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(خوای لێ ڕازی بێت) شیرێکی خواردەوەو زۆر تامی لێبینی، بەوەی وت کە پێیدا ئەم شیرەت لەکوێ بوو؟ وتی ئەوەی لەسەر ئاوێ هێناوە، کە لە ئاژەڵی صەدەقەیەو ئەوانە داوای ئاو دەکەنو لە شیری ئاژەڵەکانمان پێدەدەن منیش کردمەوە ئەمەوە. عومەر پەنجەی برد بە قوڕگیداو هەوڵی خۆ ڕشاندنەوەی دا.[3]

ئیبن سەعدج٣، ص٢٩٠ لە مسوەری کوڕی مەخرەمەوە هێناویەتی دەڵێت ئێمە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) دەبووینو لەوەوە فێری وەرعو خۆپارێزی دەبووین.

---

[1] – (موسلیمو نەسائی هێناویانە).

[2] – ( لە البدایە والنهایە ج٤، ص٣٢٨ دا واهاتووە).

[3] – ( لەالمنتخب ج٤، ص٤١٨ دا واهاتووە).

ئیبن سەعد لە تاوسەوە هێناویەتی دەڵێت: شایەتی دەدەم لە ئیبن عەبباسم بیست دەیوت: شایەتی دەدەم لە عومەرم بیست دڵ خۆش بوو، ئێمە لە بارێکدا وەستابووین، کەسێك پێی وت ئەگەر چوو چی؟ ئیبن عەبباس وتی نازانم، خەڵکی سەرسام بوون لەوەرعی ئیبن عەبباس.[1]

## لە خوا ترسیو خۆپارێزی

ئەحمەد لە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی لە باپیریەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە کەناریدا لەشەودا خورمایەکی بینی خواردی، ئەو شەوە نەخەوت یەکێ لەئافرەتەکانی وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەمشەو بێداربویت، فەرمووی(إني وجدت في جنبي تمرة فأكلتها وكان عندنا تمر من تمرا الصدقة فخشيت ان تكون منه)واتە(من خورمایەکم لە لاپاڵمدا بینیو خواردم، خورمای صەدەقەشمان لابوو ترسام لەوەبێت)[2].[3]

ئەحمەد لە الزهد لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت کەسم نەدیوە وەك ئەبوبەکرخواردن بێنێتەوە چونکە خواردنێکی بۆ هێنرا خواردی پاشانپێی وترا ئەوە نوعمان هێنای، وتی نانی.فاڵچێتی کوڕی نوعمانتان پێدام؟ پاشان هێنایەوە. بەغەوی لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلا ئەبونوعەیمانەوە= کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووو شانو شکۆیەکی بەرچاوی هەبوو، هێناویەتی هەندێ هاتن بۆ لایو وتیان ئای لای تۆ شتێك هەیە بۆ ژنێك کە سکی نابێت؟ وتی بەڵێ، وتیان چیە؟ وتی (یاأیتها الرحم العقوق... چەند وشەیەکی ناروون،) پاشان

---

[1] – (لە المنتخب ج٥ص٢٢٩ دا واهاتووە).

[2] – صحیح.

[3] – (ئەحمەد بە تەنها هێناویەتیو ئوسامەی کوڕی زەید..... لە کەسانی سەنەدی موسلیمە، لە البدایە والنهایە ج٦، ص٥٩ دا واهاتووە).

مەڕو ڕۆنی پێدا،ئەویش بڕێکی لێهێنا بۆ ئەبووبەکرو ئەویش لێی خوارد، کاتێ تەواو بوو ئەبووبەکر هەستاو هەوڵیدا بڕشێتەوە، وتی یەکێك لە ئێوە شتێکی بۆ هێناین و پێمان ناڵێت لەکوێ هێناویەتی.[1]

ئەبوو نەعیم لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هێناویەتی ئەبووبەکر کۆیلەیەکی هەبوو کە سامانێکی بۆ بڕیبوویەوە، ئەو کۆیلە شەوێك خواردنێکی بۆ هێنا،ئەبووبەکر پارووەیەکی لێخوارد، کۆیلەکە وتی بۆچی هەموو شەوێك پرسیارت لێدەکردم کەچی ئەمشەو نەتپرسی؟ وتی برسێتی وایلێکردم ئەمەت لە کوێ هێنا؟ وتی لە سەردەمی نەفامیدا دام بە لای خەڵکێکداو فاڵم بۆ گرتنەوەو شتێکم لەسەریان هەبوو، ئەوانیش بەڵێنیان پێدام، کە کاتی هات دام بە لایاندا بینیم لەوێ ئاهەنگی بووکێنییان هەبوو ئەمەیان پێدام، ئەبووبەکر وتی خەریکبوو ماڵوێرانم بکیت، هەستاو دەستی کرد بە قوڕگیداو هەوڵیدا خۆی بڕشێنێتەوەو چی خواردبوو نەدەهاتەوە، پێیان وت ئەوە تەنها بە ئاو دەبێت، ئەویش داوای تەشتێکی ئاوی کردو دەیخواردەوەو هەوڵیدەدا بیهێنێتەوە تا چی خواردبوو هێنایەوە، پێی وترا ڕەحمەتی خوات لێبێت هموو ئەمانە لەبەر ئەو پارووە بوو، ئەویش وتی ئەگەر لەگەڵ گیانیشمدا دەربهاتایە دەرمدەهێنا، لە پێغەمبەری خوام بیست دەفەرموو(هەر جەستەیەك حەرامی تیابێت دۆزەخ بەسەریدا دەسەپێ(سزای دۆزەخی بۆ دەبێت)) منیش ترسام ئەو پارووە بەشێك لە لەشم پێکبهێنێت.

ئیبن عەساکیر لە شەیبەوە هێناویەتی دەڵێت عەلی کوڕی ئەبوتالیب ڕۆژێك لەکوفەوە دەرچوو لە بەردەرگایەکدا وەستاو داوای ئاوی کرد، ئافرەتێ جامێ و دەسەسڕێکی بۆ هێناو عەلی پێی وت ئەم ماڵە هی کێیە؟ وتی هی فلان قوستال،

---

[1] – ئیبن کەسیر دەڵێت سەنەدەکەی جەییدو حەسەنە.لە المنتخب ج٤ص٣٦٠.دا واهاتووە.

وتی لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(لە بیری قستاڵدا مەخۆرەوەو لە سێبەری وەرگر لە بازرگاندا دابنیشە).[1]

ئەبونەعیم لەالحلیة ج١، ص٢٣٤ لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە هێناویەتی موعاذی کوڕی جەبەل دوو ژنی هەبوو، ڕۆژێ یەکێکیان لە ماڵی ئەوی تردا دەست نوێژی نەدەگرت، بەهۆی ئەو تینوێتیەی لە شام کەوتەوە مردن و خەڵکی سەرقاڵ بوون لەیەك چاڵدا خرانە ژێر گڵ،تیرو پشکی لەنێوانیاندا کرد تا بزانێ کامیان پێش ئەو بخاتە ناو گۆڕ. هەروەها لە ڕێگەی مالیك لە یەحیاوە هێناویەتی دەڵێت موعاذی کوڕی جەبەل دوو ژنی هەبوو، ئەگەر لای یەکێکیان بوایە ئاوی ماڵی ئەوی تریانی نەدەخوارد.

# پشت بەستن بەخوا

## پشت بەخوا بەستنی موحەممەدی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

بوخاری و موسلیم لە جابرەوە هێناویانە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) غەزای نەجد بەشداربوون، کە پێغەمبەر(ﷺ) کەوتەڕێ لە دۆڵێکی سەخت و پڕ تەنگەڵان خەڵکی بڵاوەیان لێکرد و دەچوونە بەر سێبەری درەخت، پێغەمبەر(ﷺ) لەژێر سایەی درەختێکدا بوو، و شمشێرەکەی پێدا هەڵواسی جابر دەڵێت خەوتین و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەمە شمشێرەکەی هەڵگرتم و من خەوتبووم، بێدار بومەوەو ئەو لە دەستیدا شمشێری لە کالان دەرهاتوو هەبوو، وتی چی دور دەخاتەوە لەمن؟ وتم خوا، وتی ئەی کێ تۆ لە من دوور دەخاتەوە؟ وتم خوا، شمشێرەکەی لابرد و دانیشت) پێغەمبەر(ﷺ) سزای نەدا کە ئەوەشی کردبوو.

[1]- (لەکنزالعمال ج٥، ص٢١٦ دا هاتووە دەڵێت نەمدیوە قسە لەسەر کەسانی سەنەدەکەی بکرێت).

بەیهەقی لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت : پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ موحاریب وغەتفان لە (نەخل- شوێنێکە لە نەجد-)شەڕی کردو لە مسوڵماناندا بێئاگاییەکیان بەدیکرد، یەکێکان کە پێی دەوترا غەورەتی کوڕی حارث هات و تا لەسەر سەری پێغەمبەر(ﷺ) بەشمشێرەوە وەستاو وتی کێ دەتپارێزێت لە دەسم؟فەرمووی خوا، شمشێرەکە لە دەستی کەوت و پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرەکەی گرت و فەرمووی(کێ تۆ لە دەست من دەپارێزت؟) وتی چاکترین هەڵوێست وەرگربە، فەرمووی(شایەتی دەدەیت هیچ خوایەك نیە جگە لە الله؟ وتی نا بەڵام بەڵێنیت پێدەدەم لەگەڵت نەجەنگم و لەگەڵ کەسانێ نەبم کە لەگەڵت دەجەنگن، پیغەمبەر(ﷺ) وازی لێهێنا، هاوەڵانی هاتن و ئەویش وتی من لە لای چاکترینی خەڵکەوە هاتم بۆ لاتان، پاشان باسی نوێژی ترسی کرد[1,2].

## پشت بەخوا بەستنی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەبوداودو ئیبن عەساکیر لە یەحیای کوڕی موررەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی بەشەو دەچوو بۆ مزگەوت و نوێژی خۆبەخشی دەکردو ئێمەش هاتین پاسەوانیمان دەکرد، کە لێبویەوە هات بۆ لامان وتی بۆچی دانیشتوون؟ وتمان پاسەوانیت دەکەین، وتی: ئایا پاسەوانی لەخەڵکی ئاسمان دەکەن یان لە خەڵکی زەوی؟ وتمان لەخەڵکی زەوی، وتی چی لە زەویدا هەیە نابێت تا لە ئاسماندا بڕیاری نەدرێ. هەرکەس دوو فریشتەی بۆ دانراوە بەرگری لێدەکەن و لەگەڵیدان تا قەدەری دێت کە قەدەری هات دەستی لێ بەردەدەن، من بەرگریەکی بەهێزی خوداییم لەگەڵە، کە سەرەمەرگم هات لەسەرم لادەچێت، تامی ئیمان نیە تا ئەوەی بزانیت لەئەوەی توش دەبێت، لەبەر هەڵەکاری نیەو ئەوەی هەڵەکاری دەکات لەبەر توشبونی نیە.

---

[1] – صحيح.

[2] – (لە البدايە والنهايە ج٤ ص٨٤ دا واهاتووە).

هەروەها لە قەتادەوە هێناویەتی دەڵێت: کۆتا شەو هات بەسەر عەلیداو ئارامی نەدەگرت، کەس وکاری ترسیان بۆ هەبوو، هەرکامەو دەچوونە لای ئەو تاکۆ بوونەوەو لێی پاڕانەوە، ئەویش وتی هەربەندەیەك دوو فریشتەی لەگەڵیدایە بەرگری لێدەکەن تا کاتێ قەدەری دێت، کە قەدەری هات وازی لێدێنن، پاشان چوو بۆ مزگەوت وکوژرا.

ئیبن سەعدو ئیبن عەساکیر لە ئەبوو میجزەلەوە هێناویانە کەسێك هات بۆ لای عەلی و ئەویش لە مزگەوتدا نوێژی دەکرد، وتی پاسەوانت هەبێ، چونکە خەڵکانێ نیازی کوشتنی تۆیان هەیە، ئەویش وتی هەرکەس دوو فریشتەی لەگەڵدایە دەیپارێزن تا قەدەری دێت کە قەدەری هات ڕێی بۆ چۆڵ دەکەن، ئەجەلیش قەڵغانێکی بەهێزە.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص٧٥ لە یەحیاو جگە لەوەوە هێناویەتی دەڵێت بە عەلی وترا ئەرێ پاسەوانیت نەکەین؟ وتی ئەجەل پاسەوانی کەسەکە دەکات.

ئەبونەعیم لە الدلائل ص٢١١ لە جەعفەری کوڕی موحەمەد لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: دوو کەس لە حکومەتدا هاتن بۆ لای عەلی، لە پاڵ دیوارێکدا دانیشت کەسێك وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران دیوارەکە دەکەوێت، عەلی وتی بڕۆ بەسە خوا پاسەوانم بێت، لە لایان چوو دواتر دیوارەکە کەوت.

ئیبن عەساکیر لە ئەبوزەبیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵلا تووشی ئەو نەخۆشیە بوو کە تیایدا مرد، عوسمانی کوڕی عەففان سەردانی کرد و وتی سکاڵای چیتە؟ وتی تاوانەکانم، وتی حەزت لەچیە؟ وتی ڕەحمەتی پەروەردگارم، وتی پزیشکت بۆ بانگ بکەم؟ وتی پزیشك نەخۆشی خستم، وتی فەرمانی بەخشینێکت بۆ نەکەم؟ وتی نا پێویستم پێی نیە، وتی بۆ کچەکانت لە دوای خۆت، وتی ترسی هەژاریت بۆ کچەکانم هەیە؟ من فەرمانم کردووە کچەکانم هەموو شەوێك

[1] – ( لەکنزالعمال ج١، ص٨٨ دا هاتووە).

سورەتی الواقعة بخوێنن. لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو(من قرا سورة الواقعة كل ليلة لم تحبسه فاقة ابدا)واتە (هەرکەس هەموو شەوێك سورەتی واقیعە بخوێنێت هەرگیز تووشی دەست بەتاڵی نابێ).[1] پێشتریش نموونەمان لەسەر ئەبوبەکرو ئەبودەردا هێنا لەسەرخۆڕاگری لەسەر نەخۆشیەکان بەبێ باسی خوێندنی سورەتی واقیعە.[2]

## ڕازیبوون بە قەزا

ئیبن موبارەك و ئیبن ئەبی دنیا وئیبن عەساکیرلا لە عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: باکم نیە بەیانی دەکەمەوە بەوەی کە پێم خۆشە یان ڕقمە لێی، چونکە نازانم خێر لە کامیاندایە،[3] ئیبن عەساکیر لە حەسەن لە عەلیەوە هێناویەتی پێی وترا ئەبو ذەر دەڵێت هەژاریم پێ خۆشە تا دەوڵەمەندی و نەخۆشیم پێ خۆشە تا لەش ساغی، وتی ڕەحمەتی خوا لەئەبوذەر بەڵام دەڵێم هەرکەس پشت ببەستێ بە هەڵبژاردنی باشی خوا بۆی هیوا ناخوازێ بەباری تر، ئەوە ئاستی وەستانە لەسەر ڕازی بوون بەوەی قەزای لەسەرە.[4]

ئیبن عەساکیر لە عەلیەوە(رضي الله عنه) دەڵێت هەرکەس بە قەزای خوا ڕازی بێت بەسەریدا دێت و پاداشتی بۆ هەیە، هەرکەسێك بەقەزای خوا ڕازی نەبێت بەسەریدا دێت و چاکەکانی لە دەست دەدات.[5]

---

[1] – (لە تەفسیری ئیبن کەپیرج٤، ص٢٨١ دا هاتووە).

[2] – ضعیف.

[3] – ( لەکنزالعمال ج٢، ص١٤٥ دا واهاتووە).

[4] – (لەکنزالعمال ج٢، ص١٤٥ دا واهاتووە).

[5] – لەکنزالعمال ج٢ص١٤٥ دا هاتووە.

ئەبونەعیم لەالحلیة ج١، ص١٣٨ لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی دواییدا هەرکەسەو هیوای وایە لەدنیادا مشتێکی بخواردایە، هەرکامتان لەبەیانیو ئێوارەی دنیادا زیانمەند بێت لە دەروونـدا دڵشکاوی دەبێت، ئەگەر هەرکامتان پشکۆیەك بگرێ بەدەمەوە تا دەکوژێتەوە باشترە لەوەی بە قەزای خوا بڵێت خۆزگە ئەوە نەبوایە.

## لە خوا ترسان

دەینەوەریو ئیبن عەساکیر لە کومەیلی کوڕی زیادەوە هێناویانە دەڵێت لەگەڵ عومەری کوڕی ئەبوتالیب چوومە دەر کە ڕوانی بەسەر(جبان) دا سەیری گۆڕستانی کردو وتی ئەی خەڵکی گۆڕەکان ئەی خەڵکی ترس وبەلاّ، لای ئێوە هەواڵ چیە؟ لای ئێمە ئەوەیە سامان دابەشکراو منداڵ هەتیو کەوتنو ژن گۆڕدرا، ئەی لای ئێوە هەواڵ چیە؟ پاشان لای کردەوە بە لای منداو وتی ئەی کومەیل ئەگەر مۆڵەتی وەلاّمیان هەبوایە دەیان وت چاکترین توێشوو لەخوا ترسانە، پاشان گریاو وتی ئەی کومەیل گۆڕ بوخچەی کردارەو لەسەرەمەرگدا هەواڵت بۆ دێت.[1]

ئەبونەعیم لە(الحلیة) و ئین عەساکیر لە قەیسی کوڕی حازمەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) وتی بۆ قبوڵکردنی کردەوە گرنگی زۆر بە تەقوا بدەن چونکە کردەوە لەگەڵ تەقوادا هەرگیز کەم ناکات. چۆن کەم دەبێت لەوەی کە قەبوڵ دەکرێ.[2]

[1] – ( لەکنزالعمال ج٢، ص١٤٢ دا واهاتووە).

[2] – (لەکنزالعمال ج٢، ص١٤٢ دا واهاتووە).

یەعقوبی كوڕی سوفیان‌و ئیبن عەساكیر لە ئیبن مەسعودەوە هێناویانە دەڵێت: ئەگەر بزانم خوای گەورە كارێكم لێ قبوڵ دەكات لام خۆشەویسترە لەوەی پڕی دنیا زێڕم هەبێت.[1]

ئەبونەعیم لە الحلية ج١، ص٢١١ لە ئەبودەرداوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: خۆزگە بە خەوی ژیران‌و نان خواردنیان، چۆن ڕەخنە دەگرن لە بێداری گەمژەكان‌و ڕۆژوویان‌و مسقاڵێ چاكەی لە خوا ترس‌و دڵنیای گەورەترو باشترە لە هێندەی شاخەكان پەرستشی لەخۆبایبوان. ئیبن لەئەبودەرداوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر دڵنیابم خوای گەورە یەك نوێژم قبوڵ دەكات لە هەموو دنیاو چی تێدایە لام خۆشەویسترە. خوا دەفەرموویت ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾.[2]

ئیبن عەساكیر لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هەركامتان لەبەر خوا واز لە شتێ بهێنێ، خوا لە لایەكەوە كە ئەو كەسە چاوەڕێی نییە چاكتری بۆ دێنێ‌و چی وەرگرێ لە لایەكەوە كە نازانێ خوای گەورە لەوەی لەسەریەتی زیاتری بۆ دێنێ، لە لایەكەوە چاوەڕێی نییە.[3]

## (ترس)

## (ترسی گەورەمان موحەممەدی پێغەمبەر)

بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی، دەڵێت: ئەبوبەكر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەتبینم پیر بوویت، فەرمووی:(هوودو واقیعەو مورسەلات‌و عم یتسائلون‌و اذا الشمس كورت پیریان كردم).[4]

---

[1] – (لەكنزالعمال ج٢، ص١٤٩ دا واهاتووە).

[2] – ( وەك لەتفسیر ابن كپیر ج٢، ص٤٣ دا هاتووە).

[3] – (لەكنز العمال ج٢، ص١٤٢دا هاتووە).

[4] – صحیح.

لە گێڕانەوەیەکیدا لە ئەبو سەعیدەوە، عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زوو ڕەنگی پیریت گرت، فەرمووی:(هودو خوشکەکانی پیریان کردم، واقیعەو عم یتسائلون و اذا الشمس کورت).[1]

ئەحمەد لە ئەبو سەعیدەوە(رضي الله عنه)، لە پێغەمبەرەوە کە فەرمووی(کیف انعم وقد التقم صاحب القرن القرن ومنی جبهته واصغی سمعه ینتظرا متی یؤمر)واتە(چۆن خۆشیم بێ کە خاوەنی کەڕەنا کەڕەناکەی لە دەم نزیك کردۆتەوەو تەوێڵی نزم کردۆتەوەو گوێی قولاغە چاوەڕێیە کەی فەرمان بدرێت). موسڵمان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا چی بڵێین؟ فەرمووی: بڵێن(حسبنا الله ونعم الوکیل علی الله توکلنا)[2][3].

ئیبن نەجار لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی، پێغەمبەر بیستی کەسێك ئەمەی دەخوێند ﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالاً وَجَحِيماً﴾، لە هۆش خۆی چوو.[4]

## ترسی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)

حاکم دەڵێت سەنەدی صەحیحەوە بەیهەقی لە ڕێگەی خۆیەوە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هێناویانە، یەکێ لە پشتیوانان ترسی خوا دەیگرت و لە کاتی باسی دۆزەخدا دەگریا، تائەوە وایکرد لە ماڵەوە نەیەتەدەر. ئەوە باسکرا بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەویش چوو بۆ ماڵ بۆ لای، کە چوو بۆ لای، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە

---

[1] – (لەالبدایە والنهایە ج٦، ص٥٩ دا هاتووە).

[2] – صحیح.

[3] – ( ترمزی گێڕاویەتیەوە، دەڵێت فەرموودەکە حەسەنە. لەالبدایە والنهایە ج٦، ص٥٦ دا هاتووە).

[4] – (لە کنز العمال. ج٤. ص٤٣ دا هاتووە).

باوەشی گرت و گەنجەکە مرد، پێغەمبەر فەمووی(جهزوا صاحبكم فأن الفرق فلذ كبده)واتە(هاوەڵەکەتان بنێژن، چونکە ترس جەرگی بڕی)[1].[2]

ئیبن ئەبی دنیاو ئیبن قودامە لەحوزەیفەوە(رضي الله عنه) هێناویانەو لەفەرموودەکەیدا هاتووە، پێغەمبەر نەهات بۆ لای گەنجەکە کەبینی هەستاو لەباوەشی کردو مرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(جهزوا صاحبكم فأن الفرق من النار فلذ كبده واندى نفسي بيده لقد اعاذه الله منها مورجاً شيئاً طلبه ومن خاف من شئ هرب منه)(هاوەڵەکەتان بنێژن، چونکە ترسی دۆزەخ جەرگی بڕی، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، خوا لە دۆزەخ پاراستی، هەرکەس هیوای شتێکی هەبێ بەدوایدا دەڕوات، هەرکەسیش لە شتێ بترسێ لە دەستی ڕائەکات)[3].[4]

حاکم بە صەحیحی داناوە، لە ئیبن عەباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت:(کاتێ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆسەر پێغەمبەر ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێ خوێندیەوە بۆ هاوەڵان، گەنجێ لەهۆش خۆی چوو، پێغەمبەر دەستی خستە سەر دڵی، سەیری کرد دەجولێت: پێغەمبەر فەرمووی: ئەی گەنج بڵێ(لا اله الا الله) ئەویش وتی، پێغەمبەر مژدەی بەهەشتی پێداو هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا لەنێو ئێمەدا؟ فەرمووی: مەگەر نابیستن خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ﴾[5].[6]

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە(الترغيب والترهيب ج٥، ص٢٢٣) دا هاتووە.

[3] – ضعيف.

[4] – ( لەكنز العمال ج٢، ص٤٤ دا هاتووە).

[5] – ضعيف.

[6] – ( لەالترغيب والترهيب ج٥ ص١٩٤ دا هاتووە).

بەیهەقی لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە هێناویەتی، عومەری کوڕی خەتتاب سکاڵای بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چوو سەردانی کرد،(کیف تجدن یاعمر)واتە(چۆنیت ئەی عومەر؟) ،وتی: هیوادارمو دەترسێم، فەرمووی:(ماإجتمع الرجاء والخوف في القلب مؤمن الا عطاه الله الرجاء وآمنه الخوف)واتە(ئەگەر لە دڵی باوەڕدارێکدا هیواو ترس کۆببنەوە، خوای گەورە هیواکەی پێدەبەخشێتو لە ترس دەیپارێزێت).[1]

ئەبو شەیخ لە حەسەنەوە هێناویەتی ئەبوبەکری صدیق(خوا لێ ڕازی بێت) وتی:(مەگەر نابینیت خوای گەورە باسی ئایەتی خۆشی لە کاتی سەختیو سەخی لە کاتی خۆشیدا دێنێت تا باوەڕدار ترسو هیوای هەبێتو تەنها نیازو ویستی حەقی خوای هەبێتو بەدەستی خۆی خۆی قوڕ بەسەر نەکات)[2] پێشتریش چیرۆکی ترسی ئەبوبەکرو عومەرمان هێنا.

ئەبو نەعیم لەالحلیة ج١، ص٦٠ لەعەبدوڵڵای کوڕی ڕۆمیەوە هێناویەتی دەڵێت: بیستم لە عوسمان وتی ئەگەر لە نێوان بەهەشتو دۆزەخدا بمو نەزانم فەرمانم بەکامیان دەکرێت بۆم، حەز دەکەم ببمە خۆڵەمێش پێش ئەوەی بزانم بەرەو کامیان دەبرێم.[3]

ئیبن عەساکیر لە قەتادەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبو عوبەیدەی جەراح دەڵێت: حەزدەکەم بەرخێ بوومایە کەسو کارم سەریان بڕیمایەو گۆشتەکەیان

---

[1] – (لەکنز العمال. ج٢، ص٤٥ دا هاتووە).

[2] – (لەکنز العمال ج٢، ص١٤٤ دا هاتووە).

[3] – ( ئەحمەدیش لەعوسمانەوە(خوای لێ ڕازی بێت) بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لەالمنتخب، ج٥، ص١٠ دا هاتووە).

بخواردمایەو گۆشتاوەکەیان هەڵقۆڕاندمایە. دەڵێت عیمرانی کوڕی حوصەین وتی: حەز دەکەم خۆڵەمێش بوومایەو ڕەشەبا لە ڕۆژێکی ڕەشەبایدا بیبردمایە.[1]

ئیبن سەعدج٤، ص٢٦ لە قەتادەوە هێناویەتی دەڵێت: عمرانی کوڕی حوصەین وتی: حەزدەکەم خۆڵەمێش بوومایەو ڕەشەبا بڵاوەی پێ بکردمایە.

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص١٣٣ لە عامری کوڕی مەسورقەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لە لای عەبدوڵلاّ(خوای لیٚ ڕازی بێت) ودوتی: حەزناکەم لە(اصحاب الیمین) بم، حەز دەکەم لە(المقربین) بم پێم خۆشترە. عەبدوڵلاّ وتی بەڵام لێرەدا کەسێك هەیە حەز دەکات ئەگەر مرد زیندوو نەکرێتەوە -واتە خۆی- هەروەها لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵلاّی کوڕی مەسعود(خوای لیٚ ڕازی بێت) ودوتی: ئەگەر لەنێوان بەهەشتو دۆزەخدا بووەستێنریٖمو پێم بوترێت: هەڵبژێرە سەرپشکت دەکەین کامیان لات خۆشەویسترە یان ببیت بەخۆڵەمێش، حەزدەکەم ببم بەخۆڵەمێش.

ئەبونەعیم لەالحلیة ج١، ص١٦٤ دا لە ئەبوزەرەوە هێناویەتی دەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ناچنە لای ژنەکانتانو لەسەر جێگەتان ڕاناکشێن، سوێند بەخوا حەزدەکەم خوای گەورە ئەو ڕۆژەی دروستی کردم بە درەختێك دروستی بکردمایە کە بەهێز دەبوو بەرهەمی دەخوریٚ.

ئەبو نەعیم لەالحلیة، ج١، ص٢١٦ لە حزامی کوڕی حەکمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبو دەردا وتی: ئەگەر دەزانم لە دوای مەرگ چی دەبینن نانتان بەحەزو خواردنەوەتان بە حەز نەدەخواردو نەدەچوونە ماڵیٚ تیایدا بچنە سێبەرو دەچوونە دەر بۆ ڕێگەکانو دەتاندا لەسەر سنگتانو بەسەر خۆتاندا دەگریان. حەزم دەکرد درەختێك بوومایە کە گەورە دەبیٚو دواتر دەخوریٚ.

[1] – (لەالمنتخب، ج٥، ص٧٤ دا هاتووە، ئیبن سەعدج٣، ص٤١٣ لە قەتادە لەئەبوعوبەیدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

ئیبن عەساکیر لە ئیبن دەرداوە هێناویەتی وە لە(کنز العمال ج٢، ص١٤٥) دا هاتووەو دەڵێت: حەزم دەکرد بەرخێکی ماڵ بوومایەو میوانیان بهاتایەو بیانخواردایە.

ئیبن سەعد ج٤، ص١٢ لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: حەزم دەکرد ئەو پایە بوومایە.

ئەبو نەعیم لە الحلیة، ج١، ص٢٣٦ لە تاوسەوە هێناویەتی دەڵێت: موعاذی کوڕی جەبەل هات بۆ خاکمان و یەکێ لە گەورەکانمان پێی وت: بۆچی فەرمان ناکەیت تا لەم بەردو دارەت بۆ بگوازینەوە تامزگەوتێ بۆ خۆت دروست بکەین، وتی: من دەترسم ئەرکی هەڵگرتنی لەسەر پشتم لە ڕۆژی داوییدا بکەوێتە سەر شانم.[1]

ئەبو نەعیم لە(الحلیة، ج١، ص٢٩٢) دا هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر چوویە کەعبەو بیستم لە سوجدەدا دەیوت: دەزانیت چی ڕێم نادات قوڕەیش بەسەر ئەم دنیایەدا سەرقاڵ بکەم جگە لەترسی تۆ. هەروەها لە( ج١، ص٣١٢ لە ئەبو حازمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر دای بەلای کەسێکدا لە خەڵکی عێراق کە کەوتبوو! وتی چییەتی؟ وتیان ئەگەر قورئان بخوێنێ وای لێ دێت، وتی: دەی ئێمەش لەخوا دەترسین و ناشکەوین.

ئەبو نەعیم لە الحلیة، ج١، ص٢٦٤دا لە شدادی کوڕی ئەوسی ئەنسارییەوە هێناویەتی کە دەچوویە ناو جێگە ئەمدیو و ئەودیوی ئەکردو خەوی لێ نەدەکەوت و دەیوت خوا بە دۆزەخ خەوی لێ تۆراندووم، هەڵدەستاو تابەیانی نوێژی دەکرد.

ئیبن سەعد ج٨، ص٧٤ لە عەمری کوڕی سەلەمەوە هێناویەتی عائیشە وتی: سوێند بەخوا حەزم دەکرد درەختێ بوومایە، سوێند بەخوا حەزم دەکرد لیتەو

---

[1] - ضعیف.

قوڕاو بوومایە، سوێند بەخوا حەزم دەکرد خوای گەورە دورستی نەکردمایە. هەروەها لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە هێناویەتی ئیبن عەبباس(خوای لێ ڕازی بێت) چوو بۆ لای عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت) پێش مردنی، کەوتە وەسفی عائیشەو وتی: موژدەت لێ بێت ئەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ)، لەناو کچاندا تەنها تۆی بە هاوسەر گرتووەو لەئاسمانەوە پۆزشت لەسەر دابەزی. ئیبن زوبەیر بە پێچەوانەی ئەو هات بۆ لای عائیشەو وتی ئیبن عەبباس وەسفی کردو تا ئەمڕۆ حەزم نەکردووە لە کەس ببیستم وەسفم بکات، خۆزگە من هەر لەبیرکراوبوومایە.

## (گریان)

## (گریانی پێغەمبەر(ﷺ))

بوخاری لە عەبدوڵڵاوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(قورئانم بەسەردا بخوێنە،(إني احب ان اسمعه من غيري) واتە(من حەز دەکەم لەجگە لەخۆم ببیستم) منیش سورەتی(النساء)م خوێند تاگەیشتمە ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاء شَهِيداً﴾ فەرمووی (حسبك) واتە(بەسە)، لامکردەوە سەیرم کرد چاوەکانی فرمێسك ئەڕێژن.[1]

## (گریانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ))

بەیهەقی لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەم ئایەتە دابەزی ﴿أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ {٥٩} وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ﴾. هاوەڵانی صوففە گریان، تائەوەی فرمێسکیان بەسەر کوڵماندا ڕێی دەبڕی. کە پێغەمبەر(ﷺ) هەنسکی ئەوانی بیست لەگەڵیاندا گریاو ئێمەش بە گریانی ئەو گریایین. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لا يلج النار من بكى من خشية الله ولا يدخل الجنة مصر على معصية ولو لم تذنبوا لجاء الله بقوم يذنبوون)واتە(هەرکەس لە ترسی خوا بگری، ناچێتە دۆزەخ و کەسێ

[1] - (لەالبدايه والنهايه، ج٦، ص٥٩ دا واهاتووە).

سووربێت لەسەر تاوان ناچێتە بەهەشت، ئەگەر تاوان نەکەن خوای گەورە خەڵکێ دێنێ کە تاوان بکەن)[1].[2]

بەیهەقی و ئەسفەهانی لە ئەنەسەوە هێناویانە دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی خوێندەوە ﴿وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾، فەرمووی(اوقد علیها الف عام حتی احمرت والف عام حتی ابیضت والف عام حتی اسودت فهی سوداء مظلمة لایطفأ لهیبها)واتە(هەزار ساڵ گڕدرا تاسوور بوو، هەزار ساڵیش تاسپی بوو، هەزار ساڵیش تاڕەش بوو، دۆزەخ ڕەش و تاریکەوە ناکوژێتەوە)، دەڵێت کەسێکی ڕەش لەبەردەم پێغەمبەردا بوو دەستی کرد بە پرمەی گریان. جبریل(علیه السلام) دابەزی بۆ لای وتی: ئەو کەسەی دەگریت کێیە؟ فەرمووی(کەسێکە لە حەبەشە) بە چاکە باسی کرد، فەرمووی(فان الله عزوجل یقول عزتی وجلالی وارتفاعي فوق عرشي لاتبکی عین عبد في الدنیا مخافتي إلا اکثرت ضحکها في الجنة)واتە(دەی خوای گەورە دەفەرموێت سوێند بە عززەت و شکۆو بەرزیم بەسەر عەرشمدا، چاوی هەر بەندەیەك لەدنیادا لەترسی مندا بگریت، لە بەهەشتدا پێکەنینی زیاد دەکەم)[3].[4]

شافعی لەحەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب لە وتاری هەینیدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ تاگەیشتە ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ﴾ پاشان دەیبڕی.

ئەبو عوبەیدە لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ئەم ئایەتەی خوێند ﴿انَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ مَا لَهُ مِن دَافِعٍ﴾ بەو هۆیەوە تووشی وەرەمێك بوو کە بیست ڕۆژی خایاند، ئەبو عوبەید لە عوبەیدی کوڕی عومەرەوە هێناویەتی

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( لەالرغیب والترهیب. ج٥، ص١٩٠دا هاتووە).

[3] – ضعیف.

[4] – ( لەالترغیب والترهیب، ج٥، ص١٩٤ دا هاتووە).

دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب نوێژی بەیانی بۆ کردین و سورەتی(یوسف)ی خوێند تاگەیشتە ﴿ابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ﴾ گریا تاپچڕانی و کڕنووشی برد.

لە(منتخب کنز العمال، ج٤، ص٤٠١) دا لە عەبدوڕەزاق و سەعیدو مەنسوورو ئیبن ئەبی شەیبەو بەیهەقی لە ئیبن شدای کوڕی هادەوە هێناویانە دەڵێت: پرمەی گریانی عومەرم بیست و من لەکۆتا ڕیزەکانی نوێژی بەیانیدا بووم کە سوورەتی(یوسف)ی دەخوێند تاگەیشتە ﴿قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾.[1]

ئەبو نەعیم لە الحلیة، ج١ص٥١ لە هشامی کوڕی حەسەنەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەر ئایەتێکی دەخوێند دەیگرت و دەگریا تادەکەوت دواتر دەچوویە ماڵەوە تائەوەی سەردانی دەکراو وایاندەزانی نەخۆشە.

ترمذی بە حەسەنی داناوە، لە هانیئی مەولای عوسمانی کوڕی عەففانەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمان ئەگەر لەسەر گۆڕێ بووەستایە دەگریا تائەوەی ڕیشی تەڕ ئەبوو، پێی وترا باسی دۆزەخ و بەهەشت ناتگریەنێت و باسی گۆڕ دەتگریەنێت؟ وتی: من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(القبر اول منزل من منازل الآخرة، فأن نجا منهُ فما بعدهُ أیسرو إن لم ینج منه فما بعد اشد)واتە(گۆڕ یەکەم مەنزڵگای ڕۆژی دواییە، ئەگەر لەوێ ڕزگاری بوو، دواتری ئاسانترە، ئەگەر لێی دەرباز نەبوو دواتری سەختترە) دەڵێت بیستم دەیفەرموو(مارایتُ منظراً قط إلا والقبر أفظع منه)واتە(هەر دیمەنێکم دیبێت گۆڕ لەو ترسناکتر بووە) ڕزین ئەوەی بۆ زیاد کردووە، هانیئی وتی: لە عوسمانم بیست لەسەر گۆڕ دەیوت:

---

[1] – (لەالمنتخب، ج٤، ص٣٧٨ دا واهاتووە).

(فأن تنج منها تنج من ذي عظيمة.......وإلا فأني لاإخالك ناجيا)[1].[2]

حاکم ج٣، ص٢٧٠ -دەقەکە هی ئەوە- و ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص١٥) لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر دای بە لای موعاذی کوڕی جەبەلدا کە دەگریاو وتی بۆچی دەگریت؟ وتی: فەرموودەیەکم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیست(ان ادنی الرياء شرك وأحب العبيد الى الله تبارك وتعالى الأتقياء والأخفياء الذين إذا غابووا لم يفقدوا وإذا شهدوا لم يعرفوا، أولئك أئمة الهدى ومصابيح العلم)واتە(نزمترین ڕوپامایی هاوەڵ دانانە، خۆشەویشترین بەندەکان لای خوای گەورە لە خواترسانی نادیارانن، ئەوانەی ئەگەر ئامادە نەبوون بەدوایاندا ناگەڕێ‌و ئەگەر بینران ناناسرێن، ئەوانە پێشەوایانی ڕێنموونی‌و کلیلی زانستن)[3].[4]

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص٣٠٥دا لە قاسی کوڕی ئەبو بزەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێ لە ئیبن عومەری بیست بۆی گێڕامەوە ئەمەی خوێند ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ تاگەیشتە ﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ گریا تانەیتوانی ئەوەی دواتری بخوێنێت[5].[6]

هەروەها لەوانەوە لە نافعەوە هێناویانە دەڵێت: ئیبن عومەر هەرکات ئەم دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی(البقرة)ی بخوێندایە دەگریا ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ

---

[1] – حسن.

[2]– ( لەالترغيب والترهيب، ج٥، ص٣٢٢ دا هاتووە، ئەبونەعیم لە(الحلیە، ج١، ص٦١) لەهانیئەوە بەکورتی هێناویەتی).

[3] – ضعيف.

[4]– حاکم دەڵێت سەنەدەکەی صەحیحەو نەیانهێناوە. ژەهەبی دەڵێت: ئەبو قەخزەم ئەبو حاتەم دەڵێت فەرموودەی نانوسرێت، نەسائی دەڵێت جێ متمانە نییە.

[5] – ضعيف.

[6] – ( ئەحمەد بە هەمان شێوە هێناویەتی وەك لەصفە الصفوە ج١، ص٢٣٤ دا هاتووە)

تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ {٢٨٤} آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ پاشان دەیگوت ئەم سەرژمێری و لێپێچینەوەیە سەختە. ئەبو نەعیم لە(الحلیة، ص٣٠٥) لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر ئەگەر ئەم ئایەتەی بخوێندایە ﴿لَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾ دەگریا تا زۆری بۆ دەهات.[1]

ئیبن سەعد(ج٤، ص١٦٢) لە یوسفی کوڕی ماهکەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئیبن عومەر چووم بۆ لای عوبەیدی کوڕی عومەیر کە قسەی بۆ هاوەڵانی دەکرد، سەیری ئیبن عومەرم کرد چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت.[2]

ئیبن سەعد ج٤، ص١٦٢ لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە هێناویەتی کە ئەم ئایەتی خوێند ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيداً﴾ ئیبن عومەر گریا تاڕیشی تەڕ بوو بەفرمێسکەکانی، عەبدوڵلاّ وتی: ئەوەی لە لای ئیبن عومەر بوو بۆی گێڕامەوە وتی: ویستم هەستم بۆ لای عوبەیدو پێی بڵێم بەسە چونکە تۆ ئەو کەسەت ناڕەحەت کرد.

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص٣٢٧ دا لە عەبدوڵلاّی کوڕی مولەیکەوە هێناویەتی دەڵێت: لە مەککەوە بۆ مەدینە لەگەڵ ئیبن عەبباس بووم، کە دابەزی بەشی زۆری شەو بێدار دەبوو. ئەیوب پرسیاری لێکرد چۆن قورئانی دەخوێند؟ وتی: ئەمەی دەخوێند ﴿وَجَاءتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ بەوە گریان و هەنسک دەیگرت.

هەروەها لە ج١، ص٣٢٩ لە ئەبو ڕەجائەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەو شوێنەی ئیبن عەبباس کە فرمێسکی پێدا دەچوو وەك قەیتانی پێڵاوەکەی کۆن ببوو.

---

[1] -( ئەبو عەبباس بە سەنەدی جەید هێناویەتی وە لە الاصابە ج٢، ص٣٤٩دا واهاتووە).

[2] - ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١، ص٣٠٥ لە یوسفی کوڕی ماهکەوە بەکورتی هێناویەتی.

ئەبو نەعیم لە الحیلة ج٦، ص١١٠ دا لە عوسمانی کوڕی ئەبو سەودەوە هێناویەتی دەڵێت: عوبادەی کوڕی صامتم بینی لەسەر ئەو دیوارەی مزگەوت بوو کە دەڕوانێ بەسەر(وادي جهنم) دا، سنگی لەسەر دانابوو دەگریا، وتم ئەبو وەلید بۆچی دەگریت؟ وتی ئەو شوێنەی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداین کە تیایدا دۆزەخی بینیوە.

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص٢٩٠ لە یەعلای کوڕی عەتا لە دایکیەوە هێناویەتی دەڵێت دایکی کلی دەکرد بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کە زۆر دەگریا، دەڵێ دەرگای لەسەر دادەخستو دەگریا تاچاوەکانی سپی هەڵدەگەڕان. دەڵێت: دایکم کلی بۆ دەکرد.

ئیبن سەعد ج٤، ص٦٤ لە موسلیمی کوڕی بەشیرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبو هورەیرەوە لە نەخۆشیدا گریا، پێی وترا بۆچی دەگریت؟ وتی: من بۆ ئەم دونیایە ناگریم، بەڵکوو بۆ دووری سەفەرو کەمی توێشووم دەگریم، لە سەرکەوتن و کەوتنی بەر دۆزەخ و بەهەشتدام و نازانم بەرەو لای کامیان دەبرێم.[1]

# (بیرکردنەوەو پەند وەرگرتن)
# (بیرکردنەوەو پەندگیری هاوەڵان)

ئیبن موبارەك لەضمرەی کوڕی حەبیب لە مەولای ئەبو ڕەیحانەی صەلیبیەوە هێناویەتی ئەبو ڕەیحانە لە غەزایەکیدا بەڕێکەوت و نانی شەوی خواردو و دواتر دەستنوێژی گرت و چوو بۆ مزگەوتەکەی و سورەتێکی خوێند بەردەوام لەوێدا بوو تا بانگدەر بانگی فەرموو، ژنەکەی پێی وت ئەبو ڕەیحانە غەزات کردووە و ماندوو بوویت و هاتویتەتەوە، ئایا ئێمەش مافێکمان بەسەرتەوە نییە؟ وتی: بەرێ بەخوا، بەڵام ئەگەر بیرت بکەم مافت بەسەرمەوە هەیە، وتی: دەی چی سەرقاڵی کردوویت؟

[1] – (ئەبونەعیم لە الحلیە ج١، ص٣٨٣ دا بە هەمان شێوە هێناویەتی).

وتی: بیرکردنەوە لەوەی خوا وەسفی بەهەشتو خۆشیەکانی کردووە تاگوێم لەبانگدەر بوو.[1]

ئەبو نەعیم لەالحلیة ج١، ص١٦٤ لە موحەمەدی کوڕی واسعەوە هێناویەتی کە سێکی بەسرە پاش مردنی ئەبو ذەر هات بۆ لای ئوم ذەرو لەسەر پەرستشی ئەبوذەر پرسیاری لێکرد، هاتو وتی هاتووم تاباسی پەرستشی ئەبو ذەرم بۆ بکەیت، وتی هەموو ڕۆژێ بیری دەکردەوە.

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص٢٠٨ لە عەونی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبەوە هێناویەتی ئەڵێت: پرسیارم کرد لە ئوم دەردا چاکترین کاری ئەبو دەردا چی بوو؟ وتی: بیرکردنەوەو پەند وەرگرتن. هەروەها لێیەوە هێناوە دەڵێت بەئوم دەردا وترا ئەبو دەردا زیاتر چی ئەکرد؟ وتی: پەند وەرگرتن. لە سالمی کوڕی ئەبو جەعدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی بەڵام دەڵێت: وتی بیرکردنەوە.[2] هەروەها لە ئەبو دەرداوە دەڵێت: ساتێ بیرکردنەوە چاکترە لەشەونوێژ.[3]

ئیبن عەساکیر لە ئەبو دەرداوە هێناویەتی دەڵێت: خەڵکی کلیلی خێرو داخەری خراپەیان هەیە، بەمەش پاداشت وەرئەگرن. هەشە کلیلی خراپەو داخەری چاکەن و لەسەر ئەوەش خراپەیان بۆ هەیە، ساتێ بیرکردنەوەش چاکترە لە شەونوێژ.[4]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص٢٠٩ لە حەبیبی کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای ئەبو دەرداو دەیویست غەزا بکات، وتی: ئەی ئەبو دەردا

---

[1] – ( لەالاصابە ج٢، ص١٥٧ دا واهاتووە).

[2] – ( ئەحمەد بە شێوەی فەرموودەی یەکەم لە عەونەوە هێناویەتی وەك لەصفە الصفوە ج١، ص٢٥٨ دا هاتووە).

[3] – ئیبن سەعدج٧، ص٣٩٢ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[4] – (لەج٢، ص١٤٢ دا هاتووە).

وەسیەتم بۆ بکە، وتی: لە خۆشیدا یادی خوا بکە لە سەختیدا تۆی لە یادە، ئەگەر شتێکی دنیات هاتە ڕێ بزانە بەرەو کوێ ئەچیت، هەروەها لە سالمی کوڕی ئەبو جەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: دوو گا دایان بەلای ئەبو دەرداداو کاریان ئەکرد، یەکێکیان هەستاو ئەویتریان وەستا، ئەبو دەردا وتی ئەمە پەندی لێ وەردەگیرێت.[1]

## (لەخۆپێچینەوە)

ئیبن ئەبی دنیا لە مەولای ئەبو بەکرەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی ئەڵێت: ئەبوبەکر وتی: هەرکەس لەبەر خوا لە خۆی بپێچێتەوە، خوا لە تۆڵەو سزای خۆی ئەیپارێزێت.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص٥٢ لە ثابتی کوڕی حەجاجەوە هێناویەتی، عومەری کوڕی خەتتاب وتی: پێش ئەوەی پێوانە بکرێن، پێوانەی خۆتان بکەن و پێش ئەوەی موحاسەبە بکرێن، موحاسەبەی خۆتان بکەن، چونکە ئاسانکاریتان بۆ ئەکات بۆ موحاسەبەی سبەینێ، خۆتان بڕازێننەوە بۆ خستنەڕووی گەورە ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾.

مالیك و ئیبن سەعد ئیبن ئەبی دنیاو ئەبونەعیم و ئیبن عەساکیر لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویانە دەڵێت: بیستم عومەری کوڕی خەتتاب ڕۆژێ دەرچوو لەگەڵی چووم تاچوویە حەوشەیەك، دیوارێك لە نێوانماندا هەبوو دەیوت: سوێند بە خوا لە خوا دەترسیت یان خوا سزات ئەدات.[3]

---

[1] – ( ئەحمەد فەرموودەی یەکەمی لە حەبیبەوە بە هەمان شێوە هێناویانە، وەك لەصفە الصفوە ج١، ص٢٥٨ دا هاتووە).

[2] – (کنز العمال ج٢، ص١٦٢).

[3] – ( لەالمنتخب ج٤، ص٤٠٠ دا واهاتووە).

# (بێدەنگی و زمان پاراستن)

## (بێدەنگی پێغەمبەر(ﷺ))

ئەحمەدو تەبەرانی لە فەرموودەیەکی دوورو درێژیاندا لە سیماکەوە هێناویانە دەڵێت: بە جابری کوڕی سەمرەم وت(خوای لێ ڕازی بێت) ئایا تۆ لە کۆڕی پێغەمبەردا(ﷺ) دادەنیشیت؟ وتی: بەڵێ زۆر بێدەنگ بووە.[1]

تەبەرانی لە ئەبو مالیکی ئەشجەعیەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین و منداڵ بووین، کەسم نەدیوە لە پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگتر بێت. ئەگەر هاوەڵانی قسەیان بکردایە زۆریان بوتایە زەردەخەنەی دەکرد.[2]

تەبەرانی لە عوبادەی کوڕی صامتەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك دەرچوو لەسەر وڵاخەکەی بوو هاوڵانیشیی لەگەڵدا بوون، کەسیان پێش ئەو نەکەوتن. موعاذی کوڕی جەبەل وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوا لە خوا بکە مەرگمان پێش مەرگت بێت، دەزانیت ئەگەر شتێك بێت خوا پیشانمان نادات دوای تۆ چی کارێك بکەین، پرسیارم لێکردو فەرمووی(جیهاد لە ڕێی خوادا) وتی بە دایك و باوکەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی(نعم الشئ الجهاد في سبيل الله وعاد بالناس املك من ذلك) هەروەها فەرمووی(نعم الشئ الصيام والصدقة وعاد بالناس أملك من ذلك) چی چاکەی بیر دەزانی هەمووی بیردەخستەوە و دەیفەرموو(وعاد بالناس أملك من ذلك)واتە(هیوات لەوە بۆ خەڵك گەڕایەوە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوە هیوات بۆ خەبك گەڕایەوە. پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی کرد بۆ دەمی و فەرمووی(الصمت الا من خير)واتە(بێدەنگی جگە لەچاکە). وتی: ئایا لەسەر قسەی زمانمان لێپێچینەوە دەکرێین؟ پێغەمبەر(ﷺ) دای بەڕانی موعاذداو فەرمووی:(ثكلتك أُمك وهل يكب الناس على

---

[1]- (هەیسەمی ج١٠، ص٢٩٧) دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد صەحیحن جگە لە(شريك) کە جێ متمانەشە. ئیبن سەعدج١، ص٣٧٢ لەسیماکەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[2]- (هەیسەمی ج١٠، ص٢٩٨ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبراهیمی کوڕی زەکەریای عجلی هەیە کە لاوازە

مناخرهم في جهنم إلا ما نطقت به السنتهم، فمن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيراً او ليسكت عن شر قولوا خيراً تغنموا واسكتوا عن شر تسلموا)واتە(دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات، مەگەر خەڵکی لە دۆزەخدا هەر لەسەر دەربڕینی زمانیان نییە لەسەرلووت و بڕناخیان داخ دەکرێن، هەرکەس بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە باخێر بڵێت یان لەخراپە بێدەنگ بێت، خێر بڵێن دەستکەوتتان دەبێت، بێدەنگ بن لە خراپە- خراپە مەڵێن- پارێزراو دەبن)[1].

## (بێدەنگی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ))

ئەبویەعلا لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کوژراو ئافرەتێ لەسەری گریاو وتی: وەی شەهیدم ڕۆ. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ومايدرك انه شهيد! ولعله كان يتكلم فيما لايعينه ويبخل بما لاينقصه)واتە (بەسە چوزانیت شەهیدە، لەوانەیە قسەیەکی کردبێت لای سادە بووبێت بەخیلی هەبووبێ بەوەی لێی کەم نەبووە).

لە سەنەدەکەدا عصامی کوڕی تولەیق هەیە کە لاوازە، وەك هەیسەمی ج١٠، ص٣٠٢ دەڵێت. هەروەها لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحود کەسێکمان شەهید بوو لەسەر سکی بەردێك بەدی کرا کە لەتاو برسێتی بەخۆیەوە بەستبوو، دایکی خۆڵی دا بەڕووی خۆیداو وتی: کوڕی ئازیزم بەهەشتت پیرۆز بێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(وما يدريك! لعله كان يتكلم فيما لايعنيه ويمنع مالا يضره)(چوزانیت لەوانەیە قسەیەکی کردبێت کە جێ گرنگی و پێویستی نەبووبێت و ڕێی ئەوەی نەدابێت کە زیانی بۆ نییە)[2].

---

[1]- (هەیسەمی ج١٠، ص٢٩٩، دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، جگە لە عەمری کوڕی مالیکی بەنبی کە جێ متمانەشە تەواو).

[2] – (لە سەنەدەکەدا یەحیای کوڕی یەعلای ئەسلەمی هەیە کە لاوازە، وەك هەیسەمی دەڵێت، ترمزی لە ئەنەسەوە بەکورتی هێناویەتی، وەك لە(المشكاه) دا هاتووە).

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص١٤٢ لە خالیدی کوڕی نومەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: عەمماری کوڕی یاسر زۆر بێدەنگ بوو، بێتاقەتی و دڵتەنگی درێژخایەن بوو، هەموو قسەی پەنا گرتن بوو بەخوا لە فیتنەو تاقیکردنەوەی.

حاکم ج٣، ص٢٦٩ لە ئەبو ئیدریسی خەولانیەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ مزگەوتی دیمەشق کەسێکم دی دانی پێشەوەی تیرو بریسکاوی بوون، بێدەنگ بوو. خەڵکی ئەگەر لە شتێکیاندا ناکۆك بوونایە دەیانبردەوە لای ئەو و ڕای ئەویان وەرئەگرت. وتم ئەوە کێیە؟ وتیان موعاذی کوڕی جەبەل. ئەبو یەعلا لە ئەسلمەوە هێناویەتی، عومەری کوڕی خەتتاب(خوای لێ ڕازی بێت) ئەبو بەکری بینی زمانی خۆی ڕادەکێشا، وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) چی دەکەیت؟ وتی: ئەمە هەموو شتەکانم دێنێتە ڕێ.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(لیس شئ من الجسد إلا یشکو ذرب اللسان)واتە(چی لەجەستە هەیە سکاڵای درێژی و زۆر ڕۆیی زمانیەتی).[1]

تەبەرانی لە ئەبو وائیل لە عەبدوڵلاوە هێناویەتی کە چوویە سەر سەفاو زمانی خۆی گرت و وتی بە زمان خێر بڵێ دەستکەوتت دەبێ(براوەیت) بێدەنگ بە لە خراپە وتن پێش ئەوەی پەشیمان بیتەوە، پاشان وتی لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(أکثر خطایا ابن آدم من لسانه)واتە(زۆربەی تاوانەکانی ئادەمیزاد لە زمانیەتی).[2]

ئەبو نەعیم لەالحلیة ج١، ص٣٢٨ لە سەعیدی جەریریەوە هێناویەتی لە کەسێکەوە دەڵێت: ئیبن عەبباسم بینی بەر زمانی خۆی گرتبوو دەیوت هاوار بۆت

---

[1]- هەیسەمی(ج١٠، ص٣٠٢) دەڵێت کەسەکانی صەحیحن جگە لەموسای کوڕی موحەمەدی کوڕی حبان کە ئیبن حبان متمانەی پێداوە. (ئەبو نەعیم لەالحلیە ج١، ص٣٣ لە ئەسلەمەوە بە کورتی هێناویەتی).

[2] – (هەیسهمی ج١٠، ص٣٠٠ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن).

خێر بڵێ بڕوەیت خراپە مەڵێ پارێزراویت، کەسێ پێی وت ئیبن عەبباس ئەرێ ئەبینم بەر زمانی خۆت گرتبوو ئاوات دەوت؟ وتی: بیستوومە بەندە لە ڕۆژی دواییدا بەهیچ شتێ هێندەی زمانی گیرۆدەو زیانمەند نابێت.

ئەبو نەعیم لەالحلیه ج١، ص٢٦٥ لە ثابتی بەنانیەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك شەدادی کوڕی ئەوس بەیەکێ لەهاوەڵانی وت: توێشووەکە بهێنە تاخۆمانی پێ سەرقاڵ بکەین، یەکێ لە هاوەڵانی وتی لەو کاتەوەی هاوڕێتم تائێستا قسەی وام لێت نەبیستووە، وتی: لەو کاتەوەی لە پێغەمبەر(ﷺ) جیابوومەتەوە چی قسەم کردووە بەستراوو داخراو بووە ئەی هاوار، جگە لەوە دەرناچێ ناوترێ.

هەروەها لە سولەیمانی کوڕی موساوە کە شەدادی کوڕی ئەوس ڕۆژێ وتی ئەو توێشووە بێنن با خۆمانی پێوە سەرقاڵ بکەین، ئەوانیش لەسەریان گرت، وتی سەیری ئەبو یەعلا بکەن بزانن چی لێهاتووە. وتی: برازاکانم من لەو کاتەوەی بەیعەتم بەپێغەمبەر(ﷺ) داوە تاپێش ئەمە هەرچیم وتووە بەستراوو داخراو بووە، دەی وەرن بافەرموودەتان بۆ بگێڕمەوە واز لەوە بێنن و چاکتر لەوە وەربگرن، خوایە داوات لێ دەکەین پێی چەسپاو بین و عەزیمەتی پێگەیشتنمان هەبێ و سوپاسی بەخشش و یاك پەرستنمان هەبێت، داوای دڵێکی سەلامەت و زمانێکی ڕاستگۆت لێ دەکەین، داوات لێ دەکەین بۆ چاکترینی ئەوەی دەیزانین و پەنات پێدەگرین لەو خراپەی تۆ دەیزانیت، دەی ئەوە وەربگرن و واز لەوەی پێشوو بێنن.( سولەیمانی کوڕی موسا بە مەوقوفی بەوجۆرە هێناویەتی، حەسانی کوڕی عەتیەی کوڕی شەدادی کوڕی ئەوس بەمەرفوعی هێناویەتی، پاشان ئەبو نەعیم بەو شێوەی پێشوو گێڕانەوەکەی هێناوەو تیایدا هاتووە: ئەوەم لەسەر مەگرن و ئەوەی دەیڵێم پێتان لێم وەربگرن، چونکە من بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو(اذا أكنز الناس الذهب والفضة فاكنزوا هؤلاء الكلمات اللهم إني أسألك الثبات في الأمر والعزيمة

علی الرشد)واتە(ئەگەر خەڵکی زێڕو زیو خەزێنە دەکەن، ئێوە ئەم وشانە وەربگرن،خوایە داوای پێچەسپاوی و سووربوون لەسەر پێگەیشتن و راستیت لێدەکەم). بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەمەشی بۆ زیادکردووە(واستغفرك لما تعلم إنك أنت علام الغیوب).[1]

ئەبو نەعیم لەالحلیة ج١، ص١٣٤ لە عیسای کوڕی عوقبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود وتی: سوێند بەو خوایەی هاوەڵی نییە، هیچ شتێ لەسەر زەویدا هێندەی درێژخایەنی بەندکردنی زمان سەخت و بێزارکەر نییە.[2]

ئیبن ئەبی دنیا لە عەلیەوە هێناویەتی دەڵێت: زمان ڕێکخەری جەستەیە، ئەگەر زمان ڕێك وەستا بەشەکانی جەستە ڕێك دەوەستن، ئەگەر زمان شڵەژا، بەشەکانی جەستەش وادەبن، هەروەها لێیەوە هێناوە دەڵێت بێدەنگی بەرەو بەهەشت کەمەندکێشت ئەکات، هەروەها دەڵێت:

لاتفش سرك الا الیك فان لکل نصیح نصیحا
فأنی رایت غواه الرجال لایدعون ادیما صحیحا[3]

ئیبن عەساکیر لە ئەبو دەردائەوە هێناویەتی دەڵێت: چۆن قسە فێر ئەبن و وافێری بێدەنگی بن، چونکە بێدەنگی نەرم و نیانیەکی گەورەیە، هەوڵبدە لەو

---

[1]- ( ئەبو نەعیم لەج١، ص٢٦٦ لە ڕێگەی ئەبو ئەشعەشی سەنعانی و جگە لەویشەوە بە مەرفوعی بە هەمان شێوە هێناویەتی، ئەحمەد لە ڕێگەی حەسانی کوڕی عەتیە لە شەدادەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە تەفسیری ئیبن کەپیرج٢، ص٣٥١ دا هاتووە).

[2]-.( تەبەرانی بە هەمان شێوە بە چەند سەنەدێك هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەش جێ متمانەن وەك هەیسەمی دەڵێت، هەروەها لێیەوە هێناویەتی دەڵێت زۆربەی تاوان خەڵك لە ڕۆژی دواییدا زۆر ڕۆچوونە لە پووچیدا، کەسەکانی جێ متمانەن، وەك هەیسەمی دەیڵێت).

[3] – (لە کنز العمال ج٢، ص١٥٨ دا واهاتووە).

کەسەی سورترە لەتۆ گوێ بگری تاقسە بکەیت، لە شتێکدا کە پەیوەست نییە بە تۆ قسە مەکە، هەروا پێمەکەنە و بێمان هەنگاو مەنێ.[1]

ئەبو نەعیم لەالحلیة ج۱، ص۲۲۰ لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەناو باوەڕداردا هیچ بەشێ هێندەی زمان لای خوا خۆشەویست نییە تاپێی بچیتە بەهەشت، لەبێباوەڕیشدا هیچ شتێ هێندەی زمان لای خوا بێزراو نییە تاپێی بچێتە دۆزەخ.

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج۱، ص۳۰۷ لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: شیاوترین شت بۆ پاککردنەوە کە بەندە پاکی بکاتەوە زمانیەتی.

ئیبن سەعد ج۷، ص۲۲ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: بەندە لە خواترس نییە تا لە دەست زمانی خەفەت نەخوات.

## (قسەو گوفتار
## فەرمایشتی پێغەمبەرمان موحەممەد(صلى الله عليه وسلم))

بوخاری لە عائیشەوە(رضی الله عنها) هێناویەتی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە قسەی دەفەرموو، ئەگەر کەسێ قسەکانی بژماردایە، دەیژماردن، هەروەها لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبو فلان سەرسامی نەکردوویت هات لە پاڵ ژوورەکەمدا دانیشت و فەرموودەی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) دەگێڕایەوەو ئەوەی لێ دەبیستم منیش(سبحان الله)م دەکرد پێش ئەوەی تەواو بم هەستا، ئەگەر پێی بگەیشتایەم لێم دووبارە دەکردمەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەك ئێوە لەقسەکردندا پەلەی نەدەکرد. (ئەحمەدو موسلیم و ئەبوداود هێناویانەو لە گێڕانەوەکەیاندا هاتووە سەرت لەئەبوو هورەیرە سوڕنامێنێ- بە هەمان شێوە هێناویەتی)- ئەحمەد دەڵێ عائیشە وتی:قسەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جیادەکرانەوەو هەموو کەس لێی تێدەگەیشت و پەلەی نەدەکرد،( ئەبو داود هێناویەتی)، ئەبو یەعلاش لە جابر یان ئیبن عومەرەوە

[1] – (لە كنز العمال ج۲، ص۱۵۹دا واهاتووە).

هێناویەتی دەڵێت لە فەرمایشتی پێغەمبەردا(ﷺ)نیمچە هێواشی و لەسەرخۆیی بەدیدەکرا.[1]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر قسەیەکی بکردایە سێ جار دەیوتەوەو ئەگەر سەلامی لە خەڵکی بکردایە سێ جار سەلامی لێ دەکردن. (بوخاری هێناویەتی). ئەحمەد لە ثومامەی کوڕی ئەنەسەوە هێناویەتی ئەنەس ئەگەر قسەی بکردایە سێ جار دەیوت و باسی دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) قسەیەکی بکردایە سێ جار دەیفەرموو، سێ جاریش داوای مۆڵەتی دەکرد.[2]

ترمذی لە ثومامە لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە قسەی دەکرد سێ جار دەیوتەوە تالێی تێبگەن. ترمذی دەڵێت فەرموودەکە حەسەنی صەحیحی غەریبە. ئەحمەد لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو(بعثت بجوامع الكلم ونصرت بالرعب وبينا أنا نائم أوتيت بمفاتيح خزائن الأرض فوضعت في يدي)[3](نێردراوم بە کۆی وتەکان و بۆ ترس سەرخراوم و خەوتبووم کە کلیلەکانی خەزێنەکانی زەویم بۆ هێنراو خرایە دەستم)( بوخاریش بەو شێوەیە هێناویەتی). ئیبن ئیسحاق لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە دادەنیشت قسەی دەکرد زۆرجار سەری بەرەو ئاسمان بەرز ئەکردەوە[4].[5]

ترمذی لە الشمائل، ص٢٥ لە عەمری کوڕی عاصەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ڕووخسارو وتەی بەرامبەر خراپترینی خەڵك هەبوو تا بەوە دڵیان

---

[1] - صحيح.

[2] - حسن.

[3] - صحيح.

[4] - ضعيف.

[5] - ( ئەبو داود لە(كتاب الأدب) لە فەرموودەکەی ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی. لەالبدايه والنهايه ج٦، ص٤٠-٤١ دا واهاتووە).

ڕابکێشێت. ڕووخسارو قسەشی لە ڕوومدا هەبوو منیش وامزانی چاکترین خەڵکم، وتم ئەی پێغەمبەری خوا من باشترم یان ئەبوبەکر؟ فەرمووی ئەبوبەکر، وتم: من یان عومەرﭬ، وتی: عومەرﭬ، وتم: ئەی من یان عوسمانﭬ، فەرمووی: عوسمان. کاتێ پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) کردو ڕاست وەڵامی دامەوە حەزم دەکرد پرسیارم لێنەکردایە[1].

## (پێکەنینو زەردەخەنە)

## (پێکەنینی پێغەمبەری خوا(ﷺ))

بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) نەبینیبوو بە تەواوی پێبکەنێت تادەمو دانی دەربکەوێت، بەڵکوو تەنها بزەی هەبوو. ترمذی لە عەبدوڵلای کوڕی حارثی کوڕی جوزئەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسم نەدیوە هێندەی پێغەمبەر(ﷺ) بزەی هەبێت، هەروەها لێوەی هێناوە دەڵێت: پێکەنینی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها زەردەخەنە بوو[2][3].

موسلیم لە سیماکی کوڕی حەربەوە هێناویەتی دەڵێت: بەجابری کوڕی سەمرەم وت تۆ لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دادەنیشتیت؟ وتی: بەڵێ زۆرجار لەسەر ئەو جێ نوێژەی بەیانی هەڵنەدەستا تا خۆر هەڵدەهات. هەڵدەستاو خەڵکی قسەیان دەکردو لەسەر سەردەمی نەفامی دەدوانو پێدەکەنینو پێغەمبەریش(ﷺ) زەردەخەنەی دەکرد. تەیاسی لە سیماکەوە هێناویەتی بە جابری کوڕی سەمرەم وت ئایا تۆ لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دادەنیشتیت؟ وتی: بەڵێ، کەم بێدەنگو

---

[1] - ضعیف.

[2] - صحیح.

[3] - (ترمزی دەڵێت فەرموودەکە صەحیحە).

کەم پێکەنینی هەبوو. هاوەڵانی لە لای شیعەیان دەهۆنیەوە یان شتێکیان دەوت و پێدەکەنین و پێغەمبەریش(ﷺ) زەردەخەنەی دەکرد.[1]

ئەبو نەعیم و ئیبن عەساکیر لە حوصەینی کوڕی یەزیدی کەلیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) نەبینیوە پێبکەنێ، بەڵکو بزەی هەبوو، جار هەبوو لەتاو برسێتیدا بەردی دەبەست بەسکیەوە.[2]

خەرائیتی و حاکم لە عەمرەوە هێناویانە دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە پێغەمبەر(ﷺ) کە لەگەڵ خێزانەکانی بووایە چی دەکرد؟ وتی: وەك هەرکام لەو پیاوانەی ئێوە، بەڵام بەڕێزترین کەس و نەرم و نیانترین بوو. پێکەنین و زەردەخەنەی هەبوو.[3][4]

بەزار لە جابرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە سروشتی بۆ دادەبەزی یان ئامۆژگاری دەکرد، دەتوت هەواڵی هاتنی سزا بە خەڵکی دەدا- واڕەنگی دەگۆڕا- کە ئەوەندەی نەدەما دەتبینی ڕووگەشترین کەس بوو، لە هەمووان پێکەنینی زیاترو ڕوخۆشی چاکترو جوانتر بوو.[5][6]

تەبەرانی لە ئەبو ئومامەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە هەمووان زیاتر پێدەکەنی و لە هەمووان زیاتر دەروونی پاکتر بوو.[7][8]

---

[1]- ( لەالبدایە والنهایە. ج٦، ص٤١- ٤٢ دا هاتووە. ئیبن سەعد ج١، ص٣٧٢ لە سیماکەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[2]- (لەکنز العمال. ج٤، ص٤٢ دا واهاتووە. ئیبن نافع لە حوصەینەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و باسی بەردەکەی نەهێناوە، وەك لە الصابە، ج١، ص٣٤٠ دا واهاتووە).

[3] – ضعیف.

[4]- ( لەکنز العمال. ج٤. ص٤٧ دا هاتووە. ئیبن عەساکیر لەعەمرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە البدایە والنهایە. ج٦. ص٤٤ دا هاتووە. ئیبن سەعد ج١، ص٩١ بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[5] – حسن.

[6] – (هەیسەمی ج٩، ص١٧ دەڵێت سەنەدەکەی حەسەنە).

[7] – ضعیف.

[8]- لە سەنەدەکەدا عەلی کوڕی یەزیدی ئەلهانی هەیە کە لاوازە، وەك(هەیسەمی ج٩، ١٧ دەڵێت).

ترمذی لە الشمائل ص١٦ لە عامری کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: سەعد(خوای لێ ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بینی ڕۆژی شەڕی خەندەق پێکەنی تادانەکانی دەرکەوتن.وتم چۆن بوو؟ وتی: کەسێ کەوانێکی پێبوو، سەعدیش تیری دەهاویشت، قسەی دەوت بە کەوانەکەو تەوێڵی دەسڕی. سەعد تیرێکی پێدا، کە سەری بەرزکردەوە وەشاندیو گوێی بەڕوونی نەداو وەرگەڕایەوە و قاچی بەرز کردەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێکەنی تادانەکانی دەرکەوتن. وتم: بەچی پێکەنی؟ وتی: بەهەڵوێستی بەرامبەر کابرا.[1]

بوخاری لە صەحیحەکەیدا ج٢، ص٨٩٩ لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و وتی قووڕ بەسەر بووم، لەڕەمەزاندا چوومە لای ژنەکەم. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(دەی کۆیلەیەك ئازاد بکە) وتی: نیمە. فەرمووی: دەی دوو مانگ بەسەر یەکەوە بەڕۆژووبە. وتی: ناتوانم، فەرمووی: دەی نانی شەست هەژار بدە. وتی: نیمە. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بڕێك خورمای هێنا(العرق: المکتل) فەرمووی:(أين السائل؟ تصدق بها)واتە(داواکار کوا، ئەمە ببەخشە) وتی: لە من هەژارتر هەیە؟ بەخوا لەم شارەدا لە ئێمە هەژارتر نییە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێکەنی تادانەکانی دەرکەوتنو فەرمووی:(فأنتم إذا)واتە(دەی بۆ خۆتان).

ترمذی لە شمائل ص١٦ لە ئەبوذەرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:(إني لأعلم أول رجل يدخل الجنة وآخر وجل يخرج من النار يؤتى بالرجل يوم القيامة فيقال أعرضوا عليه صغار ذنوبه ونخبأ عنه كبارها فيقال له عملت يوم كذا و كذا وهو مقر لاينكر وهو مشفق من كبارها، فيقال أعطوه مكان كل سيئة عملها حسنة فيقول ان لي ذنوبا ما أراها ههنا)واتە(من چاك دەزانم یەکەم کەس دەچێتە بەهەشتو کۆتا کەس لە دۆزەخ دەردەچێت. لە ڕۆژی دوایدا کەسێك دەهێنرێتو دەوترێت تاوانە بچووکەکانی پێ نیشان بدەنو گەورەکانی لێ بشارنەوە. پێی دەوترێ لەبری هەر خراپەیەکی چاکەیەکی پێببەخشن. ئەویش دەڵێت: من هەندێ تاوانم هەن لێرەدا نایانبینم).

---

[1] - ضعیف.

ئەبوزەر دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی پێدەکەنی تا دانەکانی دەرکەوتن، هەروەها لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(من کۆتا کەسی ناو دۆزەخ دەناسم کە لە دۆزەخ دەردەچێت، کەسێکە بە پاڵەخشێ لێی دەردەچێت، پێی دەوترێت بڕۆرە ناو بەهەشت، دەچێت تابچێتە ناو بەهەشت، سەیردەکات خەڵکی شوێنی خۆیانیان گرتووە، دەگەڕێتەوە و دەڵێت: پەروەردەگارا خەڵکی شوێنیان گرتووە، پێی دەوترێ ئەو سەردەمەت بیردێت کە تیایدا بوویت؟ دەڵێت: بەڵێ، پێی دەوترێ هیوا بخوازە، ئەویش هیوا دەخوازێ، پێی دەوترێ ئەوەی هیوات بۆ خواستو دە هێندەی دنیا بۆ تۆ. ئەویش دەڵێت: تۆ مەلیکیتو گاڵتەم پێدەکەیت؟). دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی پێکەنی تاددانەکانی دەرکەوتن.

## (لەسەرخۆیی)

قازی عیاض لە(الشفاء) لە خارجەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆڕیدا لەسەرخۆترین کەس بوو ، لەملاولایەوە شتێ دەچوو.[1][2]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص٣٣١ لە شەمری کوڕی حەوشەبەوە هێناویەتی دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر قسەیان بکردایەو موعاذی کوڕی جەبەلیان تێدا بووایە، سەیریان دەکرد شانوشکۆی هەبوو. هەروەها لە ئەبو موسلیمی خەولانیەوە هێناویەتی دەڵێت: چوومە مزگەوتی حیمص تیایدا نزیکەی سی(٣٠) کەس هەبوون لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، گەنجێکی تێدابوو، چاوەکانی ڕشتبوو دەمو دان گەشو قسەی نەدەکرد، ئەگەر خەڵکەکە لە شتێکدا گومانیان هەبووایە دەچوونەوە بۆ لای ئەو و پرسیاریان دەکرد، بەوکەسەی پاڵ خۆمم وت

---

[1] - ضعیف.

[2] - ( ئەبو داود لە(المراسیل) دا هێناویەتی، وەك لە(شرح الشفاء) ی خەفاجیدا ج٢، ص١١٧ هاتووە).

ئەوە کێیە؟ وتی: موعاذی کوڕی جەبەل، خۆشەویستی ئەو کەوتە دڵمەوەو لەگەڵیاندا بووم تابڵاوەیان کرد. هەروەها لێیەوە هێناویەتی ڕۆژێ لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ مزگەوت، یەکەمجار بوو لە سەردەمی ئیمارەتی عومەری کوڕی خەتتابدا کۆببنەوە. لە کۆڕێکدا دانیشتم کە سی و ئەوندە کەس بوون و هەموویان فەرموودەیان لەپێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕایەوەو لەبانەکەدا گەنجێ هەبوو کە قسەو ڕووخۆش و دەموچاو گەش بوو، لە هەموویان گەنجتر بوو، ئەگەر لەشتێکدا گرفتێکیان هەبووایە دەیانگێڕایەوە بۆ لای ئەو، ئەویش ئەوەی بۆ دەوتن و هیچی پێ نەدەوتن مەگەر پرسیاریان لێ بکردایە. وتم: ئەی بەندەی خوا تۆ کێیت؟ وتی: من موعاذی کوڕی جەبەلم.

## (ڕق و کینە خواردنەوە)

تەیالسی و ئەحمەدو حەمیدی و ئەبوداودو ترمذی و ئەبو یەعلاو سەعیدی کوڕی مەنسوورو جگە لەوانیش لەئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە هێناویانە دەڵێت: کەسێ لە ئەبوبەکری صدیق تووڕە بوو، ئەبو بەرزە وتی بدەم لە ملی؟ ڕێی پێ نەدا وتی دوای پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەڵوێستە بۆ کەسی تر نییە[1].[2]

ئەحمەد لە(الزهد) لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: هەر بەندەیەك هیچ جامێ شیر یان هەنگوین ناخواتەوە هێندەی جامێ تووڕەیی و ڕق خواردنەوە باشتر بێ- واتە ڕق و تووڕەیی نەڕێژێت-.[3]

---

[1] – صحیح.

[2] – (لە کنز العمال ج٢، ص١٦١ دا واهاتووە).

[3] – ( لەکنز العمال دا واهاتووە).

# (غیرە)

ئیبن عەساکیر لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی فلانە؟ دەچێتە لای ژنی باوکی. ئوبەی وتی: ئەگەر من بومایە بە شمشێر لێمدەدا. پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی:(ناأغیرك یاأبي؟ إني لأغیر منك والله أغیر مني)واتە(چی غیرەی پێدایت ئەی ئوبەی؟ من لە تۆ غیرەدار ترمو خواش لە من غیرەدارترە).[1]

بوخاری و موسلیم لەموغیرەوە هێناویانە دەڵێن: سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەگەر کەسێك لەگەڵ ژنەکەم ببینم، بەبێ ئەملاو ئەولا دەدەم لە ملی. پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بیستەوەو فەرمووی:(أتعجبوون من غیرة سعد والله لأنا أغیرك منه والله أغیرك مني ومن أجل عیرة الله حرم الله الفواحش ماظهر منها وما بطن ولا أحد أحب الیه العذر من الله من أجل ذلك بعث المنذرین والمبشرین. ولا أحد أحب الیه المدحة من الله ومن أجل ذلك وعد الله الجنة)واتە(سەرتان سوڕدەمێنێت لە غیرەی سەعد؟! سوێند بەخوا من لەو خاوەن غیرەترمو خواش لە من خاوەن غیرەدارترە، لەبەر غیرەی خوا خوا داوێن پیسی حەرام کردووە، بەوەی دیارەو ئەوەشی نادیارە، کەس نییە لە خوا زیاتر پۆزشی لا خۆشەویست بێت، لەبەرئەوە ترسێنەران و مۆژدەبەرانی ناردووە، کەس نییە هێندەی خوا مەدحی لاخۆشەیست بێت، لەبەرئەوە خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە).

موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەگەر لەگەڵ ژنمدا پیاوێ ببینم، دەستی لێ نەدەم تاچوار شاهید بێنم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، وتی: نەبەخوا کە تۆی بە حەق ناردووە، پێش ئەوە بە شمشێر

---

[1] - ( لەالمنتخب ج٥، ص١٣٢دا واهاتووە).

ئەدەم لە ملی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بیستت گەورەکەتان چی دەڵێت، ئەو غیرەی زۆرەو من لەو غیرەدارترمو خواش لە من غیرەی زیاترە)[1].[2]

ئەبو یەعلا لە ئیبن عەبباسەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی و لە فەرموودەکەیدا هاتووە: وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرکۆنەی مەکە، چونکە کەسێکە غیرەی زۆرە، بەخوا تەنها کچی بە هاوسەر گرتووەو هەر ژنێکی تەلاق دابێت یەکێ لەئێمە لەتاو غیرەی ئەو نەیوێراوە ژنی تەلاقدراوی بە هاوسەر بگرێت. سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من دەزانم ئەوە حەقەو لای خواوەیە، بەلاّم سەرم سوڕما ئەگەر ببینم ئافرەتێ پیاوێ ڕانی خستبێتە سەر ڕانی هیچ نەکەمو نەیجوڵێنم تاچوار شاهید نەهێنم، بەخوا ناچم بۆیان تاپێویستی خۆی بەجێدەگەیەنێت.[3]

موسلیم لە عائیشەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) شەو لە لای دەرچوو، منیش غیرەم لێ کرد، هاتەوە سەیری کرد چیم لێکردووە، فەرمووی(مالك یاعائشة أغرت؟)واتە(چیتە عائیشە غیرەت کردووە؟) وتم: بۆچی نموونەی من غیرەی بۆ نموونەی وەك تۆ نەبێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (قد جاءك شیطانك). واتە (بەڕاستی شەیتانەکەت هاتووە بۆ لات) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا شەیتانم لەگەڵە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: لەگەڵ تۆشدا هەیە؟ فەرمووی: )(نعم ولكن أعاني الله حتى أسلم) واتە(بەڵێ، بەلاّم خوای گەورە یارمەتیدام تاموسڵمان بووخۆی دابەستەوە).[4]

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( لەالمشكاة ص٢٧٨ دا واهاتووە).

[3] – (هەیسەمی ج٥، ص١٢ دەڵێت: ئەبو یەعلا هێناویەتی و دەقەکە هی ئەوەو ئەحمەد بە کورتی لێوەی هێناوە).

[4] – (لەالمشكاه ص٢٨٠ دا هاتووە).

ئیبن سەعد ج٨، ص٩٤ لە عائیشەوە هێناویەتی وتی: کە پێغەمبەر(ﷺ) ئوم سەلەمەی بە هاوسەرگرت، زۆر خەفەتم پێ خوارد، لەبەرئەوەی باسی جوانی ئوم سەلەمەیان بۆ کردبووین، سۆزم بۆ نواند تابینیم. سوێند بەخوا چەند بەرامبەر ئەو جوانی و چاکییە بوو کە بۆم وەسف کرابوو، ئەوەم بۆ حەفسە باسکرد کە یەکدەست بوون و وتی: بەخوا ئەمە غیرەیە، وانیە وادەیڵێن. ئەویش بینی وتی بەخوا بینیم نەبەخوا وانییە کە دەیڵێن و نزیکیش نییە ئەو زۆر جوانە، دەڵێت دواتر بینیم بەخوا وابوو کە حەفسە وتی، بەڵام من غیرەم لێ کرد.

رستە لە عەلییەوە هێناویەتی دەڵێت: ئایا لەسەر ئافرەتانتان نەمبیستووە ئەوان پشێوی ناو بازاڕ دروست ئەکەن، ئایا غیرە ناکەن؟ هەر کەس غیرە نەکات هیچ خەیری تێدا نییە. هەروەها لێیەوە هێناویەتی غیرە دوو جۆرە: چاک و جوانەو پیاو ماڵەوەی پێ دەسوڵحێنێ، غیرەیەکیش دەیخاتە دۆزەخ.[1]

## (فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە)

تەبەرانی لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ژوور و فەرمووی: ئەی ئیبن عەبباس، وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا –سێ جار– فەرمووی: ؟)(أتدري أي الناس أفضل؟) واتە(دەزانیت باشترین کەسەکان کێن). وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن. فەرمووی: (فأن أفضل الناس أفضلهم عملاً إذا فقهوا في دينهم) واتە(دەی چاکترینی خەڵك چاکترینیانن لەکاردا، ئەگەر لەئایینیان تێگەیشتبن) پاشان فەرمووی:(ئەی ئیبن مەسعود، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(دەزانیت زاناترینی خەڵك کێن؟) وتم: خواو پێغەمبەرکەی دەزانن. فەرمووی:(زاناترینی خەڵك ئەوانەن چاکتر حەق دەبینن، ئەگەر خەڵك ناکۆك بوون ئەگەرچی لەکاردا کەمتەرخەم بێ و ئەگەر لەسەر سمتی بکشێ، ئەوانەی پێش من دابەش بوون بۆ حەفتاو دوو بەش، لەوانە سێیان ڕزگاریان بوو ئەوانی تر هەموو

---

[1] – (لەکنز العمال، ج٢، ص١٦١ دا واهاتووە).

بەهیلاکدا چوون. دەستەیەك لە پاشایان لایانداو لەسەر ئایینیان شەڕیان لەگەڵ کردن و لەسەر ئایینی عیسای کوڕی مەریەم لە وڵاتدا بڵاوبوونەوەو دایانە ڕوهبانییەت. ئەوانە ئەوانەن کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاء رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرکەس بڕوام پێ بهێنێ و بەڕاستم بزانێ و شوێنم بکەوێت ئەرکی خۆی بەجێگەیاندووە. هەرکەسیش شوێنم نەکەوێت ئەوانە بە هیلاکدا چووە).

لە گێڕانەوەیەکیشدا(دەستەیەك لەناو پاشا خۆسەپێنەکاندا) مانەوەو بانگەوازیان کرد بۆ ئایینی عیسا، گیران و بە مشار کوژاران و بە ئاگر سوتێنران، خۆیان گرت تا گەیشتنەوە بەخوا، ئەوی دیکەی بە هەمان شێوە هێناوە).[1]

بەزار لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئێوە لەسەر ڕێنموونی پەروەردگارتانن تاکاتێ لەناوتاندا دوو سەرخۆشیەکە دەرنەکەون، سەرخۆشی نەفامی و سەرخۆشی خۆشەویستی ژیان. ئێوە فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن و لە ڕێی خوادا جیهاد دەکەن، ئەگەر خۆشەویستی دنیا لەناوتاندا دەرکەوت، فەرمان ناکەن بە چاکەو ڕێگری ناکەن لە خراپەو لە پێناو خوادا جیهاد ناکەن. ئەوانەی ئەمڕۆ بە قورئان و سوننەت دەدوێن وەك پێشینە یەکەمینەکانی کۆچەران و پشتیوانان وان).[2]

بەیهەقی و نەقاش لە موعجەمەکەیداو ئیبن نەجار لە واقیدی کوڕی سەلامە لە یەزیدی ڕەقاشی لە ئەنەسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئایا هەواڵی

---

[1]- (هەیسەمی ج٧، ص٢٦٠ دەڵێت: تەبەرانی بە دوو سەنەد هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدێکیان صەحین، جگە لە بەکیر کە ناسراوەو ئەحمەدو هی دیکە متمانەی پێ دەکەن جۆرە لاوازییەکی تێدایە، تەواو).

[2]- هەیسەمی ج٧، ص٢٧١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا حەسەنی کوڕی بەشیر هەیە کە ئەبو حاتەم و جگە لەویش متمانەی پێ دەدەن و جۆرە لاوازییەکی تێدایە. تەواو.

کەسێکتان پێ بدەم کە پێغەمبەران و شەهیدان نین و لەڕۆژی دواییدا پێغەمبەران و شەهیدان ئاوات بە شوێنیان دەخوازن لای خوا. لەسەر مینبەری ڕووناکی و نوورن و دەناسرێنەوە) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانە کێن؟ فەرمووی(الذین یحبوون عباد الله الی الله ویحببوون الله الی عباده ویمشون علی الأرض نصحا)واتە(ئەوانەی بەندەکانی خوا لای خوا خۆشەویست دەکەن و خوا لای بەندەکانی خۆشەویست دەکەن بەسەر زەویدا دەچن بە ئامۆژگاری کردن) منیش وتم ئەوانە لای بەندەکان خۆشەویست دەکەن، بەڵام چۆن بەندەکانی خوا لای خوا خۆشەویست دەکەن؟ فەرمووی:(یأمرنهم بما یحب الله وینهونهم عما یکر، الله فأذا أطاعوهم أحبهم الله عزوجل)واتە(فەرمانیان پێ دەکەن بەوەی خوا خۆشی دەوێت و ڕێگرییان لێ دەکەن لەوەی خوا ڕقی لێیەتی، ئەگەر گوێڕایەڵییان کردن، خوای گەورەش خۆشی دەوێن).[1]

تەبەرانی لە حوذەیفەوە هێناویەتی دەڵێت: بە پێغەمبەرم(ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە وازی لێ دەهێنرێت؟ کە ئەوانە گەورەترین کارە چاکەکانی مرۆڤن؟ فەرمووی:(اذا اصابکم ماأصاب بني اسرائیل)واتە(ئەگەر ئەوەتان تووشبوو کە تووشی بەنی ئیسرائیل بوو) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوان تووشی چی بوون؟ فەرمووی(اذا داهن خیارکم فجارکم وصار الفتنة فی برارکم وصار الملك في صغارکم فعند ذلك تلبسکم فتنة تکرون ویکر علیکم).[2][3]

---

[1] – ( واقدو یەزید کە لەسەنەدەکەدان لاوازن. لەکنز العمال ج٣، ص١٣٩ دا واهاتووە).

[2] – ضعیف.

[3] – ( لە سەنەدەکەدا عەمماری کوڕی سەیف هەیە کە عجلی و هی دیکەش متمانەی پێ دەدەن و کۆمەڵیکیش بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەش جێمتمانەن و لەسەر هەندیکیان ڕاجیاوازی هەیە. وەك هەیسەمی ج٧، ص٢٧٦ دەیڵێت. هەروەها ئیبن عەساکیرو ئیبن نەجار لە ئەنەسەوەو ئیبن ئەی دنیا لە عائیشەوە بەو واتایە هێناویانە. وەك لە کنز العمال ج٢، ص١٣٩ دا هاتووە).

بەیهەقی و سەعیدی کوڕی مەنسورو جگە لەوانیش لە قەیسی کوڕی ئەبو حازمەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێ ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە چوویە سەر مینبەرو سوپاسی خوای کرد، پاشان وتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ إِلَى اللّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئێوە لە شوێنی خۆیدا دایناننێن. من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(ان الناس اذا رأوا النمكر ولم يغيروه أوشك أن يعمهم الله بعقاب)واتە(خەڵکی ئەگەر خراپەیان بینی و نەیانگۆڕا نزیکە خودا هەموویان تووشی سزا بکات).[1]

ئیبن مەردەویە لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر لەسەر مینبەری پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت، ئەو ڕۆژەی بە خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) ناونرا، سوپاس و ستایشی خوای کردو سەڵەواتی دا لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) پاشان دەستەکانی بڵاوکردەوەو دواتر لەسەر ئەو شوێنە دایانان کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەرەکەی لەسەری دادەنیشت. پاشان وتی: لە خۆشەویستم بیست کە لێرەدا دانیشتبوو تەئویلی ئەم ئایەتەی دەکرد ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ پاشان ڕاڤەی کرد، ڕاڤەکەی بۆمان ئەوەبوو فەرمووی (نعم ليس من قوم عمل فيهم بمنكر ويفسد فيهم بقبيح فلم يغيروه ولم ينكروه الا حق على الله أن يعمهم بالعقوبة جميعاً ثم لم يستجاب لهم)واتە (بەڵێ، هەر هۆزێ خراپەیەکیان لەنێواندا بکرێت و خراپەکاری بکرێت بە ناشرینییەك و نەیگۆڕن و نکوڵی لەسەر نەکەن، مافی خوایە کە هەموویان سزا بدات و دواتر وەڵامی نزایان نەدرێتەوە)

---

ئیبن ئەبی شەیبە و ئەحمەدو عەبدی کوڕی حەمیدو عەدەنی و ئیبن مونیع و حەمیدی و ئەبوداودو ترمزی هێناویانەو ترمزی دەڵێت فەرموودەکە حەسەنی صەحیحەو نەسائی و ئیبن ماجەو ئەبو یەعلاو ئەبو نەعیم لە(المعرفه) و دارقوتنی لە(الحلل) دا دەڵێت: هەموو گێڕەرەوەکان جێمتمانەن.

[1] – صحیح.

پاشان پەنجەی کرد بەگوێکانیداو وتی: ئەگەر لە خۆشەویستم(ﷺ) نەبیستایە بێدەنگ دەبووم.[1]

بەیهەقی لە ئەبوبەکرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر کەسانێ لە بەردەم خەڵکانێکدا خراپەیان کرد کە ئەوان لەوان عیززەتمەندتر بن و نەیگۆڕن، خوای گەورە بەڵایان بەسەردا دەبارێنێت، پاشان لەسەریان لادەبات.[2]

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەبو عوبەیدو ئیبن ئەبی دنیا لە(الصمت) لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: چی ڕێگرتانە ئەگەر گەمژەتان بینی سنوورو ئابڕووی خەڵك دەشکێنێ لە ڕووی نەوەستن؟ وتیان: لە زمانی دەترسین، وتی: ئەوە کەمترە لەوەی شاهید بن.[3]

ئیبن ئەبی شەیبە لە عوسمانەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکەن پێش ئەوی خراپەکانتان بەسەرتاندا زاڵ بن و چاکەکانتان نزایان لێ بکەن و نزایان وەڵام نەدرێتەوە.[4]

ئیبن ئەبی شەیبە لە عەلیەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێنایەتی دەڵێت: بەخوا فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکەن و فەرمانی خوا بەجێدەگەیەنن یان کەسانێ لە ئێوە نابن سزاتان بدەن و خواش ئەوان سزا بدات. حارث لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکەن یان خوا خراپەکانی خۆتانتان بەسەردا زاڵ دەکات و دواتر چاکەکانتان نزا دەکەن و وەڵامیان نادرێتەوە. ئیبن ئەبی حاتەم لێیەوە هێناویەتی کە لەوتارەکەیدا وتی: خەڵکینە ئەوانەی پێش ئێوە بەوە لەناوچوون خراپەیان گرتەبەر، لە خواترس و ئەحبارەکانیان ڕێگرییان لێ

[1] – ( لەکنز العمال، ج٢، ص١٣٨ دا واهاتووە).
[2] – ( لەکنز العمال، ج٢، ص١٣٨دا واهاتووە).
[3] – ( لەکنز العمال، ج٢، ص١٣٩ دا واهاتووە).
[4] – ( لەکنز العمال، ج٢، ص١٢٩ دا واهاتووە).

نەکردن. هەرچی زیاتر خراپەیان دەکردو ئەوانیش ڕێگرییان لێ نەدەکردن سزا دایدەگرتن. دەی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکەن پێش ئەوەی ئەو بەڵایەتان تووش بێت کە تووشی ئەوان بوو. بزانن فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە ڕۆزی نابڕێ‌و مەرگ نزیك ناکاتەوە.[1]

موسەددەدو بەیهەقی – بە صەحیحی داناوە– لە عەلییەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: جیهاد سێ جۆرە، جیهادی دەست‌و جیهادی زمان‌و جیهادی دڵ. یەکەم جۆری جیهاد کە بەسەریدا زاڵ دەبن جیهادی دەستە، پاشان جیهادی زمان، پاشان جیهادی دڵ. ئەگەر دڵ چاکەی نەناسی‌و خراپەی بەرپەرچ نەدایەوە شکست خواردووەو بەرزی نزم دەبێ.

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەبو نەعیم‌و نەسر لە عەلییەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: یەکەم جۆری جیهاد کە بەسەریدا زاڵ دەبن جیهادی دەستتانە، دواتر جیهادی دڵتان. هەر دڵێ چاکە بە چاك‌و خراپە بە خراپ نەناسێ، دەشکێ‌و بەرزی نزم دەگەڕێ، وەك چۆن گۆزە دەشکێ‌و چی تێدایە دەڕژێ.[2]

تەبەرانی لە تاریقی کوڕی شهابەوە هێناویەتی دەڵێت: عریسی کوڕی عرقوبی شەیبانی هات بۆ لای عەبدوڵڵا(خوای لێ ڕازی بێت) وتی: هەرکەس فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە نەکات ماڵوێرانە. وتی: بەڵکو هەرکەس چاکە نەناسێ و خراپە بەرپەرچ نەداتەوە ماڵوێرانە.[3]

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: خەڵکی سێ جۆرن، جگە لەوانە خێریان تێدا نییە، کەسێ دەستەیەك ببینێت لە ڕێی خوادا

---

[1] . ( لەکنز العمال، ج۲، ص۱۳۹ دا واهاتووە).

[2] – ( لەکنز العمال، ج۲، ص۱۳۹ دا واهاتووە).

[3] – (هەیسەمی ج۷، ص۲۷۵ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن. هەروەها ئەبو نەعیم لە الحلیە ج۱، ص۱۳۵ لە تاریقەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی. ئیبن ئەبی شەیبەو نەعیم لە(الفتن) لە ئیبن مەسعودەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە کنز العمال ج۲، ص۱٤۰ دا هاتووە).

بجەنگن ئەویش بە ماڵ و گیانی جیهاد بکات. کەسێ بەزمانی جیهاد بکات و فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە بکات. کەسێ بە دڵ حەق بناسێ.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: بەدەستەکانتان جیهادی دووڕوان بکەن، ئەگەر نەتانتوانی تەنها ئەوە نەبێت بەڕوویاندا گرژی بنوێنن بەڕوویاندا گرژی بنوێنن.[2]

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەبونەعیم لە ئیبن مەسعودەوە هێناویانە دەڵێت: ئەگەر ناڕەوات بینی و نەتتوانی بیگۆڕی، هێندە بەسە خوا بزانێت تۆ لەدڵەوە پێت ناخۆشە.[3]

هەروەها هەردووکیان لە ئیبن مەسعودەوە هێناویانە دەڵێت: کەس هەیە دەبینێت خراپەو سەرکەشی دەکرێت و کاری پێ دەکات و پێی ناخۆشە، وەك ئەوە وایە نەیکردبێت. کەسیش هەیە نایکات، بەڵام پێی خۆشە وەك ئەوە وایە کردبێتی، هەرکس ڕقی لەوە بێت کە دیویەتی، وەك ئەوە وایە لێی دوور بووبێت.[4]

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص١٣٥ لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: پیاوچاکان دەستە بە دەستە دەچن و کەسانی گومان کە چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە ناناسن دەمێننەوە.[5]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١، ص٢٧٩ لە ئەبو رەتادەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ مەولاکەم چووم و من غولام بووم، ئاگام لە حوزەیفە بوو دەیوت: ئەگەر کەس لە

---

[1] – (هەیسەمی ج٧، ص٢٧٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی واهەیە کە نایناسم).

[2] – ( لەکنز العمال، ج٢، ص١٤٠ دا هاتووە.تەبەرانی بەو واتایە هێناویەتی. هەیسەمی ج٧، ص٢٧٦ دەڵێت: تەبەرانی بە دوو سەنەد هێناویەتی، لە سەنەدێکیاندا شەریك هەیە کە فەرموودەی حەسەنە. کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن).

[3] – ( لەکنز العمال، ج٢، ص١٤٠ دا هاتووە

[4] – لە کنز العمال، ج٢، ١٤٠ دا واهاتووە).

[5] – تەبەرانی بە هەمان شێوە هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، (وەك هەیسەمی ج٧، ص٢٨٠ دەیلێت).

سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) قسەیەکی بکردایە، پێی دەبوو بەدووڕوو. من ئەو قسەیەم لەیەکێکتان بیست لە یەك شوێندا چوار جار وتی. دەی فەرمان بەچاکە دەکەن و لەسەر چاکە دەکەونە هاندان یان خوای گەورە هەموتان تووشی سزایەك دەکات یان خراپەکانتان دەبنە بەرپرستان و چاکەکانتان نزا دەکەن و وەلامی نزاتان نادرێتەوە.[1]

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص٢٧٩ لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: نەفرینی خوا لەوەی لە ئێمە نییە. سوێند بەخوا فەرمان دەکەن بە چاکەو ڕێگری دەکەن لە خراپە یان لەنێوخۆدا شەڕدەکەن و خراپەکانتان بەسەر چاکەکانتاندا زاڵ دەبن و دەیانکوژن تاکەسێ نەمێنێ فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکات. دواتر لە خوا دەپارێنەوە خواش وەلامتان ناداتەوە.

هەروەها لە ئەبونەعیم ج١، ص٢٨٠ لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: سەردەمێکتان بەسەردا دێت چاکتان تیایدا ئەوەیە فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە ناکات.[2]

ئیبن عەساکیر لە عەددی کوڕی حاتەمەوە هێناویەتی دەڵێت: چاکەی ئەمڕۆتان خراپەی سەردەمێ بوو کە چوو، خراپەی ئەمڕۆشتان چاکەی سەردەمێکە کە بەڕێوەیە. ئێوە تا کاتێ خراپەکانتان بزانن و نکوڵی و دژایەتی ئەو خراپانە نەکەن کە دەیانزانن لە خێردا نابن. تاکاتێ زاناتان بەبێ بەکەمزانین لەنێوتاندا هەستێ قسەبکات.[3]

---

[1] – (ئیبن ئەبی شەیبە بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە کنز العمال، ج٢، ص١٤٠دا هاتووە).

[2] – ( ئیبن ئەبی شەیبە بە هەمان شێوەی لێوەی هێناوە. وەك لە کنز العمال، ج٢، ص١٤٠ دا هاتووە. ئیبن ئەبی دنیا لە ئەبو سەعیدەوە بە هەمان شێوە لە کتێبی(الأمر بالمعروف والنهی عن المنکر) دا هێناویەتی، وەك لەکنز العمال، ج٢، ص١٤٠ دا هاتووە).

[3] – ( لەکنز العمال، ج٢، ص١٤١ دا هاتووە).

ئيبن عەساكير لە ئەبو دەرداوەﷺ هێناويەتی دەڵێت: من فەرمان بە چاكە دەكەم‌و خۆم نايكەم، بەڵام هيوام وايە لای خوا لەسەری پاداشت وەربگرم.[1]

ئيبن سەعدو ئيبن عەساكير لە ئيبن عومەرەوە هێناويانە دەڵێت: عومەر ئەگەر بيوستايە ڕێگری شتێ لە خەڵكی بكات دەچوو بۆ ماڵەوەی خۆی، بزانم هەركەس دوورە پەرێزييەكی ئەنجامداوە سزاكەی بۆ چەند بەرامبەر دەكەم.[2]

ماليك‌و ئيبن سەعد لە ئەبو شهابەوە هێناويانە دەڵێت: هيشامی كوڕی حەكيمی كوڕی حزام لەناو كەسانێكدا كە لەگەڵی بوون فەرمانی دەكرد بەچاكە، عومەر دەيوت: تا من‌و هيشام بژين ئەوە نابێت.[3]

تەبەرانی لە ئەبو جەعفەری خەتميەوە هێناويەتی عومەيری كوڕی حەبيبی كوڕی حەماسەی باپيری كە پێغەمبەر(ﷺ) لە هەرزەكاری خۆيدا بينيبووی وەسيەتی بۆ كوڕەكەی كردو وتی: كوڕی شيرينم وريابە لە كۆڕی گەمژەكاندا دانەنيشيت، چونكە دانيشتن لەگەڵياندا دەردە. هەركەس دوور لە گەمژە بێت دڵخۆشەو هەركەسيش خۆشی بوويێت پەشيمانە. هەركەس ڕازی نەبێت بەكەم ئەوەی گەمژە دەيهێنێ بەزۆر ڕازی دەبێت، ئەگەر هەركەسێكتان ويستی فەرمان بەچاكەو ڕێگری لە خراپە بكات، باخۆی ڕابێنێت لەسەر خۆڕاگری بەرامبەر سەختيەكان‌و متمانەی بەپاداشتی لای خوا هەبێت، هەركەس ئەو متمانەی هەبێت ئازار بەركەوتن زيانمەندی ناكات.[4]

---

[1] – (كنز العمال، ج٢، ص١٤١ دا هاتووە. ئەبو نەعيم لە الحليه ج١، ص٢١٣ لێيەوە هێناويەتی).

[2] – (لەكنز العمال، ج٢، ص١٤١ دا واهاتووە).

[3] – (لەكنز العمال، ج٢، ص١٤١دا واهاتووە).

[4] – (كەسەكانی ناو سەنەدەكە جێ متمانەن، وەك هەيسەمی ج٧، ص٢٦٦ دەيڵێت: ئەبو نەعيم‌و ئەحمەديش هێناويانە، وەك لە الأصابه ج٣، ص٣٠دا هاتووە).

تەبەرانی لە عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی بەکرەوە هێناویەتی کە ئەبوبەکر ژنێکی لە بەنی غدانە بە هاوسەر گرت، ژنەکە مرد، ئەبوبەکر بردی بۆ گۆڕستان، براکانی هاتنە بەر ئەو نوێژەوە، ئەویش وتی وامەکەن من لە ئێوە شیاوترم بەنوێژ، وتیان: هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕاست ئەکات. ئەویش نوێژی کرد لەسەر ژنەکە، پاشان چوویە ناو گۆڕەکەوە، ئەوانیش پاڵێکی توندیان پێوەنا تا لە هۆش چوو، برایەوە ماڵەوە، ئەو ڕۆژ بیست کوڕو کچی بۆی دەگریان. عەبدولعەزیز وتی: من ئەو ڕۆژ بچوکترینیان بووم، کە بەهۆش هاتەوە وتی بەسەرمدا مەگرین، بەخوا دەرچوونی هیچ گیانێ هێندەی دەرچوونی گیانی ئەبوبەکر لە لام شیرینتر نییە. هەموو ترسان و وتیان بۆچی بابە گیان؟ وتم: دەترسم بگەمە سەردەمێ نەتوانم فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکەم، هیچ خێرێ لەو ڕۆژەدا نییە.[1]

تەبەرانی لە عەلی کوڕی ئەبو زەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: لە کۆشکدا لەگەڵ حەجاج بووم کە لەپێناو ئیبن ئەشعەسدا خەڵکی دەبینی، ئەنەسی کوڕی مالیک هات تا نزیك بوویەوە، حەجاج پێی وت: ئێ، ئەی گەڕۆکی ناو ئاژاوەکان، جارێ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبوتالیب و جارێ لەگەڵ ئەشعەس، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە وەك شێلم ڕیشەکێشت دەکەم و وەك داماڵینی پێستی مارمێلکە داتدەماڵم. ئەویش وتی: خوا ئەمیر بارچاك بکات مەبەستی کێیە؟ وتی: خوا کەڕت بکات مەبەستم تۆیە. ئەویش گەڕایەوەو وتی: أنا لله وإنا اليه راجعون، پاشان لە لای دەرچووم وتی: ئەگەر بیری کوڕەکەمم نەکردایەتەوەو ترسی ئەوم نەبووایە لەو شوێنەدا قسەیەکم پێدەوت کە هەرگیز دوای ئەوە بەدوای وەڵامدا نەگەڕێ.[2]

بەزار لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: بیستم حەجاج وتاری دەدا، قسەیەکی کرد پێم خراپ بوو، ویستم پێی بگۆڕم ئەو فەرموودەیەم

---

[1] – کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن. (وەك هەیسەمی ج٧، ص٢٨٠ دەڵێت).

[2] – (هەیسەمی ج٧، ص٢٧٤ دەڵێت عەلی کوڕی زەید لاوازەو متمانەشی پێدراوە).

بیرکەوتەوە(لاینبغي للمؤمن أن یذل نفسه)واتە(بۆ موسڵمان شیاو نییە خۆی سەرشۆڕو زەلیل بکات). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن ئەوە دەکات؟ فەرمووی:(یتعرض من البهاء لما لایطیق)واتە(بەرەو ڕووی سەختییەك بێتەوە کە دەرەقەتی نایەت).[1]

## (کەنارگیری)

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەحمەدو ئیبن ئەبی دنیا لە عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: کەنارگیری ئارامگیرییە لە تێکەڵی خراپ. ئەحمەدو ئیبن حەبان و عەسکەری لە عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: بەختی خۆتان لە کەنارگیرییدا وەربگرن.[2]

دەینەوەری لەمعاضی کوڕی عمرانەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب دای بە لای خەڵکێکدا کە سەرکۆنەی کەسێکیان دەکرد لەبەر خوا کەناری گرتبوو، وتی: مەرحەبا نەبێت لەو ڕوخسارانەی تەنها لە خراپەدا دەبینرێن.[3]

تەبەرانی لە عەدەسەی تائیەوە هێناویەتی دەڵێت لە(سراف) بووم کە عەبدوڵلا دابەزی بۆ لامان و کەس وکاری هەندێ شتی پێ ناردبووم بۆی. هەندێ منداڵ هاتن بەدووری چوار شەو ڕێ و باڵندەیەکیان هێنابوو، بردم بۆی، کە بردم بۆی وتی ئەم باڵندەت لە کوێوە هێنا؟ وتم: چەند منداڵێکمان لە دووری چوار شەو ڕێ هێنایان. عەبدوڵلا وتی: خۆزگە ڕاوێك بوومایەو کەسم نەدواندایەو کەسیش نەیدواندمایە تادەگەیشتمەوە بەخوا.[4]

---

[1]- هەیسەمی ج٧، ص٢٧٤ دەڵێت: بەزار و تەبەرانی لە دوو موعجەمی وەسیت و کەبیر بەکورتی هێناویانە، سەنەدەکەی تەبەرانی لە کەبیرەکەیدا باشەو کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە زەکەریای کوڕی یەحیای کوڕی ئەیوبی زەریر خەتیب باسی کردووە کە فەرموودەی لە هەندێ گێڕاوەتەوەو فەرموودەی بۆ هەندێکیش گێڕاوەتەود، کەسیش قسەی تێدا نەکردووە).

[2]- ( لەکنز العمال ج٢، ص١٥٩دا هاتووە. ئیبن موبارەك لە عومەرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی. وەك لە فتح الباري ج١، ص٢٦٢ دا هاتووە).

[3]- ( لەکنز العمال ج٢، ص١٥٩ دا واهاتووە).

[4]- هەیسەمی ج١٠، ص٣٠٤. دەڵێت کەسەکانی صەحیحن. ئیبن عەساکیر بەو واتایە. بە کوورتی لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی، وەك لەکنز العمال ج٢، ص١٥٩دا هاتووە.

ئەبونەعیم لە الحلية ج١، ص١٣٥ لە قاسمەوە هێناویەتی کەسێك بەعەبدوڵڵای وت: ئامۆژگاریت بکەم؟ وتی با ماڵەوەی خۆی بەس بێ‌و زمانی خۆت بپارێزەو بگری بەسەر بیرکردنەوەی خراپەکانتدا.

تەبەرانی لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبوخالیدەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن مەسعود سێ ئامۆژگاری کوڕەکەی کرد: کوڕی شیرینم وەسیەتت بۆ دەکەم لە خوابترسەو ماڵی خۆت بەس بێت‌و بەسەر تاوانەکانتدا بگری.[1]

حاکم لە حوذەیفەوە هێناویەتی دەڵێت: خۆزگە بەشی خۆم‌و ماڵ‌و پێویستیم دەبوو، ئیتر دەرگام دابخستایەو کەس نەهاتایە بۆ لام‌و نەچوومایە بۆ لای کەس تادەگەیشتمەوە بەخوا.[2]

ئیبن ئەبی دنیا لە مالیك لە کەسێك لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر ترس‌و وەسواسی نەبووایە دەچووم بۆ شوێنێ مرۆڤی تێدا نەبووایە، مەگەر جگە لە مرۆڤ کەس هەیە مرۆڤ خراپەڕێ بکات؟[3]

ئیبن ئەبی دنیا لە مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: لە یەحیای کوڕی سەعیدم بیست دەیوت: ئەبولجەهم حارسی کوڕی حمیمە لەگەڵ پشتیوانان دادەنیشت، کە باسی کەنارگیری‌و تاکگیرییان بۆ دەکرد دەیوت خەڵکی لە تاکگیری خراپترن.[4]

ئیبن عەساکیر لەئەبو دەرداوە هێناویەتی دەڵێت: بەسە بۆ کەسی موسڵمان کە ماڵی خۆی بەس بێت تیایدا خۆی‌و چاو و شەرمگەی بگرێتەوە. وریابن دووربگرن لە کۆڕی ناوبازاڕ، چونکە گاڵتەو پووچکاری تێدایە.[5]

---

[1] -.(هەیسەمی ج١، ص٢٩٩ دەڵێ تەبەرانی بە دوو سەنەد هێناویەتی‌و سەنەدێکیان صەحیحن.

[2] - ( لەکنز العمال ج٢، ص١٥٩ واهاتووە. ئەبو نەعیم ج١، ص٢٧٨ بە هەمان شێوە لێوەی هێناوە).

[3] - (لە کنز العمال ج٢، ص١٥٩ دا واهاتووە).

[4] - (لە کنز العمال ج٢، ص١٥٩ دا واهاتووە).

[5] - (لە کنز العمال ج٢، ص١٥٩ دا واهاتووە).

تەبەرانی لـە عەبدوڵڵای کوڕی عـەمرەوە هێناویـەتی دای بـەلای موعـاذی کـوڕی جەبەلـدا کـە لەبەردەرگاکەیـدا وەسـتابوو بـە دەسـتی ئامـاژەی دەکـرد وەك ئـەوەی لەگـەڵ خـۆی قسەبکات. عەبدوڵڵا پـێی وت: ئـەبو عەبدوڕەحمان ئـەوە چیتە خـۆت دەدوێنی؟ وتی: هیچ نییە دوژمنی خوا دەیەوێت دوورم بگرێت لەو فەرمایشتەی لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(من خـرج في سـبيل الله كـان ضـامنا علـى الله ومـن عاد مريضا كان ضامنا على الله عزوجل ومن غدا الى المسجد أوراح كان ضـامنا علـى الله عزوجل، ومن دخل الى إمام يعـزره كـان ضـامنا علـى الله عزوجل ومـن جلـس في بيتـه لم يغتـب أحداً بـسوء كـان ضـامنا علـى الله عزوجـل)واتـە(هەرکـەس لەبـەرخوا دەربـچێت لای خـوا زامنــە، هەرکــەس بــە نەخۆشــی بگەڕێتــەوە لای خــوا زامنــە. هەرکــەس لــە ڕێی مزگەوتــدا بێــت لای خــوا زامنــە. هەرکــەس بــچێت بــۆ لای پێشەوایەكو دەستگرۆی حاڵی بێت لای خوا زامنـە، هەرکـەس لەماڵـەوە دانیشێتو بە خراپە باسی کەس نەکات لای خوا زامنە).دوژمنی خـوا دەیویـست لـە مـاڵی خـۆم بمبات بۆ کۆڕەکان[1] [2].

---

[1] - ضعيف.

[2] - (هەیسەمی ج١٠، ص٣٠٤ دەڵێت: تەبەرانی بـەکورتی بـەو شـێوەیە هێناویـەتی. بـەزاریش هێناویەتی، کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد صەحیحن جگە لە ئیبن لوهەیعە).

## (قه‌ناعه‌ت)

ئیبن موبارەك لە عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(خوای لێ ڕازی بێت) کراسێکی بە ئەحنەف بینی وتی ئەحنەف ئەو کراسەت بەچەند کڕی؟ وتی: بە دوانزە درهەم، وتی: هاوار بۆت بەشەش درهەم بۆچی نەتکڕی، بائەوی تری بۆ شتێکی تر بووایە؟[1]

ئیبن ئەبی حاتەم لە حەسەنی بەسرییەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری کە بەگیانت لەدنیادا قەناعەت بکە، چونکە خوای گەورە لە ڕۆزیدا فەزڵی هەندێ بەندەی داوە بەسەر هەندێکی دیکەیدا، بەڵکوو هەرکەسەو تاقی دەکاتەوە. ئەوەی زۆری پێدەدات تاقیدەکاتەوە تابزانێ چۆن سوپاسی لەسەر دەکات، سوپاسکردنەکەی بەجێگەیاندنی ئەرکیەتی بەرامبەر ئەوەی پێی بەخشیوەو پێی داوە.[2]

عەسکەری لە ئەبو جەعفەرەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی(خوای لێ ڕازی بێت) لە خورمایەکی وشكو ڕەقی خواردو دواتر ئاردی بەسەردا کردو پاشان دای بەسکی خۆیداو وتی: هەرکەس سکی بیباتە ئاگرەوە خوای گەورە لێی بەدوور بگرێت، پاشان ئەم شیعرەی وت:

فأنك مهما تعطي بطنك سؤله　　　وفرجك نالا منتهى الذم اجمعا[3]

دەینەوەری لە شەعبیەوە هێناویەی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی: ئەی نەوەی ئادەم خەمو خەفەتی ئەمڕۆت کە دێت پێش ئەو ڕۆژەی مەخە کە تیایدایت،

[1] – ( لە کنز العمال ج٢، ص١٦١ دا واهاتووە).

[2] – ( لەکنز العمال ج٢، ص١٦١ دا واهاتووە).

[3] – (لە کنز العمال ج٢، ص١٦١ دا واهاتووە).

چونکە لەئەجەلتدا نییە کە تیایدا ڕۆزیەکەت بۆ دێت. بزانە سەرو پشکی خۆت سامان بەدەست ناهێنێت، مەگەر ئەوەی خەزێنەی بکەیت بۆ کەسی جگە لەخۆت.[1]

ئیبن عەساکیر لە سەعدەوە هێناویەی بەکوڕەکەی وت: کوڕی شیرینم ئەگەر داوای دەوڵەمەندیت کرد بە قەناعەت داوای بکە، چونکە هەرکەس قەناعەتی نەبێت سامان دەوڵەمەندی پێ نابەخشێت.[2]

## (هەنگاونانی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە هاوسەرگیریدا)

## (هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خەدیجەدا)

تەبەرانی لەجابری کوڕی سەمرەوە یان لە یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) مەڕی دەلەوەڕاند، دواتر ویستی مەڕ تێپەڕێنێ و لەو شتەدا کاری کرد، خۆی و هاوڕێیەکی بوون. بۆ خوشکی خەدیجە سەفەرەکەیان تەواو کرد شتێکیان لای مابوو، هاوڕێکەیان دەهات بۆ لای ژنەکەو داوای قەرزەکەی دەکردن و بە موحەمەدی دەوت بڕۆ، ئەویش دەیوت تۆ بڕۆ من شەرم دەکەم. جارێکیان ژنەکە هات بۆ لایان و وتی محەمەد کوا؟ وتی: پێم وت وتی شەرم دەکەم، ئافرەتەکە وتی: کەسی هێندە بەشەرم و داوێن پاک و...هتد.نەدیوە. بەوە چوویە دڵی خەدیجەی خوشکی. بۆیە ناردی بەدوایدا وتی وەرە بۆ لای باوکم و داوام بکە، فەرمووی باوکت سامانی زۆرەو ئەوە ناکات، وتی: تۆ بڕۆ قسەی لەگەڵ بکە من لە کاتی سەرخۆش بوونیدا کارەکەت بۆ ڕادەپەڕێنم. ئەویش چوو داوای خەدیجەی کردو ئەویش پێی دا. بۆ بەیانی کە لە کۆڕدا دانیشت پێی وترا ئافەرین کچەکەت

---

[1] – ( لە کنز العمال ج٢، ص١٦١ دا واهاتووە).

[2] – ( لە کنز العمال ج٢، ص١٦١ دا واهاتووە).

دا بە موحەمەد وتی: من شتی وام نەکردووە! وتیان بەڵێ. ئەویش چوو بۆ لای خەدیجەو وتی: خەڵکی وادەڵێن کە تۆم داوە بە موحەمەد؟ وتی: بەڵێ، ڕاکەت لا کەمو سووک نەبێت موحەمەد ئاواو ئاوایە، هێندەی پێ وت تاڕازی کرد.

پاشان خەدیجە دوو بۆقیەی زێڕ یان زیوی نارد بۆ موحەمەد وتی: شتی پێ بکڕە بۆ مارەییەکەمو بەرخێکو ئەوەو ئەوەی پێ بکڕە. ئەویش وایکرد.[1]

ئەحمەدو تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە، وادیارە لەحەمادەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی خەدیجەی بۆ کردو باوکی خەدیجەش حەزی نەدەکرد بیدات بەو. خەدیجە خواردنو خواردنەوەی ئامادەکردو باوکی و چەند کەسێکی قوڕەیشی بانگکردو کەوتنە خواردنو خواردنەوە تاسەرخۆش بوون. خەدیجە وتی: موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلا هاتووە بۆ داوام منی بدەرێ، ئەویش پێیدا، خەدیجەش جلی کردە بەری و نەریتیش وابوو بۆ باوکان وابکەن. کە لەسەرخۆشی دەرهات سەیری کرد جلی لەبەرە وتی: ئەمە چییە؟ خەدیجە وتی: منت دا بەموحەمەدی کوڕی عەبدوڵلا، وتی: من کچ بدەم بە هەتیووی ئەبو تالیب؟ نەبەخوا، خەدیجە وتی: شەرم ناکەیت؟. دەتەوێت خۆت لای قوڕەیش سووک بکەیتو خەڵکی بزانن تۆ سەرخۆش بویت؟ بەوجۆرە وازی لێ هێنا تاڕازی کرد.[2]

ئیبن سەعد ج۱، ص۱۳۱ لە نەفیسەوە هێناویەتی دەڵێت: خەدیجەی کچی خوەیلد(رضي الله عنها) ئافرەتێکی بەخۆو بە شەریف و ڕێکوپێك بوو، سەرەڕای

---

[1] – (هەیسەمی ج۹، ص۲۲۲ دەڵێت: تەبەرانیو بەزار هێناویانەو کەسەکانی سەنەدەکەی بەزار صەحیحن جگە لە ئەبو خالیدی والبی کە جێ متمانەشە. کەسەکانی بەزاریش هەروا)، بەڵام ئەحمەدی کوڕی یەحیای صوفی مامۆستای نامەکە جێ متمانەشە. بەڵام کەسە صەحیحەکان نییەو لەگێڕانەوەکەیدا دەڵێت: خەدیجە وتی پێی ناخۆش نییە لە جیاتی ئەوەی بڵێ کاتی سەرخۆشیەکەی، سەبارەت بە شمەكو زێڕیش دەڵێت: دیاری بکە بۆ باوکم لە جیاتی بڵێ بۆ خۆم، تەواو.

[2] – کەسەکانی سەنەدی هەردووکیان صەحیحن. وەك(هەیسەمی ج۹، ص۲۲۰ دەڵێت).

ئەوەی خوا ڕێزو خێری پێدابوون ئەوکات لەناو قوڕەیشدا لە ڕەچەڵەکەوە نێوەندو لە شەرەفمەندیدا گەورەترین و لە ساماندا زۆرترینی هەبوو. هەمووان سووربوون لەسەر ئەوەی ئەگەر بتوانن بەهاوسەری بگرن و سامانی بۆ بەخەرج بدەن.

منی وەك هەواڵبەر نارد بۆ لای موحەمەد پاش ئەوەی لە کاروانی بازرگانی شام هاتەوە وتم: ئەی موحەمەد بۆچی ژن ناهێنیت؟ وتی: هیچم نییە تاژنی پیّ بهێنم. وتم: ئەگەر ئەوەت بۆ چارەکراو بانگکرایت بۆ لای ئافرەتێکی جواو دەوڵەمەندو شەرەفمەندی لێهاتوو ئامادەیت؟ وتی: کێیە؟ وتم: خەدیجە، وتی: دەی چۆن ئەوە دەکریّ؟ وتم: لەسەر من، وتی: دەی باشە، منیش چووم و هەواڵم دا بە خەدیجە، ئەویش هەواڵی نارد بۆ موحەمەد کە لە فلاّن کاتدا وەرە. ناردی بە دوای عەمری کوڕی ئەسەدی مامیدا تابە هاوسەر بیدات بە موحەمەد. مامی هات و پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوور بۆ ناو مامەکانی و یەکێکیان لێی بە هاوسەرگرت، عەمری کوڕی ئەسەد وتی: ئەمە مارەبڕینی وەلاّم نادرێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی خۆی و چل ساڵی خەدیجەدا بە هاوسەری گرت، پێش ساڵی فیل، بە ماوەی پانزە ساڵ خەدیجە لە دایك بووبوو.

## هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ عائیشەو سەودە(خوایان لیّ ڕازی بێت)

تەبەرانی لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتیّ خەدیجە مرد خەولەی کچی حەکیمی کوڕی ئەو قەسی ژنی عوسمانی کوڕی مەزعوونت لە مەککە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی هاوسەرگیری ناکەیت؟ فەرمووی: کیّ بێنم؟ وتی: کچ یان بێوەژن؟ فەرمووی: کچ کیّ بیّ؟ وتی: کچی خۆشەویسترین دروستکراوی خوا لات، عائیشەی کچی ئەبوبەکر، فەرمووی: ئەی بێوەژن کیّ؟ وتی: سەودەی کچی زەمعە، بڕوای پیّ هێنایت و شوێنت کەوتووە. فەرمووی: دەی بڕۆ بە هەردووکیان

بڵێ. هات بۆ ماڵی ئەبوبەکرو ئوم ڕوومانی دایکی عائیشەی بینی وتی: ئوم ڕوومان خوای گەورە چ خێرو بەرەکەتێکی بۆ ناردوون؟ پێغەمبەر(ﷺ) ناردوومی تا داوای عائیشەی بۆ بکەم. وتی پێم باشە بووەستی وائەبوبەکر دێتەوە، ئەبوبەکر هات و خەولە وتی: ئەی ئەبوبەکر خوا چ دەروویەکی خێرو بەرەکەتی لێ کردوونەتەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) ناردومی بۆ داوای عائیشە. وتی: دەی عائیشەی بۆ دەبێت؟ ئەو کچی برایەتی. ئەویش گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: چی وتووە؟ ئەویش پێی فەرمووی بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی بڵێ(أنت أخي في الإسلام وأنا أخوك وابنتك تصلح لي)واتە(تۆ برامیت لە ئیسلامداو منیش برای تۆم و کچەکەت بۆ من دەشێت) هاتەوە لای ئەبوبەکرو ئەویش وتی: دەی پێغەمبەرم(ﷺ) بانگ بکە، ئەویش هات و ئەبوبەکر لێی مارەکرد.[1] ئەحمەد لە ئەبو سەلەمەو یەحیای کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاتبەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ خەدیجە مرد- فەرموودەکە بەو واتایە دێنن و لە کۆتاییەکەیدا هاتووە- فەرمووی(بگەڕێرەوە پێی بڵێ: من برای تۆم و تۆ برای منیت لە ئیسلامداو کچەکەت بۆم دەشێت). ئەویش گەڕایەوەو پێی وت: ئەبوبەکر وتی: ڕاوەستەو چوویە دەرەوە. ئوم ڕومان وتی: موتعەمی کوڕی عەدی داوای کردبوو بۆ کوڕەکەی، بەخوا هەرگیز بەڵێنێکی نەداوە دوای خستووە بۆ ئەبوبەکر، ئەبوبەکر چوو بۆ لای مەتعەمی کوڕی عەدی و وتی: ئەو ئافرەتە دەڵێت تۆ وادەڵێیت، لە لای چوو خوای گەورە ئەو بەڵێنەی ناو دەروونی لابرد، ئەبوبەکر بەخەولەی وت: پێغەمبەرم(ﷺ) بۆ بانگ بکە، ئەویش بانگی کردو ئەبوبەکریش لێی مارەکرد، عائیشە ئەوکات شەش ساڵان بوو، پاشان خەولە چوو بۆ لای سەودەی کچی زەمعە و وتی: خوا چ خێرو بەرەکەتێکی بۆ ناردوویت، وتی: چییە؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردوومی بۆ داوات، وتی حەزدەکەم بچیت بۆ لای باوکم و

[1]- (هەیسەمی ج٩، ص٢٢٥ دەڵێت: کەسەکانی صەحیحن جگە لە موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی عەلقەمە کە فەرموودەی حەسەنە).

ئەوەی لە لا باس بکەیت. باوکی پیربوو تەمەنی زۆر بوو لە حەج دواکەوتبوو، خەولە چوو بۆ لای و سەلامی سەردەمی نەفامی لێکرد، وتی ئەو ژنە کێیە؟ وتی: خەولەی کچی حەکیم، وتی: کارت چییە؟ وتی: محەمەدی کوڕی عەبدوڵلا ناردوومی بۆ داوای سەودە. وتی شیاو و بەڕێزە ئەی سەودە چی دەڵێت؟ وتی: حەز دەکات. وتی دەی موحەمەدم بۆ بانگ بکە. پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای و ئەویش سەودەی لێ مارەکرد. عەبدوڵلای کوڕی زەمعەی برای لەحەج هاتەوەو خۆڵی دەکرد بە سەریداو پاش ئەوەی موسڵمان بوو وتی: بەخوا من ئەو ڕۆژە خۆڵم دەکرد بەسەرمدا لەسەر هاوسەرگیری سەودەی کچی زەمعەو پێغەمبەر(ﷺ) گەمژەییم نواند. عائیشە وتی: چووین بۆ مەدینەو لای بەنی حارثی کوڕی خەزرەج لە(سونح) دابەزین، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ماڵمان و دایکم منی هێناو منیش لەناو جۆلانەیەکدا بووم جۆلانێم دەکرد. دایکم دایبەزاندم، منیش خورمایەکم هەبوو بەجێم هێشت و بە بڕێ ئاو دەم و چاوم شۆرد. پاشان دایکم بردمی تالای دەرگا وەستاو منیش دڵەخورپێم بوو تا ئارام بوومەوە، پاشان بردمیە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر جێگەیەك لە ماڵمان دانیشتبوو هەندێ ژن و پیاوی پشتیوانان لەوێ بوون. دایکم لەژوورێکدا هێشتمیەوەو پاشان وتی ئەوانە کەسی تۆن خوا بەرەکەتت بخاتە ناو لەنێویانداو بەرەکەتی ئەوانیش بخاتە ناو تۆ. هەمووان هەستان و چوون و پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵمان لە لام مایەوە. هیچ وشترو بەرخێ سەرنەبڕا تا سەعدی کوڕی عوبادە ئەو تەشتەی بۆ ناردین کە دەینارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ پێغەمبەر(ﷺ)دەچوو بۆ لای ژنەکانی. ئەوکات من تەمەنم حەوت ساڵان بوو.[1][2]

---

[1] - صحيح.

[2] - (هەیسەمی ج٩، ص٢٢٧ دەڵێت ئەحمەد هەندێکی هێناوە تیایدا باسی پەیوەندی هێنانی لەعائیشەوە دەکات و زۆربەی مورسەلە. لە سەنەدەکەشدا موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی

## (هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ حەفسەی کچی عومەر)

بوخاری و نەسائی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە، عومەر(خوای لێ ڕازی بێت) کە حەفسەی لە خونەیسی کوڕی حوذافەی سەهمی بۆ گەڕایەوە،(خونەیس لە بەدردا بەشداربوو لە مەدینە مرد) عوسمانی بینی وتی ئەگەر پێت باشە حەفسەت لێ مارە دەکەم، وتی: بابیری لێ بکەمەوە. چەند شەوێکی برد پێی وتم کە هاوسەرگیری ناکەم، عومەر وتی بە ئەبوبەکرم وت ئەگەر دەتەوێت حەفسەت لێ مارە دەکەم، بێدەنگ بوو، لە عوسمان زیاتر چاوم لەسەری بوو، شەوانێك مایەوە. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) داوای کردو منیش پێمداو ئەبوبەکرك بینی وتی لەوانەیە کە پێشنیاری حەفسەت بۆ کردم ناڕەحەت بوویت کە هیچم پێ نەوتیت، وتم: بەڵێ، وتی تەنها لەبەرئەوە وەڵامم نەدایتەوە، دەمزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست داوای بکات، منیش نهێنی ئەوم بڵاونەکردەوە، ئەگەر نەیهێنایە من دەمهێنا.[1]

ئەحمەدو بەیهەقی و ئەبویەعلاو ئیبن حبان هێناویانەو ئەوەی بۆ زیادکردوە عومەر وتی: سکاڵای عوسمانم کرد لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: )(تزوج حفصة خیراً من عثمان، ویزوّج عثما خیراً من حفصة) واتە(کەسێ باشتر لەعوسمان حەفسە دەهێنێت و عوسمانیش کەسێ باشتر لەحەفسە دەهێنێت پێغەمبەر(ﷺ) کچەکەی عومەری هێنا.[2]

---

عەقلەمە هەیە کە چەند کەس متمانەی پێ دەدەن. کەسەکانی دیکەی صەحیحن، لە صەحیحیشدا بەشێکی هاتووە. تەواو).

[1] – (لەجمع الفوائد ج١، ص٢١٤ دا واهاتووە).

[2] – (لەمنتخب کنز العمال ج٥، ص١٢٠ دا واهاتووە).

# هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئوم سەلەمەی کچی ئەبو ئومەییە(خوای لیٚ ڕازی بێت)

نەسائی بە سەنەدی صەحیح لەئوم سەلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتیٚ ماوە(عدّە) ئوم سەلەمە تەواو بوو، ئەبوبەکر خواستی، بەڵام شووی پیٚ نەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ داوای، ئوم سەلەمە وتی بە پێغەمبەر(ﷺ) بڵیٚ من ئافرەتێکم غیرەم زۆرەو تووشبووم و گەورەیەکم نییە شاهید بێت. فەرمووی(پیٚ ی بڵیٚ بۆ ئەو قسەت غیرەم زۆرە لای خوا نزا دەکەم و غیرەکەت دەڕوات، بۆ ئەو قسەشت ئافرەتێکی تووشبووم منداڵەکانت بەسن، بۆ ئەو قسەشت گەورەیەکم نییە شاهید بێت ئەوا هیچ گەورەیەکت شاهید بێت یان ئامادەبێت ڕقی لەم کارە نییە) ئوم سەلەمە بەعومەری وت هەستەو من بدە بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش وایکرد.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئوم سەلەمەوە هێناویەتی کە هاتە مەدینە هەواڵی پێدان کچی ئەبو ئومەییەی کوڕی موغیرەیە، بەڵام بەدرۆیان خستەوە تاهەندیٚ کەسیان کە لە ڕیٚ ی حەج بوون وتیان شتیٚ بۆ کەسوکارت بنووسە، ئەویش وایکرد. کە هاتنەوە بۆ مەدینە بە ڕاستیان دانا بەوە زیاتر ڕێزی لایان پەیدا کرد. دەڵێت: کاتیٚ زەینەبم بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هات و داوای کردم و منیش وتم: ئافرەتی وەك من دەخوازیت؟ من کوڕم نییەو غیرەم زۆرەو ماڵ و منالم هەیە. فەرمووی(من لە تۆ گەورەترم، بۆ غیرەش خوا لە سەرت لادەبات، بۆ منداڵیش بۆ خواو پێغەمبەرەکەی).

پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوسەری گرت و دەهات بۆ لای و دەیفەرموو زەینەب لە کوێیە(أین زناب؟)؟ تاعەممار هات، شەرمی لەڕوو نواندو دەیوت ئەو ئافرەتە ڕیٚ بەپێغەمبەر(ﷺ) نادات، ئەو ئافرەتە شیری پیٚ دەدات. پێغەمبەر(ﷺ) هات و هەمان شتی فەرموو؟ وتی نزیکی کچی ئەبو ئومەییەیە لە لای ڕازییە، ئیبن یاسر بردوویەتی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەمشەو دێم بۆ لاتان. پارچە پێستێکی داناو

[1] – ( لەالإصابە ج٤، ص٤٥٩ دا هاتووە. لەجمع الفوائد ج١، ص٢١٤ دا هاتووە).

هەندێ جۆی هێناو چەوری هێناو کردی بە خواردن بۆی، پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە تابەیانی، ئینجا فەرمووی(إن لك على أهلك كرامة إن شئت سبعت لك وإن أسبع لك أسبع لنسائي).[1](تۆ لای خێزانی خۆت ڕێزداریت ئەگەر دەتەوێت حەوت شەو لات دەمێنمەوە، ئەگەر حەوت شەو لات بمێنمەوە لای ژنەکانیشم هێندە دەمێنمەوە).

# (هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسفیان(خوای لێ ڕازی بێت))

زوبەیری کوڕی بەکار لە ئیسماعیلی کوڕی عەمرەوە هێناویەتی ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسفیان وتی: من لە خاکی حەبەشە بووم کە نێردراوی نەجاشی کەنیزەکێك بوو پێی دەوترا ئەبرەهە،خزمەتی جلەکانی دەکرد، مۆڵەتی لێ وەرگرتم، مۆڵەتم پێدا، وتی پاشا پێتدەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) نامەی بۆ نوسیووم تاتۆی لێ مارەبکەم. منیش وتم خوا موژدەی خێرت بداتێ، وتی پاشا پێت دەڵێت کەسێ بکە بەوەکیل تامارەت بکات. دەڵێت منیش ناردم بە شوێن خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصداو ئەوم ڕاسپاردو دوو بازنەی زیوو دوو خاڵخاڵێ زیوم دا بە ئەبرەهە لەگەڵ چەند خاتەمێکی زیودا کە لەتاو خۆشی موژدەیدا سەرتاپا لە خۆشیدا بووم، بۆ ئێوارە نەجاشی فەرمانی کرد بە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و موسڵمانانی ئەوێ ئامادەبن و نەجاشی وتاری خوێندەوەو وتی سوپاس بۆ خوای مەلیك و پیرۆزو موئمین و عەزیزو جەبار، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نییە جگە لە خواو موحەمەد بە بەندەو پێغەمبەریەتی و ئەوەیە کە عیسای کوڕی مەریەم مزگێنی هاتنی دەدا. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسفیانی لێ

---

[1]- ( لە کنز العمال ج٧، ص١١٧ دا واهاتووە. نەسائی بەسەنەدی صحیح لە ئوم سەلەمەوە هێناویەتی. لەالإصابە ج٤، ص٤٥٩ دا هاتووە.ئیبن سەعد _ج٨، ص٩٣ لە ئوم سەلەمەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

مارەبکەم، منیش چووم بەدەم داواکەیەوە. پێغەمبەر(ﷺ) مارەیی چوارسەد دیناری بۆ داناوە، پاشان لە بەردەم خەڵکەکەدا دینارەکانی هەڵڕشت، خالیدی کوڕی سەعید قسەی کردو وتی سوپاس بۆ خوا، سوپاسی دەکەمو داوای لێخۆشبوونی لادەکەم، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نییە جگە لە خواو موحەممەد بەندەو نێردراویەتی بە ڕێنموونیو ئایینی حەق ناردوویەتی تا زاڵ بێت بەسەر هەموو ئایینەکاندا با بێباوەڕانیش پێیان ناخۆش بێت. پاشان هاتم بەدەم داواکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ)و ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسفیانم لێ مارەکرد. خوا پیرۆزی بکات لە پێغەمبەر(ﷺ) نەجاشی دینارەکانی دایە دەست خالیدو ئەویش دای بە ئوم حەبیبە، پاشان ویستیان هەستن وتی دانیشن، سوننەتی پێغەمبەران وابووە ئەگەر هاوسەرگیرییان کرد لەسەر ئەوە خواردن بخورێت، خواردنی بانگ کردو نانیان خوارد، دواتر بلاوەیان لێ کرد.[١]

حاکم ج٤، ص٢٠ لە ئیسماعیلی کوڕی عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاصەوە هێناویەتی دەڵێت: ئوم حەبیبە وتی لە خەودا بینیم عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحشی مێردم ناشرینترین شێوەی هەبوو، ترسامو وتم بەخوا حاڵی گۆڕاوە. کە بەیانی هات دەیوت ئەی ئوم حەبیبە سەیری ئایینم کردووەو لە مەسیحییەت چاکترم نەدیوە، من پێشتر نەسرانی بووم دوایی هاتمەوە ناو ئایینی موحەممەد پاشان گەڕامەوە بۆ مەسیحییەت، منیش وتم بەخوا خێرت نەبینیوە، خەوەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش گوێی پێ نەداو کەوتە مەی نۆشی تا مرد. لە خەودا بینیم یەکێ هات بۆ لام پێی دەوتم: ئەی دایکی باوەڕداران، منیش ترسامو وا لێکمدایەوە پێغەمبەر(ﷺ) بمهێنێت. ماوەکەم کە تەواوبوو هێندەم بینی نێردراوی نەجاشی هات —فەرموودەکە وەك ئەوەی پێشوو دێنێتو دوای وتە نانیان خواردو بلاوەیان

[١] – ( لەالبدایە والنهایە ج٤، ص١٤٣ دا واهاتووە).

لێکرد– دەڵێت: ئوم حەبیبە وتی: کە پارەکەم هاتەدەست ناردم بە شوێن ئەبرەهەدا کە موژدەی پێدام پێم وت من ئەو ڕوژ ئەوەم پێدایت و هیچم پێ نەبوو، ئەمە پەنجا مسقاڵە بیبە بۆ خۆت، ئەویش تووڕەکەیەکی دەرهێناو چیم پێدابوو تیایدا بوو پێ ی دامەوەو وتی: پاشا بڕیاری بۆ داوم هیچت لێ وەرنەگرمو من سەرقاڵی بەرگ و حاڵی بووم، من شوێن ئایینی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتوومو لەبەرخوا موسڵمان بووم، پاشا فەرمانی کردووە بەژنەکانی تاچی بۆنی خۆشیان لایە بینێرن بۆ تۆ، بەیانی عودو وەرس و عەنبەرو زیادێکی زۆریان هێناو منیش هەموویم برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوانەی لە سەرم دەدی و لە لام بوون و هیچ نکوڵی نەدەکرد. پاشان ئەبرەهە وتی: من داوام لێت ئەوەیە سەلامی من بە پێغەمبەر(ﷺ) بگەیەنیت و پێ ی بڵێیت من شوێنی ئایینەکەی کەوتووم، دەڵێت پاشان سۆزی بۆ نواندمو ئامادەسازی بۆ کردم. کە دەهاتەلام دەیوت: داواکەمن بیرنەچێت. کە چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) باسی داواکردنەکە و باری ئەبرەهەم بۆ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) بزە گرتی، کە سەلامەکەیم پێ گەیاند فەرمووی(وعليهم السلام ورحمة الله وبركاته)واتە(سەلامو ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا لەویش).[1]

[1]– (ئیبن سەعد ج٨، ص٩٧ لە ئیسماعیلی کوڕی عەمری کوڕی سەعیدی ئومەوییەوە بەو واتایە هێناویەتی).

# (هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش(خوای لێ ڕازی بێت))

ئەحمەد لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێ زەینەب(خوای لێ ڕازی بێت) ماوەکەی خۆی تەواو کرد پێغەمبەر(ﷺ) بەزەیدی فەرموو(اذهب فاذكرها عليّ) واتە(بڕۆ داوای بکە بۆم) ئەویش چوو بۆ لای و زەینەب هەویری دەشێلا. زەید دەڵێت کە بینیم سەرسنگم داگیرا تا ئەوەی نەمدەتوانی سەیری بکەم کاتێ بینیم پێغەمبەر(ﷺ) داوای دەکات، بۆیە ڕووم لێ وەرگێڕاو لەسەر پشت گەڕامەوەو وتم زەینەب موژدەت لێ بێت پێغەمبەر(ﷺ) منی ناردووە بۆ داوات. ئەویش وتی: من هیچ ناکەم تا فەرمان لە پەروەردگار وەرنەگرم. پاشان چوویە مزگەوتەکەی و قورئان دابەزی و پێغەمبەر(ﷺ) هات و بەبێ مۆڵەت هات بۆ لای زەینەب، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هات نان و گۆشتمان لەسەر خوارد، خەڵکی چوون و هەندێ کەس داوای نان خواردن مانەوە قسەیان دەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) چوویە دەرو منیش چوو بە دوایداو پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ ژوورەکانی ژنەکانی و سەلامی لێ دەکردن، ئەوانیش دەیانوت ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ماڵ و منداڵت چۆن بوون؟ منیش نەمزانی هەواڵم پێداو خەڵکەکە دەرچووبوون یان هەواڵ گەیشتبێ. پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ماڵ و منیش چووم تا لەگەڵی بچمە ژوور، بەربەستێکی خستە نێوان من و خۆی و چوویە ئەودیوو ئامۆژگاری خەڵکی کرد بەم ئایەتە ﴿لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾ موسلیم و نەسائی بە هەمان شێوە هێناویانە.

بوخاری لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: خواردنی ئاوی گۆشت لای زەینەب هەبوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) منیش کەسێکم نارد تاخەڵکی بانگ بکات بۆ نان خواردن، خەڵکی هاتن و نانیان دەخواردو دەچوون و هەندێکی دیکە دەهاتن و نانیان دەخواردو دەچوون تا کەسێ نەما. وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەس نییە بانگی بکەم، فەرمووی(ارفعوا طعامكم)واتە(خواردنەکەتان هەڵبگرن). سێ دەستە هاتن و

لـە ماڵـەوە قسەیان دەکـرد، پێغەمبـەر(ﷺ) دەرچـوو چـوو بـۆ ژوورەکـەی عائیـشەو فـەرمووی(الـسلام علـیکم أهـل البیـت ورحمـة الله وبرکاتـه)واتـە(سـەلامو ڕەحمـەتو بەرەکـەتی خواتـان لێبێـت ئـەهلی بـەیت).ئـەویش وتـی:(علیـك الـسلام ورحمـة الله وبرکاتـه) مـاڵو منـداڵت چـۆنن؟ خـوا بەرەکـەتت پـێ ببەخـشێت. ئینجـا چـوو بـۆ ژوورەکانی ژنەکانی دیکەیو هەمان شتی پێ فەرموونو ئەوانیش هەمان وەڵامیان هەبوو. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوەو سێ دەستە لە ماڵەکەیدا بوون قسەیان دەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەشەرم بوو، بۆیە بەرەو ژوورەکەی عائیشە چوو، نازانم هەواڵم پێدا یان هەواڵی پێدرا کە خەڵکەکە چوون، ئەویش چوو تاپێی خستە سەر دەرگاکەو قاچەکەی دیکەشی لە دەرەوەدا بوو، پەردەی خستە نێوان منو خۆیو ئایەتی حیجاب(پەردە) دابەزی.

ئیبن ئەبی حاتەم لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چوو بەلای هەندێ لەژنەکانی، ئوم سولەیم(خوای لێ ڕازی بێت)خواردنی حیسی[1] بۆ دروستکرد پاشان خستیە ناو جامێکەوە وتی: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێی بڵێ ئەمە هی ئێمەیە بۆیو کەمە! ئەنەس دەڵێت: ئەو ڕۆژ خەڵکی لەناڕەحەتیو برسێتیدا بوون، بردم بـۆیو وتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـوم سـولەیم ئەمـەی وبـۆ ناردوویـتو سـەلامی لێکردیت وتی: ئەمە هی ئێمەیە بۆیو کەمە، ئەویش سەیری کردو فەرمووی:(ضعه فی الناحیة البیت)واتە(لە لایەکی ماڵەوە دایبنێ) پاشان فەرمووی(اذهب فادع لي فلانـاً وفلانـا)واتـە( بـڕۆ فـلانو فـلان بـانگ بکـە)، نـاوی چـەندین کـەس بکـە. فەرمووی:(ومن لقیت من المسلمین)واتە(بە هەرکەسێکی موسڵمانان گەیشتیت). منیش ئەوانەی پێی وتمو ئەوانەی پێیان گەیشتم –لە موسڵمانان– بانگم کردن، منیش هاتمو ماڵو ژوورو حەوشە پڕبوو لە خەڵك، وتم ئەبو عوسمان چەند بوون؟ وتـی: نزیکـەی سـێ سـەد کـەس دەبـوون. پێغەمبـەر(ﷺ) پـێی فـەرمووم(بیهێنـە)

[1] – خواردنێك بووە لە خورما و ڕۆنو پەنیر دروستکراوە.

منیش بۆم بردو دەستی لەسەر داناو هەندێ شتی فەرموو پاشان فەرمووی(یتعلق عشرة عشرة ولیسموا ولیأكل كل انسان مما یلیه)واته(با دەدە بازنه ببەستن و بسم الله بكەن و هەركەسەو لەبەرخۆیەوە بخوات) هەمووان(بسم الله الرحمن الرحیم) یان دەكردو دەیانخوارد تا هەموویان خواردیان، ئینجا پێی فەرمووم (ارفعه)واته (هەڵی بگرە)دەڵێت هاتم و بردم و سەیری قاپەكەم كرد نەمزانی ئایا لە پێشتری زیاتر بوو یان كاتێ هەڵمگرت زیاتر بوو؟ دەڵێت هەندێ كەس لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) دواكەوتن و ئەو ژنەی پێغەمبەر(ﷺ) كە لەگەڵیاندا بردیە ژوورەوە ڕووی كردبووە حەوشەكە، ئەوانیش قسەیان تەواو نەدەكردو پێغەمبەریان(ﷺ) بێزار كرد. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە شەرم بوو، ئەگەر ئەوەیان بزانیایە لەسەریان سەخت دەبوو. پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ ژوورەكانی ژنەكانی و كاتێ بینییان هاتووەو زانییان باریان سەخت كردووە، لە دەرگا هاتنە دەرێ و پێغەمبەر(ﷺ) هات تا پەردەی داداو چوویە ژوورو منیش لە ژوورەكەدا بووم. پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەوەیدا كەمێك مایەوەو خوا قورئانی دابەزاندو پێغەمبەر(ﷺ) كە هاتەدەر ئەم ئایەتەی دەخوێند ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَداً إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيماً {٥٣} إِن تُبْدُوا شَيْئاً أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾ ئەنەس دەڵێت لە پێش خەڵكدا بۆ منی خوێندەوەو منیش ماوەیەك ئەوەم دەوتەوە بەخەڵك.[1]

---

[1]- موسلیم و نەسائی و ترمزی هێناویانەو ترمزی دەڵێت حەسەنی صەحیحە. بوخاری و ئیبن جەریر هێناویانە. ( لەالبدایه والنهایه ج٤، ص١٤٦ دا واهاتووە. ئیبن سەعد ج٨، ص١٠٤ لە چەند ڕێیەكەوە لە ئەنەسەوە هێناویەتی).

# هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ صەفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب(خوای لێ ڕازی بێت)

ئەبوداود لە ئەنەسەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت: لە خەیبەر(گیراوەکان) کۆکرانەوەو دیحیە هات و وتی ئەی پێغەمبەری خوا یەکێ لەو کەنیزەکانەم بدەرێ. فەرمووی بڕۆ کەنیزەکێك ببە، ئەویش صەفیەی کچی حویەی برد. کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەت دابە دیحیە -یەعقوب دەڵێت- صەفیەی کچی حویەی گەورەی قورەیزەو نەزیر دەدەیت بەدیحیە، ئەو ئافرەتە بەس بۆ تۆ شیاوە. فەرمووی ئافرەتەکە بانگ بکەن، پێغەمبەر(ﷺ) کە سەیری کرد فەرمووی کەنیزەکێکی دیکە لەبری ئەم ببە. پێغەمبەر(ﷺ) صەفیەی ئازاد کردو بەهاوسەری گرت.[1]

بوخاری لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: چووین بۆ خەیبەر، کە فەتحمان کرد باسی جوانی صەفیەی کچی حویەی کرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە مێردەکەشی کوژرابوو خۆیشی بووك بوو. پێغەمبەر(ﷺ) هەڵیبژارد بۆ خۆی لەگەڵ خۆی بردی تاگەیشتە(سد الصهباء) لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) چوویە لای، پاشان لە پێستێکی بچووکدا خواردنی حیسی ئامادەکردو پاشان پێی فەرمووم(آذن من حولك)واتە(بیدە بەوانەی دەورت) ئەوە خواردنی هاوسەرگیری بوو بۆ صەفیە. پاشان بەرەو مەدینە چووین بینیم پێغەمبەر(ﷺ) بەعەبایەك پەردەی بۆ دەکردو دواتر لە لای وشترەکەی دادەنیشت و ڕانی دادەناو صەفیەش قاچی دەخستە سەر ڕانی تاسواری وشترەکە دەبوو.

هەروەها لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان خەیبەرو مەدینەدا سێ شەو مایەوە لەگەڵ صەفیەدا بوو. من موسڵمانم بانگهێشت کرد بۆ خواردنەکەی کە تیایدا نان و گۆشت نەبوو، فەرمانی بەبیلال کرد ڕاخەر ڕابخات و

---

[1] - بوخاری و موسلیم هێناویانە.

خورمای لەسەر دانرا لەگەڵ پەنیرو رۆندا، موسڵمانان وتیان یەكێ لەدایكی باوەڕداران دەبێت یان كەنیزەكێك دەبێت؟ وتیان ئەگەر پەردەی بۆ دادا ئەوا یەكێكە لەدایكی باوەڕداران ئەگەرنا كەنیزەكیەتی. كە چوون لەپشتیەوە بوو پەردەی بۆ دادەدا.[1]

ئەحمەد لە جابری كوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی دەڵێت: كاتێ صەفیەی كچی حەویەی كوڕی ئەختەب هاتە لای چادرەكەی پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ كەس ئامادەبوون و منیش ئامادەبووم تاتیایدا پشكم هەبێت. پێغەمبەر(ﷺ) هاتەدەروو فەرمووی(قوموا عن أمكم)واتە(لای دایكتان هەستن) بۆ شەو ئامادەبووین و پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و لایەكی عەباكەی نزیكەی مشت و شتێ خورمای تێدابوو. فەرمووی(كلوا من وليمة أمكم)واتە(لەنانی هاوسەرگیری دایكتان بخۆن)[2][3].

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: چاوەكانی صەفیە جۆرە سەوزاییەكی پێوە دیاربوو. پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(ماهذه الخضرة بعينك) وتی بەمێردەكەمم وت لە خەومدا بینیم مانگێ كەوتە ناوماڵەكەم، ئەویش بۆكسێكی لێدام و وتی مەبەستت پاشای یەثریبە؟ وتی: هیچ كەس نەبوو هێندەی پێغەمبەر(ﷺ) رقم لێی بێت، باوكم و مێردەكەمی كوشت، ئەویش بەردەوام پۆزشی دەهێنایەوەو دەیفەموو(ياصفية إن أباك ألب علي العرب وفعل وفعل) واتە(ئەی صەفیەی باوكت عەرەبی لەدژ كۆكردمەوەو ئەوەو ئەوەی كرد) تائەوەم لە دەروونندا نەما[4][5].

---

[1] – (لەالبدايه والنهايه ج٤، ص١٩٦ دا واهاتووە).

[2] – حسن.

[3] – ( هەیسەمی ج٩، ص٢٥١ دەڵێت: ئەحمەد بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی، ئیبن سەعدیش ج٨، ص١٢٤ بە هەمان شێوە هێناویەتی).

[4] – صحيح.

[5] – (هەیسەمی ج٩، ص٢٥١ دەڵێت: كەسەكانی سەنەدەكە صەحیحن).

حاكم ج٤، ص٢٨ لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) صەفیەی بردە ژوورەوە، ئەبی ئەیوب لە بەردەرگای پێغەمبەردا(ﷺ) مایەوە تابەیانی، بۆ بەیانیەكەی پێغەمبەری بینی(الله أكبر)ی كردو شمشێرێكی پێبوو، وتی ئەی پێغەمبەری خوا كەنیزەكێكە ماوەی بووكێنی تازەیەو تۆ باوك و براو مێردەكەیت كوشتووە بۆیە لێی دڵنیا مەبە. پێغەمبەر(ﷺ) پێكەنی و قسەی خێری بۆ فەرموو[١] [٢].

ئیبن سەعد لە عەتای كوڕی یەسارەوە هێناویەتی دەڵێت: كاتێ صەفیە لە خەیبەرەوە هات لەماڵی حارثەی كوڕی نوعمان دابەزی، ژنانی پشتیوانان بیستیان و هاتن سەیری جوانیەكەیان دەكرد، عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت) هات و پەردە لەسەر چاوی بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هات بەدوایداو فەرمووی(كیف رایت یاعائیشە؟)واتە( ئەی عائیشە چۆنت بینی) وتی: جولەكە بوو، فەرمووی(لاتقولي ذلك، فأنها أسلمتْ وحسن إسلامها). (وامەڵێ، چونكە ئەو موسڵمان بووە بەچاكی)[٣]

لە سەعیدی كوڕی موسەیبەوە هێناویەتی دەڵێت: صەفیە هات و گوارەیەكی زێڕ لە گوێیدا بوو، نیازی فاتیمەو ئافرەتانێكی كە لەگەڵیدا بوو بۆ هەبوو(پشكداری تێدا بكەن).[٤]

---

[١] – صحیح.

[٢] – حاكم دەڵێت: ئەو فەرموودەی سەنەدەكەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیهێناوەو ژەهەبی دەڵێت صەحیحە. ئیبن عەساكیر لە عروەوە بە دوورو درێژتر بەو واتایە هێناویەتی وەك(لەكنز العمال ج٧، ص١١٩) دا هاتووە. ئیبن سەعد(ج٢، ص١١٦) لە ئیبن عەبباسەوە بەدوورو درێژتر لێیەوە هێناوە. لە گێڕانەوەیەكیشدا: وتم: ئەگەر بجوڵێت من لێت نزیك بووم.

[٣] – ضعیف.

[٤] – ( لەالاصابە ج٤، ص٣٤٧ دا واهاتووە).

# (هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ جوەیریەی کچی حارسی خوزاعی(خوای لێ ڕازی بێت))

ئیبن ئیسحاق لەعائیشەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کەنیزەکەکانی بەنی موستەلەقی دابەشکرد، جوەیریەی کچی حارث پشکی ثابتی کوڕی شەماس یان هی ئامۆزایەکی بوو. جوەیرەیەو ئافرەتێکی شیرین و خوێن گەرم بوو هەرکەس بیبینیایە دڵی دەیگرت. لەسەر ئەمە جوەیریەی ویستی نەچێتە لای ئەوو هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)تایارمەتی بدات. عائیشە دەڵێت: سوێند بەخوا کە لەبەردەم دەرگاکەمدا بینیم ڕقم لێی بوو زانیم پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی لێ دەبینێت کە من لێم بینی. چوو بۆ لای وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من جوەیریەی کچی حارپی کوڕی ئەبو زیراری گەورەی هۆزەکەیم و بەڵایەکم تووش بووە کە خۆت دەیزانیت، کەوتوومەتە بەر پشکی ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس یان بۆ ئامۆزایەکی، لەسەر خۆم داوام کردووە نەچمە لای و هاتووم تایارمەتیم بدەیت.

فەرمووی: (فهل لك من خير من ذلك) واتە(لەوە باشترت دەوێت؟) وتی: چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرووی(أقضي عنك كتابتك وأتزوجك)واتە (ئەوەت لەسەر لادەبەم و بەهاوسەرت دەگرم) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ڕازیم. عائیشە دەڵێت: چوو بۆ لای خەڵك و خەڵکی زانییان پێغەمبەر(ﷺ) جوەیریەی کچی حارثی هێناوە، خەڵکی وتیان خزمانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە چییان پێ بوو ناردیان، دەڵێت: بە هاوسەرگیری جوەیریە سەد ماڵ لەبەنی موستەلەق ئازاد کران، ئافرەت نەبینراوە هێندەی ئەو بەرەکەتی بۆ هۆزی خۆی هەبێت[1][2].

[1] – حسن.

[2] – ( لەالبدایە والنهایە ج٤، ص١٥٩ دا واهاتووە). ئیبن سەعد ج٨، ص١١٦ لە واقیدیەوە بە سەنەدێکی لە عائیشەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، بەڵام ناوی مێردەکەی بە(صەفوانی کوڕی مالیك) هێناوە. حاکم ج٤، ص٢٦ لە ڕێگەی واقیدییەوە بەو شێوەیە هێناویەتی.

واقیدی لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: جوەیریەی کچی حارث وتی پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بەسێ ڕۆژ خەوم بینی کە مانگ لەئەثریبەوە هات تاهاتە ناو ژوورەکەم. پێم باش نەبوو کەس بزانێت تا پێغەمبەر(ﷺ) هاتن، کە بە کەنیزەك گیراین هیوای خەوەکەمم هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) ئازادی کردمو بەهاوسەری گرتم. سوێند بە خوا لەسەر هۆزەکەم قسەم کرد یەکسەر موسڵمانان هۆزەکەیان ئازادکردن، هێندەم زانی کەنیزەکێکی ئامۆزام هەواڵەکەی پێدام. بۆیە سوپاسی خوام لەسەر کرد[1].[2]

## (هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ مەیمونەی کچی حارسی هیلالی)

حاکم ج٤، ص٣٠ لە ئیبن هیشامەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی دواتردا ساڵی حودەیبیە لە ذیلقەدەی ساڵی حەوتدا بە باری عەمرەوە دەرچوو، ئەو مانگە تێیدا بێباوەڕان ڕێیان گرت لە چوونە کەعبە تا گەیشتە(یەئجوج) جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبی نارد بۆ لای مەیمونەی کچی حارثی کوڕی حزنی عامریو داوایکرد. ئەویش بارەکەی دایە دەست عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب کە ئوم فەزلی خوشکی لابوو. عەبباس دای بەپێغەمبەر(ﷺ). پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوە تاماوەیەك لە(سەریف) مایەوە تامەیمونە هاتو لەوێ چوویە لای. ویستی خوا وابوو پاش ماوەیەك مەیمونەی مچی حارث مرد. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) چوویە لای لەو ماوەدا مرد.

---

[1] – ضعیف.

[2] – ( لەالبدایە والنهایە ج٤، ص١٥٩ دا هاتووە. حاکم ج٤، ص٢٧ لە ڕێگەی واقیدیەوە لەخوزامی کوڕی هیشام لەباوکیەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی).

هەروەها لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی، پێغەمبەر(ﷺ) مەیمونەی کچی حارثی بە هاوسەر گرت و سێ ڕۆژ لە مەککە مایەوە، ئەوکات حوەیتبی کوڕی عەبدولعوزا بە دەستەیەکی قورەیشیەکانەوە لە ڕۆژی سێیەمدا هاتن و پێیان وت: ماوەکەت تەواو بووە، دەی لامان بڕۆ. فەرمووی(وما علیکم لو ترکتمونی فأعرس بین أظهرکم فصنقت لکم طعاماً فحضرتموه)واتە(ئەی چی دەبێت ئەگەر ڕێم بدەن لە نێوانتاندا هاوسەرگیری بکەم و خواردنێ ئامادە بکەم و ئێوەش ئامادەی ئەو خوانە بن) وتیان هیچ پێویستمان بە خواردنت نییە، لامان بڕۆ. پێغەمبەر(ﷺ) مەیمونەی لەگەڵ خۆی برد تا لە(سەریف) هاوسەرگیری لەگەڵ کرد[1،2].

## (پێغەمبەر(ﷺ) فاتیمەی کچی دەدات بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب)

بەیهەقی لە (الدلائل) لە عەلییەوە هێناویەتی دەڵێت: داوای فاتیمەم کرا لای پێغەمبەر(ﷺ) مەولایەکم پێی وتم: ئایا دەزانیت فاتیمەی لای پێغەمبەر(ﷺ) داواکراوە؟ وتم: نا. وتی: با داواکراوە، بۆچی ناچیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تابیدات بەتۆ. وتم: مەگەر هیچم هەیە تاژنی پێ بێنم؟ وتی: ئەگەر بچیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لێت مارە دەکات، دەڵێت بەخوا بەردەوام پێی وتم تاچووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە بەردەمیدا دانیشتم تەواو شڵەژام، بەخوا نەمتوانی لەتاو شان و شکۆیدا هیچ بڵێم. فەرمووی: بۆچی هاتوویت؟ هیچ پێویستی و کارێکت هەیە؟ منیش بێدەنگ بووم. فەرمووی(لعلك جئت تخطب فاطمة) واتە(لەوانەیە بۆ دوای فاتیمە هاتبیت؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی(وهل عندك من شئ تستلها

---

[1] - صحیح.

[2] - حاکم و ژەهەبیش بەصەحیحی دەزانن لەسەر مەرجی موسلیم. بوخاری و موسلیمیش نەیانهێناوە.

بە)واتە(هیچت لا هەیە تاپێی حەڵاڵی بکەیت بۆ خۆت(مارەی بکەیت)؟) وتم: نە بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(چیت کرد بەو قەڵغانەی پێمدایت؟) وتی بەوکەسەی گیانمی بەدەستە، ئەوە تەنها حوتەیمە(شمشێرشکێن)یٚ بوو(قەڵغان) کە نرخەکەی چوار درهەم نەبوو، وتم: بەڵێ لامە، فەرمووی(قد زوجتكها فابعثت اليها بها فاستعلها بها) واتە(دەی وا فاتیمەم لێ مارە کردیت بۆی بنێرەو بەوە مارەی بکە) ئەوە مارەیی فاتیمە کچی پێغەمبەر(ﷺ) بوو[1][2].

تەبەرانی لە بوورەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: دەستەیەکی پشتوانان بەعەلییان وت بڕۆ بۆ داوای فاتیمە. ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ماحاجة ابن طالب؟) واتە(کوڕی ئەبوتالیب چی پێویستە؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووم بۆ داوای فاتیمەی کچی پێغەمبەر. فەرمووی:(مرحباً وأهلاً)واتە(بەخێربێیت) لەوە زیاتری نەفەرموو. عەلی چوو بۆ لای ئەو دەستەی پشتیوانان کە چاوەڕێیان دەکردو وتیان چی بوو؟ وتی: نازانم بەلاٚم پێی فەرمووم(مرحباَ وأهلاَ)، وتیان: دەی یەکێ لەو دوو وشەی پێغەمبەرت(ﷺ) بەسە. کاتێ پێیدا فەرمووی(یاعلی إنه لابد من للعروس من وليمة)واتە(ئەی عەلی بووکێنی هەردەبێ خواردنێکی بۆ بکرێت) سەعد وتی من بەرخێکم لایە، لە لایەن پشتیوانانەوە بڕێ کۆکرایەوە. بۆ شەوی گواستنەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لا تحدث شيئاً حتى تلقاني)واتە(هیچ مەکە تادەمبینیت) پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئاوێکی کردو دەستنوێژی لێگرت و پاشان کردی بەسەرمداو فەرمووی(اللهم بارك فيهما وبارك لهما في بنائهما)واتە(خوایە بەرەکەت بخەرە نێوانیان و بەرەکەت بخەرە بەیەك

[1] - صحيح.

[2] - ( لەالبدایە والنهایە ج٣، ص٣٤٦ دا واهاتووە. دولابی لە(الژریە الگاهرە) دا هێناویەتی، وەك لە کنز العمال ج٧، ص١١٣ دا هاتووە).

گەیشتنیان) : هەیسەمی ج٩، ص٢٠٩ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی، بەڵام تیایدا دەڵێت: دەستەیەك لە پشتیوانان بەعەلییان وت: بۆچی داوای فاتیمە ناکەیت؟. لە کۆتاییەکەشیدا نزاکەی واهێناوە(اللهم بارك فيهما وبارك لهما في شبليهما).[١]

لە گێڕانەوەیەکەیاندا ئەم نزایە هاتووە(اللهم بارك فيهما وبارك عليهما وبارك لهما في بنائهما وبارك لهما في نسلهما)واتە(خوایە بەرەکەت بنێرە بۆ خۆیان و بەسەریان و بۆیان و لەبەیەکگەیشتنیان و بەرەکەت بنێرە بۆیان لەوەچەیاندا)[٢] لەگێڕانەوەیەکدا(اللهم بارك لهما في تسملهما)واتە(خوایە بەرەکەت بخەرە ناو جوت بوونیان).[٣]

تەبەرانی لە ئەسمای کچی عومەیسەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ فاتیمە درا بەرعەلی کوڕی ئەبوتالیب لە ماڵدا تەنها ڕاخەرێك و سەرینێك کە ناوەکەی لیف بوو لەگەڵ سەب و گۆزەیەکدا هەبوو. پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی نارد هیچ مەکەن- یان نزیکی خێزانت مەبەرەوە- تا دێك بۆ لات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اثم اخي)(براکەم کوا؟) ئوم ئەیمەن کە دایکی ئوسامەی کوڕی زەید بوو حەبەشی بوو ئافرەتێکی صالح بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کچی خۆت پێداوەو برایشتە؟ پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان هاوەڵان و برایەتی خستە نێوان خۆی و عەلی. فەرمووی(إن ذلك يكون يا أُمّ أيمن). واتە(ئەی ئوم ئەیمەن ئەوە دەبێت)

ئەسما دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) داوای قاپێکی کرد کە ئاوی تێدابوو، پاشان شتێکی وت و دەستی هێنا بەسەر سنگ و ڕوخساری عەلیدا و پاشان فاتیمەی بانگ

---

[١]- کەسەکانی هەردووکیان صەحیحن جگە لە عەبدولکەریمی کوڕی سولەیت کە ئیبن حەببان متمانەی پێ دەدات. تەواو. ڕەویانی و ئیبن عەساکیر بە هەمان شێوە هێناویانە، وەك( لەکنز العمال، ج٧، ص١١٣) دا هاتووە.

[٢] – نەسائی بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە(البدايه والنهايه ج٧، ص٣٤١) دا هاتووە.

[٣] – ئیبن سەعد ج٨، ص٢١ لە بوورەیدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

کرد، فاتیمە هات و لەتاو شەرمدا سەری بەخۆدا کردبوو. پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ لەوەی بەسەردا ڕشت و شتێکی فەرموو، پاشان پێی فەرموو(أما إني لم آلك إن انكحك احب! اهلي إلَيّ)(من بۆ ئەوەی تۆ لە خۆشەویستترین کەسم مارە بکەم کەمتەرخەمیم نەنواندووە) پاشان ڕەشاییەکی لە پشت یان دەرگاوە بینی، فەرمووی ئەوە چییە؟ وتی: ئەسما، فەرمووی: ئەسمای کچی عومەیس؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). فەرمووی:(جئت كرامة لرسول الله؟) (وەك ڕێزگرتنی پێغەمبەری خوا هاتوویت؟) وتی: ئافرەت لەشەوی یەکەمی چوونە لای مێردی دەبێت ئافرەتێکی لێ نزیك بێت ئەگەر پێویستییەکی بۆ هاتەڕێ پێی بڵێت؟ ئەویش نزایەکی بۆ کردم کە گرنگتریت کار بوو لە لام. پاشان بەعەلی فەرموو بڕۆ بۆ لای خێزانەکەت، ئینجا چوو بەردەوام نزای بۆ دەکردن، تاگەیشتە ژوورەکەی.

لە گێڕانەوەیەکدا لە ئەسمای کچی عومەیسەوە هێناویەتی دەڵێت: من لەگواستنەوەی فاتیمەی کچی پێغەمبەردا بووم(ﷺ)، بۆ بەیانی پێغەمبەر(ﷺ) هات و دای لەدەرگا. ئوم ئەیمەن هات و دەرگای بۆ کردەوەو پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(ئەی ئوم ئەیمەن براکەمم بۆ بانگ بکە) وتی: براشتەو کچیشت لێ مارە کردووە؟ فەرمووی(یاأم أیمن ادعی لی) واتە(ئوم ئەیمەن بۆم بانگ بکە) ئافرەتان دەنگی پێغەمبەریان بیست و هەستیان کردو لە لایەکەوە دانیشتن. پاشان عەلی هات و پێغەمبەر(ﷺ) نزای بۆکردو پاشان لەئاوەکەی بەرسەردا کرد. پاشان فەرمووی(فاتیمەم بۆ بانگ بکەن) فاتیمە هات و لەتاو شەرمدا عەرەقی کردبوو، فەرمووی(اسكتي فقد انكحتك أحب أهلي لَيّ)واتە(بێدەنگ بە، وامارەم کردیت لە خۆشەویسترین کەسم لام).[1]

---

[1]- بە هەمان شێوە هێناویەتی. هەیسەمی ج٩، ص٢١٠ دەڵێت: تەبەرانی هەمووی هێناوەو کەسەکانی گێڕانەوەی یەکەم کەسی صەحیحن.

ئیبن عه‌ساکیر له عه‌لیه‌وه هێناویه‌تی، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) کاتێ فاتیمه‌ی دا به‌عه‌لی، داوای ئاوێکی کردو دواتر له‌گه‌ڵیدا بردیه ژوورو پرژاندی به‌لاوشانه‌کانیداو به‌(قل هو الله احد، قل اعوذ برب الناس، قل أعوذ برب الفلق) په‌نای دایه به‌ر خوا.[1]

ئه‌بویه‌علاو سه‌عیدی کوڕی مه‌نسوور له‌عه‌لبای ئه‌حمه‌ره‌وه هێناویانه ده‌ڵێت: عه‌لی کوڕی ئه‌بوتالیب وتی داوای فاتیمه‌ی کچی پێغه‌مبه‌رم(ﷺ) کرد، ده‌ڵێت: عه‌لی قه‌ڵغانێکی هه‌بوو له‌گه‌ڵ هه‌ندێ شتی دیکه‌دا فرۆشتی و گه‌یشته چوارسه‌دو هه‌شتا درهه‌م. ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمانی کرد دوو له‌سێی بۆ بۆن و یه‌ك له‌سێی بۆ جل بێت، له‌قاچاخێکدا ئاویشی دانابوو تاخۆیانی پێ بشۆن، فه‌رمانی به‌فاتیمه کرد به‌شیردانی کوڕه‌که‌ی پێشی نه‌که‌وێت، بۆ حوسه‌ین پێشکه‌وت، به‌ڵام بۆ حه‌سه‌ن پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) شتێکی کرد به‌ده‌میدا که نه‌زانرا چی بوو، به‌وه زیره‌کترین ده‌رچوو.[2][3]

به‌زار له‌جابره‌وه هێناویه‌تی ده‌ڵێت: ئاماده‌ی ئاماده‌ی ئاهه‌نگی عه‌لی و فاتیمه بووین له‌وه باشترمان نه‌دیبوو. ڕاخه‌رمان بۆ دانراو خورماو مێووژ هێنراو خواردمان، ڕاخه‌ری شه‌وی بووکێنی به‌رخێك بوو.[4]

به‌یهه‌قی له‌(الدلائل) له‌عه‌لیه‌وه هێناویه‌تی ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له‌خه‌میلێك و قاپێك و ڕاخه‌رێکی پێسته‌دا که ناوه‌که‌ی گیای ئیزخر بوو، فاتیمه‌ی بۆ گواستنه‌وه ئاماده کرد.[5] ته‌به‌رانی له‌عه‌بوولای کوڕی عه‌مره‌وه هێناویه‌تی، پێغه‌مبه‌ر که

---

[1] – له‌(کنز العمال ج۷، ص۱۱۳)دا واهاتووه.

[2] – صحیح.

[3]– له کنز العمال ج۷. ص۱۱۲ دا هاتووه. ئیبن سه‌عد ج۸، ص۲۱ له‌عه‌لباوه چیرۆکی بۆن و جله‌که‌ی هێناوه.

[4]– هه‌یسه‌می ج۹. ص۲۰۹ ده‌ڵێت: له‌سه‌نه‌ده‌که‌دا عه‌بدوڵلای کوڕی مه‌یمونی قداح هه‌یه که لاوازه.

[5] – له‌(کنز العمال ج۷، ص۱۱۳) دا هاتووه.

فاتیمـەی دایـە عـەلی لەگەڵیدا خـەمیلێکی نـارد، عـەتا وتـی خومـەیل چـییە؟ وتی‌پاڵپشتیٚ لە پێست کە لـە پێستی دارخورما دروست کرابوو و ناوەکەی گیای ئیزخـر بـوو، لەگـەڵ ڕاخـەرێکی پێـستەدا کـە ناوەکـەی لێـف بـوو. خەمیلەکـەیان ڕادەخست و نیوەشیان دەدا بەخۆیاندا.[1]

## (هاوسەرگیری ڕەبیعەی ئەسلەمی(خوای لیٚ ڕازی بێت))

ئەحمـەدو تەبەرانی لەڕەبیعـەی ئەسلەمیەوە هێناویانـە دەڵێت: مـن لەخزمـەت پێغەمبەردا بووم(ﷺ) پیٚی فەرمووم(ئەی ڕەبیعە ئایا هاوسـەرگیری ناکەیت؟) وتم: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا نامـەوێت هاوسـەرگیری بکـەم لەکاتێکدا شتێکم نییـە ئـافرەتی پـیٚ بەڕێوەببـەم‌و حەزناکـەم شـتیٚ لـەتۆ دوور بخاتـەوە. پاشـان پـیٚی فەرمووموەوە(ئەی ڕەبیعە ئایا هاوسەرگیری ناکەیت؟) هەمان شتم وتەوە.

وازی لیٚ هێنام پاشان بەخۆمدا چوومەوەو وتم بەخوا پێغەمبـەری خوا(ﷺ) زۆر لەخۆم شارەزاترە بەباشی ژیان‌و دواڕۆژم، بـەخوا ئەگـەر ئەمجار لێـی پرسیم دەڵێم بەلیٚ ئەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) چیت پیٚ باشـە پێم بفەرموو. فـەرمووی(ڕەبیع ئایا هاوسەرگیری ناکەیت؟) وتم باچۆنت پیٚ باشـە پێم بفەرموو. فەرمووی(بڕۆ بۆ لای فـلاٚن) –لەناوچـەی پـشتیوانان– پێیـان بڵـیٚ پێغەمبـەر(ﷺ) نـاردوومی بـۆ لاتـان‌و فـەرمانتان پـیٚ دەکـات فلاٚنـە ئـافرەتم لیٚ بەهاوسـەر بگـرن) ئـافرەتێکی ئـەوان بـوو. منیش چووم بۆ لایان‌و پێم وتن پێغەمبـەر(ﷺ) ناردوومی بۆ لاتـان تائەو ئافرەتـەم بـدەنیٚ. وتیـان مەرحـەبا لەپێغەمبـەری خـواو نێـردراوی پێغەمبـەری خـواش، بەخوا نێردراوی پێغەمبـەر(ﷺ) دەبێت بەگرتنـەخۆی خواستەکەیەوە بچێتەوە. ژنەکـەیان پێدام‌و یارمەتییان پێدام‌و هیچیان لیٚ داوا نـەکردم، منـیش بـەدڵگرانی گەڕامـەوە بۆ لای پێغەمبەرو(ﷺ) وتم چووم بۆ لای کەسانێکی بـەڕێز ئافرەتەکـەیان لیٚ بەهاوسـەر

[1] – هەیسەمی ج٩، ص٢١٠ دەڵێت: لەسەنەدەکەدا عەتای کوڕی سائیب هەیە کە تێکەڵ دەکات.

گرتمو سۆزیان بۆ نواندمو شتێکی ڕوونیان لێ داوا نەکردمێ منیش هیچێکم بۆ مارەیی لا نییە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(یابریدة الأسلمي اجمعوا لە وزن نواة من ذهب)(ئەی بوورەیدەی ئەسلەمی کێشی ناوکێ زێڕی بۆ کۆبکەنەوە) دەڵێت: ئەوەندەیان بۆ کۆکردمەوە منیش ئەوەم برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(اذهب بهذا اليهم فقل لهم هذا صداقها)(ئەوەیان بۆ ببەو بڵێ ئەمە مارەییەکەیەتی) ئەوانیش ڕازی بوونو وتیان زۆر پاکە. پاشان گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەدڵگرانی، فەرمووی: ئەی ڕەبیعە چییە دڵگرانیت؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا ڕێزگرتن لەوانم نەبینیوە ئەوەی بردم پێی ڕازی بوونو وتیان زۆر پاک، بەلاّم من هیچم نییە بۆ نانی هاوسەرگیری(وليمة). فەرمووی:(ئەی بوورەیدە مەڕێکی بۆ ئامادەبکەن)(یابریده اجمعوا لە شاه) ئەوانیش بەرخێکی گەورەیان بۆ ئامادەکردم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اذهب الی عائشة فقل لها فلتبعث بالمكتل الذی فیه الطعام)(بڕۆ بۆ لای عائیشەو بڵێ ئەوسوورزگیەت بۆ بنێرێت کە خواردنی تێدایە) منیش چوومو پێموت، ئەویش وتی ئەوە حەوت مشت جۆی تێدایە نەبەخواو نەبەخوا، ئەگەر خواردنێکی ترمان بۆ هەیە بیبە. منیش بردم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتم عائیشە وای وت، فەرمووی ئەمەیان بۆ ببەو پێیان بڵێ بائەوە بکەنە نانو ئەوەش بکەنە خواردن. وتیان بۆ نان ئێمە خۆمان دەیکەین، بەلاّم بۆ بەرخەکە خۆتان لەبری ئێمە بیکەن. منو چەندێکی دیکە لەبەنی ئەسلەم بەرخەکەمان بردو سەرمان بڕیو پێستەیمان گرتەوەو لێمان نا. بۆ بەیانی نانو گۆشتمان لابوو، میوانداریم کردوو پێغەمبەرم(ﷺ) بانگکرد، پاشان وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوە زەوییەکی پێدامو دنیا هاتو چوو گەیشتینە بەر دارخورمایەك، من وتم ئەمە لەسنووری مندایە، ئەبوبەکر وتی لەسنووری مندایە. قسەیەك کەوتە نێوانمانو ئەبوبەکر قسەیەکی ناخۆشی پێ وتمو پەشیمان بوویەوەو وتی پێم بڵێرەوە تا تۆڵە بێت، وتم نایڵێمەوەوتی یان دەیڵێیتەوە یان هاوارم دەبەمە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ). وتم من نایڵێمەوە، ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) منیش

بەدوایدا چووم، هەندێ لەبەنی ئەسلەم هاتن و وتیان ڕەحمەتی خوا لەئەبوبەکری صدیق هاوڕێی دوانەیی، ئەمە ڕیش سپی(قسە ڕۆشتووی) موسڵمانانە. وریابن لانەکاتەوەو وابزانێت دژ بەو پشتگیریم دەکەن و تووڕە ببێت و بچێت بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)و ئەویش بۆ ئەو تووڕە بێت و خواش بۆ تووڕەیی ئەو دوانە لێم تووڕە بێت و ڕەبیعە ماڵ ویران بێت. وتیان چی بکەین؟ وتی: بگەڕێنەوە. ئەبوبەکر چوو بۆ لای پێغەمبەرو منیش بەتەنها کەوتمە دوای تاچووینە خزمەتی و وەك خۆی باسەکەی بۆ گێڕایەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرەو ڕووم بەرز کردەوەو فەرمووی(ياربيعة مالك وللصديق)(ئەی ڕەبیعە تۆو صدیق چیتانە؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاواو ئاوابوو قسەیەکی ناخۆشی پێ وتم و پێی وتم دەبێت پێم بڵێیتەوە تاتۆڵەسەندنەوە بێت، منیش ئامادە نەبووم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(أجل لاتردّ عليه ولكن قل غفر الله ياأبابكر)(بەڵێ پێی مەڵێرەوە، بەڵام بڵێ ئەبوبەکر خوا لێت خۆش بێت).[1] حەسەن وتی: ئەبوبەکر ڕەحمەتی خوای لێبێت لایکردەوەو دەگریا.[2]

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٤، ص٢٥٧ دەڵێت: ئەحمەدو تەبەرانی هێناویانەو تیایدا موبارەکی کوڕی فوزالە هەیە کە فەرموودەی حەسەنە، کەسەکانی دیکەی سەنەدی ئەحمەد کەسانی صەحیحن.ئەبویەعلا لەڕەبیعەوە بە هەمان شێوە بەدوورو درێژی هێناویەتی، وەك لە(البدايه والنهايه ج٥، ص٦٣٦) دا هاتووە.حاکم و جگە لەویش بە هەمان شێوە هێناویانە. وەك لە(كنز العمال، ج٧، ص٣٦) دا هاتووە. ابن سعد ج٣، ص٤٤، چیرۆکەکەی لەگەڵ ئەبوبەکردا هێناوە.

# (هاوسەرگیری جولەیبیب(خوای لیٚ ڕازی بیٚت))

ئەحمەد لەئەبوزەری ئەسلەمیەوە هیٚناویەتی جولەیبیب کەسیٚك بوو دەچوو بۆ لای ئافرەتان و بەلایاندا تیٚدەپەڕی و گاڵتەو گەپی لەگەڵ دەکردن. بەژنەکەمم وت: جولەیبیب نەیەت بۆ لاتان، ئەگەر بیٚت ئاواو ئاوا دەکەم. پشتیوانانیش ئەگەر هەرکامیان بیٚوەژنیٚکی هەبووایە نەیدەدا بەشوو تابیزانیایە ئایا پیٚغەمبەر(ﷺ) پیٚویستی پیٚ دەبیٚ یانا. پیٚغەمبەر(ﷺ) بەیەکیٚ لەپشتیوانانی فەرموو(زوّجني ابنتك)(کچەکەتم بدەریٚ) وتی: بەڵیٚ ڕیٚزداریشە ئەی پیٚغەمبەری خوا بەخششی بەرچاوە. فەرمووی(بۆ خۆمم ناویٚت)(إني لست أريدها لنفسي) وتی: ئەی پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ کیٚ؟ فەرمووی: بۆ جولەیبیب، وتی: ڕاویٚژ بەدایکی دەکەم. وتی پیٚغەمبەر(ﷺ) داوای کچەکەتی کردووە، وتی بەخششە، وتی بۆ خۆی نا، بەڵکو بۆ جولەیبیبی دەویٚت. وتی: نا بەخوا نایدەینیٚ کە ویستی هەستیٚ بیٚت بۆ لای پیٚغەمبەر(ﷺ) و پیٚی بڵیٚ ئافرەتەکە وتی کیٚ هاتووە بۆ داوام؟ داکیی وتی کیٚ هاتووە، ئافرەتەکە وتی: بەرپەرچی فەرمانی پیٚغەمبەر(ﷺ) دەدەنەوە، بمدەنیٚ پیٚی، چونکە دڵنیام قووڕ بەسەرم ناکات. باوکی چوو بۆ لای پیٚغەمبەر(ﷺ) ئەویش پیٚی وت چی بوو. ئەویش دای بەجولەیبیب.

پیٚغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ شەڕیٚك فەرمووی(فما أفاء الله عزوجل) فەرمووی بۆ کەس دەگەڕیٚن؟ وتیان: نا. فەرمووی: بەڵام من بۆ جولەیبیب دەگەڕیٚم، گەڕان بۆی و دۆزیانەوە لەپاڵ حەوت دانەدا کوشتوونی و خۆشی کوژراوە. وتیان ئەی پیٚغەمبەری خوا ئەوەتا لەپاڵ حەوت دانەدا کوژراوەو ئەوانیش کوشتوویانە. پیٚغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای و فەرمووی(حەوتی کوشت پاشان کوشتیان، ئەوە لەمنەو من لەئەوم) دوو یان سیٚ جار فەرمووی، پاشان پیٚغەمبەر(ﷺ) خستیە سەر دەستەکانی و گۆڕی بۆ هەڵکەند، سەرینەکەی دەستی پیٚغەمبەر بوو(ﷺ). پاشان خستیە گۆڕەکەی، باسی شتنی نەکرد. ثابت دەڵیٚ: هیچکام لەبیٚوەژنان نەبوو لەو

بەخشندەتر بێت، ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبوتەلحە بەثابتی وت: ئایا دەزانیت پێغەمبەر(ﷺ) چ نزایەکی بۆ ئافرەتەکە کرد؟ فەرمووی:(اللهم صب عليها الخير صبا ولا تجعل عيشها كدًا كدا) ئیدی لەناو بێوەژنانی پشتیوانان‌دا لەو بەخشندەتر نەبوو[1][2].

## هاوسەرگیری سەلمانی فارسی(خوای لێ ڕازی بێت)

ئەبونەعیم لە(الحلیة ج١، ص١٨٥) لەئەبو عەبدوڕەحمانی سلمی لەسەلمانەوە هێناویەتی کە ئافرەتێکی لەکیندە هێناو لەماڵی ژنەکەدا چوویە لای، بۆ شەوی چوونە لای لەگەڵ هاوەڵانیدا تالای ماڵی ژنەکە چوو. کە گەیشتە ماڵەکە وتی خوا پاداشتتان بداتەوە بگەڕێنەوە، نەیبردنە ژوورەوە وەك ئەوەی گەمژەکان دەیکەین، کە سەیری ماڵەکەی کرد ماڵەکە ڕازێنرابوویەوە وتی ماڵتان تای هەیە یان کەعبە هاتووەتە کیندە؟ وتی هیچکامیان، ئەویش نەچوویە ژوورەوە تاهەموو پەردەی ماڵی لابرد جگە لەپەردەی دەرگاکە، کە چوو سەیری کرد شتێکی زۆری تێدایە وتی ئەمانە بۆ کێ؟ وتیان هی تۆو ژنەکەتن. وتی ئازیزم پێغەمبەر(ﷺ) وەسیەتی ئەمەی بۆ نەکردوم وەسیەتی بۆ کردم شمەکم لەدنیادا هێندەی ڕێبوواریٚ بێت، خزمەتکارێکی بینی وتی ئەمە هی کێیە؟ وتیان خزمەتکاری تۆو ژنەکەتن، وتی ئازیزم وەسیەتی وای بۆ نەکردووم، وەسیەتی بۆ کردم تەنها یان مارە بکەم یان هەڵبژێردرێم، ئەگەر وامکردو یاخی بوون تاوانی ئەوانم هەیە بەبیٚ کەمبوونەوە لەتاوانی ئەوان، پاشان بەو ئافرەتانەی وت کە لای ژنەکەی بوون ئایا ئێوە دەچنە دەرگاو لەگەڵ ژنەکەم بەتەنیا بەجێبهێڵن؟ وتیان بەڵیٚ، چوونە دەرو ئەویش چوو بۆ

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٩. ص٣٦٨ دەڵێت ئەحمەد هێناویەتی و کەسەکانی صەحیحن لەصەحیحەکەیدا باسی داواکردن و هاوسەرگیرییەکە نەهاتووە. تەواو.

لای دەرگا تادایخست و پەردەی داداو دواتر هات لای ژنەکەی دانیشت و دەستی هێنا بەڕوخساریداو نزای بەزەکەتی کرد، بەژنەکەی وت ئەگەر فرمانی شتێکت پێ بکەم بەگوێم دەکەیت؟ وتی: لەشوێنی کەسێکدایت کە گوێڕایەڵی دەکرێت، وتی دەی ئازیزم وەسیەتی بۆ کردم ئەگەر لەماڵی ژنەکەم کۆبوومەوە لەسەر گوێڕایەڵی خوا کۆببمەوە، هەستاو چوونە مزگەوت و نوێژیان کرد، پاشان چوونە دەرو کاری ژن و مێردییان کرد. بۆ بەیانی هاوەڵانی هاتن بۆ لای وتیان ژنەکەت چۆنە؟ وەڵامی نەدانەوە، وتیان ئەوەو ئەویش وەڵامی نەدانەوە، جاری سێیەمیش وابوو. پاشان وتی خوا پەردەو بەرگ و دەرگای داناوە تاهەرکامتان ئەوەندە بزانێ کە دەیبینێ، ئەوەی کە نایبینێ باپرسیاری لێ نەکات.

لەپێغەمبەرم بیست دەیفەرموو(المتحدث عن ذلك كالعمارين يتسافدان في الطريق)(ئەوەی باسی ئەوە دەگێڕێتەوە وەك ئەو دوو گوێدرێژە وان کە لەسەر ڕێگە جوت دەبن) هەروەها لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: سەلمان لەماوەیەکی دووریدا گەڕایەوەو عومەری بینی وتی خوا وەك بەندە لێت ڕازی بێت، وتی دەی کچێکم بدەرێ، لێی بێدەنگ بوو. سەلمان وتی بۆ خوا واڕادەبینیت، بەڵام بۆ خۆت لێم ڕانابینیت؟ بۆ بەیانی کەسانی عومەر هاتن بۆ لای، وتی ئیشتان هەیە؟ وتیان بەڵێ، وتی ئیشتان چییە؟ دەکرێت، وتیان واز لەداخوازی لای عومەر بهێنی. وتی بەخوا دەسەڵاتی وای لێ نەکردم، بۆ ئەو کارە، بەڵام وتی: کەسێکی صالح بەڵکو خوای گەورە لەمن و ئەوەوە وەچەیەکی صالح بنێتەوە. وتی لەکیندە ژنی هێنا، فەرموودەکە بەو شێوەیە دێنێت[1][2].

---

[1] - ضعيف.

[2]- تەبەرانی بەکورتی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی و لەسەنەدی هەردووکیاندا حەجاجی کوڕی فەروخ هەیە کە لاوازە، وەك هەیسەمی ج٤، ص٢٩١ دەڵێت.

## هاوسەرگیری ئەبودەردا(خوای لێ ڕازی بێت)

ئەبونەعیم لە(الحلية ج١، ص٢٠٠) لەثابتی بەنانیەوە هێناویەتی ئەبودەردا(رضي الله عنه) لەگەڵ سەلمان چوو داوای ئافرەتێکی بەنی لەیثی بۆ کرد، چوو باسی گەورەیی سەلمان و پێشینەی موسڵمانبوونی کردو باسی کرد کە داوای فلانە کچیان لادەکات. وتیان نایدەین بەسەلمان دەیدەین بەخۆت، وتی چۆن دەبێ؟ ئەبودەردا بەسەلمانی وتوە چییان وتوە، سەلمان وتی من شیاوترم لەوەی شەرم لەتۆ بکەم کە داوای بکەم لەکاتێکدا خوا بۆ تۆی داناوە[1,2].

## ئەبودەردا دەردای کچی دەدات بەیەکێ لەموسڵمانە لاوازو هەژارەکان

ئەبونەعیم لە(الحلية ج١، ص٢١٥) لەثابتی بەنانیەوە هێناویەتی یەزیدی کوڕی موعاویە لای ئەبودەردا داوای دەردای کچی کرد، ئەویش بەرپەرچی دایەوە، یەکێ لەوانەی دانیشتبوو وتی خوا بارت بصولحێنێ، مۆڵەتم دەدەیت کچەکەت مارە بکەم؟ وتی دوور بکەوەرەوە قووڕ بەسەر، وتی دەی خوا حاڵت بصولحێنێ مۆڵەتم بدە، وتی باشە. دەڵێت داوای کردو ئەبودەرداش پێیدا. لەناو خەڵکدا بڵاوبوویەوە یەزید لای ئەبودەردا داوای کچی کردووەو ئەویش بەرپەرچی داوەتەوە، بەڵام یەکێ لەهەژارە موسڵمانەکان داوای کردووەو لێی مارە کردووە، ئەبودەردا وتی: من بەو گومانەی هەتانە ئەبودەردا سەیرمکرد دەردا وابێت کە هەستا دوو خزمەتکار لەسەر سەریەوە بن، سەیری چەندماڵێکم کرد تیایدا چاوی بریسکەی بێت بزانێ ئەمڕۆ ئایینەکەی لەکامیاندایە[3].

---

[1] - ضعيف.

[2] - تەبەرانی بە هەمان شێوە هێناویەتی. هەیسەمی ج٤، ص٢٧٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە بێ متمانەن، بەڵام پابت فەرموودەکەی لەسەلمان و ئەبودەردا نەبیستووە. تەواو.

[3] - ئیمامی ئەحمەد بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە(صفه الصفوه ج١، ص٢٦٠) دا هاتووە.

# عەلی(خوای لیٚ ڕازی بێت) ئوم کلسومی کچی دەدات بەعومەر(خوای لیٚ ڕازی بێت)

عەبدو ڕەزاق و سەعیدی کوڕی مەنسور لەئەبوجەعفەرەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر لای عەلی داوای کچەکەی کرد، ئەویش وتی بچووکە. بەعومەر وترا مەبەستی ئەوەیە نەیدات، عەلی وتی دەینێرم بۆ لات ئەگەر ڕازی بوو ژنتە، ناردی بۆ لای، ئەویش قاچی دەرخست -قاچی کچی عەلی- ئەویش وتی دوورکەوەرەوە ئەگەر ئەمیری باوەڕداران نەبوویتایە کوێرم دەکردیت.[1]

ئیبن سەعد لەموحەممەدەوە هێناویەتی عومەر داوای ئوم کلثومی کرد لای عەلی، ئەویش وتی کچەکانم بۆ کوڕانی جەعفەر دانابوون، وتی بەخوا لێم مارە دەکەیت، لەم سەرزەوییەدا کەس نییە هێندەی من چاوی لەڕێزو گەورەیی کچەکەت بێت، ئەویش وتی باشە، عومەر هات بۆ لای کۆچەران و وتی ئاهەنگم بۆ بکەن، ئەوانیش وایانکرد، وتیان کێت هێناوە؟ وتی کچی عەلی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت(كل نسب وسبب سيقطع يوم القيامة الا نسبي وسببي)(هەموو ڕەچەڵەك و وەچەیەك لەڕۆژی دواییدا دەپچڕیٚ جگە لەڕەچەڵەك و وەچەی من) منیش خزمایەتیم کردو حەزم بەوە کرد. لەڕێگەی خوراسانییەوە هاتووە عومەر بۆ مارەییەکەی چل هەزاری دانا[2][3].

---

[1] - لە(كنز العمال، ج٨، ص٢٩١) دا هاتووە. ئیبن عومەری مەقدیسی لەموحەممەدی کوڕی عەلیەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە(الاصابە ج٤، ص٤٩٢) دا هاتووە.

[2] - صحیح.

[3] - لە(الأصابة) دا هاتووە.

# عەددی کوڕی حاتەم کچەکەی دەدات بەعەمری کوڕی حریس(خوای لیٚ ڕازی بیٚت)

ئیبن عەساکیر لەشەعبییەوە هێناویەتی عەمری کوڕی حریث لای عەددی کوڕی حاتەم داوایکرد وتی ناتدەمیٚ تەنها بەحوکمی خۆم نەبێت، وتی چییە؟ وتی پێغەمبەر(ﷺ) پێشەنگێکی باش بوو بۆتان دەبێت بەپیٚی مارەکەییەکەی عائیشە چوارسەدو هەشتا درهەم بێت. هەروەها لەحەمدی کوڕی هیلالەوە هێناویەتی دەڵێت: عەمری کوڕی لەیث لای عەددی کوڕی حاتەم داوای کرد، وتی تەنها بەبڕیاری خۆم دەتدەمیٚ. وتی: حوکمت چییە بۆم بیڵیٚ؟ ئەویش هەواڵیٚ بۆ نارد چوارسەدو هەشتا درهەم مارەیی بێت، وەك لەسوونەتی پێغەمبەر (ﷺ).[1]

# هاوسەرگیری بیلالو براکەی(خوای لیٚ ڕازی بیٚت)

ئیبن سەعد(ج٣، ص٢٣٧) لە شەعبییەوە هێناویەتی دەڵێت: بیلالو براکەی لایماڵێکی خەڵکی یەمەن داوای کچیان کرد، وتی من بیلالمو ئەویش عەبدانی برامە لە حەبەشە بووین، گومڕابووین خوا ڕێنموونی کردین، کۆیلە بووین خوا ئازادی کردین، ئەگەر کچمان دەدەنیٚ سوپاس بۆ خوا، ئەگەریش کچمان نادەنیٚ(الله أكبر) خوا گەورەیە.

لە عەمری کوڕی مەیمون لە باوکیەوە هێناویەتی، برایەکی بیلال سەر بە عەرەب بوو، دەیوت لەوانە، داوای ئافرەتێکی عەرەبی کرد، وتیان ئەگەر بیلال ئامادە بێت دەتدەینیٚ. بیلال هاتو شایەتی داو وتی من بیلال کوری ڕەباحمو ئەوەش برامە، لە ڕووخسارو ئایینیشدا کەسێکی باش نییە، ئەگەر دەتانەویٚ کچی بدەنیٚ، ئەگەریش نایدەنیٚ مەیدەنیٚ. وتیان کە تۆ برای بیت دەیدەینیٚ، کچەکەیان پێدا.

[1] – لە(کنز العمال ج٨، ٧٩٩) دا واهاتووە.

## (نکووڵی لە خۆچوواندن بە بێباوەڕان لە هاوسەرگیریدا)

ئەبو شەیخ لە عورەوەی کوڕی روەیمەوە هێناویەتی عەبدوڵڵای کوڕی قەرتی سومالی شەوێ لە حیمس دەگەڕا، ئیشکەری عومەر بوو. بووکێ دای بە لایداو ئەوانیش لە بەردەستیدا ئاگریان دەکردەوە، ئەویش بە دارەکەی دەستی لێیبدات تا لەبووکێنیەکە بلاوەیان کرد. بۆ بەیانی چوویە سەر مینبەرەکەی و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردوو وتی: ئەبو جەندە لە ئومامەی بە هاوسەرگرت و بڕێ خواردنی بۆ ئامادەکرد، خوا ڕەحمەتی ببارێنێ بەسەر ئەبو جەندەلەداو سەڵەوات ببارێنێ بەسەر ئومامەداو نەفرینی خوا لەو بووکێنیەی دوێنێتان، ئاگریان کردەوەو خۆیان چوواند بە بێباوەڕان، خواش ڕووناکیان دەکوژێنێتەوە. دەڵێت عەبدوڵڵای کوڕی قەرت لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[1]

## مارەیی

ئیبن سەعد(ج٨، ص١٦١) لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: مارەیی پێغەمبەر(ﷺ) دوانزە ئۆقیەو نششێك بوو، ئەوەش پێنج سەد درهەم بوو. عائیشە دەڵێت: ئۆقیە چل و نش بیست دەکات.

سەعیدی کوڕی مەنسووروو ئەبویەعلاو مەحاملی لە مەسروقەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر(خوای لێ ڕازی بێت) چوویە سەر مینبەر وتی: نازانم کێ مارەیی گەیاندووەتە سەرو چوارسەد درهەم، پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵانی مارەیی نێوانیان چوارسەد درهەم زیاتر نەدەبوو، ئەگەر زیادکردنی مارەیی لەبەر لە خواترسی و ڕێزداری بووایە، ئێوە پێش ئەوان نەدەکەوتن، پاشان دابەزی و ئافرەتێکی قووڕەیش هاتە ڕێی وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕێ نادەیت خەڵکی لەسەروو

[1] - لە الأصابة ج٤، ص٣٨ دا واهاتووە.

چوارسەد درهەم مارەیی دابنێن؟ وتی بەڵێ. وتی: ئەی نەتبیستووە خوا لە قورئاندا دەفەرموێت ﴿وآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً﴾. عومەر وتی خوایە لێم خۆشبە، هەمووان لە عومەر زاناترن، پاشان گەڕایەوەو چوویە سەر مینبەر وتی: ئەی خەڵکینە من ڕێگریم لێکردن لە چوارسەد درهەم زیاتر بچن، هەرکەس ویستی لە سامانی خۆی چەندە دابنێ یان دەروونی ئارامو ڕازی بکات بابیکات.[1]

سەعیدی کوڕی مەنسوورو بەیهەقی لە شەعبیەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب وتاری داو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو وتی وریابن لە مارەیی ژناندا ڕۆمەچن، ببیستم هەرکەس لە هی پێغەمبەر(ﷺ) زیاتری کردووە زیادەکەی دەخەمە بەیتولمالەوە، پاشان دابەزی و ئافرەتێکی قوڕەیشی هاتە ڕێی و وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران قورئان شیاوترە بە شوێنکەوتن تاقسەی تۆ. وتی قورئان چی دەفەرموێت؟ وتی ئێستا ڕێگریت کرد لەوە خەڵك لەمارەییدا ڕۆبچن، خواش لەقورئاندا دەفەرموێت ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئاً﴾ عومەر وتی: هەمووان لە عومەر تێگەیشتوترن، دوو یان سێ جار وتی. پاشان چوویەوە سەر مینبەرو وتی: من ڕێگریم لێکردن لەوەی لە مارەیی ئافرەتاندا زیادەڕۆ بڕۆن، بەڵام ئێستا هەرکەس با چەندەی دەوێت مارەیی بکات.

ئەبو عومەری کوڕی فوزالە لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر مارەیی گەورەیی و سوپاسکاری ڕۆژی دوایی بووایە، ئەوا کچ و ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) شیاوترن بەوە.[2]

---

[1] – لە کنز العمال ج٨، ص٢٩٨ دا هاتووە. هەیسەمی(ج٤، ص٢٨٤) هێناویەتی. ئەبویەعلا هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا موجالیدی کوڕی سەعید هەیە کە لاوازییەکی تێدایەو جێ متمانەشە. تەواو. ئیبن سەعد(ج٨، ص١٦١) لە ڕێگەی عەتای خوراسانیەوە بە کورتتر لەوە هێناویەتی.

[2] – لە(کنز العمال ج٨، ص٢٩٨) دا هاتووە.

ئیبن ئەبی شەیبە لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی عومەر مۆڵەتی دا ئافرەت مارەیی دوو هەزاری هەبێت، عوسمان مۆڵەتی چوار هەزاری دا.[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەر صەفیەی لەسەر چوارسەد درهەم مارەکرد، ئەویش هەواڵی بۆ نارد ئەوە بەشمان ناکات، ئەویش دوور لە چاوی عومەر دووسەدی دیکەی بۆ زیادکرد.[2]

تەبەرانی لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی ئافرەتێکی هێنا، بۆ مارەییەکەی سەد کەنیزەکی نارد، لەگەڵ هەر کەنیزەکێکدا هەزار درهەمی نارد.[3]

# تێکەڵی ژنو پیاوو منداڵان

ئەبویەعلا لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: خواردنێکم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئامادەکردبوو بردم بۆی، بە سەودەم وت- کە پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان منو ئەودا بوو- بخۆ، ئەویش نەیخوارد، وتم یان دەخۆیت یان دەمو چاوت دەشێوێنم، ئەویش ڕازی نەبوو، منیش دەستم خستە ناو خواردنەکە(الحريرة) دام بەدەموچاویدا، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنیو بە دەستی خۆی لە دەمو چاوی لایبردو پێی فەرموو تۆش دەمو چاوی وا لێبکە. پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی بۆی. عومەر تێپەڕیو وتی عەبدوڵلا، ئەی عەبدوڵلا، وایزانی دێتە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەستن دەمو چاوتان بشۆن، عائیشە وتی من بەردەوام لەعومەر دەترسام لەبەر شانوشکۆی پێغەمبەر(ﷺ).[4]

---

[1] – لە(كنز العمال ج٨، ص٢٩٨) دا هاتووە.

[2] – لە(كنز العمال ج٨، ص٢٩٨) دا واهاتووە.

[3] – هەیسەمی ج٤، ص٢٧٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن. تەواو.

[4] – هەیسەمی(ج٤، ص٣١٦) دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە موحەمەدی کوڕی عەلقەمەو فەرموودەکەی حەسەنە. ئیبن عەساکیر بە هەمان شێوە هێناویەتی وەك لە(المنتخب

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر(ﷺ) ڕانی نزم کردەوە بۆی تاتۆڵەی لێبکاتەوە، هەندێ لە خواردنەکەی هەڵگرت و دای بە دەم و چاومداو پێغەمبەریش(ﷺ) پێدەکەنی.[1]

ئەبویەعلا لە رزینەی مەولای پێغەمبەرەوە(ﷺ) هێناویەتی سەودەی یەمانی هات بۆ سەردانی عائیشەوە حەفصەی کچی عومەری لە لابوو، سەودە بەبەر چاوی و بارێکی جوانەوە هات و عەبایەکی قەڵغان ئاسایی یەمەنی لەبەردابوو، هەروەها دوو خاڵ لە زەعفەران و صبر بە وێنەی دوو برین لەلای چاویەوە بوو، عەلیلە دەڵێ بینیم ئافرەتان بەوە خۆیان دەڕازاندەوە. حەفصە بە عائیشەی وت: ئەی دایکی باوەڕداران پێغەمبەر(ﷺ) بێت و ئەمە لە نێوانماندا بریسکە بداتەوە، دایکی باوەڕداران وتی: لە خوا بترسە ئەی حەفصە، ئەویش وتی: بەخوا ئەو جوانیەی دەشێوێنم، مەولاکە وتی چی دەڵێن؟ گوێی قورس بوو، حەفصە پێی وت ئەی سەودە ئەعوەر (دەجال)دەرچوو، ئەویش تەواو ترساو شڵەژا، وتی لە کوێ خۆم بشارمەوە؟ وتی بڕۆرە ناو چادرەکە، چادرێکیان هەبوو کە خۆیان تێدا دەشاردەوە، چوو لەوێ خۆی شاردەوە کە پیسی و هێلانەی جاڵجاڵۆکەی تێدابوو. پێغەمبەر(ﷺ) هات و هەردووکیان پێکەنین و لەتاو پێکەنیندا نەیاندەتوانی قسەبکەن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ماذا الضحك؟)(ئەو پێکەنینەتان لە چییە؟) سێ جار فەرمووی، ئەوانیش بەدەست ئاماژەیان کرد بۆ چادرەکە، پێغەمبەر(ﷺ) چوو سەیری کرد سەودە خۆی تێدا مۆڵ داوە، پێی فەرموو(یاسودة مالك؟) واتە(سەودە چیتە؟)وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەعوەر(دەجال)دەرچوو، فەرمووی(دەرنەچووەو بەدڵنیاییەوە دەردەچێت، دەرنەچووەو بەدڵنیاییەوە

---

ج٤، ص٣٩٣) دا هاتووە. ئیبن نەجار بە هەمان شێوە هێناویەتی، وەك لە(كنز العمال ج٧، ص٣٠٢) دا هاتووە.

[1] – حسن.

دەردەچێت) سەودەی هێنایە دەرەوەو تۆزو هێلانەی جاڵجاڵۆکەکەی لێ دەتەکاند[1]،[2]
بەڵام تەبەرانی دەڵێت حەفصە بەعائیشەی وت پێغەمبەر(ﷺ) بێت بۆ لامان و ئێمە
بەم شێوەو ئەویش لە نێوماندا بریسکەبەخش بێت.[3]

ئیبن عەددی و ئیبن عەساکیر لە عائیشەوە هێناویانە پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو دەنگە دەنگی خەڵك و منداڵانی بیست، سەیری کرد ئافرەتێکی حەبەشی سەما دەکات و خەڵکی لە دەوری کۆبوونەتەوە، فەرمووی(ئەی عائیشە وەرە سەیر بکە) منیش سەرم نایە سەر شانی و لەوێوە سەیرم دەکردو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(یاعائشة ماشبعت؟) (عائیشە تێرت نەخوارد؟)منیش دەموت نا تاسەیری پلەو پایەم بکەم لە لای، سەیرم کرد قاچەکانی ئەملاولای پێدەکرد، عومەر دەرکەوت و خەڵکی و منداڵان بڵاوەیان لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(رایتُ شياطين الأنس والجن فرّوا من عمر)(شەیتانە مرۆڤ و جنۆکەکانم بینین لە عومەر رایان کرد) فەرموودەکە دێنێت[4] [5].

بوخاری و موسلم لێیانەوە هێناوە، وەك لە(المشكاة ص٢٧٢) دا هاتووە عائیشە وتی: بەخوا پێغەمبەرم(ﷺ) بینی لەبەر دەرگاکەم وەستاو حەبەشیەکان بەڕم یارییان دەکرد لە مزگەوتداو پێغەمبەر(ﷺ) بە عەباکەی دایدەپۆشیم تا لای گوێیەوە سەیری یارییان بکەم، دواتر لەبەر من دەوەستا تا ئەوەی من بچوومایە، دەی حەزی ئافرەتی تەمەن کەمی سوور بوو لەسەر گاڵتەو گەپ لەبەرچاو بگرن.

[1] – ضعیف.
[2] – هەیسەمی ج٤، ص٣١٦ دەڵێت: ئەبویەعلاو تەبەرانی هێناویان.
[3] – لە سەنەدەکەیدا کەس هەن کە ناپانناسم، تەواو.
[4] – صحیح.
[5] – وەك لە(المنتخب ج٤، ص٣٩٣) دا هاتووە.

بوخاری لە عائیشەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە لای زەینەبی کچی جەحش دەمایەوەو لە لای هەنگوینی دەنۆشی، من و حەفصە پیلانمان دانا هەرکاممان پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای پێی بڵێین بۆنی(مخافیر)[1] دەدەیت ئەوەت خواردووە، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای یەکێکمان و ئەوەمان پێ وت، فەرمووی(نا، بەڵکو هەنگوینم خواردۆتەوە لای زەینەبی کچی جەحش و هەرگیزیش ناچمەوە بۆ لای) ئەو ئایەتە دابەزی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ {١} قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ {٢} وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثاً فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ {٣} إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ ئەمە بۆ عائیشەو حەفصە ﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثاً﴾ لەبەر ئەو قسەی فەرمووی بەڵکو هەنگوینم خواردووە. ئیبراهیمی کوڕی موسا لە هیشامەوە دەڵێت:(هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆی و سوێندم خواردووە بۆیە هەواڵی ئەوە بە کەس مەدە) موسلیم بە هەمان شێوە هێناویەتی.

بوخاری لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لە حەڵواو هەنگوین بو، کە عەسر دەردەچوو دەچوو بۆ لای ژنەکانی و دەچوو بۆ لای یەکێکیان، چوو بۆ لای حەفصەی کچی عومەرو زیاتر لە جاران مایەوە، منیش غیرە دایگرتم و لەسەر ئەوە پرسیارم لێکرد، پێم وترا یەکێ لە ئافرەتەکانی بڕێ هەنگوینی بە دیاری بۆ هێناوە، ئەویش بڕێکی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ)، منیش وتم بەخوا داوی بۆ دەنێینەوە(ئەوەی لێ دەکەین). بە سەودەی کچی زەمعەم وت پێغەمبەر(ﷺ) لێت نزیک دەبێتەوە، کە نزیک بوویەوە پێی بڵێ مەغافیرت خواردووە؟ ئەویش پێت دەڵێت نا، تۆش بڵێ ئەی ئەو بۆنە چییە؟ ئەویش دەڵێ حەفصە هەنگوینی پێدام، تۆش بڵێ دەی هەنگەکەی لەوەی مژیوە، منیش ئەوە

[1] – گەڵایەکی شیرین و بۆن پیسە.

دەڵێم، صەفیە تۆش ئەوەی پێ بڵێ. دەڵێ سەودە وتی بەخوا هەر کە هاتە بەردەرگا ویستم لەتاو تۆبەو فەرمانی تۆ بانگی بکەم، کە لێی نزیك بوویەوە سەودە وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەغافیرت خواردووە؟ فەرمووی نا. وتی ئەی ئەو بۆنە چییە؟ فەرمووی(سقتني حفصة شربة عسل) واتە(حەفصە هەنگوینی نۆش کردم) وتی دەی هەنگەکەی لەوەی مژیوە، کە هاتە لای منیش هەمان شتم پێ وت. کە چوو بۆ لای صەفیە ئەویش هەر وای وت. کە چوو بۆ لای حەفصە، حەفصە پێی وت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو هەنگوینەت بۆ نەهێنم؟ فەرمووی (هیچ پێویستیم پێی نییە)(لا حاجە لی فیە) دەڵێت: سەودە دەیوت بەخوا حەرامامان کرد، پێموت بێدەنگ بە.[1]

ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: بەردەوام سووربووم لەسەر ئەوەی لە عومەر بپرسم لەسەر دوو ژنی ناو ژنانی پێغەمبەر(ﷺ) کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێت ﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ تا عومەر حەجی کردو منیش لەگەڵی حەجم دەکرد. لە نیوەی ڕێدا عومەر لایداو منیش بە مەسینەیەکەوە لامدا، چوویە ئەولا، پاشان هات بۆ لامو ئاوم کرد بەدەستیدا، دەستنوێژی گرت. وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەی دوو ژنەی پێغەمبەر کامانەن کە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت ﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ عومەر وتی جێی سەرسوڕمانە بۆت ئەی ئیبن عەبباس، زوهری دەڵێت: بەخوا حەزی نەکرد ئەو پرسیارەی لێکردو لێشی نەشاردەوە، وتی ئەوانە حەفصەو عائیشە بوون، پاشان فەرموودەکەی باسکرد، وتی: ئێمەی کۆمەڵی قوڕەیش بەسەر ئافرەتاندا زاڵ بووین، کە هاتینە مەدینە خەڵکێکمان بینی ژنەکانیان زاڵ بوون، ئافرەتەکانمان لە ژنەکانی ئەوانەوە خەریك بوو فێردەبوون، دەڵێت: شوێنی من لە لای بەنی ئومەیەی کوڕی

---

[1]- موسلیم هێناویەتی. لە تەفسیری ئیبن کەپیر(ج٤، ص٣٧٨) دا واهاتووە، ئەبوداود هێناویەتی، وەك لە(جمع الفوائد ج١، ص٢٢٩) دا هاتووە. ئیبن سەعد(ج٨، ص٨٥) دا واهاتووە.

زەید لەسەرەوە بوو، ڕۆژێ ژنەکەم لێم تووڕە بوو، ڕەخنەی لێگرتم، منیش حەزم نەکرد. وتی: بۆچی ڕقتە ڕەخنەت لێ بگرم بەخوا ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن و هەیانە ڕۆژێ تاشەو نایدوێنێ. دەڵێت: منیش چووم بۆ لای حەفصەو وتم تۆ ئەوە دەکەیت؟ وتی: بەڵێ، وتم کەستان هەیە ڕۆژ تاشەو نەیدوێنێ؟ وتی: بەڵێ، وتم هەرکامتان ئەوە دەکات ماڵوێران و زیانمەندە، ناترسن خوای گەورە بەهۆی تووڕەیی پێغەمبەرەکەی تووڕەیی بەسەردا دابارێنێ؟ ئەوکات قووڕبەسەر دەبێ، بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) وامەبەو داوای هیچی لێ مەکەو چیت ویست بەمنی بڵێ، لەخۆبایی مەبە ئەگەر دراوسێکەت لە تۆ جوانترو لای پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستترە -مەبەستی عائیشە بوو- دەڵێت من دراوسێیەکی پشتیوانانم هەبوو بەسەرە لای پێغەمبەر(ﷺ) دەبووین، ڕۆژێ ئەوو ڕۆژێ من، ئەو هەواڵی دابەزینی سروش و شتی دیکەی بۆ دەهێنام، منیش هەروا، ئێمە قسەمان دەگێڕایەوەو باسی ئەوەمان بوو غەسان خۆی بۆ شەڕ ئامادەکردووە تاهەڵماتمان بۆ بێنێ. ڕۆژێ هاوەڵەکەم دابەزی و پاشان شەو هات بۆ لام و لە دەرگاکەی دام و دواتر بانگی کردم، چووم بۆ لای، وتی شتێکی گەورە ڕوویداوە، وتم: چی بووە؟ غەسان هاتووە؟ وتی نا، لەوە گەورەترو درێژ خایەنترە. پێغەمبەر(ﷺ) ژنەکانی تەڵاق داوە، وتم حەفصە قووڕبەسەرو زیانمەند بوو، من گومانم دەبرد شتی وابببێ، کە نوێژی بەیانیم کرد جل و بەرگم توندوتۆڵ کردەوەو دابەزیم و چووم بۆ لای حەفصە سەیرم کرد دەگریت، وتم: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) تەڵاقی دان؟ وتی نازانم، ئەوەتا لەو ژوورەدا دووری گرتووە. چووم بۆ لای کۆیلەیەکی ڕەشی پێم وت: مۆڵەت بۆ عومەر وەربگرە، کۆیلەکە چوو هاتەوە وتی پێم وت بێدەنگ بوو، منیش چووم تا گەیشتمە مینبەرەکە، سەیرم کرد دەستەیەك لە لایدا دانیشتوون و هەندێکیان دەگریان، کەمێك دانیشتم و دواتر ئەو بارە زۆری بۆ هێنام و چوومەوە بۆ لای کۆیلەکەو وتم: بڕۆ مۆڵەت بۆ عومەر وەربگرە. چوو هاتەوە وتی پێم وت بێدەنگ بوو، منیش چووم و لای مینبەکەرە دانیشتم، دووبارە بینینی بارەکە زۆری

بۆهێنـامو چـوومەوەو هـەمان شـت ڕوویـدا، منـیش ڕووم وەرچـەرخاندو چـوومو کۆیلەکـەش بـانگی کـردم. وتـی: بـڕۆره ژوورەوه مۆڵـەتی پێـدایت، منـیش چـوومه ژوورەوەو سەلامم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر پارچە حەسیرێك پاڵی دابوویەوه.

ئەحمەد دەڵێت یەعقوب لە فەرموودەکەی صاڵحدا هێناویەتی دەڵێت لەسەر پارچە حەسیرێك کە شوێنەواری لەسەر لەشی بەجێمابوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا ژنەکانت تەڵاق داوه؟ سەری بەرز کردەوه بەرەو ڕووم و فەرمووی(نا).

وتم(الله أكبر) ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ئێمەو کۆمەڵی قوڕەیش دەبینی کە بەسـەر ئافرەتانـدا زاڵ بـووین کـە هاتینـە مەدینـە خـەڵکێکمان بینـی ژنـەکانیان زاڵ بـوون، ژنـەکانمان لەوانـەوه فێربـوون، ڕۆژێ ژنەکـەم لـێم تـووڕە بـوو قسەی لـەڕوودا کـردم، منـیش پـێم نـاخۆش بـوو، وتـی بۆچـی پێـت ناخۆشـە بـەخوا ژنـەکانی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئـەوە دەکـەن و هەشـیانە ڕۆژ تاشـەو نایـدوێنێ. وتم دەی هـەرکامتان ئـەوە دەکـات قووڕبەسـەرو زیانمەنـد دەبێـت، ئایـا ناترسـن خـوا لەبەر تووڕەیی پێغەمبەرەکەی تووڕەیی خۆی دابارێنێ بەسەرتاندا؟ ئەوکات قووڕبەسەر دەبـن. پێغەمبـەر(ﷺ) زەردەخەنـەی کـردو منـیش وتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، ئینجـا چـووم بـۆ لای حەفـصەو وتم ئـەوه یاخیـت نـەکات کـە دراوسـێکەت لای پێغەمبەر(ﷺ) جوانترو خۆشەویستترە لە تۆ. دووبارە پێغەمبـەر(ﷺ) زەردەخەنـەی کـرد، وتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دابنیـشم؟ فـەرمووی: بـەڵێ، سـەرم لەماڵەکـەدا بـەرز کـردەوە، بـەخوا هیـچم تێـدا نـەبینی چـاو بگـرێ جگـە لـە سـێ پێـست.وتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا نزابکـە خـوا بەخـششی بـۆ ئوممەتەکـەت فـراوان بکـات، چـونکە بـۆ فـارس و ڕۆم ئـەوەی کـردووه کـە خـواش ناپەرسـتن. پێغەمبـەر(ﷺ) یەکـسەر ڕێـك دانیـشت و دواتـر فـەرمووی(أخـي شـكّ انـت ابـن الخطـاب؟ أُولئـك قـوم عجلـت لهـم طيبـاتهم في الحيـاة الـدنيا) واتـه(ئایـا لـە گومانـدایت ئـەی ئیبن خـەتتاب؟ ئەوانـە خەڵکێکن خۆشیەکانیان بۆ پێش خراوە لە ژیانی دنیادا).

وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) داوای لێخۆشـبوونم بۆبکـە، پێغەمبـەر(ﷺ) سوێندی خواردبوو مانگێك نەچێت بۆ لای ژنەکانی لەتاو زۆری تووڕەبوونی لێیان تا خوای گەورە سەرزەنشتی کرد.[1]

هەروەها موسلم لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب وتی کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لە ژنەکانی دوور گرت، چوومە مزگەوت و سەیرم کرد خەڵکی وردە بەردەکان بە زەویدا دەدەنو دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ) ژنەکانی خۆی تەلاقداوە. ئەمەش پێش ئەوەی فەرمانی حیجابی پێ بکرێت، وتم ئەو ڕۆژە دەزانم، -ئیتر باسی ئەو فەرموودە دەکات کە چوو بۆ لای عائیشەو حەفصەو ئامۆژگاری کردن- تا دەڵێت: چوومە ژوورەوە سەیرم کرد پێغەمبەر(ﷺ) لە سووچی ژوورەکەدایە، بانگم کردو وتم ئەی ڕباح لای پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتم بۆ وەربگرە- وەك جاری پێشوو فەرموودەکە دێنێت- تا دەڵێت وتم ئەی پێغەمبەری خوا چ بارێکی ئافرەتانت لەسەر سەختە ئەگەر تەلاقت داون، ئەوا خواو فریشتەکانی و جبریل و میکائیل و من و ئەبوبەکرو باوەڕدارنت لەگەڵدان- کەمجار قسەیەکم کردووە- سوپاس بۆ خوا- هیوام وابوو خوای گەورە پشتگیری قسەکەم بکات. ئەم ئایەتە دابەزی ﴿عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِّنكُنَّ﴾ و﴿وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ﴾ وتم ئایا تەلاقت داون؟ فەرمووی: نا، چوومە بەردەرگای مزگەوت و بەوپەڕی توانامەوە هاوارم کرد ژنەکانی تەلاق نەداوە. ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ﴾ من ئەوەم ئیستنبات کرد.[2]

---

[1] - بوخاری و موسلم و ترمزی هێناویانە.

[2]- لە تەفسیری ئیبن کەسیرج٤، ص٣٨٩ دا واهاتووە. عەبدوڕەزاق و ئیبن سەعدو ئیبن حبان و بەیهەقی و ئیبن جەریرو ئیبن مونزیرو ئیبن مەردەویەو هی دیکەش هێناویانە. وەك لە(کنز العمال ج١، ص٢٦٩) دا هاتووە.

ئەحمەد لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر چوو مۆڵەتی وەربگرێت بۆ چوونە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکیش لەبەر دەرگایدا دانیشتبوون و پێغەمبەریش(ﷺ) دانیشتبوو مۆڵەتی نەدا، پاشان عومەر هات و داوای مۆڵەتی کردو مۆڵەتی نەدا. پاشان مۆڵەتی ئەبوبەکرو عومەر دراو چوونە ژوورەوەو پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو ژنەکانی لە دەوری بوون و خۆی بێدەنگ بوو. عومەر وتی دەبێت لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) قسەبکەم، بەڵکو پێکەنێت. عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر کچەکەی زەید ژنەکەی عومەرت دەدی داوای خەرجیم لێدەکات. منیش دام بە پشت ملیدا، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی تادانەکانی دەرکەوتن و فەرمووی(هنّ حولي يسألنني النفقة) واتە(ئەمانە لە دەورمن داوای خەرجیم لێ دەکەن) ئەبوبەکر هەستاو تا بدات لە عائیشەو عومەر بدات لە حەفصە، هەردووکیان دەیانوت شتێ لە پێغەمبەر(ﷺ) داوا دەکەن کە نییەتی، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لێ کردن، ئەوانیش(ئافرەتان) وتیان دوای ئەم دانیشتنە داوای شتێ لە پێغەمبەر(ﷺ) ناکەین کە نییەتی. خوای گەورە سەرپشکی دابەزاند، سەرەتا بە عائیشە دەستی پێکردو فەرمووی(إني أذكر لك أمراً ما أحب تعجلي فيه حتى تستأمري أبويك) واتە(من شتێکت بۆ باسدەکەم حەزناکەم پەلەی تێدا بکەیت تا پرسیار لەدایك و باوکت بکەیت) وتی چییە؟ ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً﴾ عائیشە وتی لەسەر تۆ پرسیار لە دایك و باوکم بکەم و فەرمانیان لێ وەربگرم؟ بەڵکو خواو پێغەمبەرەکەی هەڵدەبژێرم و داوام وایە ئەم هەڵبژاردنەی من بۆ هیچ یەك لە ژنەکانت باس نەکەیت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ان الله لم يبعثني معنفا ولكن بعثني معلماً ميسراً لا تسألني امرأة منهن عما اخترت الا أخبرتها) واتە(خوا منی بە توند نوێن نەناردووە بەڵکو بە مامۆستاو ئاسانکار ناردوومی، هەر ژنێکیان پرسیارم لێبکات لەسەر هەڵبژاردنەکەت پێی دەڵێم) موسلیم و نەسائی هێناویانە. ئیبن ئەبی حاتەم لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت:

عائیشە وتی ئایەتی سەرپشککردن دابەزیو پێغەمبەر(ﷺ) یەکەمجار بە من دەستی پێکردو فەرمووی(من شتێکت بۆ باس دەکەم هیچ پێویست ناکات پەلە بکەیت تاقسەی دایكو باوکت وەردەگریت) وتی زانی باوکمو دایکم پێی ناڵێن لێی جیاببمەوە. پاشان فەرمووی خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً {٢٨} وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾ منیش وتم لەسەر ئەمە قسەی دایكو باوکم وەربگرم؟ من خواو پێغەمبەرەکەیو ڕۆژی دواییم دەوێت، پاشان هەموو ژنەکانی دیکەی سەرپشککردو ئەوانیش هەمان قسەی عائیشەیان هەبوو. بوخاریو موسلیم لە عائیشەوە بە هەمان شێوە هێناویانە. هەروەها هەردووکیانو ئەحمەدیش -دەقەکە هی ئەوە- لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سەرپشکی کردین، ئێمەش ئەومان هەڵبژارد. ئیتر هیچی لێ دووبارە نەکردینەوە.[1]

بوخاریو موسلیم لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم(من دەزانم ئەگەر تۆ لێم ڕازی بیت یان لێم تووڕە بیت) منیش وتم چۆن ئەوە دەزانیت؟ فەرمووی(ئەگەر لێم ڕازی بیت دەڵێیت نەسوێند بە پەروەردگاری موحەمەد، ئەگەریش لێم تووڕە بیت دەڵێیت نەسوێند بە پەروەردگاری ئیبراهیم) منیش وتم وایە بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا بەس ناوی تۆ دێنم.[2]

ئەبوداود لەعائیشەوە هێناویەتی لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە پێشبڕکێی لەگەڵ کرد، منیش لەسەر دوو پێ پێشم دایەوە، کە قەڵەو بووم پێشبڕکێی لەگەڵ کردم پێشی دامەوەو فەرمووی(ئەمە لە بری ئەوەی پێشوو).[1,3]

---

[1] – لەتەفسیری ئیبن کەسیرج٣، ص٤٨١ دا واهاتووە.

[2] – لە(المشكاة ص٢٧٢) دا هاتووە.

[3] – حسن.

ئیبن نەجار لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: میوانی مەیموونە بووم و ئەوکات نوێژی نەدەکرد(بۆی نەگونجاوە) جلێکی هێنا، پاشان جلیکی دیکەی هێناو لە سەرووی جێگەکەوە دایناو پاشان ڕاکشاو جلەکەی دا بەسەریداو شتێکی لە پاڵ خۆیدا ڕاخست و منیش لەگەڵیدا سەرم نایە سەر سەرینەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) هات و نوێژی کۆتایی عیشای کردبوو، هاتە لای جێگەکەوجلێکی هێناو جلەکانی لابردو هەردووکیانی هەڵواسی و دواتر چوویە ناو لێفەکە تا کۆتایی شەو هەستا بۆ لای ئاوێك لە کونەیەکی هەڵواسراودا کردیەوەو دەستنوێژی لێگرت، زانیم هەستم و ئاو بکەم بەسەریداو دواتر حەزم نەکرد بزانێت من بێدارم، پاشان هاتەوە بۆ جێگەکەو دوو جلەکەی هەڵگرت و پارچەکەی ڕاکێشا و دواتر هەستا بۆ مزگەوت و نوێژی دەکرد. منیش هەستام و دەستنوێژم گرت، پاشان هاتم لە لای چەپیەوە وەستام و ئەویش لە پشتیەوە بە دەستی پاڵی پێوەنام بۆ لای ڕاستی و نوێژی کردو منیش لەگەڵیدا سیانزە ڕکاتم کرد. پاشان دانیشت و منیش لە لایەوە دانیشتم، سەری بەلامدا خست تا دەنگی نوستووم بیست، پاشان بیلال هات و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژە. پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ مزگەوت و دوو ڕکاتی کردو بیلالیش قامەتی کرد.[2]

بەیهەقی و ئیبن نەجار لە عائیشەوە هێناویانە پیرەژنێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی تۆ کێیت؟ وتی: جوسامەی موزەنی، فەرمووی بەڵکو تۆ حەنانەی مۆزەنیت، ئێوە چۆنن؟ حاڵتان چۆنە؟ دوای ئێمە چۆن بوون؟. وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باشین، کە چوویە دەر وتم ئەی پێغەمبەری خوا بەو جۆرە پێشوازی لەو پیرەژنە دەکەیت؟ فەرمووی(ئەی عائیشە ئەمە لە سەردەمی خەدیجەدا دەهات بۆ لامان، بەڵێن چاکیش

---

[1] – لە(المشکاە ص٢٧٣) دا واهاتووە.

[2] – لە(کنز العمال ج٥، ص١١٩) دا واهاتووە.

لەئیمانەوەیە) بەیهەقی هێناویەتی عائیشە وتی: پیرەژنێ دەهات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش پێی دڵخۆش دەبوو ڕێزی دەگرت، وتم بە دایكو باوكمەوە بە قوربانت بم بەرامبەر ئەم پیرەژنە جۆرێكیت لەگەڵ كەسی تردا وانیت؟ فەرمووی(ئەمە لە كاتی خەدیجەدا دەهات بۆ لامان، مەگەر نازانیت ڕێزگرتنی دۆستو هۆگر لە ئیمانەوەیە).[1]

بوخاری لە ئەبوتوفەیلەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی لە جەعرانە گۆشتی دابەش دەكرد ئەوكات من غولامی بووم بەشێكی گۆشتی هوشترەكەم هەڵدەگرت، ژنێ هات بۆ لای، پێغەمبەر(ﷺ) عەباكەی بۆ ڕاخست، وتم ئەمە كێیە؟ وتی ئەو دایكەیەتی كە شیری پێدا.

تەبەرانی و بەزارو ئیبن سنی و ئیبن نەعیمو سەعیدی كوڕی مەنسوور لە عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و كۆیلەیەكی حەبەشی پشتی دەشێلا، وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چیتە؟ فەرمووی(ان الناقة تقحمت بي البارحة) واتە(وشترەكە فڕێی دام).[2][3]

ئیبن سەعد(ج٣، ص١٥٣) لە قاسمی كوڕی عەبدوڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود دوو نەعلەكانی دەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) و پاشان لە پشتیەوە بە گۆچان دەچوو تاچوویە شوێنەكەی نەعلەكانی لابردو خستیە ژێر باڵی و گۆچانەكەی پێدا، كە پێغەمبەر(ﷺ) بیویستایە هەستێت نەعلەكانی پێدەداو هەمووی لە پشتیەوە بەگۆچانەكەوە دەچوو تا پێش پێغەمبەر(ﷺ) دەچوویە ژوور.

---

[1] – لە(كنز العمال ج٧، ص١١٥) دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – كنز العمال. ج٤. ص٤٤.

هەروەها لە ئەبومەلیحەوە هێناویەتی دەڵێت:کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) خۆی دەشۆرد عەبدوڵا پەردەی بۆ دەگرت، کاتێ دەخەوت بێداری دەکردەوە، لەگەڵیدا دەچوو بەڕێدا.

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەبو نەعیم لە ئەنەسەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینەو من دە ساڵان بووم، مردن و من بیست ساڵان بووم، ژنەکانی دایکم بوون هانیان دەدام لەسەر خزمەتکردنی.

ئیبن سەعدو ئیبن عەساکیر لەمۆمامەوە هێناویانە بەئەنەس وترا ئایا بەشداری بەدر بوویت؟ وتی: دایکت نەبێ چۆن لەبەدر بەدووربم؟ موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەنساری وتی ئەنەسی کوڕی مالیك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ بەدر، ئەوکات منداڵ بوو خزمەتی پێغەمبەری(ﷺ) دەکرد.[1]

بەزار لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: بیست گەنجی موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون تاپێویستیەکانی بەجێبگەیەنن، شتێکی بوویستایە دەیناردن بۆ کارەکە، لە سەنەدەکەدا کەسانی واهەن کە نایاننناسن[2].[3]

هەروەها لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویەتی دەڵێت: هەمیشە چوار یان پێنج هاوەڵ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون یان لەبەر دەرگایدا بوون.[4]

هەروەها لە ئەبوسەعیدەوە هێناویەتی دەڵێت: ئێمە بۆ بەجێگەیاندنی کاری پێغەمبەر(ﷺ) سەرەگیریمان دەکرد یان بۆ کارێ دەیناردین کەسانی سەرەکە زۆر دەبوون، پێغەمبەر(ﷺ) دەهات بۆ لامان و ئێمەش گرمەو گاڵمان بوو. دەیفەرموو(ما

---

[1] – لە(المنتخب ج٥، ص١٤١) دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – (هەیسەمی ج٩، ص٢٢) ئەمە دەڵێت.

[4] – لەسەنەدەکەدا موسای کوڕی عوبەیدەی رەبزی هەیە کە لاوازە، وەك هەیسەمی دەڵێت.

هـذا النجوى؟ ألم أنهكم عن النجوى) واتـه(ئـەم چپە چپە چییە؟ مەگـەر ڕێگـریم لێ نەکردن لەچپە چپ؟).[1]

هـەروەها لـە عاصـمی کـوڕی سـوفیانەوە هێناویـەتی کـە لـە ئـەبودەردا یـان ئەبوزەری بیست وتی: مۆڵـەتم لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) خواست تا لەبەر دەرگایدا بم و بۆ پێویستی و کاروباری ئاگادارم بکاتەوە. مۆڵەتی دام و شەوێك مامەوە.[2]

ئیبن عەساکیر لەحوذەیفەوە هێناویـەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) نوێـژم کـرد لـە مـانگی ڕەمەزانـدا، هەڵدەسـتا خـۆی دەشـۆرد منـیش پـەردەم بـۆ دەگـرت، زیـادەی ئـاوێم لێ دەخواسـت، فـەرمووی(ان شئت فارفعـه وإن شئت فـصب عليـه) واتــه(ئەگــەر دەتــەوێت لایبــە، ئەگــەریش دەتــەوێت بیکــە بەســەریدا) وتم ئــەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئـەو زیادەم لا ئازیزترە تابکەم بەسـەریدا. خـۆم پـێ شـۆردو پێغەمبەر(ﷺ) پەردەی بۆ گرتم، وتم پەردەم بۆ مەگرە، فەرمووی(بلی، لأسترنك كما سترتني) واتە(نا، چۆن پەردەت بۆ گرتم، پەردەت بۆ دەگرم).[3]

موسلیم(ج٢، ص٢٥٤) لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە هێناویـەتی دەڵێت: کەسـم نــەدی لــە پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) بەســۆزتربێت بــۆ ژن و مــاڵی. دەڵێــت ئیــبراهیم شیردەرێکی(دایەن) هەبوو لە سەرووی مەدینەدا، دەچوو ئێمەش لەگەڵی دەچووین، دەچوویە ماڵ و خانوەکە پڕ دووکەڵ بوو.مێردی شیردەرەکە(دایەنکە) ئاسنگەر بوو، ئیبراهیمی هەڵیدەگرت، ماچی دەکردو دەگەڕایەوە، عومـەر وتـی کە ئیبراهیم مـرد پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی(ان ابـراهيم إبـني وانـه مـات في الثـدی وان لـه لظئرين يكملان رضاعه في الجنة).[4]

---

[1] – کەسەکانی جێ متمانەن و ڕاجیاوازی لەسەر هەندێکیان هەیە، وەك هەیسەمی دەڵێت.

[2] – کەسەکانی جێ‌متمانەن، وەك هەیسەمی ج٩، ص٢٢ دەڵێت.

[3] – لە(المنتخب ج٥، ص١٦٤) دا واهاتووە.

[4] – ئەحمەد هێناویەتی، وەك لە(البدايه والنهايه ج٦، ص٤٥) دا هاتووە.

ئەحمەد لە عەبدوڵلای کوڕی حارثەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) عەبدوڵلاو عوبەیدو کەپیری کوڕی عەبباسی ڕیزدەکردن و پاشان دەیفەرموو(من سبق الي فله كذا وكذا) واته(هەرکەس پێشتر بێت بۆ لام ئەوەو ئەوەی بۆ هەیە) ئەوانیش بەپەلە دەچوون و خۆیان دەدا بەسەر سنگ و ملیداو ئەویش ماچی دەکردن و دەیگرتنە کۆش[1][2].

ئیبن عەساکیر لەعەبدوڵلای کوڕی جەعفەرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە لە سەفەرێك دەگەڕایەوە لای منداڵانی خێزانەکەی دەگرتە کۆش، لە سەفەرێك هاتەوەو منی گرتەخۆی، خستمیە بەردەم خۆی، پاشان یەکێ لە کوڕەکانی فاتیمە حەسەن یان حوسەین هێنرا لە پشتیەوە دایناو چوونە مەدینەو هەرسێکمان لەسەر ئاژەڵێك بووین.

هەروەها لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: من لەگەڵ منداڵان یاریم دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) دای بە لامداو من و منداڵێکی بەنی عەبباسی گرتە کۆش و لەسەر ولاخەکە سواری کردین، هەرسێکمان لەسەر ولاخێك بووین.

هەروەها لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر من و قوثەم و عوبەیدوڵلای دووکوڕی عەبباست دەبینی کە منداڵ بووین یاریمان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە ولاخێکەوە دای بە لامانداو فەرمووی(ئەوەم بۆ بەرز بکەنەوە) منی لە پشتیەوە دانا. فەرمووی(ئەوەشم بۆ بەرز بکەنەوە) لە پشتیەوە داینا. عوبەیدولا بۆ عەبباس لە قوثەم خۆشەویستتربوو. شەرمی نەکرد لە مامی کە قوثەم هەڵگرت و ئەوی بەجێهێشت، پاشان سێ جار دەستی هێنا بەسەر سەرمدا. هەرجارەو

[1] – ضعيف.

[2] – هەیسەمی ج٩، ص١٧، دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی و سەنەدەکەشی حەسەنە.

دەیفەرموو(اللهم اخلق جعفراً في ولده) واته(خوایه لەوەچەی جەعفەر لە دوای خۆی بهێڵەرەوە).[1]

ئەبویەعلا لە عومەری کوڕی خەتتابەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەسەن و حوسەینم لەسەر شانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی، وتم بەڕاستی ئەسپێکی چاکتان لە ژێردایە، ئەویش فەرمووی(نعم الفارسان هما) واته(ئەوانیش سواری چاکن).[2,3]

ئیبن عەساکیر لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حەسەنی لەسەر شان نابوو چوویە دەر، کەسێ پێی وت ئەی منداڵ بەڕاستی جێ سوارێکی باشت هەیە. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ونعم الراكب هو) واته(ئەویش سوارێکی باشە).[4]

تەبەرانی لە بەرائی کوڕی عازبەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی دەکرد کە حەسەن و حوسەین یان یەکێکیان هات و چوویە سەر پشتی تا سەری بەرز کردەوە بە دەستی گرتی یان هەردووکیانی گرت و فەرمووی(نعم المطيّة مطيتكما)واته(بەڕاستی وڵاخەکەتان باشە).[5]

هەروەها لە جابرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و لەسەر دەست و پێی دەچوو حەسەن و حوسەین لەسەر پشتی بوون،

---

[1] – المنتخب ج٥، ص٢٢٢.

[2] – ضعيف.

[3] – لە(كنز العمال ج٧، ص١٠٦) دا هاتووە. لە(المجمع ج٩، ص١٨٢) دا هاتووە کە کەسەکانی سەنەدەکەی صەحین. وەك لە(المجمع) دا هاتووەو دەڵێت بەزار بە سەنەدی لاواز هێناویەتی. ئیبن شاهین هێناویەتی، وەك لە(كنز العمال) دا هاتووە.

[4] – لە(كنز العمال ج٧، ص١٠٤) دا هاتووە.

[5] – (هەیسەمی ج٩، ص١٨٢ دەڵێت سەنەدەکەی حەسەنە).

دەیفەرموو(نعم الجمل جملكما ونعم العدلان أنتما)واتە(وشترەکەتان وشترێکی باشەو ئێوەش ڕێك سواربوون باشن)[1].[2]

تەبەرانی لە سەلمانەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئێمە لە دەوری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین کە ئوم ئەیمەن هات و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) حەسەن و حوسەین ون بوون، دەڵێت لە گەرمەی ڕۆژدا بوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(قوموا فاطلبووا ابني) واتە(هەستن بگەڕێن بۆ کوڕەکانم) هەرکەسەو بەرەو لای خۆی چوو من بەرەو لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چووم تا لە لاپاڵی درەختێکدا بینیم و حەسەن و حوسەین باوەشیان کردبوو بەیەکداو مارێك لەسەر خۆی وەستابوو لە دەمیەوە گڕەی ئاگر دەباری. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خێرا چوو بۆی و ئەویش ڕوویکردە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەك قسەکەر، پاشان چوویە ناو هەندێ بەرد، پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لایان و لەبەریەکی جوودا کردنەوەو دەم‌وچاوی سڕین و فەرمووی(بأبي وأمي انتما ماأكرمكما على الله)(بە دایك و باوکمەوە بە قوربانتان بم لای خوا چەند ڕێزدارن) پاشان هەردووکیانی خستە سەر هەردوو شانی. وتم بەختتانە چەند جێگەتان خۆشە(چ سواریەکی باشتان هەیە؟) ئەویش فەرمووی(ئەوانیش سواری باشن و باوکیان لەخۆیان باشترە)[3].[4]

تەبەرانی لە جابرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین بانگکراین بۆ خواردنێ، حوسەین لە ڕێگەدا یاری دەکرد لەگەڵ منداڵانێکدا،

---

[1] – ضعیف.

[2] – (هەیسەمی ج٩، ص١٨٢ دەڵێت لە سەنەدەکەدا مەسروح ئەبوشهاب هەیە کە لاوازە).

[3] – ضعیف.

[4] – (هەیسەمی ج٩، ص١٨٢) دەڵێت لەسەنەدەکەدا ئەحمەدی کوڕی ڕاشدی هیلال هەیە کە لاوازە، تەبەرانی لە یەعلای کوڕی مورڕەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی. وەك لە(کنز العمال ج٧، ص١٠٧ دا هاتووە).

پێغەمبەر(ﷺ) پێشمان کەوت و دەستی کردەوەو ئەویش بەملاولادا ڕایدەکردو پێغەمبەریش(ﷺ) دەیخستە پێکەنین تا گرتی و یەکێ لە دەستەکانی خستە لای چەناگەی و ئەو دەستەکەشی لە نێوان سەرو گوێیدا داناو پاشان گرتیە کۆش و ماچی کردو فەرمووی(حسين مني وأنا منه، أحب الله من أحبه الحسن والحسين سبطان من الأسباط)واتە(حوسەین لەمنەو من لەوم، خوا ئەوەی خۆش بوویت کە خۆشی دەوێن، حەسەن و حوسەین دوو نەوە لە نەوکانن)[1,2].

## تێکەڵی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەبونەعیم لە الحلية ج١، ص١٠٦ لە ئەبو ئیسحاقی سوبەیعیەوە هێناویەتی دەڵێت: ژنەکەی عوسمانی کوڕی مەزعون هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و شێوە ناشرین لەبەرگێکی شڕۆڵدا، پێیان وت بۆچی وایت؟ وتی شەو شەونوێژو ڕۆژ بەڕۆژووە. پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵەکەی بیست و گەیشت بە عوسمان و سەرکۆنەی کردو فەرمووی(ئایا من پێشەنگ نیم بۆت؟) وتی: با، خوا بمکاتە قوربانت، ژنەکەی دوای ئەوە جوان و بۆنی خۆش بوو، کاتێ عوسمان مرد ژنەکەی وتی:

یاعين جودي بدمع غير ممنون — علي رزيّة عثمان بن مظعون

على امرئ بات في رضوان خالقه — طوبى له من فقيد الشخص مدفون

طاب البقيع له سكني وغرقده — وأشرقت ارضه من بعد تفتين

وأورث القلب حزناً لا انقطاع له — حتى الممات فما ترقي له شوني

ئیبن سەعد ج٣، ص٣٩٤ لە ئەبو بوردەوە بەو واتایە هێناویەتی و عەبدوڕەزاق لە عروەوە بەو شێوەیە هێناویەتی، وەك لە(کنز العمال ج٨، ص٣٠٥ دا هاتووە)، بەڵام شعرەکانیان نەهێناوەو عروە ناوی ژنەکەی هێناوە خەولەی کچی حەکیم، دەڵێت ئەو ژنە

---

[1] – حسن.

[2] – لە(کنز العمال، ج٧، ص١٠٧ دا هاتووە).

چوو بۆ لای عائیشەو لە فەرموودەکەیدا هاتووە) (یاعثمان ان الرهبانیة لم تكتب علینا افما لك في اسوة حسنة؟ فوالله إنّ اخشاكم واحفضطكم لحدوده لأنا) واتە(ئەی عوسمان کەنارگیری(ڕەهبانیەت) لەسەرمان نوسراوە، ئایا من پێشەنگێکی باش نیم بۆت؟ بەخوا خاوەن ترس ترین و پارێزەرترینتان بۆ سنووری خوا منم.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١، ص٢٨٥ لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە هێناویەتی دەڵێت: باوکم ئافرەتێکی قوڕەیشی بۆ هێنام، کاتیّ ژنەکەی هات بۆ لام بە هۆی هێزی پەرستشی نوێژو ڕۆژووەوە گرنگیم پیّ دەدا، عەمری کوڕی عاص هات بۆ لای بووکەکەو پیّی وت: مێردەکەت چۆنە؟ وتی چاکترینی پیاوانە، یان چاکترین مێردەو نموونەی نییە لامان بەلادا ناکاتەوەو جێگەمان بەلادا ڕاناخات، ئەویش هات بۆ لامو قسەی لە ڕوودا کردمو وتی من ئافرەتێکی بەڕەچەڵەك قوڕەیشم بۆ هێناویت تۆش پشتگوێت خستووەو وادەکەیت، پاشان چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و شکاتی کردم. پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە شوێنمداو منیش چووم بۆ لای، پیّی فەرمووم(ئایا بە ڕۆژ بە ڕۆژوویت؟) وتم بەڵیّ، فەرمووی(لكني اصوم وأفطر، وأُصلي وأنام، وأمس النساء، فمن رغب عن سنتي فليس مني)واتە (شەویش بێداریت(شەونوێژ دەکەیت) وتم بەڵیّ. فەرمووی بەڵام من بە ڕۆژووش دەبمو بەربانگیش دەکەمەوە(ڕۆژووش دەشکێنم) نوێژ دەکەمو دەشخەوم، دەچمە لای ئافرەتان، هەرکەس لەسوننەتم لابدات لەمن نییە)) پاشان فەرمووی (اقرأ القرآن في كل شهر) واتە(هەموو مانگێك قورئان بخوێنە) وتم من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی(دەی لەهەموو ڕۆژێکدا بیخوێنە) وتم زیاتر لەوە دەتوانم، فەرمووی(دەی لە هەموو سیّ ڕۆژێکدا بیخوێنە) پاشان فەرمووی(لەهەر مانگێکدا سیّ ڕۆژ بە ڕۆژووبە) وتم زیاتر لەوە دەتوانم، بەردەوام بۆی زیاد دەکردم تافەرمووی(ڕۆژیّ

[1] - صحيح.

بەڕۆژووبەو ڕۆژێ ڕۆژوو مەگرە، چونکە ئەوە چاکترینی ڕۆژووەو ڕۆژووی داود(علیه السلام)ی برامە).

حوصەین لە فەرموودەیەکدا دەڵێت: پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ان لکل عابد شرة فترة فأما الی سنة وإما بووغة، فمن کانت فترته الی سنة فقد اهتدی ومن کانت فترته الی غیر ذلك فقد هلك) واتە(لەهەموو پەرستشارێك خاوبوونەوەیەك هەیە هەموو خاوبوونەوەیەك ماوەیەکی هەیە، جا هەرکەس ماوەکەی بەرەو سوننەتێك بێت، ڕێنموونی کراوە، هەرکەسیش بۆ جگە لەوە بێت قورپەسەر بووە)

موجاهید دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر کە پیرو لاواز بوو ڕۆژانێ ڕۆژووی دەگرت و دایدانەوە پاڵ یەك تابەوە خۆی بەهێز بکات، پاشان چەند ڕۆژێ پێکەوە ڕۆژووی نەدەگرت، هەروەها لە قورئان خوێندنیدا هەندێ جار زیادەو هەندێ جار کەمتری دەخوێند، بەڵام بە گشتی بەڵێنەکەی دەبردە سەر، یان بە حەوت ڕۆژ، یان بە سێ ڕۆژ تەواوی دەکرد، دواتر دەیوت: ئەگەر ڕێپێدانی پێغەمبەری خوام(ﷺ) قبووڵ بکردایە لام باشتر دەبوو لەوەی بۆی گۆڕیم، بەڵام من لەسەر شتێ جیابوومەتەوە حەزناکەم لێی لابدەم.[1]

بوخاری ج١، ص٢٦٤ لە ئەبو جوحەیفەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان سەلمان و ئەبودەرداو سەلمان سەردانی ئەبودەردای کرد، ئوم دەردای بینی خۆی زۆر شڕۆڵ و هیلاك کردبوو، وتی: چیتە؟ وتی ئەبودەردای برات لە دنیادا هیچ پێویستییەکی نییە، ئەبو دەردا هات و خواردنێکی بۆ ئامادە کرد، وتی بخۆ من بەڕۆژووم، وتی تانەخۆیت ناخۆم، لێی خوارد، کە شەو هات ئەبودەردا هەستا سەلمان وتی بخەوە، ئەویش خەوت، پاشان هەستا، ئەویش دەیوت بخەوە، بۆ کۆتایی شەو سەلمان وتی ئێستا هەستە، پێکەوە نوێژیان کرد، سەلمان پێی

[1]- (بوخاریش هێناویەتی بەتەنها. وەك لەصفه الصفوه ج١، ص٢٧١ دا بە هەمان شێوە بەدوورو درێژی هاتووە).

وت: خوا مافی هەیە بەسەرتەوە، دەروونت مافی هەیە بەسەرتەوە،ماڵو منداڵت مافیان هەیە بەسەرتەوە، دەی هەرکامەو مافی خۆیان پێبدە. هاتە لای پێغەمبەرو(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بۆ باسکرد، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(صدق سلمان)واتە(سەلمان ڕاست ئەکات).[1]

ئیبن سەعد ج٨، ص٢٥٠ لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە هێناویەتی دەڵێت: زوبەیر منی هێناو لەزەویدا هیچ سامانی نەبوو مەملوكو کۆیلەشی نەبوو، جگە لە ئەسپەکەی هیچی نەبوو. منیش ئاڵفم دەدا بەئەسپەکەیو پێویستی خۆیم دابین دەکردو بەڕێوەم دەبرد، ئاڵفم دەدا بە ئاژەڵەکەیو ئاوم پێدەداو کونە گەورەکەیم دەدوورییەوەو هەوریرم دەشێلاو نانم جوان نەبوو، دراوسێیانێکی پشتیوانانم کە ئافرەتانی ڕاستگۆ بوون، نانیان بۆ دەکردم، منیش دەنکەم لەزەوی زوبەیردا دەگواستەوە(ئەو زەوییەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆی بڕیبووەوە) دەمخستە سەرسەرمو نزیکەی دوو لە سێ‌ی فەرسەخێ دەبوو. ڕۆژێ هاتمەوەو لەسەر سەرم دانابوو گەیشتم بەپێغەمبەرو(صلى الله عليه وسلم) هەندێ لە هاوەڵانی لەگەڵدابوو، بانگی کرد بۆمو پاشان فەرمووی(أخ أخ) تا لە پیشتیەوە سوارم بکات، منیش شەرمم دەکرد لەگەڵ پیاوان بچم، باسی زوبەیرو غیرەیم کرد، چونکە لە هەمووان غیرەی زیاتر بوو. پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زانی شەرم دەکەم، چوو منیش چووم بۆ لای زوبەیرو وتم پێغەمەبەری خوام(صلى الله عليه وسلم) پێگەیشتو ئەوەم لەسەر سەر بوو دەستەیەکی هاوەڵانی لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بوون، وڵاخەکەی وەستاند تا لەگەڵیدا سواربم، منیش شەرمم کردو بیری غیرەی تۆم کردەوە. وتی بەخوا هەڵگرتنی کۆڵەکەت لام قورستر

---

[1]- ئەبونەعیم( لەالحلیە ج١، ص١٨٨ لەئەبو جوحەیفەوە بە هەمان شێوە لەگەڵ زیادەیەکدا هێناویەتی، ئەبویەعلا هێناویەتی، وەك لە کنز العمال ج١، ص١٣٧ دا هاتووە. ترمزیو بەزارو ئیبن خوزەیمەو دارقوتنیو تەبەرانیو ئیبن حبان هێناویانە وەك لە فتح الباری، ج٤، ص١٥١ دا هاتووە. ئیبن سەعد ج٤، ص١٨٥ بە چەند دەقێکی جیاجیا هێناویەتی).

بوو لەوەی لەگەڵیدا سوار بیت، دوای ئەوە ئەبوبەکر خزمەتکارێکی بۆ ناردمو لە بری من ئەسپەکەی دەبردو سەرپەرشتی دەکرد، وەك ئەوەی منی ئازاد کردبێت وابوو.[1]

هەروەها لە ج٨، ص٢٥١ دا لە عیکرمەوە هێناویەتی ئەسمای کچی ئەبوبەکر لای زوبەیر بوو، زوبەیر زۆر لەسەری توند بوو، ئەویش لای باوکی شکاتی ئەوەی لاکرد، ئەبوبەکر وتی کچی شیرینم خۆ ڕاگربە، چونکە ئافرەت ئەگەر مێردێکی صاڵحی هەبوو لە لای مرد دوای ئەوە هاوسەرگیری نەکرد لە بەهەشتدا پێکەوە دەبنەوە(دەگەنەوە بەیەك).

تەیاسی و بوخاری لە مێژووەکەیداو حاکم لە(الکنی) لە کەهمەسی هیلالیەوە هێناویانە دەڵێت: لای عومەر بووم کە دانیشتبووین لە لای، ئافرەتێك هات و لە لای دانیشت و وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مێردەکەم خراپەی زۆرو چاکەی کەمە. ئەویش پێ‌ی وت مێردەکەت کێیە؟ وتی ئەبوسەلەمە، وتی ئەو کەسێکە هاوەڵ بووەو کەسێکی ڕاستگۆیە، پاشان عومەر بە کەسێکی لای خۆی وت مەگەر وانییە؟ وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران هەر وای دەبینین، بەکەسێکی وت: هەستە بانگی بکە بۆم، ژنەکە هەستا کاتێ عومەر ناردی بەدوای مێردەکەیدا لەپشت عومەرەوە دانیشت و هێندەی نەبرد پێکەوە هاتن لەبەردەم عومەردا دانیشت، عومەر وتی: ئەم ئافرەتەی لەپشتمەوە دانیشتووە چی دەڵێت؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەو ئافرەتە کێیە؟ وتی: ژنەکەت، وتی چی دەڵێت؟ وتی دەڵێت خێرت کەمو خراپەت زۆر بووە، وتی بەڕاستی خراپی وتوە ئەی ئەمیری باوەڕداران، لەناو ژنەکانمدا لە هەموویان چاکتر دەپۆشێت و خۆشگوزەرانی زیاترە، بەڵام مێردەکەی پیر بووە، عومەر بە ژنەکەی وت چی دەڵێیت؟ وتی ڕاست ئەکات، عومەر بە گۆچان هەستا بۆی و خستیە سەر سەری و وتی ئەی دوژمنی خۆت سامانی دەخۆیت و گەنجی دەفەوتێنیت پاشان دێت هەواڵێ دەدەیت کە تیایدا نییە، وتی ئەی ئەمیری

[1] - صحیح.

باوەڕداران پەلە مەکە بەخوا ئیتر نایەمە ئەم کۆڕە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد سێ جلی بدەنێ، وتی ئەمە ببە لەسەر ئەوەی بەرامبەرت کردم، ویاربە سکاڵات لەسەر ئەم پیرە نەبێت، دەڵێت سەیرم دەکرد ژنەکە هەستاو جلەکانی پێبوو، پاشان عومەر ڕویکردە مێردەکەی و وتی: ئەوەی بینیت لە ڕوویدا نواندم وات لێ نەکات خراپەی لە ڕوودا بنوێنی، وتی واناکەم، ئینجا هەردووکیان چوون، پاشان عومەر وتی: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(أُمتي القرن الذي انا منهم ثم الثاني والثالث ثم ينشأ قوم يسبق ايمانهم شهادتهم يشهدون من غيرا أن يستشهدوا، لهم لغط في أسواقهم)واتە(ئوممەتەکەم سەدەیەکە من تیایاندام، دواتر دووەمو سێیەم، پاشان کەسانێ دێن سوێندیان پێش شایەتیان دەکەوێت، بەبێ ئەوەی داوای شایەتیان لێ بکرێت شایەتی دەدەن، لە بازاڕیاندا چەند ئاوازێ هەیە).[1]

ئیبن سەعد لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: ژنێ هات بۆ لای عومەر کوڕی خەتتاب وتی: سکاڵای کەسێکت لادەکەم کە چاکترینی دنیایە، بەڵام کەسێك بە کارێك پیشکەوتووە یان وەك کارەکەی ئەوی دەکرد شەو هەڵدەستێ تا بەیانی و ڕۆژ تا ئێوارەش بە ڕۆژو دەبێت، پاشان شەرم دایدەگرێت، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران لێم ببوورە، وتی: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە، جوان وەسفت بکات، لێت خۆش بووم، کە چوو کەعبی کوڕی سوور وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران سکاڵام بۆ هێناویت. وتی: سکاڵاکە چییە؟ وتی: مێردەکەی، وتی: من دەزانم ئەو ژنە، بە کەعبی وت: دادوەری نێوانیان بکە، وتی: من دادوەری بکەمو تۆ شاهید بیت؟ وتی: تۆ بیرت دەچێ بۆ شتێ کە من بیرم بۆی نەچووە، وتی خوا دەفەرمووێت ﴿فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ﴾ سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرەو ڕۆژێ لای ڕۆژوو مەگرە، سێ شەو شەونوێژ بکەو شەوێ لە لای بمێنەوە.

---

[1]- (ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدەکەی بەهێزە. لەکنز العمال ج٨، ص٣٠٣ دا واهاتووە. ئەبوبەکری کوڕی عاصمیش هێناویەتی، وەك لە الاصابە ج٤، ص٩٣ دا هاتووە).

عومەر وتی: ئەمەم لەیەکەم لام سەرسوڕهێنەرتر بوو، بۆیە وەك دادوەر ناردی بۆ لای خەڵکی بەسرە.

یەشکری لەشوعەیبەوە بەو واتایە بە دوورو درێژی لێوەی هێناوەو تیایدا هاتووە: عومەر پێی وت: ڕاستم پێ بڵێ و حەق کێشەی نییە، ئەویش وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران من ئافرەتێکم و ئەو حەزەم هەیە کە ئافرەتان هەیانە. عەبدوڕەزاق لەقەتادەوە هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێك هات بۆ لای عومەر وتی: پیاوەکەم بەشەو شەونوێژو بە ڕۆژ ڕۆژوو دەگرێت، وتی: ئایا فەرمانم پێدەکەیت ڕێی لێ بگرم شەونوێژ بکاتو ڕۆژوو بگرێت؟ ژنەکە چوو دواتر ئەوەی دووبارە کردەوەو ئەویش هەمان شتی پێ وتەوە. کەعبی کوڕی سوور وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران هەموو چوار شەوێك یەك شەو هەر چوار ڕۆژێك یەك ڕۆژ بۆ ئافرەتەکە، عومەر مێردەکەی بانگکردو فەرمانی پێکرد لە چوار شەودا شەوێك لە چوار ڕۆژدا ڕۆژێك ڕۆژو بشکێ و لای ژنەکەت بێت.[1]

ئیبن جەریر لە ئەبو غەرزەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەستی ئیبن ئەرقەمی گرتو بردی بۆ لای ژنەکە وتی ئایا ڕقتە لێم؟ وتی: بەڵێ، ئیبن ئەرقەم بە ئەبو غەرزەی وت بۆچی واتکرد؟ وتی: قسەی خەڵکی لەسەرم زۆرە، ئیبن ئەرقەم هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب و بۆی باسکرد، ئەویش ناردی بەدوای ئەبوو غەرزەدا وتی: بۆچی واتکرد؟ وتی: قسەی خەڵکم لەسەرە، ناردی بەشوێن ژنەکەیدا، ئەویش هات بۆ لایو پورێکی ناباشی هەبوو، وتی ئەگەر پرسیاری لێکردیت بڵێ سوێندی لێ داوا کردووم بۆیە حەزناکەم درۆ بکەم، عومەر پێی وت

---

[1] – ( لەکنز العمال ج٨، ص٣٠٧-٣٠٨ دا واهاتووە).ئەبن ئەبی شەیبە لە ڕێگەی ئیبن سیرین و زوبەیری کوڕی بەکار لە(الموفقيات) لە ڕێگەی موحەمەدی کوڕی مەعن و ئیبن دورەید لە(الأخبار المنشورە) لە ئەبوحاتەمی سجستانی لە ئەبوعوبەیدەوە بەچەند ڕێگەیەك هاتووە، (لەالاصابە ج٣، ص٣٥١ دا واهاتووە).

بۆچی واتکرد؟ ژنەکەی وتی سوێندی لێ داوا کردووم و حەزناکەم درۆ بکەم، عومەر وتی: بەڵێ، با هەرکامتان(ئێوەی ئافرەتان) درۆ بکەن و خۆ جوان بکەن، هەمووماڵەکان لەسەر خۆشەویستی بنیاد نانرێن، بەڵام تێکەڵی و پێکەوە بوون لەسەر حەسەب و ئیسلام هەیە.[1]

وەکیع لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویەتی دەڵێت: عاتیکەی کچی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی توفەیل لای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری صدیق بوو، ئەو زۆر عاتیکەی خۆشدەویست و باخێکی بۆ دانابوو لە بەرامبەری ئەوەی دوای خۆی شوونەکاتەوە. لە ڕۆژی تائیف تیرێکی لێدراو پاش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە چل ڕۆژ ئەویش مرد، عاتیکی لاواندیەوە وتی:

وآليتُ لاتنفك عيني سخينة علیك ولاينفك جلدي اغبرا
مدى الدهر ماغنّت حمامة أيكة وما ترد الليل الصباح المنوّرا

عومەری کوڕی خەتتاب چوویە داوای، ئەویش وتی(مێردی جارانم) باخێکی پێداوم لە بەرامبەر ئەوەی شوو نەکەم، ئەویش وتی دەی بڕۆ ڕا وەربگرە. عاتیکە ڕای عەلی کوڕی ئەبوتالیبی وەرگرت، عەلی وتی باخەکە بگێڕەرەوە بۆ خاوەنەکەی و شوو بکە، عومەر هێنای وچەند هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) لەوانە عەلی کوڕی ئەبو تالیب کە برای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر بوو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، عەلی بەعومەری وت: مۆڵەتم بدە با قسە لەگەڵ عاتیکە بکەم، وتی ئەی عاتیکە

وآليتُ لاتنفك عيني سخينة علیك ولاينفك جلدي اصفرا

عومەر وتی: خوا لێت خۆش بێت کەس و کارم لێ مەوروژێنە.[2]

---

[1] – ( لەکنز العمال ج٨، ص٣٠٣ دا واهاتووە).

[2] – ( لەکنز العمال، ج٨، ص٣٠٢ دا واهاتووە.ئیبن سەعد بە سەنەدی حەسەن لەیەحیای کوڕی عەبدوڕەحمانی موڕی خاتبەوە بە کورتی هێناویەتی، وەك لە الأصابة ج٤، ص٣٥٦ دا هاتووە).

عەبدوڕەزاق لـە نەدیـەی مـەولای مەیمونـەوە هێناویـەتی دەڵێت: چووم بۆ لای ئیبن عـەبباس و مەیمونە ناردمی بۆ لای، ئیبن عـەبباس لەماڵدا بـوو دوو ڕاخـەر لە ماڵیدا هەبوو، هاتمەوە بۆ لای مەیمونەو وتم وادەبینم ئیبن عـەبباس دووری گرتـووە لـە ژنەکـەی. مەیموونـە نـاردی بـۆ لای کـچی سـەرجی کینـدی ژنـی ئـیبن عـەبباس پرسیاری لێکرد، ئەویش وتی دووری گرتووە لەنێوان من و ئەودا نییە، بەڵام من لـە حـەیزدام، مەیمونـە نـاردی بـۆ لای ئـیبن عـەبباس و پـێی وت ئایـا لـە سـوننەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لادەدەیت، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەچوو بۆ لای ژنەکانی لە کاتی حەیزدا. ئافرەتەکەش پارچە پەڕۆیەکی بەسەرەوە دەبوو لە ئەژنۆیەوە تانیوەی ڕان.[1]

بوخاری لە الأدب المفرد، ص٤٩ لـە عکرەوە هێناویـەتی دەڵێت: نـازانم کامیـان نـانی بـۆ ئـەوی دیکـە سـازدەکرد، ئـیبن عـەبباس یـان ئامۆزاکـەی، کـەنیزەکێ لـە بەردەستیاندا ئیشی دەکرد کە یەکێکیان پـێی وت: ئەی زیناکـەر، ئیبن عـەبباس پـێی وت ڕاوەسـتە ئەگـەر لـە دنیـادا حـەددت لێ نـەدرێت لـە ڕۆژی دواییـدا لێـت دەدرێت، وتی: ئەی ئەگەر وابوو؟ وتـی خـوا داوێن پـیس و داوێن پیسکاری خۆش ناوێت، ئیبن عەبباس ئەم قسەی کۆتایی کرد[2].

ئیبن عەبباس لە ئەبو عمرانی فەلەستینیەوە هێناویەتی دەڵێت: ژنەکەی عەمری کوڕی عاص سەری دەچنی کە کەنیزەکێکی خۆی بانگکرد، ئەویش هێواشی نواند، ژنەکەش وتـی ئەی زیناکـەر. عـەمر وتـی: بینیوتـە زینـا بکات؟ وتـی: نـا، وتـی دەی بـەخوا لـە ڕۆژی دواییـدا لەسـەری هەشـتا جەڵـدت لێ دەدرێـت. ژنەکـەش بـە کەنیزەکەکەی وت و لێی پاڕایەوە تا لێی خۆش بێت، ئەویش لێی خۆش بوو، عـەمر

---

[1] - وەك لە(کنز العمال ج٥، ص١٣٨) دا هاتووە.

[2] - صحیح.

پێی وت: چۆن لێت خۆش نەبێت لە کاتێکدا لە ژێر دەستی تۆدایە، دەی ئازادی بکە، ئەویش وتی لەسەر ئەوە پاداشت هەیە؟ وتی: بەڵکو.[1]

ئەبو نەعیم لە الحلية ج١، ص٣٨٤ دا لە ئەبو متەوەکیلەوە هێناویەتی ئەبوهورەیرە زنجیەکی هەبوو کە بە کارەکانی بێزاری کردبوو، ڕۆژێ ئەبو هورەیرە قامچیەکی لێ بەرز کردەوەو وتی: ئەگەر تۆڵەسەندنەوە نەبووایە بەمە لە هۆش خۆتم دەبردیت، بەڵام دەتفرۆشم بە کەسێ نرخەکەتم بداتەوە. بڕۆ تۆ بۆ خوایت(لە ڕێی خوادا ئازادیت).

ئەبو عوبەیدو ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵلای کوڕی قەیس یان ئیبن قەیسەوە هێناویانەو دەڵێت: من لەوانەبووم کە لەگەڵ ئەبو بورەیدە عومەرم بینی لە کاتی هاتنی بۆ شام، عومەر دەڕۆیشت کە ڕمبازێنانی ناوچەی(ئەزروعات) بە شمشێرو ڕمەوە هاتن بە دەمیەوە، ئەویش وتی بەسە، بیانگێڕنەوەو ڕێیان پێ مەدە. ئەبو عوبەیدە وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمە باوی عەجەمە، ئەگەر ڕێیان نەدەیت وادەزانن بەڵێنیان دەشکێنیت. عومەر وتی لە گوێڕایەڵی ئەبوو عوبەیدەدا وازیان لێ بهێنن.[2]

محاملی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی عومەر لەگەڵ زوبەیر کێبەرکێی کرد، زوبەیر پێشی کەوت، وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە پێشت کەوتم، پاشان جارێکی تر عومەر کێبەرکێی لەگەڵ کردو پێشی کەوت، عومەر وتی سوێند بە پەروەردگاری کەعبە پێشت کەوتم.[3]

ئیبن ئەبی شەیبە لە(الجامع) لەسەلیمی کوڕی حەنزەلەوە هێناویەتی دەڵێت: هاتین بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب تا لە لای قسەبکەین، کە هەستا لەگەڵی

---

[1] – ( لەکنز العمال ج٥، ص٤٩٨ دا واهاتووە).

[2] – ( لەکنز العمال، ج٧، ص٣٣٤ دا واهاتووە).

[3] – ( لەکنز العمال ج٧، ص٣٤٤ دا واهاتووە).

هەستاین و دەچووین عومەر پێی گەیشت و وتی: ئایا نابینیت ئاشوبە بۆ شوێنکەوتەو زەلیلیە بۆ شوێنکەوتوو.[1]

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١، ص٢٠٣ دا لە ئەبولبووختەریەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای سەلمان(رضي الله عنه) وتی: خەڵکی ئەمڕۆ چەند چاك دەکەن! من سەفەرم کردووە بەخوا کەسیان وەك ئیبن ئوبەی نەبوون، پاشان وتی لە چاکەو نەرمییان ئەوەیە دەڵێن: برازا گیان ئەوە بزەو خۆشی ئیمانە، ئایا نابینیت ئاژەڵ کە بارەکەی دەنێیتە سەر خێرا دەیبات، ئەگەریش هیواشی پێبکەیت دەوەستێ و خاوو خلیچکی دەنوێنێت.

موسەددەدو ئیبن مونیع و دارمی لە حەییەی کچی ئەبوو حەییەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك لە(الظهیرة) هات بۆ لام، وتم ئەی بەندەی خوا چیت دەوێت؟ وتی من و هاوڕێیەکم بە دوای وشترێکماندا هاتووین، هاوەڵەکەم چووە دەگەڕێت و منیش لە ژێر سێبەردام و دەخۆمەوە. وتی: منیش چووم کەمە شیرۆکەیەکم(شیر) هێنا کە مەیی بوو، هەندێکیم بۆ هێناو وتم ئەی بەندەی خوا تۆ کێیت؟ وتی: ئەبوبەکر. وتم هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە لەسەری شتم بیستووە؟ وتی: بەڵێ، منیش باسی غەزای خەثعەمم بۆ کرد کە لە سەردەمی نەفامیدا هەبوو چۆن دەماندا لە یەکدی و دواتر خوا چ هۆگرییەکی هێنا بۆمان. وتم: ئەی بەندەی خوا تاکەی خەڵکی بەوجۆرە دەبن؟ وتی: تا پێشەواکان ڕێك بن، وتی: نابینیت گەورەیەك لە شوێنێ بێت ئایا شوێنی دەکەون و گوێڕایەڵی دەبن؟ دەی ئەوانە ڕێك نەوەستاون. ئیبن کەثیر دەڵێت سەنەدەکەی حەسەنی جەییدە.[2]

یەعقووبی کوڕی سوفیان و بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە حارثی کوڕی موعاویەوە هێناویانە چوو بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) و پێی وت: خەڵکی شامت چۆن بەجێهێشت؟ ئەویش باری ئەوانی بۆ باسکردو ئەویش سوپاسی خوای کردو پاشان وتی: لەگەڵ بێباوەڕاندا دانیشتن؟ وتی: نا، ئەی ئەمیری باوەڕداران، وتی:

---

[1] – ( لەکنز العمال ج٨، ص٦١ دا واهاتووە).

[2] – ( لەکنز العمال ج٣، ص١٦٢ دا واهاتووە).

ئەگەر لەگەڵیاندا دابنیشتنایە نان و ئاوتان لەگەڵ دەخواردن، تا ئەوە نەکەن لە خێردان.[1]

ئیبن ئەبی حاتەم لە عیاضەوە هێناویەتی عومەر(خوای لێ ڕازی بێت) فەرمانی کرد بە ئەبو موسای ئەشعەری تاچی وەرگرتووەو بەخشیوە لەیەك پارچە پێستەدا بۆی بێنێ(لە نوسراوێکدا) ئەویش نوسەرێکی مەسیحی هەبوو، ئەوەی بۆ بەرزکردەوە(بۆی نووسی و بۆی نارد) عومەر(رضي الله عنه) سەری سوڕماو وتی ئەمە زۆر پارێزەرە. ئایا تۆ لە مزگەوتدا نامەیەکمان بۆ دەخوێنێتەوە کە لە شامەوە هاتووە؟ ئەویش وتی ناتوانێت؟ عومەر وتی مەگەر لەشی گرانە؟ وتی نا، بەڵکو مەسیحییە، ئەویش سەرکۆنەی لەڕوودا نواندم و دای لە ڕانم و پاشان وتی دەری بکە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾.[2]

---

[1] – (لەکنز العمال ج٢، ص٣٠٠ دا واهاتووە).

[2] – لەتە فسیری ئیبن کەسیر، ج٢، ص٦٨ دا واهاتوووە.

# (خواردن و خوادرنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی)

بوخاری و موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز ڕەخنەی لە خواردنێ نەدەگرت، ئەگەر حەزی لێ نەبووایە دەیخوارد ئەگەرنا دەکشایەوە دواوە.[1]

ئیبن عەساکیر لە عەلیەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت: خۆشترین بەشی مەڕ لای پێغەمبەر(ﷺ) باڵەکانی بوو.[2]

ترمذی لە(الشمائل ص١٢) لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەباڵەکان بوو، دەڵێت ژەهریش کرایە ناو باڵەوە بۆی و پێی وابوو جولەکە ئەوەیان کرد،[3] هەروەها لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ ماڵمان، ئێمەش مەڕێکمان بۆ سەربڕی. دەڵێت: وەك ئەوەی زانیبێتتان ئێمە حەزمان لە گۆشتە، دەڵێت لە فەرموودەکەدا چیرۆکێك هەیە.[4]

هەروەها لە ئەنەسەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لە کولەکە بوو، خواردنێ هێنرا یان خواردنێکی بۆ بانگ کرا، منیش بۆی گەڕام و دەمخستە بەردەستی، چونکە دەمزانی حەز لێ دەکات، هەروەها لێوەی هێناوە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ نانی دەخوارد سێ پەنجەکەی دەلێسایەوە.[5]

ئیبن نەجار لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر زەوی نانی دەخواردو مەڕی دەدۆشی و دەچوو بەدەم میوانداری کۆیلەیەکیشەوە با نانی جۆشی هەبوایە.[6]

---

[1] – (لەالبدایە والنهایە ج٦، ص٤٠ دا واهاتووە).

[2] – ( لەکنز العمال ج٤، ص٣٧ دا هاتووە).

[3] – صحیح.

[4] – صحیح.

[5] – صحیح.

[6] – (لەکنز العمال ج٤، ص٤٤ دا واهاتووە).

ئیبن عەساکیر لە یەحیای کوڕی ئەبوکەسیرەوە هێناویەتی دەڵێت: سەعدی کوڕی عوبادە ڕۆژانە تەشتێکی تریتی دەنارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، لەماڵی هەر خێزانێکی بوایە بۆ ئەوێی دەنارد[1،2].

ئیبن جەریر لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: شیری مەڕم هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش لە شیرەکەی خوارد، پاشان ئاوێکی هەڵگرت و دای بەناو دەمیداو فەرمووی(ان له دسما)واتە(بە ڕاستی چەوری هەبوو)[3،4].

ئەبو یەعلا لە ئەبوبەکری صدیقەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە شوێنێ دابەزی و ژنێك لەگەڵ کوڕێکدا مەڕێکی بۆ نارد، پاشان فەرمووی(انطلق به الی اُمّك)واتە (بیبە بۆ لای دایکت) ئەویش لێی خواردەوە تا تێری خواردەوە. پاشان مەڕێکی دیکەی بۆ هێنا دۆشی، پاشان ئەبوبەکر خواردیەوە، ئینجا مەڕێکی تری هێناو دۆشی و ئینجا خۆی خواردیەوە[5،6].

سەعیدی کوڕی مەنسوور لە ئیبراهیمەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خواردن و خواردنەوەو دەستنوێژی و شتی لەوجۆرە دەستی ڕاستی بەکارهێناو بۆ خۆپاککردنەوەو لووت پاککردنەوەو شتی لەو جۆرە دەستی چەپی بەکاردەهێنا.[7]

ئەبونەعیم لە جەعفەری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی حەکەمی ڕافعەوە هێناویەتی دەڵێت: حەکەم منی بینی و من منداڵ بووم و لەوێ و لەوێوە دەمخوارد، وتی منداڵ

[1] – صحیح.

[2] – ( لەکنز العمال ج٤، ص٣٧ دا هاتووە).

[3] – صحیح.

[4] – (لەکنز العمال ج٤، ص٣٧ دا واهاتووە).

[5] – ضعیف.

[6] – ( لەکنز العمال ج٤، ص٤٤ دا واهاتووە).

[7] – (لە کنز العمال ج٨، ص٤٥ دا واهاتووە).

بەوجۆرە مەخۆ شەیتان وادەخوات. پێغەمبەر(ﷺ) کە نانی دەخوارد پەنجەکانی لەوەی ژێر دەستی ئەولاتر نەدەبرد.[1]

ئیبن نەجار لە عەمری کوڕی ئەبوسەلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نانم خواردو لە گۆشتی دەوری قاپەکەم هەڵدەگرت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(کل مما یلیك)واتە(لەبەردەم خۆتەوە بخۆ).[2]

ئەحمەدو ئەبوداودو نەسائیو ئیبن قانعو تەبەرانی حاکمو جگە لەویش لە ئومەیەی کوڕی مخشیەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) هێناویانە کەسێکی بینی نانی دەخواردو(بسم الله لەسەرەتاو لە کۆتاییەوە) پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنیو فەرمووی(والله مازال الشیطان یأکل معك حتی اذا شمیت فما بقي في بطنه شئ الا قاءه) (سوێند بەخوا بەردەوام شەیتان لەگەڵتدا دەیخوارد تا بسم اللەت کرد هیچ لەسکیدا نەما جگە لە ڕشانەوەکەی) لەدەقێکدا تا ناوی خوات هێنا چی لە سکیدا بوو هەمووی هێنایەوە.[3][4]

نەسائی لە حوزەیفەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت: لای پێغەمبەر(ﷺ) بووین کە لە گانێ هێنراو دانرا، پێغەمبەر(ﷺ) و ئێمەش وامانکرد، تاپێغەمبەر(ﷺ) دەستی دانەنایە دەستمان دانەدەنا. دەشتەکیەك هات دەتوت ڕاونراوە هەڵمەتی برد بۆ لەگانەکە، تا لێی بخوات، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرت، ئافرەتێ هات دەتوت پاڵی پێوە دەنێنو ویستی دەست بخاتە ناو خواردنەکە، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرتو فەرمووی(ان الشیطان لیستحل طعام القوم اذا لم یذکر اسم الله علیه وانه لما رآنا کففنا عنها جاءنا لیستحل به فوالله الذي لااله الا

[1] - ( لە کنز العمال ج٨، ص٤٦ دا هاتووە). (لەالصابە ج١، ص٣٤٤ دا دەڵێت: سەنەدەکەی لاوازە).

[2] - (لە کنز العمال ج٨، ص٤٦ دا هاتووە).

[3] - ضعیف.

[4] - ( لەکنز العمال ج٨، ص٤٥ دا واهاتووە).

هو إن يده في يدي مع يدها)واته(شەيتان لەخواردنی ئەو خەڵكە دەخوات كە ناوی خوای لەسەر نەيەت، كاتێ ئێمەی بينی دەستمان لێ هەڵگرت، هات بۆ لامان تا لێی بخوات، سوێند بەوەی هيچ پەرستراوێك نييە جگە لە ئەو دەستی لە دەستمدا بوو لەگەڵ دەستی ئەودا(ئافرەتەكە)[1][2].

ئيبن نەجار لە عائيشەوە هێناويەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەناو شەش كەسدا نانێكی خوارد دەشتەكيەك هات و لە نێوياندا دوو تيكەی خوارد. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەگەر ناوی خوای بهێنايە بەشی دەكردن، ئەگەر هەركامتان نانێكتان خوارد با ناوی خوای گەورە بهێنێت، ئەگەر بيری چوو بڵێ بەناوی خوا لە سەرەتاو كۆتاييەوە[3][4].

ئيبن ئەبی شەيبەو ئەبوو نەعيم لەعەبدوڵلای كوڕی بووسرەوە هێناويەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای باوكم و دابەزی، خواردنی خورماو ڕۆنی بۆ هێنرا، خواردی، خواردنەوەيەكی بۆ هێنا، لێی خواردەوەو دای بەوەی لای ڕاستيەوە بوو، ئەگەر خورمای بخواردايە بەوجۆرە ناوكەكەی دەگرت، بە پەنجە ئاماژەی كرد بۆ پێشەوەی. كە پێغەمبەر(ﷺ) سواربوو باوكم هەستاو ڕەشۆی ولاخەكەی گرت و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لای خوا نزامان بۆ بكە، فەرمووی(اللهم بارك لهم فيما رزقتهم واغفر لهم وارحمهم)واته(خوايە بەرەكەتيان پێ ببەخشيت لەوەی پێت بەخشيون و لێيان خۆشبەو ڕەحميان پێ بكە).

حاكم لێيەوە هێناويەتی دەڵێت: باوكم بە دايكمی وت: بۆچی خواردنێ ئامادە ناكەيت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەويش تريتێكی دروست كرد، باوكم چوو پێغەمبەری

[1] – صحيح.
[2] – (لە كنز العمال ج٨، ص٤٦ دا واهاتووە).
[3] – صحيح.
[4] – (لەكنز العمال ج٨، ص٤٧ دا واهاتووە).

خوای(ﷺ) بانگکردو پێغەمبەر(ﷺ) دەستی لەسەر ئاوەکەی داناو فەرمووی(خذوا بسم الله)واتە(بەناوی خواوە هەڵبگرن) ئەوانیش لە لاکانیەوە لێیان هەڵگرت، کە نانیان خوارد پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اللهم اغفر لهم وارحمهم وبارك لهم في رزقهم)[1][2].

ئیبن ئەبی شەیبەو ئەبی دنیاو ئەبو نەعیم لە(الحلیە)و بەیهەقی لە ئیبن ئەعبەدەوە هێناویانە عەلی(خوای لێ ڕازی بێت) وتی ئەی ئیبن ئەعبەد دەزانیت مافی خواردن چییە؟ وتم چییە؟ وتی: (بسم الله اللهم بارك لنا فيما رزقتنا)( بڵێت بە ناوی خوا، خوایە بەرەکەت بخەرە ئەوەی پێت بەخشیوین) پاشان فەرمووی دەزانیت کە لێبوویتەوە سوپاسی چییە؟ وتم چییە؟ وتی بڵێت(الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا) (سوپاس بۆ ئەو خوایەی خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوین).[3]

ئەبو نەعیم لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: وریابن لە خواردن و خواردنەوەدا زۆرخۆر مەبن، چونکە بۆ لەش خراپ و ئاوکێش و بۆ نوێژ تەمبەڵکەرە. هەوڵ بدەن لە خواردن و خواردنەوەدا بەپێویست بخۆن، چونکە بۆ لەش باشترو دوورترە لە زیادەڕۆیی، خوا ڕقیەتی لە قەڵەوی زانا، هەرکەسیش هەرگیز بەهیلاکدا ناچێت تاکاتێ ئارەزووی بەسەر ئایینیدا زاڵ دەبێت.[4]

ئیبن عەساکیر لە ئەبو مەحزورەوە هێناویەتی دەڵێت: لای عومەری کوڕی خەتتاب دانیشتبووم کە صەفوانی کوڕی ئومەییە لەگانێکی هێناو لەبەردەستی عومەردا داینا. عومەر هەندێ خەڵکی هەژاری بانگکردو لە دەوری کۆبوونەوەو لەگەڵیدا نانیان خوارد، پاشان وتی لەمەدا خوای گەورە وابکات، بەخەڵکی کە

[1] - صحیح.

[2] - (لە کنز العمال ج٧، ص٤٧ دا واهاتووە).

[3] - (لەکنز العمال ج٨، ص٤٦).

[4] - (لەکنز العمال ج٨، ص٤٧ دا هاتووە).

ئامادەنین لەگەڵ هەژارەکانیان نان بخۆن، صەفوان وتی دەی بەخوا ئێمە وانین، بەڵام ناچارین خواردنی باش بەدی ناکەین تا لەگەڵیاندا بیخۆین.[1]

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص٣٠١) لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: بیستم ئیبن عومەر لە جەحفە دابەزی، ئیبن عامر کوڕی کریز بە نانکەرەکەی وت خواردنەکەت ببە بۆ ئیبن عومەر، ئەویش قاپێکی هێنا، ئیبن عومەر وتی داینێ، پاشان قاپێکی تری هێناو ویستی یەکەم قاپ لاببات، ئیبن عومەر وتی چییە؟ وتی دەمەوێت لایبەم، وتی وازی لێ بهێنە، ئەوی تری بکە بەسەردا، هەرجار قاپێکی دەهینا دەیکرد بەسەر ئەوی تردا، کۆیلەکە چوو بۆ لای ئیبن عامرو وتی ئەوە کەسێکی ڕەق و وشک و دەشتەکییە. ئیبن عامر پێی وت: ئەوە ئیبن عومەری گەورەتە.

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص٣٢٣) دا لە عەبدولحەمیدی کوڕی جەعفەر لە باوکیەوە هێناویەتی ئیبن عەبباس دانەی هەناری دەگرت و دەیخوارد، پێی وترا ئیبن عەبباس بۆچی وادەکەیت؟ وتی بیستوومە لەسەر زەویدا چی هەنار دێتە بەر بەدانەیەکی بەهەشتیە، بەڵکو ئەمەیان بێت.

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص٢٠٧) لە سالمی مەولای زەیدی کوڕی صوحانەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ مەولاکەمدا زەیدی کوڕی صوحان لە بازاڕدا بووم کە سەلمانی فارسی کۆڵێ خواردنی کڕیبوو دای لە لاماندا، زەید پێی وت: ئەی ئەبو عەبدوڵڵا ئەوە دەکەیت و هاوەڵی پێغەمبەری خواشی(ﷺ)؟ وتی: دەروون ئەگەر ڕۆزیەکەی بەدەست هێنا دڵنیا دەبێت و یەکلادەبێتەوە بۆ پەرستش و دوو دڵکەران لێی بێهیوا دەبن. هەروەها لە(ج١، ص٢٩٠) لە ئەبو عوسمانی نهدیەوە هێناویەتی سەلمانی فارسی وتی من حەزدەکەم لەبەری ڕەنجی دەستی خۆم بخۆم.

---

[1] – ( لەکنز العمال ج٥، ص٤٨ دا واهاتووە).

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص٣٨٤) دا لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پانزە خورمام هەبوو، بۆ پارشێو پێنج دانەم خوارد، ئێوارەش پێنج و پێنج دانەشم هێشتەوە.

ئیبن سەعد(ج٦، ص٢٣٧) لە قاسمی کوڕی موسلیمی مەولای عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی(خوای لێ ڕازی بێت) داوای خواردنەوەیەکی کرد، منیش جامێ ئاوم بۆ برد، فووم بەسەردا کرد، گێڕایەوەو ئامادەنەبوو بیخواتەوەو وتی خۆت بینۆشە.

## (جلو بەرگی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان)

ئیبن سەعد لە عەبدوڕەحمانی ئەبو لەیلاوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب بووم وتی ئەبوقاسمم بینی کە جبەیەکی شامی دوو قۆڵ تەسکی لەبەردا بوو.[1]

ئیبن سەعد(ج٤، ٣٤٦) لە جوندوبی کوڕی مکیثەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر وەفد بهاتایە بۆ لای جوانترین جلەکانی دەپۆشی و فەرمانی بە گەورە هاوەڵانی دەکرد وابکەن. بینیم ڕۆژێ کە وەفدی کیندە هاتن پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبەکر عومەریش بەرگێکی یەمەنیان لەبەربوو.[2]

ئیبن ئەبی شەیبەو ترمذی لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە هێناویانە عوسمانی کوڕی عەففان تا نیوەی قوولەکانی بەرگی دەپۆشی و دەیوت بەرگی خۆشەویستم پێغەمبەر(ﷺ) وابوو[3].[4]

---

[1] – لە(کنز العمال ج٤، ص٣٧) دا هاتووەو دەڵێت سەنەدەکەی صەحیحە.

[2] – ضعیف.

[3] – صحیح.

[4] – (کنز العمال ج٨، ص٥٥).

ترمذی لە(الشمائل ص٩) لە ئەشعەسی کوڕی سەلیمەوە هێناویەتی دەڵێت: لە پورمم بیست کە لە مامیەوە هێناویەتی دەڵێت: من لە مەدینەوە دەچووم کەسێك لە دوامەوە فەرمووی(ارفع ازارك فأنه اتقى وأبقى)واتە (جلەکەت بەرز بکەرەوە، چونکە بۆ تەقوا باشترو بۆ مانەوە چاکترە) لامکردەوە سەیرم کرد پێغەمبەری خوایە(ﷺ). وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە عەبایەکی جوانو باشە، فەرمووی(ئایا من پێشەنگ نیم بۆت؟) سەیرم کرد جلەکانی لە نیوەی قولیدا بوو.

هەروەها لە ئەبوبووردەوە هێناویەتی دەڵێت: عائیشە جلێکی لبادو بەرگێکی ڕەقو وشکی لەبەردا بوو، وتی گیانی پێغەمبەر(ﷺ) لەم دوو بەرگەدا کێشرا.[1]

هەروەها لە(ص٥) لە ئوم سەلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: جوانترین جل لای پێغەمبەر(ﷺ) کراس بوو.

لەئەسمای کچی یەزیدەوە هێناویەتی دەڵێت: قۆڵی کراسی پێغەمبەر(ﷺ) تاسەر ئانیشکەکانی بوو،[2] لە جابرەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی فەتح چوویە ناو مەککەو مێزەرێکی ڕەشی لەسەر نابوو.[3]

لە عەمری کوڕی حوریسەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری بۆ خەڵك دەفەرموو مێزەرێکی ڕەشی لەسەربوو.[4]

لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری بۆ خەڵك دەفەرموو مێزەرێکی ڕەشباوی لەسەربوو، لە نافع لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە مێزەری دەبەست مێزەرەکەی لە نێوان شانەکانیدا شۆڕ

---

[1] - صحيح.
[2] - ضعيف.
[3] - صحيح.
[4] - صحيح.

دەکردەوە. نافع دەڵێت: ئیبن عومەر وای دەکرد، عەبدوڵڵا دەڵێت قاسمی کوڕی موحەمەدو سالمم بینی وایان دەکرد[1][2].

بوخاری‌و موسلیم لە عائیشەوە هێناویانە پرسیاری لێکرا لەسەر جێگەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لە پێستەیەك بوو کە ناوەکەی لیف بوو.[3]

حەسەنی کوڕی عرفە لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: ژنێکی پشتیوانان هات بۆ لام‌و جێگەکەی پێغەمبەری(ﷺ) بینی کە عەبایەکی دەقدراو بوو، ئەویش چوو ڕاخەرێکی بۆ هێنام ناوەکەی خوری بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لام‌و فەرمووی(ئەی عائیشە ئەمە چییە؟) وتم ئەی پێغەمبەری خوا فلأنە ژنی پشتیوانان هات بۆ لام‌و جیگەکەی بینیت‌و چوو ئەمەی بۆ ناردم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بیگێڕەوە، منیش نەمگێڕایەوەو حەزمکرد لە ماڵمدا بێت تا سێ جار ئەوەی لێ دووبارە کردمەوە، فەرمووی ئەی عائیشە بیگێڕەوە بەخوا ئەگەر بمویستایە خوای گەورە شاخی زێڕو زیوی لەگەڵدا بەڕێ دەکردم[4][5].

ترمذی لە(الشمائل) لە جەعفەری کوڕی موحەمەد لەباوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: پرسیارکرا لە عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت) ڕاخەری پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی تۆدا چی بوو؟ وتی: لە پێستەبوو ناوەکەی لیف بوو(گەڵای خورما).

پرسیارم کرد لە حەفسە ئەی لە ماڵی تۆدا ڕاخەری پێغەمبەر(ﷺ) چی بوو؟ وتی لە پێست بووو ناوەکەشی بەرگی خورما بوو،دوو دەق، لەسەری دەخەوت. شەوێك وتم با چوار دەقی بکەم بۆی باشتر بێ، چواردەقمان کرد کە بەیانی هات

---

[1] – صحيح.

[2] – لە الشمائل ص٩) دا واهاتووە.

[3] – ئیبن سەعد(ج١، ص٤٦٤) بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[4] – صحيح.

[5] – ئیبن سەعد(ج١، ص٤٦٥) لەعائیشەوە بەو شێوەیە هێناویەتی.

فەرمووی(مافرشتم لي الليلة؟) واتە(ئەمشەو چیتان بۆ ڕاخستم؟) وتمان هەر ئەوەی خۆت بوو، بەڵام چواردەقمان کرد وتمان بۆت باشترەو نەرمترە. فەرمووی(ردوه لحالته الأولى فأنه منعتني وطأته صلاتي الليلة)واتە(وەك یەکەمجاری لێ بکەنەوە، چونکە نەرمیەکەی نەیهێشت ئەمشەو نوێژ بکەم)[1].[2]

ئیبن سەعد لە(ج١، ص٤٦٥) دا لە عائیشەوە هێناویەتی، ئیبن موبارەك و تەبەرانی و حاکم و بەیهەقی و جگە لەویش لە عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی داوای جلی تازەی کردو لەبەری کرد، کە گەیشتنە لای ئەژنۆکانی فەرمووی(سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەم جلەی پێدام تا شەرمگەمی پێ دابپۆشم و لە ژیانمدا خۆمی پێ جوان بکەم) پاشان فەرمووی(والذی نفسي بيده مامن عبد مسلم يلبس ثوباً جديداً ثم يقول مثل ماقلت ثم يحمد الى سمل من اخلاقه التى وضع فيكسوه إنساناً مسلماً فقيراً لايكسوه الا لله لم يزل في حرز الله وفي ضمان الله وفي جوار الله مادام عليه منه سل واحد حيّا وميتا حيا ميتا حيا وميتاً) واتە(سوێند بەوەی گیانمی بە دەستە، هەر بەندەیەکی موسڵمان جلێکی تازە بپۆشێت پاشان ئەوە بڵێت کە من وتم پاشان بنەوێتەوەو ئەو جلانەی کە ریبردن و بیاندات بە کەسێکی موسڵمانی هەژار تەنها لەبەر خوا بیداتێ بەردەوام لە پەناو زامن و سایەی پەروەردگاردایە تا یەك تاڵە دەزووی لەسەربێ بەزیندوویی و مردوویی، بە زیندوویی و مردوویی، بە زیندوویی و مردوویی) بەیهەقی دەڵێت: سەنەدەکەی بەهێز نییە، ئیبن حەجەر بە حەسەنی داناوە[3].[4]

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایە والنهایە ج٦، ص٥٣ دا هاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – لە کنز العمال ج٨، ص٥٥) دا واهاتووە.

بەزار عوقەیلی و ئیبن عەددی و جگە لەوانیش لە عەلیەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویانە دەڵێت: لای پێغەمبەر(ﷺ) لە بەقیع لە ڕۆژێکی باراناویدا دانیشتبووم کە ئافرەتێ بەسواری گوێدرێژی لەگەڵ موکارێك بوو تێپەڕی و دای بەناو زەوییەکی کەندەڵاندا کەوتە خوارو پێغەمبەریش(ﷺ) ڕووی وەرچەرخاند، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەڕواڵی پێشیبوو، فەرمووی اللهم اغفر للمسرولات من أُمتي يأيهاالناس اتخذوا السراويلات فأنها من استر ثيابكم وحضوا بها نساءكم اذا خرجن)واتە (خوایە خۆش بە لەشەڕواڵ پۆشانی ئوممەتەکەم، ئەی خەڵکینە شەروال بپۆشن، چونکە پۆشەرترین جلتانە، بۆ ئافرەتەکانتان بەکاریان بێنن کاتێ دەچنە دەر)[1][2].

ئیبن مندەو ئیبن عەساکیر لە دحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبییەوە هێناویانە پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لای هرقل، کاتێ گەڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ) جلێکی قیبتی پێداو فەرمووی(اجعل صديعها قميصها واعط صاحبتك صديعاً تختمربه)واتە(پارچەیەك بکە بە کراسێك و پارچەیەك بدە بە ژنەکەت تا ڕووی پێ دابپۆشێت) کاتێ چوو پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردو فەرمووی(مرها تجعل تحته شيئاً لئلا يصف)واتە(بیبە شتێ لە ژێری دابنێ تادەرنەکەوێت).[3]

ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن سەعدو ئەحمەدو ڕەویانی و باوردی و تەبەرانی و بەیهەقی و سەعیدی کوڕی مەنسوور لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) جلێکی قیبتی چڕوپڕی پێدام لەوەی دحیەی کەلبی بە خەلات پێی دابوو، منیش کردمە بەری ژنەکەم و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(مالك لاتلبس

---

[1] – موضوع.

[2] – ئیبن جەوزی لە فەرموودە هەڵواسراوەکاندا هێناویەتی و نەیپێکاوە. فەرموودەکە لە چەند ڕێیەکەوە هاتووە. لە(كنز العمال ج٨، ص٥٥) دا هاتووە.

[3] – كنز العمال ج٨، ص٦١ .

القطيفة؟) واته(بۆچی مەگەر قەیفە ناپۆشیت؟) وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من کردمە بەری ژنەکەم، فەرمووی(فأمرها فلتجعل تحتها غلالة فأني أخشى ان تصف عضامها)واتە(فەرمانی پێبکە با تویژێکی لە ژێریدا دابنێ، چونکە من دەترسم ئێسکەکانی دەربکەون)[1].[2]

ئیبن موبارەك و ئەبو نەعیم لە(الحلية) لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: جلەکانم پۆشی و سەیری زیادەکەیم دەکردو لە ماڵدا دەهاتم و دەچووم و سەیری جلەکانم و درێژەو زیادەکەیم دەکرد، ئەبوبەکر هات بۆ لام و وتی عائیشە ئایا نازانیت ئێستا خوا سەیری ناکات؟ ئەبو نەعیم لە عائیشەوە هێناویەتی وتی: جارێك زرێ پۆشێکی نوێژم پۆشی و سەیرم دەکرد پێی سەرسام بووم، ئەبوبەکر وتی سەیری چی دەکەیت؟ خوا سەیری ناکات، وتم: بۆچی؟ وتی مەگەر نازانیت بەندە ئەگەر سەرسام بوو بەجوانی دنیا، خوا ڕووی لێ وەردەچەرخێنێ تا لەو جوانیە جیادەبێتەوە؟ منیش لامبردو بڕوام بەقسەکەی کرد. ئەبوبەکر وتی: بەڵکو بەوە تاوانت بسڕێتەوە.[3]

ئیبن سەعد لە عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبوو جەمیلی ئەنسارییەوە هێناویەتی دەڵێت جلەکەی عومەر(کراسەکەی) لە ئانیشکەکانی زیاتر نەدەچوون، لە بەدیلی کوڕی مەیسەرەوە دەڵێت ڕۆژێك عومەری کوڕی خەتتاب دەرچوو بۆ نوێژی هەینی و کراسێکی سەیلانی لەبەردابوو قۆڵەکەی درێژبوون، ئەگەر هەڵی نەکردنایە دەگەیشتنە سەر پەنجەکانی.

لەهیشامی کوڕی خالیدەوە دەڵێت عومەرم بینی لەسەرو ناوکیەوە جلی ڕادەگرن لەعامری کوڕی عوبەیدەی جاهیلییەوە دەڵێت پرسیارم کرد لە ئەنەس

---

[1] – حسن.

[2] – لە کنز العمال ج٨، ص٦٢ دا واهاتووە.

[3] – لە (کنز العمال ج٨، ص٥٤) دا واهاتووە دەڵێت: ئەمە حوکمی مەرفوعی هەیە.

سەبارەت بە(خذ) وتی خۆزگە خوا دروستی نەکردایە، هیچ کام لە هاوەڵانی پێغەمبەرم(ﷺ) نەدیوە نەیپۆشن جگە لە عومەرو ئیبن عومەر.[1]

هنادو ئیبن ئەبی دنیا لە مەسروقەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر ڕۆژێ هات بۆ لامان و جلێکی لۆکەی لەبەربوو، خەڵکی زۆر سەیریان کرد، ئەویش وتی:

لاشيء فيما يرى إلا بشاشته      يبقى الأله ويودى المال والولد

سوێند بەخوا دنیا لە چاو ڕۆژی دواییدا وەك تەپۆڵکەیەکی کەروێشك وایە.[2]

حاکم(ج٣، ص٩٦) لە ئەبوعەبدوڵلای مەولای شەدادی کوڕی هادەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففانم بینی لە ڕۆژی هەینی لەسەر مینبەر بوو جلێکی عەدەنی ڕەقی پۆشیبوو کە بەهاکەی چوار یان پێنج درهەم بوو، لەگەڵ ڕەبتەیەکی کوفیدا کە خۆشەکرابوو، گۆشتن و ڕیشی درێژو ڕووخسار جوان بوو.

تەبەرانی لە عەبدوڵلای کوڕی شەدادی کوڕی هادەوە بەوشێوە دەیهێنێت و سەنەدەکەی حەسەنە، وەك(هەیسەمی ج٩، ص٨٠) دەڵێت. هەروەها لەموسای کوڕی تەلحەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمان ڕۆژی هەینی خۆی دەدا بەسەر گۆچانێکدا، جوانترین کەس بوو، دوو جلی زەردی لەبەربوو لەگەڵ عەبایەکدا تادەهاتە سەر مینبەرو لەسەری دادەنیشت.[3]

ئبن سەعد(ج٣، ص٥٨) لە سەلیمی عامرەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففانم بینی کە عەبایەکی یەمانی سەد درهەمی پۆشیبوو، هەروەها لە(ج٣، ص٥٨) لە موحەممەدی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حارشەوە دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ژنەکانیان جلی زۆریان دەبرد لەوەی قایم و جوانکار بوو، پاشان دەیوت عوسمانم بینی جلێکی دوولا دیاری لەبەربوو کە نرخەکەی دوسەد درهەم بوو وتی ئەمەم بۆ فائیلە هێنا، من دەیپۆشم و دڵخۆشی دەکەم پێی.

[1] – (منتخب كنزالعمال ج٣، ص٤١٩) دا واهاتووە.

[2] – لە(المنتخب كنزالعمال ج٢، ص٤٠٥) دا واهاتووە.

[3] –هەیسەمی ج٩، ص٨٠) دەڵێت تەبەرانی لە میقدادی کوڕی داودی مامۆستایەوە هێناویەتی کە لاوازە.

ئەبونەعیم لە(الحلیة ج١، ص٨٢) لە زەیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی دەڵێت: وەفدێکی خەڵکی بەسرە هاتن بۆ لای عەلی و کەسێکی خەواریج لەنێوانیاندا بوو پێی دەوترا جەعدی کوڕی نەعجە، سەرکۆنەی عەلی کرد لەسەر جلەکانی، عەلی وتی جلەکانم چییانە؟ دوورن لە خۆبەزلزانین و شیاوتر وایە مسوڵمان بیانپۆشێت.

لە عەمری کوڕی قەیسەوە دەڵێ: بە عەلی وترا ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی کراسەکەت پینە دەکەیت؟ وتی دڵ لەخواترس دەکات و باوەڕدار پێشەنگی پێوە دەکات.[1]

ئیبن ئەبی شەیبەو هناد لە عەتا ئەبو موحەممەدەوە هێناویانە دەڵێت: کراسێکم لەم جلانە لەبەری عەلیدا بینی نەشۆرابوو.

هنادو ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو هزیلەوە هێناویانە دەڵێت: جلێکی سافم بینی لەبەری عەلیدا ئەگەر دەستی درێژبکردایە دەگەیشتە لای پەنجەکانی ئەگەریش وازی لێ بهێنایە دەگەیشتەوە نزیك نیوە باڵی.[2]

سەعیدی کوڕی مەنسورو بەیهەقی و ئیبن عەساکیری لەعەلیەوە هێناویانە کە جلی دەپۆشی و دواتر قۆڵەکەی ڕادەکێشا تا دەگەیشتە لای پەنجەکان و زیادەکەی دەبڕی و دەیوت: لەسەرو دەستەکانەوە زیادەی قۆڵ نابێ ببێ.[3]

ئەبو نەعیم لە الحلیة ج١ص٨٣ لە ئەبو سەعیدی ئەزدیەوە هێناویەتی کە پێشەوایەکی ناوچەی ئەزد بوو دەیوت: عەلیم بینی هاتە بازاڕو وتی: کێ کراسێکی باشی لایە بە سێ درهەم؟ کەسێ وتی من لامە، بۆی هێنا عەلی سەرسام بوو، وتی لەوانە باشتربێ، وتی نا وتی ئەوە نرخەکەی دەڵێت: عەلیم بینی لە

[1]- هیناد لە عەمری کوڕی قەیسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی وەك لە(المنتخب ج٥، ص٥٧) دا هاتووە، ئیبن سەعد(ج٣ص٣٨) لە عەمرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] – لە(المنتخب ج٥، ص٥٧) دا واهاتووە.

[3] – لە(کنزالعمال ج٨، ص٥٥) دا واهاتووە.

جلەکەیدا پەڕۆی درهەمەکانی دەکردەوەو پێیداو جلەکەی پۆشی قۆڵەکەی لە پەنجەکانی زیاتر چوو، داوای کرد زیادەکەی بڕدرا.

ئەحمەد لە مەولای ئەبو غصینەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلیم بینی هاتە دەر بۆ لای کراس فرۆشێ، پێی وت کراسێکی سونبوولانیت لانیە؟ ئەویش بۆی هێنا، عەلی پۆشی لەنیوەی قاچیدابوو، سەیری ڕاستو چەپی کرد وتی وادەبینم پێوانێکی باشە، ئەمە بە چەندە؟ وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران بە چوار درهەمە، وتی: لە کراسەکەی دەریهێناو پێی داو پاشان چوو.[1]

ئیبن سەعد(ج٣، ص٣٠٢) لە سەعدی کوڕی ئیبراهیمەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف عەبایان جلی دەپۆشی کە نرخەکەی دەگەیشتە پێنج سەد یان چوارسەد.

ئەبو نەعیم لە(الحلية ج١، ص٣٠٢) لە قەزعەوە هێناویەتی دەڵێت: جلێکی ناچاکو ڕەقم لەبەری ئیبن عومەردا بینی، وتم ئەی ئەبو عەبدوڕەحمان من جلێکی نەرمم بۆ هێناویت کە لە خوراسان دروست دەکرێت. چاوەکانم تامەزرۆن لەبەری تۆدا ببینین، چونکە جلەکەت ڕەقونباشە، وتی ئادەی با سەیری بکەم، دەستی لێداو وتی ئایا ئەمە ئاوریشمە؟ وتم نا لۆکەیە وتی دەترسم بیپۆشم ببێتە هۆی بەخۆدا نازینو خواش کەسی وای ناوێت. هەروەها لە عەبدوڵڵای کوڕی حبیشەوە هێناویەتی دەڵێت: دوو جلی خۆڵاویم لەبەری ئیبن عومەردا بینی، جلەکانی تا نیوەی قولی دەهاتن.[2]

ئەبو نەعیم(ج١ص٣٠٢) لە وەقدانەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ئیبن عومەرم بیست کە سێ پرسیاری لێکرد چی جلێ بپۆشم؟ وتی ئەوەی گەمژەکان گاڵتەت پێ نەکەن لەسەری و ژیرەکانیش سەرکۆنەت نەکەن لەسەری. وتی ئەوە کامەیە؟ وتی ئەوەیە نرخی لە نێوان پێنج تا بیست درهەم دا بێت.

[1] -. لە(البدایە والنهایە ج٨، ص٣) دا واهاتووە

[2] - ئیبن سەعد ج٤ص١٧٥ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

ئەبو نەعیم لە(الحلية ج٤، ص٣٤١) لە ئەبو ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عومەرم بینی جلی تا نیوەی قولەکانی دەهێنا، هەروەها دەڵێت: چەند هاوەڵێکی پێغەمبەرم(ﷺ) بینین ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەرقەمو بەرائی کوڕی عاربو ئیبن عومەر تا نیوەی قولیان جلیان دەهێنا.

ئەبو نەعیم لە(الحليةج١، ص٣٢١) لە عوسمانی کوڕی ئەبو سولەیمانەوە هێناویەتی ئیبن عەبباس جلێکی بە هەزار درهەم پۆشی لەبەر کرد.

بوخاری لە(الأدب المفرد ص٦٧) لە کەثیری کوڕی عوبەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای عائیشەی دایکی باوەڕداران وتی: ڕاوەستە تا پەچەکەم دەدورمەوە، منیش وەستام وتم ئەی دایکی باوەڕداران ئەگەر بچم پێیان بڵێم وابوو ئەوە بە پیسکەیی و چروکی تۆ دەزانن، وتی وریای خۆت بە، هیچ تازەییەك نیە بۆ کەسێ کە جلی کۆنەو شڕ نەپۆشێ.[1]

ئیبن سەعد(ج١، ص٧٣) لە ئەبو سەعیدەوە هێناویەتی کەسێ هات بۆ لای عائیشەو ئەویش پەچەیەکی دەدووریەوە، وتی دایکی باوەڕداران مەگەر خێری خوا زۆر نیە؟ وتی وازمان لێ بێنە، هەرکەس کۆن نەپۆشێ تازەی بۆ نیە.[2]

بەیهەقی لە ئەنەسەوە هێناویەتی ئافرەتێ هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران زریێ پۆشەکەم ون بووە، وتی مەگەر جلم نەدایتێ؟ وتی با بەڵام کون بووە، ئەویش فەرمانی کرد زریێ پۆشێکی چاكو دەزوویەکیان بۆ هێنا، پێی وت ئەمە بپۆشە کۆنەکە کاتێ نان دەکەیت کاتێ لە کار دەبیتەوە ئەمەیان بپۆشە، چونکە هەرکەس کۆن نەپۆشێت تازە بۆ نیە.[3]

---

[1] – صحيح.

[2] – صحيح.

[3] – لە كنزالعمال ج٨ص٥٥ دا واهاتووە.

سـوفیانی کـوڕی عویەینـە لـە جامعەکەیـدا لـە خەرشـەی کـوڕی حـورەوە هێناویـەتی دەڵێـت: عومـەری کـوڕی خـەتتابم بینـی گـەنجێ دای بەلایـداو جلەکـەی بەدوایدا دەخشا، عومەر بانگی کردو پێی وت: تۆ لە حـەیزدایت کوڕە؟ وتـی ئـەی ئەمیری باوەڕداران مەگەر پیاو حەیزی هەیە؟ وتی ئەی بۆچی جلەکانت لە قولـەپێت خوارترن؟ پاشان داوای شفرەیەکی کردو لایەکە جلەکەی لە خوارەوە گرتو چی لە خوار قولە پێیەوە بوو بڕی، خەرشە دەڵێت سەیری دەزوەکانم دەکرد لە دوایەوە دەکشان.[1]

ئـەبو زەری هـورەوی لـە(الجـامع) و بەیهـەقی لـە ئـەبو عوسمـانی نهدیـەوە هێناویانە دەڵێت: نامەی عومەری کوڕی خەتابمان بۆ هات، ئەوکات لەگەڵ عوتبـەی کوڕی فەرقەد لە ئازەربایجان بووین، نوسرابوو پاشان جل بپۆشن و کورت بپۆشن، بەلەسـەربەخۆیی بهاوێـژن و شـەرواڵ دانێن، جلـی ئیمـامی عـەلی باوکتـان بپۆشـن، وریابن نەکەونە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و بەرگی لە عەجەمەوە، جلی ڕەق و زبر بپۆن، ڕێ ببڕن و تازەو خوازراوەکان بهاوێژن(ئامانج بگرن) و گۆشەو پەنا بگرن، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ڕێگـری کـردووە لـە پۆشـینی ئاوریـشم مەگـەر ئـاوا نـەبێت، بـە پەنجەکانی ناوەڕاستینەکانی ئاماژەی کرد.[2]

[1] – لە(کنزالعمال ج٨، ص٥٩) دا واهاتووە.

[2] – لە(کنز العمال ج٨، ص٥٨) دا واهاتووە.

# ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)

ئیبن سەعد(ج٨ص١٦٧) لە واقیعەوە هێناویەتی دەڵێت: موعاذی کوڕی موحەممەدی ئەنساری پێی وتم لە کۆڕێکدا کە عیمرانی کوڕی ئەبو ئەنەسی تێدابوو لە عەتای خوراسانم بیست لە نێوان گۆڕو مینبەردا بوو دەیوت: چوومە ژوورەکانی ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵای دارخورمابوو، لەسەر دەرگاکانی ڕووپۆشی لە موی ڕەش، ئامادەی نامەی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك بووم دەخوێندرایەوە فەرمانی کرد بۆ ژوورەکانی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بخرێتە سەر مزگەوتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێ پڕ گریانتر لەو ڕۆژەم نەدیبوو، عەتا دەڵێت لە سەعیدی کوڕی موسەیبم بیست ئەو ڕۆژەی دەیوت: سوێند بەخوا حەزم دەکرد وەك خۆیان بین هێڵێتەوە، کەسی مەدینە گەورە بووایەو کەس لە ئاسۆوە(لە لاکانەوە) بهاتایەو هەمووان بیان دیبایە پێغەمبەر(ﷺ)لە ژیانیدا بە چەندە ڕازی بووە، ئەمە وای بکردایە خەڵکی لە زیادەڕەوی و بەخۆدانازین لە دنیادا کەنارگیربن و ڕۆنەچن، موعاذ دەڵێت: کە عەتای خوراسانی لە فەرموودەکەی لێبوویەوە عیمرانی کوڕی ئەبو ئەنەس وتی: چوار ماڵیان لە خشت بوون و ژووری لە گەڵای دارخورمای تێدابوو، پێنج ماڵیان لە دارخورما قوڕ لێدراوبوون و هیچ بەردیان نەبوو، لەسەر دەرگاکانی ڕوپۆشی مو هەبوو، جێ پەردە پۆشیەکەم پێوا(الستر) بینیم سێ باڵ بوو لە یەك ماڵدا، لەگەڵ ئێسکی یان کەمتر لەئێسکی، سەبارەت بە باسی زۆر گریان لەکۆڕێکدا کە دەستەیەکی کوڕانی هاوەڵانی تێدابوو، لەوانە ئەبو سەلەمە عەبدوڕەحمان و ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حەنیف و خارجەی کوڕی زەید، هەمووان دەگریان تا ڕیشیان تێك ئالاوی فرمێسك ببوو(بە فرمێسك تەڕ ببوو) ئەبو ئوسامە ئەو ڕۆژە دەیوت: خۆزگە بەوجۆرە بەجێ دەهێڵران و تێك نەدەدران تا خەڵکی لە بیناکاریدا کورتی بنوێنن(زۆر ڕۆنەچن)و ببینن خوا بۆ پێغەمبەرەکەی بە چەند ڕازی بووە لە کاتێکدا(کلیلی خەزێنەکانی دنیای بە دەست بووە.

# بەشی یانزەهەم

(هاوەڵان چۆن بڕوایان دەهێنا بە غەیب وخۆشیە لەناوچووەکانو دیمەنە بەرچاوە مرۆییەکانو دەستپێکراوەکانو ئەزمونە مادییەکانیان وازلێ دەهێنا بەرامبەر بە هەواڵو فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەک ئەوەی غەیبیان لە لادیارو بەرچاوەکانیان لا درۆ بێت)

# گەورەیی باوەڕ

موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت لەدەوری پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین ئەبوبەکرو عومەرو دەستەیەکیشمان لەگەڵدا بوون، پێغەمبەر(ﷺ)لە نێوانماندا هەستا و کەمێ ئەولای گرت و ئێمەش ترساین لێمان بپچڕێ، بۆیە ترساین و هەستاین من یەکەم کەس بووم کە ترسام و چووم بە دوای پێغەمبەر(ﷺ) دا تا گەیشتمە حەوشەی پشتیوانان لە بەنی نەجار، چوار دەوری گەڕام تا بزانم تا دەرگایەکی هەیە؟ دەرگام نەبینی سەیرم کرد جۆگاوێك لە بۆشایی دیوارێ لەبیری خاریجەوە دەچوویە ژوور، منیش چووم چوومە ژوور بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەبوهوریرە؟ وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمی چیتە؟ وتم تۆ لەنێوانماندا بوویت هەستایت و کەمێ دوورت گرت لێمان، ئێمەش ترساین من یەکەم کەس بووم ترسام و هاتم بۆ ئێرە و چۆن ڕێوی دائەچەمێ منیش واهاتمە ژوورەوە ئەو خەڵکەش لە دوامەوەن، فەرمروی ئەی(ئەبو هورەیرە) دوو نەعلەکەی خۆیی پێدام فەرمی إذهب بنعلي هاتين فمن لقيت من وراء هذا الحائط شهد ان لاإله إلا الله مستقينا بها قلبه فبشره بالجنة) واتە(ئەم دوو نەعلەم ببە، هەرکەس لە پشت ئەم دیوارەوە پێتگەشت و شایەتی دا هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خواو دڵی پێی دڵنیا بێت مزگێنی بەهەشتی پێبدە) (یەکەم کەس کە پێم گەیشت عومەربوو، وتی ئەبو هوریرە ئەم دوو نەعلە چین؟ وتم ئەوانە نەعلەکانی پێغەمبەرن(ﷺ) پێی دام تا بگەم بەهەرکەس شایەتی بدات هیچ پەرشتراوێك نیە جگە لە خوا دڵی پێی دڵنیا بێت مزگێنی بەهەشتی پێبدەم، عومەر دای بەنێو سنگمداو منیش لەسەر قنگ کەوتم،وتی ئەبو هورەیرە بگەڕێرەوە، منیش گەرشامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەگریانەوە خۆم خستە بەردەمی و عومەریش بەدوامدا هات و پێم وت فەرمانی چیت پێکردوم، ئەویش دای بەسەر ستگمداو لەسەر قنگ کەوتم، وتی بگەڕێرەوە پێغەمبەر(ﷺ)(عومەر بۆچی وات کرد)(یاعمر ما حملك على ما فعلت؟) وتی ئەی

پێغەمبەری خوا بەدایكو باوكمەوە بەقوربانت بم تۆ ئەبو هورەیرەت ناردوە نەعلەكانت پێدا تا بگات بەهەركەس شایەتی بدات هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو دڵی پێی دڵنیا بێت مزگێنی بەهەشتی پێبدات؟ فەرمی بەڵێ وتی دەی وامەكە چونكە دەترسم خەڵكی پشتوێنی لێ بكەنەوەو پاڵ بدەنەوە، وازیان لێبێنە با ئیش بكەن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(فخلهم) واتە(دەی وازیان لێبێنە).[1]

بوخاریو موسلیم لە ئەبوزەرەوە هێناویانە دەڵێت شەوێك دەرچووم پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنها دەچوو بەڕێداو كەسی لەگەڵ نەبوو وتم حەز ناكات كەس لەگەڵی بچێت، منیش لە ژێر سیەی بانگدا دەچووم پێغەمبەر(ﷺ) لایكردەوەو منی بینیو فەرمووی(من هذا) واتە(ئەوە كێیە؟) ئەبو ذەرم خوا بمكا بە قوربانت، فەرمووی ئەبو ذەر وەرە منیش ماوەیەك لەگەڵی چووم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(إن المكثرين المقلون يوم القيامة إلا اعطاه الله خيرا فصنع فيه عن يمينه وشماله وبين يديه ووراءه وعمل فيه خيرا) واتە(زۆر خوازان كەمانی ڕۆژی دوایین، مەگەر ئەوەی خوا خێری پێ بەخشی بێتو تیایدا یارمەتی ڕاستو چەپو بەردەستو پشتی بێتو تیایدا كاری خێری پێ بكات) منیش ماوەیەك لەگەڵی چووم پێی فەرموم لێرە دابنیشە، لەتەختاییەكدا دای نیشاندم كە چواردەوری بەردبوو، پێی فەرموم(ههنا حتى ارجع إليك) واتە(لێرە دابە تا دەگەڕێمەوە بۆ لات) چو بەناو بەردەڵانی ڕەشدا تا ئەوەی نەم دەبینی درەنگی كردو نەهاتەوە، پاشان بیستم دەهاتەوە دەیفەرمو(بازیناش بكات با دزیش بكات) كە هاتەوە خۆم نەگرتو وتم ئەی پێغەمبەری خوا خوا بمكات بە قوربانت لە لای بەردەڵانەكان كێت دەدواند؟ نەمبینی كەس وەڵامت بداتەوە، فەرمووی(ذالك جبريل عرض لي في جانب الحرة فقال بشرا امتك من مات لايشرك بالله شيئا دخل الجنة، فقلت يا جبريل وإن زنى وإن سرق، قال نعم) واتە(ئەوە جبریل بوو لە لای بەردەڵانەكانە هاتە ڕێمو پێی وتم

[1] – لە(جمع الفوائد ج١، ص٧) دا واهاتووە.

مژده بە ئومەتەکەت بدە هەرکەس بمرێ و هیچ هاوەڵێکی بۆ خوا دانەنابێت دەچێتە بەهەشت، منیش وتم ئەی جبریل ئەگەریش زینا بکات یان دزی بکات، وتی بەڵێ) وتم ئەی پێغەمبەری خوا بازینا یان دزیش بکات؟ فەرمووی بەڵێ، لێم دووبارە کردەوە، فەرمووی(نعم وإن اشرب الخمر) واتە(بەڵێ ئەگەریش مەی بخواتەوە).[1]

ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە هێناویەتی پیرێکی دەشتەکی پێی دەوترا عەلقەمەی کوڕی عولاشە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا من کەسێکی پیرو بەتەمەنم و ناتوانم فێری قورئان ببم، بەڵام شایەتومان بە حەق دێنم، کە کابرا چوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(فقه الرجل او فقه صاحبكم) واتە(پیاوەکە تێگەیشتووە یان هاوەڵەکەتان تێگەیشتوە)[2].[3]

ئەحمەد لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە هێناویەتی دەڵێت لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(إني للأعلم كلمة لايقولها عبد حقا إلا حرم على النار) واتە(من وشەیەك دەزانم هەربەندەیەك بە حەق بیڵێت لە دڵیەوە خوای گەورە دۆزەخی لێ حەرام دەکات) عومەری کوڕی خەتتاب وتی پێت بڵێم چیە؟ وشەی دڵسۆزییە کەخوای گەورە پەیوەستی موحەمەدو هاوەڵانی کردووە، وشەی لە خواترسیە کە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لەئەبو تالیبی مامی کرد لەسەرە مەرگدا بیڵێت، شایەتی ئەوەی هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا[4].[5]

---

[1]- لە(جمع الفوائد ج١، ص٧) دا واهاتووە، دەڵێت لەگەڵ ترمزیشدا لە فەرمودەیەکی تردا بە هەمان شێوە هێناویەتی و لە جاری چوارەمدا فەرمووی(على رغم انف ابى ذر)

[2] - ضعيف.

[3]- لە(كنز العمال ج١، ص٧٠) دا واهاتووە، خەرائیتی و دارقوتنی لە فەرموودەی ئەنەسەوە بە سەنەدی تەواو لاواز هێناویانە، هەروەها لە(الإصابه ج٢، ص٥٠٣) دا واهاتووە.

[4] - صحيح.

[5]- لە(المجمع ج١ص١٥) دا واهاتووە. ئەبو یەعلاو ئیبن خوزەیمەو ئیبن حبان و بەیهەقی و جگە لەوانیش هێناویانە، لە(كنزالعمال ج١ص٧٤) دا واهاتووە.

ئەحمەد لەیەعلای کوڕی شەدادەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبو شەداد بۆی گێڕامەوەو عبادەی کوڕی صامتیش لەوێ بوو پشتگیری قسەکەی دەکرد وتی: لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بووین فەرمووی ئایا لەنێوانتاندا کەسێکی نامۆ هەیە؟) واتە ئەهلی کیتاب، وتمان نا ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمانی کرد دەرگا داخراو فەرمووی(دەستەکانتان بەرز بکەنەوەو بڵێن(لاإلە إلا الله) ماوەیەك دەستمان بەرزکردەوە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) دەستی داناو دواتر فەرمووی(الحمدلله، اللهم إنك بعثتنی بهذه الكلمة وامرتنی بها ووعدتنی علیها الجنة وإنك لاتخلف المیعاد) واتە(سوپاس بۆ خوا، خوایە تۆ بەو وشەیە منت ناردو فەرمانت پێ کردم پێی و لەسەر ئەوە بەڵێنی بەهەشتی پێدامو تۆیش لە بەڵێنت لا نادەین) پاشان فەرمووی(الا ابشروا فأن الله قد غفر لكم) واتە(دەی موژدەتان لێبێت خوا لە ئێوەش خۆشبوو)[1].[2] ئەحمەد لە فارعەی جوهەنیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووین تا گەیشتینە کەدید، کەسانێ مۆڵەتیان لە پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگرت تا بچنەوە لای ماڵو منداڵیان، ئەویش مۆڵەتی دەدان، پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو سوپاسو ستایشی پەروەردگاری کردو فەرمووی(ما بال رجال یكون شق الشجرة التی تلی رسول الله ابغض إلیهم من الشق الأخر) واتە(ئەوە چیە کەسانێ ئەویەی درەختەی لای پێغەمبەری(ﷺ) خواوەیە لایان بێزراوترە لە لاکەی دیکەی) ئەوکات هەرکەس دەبینرا دەگریا، کەسێك وتی: ئەوەی دوای ئەمە داوای مۆڵەت بکات گەمژەیە، پێغەمبەر(ﷺ) سوپاسو ستایشی خوای کردو قسەی خێری کردو فەرمووی (اشهد عندالله لایموت عبد یشهد ان لا إلە إلا الله وإنی رسول الله صدقا من قلبه یم یسدد إلا سلك فی الجنة) واتە(شایەتی دەدەم لای خوا هەر بەندەیەك بمرێتو شایەتی بدات هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو من پێغەمبەری خوامو

---

[1] - ضعیف.

[2] -هەیسەمی ج١ص١٩دەڵێت ئەحمەدو تەبەرانی هێناویانەو کەسەکانی سەنەدی بەزار جێمتمانەن.

دانی پێدا بنێت پاشان ڕاست بگرێت دەچێتە بەهەشت) فەرمووی(وقد وعدنی ربی عزوجل ان یدخل الجنة من امتی لسبعین الفا لاحساب علیهم ولا عذاب وإنی للأرجون ان لایدخلوها حتی تبووا وانتم ومن صلح من ابائكم وازواجكم وذارریكم مساكن فی الجنة) واته(پەروردگارم بەڵێنی پێداوم حەفتا هەزار لە ئوممەتەكەم بەبێ حساب و سزایەك بباتە بەهەشت. من هیوام وایە نەچنە ناوی تا ئێوەو ئەوەی باش بووە لە باوك و ژن و منداڵتان لە شوێنی ناو بەهەشتدا جێ بگرن).[1]

بەزار لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەی فلان ئاواو ئاوات كرد؟) وتی نا سوێند بەو كەسەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو وام نەكردووە، پێغەمبەر(ﷺ) دەی وایكردوە، چەند جارێك لێی دووبارەكردەو، پێغەمبەر(د.خ)فەرمووی(كفر عنل بتصدیقك بلا الەإلا الله) واتە(بە لا إ لە إلا الله كەفارەتی سوێندەكەت بدەرەوە) (هەیسەمی ج١٠ص٨٣) دەڵێت بەزارو ئەبو یەعلا بە هەمان شێوە هێناویانە بەڵام دەڵێت فەرمووی(كەفارەتی درۆكەت بدەرەوەبەڕاست دانانی(لاإلە إلا الله)(كفر عنك كذبك بتصدیقك بلا إلە إلا اللە)[2] كەسەكانی سەنەدەكانیان ئەبو قودامە هەیە كە ناڕەزایی لەسەری زۆرە ئەمەش یەكێكەلەوانەی بەزار باس دەكات كە ئەو بە تەنها هێناویەتی، تەواو. تەبەرانی لە ئیبن زوبەیرەوە بە مەرفوعی هێناویەتی كەسێك سوێندی درۆی خوارد بەو پەروەردگارەی كە جگە لەو هیچ پەرستراوێكی دیكە نیە، خواش لێی خۆش بوو.[3]

تەبەرانی لە ئەبو موساوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(إذا إجتمع اهل النار فی النار من معهم من اهل القبلة قال الكفار للمسلیمین الم تكونوا مسلمین؟ قالو بلی، قالوا فما اغنی عنكم الأسلام وقد صرتم معنا فی النار؟ قالوا

---

[1] – صحیح.
[2] – ضعیف.
[3] – (هەیسەمی ج١ص٨٣) دەڵێت: كەسەكانی سەنەدەكە صەحیحن.

كانت لنا ذنوب فأخذنا بها، فسبع الله ما قالوا فأمر بمن كان فی النار من اهل القبلة فأخرجوا، فلما راى ذلك من بقی من الكفار قالوا يا ليتنا كنا المسليمن، فخرج كما خرجوا) واتە(كاتێ دۆزەخیەكان لە دۆزەخدا كۆبوونەوەو لەگەڵیاندا لە ئەهلی قیبلە هەبوون هێندەی خوا بیەوێت بێباوەڕان بە مسوڵمانان دەڵێن مەگەر ئێوە مسوڵمان نەبوون؟ وتیان با، وتیان ئەی ئیسلام سوودی چیبوو بۆتان كاتێ لە دۆزەخدا لەگەڵ ئێمەدان؟ وتیان ئێمە تاوانمان هەبوو بەو تاوانانە خراینە ناو دۆزەخ،خواش قسەكەی بیستن فەرمانی كرد چی ئەهلی قیبلەن لە دۆزەخدا دەركرێن، كاتێ ئەوانەی مابوونەوە لە بێباوەڕەكان بینیان وتیان مسوڵمان بووینایەو وەك چۆن ئەوانە دەرچوون ئێمەش دەربچوینایە) پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ﴿الَر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُّبِينٍ رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ﴾[1] (الحجر ۱) ئیبن ئەبی حاتەم هێناویەتی و تیایدا(بسم الرحمن الرحيم) لە بری(اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) هاتووە، تەبەرانیش لە ئەنەسەوە بە مەرفوعی هێناویەتی فەرمووی(إن ناسا من اهل لا إلا إلا الله يدخلون النار بذنوبهم فيقول لهم اهل اللات والعزى ما اغنى عنكم قولكم لا إله إلا الله وانتم معنا فی النار، فيغضب الله لهم فيخرجهم فيلقهم فی نهر ما الحياة فيبرؤون من حرقهم كما يبرا القمر من خسوفه، ويدخلون الجنة ويسمون فيها الجهنميون) واتە(خەڵكانێ لە ئەهلی لا إله إلا الله بە تاوانیان دەچنە ناو دۆزەخ، ئەهلی لات و عوزا پێیان دەڵێن: قسەكەتان كە دەتان وت لا إله إلا الله چ سودێكی هەبوو بۆتان كە لەگەڵ ئێمەدان لە دۆزەخدا، خوای گەورە لەسەریان تووڕە دەبێت و دەیان هێنێت و دەیان خاتە ناو ڕووباری ژیان و ل ەسوتانیان پاك دەبنەوە وەك چۆن مانگ لە گیرانی دەرباز دەبێت، دەچنە بەهەشت و تیایدا ناودەبرێن بەدۆزەخیەكان) تەبەرانی لە ئەبو سەعیدی خودریەوە بە دەقێكی دیكە بە هەمان شێوە هێناویەتی، لەگێڕانەوەیەكدا هاتووە(فيسمعون فی

---

[1] - صحيح.

الجنة الجهنميين من اجل سواد فی وجوههم فيقولون ربنا اذهب عنا هذا الأسم، فيأمرهم فيغتسلون فی نهر الجنة فيذهب ذلك الآسم عنهم) واتە(لەبەهەشتدا لەبەر ڕەشیەك لەڕوویاندا پێیان دەوترێت دۆزەخیەکان، ئەوانیش دەڵێن پەروەردگارا ئەو ناوەمان لەسەر لابە، پەروەردگاریش فەرمانیان بۆ دەکات لەڕووباری بەهەشتدا دەشۆردرێن و ئەو ناوەیان لەسەر نامێنێت)[١].[٢]

حاکم ج٢ص٥٤٥ لە ربعی لەحوزەیفەوە هێناویەتی دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(يدرس الأسلام كما يدرس وشي الثوب لايدری ما صيام ولا صدقة ولانسك ويسری علی كتاب الله عزوجل فی ليلة فلا يبقی فی الآرض من اية ويبقی طوائف من الناس الشيخ الكبير والعجوز الكبيرة يقولون ادركنا اباءنا علی هذه الكلمة لاإله إلا الله فنحن نقولها) واتە(نیشانەکانی ئیسلام بە وینەی نەخشی جل نامێنن تا ئەوەی نازانرێ کە نوێژو صەدەقەو سوننەت چیە، لە شەوێکدا کتێبی خوا بەرز دەکرێتەوە، ئیتر لەسەر زەویدا ئایەتێکی نامێنێ، دەستەیەکی خەڵك دەمێنن، پیرە پیاوو پیرە ژن دەڵێن لەباكو باپیرانمان بیست ئەم وشەیان دەوت لا إله إلا الله ئێمەش دەیڵێین) صلە دەڵێت: لا إله إلا الله کەیان سودیان پێ نابەخشێ، نازانن ڕۆژو صەدەقە چیە، حوزەیفە ڕووی لێ وەرگێڕاو ئەویش سێ جار لێی دووبارە کردەوەو ئەویش ڕووی لێ وەردەگێڕا، لە جاری سێیەمدا وتی ئەی صلە لەدۆزەخ ڕزگاریان دەکات، لە دۆزەخ ڕزگاریان دەکات، لە دۆزەخ ڕزگاریان دەکات[٣].[٤]

---

[١] – حسن.

[٢] – لە(تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ص٤٦٥) دا واهاتووە.

[٣] – صحيح.

[٤]– حاکم دەڵێت ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحو بوخاریو موسلیم نەیان هێناوە. زەهەبی دەڵێت لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە.

ئەبو نەعیم لە الحلیة لە عەلیەوە(ر.ض)هێناویەتی دەڵێت: زمان پاراوترین و زاناترین کەس لەبەردەم خوادا ئەوانەن کە زیاتر خۆشەویستی و ڕێزیان هەیە بۆ دارو دەستەی لا إله إلا الله.[1]

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص٢١٩) لە سالمی کوڕی ئەبو جەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: بە ئەبو دەردا وترا ئەبو سەعدی کوڕی منبە سەد کەسی ئازاد کرد. وتی سەد کەس لەماڵ و سامانی کەسێك زۆر زۆررە، ئەگەر دەتەوێت هەواڵت پێ دەدەم لەوەی لەوە باشترە.ئیمانێك کە پەیوەستی شەو و ڕۆژبێت بەردەوام زمانت پاراوبێت بە یادی خوا[2].[3]

تەبەرانی لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: خوای گەورە وەك چۆن ڕۆژی لە نێوانتانا دابەشکردووە ئاکاریشی لە نێوانتانا دابەشکردووە، گەورە سامان دەبەخشێ بەوەی خۆشی دەوێت یان خۆشی ناوێت، بەڵام ئیمان تەنها بەوە دەبەخشێت ترسی لە بەخشین و خەرجی سامان بووو ترسا لەگەڵ دووژمن بجەنگێ وشەو کوێت و بەندی بکات با زۆر بڵێ(لا إله إلا الله والله اکبر والحمدلله وسبحان الله)[4].[5]

---

[1] – لە(کنز العمال ج١ص٧٦) دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3]– ئیبن ئەبی دنیا بە مەقوفی بە سەنەدی حەسەن لە سالمی کوڕی ئەبو جەعدەوەهێناویەتی دەڵێت بە ئەبو دەردا وترا کەسێك....بە هەمان شێوە دەیهێنێت، وەك لە(الترهیب ج٣، ص٥٥) دا هاتووە.

[4] – صحیح.

[5]– هەیسەمی ج١٠ص٩٠دەڵێت تەبەرانی بەمەوقوفی هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، تەواو. لە مونزیری لە(الترغیب والترهیز ج٣ص١٩٥) دا دەڵێت: گێڕاوەکانی جێ متمانەن و لە ئەسڵی مندا نیە مەرفوع بێت، تەواو.

# کۆڕی ئیمان

ئەحمەد بە سەنەدی حەسەن لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئەگەر بگەیشتایە بە یەکێ لە هاوەڵانی دەیوت وەرە با ماوەیەك بڕوا بهێنین بە پەروەردگارمان(لەیادکردنیدا بین) ڕۆژێك ئەوەی بە کەسێك وت کابرا تورە بووو هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتی ئەی پێغەمبەری خوا دەبینیت ئیبن ڕەواحە لە ئیمانی تۆ کەنار دەگرێ بۆ ساتێ ئیمان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ڕەحمەتی خوا لە ئیبن ڕەواحە، ئەو حەزی لەو کۆڕانە نیە کە فریشتەکان کەشخەی پێوەدەکەن)(یرحم الله إبن رواحه إنه يجب الجالس التى تتباهى بها الملائكة)[1][2].

بەیهەقی بەوسەنەدە لەعەتای کوڕی یەسارەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بە هاوەڵێکی خۆی وت وەرە با ساتێ لەباوەڕداریدا بین، ئەویش وتی مەگەر باوەڕدارنین؟ وتی با بەلاّم یادی خوا دەکەین و ئیمانی پێ زیاد دەکەین. ئەبولقاسم لالەکائی لەشورەیحی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دەستی یەکێ لە هاوەڵانی دەگرت و دەیوت: هەستە با ساتێ سەرقاڵی ئیمانداری بین، لە کۆڕی یادی خوا دابنیشین.[3]

تەیالسی لە ئەبو دەرداوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دەستی دەگرتم و دەیوت: وەرە با ساتێ باوەڕ بێنین، دڵ لە مەنجەڵ زوتر هەڵدەگەڕێتەوە ئەگەر هەڵچونی کۆبوویەوە. ئیبن عەساکیر لێیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کە دەگەیشت پێم دەیوت: ئەی عوەیمر دانیشە با ساتێ یادو زیکر

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە(الترغيب والترهيب ج٣، ص٦٣) دا هاتووە، ئیبن کەسیر لە(البدايه والنهايه ج٤، ص٢٥٨) دا دەڵێت: ئەم فەرموودە زۆر جددی نیە.

[3] – ئەم فەرموودە لەدوو ڕەوەوە مورسەلە، تەواو.

بکەین، دادەنیشتین و زیکرمان دەکرد، پاشان پێی دەوتم ئەوە کوڕی ئیمانە، نمونەی ئیمان وەك کراسەکەت وایە، کاتێ دەیپۆشی دواتر لایدەبەیت، کاتێ لایدەبەیت دواتر دەیپۆشیت، دڵ خێراتر لە مەنجەڵ هەڵدەگەڕێتەوە کاتێ هەڵچوونی کۆدەبێتەوە.[1]

ئیبن ئەبی شەیبەو لالەکائی لە ئەبوزەرەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر دەستی یەك یان دوو هاوەڵی دەگرت و دەیوت: هەستن با ئیمانمان زیاد بکەین، یادی خوایان دەکرد.[2]

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص٢٣٥) لە ئەسوەدی کوڕی هیلالەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ موعاز دەچوین پێی وتین: با دابنیشین و ساتێ ئیمان خوازی بنوێنین.

## نوێکردنەوەی ئیمان

ئەحمەدو تەبەرانی لە ئەبو هوریرەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(جددوا إیمانکم) واتە(ئیمانتان نوێ بکەنەوە) وترا ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ئیمانمان تازە بکەینەوە؟ فەرمووی(اکثر من قول لا إله إلا الله) واتە(زۆر بڵێن لا إله إلا الله)[3].[4]

## بەڕاست دانەنانی ئەزموون و بەرچاویەکان

بوخاری و موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هێناویانە کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وتی براکەم سکی هیچ لەخۆ ناگرێت فەرمووی(إسقه عسلا) واتە(هەنگوینی بدەرێ) ئەویش چوو هەنگوینی پێدا، پاشان هات وتی ئەی

[1] – لە(کنزالعمال ج١، ص١٠١) دا واهاتووە

[2] – لە(کنز العمال ج١ص٢٠٧) دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – (هەیسەمی ج١٠ص٨٢) دەڵێت: سەنەدەکەی ئەحمەد حەسەنە.

پێغەمبەری خوا هەنگوینم پێدا زیاتر بوو، فەرمووی(بڕۆ هەنگوینی بدەرێ) چو هەنگوینی پێدا پاشان هات وتی ئەی پێغەمبەری خوا سک چوونی زیاتر بوو، فەرمووی(صدق الله وكذب بطن اخيك إذهب فاسقه عسلا) واتە(خوا ڕاست دەکات و سکی براکەت درۆ دەکات، بڕۆ هەنگوینی بدەرێ) چو هەنگوینی پێدا چاک بوویەوە.[1]

ئەحمەد لە زەینەبی ژنی ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت عەبدوڵلاّ کە لە کارێکەوە دەهات دەگەیشتە بەردەرگا دەنگە دەنگی دەکرد نەوەک بە بارێکدا بێت بۆ لامان کە پێی ناخۆش بێت، ڕۆژێ هات و وای کرد و منیش پیرە ژنێکم لابوو بۆ نەخۆشی(حمرة) سورێژە ڕوقیەی بۆ دەکردم، خستمە ژێر جێگەکەم، ئیبن مەسعود هاتە ژورەوە لام دانیشت و دەزویەکی لەملمدا بینی وتی ئەوە چیە؟ وتم دەزووە کە تیایدایە ڕوقیەم بۆ کراوە، ئەویش گرتی و پچڕاندی پاشان وتی ماڵی عەبدوڵلاّ بێ نیازن لە شیرك بیستم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو( إن القى والتمائم والتوله شرك) واتە(ڕوقیە و تەمیمە و تەولە شیرکن) زەینەب دەڵێت پێم وت بۆچی ئەوە دەڵێیت لەکاتێکدا چاوم پرتەی بوو چووم بۆ لای فلاّنە ژن جولەکەکە ڕوقیەی بۆ دەکرد ئارامی دەگرت؟ وتی ئەوە شەیتان بە دەستی دەیپروێنێت کە ڕوقیەی کرد دەستی لادەبات هێندە بەسە فەرمایشتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بڵێینەوە(إذهب البأس رب الناس اشف وانت الشافي فى لا شفاء إلا شفاؤك شفاء لا يغادر سقما)[2].[3]

دار قوتنی ص٤٤ لە عیکرمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن ڕەواحە لە پاڵ ژنەکەیدا ڕاکشابوو هەستا بۆ لای کەنیزەکێکی لە سووچی ژوورەکەدا، لەگەڵی نوست، ژنەکەی ترسا و ئیبن ڕەواحەی لە شوێنەکەی دا نەبینی، هەستا چوویەوە

[1] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ص٥٧٥ دا واهاتووە
[2] – صحيح.
[3] – لە(تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ص٤٩٤) دا هاتووە.

دەرو بینی لەسەر کەنیزەکێکە، گەڕایەوە بۆ ماڵ شفرەی هەڵگرت و چویە دەر، ئیبن ڕەواحە لێبوویەوە هەستا گەیشت بە ژنەکەی کە شفرەی هەڵگرتبوو، وتی چیتانە؟ وتی چیمانە ئەگەر لەو باوەڕەدا پێت بگەیشتمایە بەم شفرە نێوان شانەکانتم هەڵ دەدڕی، وتی چۆن منت بینی؟ وتی لەسەر کەنیزەکەکە بوویت، وتی منت بینی و پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری کردووە کەسمان لەشگران بێت و قورئان بخوێنێت، ژنەکە دەی بخوێنە ئەویش وتی:

اتانا رسول الله يتلو كتابه — كما لاح مشهور من الفجر ساطع

اتى بالهدى بعد العمى فقلوبنا — به موقنات إن ما قال واقع

ليبيت يجافي جنبه عن فراشه — إذا استثقلت بالمشركين المضاجع

ژنەکە وتی: بڕوام هێنا بە خواو چاوم بە درۆخستەوە، پاشان چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بۆی باسکرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی تا دانەکانی دەرکەوتن، دارقوتنی ص٤٥ لەڕێگەیەکی دیکەوە لە عیکرمە لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە چوویە ژوور بە هەمان شێوە دەیهێنێت دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لێکردین لەشگران بین و قورئان بخوێنین[1][2].

بوخاری لەحەبیبی کوڕی ئەبوثابتەوە هێناویەتی دەڵێت چووم بۆ لای ئەبو وائیل پرسیارم لێدەکرد وتی: ئێمە لەصفین بووین کەسێ هەستا و وتی سەیری ئەوانە ناکەیت بانگەواز بۆ لای قورئان دەکەن؟ عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی بەڵێ، سەهلی کوڕی حەنیف وتی خۆتان تۆمەتبار بزانن، ڕۆژی حودەیبیە ئێمەتان دەبینی، واتە ئەو ڕێکەوتنەی لەنێوان پێغەمبەر(ﷺ) و بێباوەڕاندا بەو ئەگەر شەڕمان بەدی بکردایە شەڕمان دەکرد، عومەر هات و وتی مەگەر ئێمە لەسەر حەق و

[1] - ضعيف.

[2] - له المغنى ص٤٥ دا واهاتووه: له سەنەدەکەدا سەلەمەی کوڕی وەهرام هەیە کە ئیبن موعین ئەبو زەرعە بەجێ متمانەو ئەبو داود بەلاوازی دەزانێت. تەواو.

ئەوان پوچی نین؟ مەگەر کوژراوانی ئێمە لەبەهەشت و کوژرانی ئەوان لە دۆزەخدا نین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی با(بلا) وتی دەی ئیتر بۆچی سوکی بۆ ئاینمان نیشان بدەین و بگەڕێینەوە، دوا کاتێ خوا حوکمی نێوانمان دەدات؟ فەرمووی(یا إبن الخطاب إني رسول الله ولن یضیعني اللة ابدا) واتە(ئەی کوڕی خەتتاب من پێغەمبەری خوام و هەرگیز لەناوم نابات) ئەویش بەتوڕەییەوە گەڕایەوە و تا ئەبوبەکر هات، هەمان شتی بەئەبوبەکر وت و ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە، ئینجا سورەتی فەتح دابەزی. بوخاری لەچەندلایەوکی دیکەداو موسلیم و نەسائی لە چەند ڕێگەیەکی دیکەوە لەسەهلەوە هێناویەتی و لەهەندێ دەقیدا هاتووە: ئەی خەڵکینە تۆمەتباری ڕابنوێنن، ڕۆژی ئەبو جەندەل منت دەدی ئەگەر بمتوانیبا وەڵامی پێغەمبەر(ﷺ) بدەمەوە دەمکرد، لەگێڕانەوەیەکدا: سورەتی فەتح دابەزی، پێغەمبەر(ﷺ) عومەری کوڕی خەتتابی بانگکرد و سورەتی فەتحی بەسەردا خوێندەوە.[1] پێشتریش بەدورو درێژی لەباسی بانگەواز بۆ خوا لەچیرۆکی ڕێککەوتنی حودەیبییە لەبووخاریەوە لەڕێگەی میسوەری کوڕی مەخرەمەو مەڕوانەوە هاتووە، تیایدا هاتووە ئەبو جەندەل وتی: ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان: من بە مسوڵمانی هاتووم و دەگەڕێنرێمەوە بۆ لای بێباوەڕان؟ نابینین توشی چی بووم؟ ئەولەسەر ئیسلام زۆر سزا درابوو، عومەر وتی چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتم مەگەر تۆ بە حەق پێغەمبەری خوانیت؟ فەرمووی بەڵێ، وتم مەگەر ئێمە لەسەر حەق و ئەوان لەسەر ناحەق نین؟ فەرمووی با وتم دەی ئیتر بۆچی سوکی بۆ ئاینمان بنوێنین؟ فەرمووی(إني رسول الله ولست اعصية وهو ناصري) واتە(من پێغەمبەری خوام و لێی یاخی نابم و ئەو سەرخەرمە) وتم مەگەر تۆ نەت دەوت دەچین بۆ کەعبەو تەوافی دەکەین؟ فەرمووی بەڵێ، ئەی پێم وتیت ئەمساڵ دەچین؟)(بلى فأخبرتك انا نأتيه العام؟) وتم نا، فەرمووی(دەی تۆ دەچیت بۆ ئەوێ و تەوافی

[1] – لەتەفسیری(ئیبن کەسیر ج٤ص٢٠٠) دا هاتووە،

دەکەیت)(فأنك اتیه ومطوف به) وتی چووم بۆ لای ئەبوبەکرو هەمان شتم پیّ وت، وتی کابرا ئەو پێغەمبەری خوایەو لە فەرمانی لانادات‌خوا سەرخەریەتی، دەی پەیوەستی هەڵوێستی بە بەخوا ئەو لەسەر حەقە، وتم مەگەر نەیدەوت دەچین بۆ کەعبەو تەوافی دەکەین؟ وتی بەڵێ بەڵام ئایا وتی ئەمساڵ دەچین؟ وتم نا، وتی دەی دەچین‌و تەوافی دەکەین، عومەر وتی: بۆ ئەمە چەند کارێکم کرد.

ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەم ئایەتە دابەزی بۆسەرپێغەمبەر(ﷺ)(لیغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر)(الفتح٢) لە گەڕانەوەی لە حودەیبیە بوو، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی(لقد انزلت علی اللیلة ایة احب إلی مما علی الأرض) واتە(بە ڕاستی ئەمشەو ئایەتێکم بۆ دابەزی لام خۆشەویسترە لەهەرچی لەسەر زەویدا هەیە) پاشان پێغەمبەر(ﷺ)ئایەتەکەی بۆ خوێندنەوە، وتیان پیرۆزت بێت ئەی پێغەمبەری خوا، خوا ڕوونی کردەوە بەرامبەری تۆ چی دەکات ئەی بەرامبەر بە ئێمە چی دەکات؟ ئەم ئایەتە دابەزی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)(لیدخل المؤمنین والمؤمنات جنات تجری من تحتها الأنهار.......فوزا عظیما) (الفتح:٥).[١]

ئیبن جەریر سەبارەت بەئایەتی(إنا فتحنا لك فتحا مبینا) لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: لە کاتی گەڕانەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە دابەزی بۆ سەری، کاتیّ نێوانی خۆیان‌و قوربانیان کەوتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئاژەڵەکەی لە حودەیبیە سەربڕی‌و هاوەڵانیشی تێك ئاڵاوی خەم‌و پەژارە بوون، فەرمووی(لقد انزلت علی ایة احب إلی من الدنیا جمیعا) واتە(بەڕاستی ئایەتێك داباری بۆ سەرم لە هەموو دنیا لام خۆشەویسترە) ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە(إنا فتحنا لك فتحا مبینا، لیغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر.......عزیزا)(الفتح:١)هاوەڵان وتیان پیرۆزت بێت بە هەمان شێوەی پێشوو فەرموودەکە دێنێت.

---

[١]- بوخاری‌و موسلیم لە ئەنەسەوە هێناویانە وەك لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ص٨٣ دا هاتووە.

ئەحمەد لە مەجمەعی کوڕی جاریەی ئەنساریەوە هێناویەتی کە یەکێ بوو لەو قورئان خوێنانەی قورئانیان دەخوێند، وتی: لە حودەیبیە بووین کاتێ لەوێ چووین خەڵکی لە دەست بێزارییان ئاژەڵەکانیان ڕاوەدو دەنان، بە یەکتریان دەوت خەڵکی چیانە؟ وتیان سروش دابەزیوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خەڵکی دەرچووین و خێرامان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر وڵاخەکەی بوو لە ناوچەی(کراع الخمیم) خەڵکی لە لای کۆبوونەوە، ئەویش ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە(إنا فتحنا لك فتحا مبینا) یەکێ لەهاوەڵان وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە فەتحە؟ فەرمووی(ای والذی نفس محمدا بیده إنه لفتح) واتە(ئەرێ، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەمە فەتحە) فەرمودەکە دێنێت[1][2].

بوخاری لەبەرائەوە هێناویەتی دەڵێت ئێوە فەتحی مەککە بە فەتح دادەنێن، فەتحی مەککە فەتح بوو بەڵام ئێمە بەیعەتی ریزوانی ڕۆژی حودەیبیە بەفەتح دەزانین ئینجا فەرمودەکە دێنێت،[3] ئیبن لە تەفسیرەکەیدا(ج٢٦ص٤٤) لە بەرائەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە جابرەوە دەڵێت: ئێمە تەنها ڕۆژی حودەیبیەمان بەفەتح دادەنا.

ئەبولقاسمی لالەکائی لەقەیسی کوڕی حوجاج لەکەسێکەوە کە بۆی گێڕاوەتەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ میسر فەتح کرا خەڵکەکەی هاتن بۆ لای عەمری کوڕی عاص کە ئەوکاتە ئەمیر بوو چوویە مانگی بوونە کە لە مانگەکانی عەجەم بوو، لەوێ ئەمیربوو، وتیان ئەی ئەمیر ئەم نیلەمان نەریتێکی هەیە تەنها بەوە دەڕوات، وتی چیە؟ وتیان ئەگەر دوانزە شەو لەم مانگە چو ئافرەتێکی دەست لێ نەدراو لەبەردەم دایك و باوكیدا دیاری دەکەین و ڕازییان دەکەین و جلی دەکەین

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەبو داودیش هێناویەتی، وەك لەتەفسیری(ئیبن کەسیر ج٤ص١٨٣) دا واهاتوە.

[3] – وەك لە تەفسیری(ئیبن کەسیر ج٤ص١٨٣) دا هاتووە،

بەر بەجوانترین شێوە، پاشان دەیخەینە ناو نیل، عەمر پێی وتن ئەمە لەئیسلامدا نابێت، ئیسلام ئەوەی پێش خۆی تێك دەشكێنێ، ئەوانیش لەبووئنە بوون و نیل نەدەچوو تا ویستیان چۆڵی بكەن، عەمر نامەی نوسی بۆ عومەر، عومەریش بۆی نوسی وتی تۆ بەوەی كردوتە پێكاوتە، لەناو ئەم نامەدا وەرەقێكت بۆ دەنێرم بیخەرە ناو نیل = فەرمودەكە دێنێت وەك لەدواتر لەباسی پاڵپشتیە غەیبیەكاندا بۆ بەردەست خستنی دەریاكان دەیهێنێت = لەكۆتاییەكەیدا هاتووە دەخستیە ناو نیل و ڕۆژی شەممە هات و خوا نیلی شانزە باڵ لەیەك شەودا بەڕێ خست، خوای گەورە ئەو نەریتەی خەڵكی میسری تا ئەمڕۆ نەهێشت[1].[2]

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١ص٧) لە سەهمی كوڕی منجابەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عەلائی كوڕی حەزرەمیدا شەڕمان كردو چووین تا گەیشتینە دوو ماڵ و دەریا لە نێوان ئێمەو ئەواندا بوو، وتی ئەی عەلیم ئەی حلیم ئەی عەضیم، ئێمە بەندەی تۆین و لەپێناو تۆدا لەگەڵ دوژمنت دەجەنگین، خوایە دەی ڕێمان بۆ بكەرەوە تا بچین بۆیان، دەریا ڕێی بۆ كردین و هێندەی پێكانمان تەڕبن دامان بەناویداو چووین بۆیان، هەروەها(ج١ص٨) لەئەبو هورەیرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد كردووە: كاتێ ئیبن موكەعبەری كاربەدەستی كیسرا ئێمەی بینی وتی نەبەخوا لەگەڵ ئەمانە شەڕ ناكەین، ئینجا چوویە ناو ا خۆی گەیاند بە فارس.[3]

ئەبونەعیم لە(الدلائل ص٢٠٨) لە ئەبو هورەیرەوەو تەبەرانیش لە ئەبو هورەیرەوەو ئیبن ئەبی دنیا لە سەهمی كوڕی بنجاب و بەیهەقی لە ئەنەسەوە هێناویانە، وەك دواتر فەرمودەی ئەوانە دێنین. فەرمودەش لەسەر تێپەڕینی

---

[1] – ضعیف.

[2] – ئیبن عەساكیرو ئەبو شەیخ و جگە لەوانیش هێناویانە.

[3] – صحیح.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە دیجلە لە ڕۆژی شەڕی قادسیە دێنین، تیایدا قسەی حوجری کوڕی عەددی هەیە جێ ڕێتان لێ دەگرێت بپەڕنەوە بۆ ئەو دوژمنانە جگە لەو دڵۆپە ئاوە، واتە دیجلە(وما كان لنفس ان تموت إلا بأذن الله كتاب مؤجلا) پاشان ئەسپەکەی تاو دایە ناوی، خەڵکیش بە دوایدا چوون، کە دوژمن ئەوانیان بینین وتیان دیوان(دێوەکان) ڕایانکرد.[1]

ئەبو نەعیم لە(الدلائل ص٢١٢) لەموعاویەی کوڕی حەرمەلەوە هێناویەتی، فەرمودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە: لە ناوچەی(الحرة) ئاگرێ دەرچوو، عومەر هات بۆ لای تەمیم وتی بڕۆ بۆ لای ئەو ئاگرە، وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران من کێم؟ من چیم؟ بەردەوام پێی وت تا لەگەڵی هەستا. دەڵێت منیش شوێنیان کەوتم چوین بۆ لای ئاگرەکە، بەدەستی لای دەدا بەوجۆرە تا چوویە ناو دۆڵەکەو تەمیم بە دوایدا چوو، عومەر وتی: ئەوە بینیوەتی وەك ئەوەنیە کە نەیبینیوە، بەیهەقی و.هێناویانە وەك دواتر دەیهێنین لە باسی پاڵ پشتیە غەیبیەکان لە گوێ ڕایەڵی ئاگردا.

نەسائی لەئەبو سەکینە کەسێکی بەحرەینەوە لەکەسێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بەهەڵکەندنی خەندەق بەردێکیان هاتە ڕێ و ڕێی لێگرتن، پێغەمبەر(ﷺ) هەستا و پاچەکەی هەڵگرت و لە لای خەندەقەکەوە عەباکەی دانا و فەرمووی(وتمت لكمة صدقا وعدلا لامبدل لكلماته وهو السميع العليم) سێ یەکی بەردەکە شکا و سەلمانی فارسیش وەستابوو سەیری دەکرد لەگەڵ لێدانەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) بەردەکەبریسکەیەکی کرد، پاشان بۆ جاری دووەم لێیداو فەرمووی(وتمت كلمة ربك صدقا وعدلا لامبدل لكلماته وهو السميع العليم) بەشی دووەمی لاچوو بریسکەیەکی کرد، سەلمان بینی. پاشان جاری سێیەم لێیداو فەرمووی(وتمت كلمة ربك صدقا وعدلا لامبدل لكلماته وهو السميع العليم) بەشی سێیەمیش کە مابوو شکاو پێغەمبەر(ﷺ)هاتە

[1] - ئیبن ئەبی حاتەم لە حەبیبی کوڕی زبیانەوە هێناویەتی.

دەرو عەباکەی کردو دانیشت، سەلمان وتی ئەی پێغەمبەری خوا بینیم کە لێت دەدا بریسکەیەکی لەگەڵدابوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەی سەلمان ئەوەت بینی؟) وتی ئەرێ سوێند بەوکەسەی تۆی بەحەق ناردوە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(فأني حين ضربت الضربة الأولى رفعت لي مدائن كسرى وما حولها ومدائن كثيرة حتى رايتها بعيني) واتە(دەی من کاتێ لێدانی یەکەمم لێدا مەدائینی کیسراو چواردەوری و مەدائینێکی زۆرم بۆ بەرزکرایەوە تا بەچاوەکانم بینیم) یەکێ لەهاوەڵان کە لە لای بوو وتی ئەی پێغەمبەری خوا لەخوا داوابکە فەتحی بکات بۆمان و نەوەکانیان بەدەست کەوتمان بکات و بەدەستمان وڵات و نەوەیان بەوێران بەرین، پێغەمبەر(ﷺ) نزای کردو فەرمووی(پاشان لێدانی دووەمم لێدا مەدائینی قەیسەرو چواردەوریم بۆ بەرزکرایەوە تا بەچاوەکانی خۆم بینیم) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا لەخوا داوا بکە فەتحی بکات بۆمان تا ژن و ماڵ و منداڵیان بەدەسکەوت بگرین و وڵاتیان وێران بکەین بەدەستەکانمان، نزای کردو پاشان فەرمووی(پاشان لێدانی سێیەمم لێداو مەدائینی حەبەشەو شوێنەکانی چواردەوریم بۆ بەرزکرایەوە تا بە چاوەکانم بینیم) پاشان فەرمووی(دعوا الحبشة ما ودعكم واتركوا الترك ماتركوكم) واتە(واز لەحەبەشە بهێنن تا کاتێ وازتان لێ دێنن و واز لەتورک بهێنن تا وازتان لێ دەهێنن)[1،2].

ئەبوداود لێوەی هێناوە فەرمووی(دعوا الحبشة ما دعوكم واتركوا الترك ما تركوكم) تەواوئیبن جەریر لە عەمری کوڕی عەوفی موزەنیەوە هێناویەتی فەرموودەیەك دێنێت تیایدا هاتووە: پێغەمبەر(ﷺ) هات و پاچەکەی لە دەست سەلمان گرت و دای لە بەردەکەو گەڕایەوەو بریسکەیەکی کرد کە نێوانی ئەملاو لای مەدینەی ڕووناك کردەوەوەك چرای ناو تاریکایی شەوی تاریك، پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ - صحيح.

٢ - ئیبن کەسیر لە(البدایە والنهایە ج٤ص١٠٢) دا دەڵێت نەسائی بەدوورو درێژی هێناویەتی.

الله اکـبری کـردو بـۆ فـەتحو مـسوڵمانانیش الله اکبریـان کـرد، جـاری دووەمو سێیەمیش وابوو، سەلمانو مسوڵمانان پرسیاریان کرد لەپێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەو ڕوناکیـە، فـەرمووی(لەیەکەمـدا کۆشـکەکانی حیرەومـە دائینـی کیـسرام بـۆ ڕونـاك بوونەوە وەك کەڵبەکانی سەگەکان وابوونجبریل پێـی وتم ئوممەتەکەم بەسەریدا زاڵ دەبێت. لەدووەمدا کۆشکە سورەکانی لـەخاکی ڕۆم ڕونـاك بوونـەوە وەك کەڵبـەکانی سەگەکان وابـوون، جبریـل پێـی وتم ئوممەتەکـەم بەسەریدا زاڵ دەبێـت. لەسێیەمدا کۆشکەکانی صـەنها ڕوناك بوونـەوە وەك کەڵبـەکانی سـەگ وابوون جبریـل پێـی وتم کە ئوممەتەکـەم بەسـەریدا زاڵ دەبێـت. دەی موژدەتـان لێبێـت)(لقد اضـاء مـن الأولى قصور الحيرة ومدائن كسرى كأنها انيـان الكـلاب فـأخبرنى جبريـل ان امتـى ضـاهرة عليها ومـن الثانيـة اضـاءت قـصور صنعاء كأنها انيـاب الكـلاب اخبرنـى حبريـل ان امتى ضـاهرة عليها ومن الثالثة اضـاءت قصور صنعاء كأنها انياب الكلاب واخبرنـى جبريـل ان امتـى ضـاهرة عليها فأبشروا) مـسولَمانان موژدە بەخـشن بـوونو وتيـان ﴿هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَاناً وَتَسْلِيماً﴾ دوڕوەکـان وتيان پێتان دەڵێت لەيـەثريبـەوە کۆشـکی حیرەو مـەدائينی کيـسرای بينيـوەو ئـەو شوێنانـە فـەتح دەبن بۆتانو ئێـوەش خـەندەق هەڵدەکـەننو نـاتوانن شـەڕی دەسـتەو يەخە بکەن، ئەم ئايەتە لەسەريان دابەزی: ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُوراً﴾[1][2].

تەبـەرانی لەفەرمودەيەکیدووروودرێـژدا لـە ئـيبن عەباسـەوە هێناويـەتی دواتـر دەيهێنـێن دەڵـێن پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی(دعـونی فـأكون اول مـن ضـربها)(وازم لـێ بهێنن بامن يەکەم کەس بم لێی بدەم) فەرمووی(بسم الله)(بـەناوی خـوا) لێيـداو يـەك لە سێی شکا، فەرمووی(الله اكبر سوێند بە پـەروەردگاری کەعبـە کۆشـکەکانی ڕۆم)

---

[1] – ضعيف.

[2] – ئيبن کەسير لە(البدايه والنهايه ج٤ص١٠) دا دەڵێت ئەم فەرمودە غەريبە.

پاشان لێیداو بەشێکی تری کەوت، فەرمووی(الله اكبر سوێند بە پەروەردگاری کەعبە کۆشکەکانی فارس) ئەو کات دوڕوەکان وتیان ئێمە چاڵ هەڵدەکەنین و ئەویش بەڵێنی کۆشکەکانی فارس و ڕۆممان پێ دەدات[1].[2] دواتریش لەباسی لەباسی نەمانی کاریگەری ژەهردا خواردنەوەکەی خالید دێت کە ژەهری خواردەوە وتی: کەس نامرێ تا سەرەمەرگی نەیەت، یان عەمر وتی: ئەی کۆمەڵی عەرەب سوێند بەخوا ئەوەی دەتانەوێت بە دەستی دێنن تا کاتێ یەکێ لەئێوە لەم سەدەدا هەبێ، بەئەهلی حیرەی وت: باری ڕونتر لەم پێشوازیەم وەك ئەمڕۆ نەدیوە، دواتر لەباسی هۆکارەکانی سەرکەوتندا قسەکەی ثابتی کوڕی ئەرقەم دێنین: ئەی ئەبو هورەیرە خەڵکێکی زۆر دەبینیت، وتم بەڵێ، وتی تۆ لەگەڵ ئێمە بەدرت نەبینیوە، ئێمە بەژمارەی زۆر سەرنەکەوتین، هەروەها کاتێ کەسێ بە خالیدی وت ڕۆم چەند زۆرو موسڵمانان چەند کەمن! ئەویش وتی: ڕۆم چەندە کەمن و موسڵمانان چەندە زۆرن، بەڕاستی سەربازان بە سەرکەوتن زۆرو بە شکست و سەرشۆڕی کەم دەبن نەوەك بە ژمارەی سەرباز، سوێند بەخوا حەز دەکەم ئەسپی(ئەشقەر) بەتواناو حەسانەوە بوایەو ئەوان لە ژمارەدا چەند بەرامبەر بوونایە، نامەکەی ئەبوبەکریش بۆ عەمری کوڕی عاص کە وتی پاشان نامەکەتم بۆ هات باسی کۆبوونەوەی زۆری ڕۆم دەکەیت، خوای گەورە بەزۆری ژمارەو سەرباز ئێمەی لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا سەرنەدەخست، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین و تەنها یەك ئەسپمان لابوو ئێمە بەسەرە سواری وشتر دەبووین و ڕۆژی ئوحود لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یارمەتی ئەوەی دەداین کە لێمان دوادەکەوت، پێشتر وتمان ئەبوبەکر لەناردنی سوپای ئوسامەدا چی کرد کاتێ عەرەب لەهەموو لایەکەوە دایان بەسەریداو هەڵگەڕانەوەو دووڕوویی

---

[1] – صحیح.

[2]– هەیسەمی ج٦ص١٣٢ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لەعەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و نەعیمی عەنبەری کە جێ متمانەشن، تەواو.

خۆی نواندو جولەکەو مەسیحی سەریان بەرز کردبوویەوەو موسڵمانانیش لەتاو لەدەستدانی پێغەمبەریان و شەڕو کوژران و زۆری دوژمنیان حاڵیان شێواو بوو. ئاماژەیان کرد بۆ ئەبوبەکر تاسوپای ئوسامە ڕابگرێت. ئەبوبەکر کە لەهەموویان زیاتر یەکلاکەرەوە بوو وتی من سوپایەك ڕابگرم کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردوویەتی، بەڕستی لەسەر شتێکی گەورە بوێری دەنوێنم، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر عەرەب بدەن بەسەرمدا لام خۆشترە لەوەی سوپایەك ڕابگرم کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردوویەتی، ئوسامە بە سوپاکەتەوە بڕۆ بەرەو ئەو لایەی فەرمانت پێکراوە. دواتر بەوجۆرە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردیت بەرەو فەلەستین و خەڵکی موئتە شەڕ بکەن، چونکە خوا بەسە بۆ ئەوەی بەجێیدەهێڵێت. هەروەها باسی ڕۆژی موئتەمان کرد کە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کاتێ بینی دوژمن دووسەد هەزار سوپای کۆکردۆتەوە وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا ئەوەی ڕقتانە لێی ئەوەیە کە بۆی دەرچوون و بەدوای شەهیدیدا دەگەڕێن. ئێمە بەژمارەو هێزو زۆری شەڕ ناکەین، ئێمە تەنها بەم ئایینە شەڕیان لەگەڵ دەکەین کە خوا پێی ڕێزداری کردووین، دەی بەڕێ کەون، ئەمە یەکێکە لەدوو چاکەکە سەرکەوتن یان شەهیدی، خەڵکی وتیان بەخوا ئیبن ڕەواحە ڕاست دەکات.

لەوبارەوە چەندین چیرۆکی هاوەڵان بڵاون لەم کتێبەو کتێبەکانی فەرموودەو غەزاو ژیاننامەدا هاتوون، بۆیە درێژەی پێ نادەین و دووبارەیان ناکەینەوە.

# (ڕاستیو پڕاوپڕی باوەڕ)

ئیبن عەساكیر لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەچوویە مزگەوتو حارثی كوڕی مالیك ڕاكشابوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە قاچی جووڵاندیو فەرمووی(سەرت بەرز بكەرەوە) ئەویش سەری بەرز كردەوەو وتی: بە دایكو باوكمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(كیف اصبحت یا حارث بن مالك؟) واتە(بارت چۆنە ئەی حارثی كوڕی مالیك؟) وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەحەق باوەڕدارم، فەرمووی(ان لكل حق حقیقة فما حقیقة ماتقول؟) واتە(هەر حەقێك ڕاستییەكی هەیە، ئەی ڕاستی ئەوەی دەیڵێیت چییە؟)وتی: دەستم لە دنیا دوور گرتووەو ڕۆژم تینوێتیو شەوم بێدارییە، وەك ئەوەی خستنەڕووی پەروەردگارم لەبەر چاو بێت، وەك ئەوەی سەیری بەهەشتیەكان بكەمو لەسەردانی یەكدانو دۆزەخیەكان لەهاوارو نركەدان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(انت امرؤ نوّر الله قلبك، عرفت فالزم) واتە(تۆ كەسێكیت خوا دەروونی ڕووناك كردوویت زانیت دەی پەیوەستی بە).[1]

عەسكەری لە ئەنەسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، بەڵام ناوی بەحارثەی كوڕی نوعمان هێناوە، لەگێڕانەوەیەكدا هاتووە فەرمووی(ابصرت فالزم) واتە(ڕوونبین بوویت دەی پەیوەستی بە) پاشان فەرمووی(عبد الله نوّر الإیمان فی قلبه) واتە(بەندەیەك خوا ڕووناكی ئیمانی خستۆتە دڵتەوە) وتی ئەی پێغەمبەری خوا نزای شەهیدیم بۆ بكە، ئەویش نزای بۆ كرد، ڕۆژێ هاواركرا ئەی ئەسپی خوا بەڕێكەوە، یەكەم سوارو یەكەم شەهیدی ناو سوارەكان ئەو بوو.[2]

ئیبن نەجار لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڕێدا دەچوو كە گەنجێكی پشتیوانان هات بەرەو ڕوویو پێغەمبەر(ﷺ) پێی

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە(منتخب كنز العمال ج٥، ص١٦٠) دا واهاتووە.

فەرموو(كيف أصبحت ياحارث؟) واتە(ئەی حارث چۆنیت؟) وتی: باوەڕی بە حەقم بەخوا هەیە. فەرمووی(انظر ماتقول فأن لكل قول حقيقة) واتە(بزانە چی دەڵێیت، چونكە هەر قسەیەك ڕاستییەكی هەیە) وتی ئەی پێغەمبەری خوا -بە هەمان شێوەی پێشوو هێناویەتی لەگەڵ زیادەیەك لە كۆتاییەكەیدا-.[1]

ئیبن موبارەك لە(الزهد) لە صاڵحی كوڕی مسمارەوە بە هەمان شێوەی دەقی ئیبن عەساكیر هێناویەتی، لەگێڕانەوەیەكدا فەرمووی(هەر قسەیەك ڕاستییەكی هەیە، ئەی ڕاستی ئیمانی تۆ چییە؟)[2،3].

ئەبو نەعیم لە(الحلية ج١، ص٢٤٢) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە هێناویەتی موعاذی كوڕی جەبەل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی(كيف أصبحتَ يامعاذ؟) وتی: باوەڕم بە خوای گەورە هەیە، فەرمووی(ان لكل قول مصداقاً ولكل حق حقيقة فما مصداق ماتقول؟) واتە(هەر قسەیەك پشت ڕاستكردنەوەیەكی هەیە، هەر حەقێك ڕاستییەكی هەیە، ئەی پشت ڕاستكردنەوەی ئەوەی دەیڵێت چییە؟)

---

[1] - وەك لە(منتخب كنز العمال ج٥، ص١٦١) دا واهاتووە.

[2] - ضعيف.

[3] - ئیبن حەجەر لە(الإصابە ج١، ص٢٨٩) دا دەڵێت گرفتاری بوو، هەروەها عەبدوڕەزاق لەصاڵحی كوڕی مسمارو جەعفەری كوڕی بەرقانەوە هێناویەتی، لەتەفسیردا لە یەزیدی سلمی دا واهێناویەتی و بە مەوسولی هاتووە -فەرموودەكە ئەنەس دێنێت- و دەڵێت تەبەرانی و ئیبن موندە هێناویانەو بەیهەقی لە(الشعب) لەڕێگەی یوسفی كوڕی عەتیەی صافارەوە هێناویەتی كە تەواو لاوازە. بەیهەقی دەڵێت: ئەمە مونكەرە یوسف قسەی جیا دێنێت، جاریێ دەڵێت حارسە، ئیبن صاعد دەڵێت ئەم فەرموودە نەسەلمێنراوە مەوسول بێت- تەواو بەكورتی- بەزاریش لە ئەنەسەوە هێناویەتی،(هەیسەمی ج١، ص٥٧) لەسەنەدەكەدا یوسفی كوڕی عەتیە هەیە كە جێ بەڵگە نییە، تەبەرانی لەحارسی كوڕی مالیكی ئەنسارییەوە هێناویەتی دای بەلای پێغەمبەردا(ﷺ)، ئەویش فەرمووی(كيف اصبحت يارحاپە؟) بە هەمان شێوەی فەرموودەكەی ئیبن عەساكیر دەیهێنێت.(هەیسەمی ج١، ص٥٧) لەسەنەدەكەدا ئیبن لوهەیعە هەیە لەسەنەدەكەدا كەسی واهەیە كە پێویستە پەردەی لەسەر هەڵدرێ.

وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر بەیانییەك هەڵدەسم وادەزانم شەوم نایەت و هەر ئێوارەیەکیش دێت وادەزانم ڕۆژ ناکەمەوە. هەر هەنگاوێ دەنێم وادەزانم هەنگاوی دواترم بۆ نییە، تادەبینم هەر دەستەو بانگدەکرێن بۆ نامەکەیان و پێغەمبەریان و ئەو بتانەیان لەگەڵدان کە لە بری خوا دەیانپەرستن، سزای دۆزەخیەکان و پاداشتی بەهەشتیەکانم لەبەرچاوە، فەرمووی(عرفت فالزم) واتە(زانیت، دەی پەیوەستی بە).

پێشتر لە بەشی بانگەواز بۆ خواو پێغەمبەرەکەی فەرموودەکەی سوەیدی کوڕی حارثمان هێنا کە وتی لەگەڵ شەش کەسی هۆزەکەمدا چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ چووین بۆ لای و دواندمان کە شێوە جوانی و ڕازاوەیی ئێمەی بینی سەرسام بووم، فەرمووی(ئێوە کێن؟) وتمان باوەڕدارین. زەردەخەنەی کردو فەرمووی(هەر قسەیەك ڕاستییەکی هەیە، ئەی ڕاستی و قسەو باوەڕی ئێوە چییە؟). سوەید وتی: وتمان پانزە خەسڵەت هەن، پێنجیان نێردراوەکانت فەرمانیان پێ کردین بڕوایان پێ بهێنین، پێنجیشیان نێردراوەکانت فەرمانیان پێ کردین کاریان پێ بکەین، ئێنجیشیان لە سەردەمی نەفامیەوە خوومان پێوە گرتوون و لەسەریان دەچین، مەگەر تۆ لە یەکێکیان ناڕازی بیت- فەرموودەکە دێنێت سەبارەت بە ئیمان بە خواو فریشتەو کتێب و نێردراوەکانی و خێرو شەڕی قەدەرو پایەکانی ئیسلام و ڕەوشتە پاك و جوانەکان-.

ئەبو نەعیم لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووم کە حەرمەلەی کوڕی زەیدی ئەنساری لە بەنی حارثەبوو هات بۆ لای و لە بەردەمیدا دانیشت و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیمان لێرەدایە- بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ زمانی- دووڕوویش لێرەدایە- دەستی خستە سەرسنگی- کەمیش یادی خوا دەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو حەرمەلە وتیەوە. پێغەمبەر(ﷺ) لا زمانی حەرمەلەی گرت و فەرمووی(اللهم اجعل له لساناً صادقاً وقلباً شاکرا وارزقه حبي وحب من يحبني وصير أمره الی خير) واتە(خوایە بۆی بکە بە زمانێکی ڕاستگۆو دڵێکی سوپاسگوزارو خۆشەویستی من و ئەوەی منی خۆشدەوێت پێ ی ببەخشە،

باری بگۆڕە بۆ خێر) حەرمەلە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من چەند برایەکی دووڕووم هەیە لەنێوانیاندا گەورەیان بووم نەتبەم بۆ لایان؟. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرکەس وەك تۆ بێت بۆ لامان داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەین، وەك بۆ تۆمان کرد، هەرکەس لەسەر ئەوە سووربێت خوا لەپێشتری بۆی)(من جاءنا کما جئتنا استغفر له کما استغفرنا لك ومن أصرّ علی ذلك فالله أولی به)[1] [2].

# (باوەڕهێنان بە زاتو سیفاتەکانی خوای گەورە)

بەیهەقی لە(الأسماء والصفات ص٢٠٨) لە عائیشەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی بەسریەیەکەوە نارد، لە نوێژەکانیدا قورئانی بۆ هاوەڵەکانی دەخوێندو قل هو الله احدی دەخوێند، کاتێ گەڕانەوە ئەوەیان باسکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی(پرسیاری لێ بکەن لەبەرچی ئاوای دەکرد؟) پرسیاریان لێکردو وتی چونکە سیفەتی خوایە منیش حەز دەکەم بیخوێنم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(أخبره أن الله عزوجل یحبه) واتە(هەواڵی پێ بدەن خوای گەورە خۆشی دەوێت).[3]

بەیهەقی لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی حەبر هات بۆ لای پێغەمبەرو(ﷺ) وتی ئەی محەمەد -یان ئەی پێغەمبەری خوا- خوای گەورە ئاسمانەکانی لەسەر چەند پەنجەیەكو زەوییەکانی لەسەر چەند پەنجەیەكو شاخو دارو درەختی لەسەر چەند پەنجەیەكو ئاوی لەسەر چەند پەنجەیەكو هەموو

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە(کنز العمال ج٢، ص٢٥٠) دا هاتووە. تەبەرانی بە€ سەنەدی بێ گرفت هێناویەتی، ئیبن مندەش هێناویەتی. لە(فوائد)ی هیشامی کوڕی عەماردا گێڕانەوەی ئەحمەدی کوڕی سولەیمانمان لە فەرموودەی ئەبودەرداوە بە هەمان شێوە هێناوە، وەك لە(الإصابە، ج١، ص٣٢٠) دا هاتووە.

[3] – بوخاریو موسلیم لەعائیشەوە هێناویانە، وەك هەیسەمی دەڵێت.

دروستکراوەکانی لەسەر چەند پەنجەیەك داناوە، دەیانهەژێنیٚ و دەفەرمووێت من مەلیکم، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی تا دانەکانی دەرکەوتن وەك بەڕاست دانانی قسەکەی، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.[1]

بەیهەقی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرا بێباوەڕ لەڕۆژی دواییدا چۆن لەسەر ڕووی موحاسەبە دەکرێت؟ فەرمووی(الذي امشاه علی رجلیه في الدنیا قادر أن یمشیه علی وجه یوم القیامة) واتە(ئەوەی لە دونیادا لەسەر قاچەکانی دەیبات بەڕێوە دەتوانێت لە ڕۆژی دواییدا لەسەر ڕووی بیبات بەڕێوە).[2]

ئەحمەد لەحوزەیفەی کوڕی ئوسەیدەوە هێناویەتی دەڵێت ئەبوزەر هەستاو وتی ئەی بەنی غیفار بڵێن و سوێند مەخۆن، چونکە ڕاستگۆیی و بەڕاست دانراو پێ ی وتم خەڵکی بەسیٚ دەستە موحاسەبە دەکرێن، دەستەیەك سوارەی پۆشتەی تێرن، دەستەیەك دەچن و ماندوودەبن و هەوڵ دەدەن، دەستەیەك فریشتەکان لەسەر دەم و چاویان ڕایاندەکێشن و بەرەو دۆزەخیان دەبەن. یەکێکیان وتی: ئەو دووانە دەزانین، بەڵام ئەوانەی بەپیٚ دەچن و هەوڵ دەدەن و ماندوو دەبن باریان چۆنە؟ وتی خوا دەرد دەنێرێت بۆ سوار تائەوەی سوار نامێنیٚ تاکەس دەبێت باخێکی سەرسوڕهێنەری دەبێت دەیدات بەوشترێکی بە تەمەنی کۆپاندار کەچی توانای بەسەردا نابیٚ).[3]

---

[1] – بوخاری و موسلیم هێناویانە وەك بەیهەقی دەڵێت.

[2] – بوخاری و موسلیم و ئەحمەدو نەسائی و ئیبن ئەبی حاتەم و حاکم و جگە لەوانیش بە هەمان شێوە لە ئەنەسەوە هێناویانە، وەك لە(کنز العمال ج٧، ص٢٨٠) دا هاتووە.

[3] – لە(تەفسیری ئیبن کەسیر ج٣، ص٦٥) دا واهاتووە.

حاکم(ج٤، ص٥٦٤) لەحوزەیفەی ئەبو زەرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و دەڵێت: ئەم فەرموودە تاوەلیدی کوڕی جەمیع سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوەو زەهەبی دەڵێت: موسلیم بەموتابەعە بۆی گێڕاوەتەوەو نەسائیش بەبەڵگەی هێناوە.

بەیهەقی لە(الأسماء والصفات ص١١٠) لەتوفەیلی کوڕی عەبدوڵلای برای عائیشە(لەدایکیەوە) هێناویەتی لە خەویدا بینی بە دەستەیەکی مەسیحیەکان گەیشت و وتی: ئێوە خەڵکێکی زۆرباشن ئەگەر بێتو نەڵێن عیسای کوڕی خوایە، وتی ئێوە باشن ئەگەر نەڵێن ماشاءاللهء وشاء محمد، پاشان گەیشت بەدەستەیەکی جوولەکەو وتی ئێوە باشن ئەگەر نەڵێن عوزەیر کوڕی خوایە، ئەگەر نەڵێن ماشاءالله وشاء محمد، دەڵێت: هات بۆ لای پێغەمبەرو(ﷺ) بۆی گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی(حدثت بها أحد بعد؟) واتە(بۆ کەست گێڕاوەتەوە؟)وتی بەڵێ، ئەویش سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو فەرمووی(إن اخاكم قد رأى مابلغكم فلا تقولوها ولكن قولوا ماشاءالله وحده لاشريك له) واتە(براکەتان ئەو خەوەی بینیوە کە بیستوتانە، دەی مەیڵێن و بیڵێن ماشاءالله وحده لاشريك له).

هەروەها لەحوزەیفەوە دەڵێت: کەسێ لەموسڵمانان لەخەویدا بینی گەیشت بەکەسێکی ئەهلی کیتاب و پێی وت: ئێوە زۆر باشن ئەگەر بێتو هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن و نەڵێن ماشاءالله وشاء محمد، ئەو خەوەی باسکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی(إن كنت لأكرهها لكم، قولوا ماشاءالله ثم شاء فلان) واتە(من پێشتر حەزم نەدەکرد ئەوە بڵێن خوا ویستی پاشان فلان ویستی).[1]

[1] – صحیح.

بەیهەقی لە(الأسماء والصفات ص١١٠) لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و هەندێ کاری هەبوو، کابرا بە پێغەمبەری(ﷺ) وت(ماشاءالله وشئت) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی(اجعلتني لله عدلاً بل شاء الله وحده) واتە(ئایا منت خستە ڕیزی خوا، بەڵکو بەتەنها خواویستی).[1]

بەیهەقی لە ئەوزاعیەوە هێناویەتی دەڵێت: جوولەکەیەك هات بۆ لای پێغەمبەرو(ﷺ) لەسەر ویست پرسیاری لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(المشیئة لله تعالی) واتە(ویست بۆ خوای گەورەیە) کابرا وتی دەی من دەمەوێت هەستم، فەرمووی(فقد شاءالله أن تقعد) واتە(دەی خوا ویستی تۆ دانیشیت) وتی دەی من دەمەوێت ئەو دارخورمایە ببڕم، فەرمووی(فقد شاءالله أن تقطعها) واتە(دەی خوا دەیەوێت تۆ بیبڕیت) وتی دەی من دەمەوێت نەیبڕم، فەرمووی(فقد شاء الله أن تترکها) واتە(دەی خوا ویستوویەتی نەیبڕیت). جبریل(علیه السلام) هات بۆ لای و وتی: وەك ئیبراهیم بەڵگەت پێدرا، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾[2].[3]

بەیهەقی لە(الأسماء والصفات ص١٠٩) لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لەحودەیبیە گەڕایەوە لەشوێنێ دابەزیو لەوێ شەو چوونەماڵێك، فەرمووی((کێ پاسەوانیمان دەکات؟) عەبدوڵڵا وتی من ، فەرمووی(تۆ– دوو یان سێ جار– خەویت) پاشان فەرمووی(تۆ پاسەوانی بکە) منیش پاسەوانیم کرد تادەمەو بەیانی هات فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتەدی و خەوتم، تا گەرمای خۆر هات ئینجا هەستاین. پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو وەك جارانی

---

[1] – صحیح.

[2] – ضعیف.

[3] – بەیهەقی دەڵێت: ئەم فەرموودە ئەگەرچی مورسەلە بەڵام مەوسولەکانی پێشتری لەسەر واتاکەی پشتگیری دەکەن، تەواو.

کردو پاشان نوێژی بەیانی کردو پاشان فەرمووی(إن الله تعالى لو شاء لم تناموا عنها ولكن اراد ان تكون لمن بعدكم فهكذا اي لمن نام أو نسي) واتە(خوای گەورە ئەگەر بیویستایە لەسەر نوێژەکەتان نەدەخەوتن، بەڵام ویستی وابێت بۆ ئەوانەی دوای ئێوە دێن، دەی بەو جۆرەیە واتە بۆ ئەوەی خەوتووە یان لەبیری چووە).

هەروەها لەعەبدوڵلای کوڕی ئەبو قەتادەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ان الله تعالى قبض أرواحكم حين شاء وردّها حين شاء) واتە(خوا کەی بیەوێت گیانەکانتان دەگرێت(دەباتەوە)و کەی بیەوێت دەیگێڕێتەوە) ئەوانیش پێویستیان بەجێگەیاندو دەستنوێژیان گرت تاڕۆژ(سپی بوو) پاشان هەستاو نوێژی کرد.[1]

عومەری کوڕی جەریرو ئیبن خسرەو –دەقی ئەوە– لەتاریقی کوڕی شەهابەوە هێناویانە دەڵێت: جولەکەیەك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب(خوای لێ ڕازی بێت) وتی سەیری ئەم ئایەتە ناکەیت ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ﴾ ئەی ئیتر دۆزەخ لە کوێدایە؟، عومەر بەهاوەڵانی وت وەڵامی بدەنەوە، کەسیان وەڵامیان پێ نەبوو، عومەر وتی ئەگەر شەو هات دنیای پڕکردەوە(داگرتەوە) ئیتر ڕۆژ لەکوێیە؟ وتی لەوێیە کە خوا دەیەوێت، عومەر وتی دەی دۆزەخیش وایە، جولەکەکە وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەوە لە کتێبی خوادا هەیە کە تۆ وتت.[2]

ئیبن ئەبی حاتەم لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکیەوە لە عەلیەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی دەڵێت: بە عەلی وترا لێرەدا کەسێ هەیە قسە لەسەر ویست دەکات، عەلی پێی وت(ئەی بەندەی خوا، خوا بەویستی خۆی تۆی دروستکرد یان بە ویستی تۆ؟ وتی: بە ویستی خۆی، وتی: ئەی بە ویستی

[1] – بوخاری بەو سەنەدە هێناویەتی.

[2] – لە(كنز العمال ج٧، ص٢٧٧) دا واهاتووە.

خۆی نەخۆشت دەخات یان بەویستی تۆ؟ وتی بە ویستی خۆی، وتی ئەی بۆ شیفا؟ وتی: بە ویستی خۆی، وتی: ئەی بەویستی خۆی دەتبات بەرەو شوێنێ یان بە ویستی تۆ؟ وتی: بە ویستی خۆی. وتی: سوێند بەخوا ئەگەر جگە لەوەت بوتایە دەمدا لەوەی چاوەکانتی تیایە(واتە ملت).[1]

بەزار لە موسنەدەکەیدا لەسەئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە لە لای تۆ لەبارێکداین، کە لێت دوور دەکەوینەوە بارمان دەگۆڕێت، فەرمووی(کیف انتم وربکم؟) واتە(لەگەڵ پەروەردگارتان چۆنن؟)وتیان لەئاشکراو نهێنیدا پەروەردگارمانە. فەرمووی(لیس ذلکم النفاق) واتە(ئەوە دووڕوویی نییە)[2][3].

ئیبن نەجار لەئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەشتەکیەك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: کێ لەڕۆژی دواییدا لێپێچینەوەی دروستکراوەکان دەکات ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: خوای گەورە(الله عزوجل) وتی: بەخوای کەعبە براوەین، فەرمووی(وکیف یااعرابي؟) واتە(چۆن ئەی دەشتەکی؟)وتی: بەخشندە کە پێوانەی کرد لێبووردنی هەیە.[4]

عەبدوڕەزاق و محاملی لەسەعیدی کوڕی موسەیبەوە هێناویانە عومەری کوڕی خەتتاب موعاذی نارد بۆ لای بەنی کیلاب تا زەکاتیان کۆبکاتەوە، ئەویش لەناویاندا دابەشی کرد تاهیچی نەهێشتەوە، تاهاتەوە ئەو شوێنەی لێی چوو بوو ئەوەی پێ بوو، ژنەکەی پێی وت: ئەی کوا ئەوەی کە کارکاران وەك دیاری سەفەر دەیهێنن بۆ ماڵ و منداڵیان؟ وتی: من پارێزەرێکم لەگەڵ بوو، وتی: تۆ لای

---

[1] – لە(تفسیر ئیبن کەسیر. ج٣. ص٢١١) دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤، ص٣٩٧ دا واهاتووە.

[4] – لە(کنز العمال ج٧، ص٢٧٠) دا واهاتووە.

پێغەمبەرو(ﷺ) ئەبوبەکر جێ دڵنیایی بوویت ئێستا عومەر چاودێری لەگەڵ ناردیت؟ ئەوەی برد بۆ لای ژنەکانی و سکاڵای لەعومەر کرد، عومەر ئەوەی بیستەوەو موعاذی بانگکردو وتی من کەسی وام لەگەڵ ناردیت؟ وتی: من هیچ بیانوویەکم بۆی نەبوو جگە لەوە، عومەر پێکەنی و شتێکی پێداو وتی بەمە ڕازی بکە. ئیبن جەریر دەڵێت مەبەستی موعاذ خوای پەروەردگار بووە.[1]

ئیمامی ئەحمەد لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: سوپاس بۆ خوا کە هەموو دەنگەکان دەبیستێت. ئافرەتێ هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) قسەی لەگەڵ کردو من لە لایماڵەکەوە بووم و نەمدەبیست چی دەوت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾.[2][3]

لە گێڕانەوەیەکی ئیبن ئەبی حاتەمدا وەك لە(تفسیر ابن کثیر ج٤، ص٣١٨) دا هاتووە، لەعائیشەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: گەورەیی بۆ ئەو خوایەی بیستنی هەموو شتێ دەبیستێ. من گوێم دەگرت لە قسەی خەولەی کچی ئەعلەبەو هەندێکم نەدەبیست کاتێ سکاڵای لای پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد لەسەر مێردەکەی خەولە دەیوت ئەی پێغەمبەری خوا سامانی خواردم و گەنجی فەوتاندم و سکمم گوشی بۆی تا پیربووم و منداڵ بوونم نەما ئێستا زیهاری لەڕوودا نواندووم. من سکاڵات لادەکەم، هێندەی نەبرد جبریل ئەم ئایەتەی هێنا ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي

[1] – لە(کنز العمال ج٧، ص٨٧) دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – بوخاری لە(کتاب التوحید) دا بە تەعلیقی هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٣١٨) دا واهاتووە. بەیهەقی لە(الاسماو والصفات ص١٣٦) دا هێناویەتی.

زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ دەڵێت مێردەکەی خەوله ئەوسی کوڕی صامت بوو.[1]

بوخاری لە مێژووەکەیداو عوسمانی دارمی لەوەلآمدانەوەی جوهەمیەو ئەسبەهانی لە(الحجة) لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) مرد ئەبوبەکر وتی: ئەی خەڵکینە ئەگەر موحەممەد ئەو خوایەتان بوو کە دەتانپەرست ئەوە مرد، ئەگەر خواتان ئەوەیە کە لە ئاسمانە، ئەوا نەمردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ﴾.[2]

پێشتریش وتارەکەی ئەبوبەکرمان هێنا کە تیایدا وتی خوای گەورە تەمەنی دا بە موحەممەد(ﷺ) تا ئایینی خوای گەیاندو فەرمانی خوای سەرخستو پەیامی خوای گەیاندو لەڕێی خوادا جیهادی کرد، پاشان لەسەر ئەوە مراندیو لەسەر ئەو ڕێگە بەجێی هێشتن، دەی دوای ڕوونیو شیفا کەس لەناوناچێ. هەرکەس خوا پەروەردگاریەتی، خوا زیندووەو نامرێت، هەرکەسیش موحەممەدی دەپەرستو بەخوای دەزانی ئەوا خواکەی مرد. دەی خەڵکینە لە خوا بترسن بە ئایینتانەوەو پشت ببەستن بە پەروەردگارتان، چونکە ئاینی خوا زاڵەو پەیامی خوا تەواوەو خوا هەرکەس سەر دەخات کە سەری دەخاتو ئایینی خۆی سەربڵند دەکات. کتێبی خوا لەبەردەستماندایەو قورئانیش ڕووناکیو شیفایەوخوا بەو قورئانە ڕێنموونی موحەممەدی کردو حەڵاڵو حەرامی خوای تێدایە، سوێند بە خوا گوێمان لێنییە چ

---

[1] – صحيح.

[2] – ئیبن کەسیر دەڵێت کەسەکانی جێمتمانەن. لە(کنز العمال ج٤، ص٥١) دا واهاتووە.

دروستکراوانێکی خوا له دژمان دێت. شمشێرەکانی خوا هەڵکراون و دایان نانێن و بە دڵنیاییەوە جیهانی دژ بە نەیارانمان دەکەین وەك چۆن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) جیهادمان دەکرد.[1]

حاکم(ج٣، ص٤٧٦) لەعەلقەمە لەدایکیەوە هێناویەتی ئافرەتێك چوو بۆماڵی عائیشەو لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کردو ساغ و سەلامەت بوو، سوجدەی بردو سەری بەرزنەکردەوە تامرد، عائیشە وتی سوپاس بۆ ئەو خوایەی دەمرێنێ و دەیژیەنێت. ئەمە پەندە بۆ من سەبارەت بە عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکر قسەیەکی دەکرد کە بەلادا کەوت، چوون تا بێداری بکەنەوە سەیریان کرد مردووە. گومانێ چووە دەروونی عائیشە کە شتێکی پێکرابێت و مەرگی پێش خرابێت و بە زیندوێتی خرابێتە ژێر خاك. پێی وابوو ئەوە پەندە بۆی بەوە ئەو گومانەی لانەما.

## بڕوابوون بە فریشتەکان

ئیبن جەریر لە عەلیەوە(ر.ض) هێناویەتی دەڵێت: هەر دڵۆپە بارانێك دەبارێت مەگەر ئەوەی بە پێوانە لەسەر دەستی فریشتەیەکە جگە لە ڕۆژی نوح(ع.س) کە مۆڵەت بە ئاو درا بەبێ پێوانە دەرچوو، ئەوەیە دەفەرموێت ﴿بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ﴾ لەخەزێنە لایدا.[2]

ئین سەعد(ج٤، ص٩٢) لە شەعبی لە جەزل لە ژنی سەلمانەوە(بقیرە) هێناویەتی کاتێ سەلمان سەرەمەرگی هات لە ژوورێکدا بوو بانگی کردم ژوورەکە چوار دەرگای هەبوو، وتی ئەی بقیرە دەرگاکان بکەرەوە، چونکە ئەمڕۆ سەردانکەرم

[1] – بەیهەقی لە عروەی کوڕی زوبەیرەوە هێناویەتی.

[2] – لە(کنز العمال ج١، ص٢٧٣) دا واهاتووە.

هەن نازانم لە کامیانەوە دێن بۆ لام، پاشان داوای مسیکی کرد(کە هەیبوو) وتی لەگەڵ ئاو لە تەنورێکدا تێکەڵی بکە بۆم.

منیش وامکرد وتی بیرێژە بە دەوورو بەری جێگەکەمدا پاشان دابەزە دابنیشە، دواتر دێیت لەسەر جێگەکەم دەبینیت. کە هاتمەوە سەیرمکرد گیانی چوو بوو وەك ئەوەی لەسەر جێگەکەی خەوتبێتو بەم جۆرە. هەروەها لە(ج٤، ص٩٢) دا لە شەعبیەوە هێناویەتی کە سەلمان سەرەمەرگی هات بە ژنەکەی وت: ئەو چادرەی داوام لێکردیت بیهێنەو، منیش میسکێکم بۆ هێنا، وتی قاپێکم بۆ بێنە ئاوی تێدا بێت میسکەکەی تێکردو دواتر بە دەستی تواندیەوە وتی بیرێژە بە دەورمدا، چونکە برێ دروستکراوی خوا دێن بۆ لام بۆن دەکەنو خواردن ناخۆن، پاشان دەرگاکەم دابخەو دابەزە. منیش وامکرد کەمێ دانیشتمو دەنگێکم بیست، دواتر چوومە سەر سەیرمکرد مردووە هەروەها لە عەتای کوڕی سائیبەوە بە کورتی هێناویەتیو تیایدا هاتووە: چونکە ئەمشەو لەسەر فریشتە دێن بۆ لام بۆن دەکەنو نان ناخۆن. دواتر لەسەر فریشتەو یارمەتیدانیان چیرۆکی دیکە دەهێنن.

## بڕوا بوون بە قەدەر

موسلیم لە عائیشەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر بانگکرا بۆ لای تەرمی منداڵێکی پشتیوانان وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشبەختی بۆی، چۆلەکەیەکی بەهەشتە، خراپەی نەکردووەو تووشی خراپە نەبووە، پێغەمبەر فەرمووی(او غیر ذلك یا عائیشە إن الله خلق الجنة وخلق لها اهلا وهم فی اصلاب بأبائهم وخلق النار وخلق لها اهلا وهم فی اصلاب ابائهم) واتە(مەگەر جگە لەوە هەیە ئەی عائیشە؟ خوا بەهەشتی دروستکردو خەڵکێکی بۆ دروستکردو ئەوانە لە

پشتی باو باپیرانیانن، دۆزەخیشی دروستکردو خەڵکێکی بۆ دروستکردو لە پشتی باو باپیرانیانن).[1]

ئیمامی ئەحمەد لە وەلیدی کوڕی عوبادەوە هێناویەتی دەڵێت چووم بۆ لای عوبادە کاتێ نەخۆش بوو وا گومانم دەبرد بمرێت، وتم ئەی باوکە گیان؟ وەسیەتم بۆ بکەو قسەم بۆ بکە، وتی دام نیشێنن دایان نیشاندو وت کوڕی شیرینم تۆ تامی ئیمانت نەچەشتوەو واتای حەقیقی زانیاری بەخوات بەدی نەکردووە تا کاتێ بڕوا بهێنین بەخێرو شەڕی قەدەر، وتم بابە گیان من چوزانم خێرو شەڕی قەدەر کامانەن؟ وتی بزانیت ئەو هەڵەو خراپەی دێتە ڕێت لە خۆت نەبووەو ئەوەی توشی کردویت بۆ ئەوە نییە خراپەو هەڵە بێنێتە ڕێت. کوڕی شیرینم من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(إن اول ما خلق الله القلم ثم قال له اكتب فجرى في تلك الساعه بما هو كائن إلى يوم القيامة) واتە(یەکەم شت خوا دروستی کرد پێنوس بوو، پاشان پێی فەرموو بنوسە، لەوکاتەوە چی هەبوو هەیە تا ڕۆژی دوایی نووسی) کوڕی شیرینم ئەگەر مردیت و لەسەر ئەو بیرو باوەڕە نەبیت دەچیتە دۆزەخ.[2][3]

ئەحمەد لە ئەبو زەرەوە هێناویەتی یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر کە پێی دەوترا ئەبو عەبدوڵڵا هاوەڵانی هاتن بۆ لای و سەردانیان دەکردو ئەویش دەگریا، پێیان وت بۆچی دەگریت؟ مەگەر پێغەمبەر(ﷺ) پێی نەفەرموویت(لەسمێلت بگرە(لابە) واتە(خذ من شاربك ثم اقره حتى تلقائي)و دواتر بیوەستێنە تا دەگەیتەوە پێم) وتی با- بەڵام لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(إن الله عزوجل قبض بيمينه

---

[1] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٢، ص٢٦٨) دا واهاتووە.

[2] – صحيح.

[3] – ترمزی لە وەلیدی کوڕی عوبادەوە هێناویەتی دەڵێت فەرموودەکە حەسەنی صەحیحی غەریبە، هەروەها لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٢٦٨) دا هاتووە.

قبضته والآخرى باليد الآخرى قال هذه لهذه وهذه لهذه ولا ابالى) واتە(خوا بە دەستی ڕاستی مشتێکی هەڵگرت و بە دەستەکەی دیکەشی مشتێکی هەڵگرت و فەرمووی ئەمە بۆ ئەمە و ئەمەش بۆ ئەمە باکیشم نییە) جا من نازانم لە کام مشتیانم[1][2].

تەبەرانی لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ سەرە مەرگی هات گریا پێی وترا بۆچی دەگریت؟ وتی بەخوا لە ترسی مەرگ یان بەجێهێشتنی دنیا دوای خۆم ناگریم، بەڵام لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(إنما هما قبضتان فقبضته فی النار وقبضته فی الجنة) واتە(دوو مشتن مشتێ بۆ نا دۆزەخ و مشتێ بۆ ناو بەهەشت) منیش نازانم لە کام مشتیان دەبم[3][4].

ئەحمەدی لە موحەممەدی کوڕی عوبەیدی مەککی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هێناویەتی پێی وترا: کەسێك هات بۆ لامان و بڕوای بە قەدەر نییە، وتی نیشانم بدەن کوێر بوو، وتیان ئەبو عەبباس چی لەگەڵ دەکەیت؟ وتی سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر دەستم بگات پێی قەپێ دەگرم لە لوتی تا دەیبڕم، ئەگەریش دەستم بگات بە ملی دەیشکێنم، من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(كأنی بنساء بنی فهر یطفن بالخزرج تصطفق الیاتهن) واتە(وەك ئەوەی ئافرەتانی بەنی فەهر ببینم تەوافی خەزرەج دەکەی سمتیان(دەشۆکێتەوە) دەجوڵێتەوە). بێباوەڕی ئەوە یەکەم هاوەڵدانانی ئوممەتە سوێند بەو کەسەی

[1] – صحیح.

[2] – (هەیسەمی ج٧، ص١٧٦) دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی(ج٧، ص١٨٧) دەڵێت: لە سەنەدەکەدا بەرائی کوڕی عەبدوڵڵای غەنەوی هەیە کە لاوازە حەسەنیش موعاژی نەبینیوە.

گیانمی بەدەستە ڕاخراپیان کۆتاییان پێ دێنێت تا خوا لەوە دەردەکەن ئەو خێری دانا بێت هەروەها لەوە دەری دەکەن کە ئەو خراپەو شەڕی دیاری کردبێت.[1]

ئیبن ئەبی حاتەم لە عەتای کوڕی ئەبو باحەوە هێناویەتی وتی: چووم بۆ لای ئیبن عەبباس کاتێ لە ئاوی زەمزەم ئاوی دەهێنا، خوارووی جلەکانی تەڕبوو، پێم وت قسە لەسەر قەدەر کرا وتی ئایا ئەوەیان کرد؟ وتم بەڵێ، وتی بە خوا ئەم ئایەتە لەسەر ئەوان دابەزیوە ﴿ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَإِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾(القمر ٤٨-٤٩) ئەوانە خراپەکانی ئەم ئوممەتەن، سەردانی نەخۆشیان مەکەن و لەسەر مردوویان نوێژ مەکەن، هەرکامیان ببینم بەم پەنجانەم چاوەکانی کوێر دەکەم.[2]

ئەبو نەعیم لە(الحلیة ج١، ص٣٢٥) لە ئیبن عەبباسەوە هێنایەتی دەڵێت: حەزم دەکرد کەسێکی ئەهلی قەدەرم لابێت تا سەری لێکەمەوە، وتیان بۆچی؟ وتی چونکە خوا لەوحی پارێزراوی لە گەوهەری سپی دروست کردووەو لاکانی یاقوتی سوورن پێنووسەکەی ڕووناکی و کتێبەکەی ڕووناکی و پانیەکەی هێندەی نێوانی ئاسمان و زەوییە. هەموو ڕۆژێ سێ سەدو شەست جار سەیری دەکات و بە هەر ڕوانینێك دروست دەکات و زیندووی دەکاتەوەو دەمرێی و سەر بەرز دەکات و کەس سەر شۆڕ دەکات و چی ویست دەیکات.

ئەحمەد لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت هاوڕێیەکی خەڵکی شامی هەبوو نامەی دەنووسی، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر نامەی بۆ نووسی بیستوومە لە شتێکی قەدەردا قسەت کردوە ئیتر هیچم بۆ نەنووسیت، چونکە من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(سیکون فی امتی اقوی یکذبون بالقدر) واتە(دواتر لە ئوممەتەکەمدا خەڵکێ دەبن قەدەر بە درۆ دەزانن).[3][1]

---

[1] – ضعیف.

[2] – تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٢٦٧).

[3] – حسن.

ئیبن عەبدولبر لە نزالی کوڕی سبرەوە هێناویەتی دەڵێت بە عەلی وترا ئەی ئەمیری باوەڕداران لێرەدا خەڵکێ هەن دەڵێن: خوا نازانیت چی دەبێت تا شتەکە دەبێت، وتی: دایکیان ڕۆڵە ڕۆیان بۆ بکات، لە کوێ ئەوەیان وت؟ وتیان لێکدانەوەی قورئان دەکەن، ئەو ئایەتەی دەفەرموێت ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ﴾ عەلی وتی: هەرکەس نەزانێت ماڵ وێران دەبێت، پاشان چوویە سەر مینبەرو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو وتی: ئەی خەڵکینە زانست وەربگرن و کاری پێبکەن و خەڵکی فێر بکەن، هەرکەس لە قورئاندا کێشەیەکی هەیە با پرسیارم لێبکات، بیستوومە خەڵکێك دەڵێن: خوا نازانێت چی دەبێت تا شتەکە ڕوودەدات بە بەڵگەی ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ﴾ ئەو ئایەتە(حتى نعلم) دەڵێن تا بزانین کێ جیهادو خۆڕاگر بێت و ئەوەی لەسەریەتی بێتە ڕێی.[٢]

پێشتر قسەی عەلیمان(خوای لێ ڕازی بێت) هێنا کە وتی لەسەر زەویدا هیچ نابێ تا لە ئاسماندا بۆی دیاری نەکرێ، هەرکەسەو دوو فریشتەی بۆ ڕاسپێردراون ڕێگری و پارێزگاری دەکەن تا قەدەری دێت ئەوکات نێوانی ئەو کەسەو قەدەرەکەی چۆڵ دەکەن، عەلیش لە لایەن خواوە قەڵغانێکی پتەوی هەیە، کە مەرگم هات ئەو قەڵغانەم لەسەر نامێنێ، تامی باوەڕ نازانرێ تا بزانیت ئەوەی تووشی دەبیت لە هەڵەو لاری نییە، ئەوەش بەرەو هەڵە دەچی لەبەر توشکردنت نییە.[٣]

[١]- ئەبو داود لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە هێناویەتی وەك لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٢٦٨) دا هاتووە.

[٢] – لە(كنز العمال ج١، ص٢٦٥) دا واهاتوو

[٣] – ئەبو دەردا لە(القدر) دا هێناویەتی.

بەیهەقی لە(الأسماء والصفات ص٢٤٣) لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب زۆرجار لە سەر مینبەر لە وتاریدا ئەم شیعرەی دەوت:

خفض عليك فأى الامور بكف الأله مقاديرها

فليس يأتيك منهيها ولا قاصر عنك مأمورها

# بڕوابوون بە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

ئیبن ئەبی شەیبەو تەبەرانیو ئیبن مەردەویە لە ئیبن عەبباسەوە هێناویانە دەڵێت ئەم ئایەتە دابەزی ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ﴾ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(كيف انعم صاحب القرن قد التقم وحتى جبهته يتنضر متى يؤمر فينفغ) واتە( چۆن خۆشی بگوزەرێنم لە کاتێکدا بەرپرسی کەڕەنا دەمی بە کەڕەنا داو تەوێڵی دانەنواندووەو چاوەڕێیە کەی فەرمانی پێبکرێت تا فووی پیا بکات) هاوەڵان وتیان ئەی چی بڵێین؟ (فقولوا: حسبنا الله ونعم الوكيل، على الله توكلنا) واتە(فەرمووی بڵێن خوامان بەسەو چاکترین وەکیلە پشتمان بە خوا بەستووە)[1] لە گێڕانەوەیەکدا کاتێ هاوەڵان ئەوەیان بیست ئەو هەواڵەیان لەسەر سەخت بوو وتیان ئەی پێغەمبەری خوا چی بکەین؟ فەرمووی بڵێن(حسبنا الله ونعم الوكيل) واتە(خوامان بەسەو چاکترین وەکیلە).

یەك چاوەکە دەرچوو وتی بەڵێ، تەواو ترساو ڕاچڵەکی وتی لە کوێ خۆم بشارمەوە، وتی بڕۆرە ناو چادرەکە ئەویش چوو لەوێ خۆی شاردەوە، چادرەکە پیسیو هێلانەی جاڵجاڵۆکەی لێبوو- فەرموودەکە دێنێت تیایدا هاتبوو: پێغەمبەر(ﷺ) چوو سەیری کرد سەودە دەلەرزێت، وتی سەودە چیتە؟ وتی ئەی

---

[1]- لە(كنزالعمال ج٧، ص٢٧٠) دا هاتووەو دەڵێت فەرموودەکە حەسەنە، باوەردی لە ئەرقەمی کوڕی ئەبو ئەرقەمەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی،

پێغەمبەری خوا یەك چاوەكەم دەرچوو، فەرمووی(دەرنەچووە بە دڵنیاییەوە دەردەچێت، دەرنەچووەو بە دڵنیاییەوە دەردەچێت) لە چادرەكە دەری هێناو تۆزی لێ دەتەكاندو تاڵە هێلانەی جاڵجاڵۆكەی پێوە لادەبرد.[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە سەعیدی كوڕی مسەییبەوە هێناویەتی ئەبوبەكر وتی ئایا لە عێراق خاكێ هەیە پێی بوترێ خوراسان؟ وتیان بەڵێ وتی دەی دەجال لەوێوە دەردەچێت، نەعیم لە حەمادەوە لە ئەبوبەكرەوە هێناویەتی دەڵێت: دەجال لە ناوچەی جولەكە نشینی ناو(مەرو) دەردەچێت.[2][3]

ئیبن جەریر لە عەبدوڵڵای كوڕی مالیكەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێ چووم بۆ لای ئیبن عەبباس وتی ئەمشەو تا بەیانی نەخەوتووم وتم بۆچی؟ وتی وتیان هەسارەی كلكدار دەركەوتووە، ترسام دوو كەڵبێت و هاتبێ تا بەیانی نەخەوتم.[4]

## بڕوابوون بەوەی لەناو گۆڕو بەرزەخدا ڕوو دەدات

ئەحمەد لە(الزهد) لە عوبادەی كوڕی نسیەوە هێناویەتی دەڵێت: كاتێ ئەبوبەكر سەرەمەرگی هات بە عائیشەی(ر.ض) وت: ئەم دوو جلەم بشۆو بە وانە كفنم بكە، چونكە باوكت یەكێكە لەو دوو كەسە، یان چاكترین پۆشاكی پۆشیوە یان بە خراپترین شێوە بەرگی لابراوەو دروست كراوەتەوە.[5]

---

[1] – ئەبو یەعلاو تەبەرانی لە رزینەمی مەولای پێغەمبەری خواوە هێناویانە

[2] – ضعیف.

[3] – لە(كنزالعمال ج٧، ص٢٦٣) دا واهاتووە.

[4] – ئیبن ئەبی حاتەم لە عەبدوڵڵای كوڕی مالیكەوە لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی. ئەم سەنەدە بۆ لای ئیبن عەبباس صەحیحە. لە تەفسیری ئیبن كەسیر(ج٤، ص١٣٩) دا واهاتووە. حاكم(ج٤، ص٥٩) لە ئیبن ئەبی مالیكەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، بەڵام لە گێڕانەوەكەی ئەمدا هاتووە وتی: ترسام دەجال هاتبێت. حاكم دەڵێت: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحەو خۆیان نەیانهێناوە، زەهەبیش لەسەری كۆكە.

[5] – لە(المنتخب ج٤، ص٣٦٣) دا هاتووە.

هەروەها ئەحمەدو ئیبن سەعدو دغولی لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێ ئەبوبەکر سەرەمەرگی هات وتم:

لعمرك ما يغني الشراء عن الفت إذا حشرجت يوما وضاق بها الصدر

ئەبوبەکر وتی کچی شیرینم وامەڵێ، بەڵکو بڵێ ﴿وَجَاءتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾(ق:١٩) وتی ئەو دوو جلەم بێنن‌و بیان شۆن دواتر بەوانە کفنم بکەن، چونکە زیندوو لە پێشترە بۆ جلی نوێ تا مردوو، ئەوە تەنها بۆ مۆڵەتە، ئەبو یەعلاو ئەبو نەعیم‌و دغولی‌و بەیهەقی لە عائیشەوە هێناویانە وتی: کاتێ ئەبوبەکر نەخۆشییەکی توندی گرت لە هۆشی برد وتم:

من لايزال دمعه مقنعا فإنه من دمعه مدفوف

کە هاتەوە هۆش خۆی وتی کچی شیرینم وانییە، بەڵکو بڵێ ﴿وَجَاءتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ پاشان وتی پێغەمبەر(ﷺ) لە چ ڕۆژێکدا مرد؟ وتم ڕۆژی دووشەممە، وتی ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ وتم دووشەممە، ئەویش وتی داوام لە خوایە نێوانی من‌و ئەمشەو یەك بخات، شەوی سێ شەممە مرد، وتی پێغەمبەر(ﷺ) لە چەند بەرگدا کفن کرا؟ وتم لە سێ جلی(سحولیدا)[1] سپی نوێ بوون، کراس‌و مێزەرەیان تێدا نەبوو، وتی دەی ئەو جلەم بشۆن کە لیتاوی زەعفەرانی پێوەیە، دوو کراسی نوێیشی لەگەڵ دابنێن، وتم ئەوە کۆنەو دڕاوە، وتی زیندو زیاتر لە مردو پێویستی بە تازەیە، ئەمە بەس بۆ مۆڵەتە.[2] لە دەقێکی دیکەدا ئیبن سەعد(ج٣، ص١٩٧) هێناویەتی وتی: دەبێت بە کێم‌و زووخاو.

ئیبن سەعد(ج٣، ص٣٥٨) لە یەحیای کوڕی ئەبو ڕاشدی نەسرییەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب کە سەرەمەرگی هات بە کوڕەکەی وت: کوڕی شیرینم ئەگەر مەرگم هات لارم بکەرەوەو دوو ئەژنۆت لەسەر پشتم دابنێ‌و دەستی

[1] سحول: گوندێکە لە یەمەن.

[2] – لە(المنتخب ج٤، ص٣٦٢) دا واهاتووە

ڕاستت لەسەر تەوێڵم دابنێ و دەستی چەپیشت لەسەر چەناگەم دابنێ کە گیانم دەرچوو چاوەکانم دابخە، لە کفن کردنمدا دەست بگرنەوە، چونکە ئەگەر لای خوا خێرم هەبێت هێندەی بینایی چاوم گۆڕەکەم بۆ فراوان دەکرێت، ئەگەریش وانەبم گۆڕەکەم لەسەر تەسك دەکرێتەوە تا ئێسکەکانم تێکەڵ بە یەکدی دەبن، لە گەڵمدا ژن مەهێننە دەرو شتێکم بۆ مەڵێن کە تیامدا نییە، چونکە خوا زاناترە بە من، ئەگەر بردمتانە دەر خێرا بڕۆن بە ڕێدا، چونکە ئەگەر لای خوا خێرم هەبێ بەرەو خێرو چاکە پێشم دەخەن، ئەگەریش وانەبم ئەوا خراپەیەك لەسەر شانتانە لە خۆتانی دوور دەخەنەوە(لە کۆڵی خۆتانی دەکەنەوە)[1].[2]

پێشتر لە باسی شورای نێوان چك خوازاندا قسەی عومەرمان هێنا کاتێ زانی مەرگی هاتووە: وتی ئێستا ئەگەر هەموو دنیام هەبێت دەیبەخشم لە بری ناڕەحەتییەك دێت، بە کوڕەکەشی وت ڕووم بلکێنە بە زەویدا ئەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر، منیش ڕانم خستە سەر قاچم، ڕووم بلکێنە بە زەوییەوە، ڕیش و ڕووی بەردا تا کەوتە سەر زەوی وتی ئەی عومەر هاوار بۆ خۆت و دایکت ئەگەر خوا لێت خۆش نەبێت ، پاشان گیانی دەرچوو ڕەحمەتی خوای لێبێت،[3] پێشتر لەسەر گریان لە هانیئەوە هێنامان وتی: عوسمان لەسەر گۆڕێ دەوەستا دەگریا تا ڕیشی دەخوسا، پێی وترا باسی بەهەشت و دۆزەخ دێت ناگریت، کەچی باسی گۆڕ دێت دەگریت،– فەرمودەکە دێنێت – ترمذی هێناویەتی و بە حەسەنی داناوە.

بوخاری لە(الأدب المفرد، ص٧٢) لە خالیدی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ حوزەیفە باری گران بوو دەستەکەی و پشتیوانان ئەوەیان بیست و بە

[1] – حسن.

[2] – ئیبن ئەبی دنیا لە یەحیایەوە بەوشێوە هێناویەتی،وەك لە(المنتخب ج٤، ص٤٢٧) دا هاتووە.

[3] – تەبەرانی لە فەرموودەیەکی دوورودرێژدا لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی و(هەیسەمی ج٩، ص٧٦) سەنەدەکەی بە حەسەن داناوە.

تاریکی شەو یان لە بەرەبەیاندا هاتن بۆ لای، وتی ئێستا کەیە؟ وتمان درەنگانی شەو یان بەرەبەیان، وتی پەنا دەگرم بەخوا لە بەرەبەیانی ئاگر، وتی هیچتان هێناوە تا کفنم بکەن؟ وتمان بەڵێ، وتی لە کفندا زیادەڕەوی مەکەن، چونکە ئەگەر لای خوا خێرم هەبێ چاکترم پێ دەدرێت، ئەگەریش خراپەم هەبێ خێرا ئەوەشم لێ دادە ماڵرێت.

ئەبو نەعیم لە(الحلية ج۱، ص۲۸۲) لە ئەبو وائیلەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ حوذەیفە(ر.ض) باری گران بوو خەڵکێ لە بەنی عەبەس هاتن بۆ لای، خالیدی کوڕی ڕەبیعی عەبەسی پێی وتم ئێمە لە مەدا ئیبن بووین هاتین بۆ لای لە درەنگانی شەودا – فەرموودەکە بە هەمان شێوە پێشوو دێنێت –.[1]

ئەبو نەعیم لە(الحلية ج۱، ص۲۸۳) لە مسلەی کوڕی زەفیرەوە هێناویەتی دەڵێت: حوذەیفە من و ئەبو مەسعودی ناردو ئێمەش کفنێکمان بۆ کڕی کە(عصب)ی یەمەنی بوو، سەد درهەم کڕیمان، وتی نیشانم بدەن چیتان بۆ کڕیوم، نیشانمان دا وتی ئەمە بۆ چییە؟، تەنها دوو ڕەیتەی سپی بەس بوون کە کراسیان لەگەڵدا نەبێت، چونکە من تەنها ماوەیەك ئەمەم لادەبێت و دەگۆڕدرێت بە باشتر لەمە یان چاکتر لەمە، ئێمەش چووین لەوەمان بۆ کڕی.

هەروەها لە(ج۱، ص۲۸۲) لە ئەبو مەسعودەوە بە کورتی هێناویەتی، لە گێڕانەوەیەکدا وتی: چی دەکەن یەمە؟ ئەم هاوەڵەتان ئەگەر باش بێت خوا دەیگۆڕێت بە چاکتر بۆی، ئەگەریش وانەبێت فڕێ دەدرێتە کونجی گۆڕەکەی تا ڕۆژی دوایی. حاکم(ج۳، ص۳۸۱) لە قەیسی کوڕی ئەبو حازمەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی ، لە گێڕانەوەیەکیشدا وتی: ئەگەر وا نەبێت خوا تا ڕۆژی دوایی پێی دەدا بە ڕوویدا.

---

[1]– حاکم لە(المستدرك ج۳، ص۳۸۰) لەئەبو مەسعودی ئەنسارییەوە بەو واتایەو بە کوورتی هێناویەتی.

ئەبونـەعیم لـە(الحلیـة ج١، ص٢٦٢) لـە زوحـاکی کـوڕی عەبدوڕەحمانـەوە هێناویـەتی دەڵێـت: ئەبوموسـای ئەشـعەری کـە سـەرەمەرگی هـات گەنجـەکانی بانگکرد(کوڕە گەنجەکانی) وتی بڕۆن و گۆڕ هەڵ بکەنن، قووڵ و پان ئەوانیش هاتن وتیان وامانکرد، وتی بەخوا ئەو گۆڕە یان بۆم فراوان دەبێت تا هەر سوچێکی چل باڵ دەبێت یان پاشان دەرگایەکم بەرەو بەهەشت لەڕوودا دەکرێتەوەو سەیری ژنەکانم و ماڵ و جێگەو ئەوە دەکەم کە خوا بۆی داناوم و دواتر لە جێگەی ئەمڕۆم لە ماڵمدا زیاتر لەوی نزیك و شارەزاتر دەبم، پاشان بۆن و بەرامەی دەکەم تا زیندوو دەبمەوە، یان ئەگەر وانەبووم – پەنا دەگریت بەخوا لێی – گۆڕەکەم لەسەر تەنگ دەکرێت تا لە جۆگەی ناو کۆڵان تەسکتر دەبێت، پاشان دەرگایەکی دۆزەخم لە ڕوودا دەکرێتەوەو سەیری کۆت و بەندەکانی و نزیکە ناحەزەکانم دەکەم و لە شوێنی دۆزەخم نزیکتر دەبم تا لە ماڵی ئەمڕۆم، پاشان لە گڕەو گەرمای بەدی دەکەم تا زیندوو دەکرێمەوە. هەروەها ئەبونەعیم و بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە عائیشەوە هێناویانە دەڵێت: ئوسەیدی کوڕی حوزەیر لە گەورە کەسەکان بووە، دەیوت ئەگەر وەك ئەو بارەم بم کە لەسەر بارێ لە سێ بارەکانم ئەوا لە خەڵکی بەهەشت دەبم و گومانم لێی نییە، کاتێ قورئان دەخوێنم و کاتێ گوێی لێ دەگرم و کاتێ وتاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەبیستم و کاتێ ئامادەی تەرمێ دەبم لە لای هەر تەرمێ بووبم خۆمم بە بیرهێناوەتەوە جگە لەوەی پێی دەکرێت و دەگۆڕدرێت بەرەو ئەو بارەی(چی لێدێت).[١]

[١] – لە(المنتخب ج٥، ص١٣٨) دا واهاتووە.

# بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی

ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا کاتێ دەتبینین دڵمان نەرم دەبێتەوەو لە خەڵکی ڕۆژی دوایی دەبین، کاتێ لێت جیابوینەوە سەرسامی دنیا دەبین و بۆنی چێژی ژن و منداڵ دەکەین، فەرمووی(لم انکم تکونون علی کل حال علی الحال التی انتم علیها عندی لصافحتکم الملائکة بأکفهم ولزارتکم فی بیوتکم ولو لم تذنبو الجاء الله عزوجل بقوم یذنبون کی یغفر لهم) واتە(ئەگەر ئێوە لە هەموو بارەکاندا لەسەر ئەو بارەبن کە لای من لەسەرینی ئەوا بەدڵنیاییەوە فریشتەکان بە دەستەکانیان تەوقەتان لەگەڵ دەکەن لە ماڵەکانتاندا سەردانتان دەکەن، ئەگەر تاوان نەکەن خوای گەورە خەڵکانێ دێنێت تاوان بکەن تا لێیان خۆش بێت) وتمان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر بەهەشت قسەمان بۆ بکە بنیادی چۆنە؟ فەرمووی(لبنة ذهب ولبنة فضة وملاطها المسك الأذفر وحصاؤها اللؤلؤ والیاقوت وترابها الزعفران، من یدخلها ینعم ولا ییأس ویخلد ولایموت، لاتبلی ثیابه ولا یغنی شبابه، ثلاثة لا ترد دعوتهم: الآمام العادل والصائم حتی یفطر ودعوة المضلوم تعمل علی الغمام وتفتح لها ابواب السماوات ویقول الرب تبارك وتعالی وعزتی لآنصرنك ولو بعد حین) واتە(خشتێ زێڕەو خشتێ زیوە، قوڕی نێوان بەردەکان میسکی بۆنداڕو چەوەکەی گەوهەرو یاقوتە خۆڵەکەی زەعفەرانە، هەرکەس بچێتە ناوی خۆش دەگوزەرێنێ و بێهیواو بێزار نابێ و بە هەمیشەیی دەژی و نامرێت، جلەکانی خراپ و شڕۆڵ نابن گەنجێتی لەناو ناچێت. سێ کەس نزایان نا گێڕدرێتەوە، پێشەوای داد پەروەر، ڕۆژووگر تا ڕۆژوو دەکاتەوە، نزای ستەم لێکراو لەسەر پشتی هەور هەڵ دەگیرێ و دەرگاکانی ئاسمانەکانی بۆ دەکرێتەوەو خوای گەورە دەفەرموێت: سوێند بە عیزەتم سەرت دەخەم با پاش ماوەیەکیش بێت)[1][2].

---

[1] - صحیح.

[2] - ترمزی و ئیبن ماجە هەندێکیان هێناوە، وەك لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٤٩) دا هاتووە

ئەبو شەیخ لە بەشێکی فەرموودەکەیدا لە سوەیدی کوڕی غەفلەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی(رضي الله عنه) تووشی نەبونییەك بوو، بە فاتیمەی وت بۆچی ناچیت بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و پێی بڵێت؟ ئەویش چوو بۆ لای، ئوم ئەیمەن لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، تەقەی دا لەدەرگا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە ئوم ئەیمەنی فەرموو(إن هذا لدق فاطمة ولقد اتتنا فی الساعة ما عودتنا ان تأتینا فی مثلها) واتە(ئەوە تەقە لێدانی فاتیمەیەو لە کاتێکدا هاتووە بۆ لامان کە نەریتمان نەبووە لەم جۆرە کاتەدا بێت بۆ لامان) وتی ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خواردنی فریشتەکان یادو ستایشی خوایە، ئەی خواردنی ئێمە؟ فەرمووی(واندی بعثنی بالحق ما اقتبس فی بیت ال محمد منذ ثلاثین یوما، ولقد اتتنا اعنز فأن شئت امرنا لك بخمسة اعنز وإن شئت علمتك خمس کلمات علمنیهن جبریل) واتە(سوێند بەوەی بە حەق ناردمی ماوەی سی ڕۆژە لەماڵی بنەماڵەی موحەممەددا هیچ نەکراوە، هەندێ بزنمان بۆ هاتوون ئەگەر دەتەوێت دەڵێین پێنج بزنت بدەنێ، ئەگەریش دەتەوێت پێنج وشەت فێر دەکەم کە جبریل ئەوانەی فێر کردم) فاتیمە وتی بەڵکو پێنج ووشەکەم فێر بکە کە جبریل پێی وتیت، فەرمووی بڵێ(قولی یا اول اولین، ویا اخر الآخرین، و یاذا القوة المتین، و یاراحم المساکین، و یاارحم الراحمین) واتە(ئەی یەکەمی یەکەمینەکان، ئەی کۆتایی کۆتاکان، ئەی خاوەن هێزی پتەو، ئەی سۆز نوێنی هەژاران، ئەی میهرەبانترینی میهرەبانان) فاتیمە چوویەوە بۆ لای عەلی(رضي الله عنه)، عەلی(رضي الله عنه) وتی چیت کرد؟ وتی لای تۆ چووم تا دنیا بە دەست بخەم، بەڵام ڕۆژی دواییم بۆ هێنایتەوە. عەلی وتی: چاکترین ڕۆژت ئەمڕۆ بوو.[1]

[1]- لە(کنزالعمال ج١، ص٣٠٢) دا واهاتووەو دەڵێت: هیچم لەسەر گێڕەرەوەکانی بەدی نەکردووە، تەنها وێنەکەی وێنەی مورسەلە. ئەگەر سوەید لە عەلییەوە بیستبێتی ئەوا فەرموودەکە موتتەسیلە.

ئەبو نەعیم لە(الحلية ج١، ص٢٥٩) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت لەگەڵ ئەبوموسا لە ڕێگەیەکدا بووین کە بیستی خەڵك قسە دەکەن، قسە پاراویەکی بیست، وتی ئەی ئەنەس ئەمە چییە؟ وەرە با یادی پەروەردگارمان بکەین، چونکە ئەوانە خەریکە کەسیان بە زمانی پێستە دەبڕێت، پاشان وتی ئەنەس خەڵکی بۆچی لە ڕۆژی دوایی دوور دەگرن و لێی ڕادەکەن؟ وتم: ئارەزوو و شەیتان وادەکەن، وتی نەبەخوا، بەڵام دنیایان بۆ پێش خراوەو ڕۆژی دوایی دواخراوە، ئەگەر بیان بینایە لایان نەدەداو بەو ئاقارەدا نەدەچوون.

## بڕوابوون بەوەی لە ڕۆژی دواییدا ڕوو دەدات

ترمذی(بە صەحیحی) داناوە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هێناویەتی کاتێ ئەم ئایەتی دابەزی ﴿(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ {١} يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ کە ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەفەرێکدا بوو، فەرمووی(اتدرون ای یوم ذلك؟) واتە(ئایا دەزانن ئەوە چ ڕۆژێکە؟)وتیان خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی(ذلك يوم يقول الله لأدم ابعث بعث النار قال يارب وما بعث النار؟ قا تسعمإته وتسعة وتسعون إلى النار وواحد إلى الجنة) واتە(ئەوە ڕۆژێکە خوا بە ئادەم دەفەرموێت: پشکی دۆزەخ دەرکە، دەڵێن پەروەردگارا پشکی دۆزەخ چییە؟ دەفەرموێت نۆسەدو نەوەدو نۆ بۆ دۆزەخ یەکێك بۆ بەهەشت) موسڵمانانیش کەوتنە گریان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(قاربوا فأنها لم تكن نبوة قط إلا كان بين يديها جاهلية)(نزیك بگری و ڕێك بگرن، چونکە هەر کات پێغەمبەرایەتییەك بووە لەبەردەستیدا نەفامیەك هەبووە) فەرمووی(فيؤخذ العدد من الجاهلية فأن تمت وإلا كلمت من المنافقين، وما مثلكم إلا ومثل الأمم كمثل الرقمة في ذراع الدابة كالشامة في الجنب البعير) واتە(ژمارە لە بێباوەڕی وەدەگیرێت،

ئەگەر تەواو بوو باشە ئەگەر نا ژمارەکە بە دووڕوەکان تەواو دەکرێت، نموونەی ئێوەو گەلان وەك ڕوقمەی ناو باڵی ئاژەڵ یان وەك خاڵ و پەڵەی لای وشتر وایە)، پاشان فەرمووی(إني لأرجو أن تكونوا ربع أهل الجنة) واتە(من هیوام وایە ئێوە چوار یەکی خەڵکی بەهەشت بن) پاشان فەرمووی(إني لأرجوا أن تكونوا ثلث أهل الجنة) واتە(هیوام وایە سێ یەکی خەڵکی بەهەشت بن) ئەوانیش "الله اکبر" یان کرد، پاشان فەرمووی(إني لأرجوا أن تكونوا نصف أهل الجنة) واتە(هیوام وایە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن) ئەوانیش "الله اکبر"یان کرد، عمران وتی نازانم دوو لە سێ یان نا[1].[2]

بوخاری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبو سەعیدەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دەفەرموێت ئەی ئادەم، ئەویش دەڵێت بەڵێ ئەی پەروەردگارا، بە دەنگێك هاوار دەکات خوا فەرمانت پێ دەکات لە نەوەکانت پشکێ بۆ دۆزەخ دەربکەیت، دەڵێت پەروەردگارا پشکی(دەستەی) دۆزەخ چییە؟ دەفەرمووێت لە هەموو هەزارێك – وابزانم وتی – نۆسودو نەوەدو نۆ، ئەوکات سك پڕسکەکەی دادەنێت و لە دایك بوو سەر سپی دەکات ﴿وترى وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ خەڵکی ئەوەیان لەسەر سەخت بوو تا ئەوەی ڕەنگیان گۆڕا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لە یەئجوج و مەئجوج نۆسەدو نەوەدو نۆو لە ئێوە یەك، ئێوە لەناو خەڵکدا وەك مووی سپی لای گای سپی یان مووی سپی لای گای ڕەش وان، من هیوام وایە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن) ئێمەش "الله اکبر"مان کرد، پاشان فەرمووی(لایەکی خەڵکی بەهەشت بن) ئێمەش "الله اکبر"مان کرد.[3]

---

[1] – صحیح.

[2] – ئیمامی ئەحمەدو ئیبن ئەبی حاتەمیش بەوجۆرە هێناویانە.

[3] – بوخاری لە چەند لایەکەوە هێناویەتی موسلیم و نەسائی لە تەفسیرەکەیدا هێناویانە. لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص٢٠٤) دا هاتووە، حاکم(ج٤، ص٥٦٨) لە ئیبن عەبباسەوە بە

ئیبن ئەبی حاتەم لە ئیبن زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ زوبەیر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دووبارە دژایەتی دەکەوێتە نێوانمان؟ فەرمووی(بەڵێ) وتی: دەی وابێت بارەکە زۆر سەختە، ئیمامی ئەحمەدیش بەوجۆرە هێناویەتی و زیادەیەکیشی هێناوە[1]: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾) زوبەیر وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر هەر بەخششێ پرسیارمان لێدەکرێت؟ بەخشش و خۆشی ئێمە تەنها دوو ڕەشەکەن خورما و ئاو، ترمذی ئەو زیادەی هێناوە و فەرموودوکەی بە حەسەن داناوە، ئیبن ماجەش هێناویەتی.

ئەحمەد لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە هێناویەتی دەڵێت کاتێ ئەم سورەتە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر ﴿إنك نَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ زوبەیر وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو تاوانە تایبەتیانەی لە دنیادا لە نێوانماندا هەبوون لەسەرمان دووبارە دەبنەوە؟ فەرمووی(نعم ليكررن عليكم حتى يؤدي إلى كل ذي حق حقه) واتە(بەڵێ بە دڵنیاییەوە لەسەرتان دووبارە دەبنەوە تا هەموو خاوەن مافێ مافی خۆی وەردەگرێتەوە) زوبەیر وتی: بەخوا بارەکە زۆر سەختە[2][3].

عەبدوڕەزاق لە قەیسی کوڕی ئەبوحازمەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە سەری لەسەر کۆشی ژنەکەی دانابوو، گریا ژنەکەشی گریا، وتی

---

هەمان شێوە هێناویەتی و لە گێڕانەوەیەکیشدا هاتووە: خەڵکەکە ئەو هەواڵەیان لەسەر سەخت بوو و تووشی دڵ داگیران و خەفەت و پەژارە بوون.

[1] – حسن.

[2] – صحيح.

[3] – ترمزی هێناویەتی و دەڵێت: فەرمودەکە حەسەنی صەحیحە، لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٥٢) دا واهاتووە، حاکم لە(المستدرك ج٤، ص٥٧٢) دا بە هەمان شێوە هێناویەتی و دەڵێت ئەم فەرموودە سەنەدی صەحیحە و بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە.

بۆچی دەگریت؟ وتی بینیم تۆ گریایت منیش گریام، وتی من ئەم ئایەتەم بیر هاتەوە ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَّقْضِيّاً﴾ نازانم ئایا لە دەستی دەربازم دەبێت یان نا، لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە نەخۆش بوو.[1]

بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە عوبادەی کوڕی صامتەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێ عوبادە(ر.ض) سەرەمەرگی هات وتی: مەوالی و خزمەتکارو دراوسێکان و ئەوانەی دێن بۆ لام بیان هێنن بۆ لام، ئەوانیش کۆیان کردنەوە بۆی وتی: ئەمڕۆ وا دەبینم کۆتا ڕۆژم بێت لە ژیانمداو یەکەم شەوی ڕۆژی دواییم بێت، نازانم لەوانەیە بەدەم یان دەستم بەرامبەرتان شتێکم هەبووبێت، ئەوەش سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە تۆڵە سەندنەوەی ڕۆژی دوایی لەسەرە، تکام لە هەرکامتانە کە لە دڵیدا شتێ لەوە هەیە با پێش گیان دەرچوونم تۆڵەم لێبکاتەوە، وتیان بەڵکو تۆ باوکێك و پەروەردەکارێك بوویت، دەڵێت هەرگیز خراپەی بە یەك خزمەتکار نەدەوت، وتی دەی ئایا لەوانەم خۆش بوون؟ وتیان بەڵێ، وتی خوایە شاهید بە، پاشان وتی دەی وەسیەتەکەم بپارێزن و لەبەری بکەن تکام لەهەرکامتانە لەسەرم نەگرین، کە گیانم دەرچوو دەست نوێژی چاك بگرن و هەرکامتان بچێتە مزگەوت و نوێژ بکات، پاشان داوای لێخۆش بوون بۆ خۆی و عوبادە بکات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ﴾ خێرا بمبە ناو چاڵەکەم و ئاگر بەدوامدا نەهێنن و ئەرغەوانم نەخەنە ژێر.[2]

پێشتریش قسەی عومەرمان هێنا کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی وت کاتێ داوای چوار هەزار درهەم قەرزی لێکرد بە نێردراوەکەی وت: پێی بڵێ: لە بەیتول ماڵ هەڵی بگرێت دواتر بیگێڕێتەوە، کاتێ نێردراوەکە هات پێی وت چی وتوە ئەوەی لەسەر سەخت بوو، عومەر پێی گەیشت و وتی تۆ وتت تا لە بەیتول ماڵ

---

[1] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص١٣٢) دا واهاتووە.

[2] – لە(کنزالعمال ج٧، ص٧٩) دا واهاتووە.

بیبات، ئەگەر پێش ئەوەی بێیت مردم دەڵێن ئەمیری باوەڕداران بردوویەتی وازی لێبهێنن بۆی، ئەوکاتە لە ڕۆژی دواییدا وەردەگیرایەوە.

دواتر لە باسی کاریگەر بوون بە زانستی خواو پێغەمبەرەکەی نرکەی توند کەوتن لەسەر ڕووی ئەبو هورەیرەوە بە دیدەکەین تا ئەوەی ئەصبوحی بە دوورو درێژی هێناویەتی کاتێ باسی قەزای خوا دەکات(دادوەری خوا) لەمەڕ قورئان خوێن و خاوەن ماڵ و ئەوەی لە ڕێی خوادا کوژراوە، گریانی سەختی موعاویەش باس دەکەین کاتێ ئەو فەرمودەیەی بیست تا ئاستێ وایان زانی لەناو دەچێت.

## بڕوا بوون بە شەفاعەت

بەغەوی و ئیبن عەساکیر لە عەوفی کوڕی مالیکەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) شەو هێشتینیەوە، هەرکاممان ولاخەکەی کرد بە سەرین، من لە درەنگانی شەو بێدار بوومەوە سەیرمکرد پێغەمبەر(ﷺ) لای ولاخەکەی نابینم، ئەوە ترساندمی چووم تا پێغەمبەر(ﷺ) ببینمەوە سەیرمکرد موعاذی کوڕی جەبەل و ئەبو موسای ئەشعەریش هەمان ترسیان هەیەو لەم نێوەندەدا بووین کە دەنگێکمان لە سەرووی دۆڵەکەوە بیست وەك دەنگدانەوەی دەستاڕ، ئێمەش باسمان کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی(أتانی اللیلە ان من ربی عزوجل فخیرنی بین الشفاعة وبین ان یدخل نصف امتی الجنة، فأخترت الشفاعة واتە(ئەمشەو نێردراوێك لای خوای گەورە هات بۆ لام و سەر پشکی کردم و لە نێوان شەفاعەت و نێوان ئەوەدا نیوەی ئوممەتەکەم بچنە بەهەشت، منیش شەفاعەتم هەڵبژارد)) وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هاودەم بوونمان داوات لێدەکەم ئێمەش لەوانە بین کە شەفاعەتیان بۆ دەکەیت، فەرمووی(فإنکم من اهل الشفاعتی) واتە(ئێوە لە دارودەستەکەی بەرکەوتووانی شەفاعەتی منن) ئێمەش لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووین تا گەیشتینە لای خەڵك، سەیرمان کرد ترساون کاتی بە

دوای پێغەمبەردا گەڕاون، پێغەمبەریش(ﷺ) هەمان فەرموودەی بەوانیش فەرموو، ئەوانیش هەمان داوای ئێمەیان هەبوو، کاتێ لە دەوری کۆبونەوە، پێغەمبەر فەرمووی(فإني اشهد من حضر ان شفاعتي لمن مات من امتي لايشرك باللة شيئا) واتە(من ئەوانە ئامادەن بە شایەتیان دەگرم شەفاعەتم بۆ هەر مردوویەکی ئوممەتەکەمە کە هیچ هاوەڵێکی بۆ خوا دا نەنابێت)[1][2].

بەغەوی و ئیبن مندە و ئیبن عەساکیر لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو عەقیلەوە(ر.ض) هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووم بۆ لای وەفدێکی ثەقیف، چوینە بەردەرگا و کەس نەبوو بێزراوتر لامان لە کەسێك بچین بۆ لای، کە دەرچوین کەس نەبوو لەوکەسە خۆشەویستر لامان، یەکێ لە ئێمە وتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی داوا ناکەیت لە پەروەردگارت موڵکێکی وەك سولەیمان(ع) پێ ببەخشێت پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و پاشان فەرمووی(لعل صاحبكم عندالله أفضل من ملك سليمان) واتە(لەوانەیە هاوەڵەکەتان لای خوا لە موڵکی سولەیمان بەرزتر بێت)(إن الله لم يبعث نبيا إلا أعطاه دعوة فمنهم من اتخذها دنيا فأعطيها ومنهم من دعا على قومه لما عصوه فأهلكوا وإن الله أعطاني دعوة أختبأتها عند ربي شفاعة لأمتي يوم القيامة) واتە(خوا هەر پێغەمبەرێکی ناردووە نزایەکی پێ بەخشیوە، هەیان بووە کاتی هۆزەکەی لێی یاخی بوون نزای لێکردوون بەو نزایە لەناو براون، خوا نزایەکی بە من بەخشی، من هەڵمگرت لای پەروەردگارم تا شەفاعەت بکەم بۆ ئوممەتەکەم(لە ڕۆژی دواییدا)[3][4].

---

[1] – صحیح.

[2] – لە(کنزالعمال ج٧، ص٢٧١) دا واهاتووە.

[3] – صحیح.

[4] – بەغەوی دەڵێت نازانم ئیبن ئەبی عقیل جگە لەم فەرمودەی گێڕابێتەوە، ئەم فەرمووده غەریبە و تەنها لەم ڕووە هاتووە. لە(کنزالعمال ج٧، ص٤١١) دا هاتووە.

شیرازی لە(الألقاب)و ئیبن نەجار لە ئوم سەلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(نعم الرجل أنا الشرار أمتى) واتە(من چاکترین کەسم بۆ خراپەکانی ئوممەتەکەم) کەسێ لە موزەینە پێی وت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ بۆ خراپەکانیان وایت ئەی بۆ چاکەکانیان؟ فەرمووی(خیار امتی یدخلون الجنة بأعمالهم وشرار امتی ینتضرون شفاعتی، الا إنها مباحة یوم القیامة لجمیع امتی إلا رجل ینتقص اصحابی) واتە(چاکەکانی ئوممەتم دەچنە بەهەشت بە کردەوەکانیان، خراپەکانی ئوممەتیشم چاوەڕێی شەفاعەتی من دەکەن، بزانن شەفاعەتم لە ڕۆژی دواییدا بۆ هەموو ئوممەتم دەبێت جگە لە کەسێك کە هاوەڵانی من بە کەم بگرێت)[1].

ئیبن مەردەویە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اشفع لأمتی حتی ینادینی ربی فیقول ارضیت یا محمد؟ فأقول نعم رضیت) (شەفاعەت دەکەم بۆ ئوممەتم تا پەروەردگارم بانگم دەکات ئەی موحەممەد ئایا ڕازی بویت؟ منیش دەڵێم بەڵێ ڕازی بووم) پاشان عەلی سەیری منی کردو فەرمووی ئێوە ئەی کۆمەڵی عێراق دەڵێت هیوا خوازترین ئایەت لە قورئاندا ئەمەیە ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ وتی ئێمە ئەوە دەڵێن وتی بەڵام ئێمەی ئالوبەیت دەڵێین هیوا خوازترین ئایەت ئەمەیە ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى﴾ ئەوەش شەفاعەتە[1][2].

ئەحمەد لە ئیبن بورەیدە لە باوکیەوە هێناویەتی چوو بۆ لای موعاویە سەیری کرد کەسێك قسە دەکات، بورەیدە وتی ئەی موعاویە مۆڵەتم دەدەیت قسە بکەم؟وتی بەڵێ- پێی وابوو ئەوی دیکە قسە دەکات- بورەیدە وتی لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(إنی لأرجوا أشفع یوم القیامة عددماعلی لأرض من شجرة ومدرة) واتە(من هیوام وایە لە ڕۆژی دواییدا شەفاعەت بکەم بە هێندەی

[1] – ضعیف.

[2] – لە(کنزالعمال ج٧، ص٢٧٣) دا واهاتووە

ژمارەی ئەوەی درەخت هەیە لەسەر زەوی دا) ئەی موعاویە ئایا تۆیش ئەو هیوایەت هەیەو عەلی نیەتی[1]؟[2]

ئیبن مەردەویە لە تەلقی کوڕی حەبیبەوە هێناویەتی دەڵێت من لەو کەسانە بوم کە زۆر بە توندی دژی بڕوابوون بە شەفاعەت بوون تا گەیشتم بە جابری کوڕی عەبدوڵلاَ(ر.ض) هەر ئایەتێکم بەسەردا دەخوێندەوە تا یادی خوای تێدا بۆبخەمە ڕوو کە خواباسی هەمیشە مانەوەی دۆزەخیەکان لە دۆزەخدا دەکات، وتی ئەی تەلق ئایا پێت وایە تۆ لە من زیاتر قورئان دەخوێنێت و زیاتر لە من شارەزای سونەتی پێغەمبەریت؟ ئەوانەی خوێندنتەوە دارو دەستەی دۆزەخن و بێباوەڕانن، بەڵام ئەمانە خەڵکێکن تاوانیان کردووە سزا دەدرێن و دواتر لە دۆزەخ دەردەکرێن، پاشان بە دەستەکانی گوێکانی گرت وتی ئەگەر ئەمەم لەپێغەمبەر(ﷺ) نەبیستبێ ئەم دوو گوێم کەڕ بن، دەیفەرموو(یخرجون من النار بعد ما دخلوا)(لە دۆزەخ دەردەچن پاش ئەوەی دەچنە ناوی ئێمەش وەك چۆن تۆ قورئان دەخوێنیت قورئان دەخوێنین.[3]

ئەبو حاتەم لە یەزیدی فەقیرەوە هێناویەتی دەڵێت: لای جابری کوڕی عەبدوڵلاوە(ﷺ) دانیشتم کە فەرموودەی دەگێڕایەوە، باسی ئەوەی کرد خەڵکانێ لە دۆزەخ دێنە دەر، وتی من ئەو ڕۆژە دژی ئەو قسەبووم، تورە بووم وتم: سەرم لە خەڵك سوڕنامێنێت، بەڵام سەرم لە ئێوە سوڕ دەمێنێت ئەی هاوەڵانی موحەممەد(ﷺ)؟! دەڵێن خوا خەڵکی لە دۆزەخ دەردەکات و خواش دەفەرموێت ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ النَّارِ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنْهَا﴾ هاوەڵان لێم زیزو گرژ بوون، ئەو لە

---

[1] – ضعيف.

[2] – لەتەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص٥٦) دا واهاتووە.

[3] – صحیح.

هەموویان لەسەر خۆتر بوو، وتی واز لە کابرا بێنن، ئەو ئایەتە بۆ بێباوەڕانە، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُواْ بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ تاگەیشتە ولهم عذاب مقيم﴾(المائدة٣٦- ٣٧) ئایا قورئان ناخوێنیت؟ وتم با، هەموویم خوێندوە، وتی مەگەر خوا نافەرموێت ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَاماً مَّحْمُوداً﴾ دەی ئەوە پلەو پایەیە، چونکە خوای گەورە بە هێندەی بیەوێت خەڵکانێ لەبەر تاوانیان لە دۆزەخدا دەهێڵێتەوەو قسەیان لەگەڵ ناکات، کە ویستی دەریان بهێنێت دەریان دەهێنێت. وتی: دوای ئەوە هەرگیز وانەبووم بڕوام بەوە نەبێت[1].[2]

## بڕوا بوون بە بەهەشتو دۆزەخ

حەسەنی کوڕی سوفیانو ئەبونەعیم لە حەنزەلەی نوسەری ئوسەیدەوە(ر.ض) کە لە نووسورانی خزمەت پێغەمبەر ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ النَّارِ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنْهَا﴾ بوو هێناویانە دەڵێن: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دا بووین کە باسی بەهەشتو دۆزەخمان کرد تا خەریکبوو هاتە بەرچاو، هەستام بۆ لای ژنو منداڵەکانم پێکەنیمو گەمەم کردو بیری باری پێشترم کەوتەوە کە تیایدا بووین، چوومە دەرو گەشتم بە ئەبوبەکر وتم: ئەی ئەبوبەکر بووم بە دووڕوو، وتی بۆچی؟ وتم لای پێغەمبەر(ﷺ) باسی بەهەشتو دۆزەخی بۆ دەکردین وەك ئەوەی لەبەرچاومان بێت وا بوو، کەلای دەرچوین گەیشتینە لای ژنو منداڵو بژێویمان لە بیرمان دەچێتەوە، ئەبوبەکر وتی ئێمەش وا دەکەین، چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بۆم باسکرد ئەویش فەرمووی(یا حنضلة عند اهلیکم کا تکونون عندی لصافحتکم الملائکة علی

---

[1] – حسن.

[2] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٢، ص٥٤) دا واهاتووە.

فرشكم وفي الطريق، يا حنضلة ساعة وساعة) واتە(ئەی حەنزەلە ئەگەر لای ژن و منالّیشتان وەك ئەوە وابن كە لای من وان بە دڵنیاییەوە فریشتەكان لەسەر جێگەتان و لە ڕێگەدا تەوقەتان لەگەڵ دەكەن، حەنزەلە ساتەو ساتە).[1]

ئیبن ئەبی حاتەم لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: شەوێك لای پێغەمبەر(ﷺ) بووین پاشان بەیانی هەستاین، فەرمووی(پێغەمبەران و شوێن كەوتوانیان لە ئوممەتەكانیاندا نیشانم دراون، هەر پێغەمبەرێ هەبوو دەیدا بە لامدا، پێغەمبەر هەبوو دەستەیەكی لەگەڵ بوو، پێغەمبەر هەبوو سێ كەسی لەگەڵ بوو، پێغەمبەر هەبوو كەسی لەگەڵ دا نەبوو – قەتادە ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ﴾ فەرمووی تا موسای كوڕی عیمران دای بە بەردەممدا لە كۆمەڵێكی بەنی ئیسرائیلەوە، وتم خوایە ئەمە كێیە؟ فەرمووی موسای كوڕی عیمرانی برات و ئەوانەی ناو بەنی ئیسرائیل كە شوێنی كەوتن، وتم خوایە ئەی ئوممەتی من لە كوێن؟ فەرمووی سەیری لای ڕاستت بكە، سەیرم كرد ڕووخساری خەڵكن(خەڵكی زۆرن) فەرمووی ڕازیت؟ وتم خوایە ڕازی بووم، فەرمووی لە چەپتەوە سەیری ئاسۆ بكە سەیرم كرد خەڵكێكی زۆرن، فەرمووی ئایا ڕازی بوویت؟ وتم خوایە ڕازی بووم، لەگەڵ ئەوانەدا حەفتا هەزار بەبێ حساب دەچنە بەهەشت(فأن مع هؤلاء سبعين الفا يدخلون الجنة بغير حساب) عوكاشی كوڕی موحصن لە بەنی ئەسەد بوو– سەعید دەڵێت لە بەدردا بەشداری كردبوو – وتی ئەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ بكە لەوانە بم، فەرمووی(اللهم اجعل منهم) واتە(خوایە لەوانەی بگێڕە) كەسێكی دیكە وتی ئەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ بكە منیش لەوانە بم، فەرمووی(سبقك بها عوكاشة) واتە(عوكاشە پێش كەوت) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(فأن استطعتم– فداكم أبي وأمي– أن تكونوا من أصحاب السبعين فافعلوا وإلا فكونوا من أصحاب الضراب وإلا فكونوا من أصحاب الأفق، فأني قد رأيت ناسا

[1] – لە(كنزالعمال ج١، ص١٠٠) دا ڕاهاتووە.

كثيرا قد ناشبوا أحوالهم) واتة(ئەگەر توانیتان- دایكو باوكم بە قوربانتان بێت- لە هاوەڵانی حەفتاكە بن وان، ئەگەر نا لە هاوەڵانی خراپ بن، ئەگەر نا لە هاوەڵانی ئاسۆ بن، چونكە من خەڵكێكی زۆرم بینی باریان هەڵواسرابوو) پاشان فەرمووی(من هیوام وایە ئێوە چارەكێكی خەڵكی بەهەشت بن) ئێمەش "الله اكبر"مان كرد، پاشان فەرمووی(من هیوام وایە سێیەكی خەڵكی بەهەشت بن) ئێمەش "الله اكبر"مان كرد، پاشان فەرمووی(من هیوام وایە نیوەی خەڵكی بەهەشت بن) پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ وَثُلَّةٌ مِّنَ الْآخِرِينَ﴾(الواقعة:٤٠) ئێمەش لە نێوانم خۆماندا وتمان ئەو حەفتا هەزارە كێ بن؟ وتمان ئەوانەن لەناو ئیسلامدا لە دایك بوونو هاوەڵیان بۆ خوا دانەناوە. پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بیستەوەو فەرمووی(هم الذين لا يكتون ولا يسترقون ولا يتطيرون وعلى ربهم يتوكلون)[١][٢].

ئیبن نەجار لە ئیبن سەلیمی كوڕی عامرەوە هێناویەتی دەڵێت هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەیان وت خوای گەورە بە دەشتەكیەكانو پرسیار كردنەكانیان سود بەخشمان دەكات، دەشتەكیەك ڕۆژێك هاتو وتی ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە لە قورئاندا باسی درەختێك دەكات كە ئازاری خاوەنەكەی دەدات، پێغەمبەر(ﷺ) یش فەرمووی كامەیە؟ وتی سیدر، چونكە دڕكی ئازار بەخشی هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(مەگەر خوا نافەرموێت ﴿فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ﴾ خوای گەورە

---

[١] – صحيح.

[٢] – ئیبن جەریر وا هێناویەتی، فەرموودەكە جگە لەم ڕووەوە چەند ڕوویەكی دیكەی هەیە، لە كتێبە صەحیحەكانو كتێبەكانی دیكەشدا، لە تەفسیری ئیبن كەسیر(ج٤، ص٢٩٣) دا واهاتووە. حاكم لە المستدرك(ج٤، ص٧٨) لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە بەم شێوە بە دوورو درێژی هێناویەتیو دەڵێت ئەم فەرموودە صەحیحەو بوخاریو موسلیم بەم دەقە نەیانهێناوە. زەهەبیش دەڵێت صەحیحە.

دڕکەکەی لابردووە(شکاندۆتەوە)و لە شوێنی هەر دڕکێکدا بەرهەمێکی داناوە، چونکە بەرهەم دەدات بەرهەمی لە حەفتاو دوو جۆری(ڕەنگی) تام دەدات کە هیچ ڕەنگ و تامێکیان لەوی دیکە ناچێت)(الیس الله تعلی یقول(فی سدر مخضود)، خضرالله شوكة فجعل مكان كل شوكة ثمرة فأنها لتنبت ثمرا ففتق الثمرة منها عن أثنين وسبعين لونا من الطعام مافيها لون يشبه الآخر).[1]

ئیبن ئەبو داود لە عوتبەی کوڕی عەبدوسولەیمەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووم کە دەشتەکیەك هات وتی ئەی پێغەمبەری خوا بیستم باسی ئەوەت کرد لە بەهەشتدا درەختێك هەیە کە من وا دەزانم درەختی لەوە دڕکدارتر نەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئغن الله جعل مكان كل شوكة منها ثمرة مثل خصوة التيس المبلود، فيها سبعون لونا من الطعام ولا يشبه لون الأخر) واتە(خوا لە شوێنی هەر دڕکێکدا بەرهەمێکی داناوە وەك گونی پیاونووساوی سابرێن، تیایدا حەفتا ڕەنگ و تامی خواردن هەیە کە هیچ کامیان لەوی دی ناچێت)[2][3].

ئیمامی ئەحمەد لە عوتبەی کوڕی عەبد سولەیمەوە هێناویەتی دەڵێت: دەشتەکیەك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد لەسەر حەزو باسی بەهەشت، پاشان دەشتەکییەکە وتی میوەی تێدایە؟ فەرمووی(نعم وفيها شجرة تدعى طوبى) واتە(بەڵێ تیایدا درەختێ هەیە پێی دەوترێت(طوبى) توبا) ئینجا شتێکی باسکرد کە نازانم چی بوو، وتی چ درەختێکی سەرزەویمان لەوە دەچێت؟ فەرمووی(ليست تشبه شيئا من شجر أرضك) واتە(لە درەختی سەرزەویت هیچ نییە لەو بچێ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اتيت الشام؟) واتە(چوویت بۆ شام) وتی نا

---

[1] – صحيح.

[2] –- صحيح.

[3] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٢٨٨) دا واهاتووە.

فەرمووی(تشبه شجرة بالشام تدعى الجوزة تنبت على ساق واحة ويتفرش اعلاها) واتە(لە درەختێکی شام دەچێت پێی دەوترێت جەوزە، لەسەر یەك قەد دەڕوێت و سەرەوەی بڵاو دەبێتەوە) وتی هێشوەکانی چەندن؟ فەرمووی(ميسرة شهر الغراب الأبقع لايفتر) واتە(ڕێی مانگێکی قەلە ڕەشی پەڵاوی کە ماندوو نەبێ و نەکەوێ) وتم ئەی ڕێیەکەی چەندە؟ فەرمووی(لو ارتلعت جذعة من ابل اهلك ما أحاطت بأصلها حتى تنكسر توقوتها هرما) واتە(ئەگەر دەستەیەکی وشتری ماڵەوەت بەڕێ بکەیت چوار دەوری ڕیشەکەی نادەیت تا لەتاو هیلاکیدا چەڵەمەی دەشکێتەوە).[1]

ئەی ترێی تێدایە؟ فەرمووی بەڵێ، وتی دانەکانی چەند دەبن؟ فەرمووی(هل ذبح أبوك تيسا من غنمه قط عضيما) واتە(ئایا باوکت لەناو مەڕو ماڵاتیدا هەرگیز ساربرینێکی گەورەی سەر بڕیووە) وتی بەڵێ، فەرمووی(فسلخ إهابه فأعطاه امك فقال(اتخذي لنا منه دلوا) واتە(پاکی کردووە و داویەتی بە دایکت و وتویەتی لەمە قاپێکمان(خواردنێکمان) بۆ ئامادە بکە) وتی بەڵێ، دەشتەکیەکە وتی دەی ئەو دانەیە خۆم و ماڵ و منالم تێر دەکات؟ فەرمووی(نعم وعامة عشيرتك) واتە(بەڵێ لەگەڵ هەموو خێڵەکەیشتدا).[2]

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت کەسێك لە خەڵکی حەبەشە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(سل واستفتهم) واتە(پرسیار بکە داوای تێگەیشتنت چییە بیڵێ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە وێنە و ڕەنگ و پێغەمبەرایەتی فەزڵتان بەسەر ئێمەدا هەیە، باشە ئەگەر باوەڕ بێنم بەوەی باوەڕت هێناوە و ئەوەی دەیکەیت منیش بیکەم ئایا لە بەهەشتدا لەگەڵت دەبم؟ فەرمووی(نعم والذي نفسي بيده إنه ليرى بياضي الأسود في الجنة من ميسرة الف عام) واتە(بەڵێ، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە لە بەهەشتدا لە دووری هەزار ساڵ

---

[1] – صحیح.

[2] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٢٩٠) دا واهاتووە.

ڕێگەوە سپێتی کەسی ڕەش دەبینرێت) پاشان فەرمووی(هەرکەسێ بڵێ لاإلە إلا الله لە لای خوا بەوە بەڵێنێکی هەیە، هەرکەسێ بڵێ سبحان الله وبحمده سەدوبیست و چوار هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێت) وتی ئەی پێغەمبەری خوا دەی ئیتر لە دوای ئەمە چۆن ماڵ وێران و قوڕ بەسەر دەبین؟ فەرمووی(إن الرجل ليأتي يوم القيامة بالعمل لوضوع على جبل لأثقلة فتقوم النعمة أو نعم الله فتكاد تستنفذ ذلك كله إلا أن يتخمده الله برحمتة) واتة(کەس هەیە لە ڕۆژی دواییدا دێت ئەگەر بخرێتە سەر شاخێك قورسی دەکات، بەخشش یان بەخششەکانی خوا هەڵ دەسن خەریکە هەموو ئەمانە لە دەست بدات، بەڵام خوای گەورە لە ڕەحمەتی خۆی ڕۆی دەبات) ئەم ئایەتە دابەزی ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً {١} تا وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيماً وَمُلْكاً كَبِيراً﴾[1] حەبەشییەکە وتی چاوەکانم ئەوە دەبینن کە چاوەکانت لە بەهەشتدا دەبینن؟ فەرمووی(بەڵێ) ئەویش حەزی بە گریان کرد تا گیانی دەرچوو، ئیبن عومەر وتی: بینیم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە دەستەکانی خۆی دەیخستە ناو چاڵەکەی[2][3].

لەتەفسیرەکەیدا ج٤ص٤٥٣ لە عەبدوڵڵای کوڕی وەهبەوە هێناویەتی ئیبن زەید وتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەم سورەتەی خوێندەوە ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾ ئەم ئایەتەی بۆدابەزی و کەسێکی ڕەش پێستی لە لابوو کەگەیشتە وەسفی بەهەشت کابرا نرکەیەکی هات تا گیانی دەرچوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(أخرج نفس صاحبكم – واخيكم – الشوق إلى الجنة) واتة(تامەزرۆیی بۆ بەهەشت گیانی هاوەڵەکەتانی – یان براکەتانی – کێشا)[4][1].

---

[1] – (الإنسان:١–٢٠)

[2] – ضعيف.

[3] – تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ص٤٥٧

[4] – ضعيف.

ئیبن عەساکیر لە ئەبو مەتەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە عەلیم(رضي الله عنه) بیست دەیوت: چووم بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب کاتێ ئەبو لؤلؤ لێیدا ئەوکات دەگریا، وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی دەگریت؟ وتی هەواڵی ئاسمان گریاندمی، ئایا بەرەو بەهەشت دەبرێم یان بەرەو دۆزەخ وتم موژدەی بەهەشتت لێبێت، چونکە من لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست هێندەی ناتوانم بیژمێرم دەیفەرموو(سیدا کهول الجنة ابوبکر و عمر وأنعما) وتی ئەی عەلی تۆ شایەتی بەهەشتم بۆ دەدەیت؟ وتم بەڵێ تۆش ئەی حەسەن شایەتی لەسەر باوکت بدە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(إن عمر أهل الجنة) واتە(عومەر لە خەڵکی بەهەشتە)[2][3].

پێشتر باسی دنیا نەویستی عومەرمان(رضي الله عنه) دەکرد کە لە میواندارییەکیدا وتی: ئەمە بۆ ئێمە ئەی بۆ هەژارانی مسوڵمانان چی کە مردن و تێر نانی جۆیان نەخوارد؟ عومەری کوڕی وەلید وتی بەهەشتیان بۆ هەیە، چاوەکانی عومەر فرمێسکاوی بوون وتی: ئەگەر پشکی ئێمە لەم دارو پەردووە بێت و ئەوان بەهەشتیان بۆ کردبێت بەڕاستی گەورەییان بردووە.[4]

ئیبن سەعد(ج٣، ص١٤٧) لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: سەری باوکم لە کۆشمدا بوو کە سەرەمەرگی بوو، چاوەکانم فرمێسکیان ڕشت، سەیری کردم و وتی کوڕی شیرینم بۆچی دەگریت؟ وتم بۆ ئەو شوێنە و بارەی دەت بینم، وتی دەی مەگری بۆم، چونکە خوا هەرگیز سزام نادات، بەڵام بێباوەڕان بە

---

[1] – فەرموودەکە مورسەلی غەریبە، تەواو.

[2] – صحيح.

[3] – لە(المنتخب کنزالعمال ج٤، ص٤٣٨) دا واهاتووە.

[4] – عەبدی کوڕی حەکیم و جگە لەویش لە قەتادەوە هێناویەتی.

چاوەکانیا ئازاریان کەم دەکەنەوە، کە چاکەکانیان نەمان دەڵێت: هەرکەسێك دەڵێت داوای پاداشتی کاری خۆی لەوە بکات کە بۆی کردووە.

ئیبن سەعد(ج٤، ص٥٨) لە ئیبن شەماسی مهریەوە هێناویەتی دەڵێت: چووین بۆ لای عەمری کوڕی عاص کە لە ڕێی مەرگدا بوو، ڕووی بەرەو حەوشەکە گێڕا و زۆر دەگریا کوڕەکەی پێی دەوت: بۆچی دەگریت؟ مەگەر پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی وای پێ نەدەدایت؟ مەگەر ئەو موژدەی پێنەدایت؟ ئەویش گریا و ڕووی بەرەو حەوشەکە بوو، پاشان ڕوی کردە ئێمە وتی: چاکترین شت کە لەسەرم حسابە شایەتی(لا إله إلا الله محمد رسول الله) یە، بەڵام من لە سێ باردا بووم: بینیم کە نەبوو هێندەی من ڕقی لە پێغەمبەر(ﷺ) بێت و حەز بکات دەستم پێی بگات و بیکوژم، ئەگەر لەو بارەدا بمردمایە دۆزەخی دەبووم، پاشان خوا ئیسلامەتی خستە دڵمەوەو هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا بەیعەتی پێبدەم، پێغەمبەری خوا، دەستی کردەوە، من دەستم داخست و فەرمووی(عەمر چیتە؟) وتم ویستم مەرج دابنێم، فەرمووی(مەرجی چی دادەنێیت؟) وتم مەرجم ئەوەیە خوا لێم خۆش بێت فەرمووی(ئەی عەمر ئەگەر نازانیت ئیسلام پێش خۆی تێك دەشکێنێ و کۆچیش پێش خۆی تێك دەشکێنێ و حەجیش پێش خۆی تێك دەشکێنێ) ئەو کات خۆشەویسترین کەس لام پێغەمبەر(ﷺ) بوو چاوم لەو ئازیزتری نەدەبینی ئەگەر داوام لێبکرێت وەصفی بکەم ناتوانم، چونکە چاوەکانم نەیانتوانی تێر سەیری بکەن لەتاو بە گەورە دانانیدا، ئەگەر لەو بارەدا بمردمایە هیوام وابوو بەهەشتی بم، پاشان دواتر هەندێ شتمان گرتە دەست و ئێستا من نازانم بارم تیایدا چیە، ئەگەر بمرم شینم بۆ نەکەن و ئاگر نەهێنن بە دوامدا، ئەگەر خستمتانە ژێر گڵ خۆڵم بەسەردا بکەن، کە لێبونەوە لە گۆڕەکەم هێندەی سەربڕینی ئاژەڵێك و دابەشکردنی

گۆشتەکەی لای گۆڕەکەم بمێننەوە چونکە ئارامتان پێ دەگرم چی بە نێردراوانی پەروەردگار دەڵێم.[1]

ئەحمەد لە عەبدوڕەحمانی کوڕی شەماسەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ عەمری کوڕی عاص سەرەمەرگی هات گریا، عەبدوڵڵای کوڕی وتی بۆچی دەگریت؟ لە ترسی مەرگ؟ وتی نە بەخوا، بۆ دوای مەرگ دەگریم، پێی وت: تۆ لەسەر خێر بوویت، باسی بۆ دەکرد، کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووەو لە فەتحی شامدا بەشدار بووە عەمر وتی لە هەموو ئەوانە گەورەترت لەبیر کرد، شایەتی(لا إله إلا الله).بە هەمان شێوە بە کورتی دەیهێنێت – لە کۆتایەکەییشدا هێناویەتی وتی: ئەگەر مردم لەسەرم نەگرین و وەسف کەر نەکەوێتە دوام بەدوامدا ئاگر نەهێنن، جلەکانم بەسەردا بدەن، چونکە من نەیارم هەیە، خۆڵم بەسەردا بکەن، چونکە لای ڕاستم لە لای چەپم شیاوتر نییە بە خوڵ، دارو بەرد مەخەنە ناو گۆڕەکەم.[2]

دەڵێت: موسلیم ئەو فەرموودەی لە صەحیحەکەیدا هێناوەو تیایدا چەند زیادەیەك لەسەر ئەو دەقە واتە دەقی ئەحمەد هەیە، لە گێڕانەوەیەکدا وتی: دوای ئەوە ڕووی بەرەو دیوارەکە وەرچەرخاندو دەیوت(خوایە فەرمانت پێ کردین لامانداو ڕێگریت لێ کردین وازمان نەهێنا، جگە لە لێبوردنت هیچ دادمان نادات) لە گێڕانەوەیەکیشدا وتی: بەهێز نیم تا سەرکەوم و بەدەرنیم تا بیانوو بهێنمەوەو نکوڵی کار نیم، بەڵکو داوای لێخۆشبوون دەکەم، هیچ پەرستراوێ نییە جگە لە تۆ، بەردەوام دەیوتەوە تا مرد تەواو.

ئیبن سەعد(ج٤، ص٢٦٠) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی – فەرموودەکە دێنێت سەبارەت بە وەسیەتی عەمر – لە کۆتیایدا هاتووە پاشان وتی:

---

[1] – موسلیم(ج١، ص٧٦) بە سەنەدەکەی ئیبن سەعد بەو دەقەو بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] – لە(البدايه والنهايه ج٨، ص٢٦) دا واهاتووە.

خوایە تۆ فەرمانت پێکردین ئێمە سەرتر چووین(لاماندا) ڕێگریت لێکردین گرتمانە بەر. بەدەر نیم تا پۆزشم هەبێت، بەهێزو بە توانا نیم تا خۆم سەرخەم، بەڵام(لا إله إلا الله) بەردەوام ئەوەی دەوت تا مرد.

پێشتر لە باسی سەرخستندا وتمان لە پشتیوانان چی یان وت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(قد وفيتم لنا بالذى كان عليكم فأن شئتم ان تطيب أنفسكم بنصيبكم من خيبر و يطيب تماركم فعلتم) واتە(وەفاداریتان هەبوو بۆمان بەوەی لەسەرتان بوو، ئەگەر دەتانەوێت بە پشکتان لە خەیبەر دەروونتان ئارام بکەن و بەرهەمەکانتان پاك و چاك ڕاگرن بیکەن) وتیان تۆ چەند مەرجێکت هەبوو لەسەرمان ئێمەش چەند مەرجێکمان هەبوو لەسەرت بەوەی بەهەشتمان بۆ هەبێت، ئەوەی داوات لێکردین کردمان، ئێستا مەرجەکەی ئێمە ماوە، فەرمووی(خذاكم لكم) واتە(دەی مەرجەکەتان بۆ هەیە).[1]

هەروەها لە باسی جیهاد دا قسەکەی عومەیری کوری حەممان هێنا کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە بەدردا خەڵکی هاندا لەسەر شەڕ، وتی(بەخ بەخ) نێوانی من و چوونە بەهەشتم ئەوەیە ئەوانە بمکوژن، خورماکانی دەستی فڕێداو شمشێرەکەی هەڵگرت و شەڕی کرد تا کوژرا.

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(چی وای لێکردیت بڵێیت بەخ بەخ؟) وتی نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنها بەو هیوایەی من یەکێ بم لەوانە(بەهەشتیەکان) فەرمووی(فأنك من أهلها) واتە(دەی تۆ لەوانەیت) ئەویش خورماکانی لە گیرفان دەرهێنا و لێی خواردن دوایی وتی ئەگەر بیم تا ئەم خورمایانە بخۆم ژیانێکی دوورو درێژ دەبێت، چی خورمای پێبوو فڕێی دا، لە گەڵیاندا شەڕی کرد تا کوژرا.[2]

[1] – بەزار گێڕاویەتییەوە.

[2] – ئەحمەدو جگە لەویش لە ئەنەسەوە(ر.ج) هێناویانە.

هەروەها لە باسی پێکران و بریندار بوونی نا جیهاد دا باسی قسەکەی ئەنەسی کوڕی نەزرمان کرد وتی وای بۆ بۆنی بەهەشت لەوحود دا بەدی دەکەم، لەگەڵ بێباوەڕان کرد تا کوژرا. یان سەعدی کوڕی خەیثەمە لە باسی حەزی هاوەڵان لە کوژرانی ڕێی خوادا وتی: ئەگەر لە بەهەشت بووایە سەرەکەم دەدا پێت، بەلاّم هیوام وایە ئەمە شەهیدی بەنێو چاوەوە بێت بۆم، ئەمە کاتێ باوکی پێی وت هەر دەبێت یەکێکمان بمێنینەوە، هەروەها سەعدی کوڕی ڕەبیع لە ڕۆژی ئوحود دا وتی: پێی بڵی ئەی پێغەمبەری خوا من بۆنی بەهەشت دەکەم، کاتێ زەیدی کوڕی ثابت(رضي الله عنه) پێی وت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەلامت لێدەکات و پێت دەڵێم پێم بڵێ حاڵم چۆنە؟ حرامی کوڕی مەلحانیش(رضي الله عنه) لە ڕۆژی بیئر مەعونەدا وتی سوێند بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم (بردمەوە) واتە بە بەهەشت. عەماریش لە باسی دلێری عەماردا وتی ئەی هاشم پێش کەوە، بەهەشت لە ژێر سایەی شمشێردایە، مەرگیش لە دەوری دانەکاندایە، دەرگاکانی بەهەشت کراونەتەوە حۆریەکانی ڕازێنراونەتەوە، ئەمڕۆ دەگەم بە ئازیزان. موحەممەدو دارو دەستەکەی، پاشان خۆی و هاشم هەڵمەتیان برد تا کوژران، هەروەها دەیوت: ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان لە بەهەشت ڕادەکەن؟ من عەمماری کوڕی یاسرم وەرن بۆم، ئیبن عومەریش لە نکوڵی کردن لەسەر وەرگرتنی دەسەلاّت وتی: دەروونم فێری دنیا نەکردووە پێش ئەمڕۆ چووم تا بڵێم ئەوی لەسەر ئیسلام دای لە تۆو باوکت تا هەردووکتانی بردە ناوی چاوی لێیەتی. باسی بەهەشت و خۆشییەکانیم هێنایە بیرو وازم لێهێنا — واتە کاتێ موعاویە لە دەمە تولجەندەل وتی: کێ چاوی لەم بارەیە(دەسەلاّت) و هیوا خوازیەتی.

سەعیدی کوڕی عامر(رضي الله عنه) کاتێ خێری کرد وتیان دەی ماڵ و مناڵیش مافیان هەیە بەسەرتەوە و نزیکانیشت مافیان لەسەرتە، وتی من زەوت کارییان لەگەڵ ناکەم و بۆ ڕەزامەندی کەس ناگەڕێم بۆ بەدەستهێنانی حۆری، ئەگەر خێری(حۆریەك) لەوانەی بەهەشت دەرکەون زەوی ڕووناك دەکاتەوە وەك چۆن خۆر

ڕووناكى دەبەخشىَ لە گێڕانەوەيەكدا بە ژنەكەى وت لەسەر خۆبە، من هاوەڵانێكم هەبوون بەم زوانە لێم جيابوونەوە حەز ناكەم دنياو چى تيايە بۆ من بێت، بەلاَم لێيان دوور بگرم، ئەگەر يەكىَ لە حۆريە چاكەكان لە ئاسمانەوە دەركەوێت ڕووناكى دەدات بە خەڵكى سەر زەوى‌و ڕووناكى ڕووخسارى خۆرو مانگ دەبەزێنىَ، خومارىَ دەى پۆشىَ باشترە لە دنياو چى تيايە، دەى تۆ لە خۆم لەپێشترى تا وازت لێبێنم بۆيان نەوەك واز لەوان بهێنم بۆ تۆ، ئەويش بێدەنگ بوو ڕازى بوو، يان ئافرەتێكى پشتيوانان لە باسى خۆڕاگرى لەسەر نەخۆشيەكان وتى: نەبەخوا ئەى پێغەمبەرى خوا، بەڵكو ئەم سىَ جارە خۆم ڕادەگرم‌و بەخوا مەترسى بۆ ڕێى بەهەشت دانانێم كاتىَ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى(أيهما إليك أن أدعوا لك فيكشف عنك – أى الحمى – أو تصبرى وتجب لك الجنة) واتە(كاميانت لا خۆشترە تا نزات بۆ بكەم، تاكەت لەسەر لابچىَ يان خۆڕابگريت‌و بەهەشتت بۆ واجب بێت).

ئەبو دەردا وتى: كاتىَ هاوارمە حەزم لە بەهەشتە، هاوەڵان پێيان وت: حەزت لە چييە؟ ئوم حارثەش لەسەر خۆڕاگرى لەسەر مەرگى مندالاَن كاتىَ لە ڕۆژى بەدر كوڕەكەى كوژرا وتى ئەى پێغەمبەرى خوا لەسەر حارثە هەواڵم پێبدە، ئەگەر لە بەهەشتدا بم خۆم ڕادەگرم، ئەگەر نا خوا دەبينێت چى دەكەم – واتە شيوەن، چونكە هێشتا حەرام نەببوو – لە گێڕانەوەيەكى ديكەدا وتى ئەى پێغەمبەرى خوا(ﷺ) ئەگەر لە بەهەشت بێت ناگريم‌و خەفەت ناخۆم، ئەگەر لە دۆزەخدا بێت تا ژيانم مابێت دەگريم، فەرمووى(يا أم حارثة إنها ليست بجنة ولكنها جنة فى الجنات والحارث فى الفردوس الأعلى) واتە(ئەى ئوم حارثە ! ئەوە بەس بەهەشت نييە، بەڵكو بەهەشتێكە لەناو بەهەشتانێكدا، حارث لە فيردەوسى ئەعلايە) ئەويش گەڕايەوەو پێدەكەنى‌و دەيوت بەخ بەخ ئەى حارث.[1]

[1] – صحيح.

حاكم(ج٤، ص٥٧٨) له عائیشه‌وه هێناویه‌تی ده‌ڵێت: بیری دۆزه‌خم كرده‌وه‌و گریام‌و پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی(عائیشه چیته؟) وتم: بیری دۆزه‌خم كردو گریام، ئایا ئێوه له ڕۆژی دواییدا بیری ژن‌و منداڵتان ده‌كه‌ن؟ فه‌رمووی(اما فی الثلاثة مواطن فلا یذكر احدا احدا حتی یعلم ایخف میزانه او یثقل وعند الكتب حتی یقال هاؤم اقرؤ كتابیه، حتی یعلم أن یقع كتابه افی یمینه أم فی الشماله او من وراء ضهره، وعند الصراط إذا وضع بین ضهری جهنم حافتاه كلا لیب كثیرة وحسك كثیر یحبس الله بها من شاء نت خلقه حتی یعلم اینجو أم لا؟) واته(له سێ باردا كه‌س بیری كه‌سی نییه تا بزانێت ئایا ته‌رازووه‌كه‌ی سووكه یان قورسه، له كاتی نامه وه‌رگرتنه‌وه‌دا تا ده‌وترێت نامه‌كه‌م بخوێننه‌وه، تا ده‌زانیت كتێبه‌كه‌ی ده‌خرێته كوێ له لای ڕاستی یان له لای چه‌پی یان له دواوه پێی ده‌درێت، له كاتی پردی صراط دا كاتێ خرایه به‌رده‌م دۆزه‌خ ئه‌ملاو لاكانی قولاپی زۆرو دڕكی تیژی زۆرن خوا كام دروست كراوانی خۆی بووێت تیایدا ده‌یهێڵێته‌وه تا ئه‌و كه‌سه بزانێت ئایا ڕزگاری ده‌بێت یان نا؟)[1].[2]

ئین ئه‌بی حاته‌م له عه‌بولعه‌زیزی كوڕی ئه‌بوداوده‌وه هێناویه‌تی ده‌ڵێت: بیستم پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئه‌م ئایه‌ته‌ی ده‌خوێنده‌وه ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾(التحريم٦) هه‌ندێ له هاوه‌ڵان له لای بوون‌و له نێوانیاندا پیرێك هه‌بوو، پیره‌كه وتی ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا به‌ردی دۆزه‌خ وه‌ك به‌ردی دنیا وایه،

---

[1] - ضعیف.

[2] - حاكم ده‌ڵێت ئه‌م فه‌رمووده له‌سه‌ر مه‌رجی بوخاری‌و موسلیم صه‌حیحه ئه‌گه‌ر ئیرساڵی نه‌بووایه له نێوان حه‌سه‌ن‌و عائیشه‌دا زه‌هه‌بی واده‌ڵێت.

فەرمووی(والذی نفسی بیده لصخرة من صخر جهنم أعضم من الجبال الدنیا کلها) واتە(سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە بەردێ لە بەردەکانی دۆزەخ گەورەترە لە هەموو شاخەکانی دنیا) پیرەکە لەهۆش خۆی چوو کەوت، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی لەسەر سنگی داناو سەیری کرد زیندووە. بانگی کردو فەرمووی(یاشیخ قل لا إلە إلا الله) ئەی پیر بلێ لا إلە إلا الله) ئەویش وتی، پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی بەهەشتی پێدا. هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەی لەنێو ئێمەدا؟ فەرمووی(بەڵێ خوا دەفەرموێت ﴿ ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ﴾[1][2].

حاکم بە کورتی بەو واتایە لە فەرموودەیەکی ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی و بە صەحیحی داناوە وەك لە پێشتر لە باسی ترسدا هێنامان. لە گێڕانەوەیەکدا گەنجەکە لە هۆش چوو کەوت – لە بری پیرە گەنج بوو – لە باسی تریشدا چیرۆکی گەنجێکی پشتیوانانمان هێنا کە ترسی خوا لە دڵی دابوو، لە کاتی باسی دۆزەخدا دەگریا تا لەماڵەوە نەچوویە دەر، پێغەمبەر(ﷺ) هات کە گەنجەکە سەیری کرد هەستاو پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆشی گرت و گەنجەکە مرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(جهزوا صاحبکم فأن الفرق من النار فلکذبوه) واتە(براکەتان بشۆن و کفنی بکەن، چونکە ترسی دۆزەخ جەرگی بڕی) حاکم بە صەحیحی لە سەهلەوە و ئیبن ئەبی دنیا و جگە لەویش لە حوذەیفەوە هێناویانە، هەروەها چیرۆکی بە ڕوودا کەوتنەوەی شدادی کوڕی ئەوس لەسەر جێگەکەی و قسەکەی: خوایە دۆزەخ خەوی لێ زڕاندوم، هەڵدەسا نوێژی دەکرد تا بەیانی هەندێ چیرۆکیشمان هێنا لە باسی گریانی هاوەڵاندا. لە ڕۆژی موئتەش باسی گریانی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کرا وتی: بەخوا خۆشەویستی دنیا و لێبوونتانم نییە، بەڵام لە پێغەمبەرم(ﷺ)

---

[1] – ضعیف.

[2] – ئەمە فەرموودەیەکی مورسەلی غەریبە، لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٣٩١) دا واهاتووە

بیست ئەم ئایەی دەخوێندەوە کە باسی دۆزەخی تێدا بوو ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَّقْضِيّاً﴾ جا من نازانم دوای دەرباز بوونم چۆن بێت.

# دڵنیابوون لەوەی خوا بەڵێنی داوە

ترمذی لە نیاری کوڕی موکریمی ئەسلەمییەوە هێناویەتی دەڵێت کاتێ ئەم ئایەتانە دابەزین ﴿ألم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فى بِضْعَ سِنِين﴾(الروم١-٤) ئەو ڕۆژەی ئەو ئایەتە دابەزی فارس ڕۆمیان شکاندبوو، مسوڵمانان حەزیان دەکرد ڕۆمەکان بەسەریاندا زاڵ بن، چونکە ئەوان ئەهلی کیتاب بوون، لەو بارەوە خوا دەفەرموێت ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾(الروم٤-٥) قوڕەیش حەزیان دەکرد فارس سەرکەون، چونکە ئەهلی کیتاب نەبوون و باوەڕیان بە زیندوو بوونەوە نەبوو، کاتێ خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند ئەبوبەکر لە بەشەکانی مەککەدا هاواری دەکرد ﴿ألم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فى بِضْعَ سِنِين﴾ هەندێ خەڵکی قوڕەیش بە ئەبوبەکریان وت: دەی با ئەو بانگەشەی هاوەڵەکەتان لە نێوان ئێمەو ئێوەدا بێت کە دەڵێیت ڕۆم لە چەند ساڵێکی تردا - سەردەکەون ئایا لەسەر ئەمە گرەوت لەگەڵدا بکەین؟ وتی بەڵێ، ئەمە پێش حەرام بوونی گرەو بوو، ئەبوبەکرو بێباوەڕان گرەویان کردو گرەوەکانیان دانا و بە ئەبوبەکریان وت ئەو چەند ساڵە بە چەند دادەنێیت؟ بە سێ ساڵ یان نۆ ساڵ، با شتێکی نێوەندی بێت لەسەری کۆك بین، لە نێوانیاندا شەش ساڵیان دانا، شەش ساڵەکە چوو پێش ئەوەی سەرکەون، بێباوەڕان گرەوەکەی ئەبوبەکریان برد، کاتێ کەوتە ساڵی حەوتەم ڕۆم بەسەر فارسدا سەرکەوتن. مسوڵمانان ڕەخنەیان لە ئەبوبەکر گرت، کە بۆچی شەش ساڵی

داناوە، چونکە خوا فەرموویەتی(فی بِضْعَ سِنِین) ئەوکات خەڵکێکی زۆر مسوڵمان بوون[1].[2]

ئیبن ئەبی حاتەم لە بەرائەوە هێناویەتی وتی: کاتێ ئەم ئایاتانە دابەزین ﴿غُلِبَتِ الرُّومُ ۝ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ﴾ بێباوەڕان بە ئەبوبەکریان وت: نابینی هاوەڵەکەت چی دەڵێت. ڕۆم بەسەر فارسدا سەردەکەوێت، وتی هاوەڵەکەم ڕاست دەکات. وتیان دەی وەرە با گرەوێ لەنێوان ئێمەو تۆدا هەبێ؟ ئەوانیش ماوەیەکیان دانا، پێش ئەوەی سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارسدا ماوەکە تەواو بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بیستەوەو پێی ناخۆشبوو بە ئەبوبەکری فەرمووی چی وایکرد ئەوە بکەیت؟ وتی: بەڕاست زانینی فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی، فەرمووی: بڕۆرەوە بۆ لایان و شتەکە گەورەتر بکە بۆیان و لەسەر چەند ساڵێ(بضع سنین) دایبنێ، ئەبوبەکر چوو بۆ لایان وتی دەتوانین پاشەکشە بکەین؟ چونکە پاشەکشەکە چاکترە؟ وتیان باش، ئەو ساڵانە تێپەڕ نەبوون تا ڕۆم بەسەر فارسدا سەرکەوتن و لە مەدائین و بەنی ڕومیە ئەسپەکانیان بەستنەوە، ئەبوبەکر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەم سامانە حەرامە فەرمووی ببیبەخشە[3].[4]

بەغەوی لە کەعبی کوڕی عەددیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ وەفدێکی خەڵکی حیرە هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش پێشنیاری مسوڵمان بوونی بۆ

---

[1] – حسن.

[2] – ترمزی واهێناویەتی، پاشان دەڵێت: ئەم فەرموودەیە حەسەنی صەحیحەو تەنها لە فەرموودەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو زنادەوە دەیبینین،

[3] – صحیح.

[4] – ئیمامی ئەحمەدو ترمزی هێناویانەو ترمزی بە حەسەنی دەزانێت. نەسائی و ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن کەسیر(ج٣، ص٤٢٢ دا) هێناویانە.

كردین ئێمەش مسوڵمان بووین، كە چووینەوە بۆ حیرە هێندەی نەبرد هەواڵی مەرگی پێغەمبەر(ﷺ) مان بیست، هاوەڵانم دایانە دوا وتیان ئەگەر پێغەمبەر بووایە نەدەمرد، منیش وتم پێشتریش پێغەمبەران مردوون، لەسەر ئیسلام مامەوە بەرەو مەدینە چووم، دام بەلای ڕاهیبێكدا كە بەبێ ئەو هیچمان نەدەكرد، چووم بۆ لای و وتم وتی هەواڵی ئەو شتەم پێبدە كە دەمەوێت شتێكی لە دەروونمدا جێی گرتووە، وتی ناوت بڵێ، منیش ناوی كەعبم پێوت، وتی بیخەرە ناو ئەو شیعرە، شیعرێكی هێنا منیش خستمە ناو شیعرەكە، سیفەتەكانی پێغەمبەرم(ﷺ) پێوت وەك ئەوەی دیبووم هاوكات مەرگیشی لەوكاتەدا كە تیایدا مردبوو، بەوە باوەڕم زیاتر توند بوو، چووم بۆ لای ئەبوبەكرو وتم چی بووەو لای مامەوە، ناردمی بۆ لای مقوقس و دواتر هاتمەوە پاشان عومەریش ناردمی. پاش شەڕی یەرمووك نامەیەكیم بردو نەمزانی نامەكە چییە(ڕۆمیەكە) پێی وتم: دەزانی ڕۆم لەگەڵ عەرەب شەڕیان كردووەو شكاندونیان؟ وتم نا، وتی بۆچی؟ وتم چونكە خوا بەڵێنی بە پێغەمبەرەكەی داوە ئایینەكەی بەسەر هەموو ئاینەكاندا سەردەخات و خواش لە بەڵێن لانادات، وتی: عەرەب ڕۆمی كوشتووە سوێند بە خوا وەك كوشتاری عاد، پێغەمبەرەكەشتان ڕاست دەكات. پاشان پرسیاری لێكردم لەسەر گەورە هاوەڵان و دیاری بۆ دانان و پێی وتم: عەبباس مامیەتی زیندووە تا سەردانی بكەین، كەعب وتی: من لەگەڵ عومەری كوڕی خەتتاب بەشدارو تێكەڵ بووم، كاتێ دیوانی دانا لەناو بەنی عەدی كوڕی كەعب پشكی بۆ منیش بڕییەوە. بەغەوی دەڵێت: تەنها ئەمەم لە كەعبی كوڕی عەددی دیووە، ئیبن قانع لە بەغەویەوە بە هەمان شێوە هێنایەتی، بەڵام لێی كورت كردوەتەوە بۆ ئەوەی وتی: پێش ئەو پێغەمبەران مردوون.[1]

---

[1]- ئیبن شاهین و ئەبو نەعیم ئیبن سكن بە دورو درێژی و ئیبن یونس لە(تاریخ مصر) لە لایەكی دیكەوە لە كەعبەوە بە دورو درێژی هێناویانە، وەك لە(الإصابە ج٣، ص٢٩٨) دا واهاتووە.

پێشتر قسەی ئەبوبەکرمان هێنا لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا وتی: بەخوا بەردەوام فەرمانی خوا بەجێ دەگەیەنم و لە ڕێی خوادا جیهاد دەکەم تا خوا سەرم دەخات و بەڵێنی خۆیمان پێ دەگەیەنێت، کاممان کوژرا شەهیدی بەردەکەوێت لە بەهەشتدایەو کاممان مایەوە خەلیفەی خوایە لەسەر زەویداو میراتگری حەقی بەندەکانیەتی، چونکە خوا قسەی ناڕاستی نییەو دەفەرموێت ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ هەروەها عومەر لە هان دانیان بۆ جیهاد دەڵێت: کوان ئەو نامۆو کەسە جۆرانەی لە بەڵێنی خوا دووریان گرتووە؟ بەسەر زەویدا بچن، ئەو خاکەی خوا لە قورئانەکەیدا بەڵێنی پێداون بە میراتی ئێوەی بگێڕێت، چونکە دەفەرموێت ﴿لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ﴾ خوا ئایینی خۆی سەردەخات و سەرخەری سەر بڵندتر دەکات و پاڵپشتی دارو دەستەیەتی و بەسەر گەلاندا سەری دەخات، کوان بەندە صاڵحەکانی خوا؟ سەعدیش لە هاندانیان بۆ جیهاد دەڵێت خوا حەقەو لە دەستەڵاتدا هیچ هاوبەشێکی نییەو بەڵێنی خوا لادانی نییەو دەفەرموێت ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾(لقمان ١٠٥) ئەوە ئەو میراتەتانە کە خوا بەڵێنی پێداون و ماوەی سێ حەجە بۆی ڕەوا کردوون، وا لێی دەخۆن و خەڵکەکەی دەکوژن و سامانیان لێ کۆدەکەنەوەو کۆیلەیان لێ دەگرن تا ئەمڕۆ کە باریان گەیشتۆتە ئەمڕۆ، وا ئەو دەستەیان هاتوون بۆتان و ئێوە ناودارانی عەرەب و چاکترینانی هەر هۆزێك و سەرخەری ئەوانەتانن کە نەهاتوون، ئەگەر دەست بەرداری دنیا و خوازیاری ڕۆژی دوایی بن خوا دنیا و ڕۆژی دواییشتان پێکەوە پێدەدات. – بە کورتی تەواوە.

# دڵنیا بوون له‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) هه‌واڵی داوه

ئیبن سه‌عد(ج٤، ص٣٧٨) له عه‌ماره‌ی کوڕی خوزه‌یمه‌ی کوڕی ثابت له مامیه‌وه هێناویه‌تی - که له هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) بوو - پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئه‌سپێکی له کابرایه‌کی ده‌شته‌کی کڕی، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) که‌وته شوێنی تا پاره‌که‌ی پێ بدات، بۆیه خێرا چوو ده‌شته‌کییه‌که‌ش هێواشی نواند، هه‌ندێ که‌س ده‌گه‌یشتین به ده‌شته‌کیه‌که‌و له‌سه‌ر ئه‌سپه‌که قسه‌یان له‌گه‌ڵ ده‌کردو نه‌یان ده‌زانی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) کڕیویه‌تی تا هه‌ندێکیان له‌و نرخه‌ی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) بۆی دانابوو زیاتریان بۆ دانا، کاتێ ئه‌وه‌بوو ده‌شته‌کیه‌که پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ی بانگکردو وتی ئه‌گه‌ر ئه‌م ئه‌سپه ده‌کڕیت ئه‌وه بیکڕه ئه‌گه‌ر نا ده‌یفرۆشم، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی(ألست قد ابتعته منك؟) واته(ئایا من نه‌مکڕی لێت؟)ده‌شته‌کیه‌که وتی نه‌به‌خوا پێم نه‌فرۆشتیت، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی(با، من لێم کڕیت)(بلى، قد ابتعته منك)(به‌ڵێ، لێم کڕیت) خه‌ڵکی ده‌یاندا به‌لای پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)و ده‌شته‌کیه‌که‌و ئه‌وانیش قسه‌یان له‌سه‌ر ده‌کرد، ده‌شته‌کیه‌که ده‌یوت: ئاده‌ی شایه‌تێك بێنه که پێم فرۆشتوویت، هه‌ر مسوڵمانێ ده‌هات به ده‌شته‌کیه‌که‌ی ده‌وت: قوڕت به‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ته‌نها حه‌ق ده‌ڵێت، تا خوزه‌یمه‌ی کوڕی ثابت هات گوێی لێبوو، چوو بۆ پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)و بۆ ده‌شته‌کیه‌که، ده‌شته‌کیه‌که ده‌ی وت شایه‌تێکم بۆ بێنه که پێم فرۆشتویت، خوزه‌یمه وتی من شایه‌تی ده‌ده‌م تۆ پێت فرۆشت، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ڕویکرده خوزه‌یمه‌و فه‌رمووی(بم تشهد؟) واته(به‌چی شایه‌تی ده‌ده‌یت؟) وتی به‌وه‌ی به‌ڕاست ده‌زانم تۆ پێغه‌مبه‌ریت، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) شایه‌تی خوزه‌یمه‌ی به شایه‌تی دوو پیاو دانا.[1]

ئه‌بوداود(ص٥٠٨) له عه‌ماره‌ی کوڕی خوزه‌یمه‌وه هێناویه‌تی ده‌ڵێت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی(ئه‌ی خوزه‌یمه به‌چی شایه‌تی ده‌ده‌یت له‌گه‌ڵمان نه‌بوویت؟)

---

[1] - صحيح.

وتی ئەی پێغەمبەری خوا من سەبارەت بەهەوڵ دانت لە ئاسمان بەڕاست دەزانم ئێستا بەو قسەت نەڵێم ڕاستە، پێغەمبەرﷺ شایەتی خوزەیمەی بەشایەتی دوو پیاو دانا، لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا وتی: دەزانم تەنها تۆ حەق دەڵێیت لەسەر گەورەتر لەوە لەسەر ئایینمان باوەڕمان پێهێناویت، ئەویش شایەتیەکەی قبوڵ کرد.

بەیهەقی لە عائیشەوە(رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) برا بۆ مزگەوتی ئەقصا بەیانی باسیکرد بۆ خەڵك، هەندێ خەڵك پاش گەزبوونەوە لەوەی باوەڕیان پێ هێنابوو و چوون بۆ لای ئەبوبەکرو پێیان وت ئاگات لە هاوەڵەکەتە دەڵێت ئەمشەو برام بۆ بەیتولمەقدیس؟ وتی شتی وا هاتووە؟ وتیان بەڵێ، وتی ئەگەر ئاوای وتبێت ڕاست دەکات، وتیان: بەڕاستی دەزانیت ئەمشەو چووبێت بۆ قودس و پێش ڕۆژ بوونەوە هاتبێتەوە؟ وتی بەڵێ من لەوە زیاتریش بە ڕاستی دەزانم، لە هەواڵی ئاسماندا بۆ چرکەساتێ بڕوای پێ دەکەم، بۆیە ناوی نرا ئەبوبەکری صدیق.[1]

ئەبونەعیم لە عائیشەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: هەندێ لەوەی باوەڕیان پێ هێنابوو پاشگەز بوونەوەو هەندێ بە ڕاستیان زانی و ڕاڕا ببوون.[2]

ئیبن ئەبی حاتەم لە فەرموودەکەی ئەنەسەوە چیرۆکی شەوی ئیسرای بە دوورو درێژی هێناوە تیایدا هاتووە: کە بێباوەڕان ئەو قسەیان بیست چوون بۆ لای ئەبوبەکر وتیان ئاگات لێیە هاوەڵەکەت دەڵێت ئەمشەو ڕێگەی مانگێکی بڕیووەو هەر ئەمشەویش گەڕاوەتەوە؟ ئەبوبوکر وتی – ڕاست دەکات – بە هەمان شێوەی پێشوو هێناویەتی.[3]

---

[1] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص٢١) دا واهاتووە.

[2]– ئەبونەعیم دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەممەدی کوڕی کەسیری مصیصی هەیە کە ئەحمەد زۆر بە لاوازی دەزانێت، ئیبن موعین وتی ڕاستگۆیە، نەسائی و جگە لەویش دەڵێن: بەهێز نییە. وەك لە(المنتخب ج٤، ص٣٥٣) دا واهاتووە.

[3] – وەك لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص٧) داهاتووە.

ئەبو یەعلا لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی دەڵێت: لە ساڵێك لە ساڵەکانی عومەردا کە خەلیفە بوو کوللە کەمی کرد، پرسیاری لێکرا ئەویش هیچی نەوت بەوە دڵتەنگ بوو و کەسێکی نارد بۆ کەنداو کەسێ بۆ شامو یەکێ بۆ عێراق تا پرسیار بکەن ئایا هیچ لە کوللە بینراوە یان نا؟ ئەوەی لە یەمەنەوە هاتبوویەوە مشتێ کوللەی هێناو خستیە بەردەستی، کە بینی سێ جار "الله اکبر" ی کرد، پاشان وتی لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(خلق الله عزوجل الف أمة منها ستمائة فی البحر واربعمائة فی البر واول شیءیهلك من هذه الأمم الجراد، فأذا هلکت تتابعت مثل النضام إذا قطع سلکه) واتە(خوا هەزار ئوممەتی دروست کردووە شەش سەدیان لە دەریادا و چوار سەدیان لە وشکانیدان، یەکەم شت لەو ئوممەتانە لەناو دەچن کوللەیە، ئەگەر لەناو چوو ئەوا بەدوایدا ئەوانی دیکەش دێن وەك تەسبیح ئەگەر سەرەکەی پچڕا)[1,2].

ئیبن ئەحمەد لە(الزوائد)و ئیبن ئەبی شەیبەو بەزارو حارثو ئەبو نەعیمو بەیهەقی لە(الدلائل)و ئیبن عەساکیر لە خوزالەی کوڕی فوزالەی ئەنسارییەوە هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ باوکم چووم بۆ(ینبع) بۆ سەردانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب کە لەوێ نەخۆش بوو، باوکم پێی وت: لێرە چی دەکەیت؟ ئەگەریش بمریت تەنها دەشتەکیەکانی جوهەینەت لەگەڵ دەبن سواربە تا دێیتە مەدینە، ئەگەر سەرەمەرگت هات هاوەڵانت لەگەڵ دەبن ونوێژت لەسەر دەکەن. – ئەبو فوزالە لە بەشداربووانی بەدربوو – عەلی وتی: من بەم دەردە نامرم، پێغەمبەر(ﷺ) ڕای سپاردووم نەمرم تا دەستەڵات دەگرمە دەست پاشان ئەمەم – واتە ڕیشی – تێك ئالاوی خوێنی ئەمە دەبێت – واتە ڕوخسارو تەوێڵی –[3,4].

---

[1] – موضوع.

[2] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٢، ص١٣١) دا واهاتووە.

[3] – صحیح.

[4] – لە(المنتخب کنزالعمال، ص٩٥) دا هاتووەو دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

حەمیدی و بەزارو ئەبویەعلاو ئیبن حبان حاکم جگە لەویش لە عەلیەوە هێناویانە، لە عەلیەوە وتی: عەبولاّی کوڕی سەلام هات بۆ لام و منیش سواری وڵاخەکە ببووم، پێی وتم بۆ کوێ دەچیت؟ وتم بۆ عێراق وتی دەچیت بۆ ئەوێ تا لای تیژی شمشێرەکەت بەرکەوێت، عەلی وتی ئەی هاوار بەخوا لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست پێش ئەوە ئەم ئەوە بڵێت ئەوەی فەرموو.[1، 2]

ئیبن عەددی و ئیبن عەساکیر لە موعاویەی کوڕی جەریری حەزرەمیەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی ئەسپێکی پێبوو ئیبن مولجەم دای بەلایداو پرسیاری کرد لەسەر ناوی یان ڕەچەڵەکی، ئەویش دایەوە پاڵ جگە لە باوکی، ئەویش پێی وت درۆ دەکەیت – تا دایەوە پاڵ باوکی خۆی – وتی ئێستا ڕاست دەکەیت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم بکوژەکەم شێوە جولەکەیەو ئەوەش جولەکەیە دەی بیبە.[3]

عەبدوڕەزاق و ئیبن سەعدو وەکیع لە عوبەیدەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی کە ئیبن مولجەمی دەبینی دەیوت:

أريد حباءه ويريد قتلي عزيرك من خليلك من مراد[4]

ئیبن سەعدو ئەبونەعیم لە ئەبو توفەیلەوە هێناویانە دەڵێت: لە لای عەلی کوڕی ئەبو تالیب بووم، عەبدوڕەحمانی کوڕی مولجەم هات بۆ لای، ئەویش فەرمانی کرد بەخششی بدەنێ پاشان وتی ئەم یاخیە چی ڕێی دەگرێت لە سەرەوە بیڕێژێت، ئەمە لەوە خوێناوی بکات – ئاماژەی بۆ ڕیشی کرد – پاشان عەلی وت:

اشدد حيازيمك للموت فأن الموت اتيكا
ولا تجزع من القتل إذا حل بواديكا[5]

---

[1] – صحیح.
[2] – لە(المنتخب ج٥، ص٥٩) دا واهاتووە.
[3] – لە(المنتخب ج٥، ص٦٢) دا واهاتووە.
[4] – لە(المنتخب ج٥، ص٦١) دا واهاتووە.
[5] – لە(المنتخب ج٥، ص٥٩) دا واهاتووە.

ئیبن عەساکیر لە ئوم عەمماری لە کۆشکگری عەممارەوە هێناویەتی دەڵێت: عەممار ناساغ بوو و وتی: بەم نەخۆشیەم نامرم، خۆشەویستم پێغەمبەر(ﷺ) پێی وتم کە بە کوژراوی لە نێوان دوو دەستەی باوەڕداراندا دەمرم، لە المنتخب ج٥، ص٢٤٧) دا واهاتووە. پێشتریش لە باسی حەزی هاوەڵان بۆ شەڕی ڕێی خوا قسەکەی عەممارمان هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) ڕای سپاردم کە کۆتا توێشوی ژیانت بڕێ شیر بێت، لە ڕۆژی صفین کە هات بۆ لای عەلی کاتێ شەڕی دەکرد کە کەسی نەدەکوشت، هەروەها وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕۆژی ئەوەو ئەوەو – سێ جار وتی – پاشان شیرێك هێنرا خواردیەوەو پاشان وتی: پێغەمبەر(ﷺ) پێی وتم ئەمە کۆتا خواردنەوەیە لە دنیادا دەیخۆمەوە، پاشان جەنگا تا کوژرا.

ئەبویەعلاو ئیبن عەساکیر لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە هێناویەتی لە کچی هیشامی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەوە – کە لە نەخۆشی عەمماردا خزمەتی دەکرد – وتی: موعاویە هات بۆ لای عەمار سەردانی کرد، لە لای دەرچوو وتی: خوایە مەرگی بەدەست ئێمە نەبێت، چونکە من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست فەرمووی(تقتل عمارا الفئة الباغية)(دەستەی یاخی بوو عەممار دەکوژن)[1][2].

ئیبن سەعد(ج٤، ص٢٣٣) لە ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەر لە باوکییەوە هێناویەتی کاتێ ئەبو ذەر سەرەمەرگی هات ژنەکەی گریا، پێی وت بۆچی دەگریت؟ وتی چونکە بەبێ تۆ دەستم نییە جلێکم نییە بۆت بشێت، وتی دەی مەگری چونکە من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە بە دەستەیەکی دەفەرموو کە منیش تیاندا بووم(ليموتن منكم رجل بضلاة من الأرض تشهد عصبة من الؤمنين) واتە(لە نێوانتاندا کەسێ لە زەوییەکی چۆڵ دەمرێت دەستەیەکی باوەڕداران ئامادەی دەبن) هەموو ئەوانە هەریەکەو لە گوندێ مردووەو دەستەیەکی مسوڵمانانی تێدابووە، منم کە لەو زەویە

[1] – صحيح.
[2] – (المنتخب كنزالعمال ج٥، ص٢٤٧).

دەمرم، سوێند بەخوا درۆم نەکردەوەو ناکەم، دەی سەیری ڕێگەکە بکە، ژنەکەی وتی: ئاخۆ چۆن کە حاجیان چوون و ڕێگە بڕاوە، دەچوویە سەر بەرزییەك و سەیری دەکردو دەهاتەوە خزمەتی دەکردو هەمووی دەچوو سەیری دەکرد، ئەوکات بینی دەستەیەك لە ئاژەڵەکانیان بەدوای یەکدا دەیان نواندن وەك کڕ کەوتوو وابوون لەسەر ئاژەڵەکانیان(بەسەری ڕەش و جلی سپی) ئەویش بە جلەکەی ئاماژەی کرد، ئەوانیش هاتن و لە لای وەستان و وتیان چیتە؟ وتی: یەکێ لە مسوڵمانان دەمرێت ئایا کفنی دەکەن؟ وتیان کێیە؟ وتی ئەبوذەر، ئەوانیش وتیان بە دایك و باوکەوە بەقوربانی بین، قامچی و شتەکانیان دانا و چوون بۆ لای، ئەویش وتی موژدەتان لێبێت ئینجا فەرموودەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ گێڕانەوە، پاشان وتی بیستم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو(لا یموت بین امرأ مسلمین ولدان أو ثلاثة فیحتسبان ویصبران فیریان النار) واتە(لە نێوان دوو کەسی مسوڵماندا دوو یان سێ منداڵ بمرن چاوەڕێی پاداشت بن و خۆڕابگرن دۆزەخ نابینن). وتی ئێوە دەبیستن ئەگەر جلێکم بووایە بەشی کفنم بکات تەنها لەوەدا کفن دەکرام، یان ژنەکەشم جلێکی هەبووایە بەشم بکات لە جلی ئەودا کفن دەکرام. دەی لەبەر خواو ئیسلام ڕاتان دەسپێرم هەرکەستان ئەمیر یان عەریف یان نەقیب یان پۆستە چییە کفنم نەکات، هەرکامەو یەکێ لەوانە بوون جگە لە گەنجێکی پشتیوانان وتی من کفنت دەکەم، چونکە من هیچ کام لەوانە نیم، لە عەباکەی بەرمدا کفنت دەکەم و دوو جلیشم هەیە لەناو توێشوەکەمدا دایکم ڕستوونی بۆم، وتی دەی تۆ کفنم بکە، پشتیوانییەکە کفنی کرد لەگەڵ ئەو دەستەدا کە لە لای بوون، لە نێویاندا حجری کوڕی ئەدبرو مالیکی ئەشتەر هەبوو لەگەڵ خەڵکێکدا کە هەموویان یەمەنی بوون[1،2].

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەبونەعیم لە ئوم ژەرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی. وەك لە(المنتخب ج٥، ص١٥٧) دا واهاتووە.

ئیبن سەعد(ج٤، ص٢٣٤) لە ئیبن مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ عوسمان(ر.ض) ئەبوزەری بۆ ڕەبزە دوور خستەوەو لەوێ ئەبو ذەر تووشی قەدەری خۆی بوو، کەسی لەگەڵ نەبوو جگە لە ژنەکەی و خزمەت کارەکەی، وەسیەتی بۆ کردن بم شۆن و کفنم بکەن و لەسەرە ڕێ دامنێن، یەکەم دەستەو کاروان دای بە لاتاندا بڵێن ئەوە ئەبو ذەری هاوەڵی پێغەمبەری خوایە، بۆ ناشتنی یارمەتیمان بدەن، کاتێ مرد وایان کردو دایاننا، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بە دەستەیەکە خەڵکی عێراقەوە بۆ عەمرە هات، سەیریان کرد تەرمێ لەسەر ڕێگەیانەو خەریك بوو وشترەکان بیشێلن، غولامەکە هەستا بۆ لای تەرمەکەو وتی ئەوە ئەبوزەری هاوەڵی پێغەمبەرە(ﷺ) دەی یارمەتیمان بدەن بیخەینە ژێر خاك، عەبدوڵڵا دەستی کرد بە گریان وتی: پێغەمبەری خوا ڕاستی فەرموو(تمشی وحدك وتموت وحدك وتبعث وحدك) واتە(بە تەنها دەچیت و بە تەنها دەمریت و بە تەنها زیندوو دەکرێیتەوە) پاشان لەگەڵ هاوەڵانی دابەزین و شاردیانەوە پاشان عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود فەرموودەکەی بۆ گێڕانەوە، کە پێغەمبەر(ﷺ) لە چوونی بۆ تەبووك چی پێ فەرموو.

ئەبونەعیم لە(الدلائل، ص١٩٦) لە حەمیدی کوڕی منهبەوە هێناویەتی وتی: حوزەیمی کوڕی ئەوسی باپیرم وتی: کۆچم کرد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە کاتی گەڕانەوەی لە تەبووك چووم بۆ لای و مسوڵمان بووم، بیستم دەیفەرموو(هذە الحیرة البیضاء قد رفعت لی وهذە الشیماء بنت نفیلة الأودیة علی بغلة شهباء محتجرة بغمار اسود)(ئەوە حیرەی سپیە بەرز کرایەوە بۆم و ئەوە شەیمای کچی نوفەیلەی ئەودیە لەسەر ووشترێکی خۆڵە مێشی ڕوپۆشێکی ڕەشی داوە بەسەرو ملیدا) دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە نەچووینە حیرە بینیمان وەك ئەوەیە کە وەسفی دەکەیت ئەوە بۆ من بێت؟ فەرمووی(هی لك)(بۆ تۆیە) پاشان هەڵگەڕانەوە ڕوویدا کەس لە تەییءهەڵ نەگەڕایەوە، لەگەڵ کچی نوفەیلە بوو وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لەسەر ووشترەکە پەڕۆیەکی ڕەشی بەستبوو، خۆم گەیاند پێی وتم ئەمە

پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کرد بۆم، خالید داوای بەڵگەی لێکردم، منیش پێم وت ئەوانیش موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو موحەممەدی کوڕی بەشیری ئەنساری بوون، خالیدیش شەیمای دایە دەستم، عەبدولمەسیحی کوڕی نوفەیلەی برای هات بۆ لای تا ڕێك بکەوێت، وتی بیفرۆشە پێم، وتم نا، وتی بەخوا لە دەسەدی کەمترت نادەمێ، هەزار درهەمی پێداو منیش دامە دەستی، پێیان وتم ئەگەر بت وتایە سەد هەزار دەیدا پێت، منیش وتم: وام نەدەزانی لەسەد دەیی ژمارەی زیاتر هەبێت[1،2].

ئەبونەعیم لە(الدلائل، ص١٩٨) لە جوبەیری کوڕی حەییەوە هێناویەتی دەڵێت:(بندار فان علج) هەواڵی نارد ئەی عەرەب کەسێك لە خۆتانمان بۆ بنێرن تا قسەی لەگەڵ بکەین، خەڵکەکە موغیرەی کوڕی شوعبەیان نارد، جوبەیر وتی: من سەیری دەکەم قژی درێژو یەك چاو بوو، چوو بۆ لای، کە گەڕایەوە پرسیارمان لێکرد چی پێوت؟ پێی وتین: سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو وتم: ئێمە دورترین شوێن و جێمان هەیەو لە هەمووان برسی ترو لە هەمووان لاسارتر بووین و لە هەمووان دوورتر بووین لە هەر چاکەیەك تا خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، بەڵێنی سەرکەوتنی دنیاو بەهەشتی ڕۆژی دوایی پێداین، لەو کاتەوەی ئەو پێغەمبەرەمان بۆ هاتووە بەردەوام لە پەروەردگارمانەوە سەرکەوتن بەدی دەکەین تا هاتین بۆ لای ئێوەش، سوێند بەخوا ئێمە موڵك و ژیانێ دەبینین لێی ناگەڕێینەوە بۆ سەختی جاران تا سەردەکەوین بەسەرتاندا بەو شەوە کە لەبەردەستان یان لە خاکتاندا دەکوژرێین.

---

[1] – ضعیف.

[2] – تەبەرانی لە حەمیدەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی وەك لە(الإصابە ج١، ص٢٢٤) دا هاتووە. بوخاری لە حەمیدەوە بە کورتی و ئیبن مندە بە دوورو درێژی هێناویەتی دەڵێت: تەنها بەم سەنەدە دەبینرێت و زەکەریای کوڕی یەحیا لە زحرەوە هێناویەتی. لە(الإصابە ج٣، ص٣٧١) دا واهاتووە.

بەیهەقی لە(الأسماء والصفات، ص١٤٨) لە جوبەیری کوڕی حەییەوە هێناویەتی – بە دوورو درێژی باسی ناردنی نوعمانی کوڕی موقرین دەکات بۆ لای خەڵکی ئەهواز کە داوایان کردبوو کەسێ بێت بۆ لایان موغیرەی کوڕی شوعبە هاتووە. وەرگێڕەکەیان وتی ئێوە کێن؟ موغیرە وتی: ئێمە خەڵکێکین لە عەرەب، لە سەختی و لاسارییەکی سەختو دوورو درێژدا بووین، لە برسێتیدا پێستمان دەلێسایەوە مووو قژمان دەپۆشی و دارو بەردمان دەپەرست، لەو بارەدا بووین کە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆ ناردین کە دایكو باوکی دەناسین، پێغەمبەرمان کە نێردراوی خوایە فەرمانی پەیامی پەروەردگاری پێ گەیاندین کە هەرکەسمان بەرەو بەهەشتو خۆشییەك دەچێت کە هەرگیز وێنەی نەبووە، هەرکەسیش لە ئێمە بمێنێتەوە گەردنی ئێوە دەگرێتە دەست.[1]

بەیهەقی لە تەلقەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای ئەبودەرداو وتی ئەی ئەبو دەردا، ماڵت سوتا، وتی نەسوتا، دواتر کەسێکی تر هات هەمان شتی وت، وتی نەسوتا، کەسێکی تر هاتو هەمان شتی وت، وتی نەسوتا، پاشان کەسێکی تر هاتو وتی ئەبو دەردا ئاگر کەوتەوە تا گەیشتمە لای ماڵی تۆ لەوێ کوژرایەوە، وتی زانیم خوا واناکات، وتی ئەبو دەردا نازانین سەرمان لە کام قسەت سوڕ بمێنێ؟ ئەوەی وتت نەسوتا یان ئەوەی وتت زانیم خوا واناکات وتی ئەو وشانەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیست هەرکەس بەیانی بیڵێت موسیبەتەکانی نایەتەڕێ تا شەودێت(اللهم لا إله إلا أنت ربي إلا أنت، عليك توكلت وأنت رب العرش الكريم، ماشاء الله كان وما لم يشأ لم يكن ولا حول ولاقوة إلابالله العلي العظيم، اعلم على كل شيء قدير وان الله قداحاط بكل شيءعلما .اللهم إني اعو ذبك من شرن فسي ومن شر كل دابة انت اخذ بنيا مستها ان ربي على صراط مستقيم).[2]

---

[1]– بوخاری هێناویەتی وەك هەیسەمی دەڵێت، ئەبو نەعیم لە(الدلائل، ص١٩٩) لە بەکری کوڕی عەبدوڵلای موزنیەو زیادی کوڕی حەییەوە بەوشێوە هێناویەتی.

[2]– ضعیف.

پێشتر قسەکەی عەددی کوڕی حاتەممای لە بانگەوازدا هێنا وتویەتی(سوێند بەوەی گیانمی بە دەستە سێیەم دەبێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ یان قسەکەی هیشامی کوڕی عاص و جگە لەویش بۆ جبللەی کوڕی ئەیهم لە ناردنی هاوەڵان بە کۆمەڵ بۆ بانگەوازەکە وتی: بەخوا ئەم شوێنی دانیشتنەت دەبەین و دەسەلاتی گەورە دەبەین بە ویستی خوا، پێغەمبەرمان موحەممەد(ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین، هەروەها وتەی عەلی(رضي الله عنه) بۆ ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە گرنگیدانی ئەبوبەکر بە ناردنی سوپا بۆ شام کە وتی: پێم وایە ئەگەر خۆت بچیت یان کەسێك بنێریت بۆیان پشت بە خوا بەسەریاندا سەردەکەویت، وتی خوا موژدەی خێرت پێبدات چۆن ئەوەت زانی؟ وتی لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو(لایزال هذا الدین ظاهر علی کل من ناوأه حتی یقوم الدین وأهله ظاهرون) واتە(بەردەوام ئەم ئایینە سەردەکەوێت بەسەر هەموو ئەوانەی دژایەتی دەکەن، تا ئایین زاڵ دەبێت و دارو دەستەشی زاڵ دەبن)، وتی سوبحانەڵلا، ئەم فەرموودە چەندە جوانە. بەڕاستی دڵخۆشت کردم پێی خوا دڵخۆشت بکات. دواتریش قسەی ئیبن عومەر دێنین کاتێ گوێی شێری گرت و ڕای کێشا و لەسەر ڕێ لایبرد و وتی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر تۆ درۆی نەفەرموو کاتێ فەرمووی(إنما یسلط علی إبن آدم ماخافه إبن آدم، ولو أن إبن آدم لم یخف إلا الله لم یسلط علیه غیره) واتە(هەرچییەك ئادەمیزاد لێی بترسێت بەسەر ئادەمیزاد دا زاڵ دەبێت، ئەگەر ئادەمیزاد تەنها لە خوا بترسایە جگە لە خۆی هیچ بەسەریدا زاڵ نەدەبوو).

# دڵنیا بوون لە پاداشت دانەوەی کارەکان

ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن ڕاهەویەو عەبدی کوڕی حەمیدو حاکمو جگە لەوانیش لە ئەبو ئەسماوە هێناویانە دەڵێت: ئەبوبەکر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نانی دەخوارد کە ئەم ئایەتە دابەزی ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ ئەبوبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا هەرچی خراپەمان کردووە دەیبینینەوە؟ فەرمووی ئەوەی پێتان ناخۆشە دێتە ڕێتان ئەوە پاداشتی ئەوەتانە، خێریش دوا دەخرێت بۆ خاوەنەکەی بۆ ڕۆژی دوایی. ئیبن مەردەویە لە ڕێگەی ئەبو ئیدریسی خەوەلانیەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەی ئەبوبەکر نابینیت ناخۆشی دێتە ڕێت ئەوە لە کێش و قورسایی خراپەکانە، کێش و قورسایی چاکەکانت هەڵ دەگیرێن بۆ ڕۆژی دوایی بەڕاست دانانی ئەمەش لە کتێبی خوادا هەیە ﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾[1,2].

عەبدی کوڕی حەمیدو ترمذیو ئیبن مونزیر لە ئەبو بەکرەوە(ر.ض) هێناویانە دەڵێت: من لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بووم کە ئەم ئایەتە دابەزی ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِن دُونِ اللّهِ وَلِيّاً وَلاَ نَصِيراً﴾ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(یا ابا بکر إلا اقوئك ایة انزلت علی) واتە(ئەی ئەبوبەکر ئایا ئایەتێکت بۆ بخوێنمەوە کە بۆم دابەزی؟) وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆی خوێندمەوە، نەمزانی چی بوو هێندەم زانی پشتم شکانێکی بە خۆوە دی، بەرەو لای لاربوومەوە، فەرمووی(ماسأنك یا ابا بکر) واتە(ئەبوبەکر چیتە؟) وتم ئەی پێغەمبەری خوا جا کاممان خراپەی نەکردووە؟ ئایا لەسەری پاداشت(سزا) دەدرێینەوە؟ فەرمووی(أما أنت یا أبا بکر والؤمنون فتجزون بذلك فی الدنیا حتی تلقون ولیس لکم ذنوب، وأما الأخرون فیجمع الله ذلك لهم حتی یجزوا

[1] - صحیح.

[2] - لە(کنزالعمال ج١، ص٢٧٥) دا واهاتووەو دەڵێت: ئیبن حەجەر لە(اگرف) لە موسنەدی ئەبوبەکردا هێناویەتی.

بـە یـوم القیامـة) واتـە(ئـەی ئەبوبـەکر تـۆو بـاوەڕداران لـە دنیـادا پاداشـتی ئـەوە دەدرێنـەوە تـا دەگەنـەوە بە خـواو تاوانتـان نییـە، ئەوانی دیکە خوا ئەوەیان بـۆ کۆدەکاتەوە بۆ ڕۆژی دوایی تا لەوێ پاداشت(سزا) دەدرێنەوە)[1,2].

ئەحمـەدو ئـیبن مـونزیرو ئـەبو یـەعلاو ئـیبن حبـانو حـاکمو بەیهـەقیو جگـە لەوانیش لە ئەبوبەکری صدیقەوە هێناویانە، وتـی ئـەی پێغەمبـەری خـوا دوای ئـەو ئایەتە خێرو خۆشی لە چی دا بێت ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ﴾ هـەموو خراپەیـەك کە کردومانە پاداشتی خراپی لەسەر وەردەگرین، فەرمووی(غفرالله لك یا أبا بکر ألـست تمـرض؟ ألـست تنـصب؟ ألـست تعـزب؟ ألـست تـصیبك الـلأواءە ألـست تنکـب؟) واتـە(خـوا لێـت خـۆش بێـت ئـەی ئەبوبـەکر، ئایـا تـۆ نـەخۆش نەدەکـەویت؟ ئایـا ناخۆشی نابینی؟ ئایا خەفەتبار نابیت؟ ئایا سەختیو ناڕەحەتیت نایەتـە ڕێ؟ ئایـا هـیلاكو نالـەباری نایەتـە ڕێـت؟)وتـی بـا، فـەرمووی(فهـی مـا تجـزون بـە فـی النیـا) واتە(دەی ئەوەیە لە دنیادا سزای لەسەر وەردەگرن)[3,4].

ئیبن ڕاهەویە لە موحەممەدی کوڕی مونتەشرەوە هێناویـەتی دەڵێـت: کەسـێك بە عومـەری کـوڕی خـەتتابی(رضي الله عنه) وت: مـن دەزانـم سـەخترین ئایـەتی قورئـان کامەیـە، عومەر هەستاو بە گۆچان لێیداو وتـی پـەردەت لەسـەر لاداوە تـا بیزانیـت؟ چـوو تـا بەیانی هات عومەر وتی ئەو ئایەتە چی بوو دوێنێ باست کرد؟ وتی ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ﴾ هـەرکاممان خراپەیـەك بکـات لەسـەری سـزا دەدرێ، عومـەر(رضي الله عنه) وتـی: کاتـێ

---

[1] – ضعیف.

[2] – ترمـزی دەڵێـت: فەرموودەکـە غەریبـەو لـە سـەنەدەکەیدا قسە هەیـە، موسـای کـوڕی عوبەیـدە لاوازی لە فەرموودەدا هەیە، مەولای ئیبن سباع نادیارە. ئەم فەرموودە جگـە لـەم ڕووەوە لـەڕووی دیکەوە لە ئەبوبەکرەوە گێڕدراوەتەوەو سەنەدی صەحیحی نییە.

[3] – ضعیف.

[4] – لە(کنزالعمال ج١، ص٢٣٩) دا واهاتووە.

دابەزی نان و ئاو سودی نەبوو بۆمان تا دوای ئەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند و مۆڵەتیدا ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُوراً رَّحِيماً﴾.[1]

ئیبن ماجە لە عەبدورەحمانی کوڕی ثەعلەبەی ئەنساری لە باوکییەوە هێناویەتی عومەری کوڕی سەمرەی کوڕی حەبیبی کوڕی عەبد شەمس هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا من وشترێکی بەنی فلأنم دزیوە، پاکم بکەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لایان، وتیان ئێمە بۆ وشترێکمان دەگەڕێین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد دەستیان بردی ئەویش دەیوت: سوپاس بۆ ئەوخوایەی پاکی کردمەوە لە تۆ، ویستت جەستەم ببەیتە ناو دۆزەخ؟[2].[3]

ئیبن ئەبی حاتەم لە حەسەن لە عمرانی کوڕی حوصەینەوە هێناویەتی دەڵێت: هەندێ لە هاوەڵان چوون بۆ لای و لەشی تووشی نەخۆشی ببوو، یەکێکیان وتی: ئێمەش پێت دڵگران دەبین کاتێ دەبینین وایت، وتی دەی دڵگران مەبە، چونکە ئەوەی دەبینیت بەهۆی تاوانەوەیەو ئەوەی خوا دەیسڕێتەوە زیاترە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿مَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾.[4]

ئەحمەد لە الزهد و ئەبونەعیم لە(الحلية) لە ئەبوضمرەوە هێناویەتی – واتە ئیبن حەبیبی کوڕی ضەمرە – وتی: کوڕێکی ئەبوبەکر سەرەمەرگی هات، گەنجەکە سەیری سەرینێکی دەکرد، کە ئەو مرد بە ئەبوبەکریان وت: بینیمان کوڕەکەت چاوی لەسەر سەرینەکە بەرزیان کردەوە سەیریان کرد لە ژێریدا پێنج یان شەش

---

[1] – لە(کنز العمال ج١، ص٢٣٩) دا هاتووە

[2] – ضعیف.

[3] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٥٦) دا واهاتووە.

[4] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص١١٦) دا واهاتوە.

دینار هەیە، ئەبوبەکر دای بەسەر دەستیداو دەیوت:(إنا لله وإنا إليه راجعون)، وام دا نەنا پێستت بەرگەی ئەمە بگرێ.[1]

پێشتر لە باسی قسە وتن بە مسوڵمانانداا فەرمایشتی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) هێنا کاتێ بە کەسێکی وت کە هات بۆ لای و لەسەر مەملوکەکانی پرسیاری لێکرد فەرمووی(إذا كان يوم القيامة يحسب ماخانوك وعصول وكذبوك، وعقابك إياهم فوق ذنوبهم إقتص لهم منك الفضل) واتە(کە ڕۆژی دوایی هات حساب دەکرێ چەند ناپاکیان لە ڕوودا نواندویت و بە درۆیان زانیون و لێت یاخی بوون، سزای تۆش بۆیان بەپێی تاوانیان بەسە نەبۆت و نە لە دژت، ئەگەر سزات بۆیان لە تاوانیان زیاتر بوو تۆڵەی زیاترەکەیان بۆ دەکرێتەوە لێت) کابرا سەری دانەواندو دەگریا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو(أما تقرأ قول الله(ونضع الموازين القسط يوم القيامة) کابرا وتی ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خێر لەوەدایە لێی جیابمەوە، تۆ شاهیدبە هەموویان ئازادن[2,3].

## بەهێزی باوەڕی هاوەڵان(رضي الله عنهم)

ئەحمەد لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی(لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ))(البقره ٢٨٤) ئەوە لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەخت بوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و لەسەر ئەژنۆ کەوتن و وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە کاردا ئەوەمان لەسەر داوا کراوە کە دەیتوانین لە نوێژو ڕۆژوو و جیهادو صەدەقەدا – ئەم ئایەتەش دابەزیوە بۆ سەری بەرگەی

---

[1]– لە(کنزالعمال ج٢، ص١٤٥) دا واهاتووەو دەڵێت: حوکمی مەرفوعی هەیە، چونکە هەواڵ لە بارەی بەرزەخەوە.

[2]– صحیح.

[3]– ترمزی لە عائیشەوە بەوشێوە هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەش جێ متمانەن.

ناگرین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اتریدون ان تقولوا کما قال اهل الکتابین من قبلکم(سمعنا وعصینا) بل قولوا سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا وإلیك المصیر) واتە(ئایا دەتانەوێت وەك ئەو دوو دەستەی ئەهلی کیتاب بڵێن کە لە پێش ئێوەوە بوون وتیان بیستمان و یاخی بووین، بەڵکو بڵێین بیستمان و گوێ ڕایەڵ دەبین، خوایە لێبوردن بۆمان گەڕانەوەش هەر بۆ لای تۆیە) کاتێ ئەوەیان دان پێدا ناو زمانیان وتی خواش بە دوایدا ئەم ئایەتەی نارد ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾(البقرة ٢٨٥) کاتێ ئەوەیان کرد خوا نەسخی کردەوەو ئەم ئایەتەی دابەزاند(لا يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ).[1]

ئەحمەد لە موجاهیدەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای ئیبن عەبباس و وتم: ئەی ئەبو عەبباس من لای ئیبن عومەر بووم، ئەم ئایەتەی خوێند و گریا، وتی کام ئایەت؟ وتم(ان تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ) ئیبن عەبباس وتی: ئەم ئایەتە کاتێ دابەزی کاتێ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر پێی دڵگران بوون و تەواو تووڕەی کردن و وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ماڵ وێران بووین، ئێمە لەسەر قسەو کردارمان شتمان لەسەر دەنوسرا ئێستا لەسەر دڵەکانیشمان کە لەدەست خۆماندا نییە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون(بڵێن بیستمان و گوێ ڕایەڵ دەبین)(وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) وتیان بیستمان و گوێ ڕایەڵ دەبین، ئەم ئایەتەی سڕیەوە ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ بەوە وتەی دەروونیان لەسەر لابرا و تەنها کرداریان لەسەر دانرا. هەروەها لە ڕێگەی سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبن عەبباسەوە بە

[1] – موسلیم بە هەمان شێوە هێناویەتی.

کورتی هێناویەتی و تیایدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بڵێن بیستمان و گوێ ڕایەڵ بووین و خۆمان بەدەستەوە دا) خوای گەورە باوەڕی خستە ناو دڵیانەوە.[1]

ئیبن ئەبی حاتەم لە عەبدوڵڵاوە(ر.ض) هێناویەتی دەڵێت کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ﴾ ئەوە لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) سەخت بوو وتیان کاممان ستەم لەخۆی دەکات؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(وانییە کە ئێوە گومانی بۆ دەبەن، بەڵکو بە کوڕەکەی وت ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ بوخاری هێناویەتی، ئیبن مەردەویە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(پێم وترا تۆ لەوانەیت).[2,3]

ئیبن ئەبی حاتەم لە صەفیەی کچی شەیبەوە هێناویەتی دەڵێت: لە لای عائیشە بووین باسی ئافرەتانی قوڕەیش و گەورەییان کرا، عائیشە وتی: ئافرەتانی قوڕەیش فەزڵیان هەیە و بەخوا من لە ئافرەتان پشتیوانان بە فەزڵترم نەدیوە لە بەڕاست دانانی کتێبی خواو ئیمان بە دابەزینی قورئاندا لەوان توندترو گەورەتر نییە، سورەتی نور دابەزی ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ پیاوەکانیان چوونەوە بۆ لایان ئەو ئایەتانەیان بۆ خوێندنەوە و کەس هەبوو دەیخوێندەوە بەسەر ژن و خوشك و کچ و نزیکانیدا هەرکامیان هەڵدەسا دەچوو بۆ لای جلە خوریەکەی و دەی پێچا بە خۆیەوە وەك بەڕاست دانان و بڕوابوون بە دابەزێنراوی خوا لە

---

[1] – موسلیم بەو شێوە هێناویەتی، ئیبن جەریر لە چەند ڕێگەیەکی دیکەوە لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی، ئەوانەش لە ئیبن عەبباسەوە چەند ڕێگەیەکی صەحیحن.وەك لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج١، ص٣٣٨) دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٢، ص١٥٣). ر

قورئانەکەیدا، لە پشت پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەك ئەوە وابوون سەریان قەلە ڕەش بێت.[1] [2]

ئیبن ئەبی حاتەم لە مەکحولەوە هێناویەتی دەڵێت: پیرێك هات کە پێڵوەکانی چاوی لەسەر چاوانی کەوتبوون وتی ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك ناپاکی کردو لایدا چی پێویستی و شتی هەبوو بەدەستی دەخست، ئەگەر خراپەی بەسەر زەویدا دابەش بکرێت قوڕ بەسەریان دەکات، ئایا تەوبەی بۆ هەیە؟ فەرمووی(ئایا مسوڵمان بویت؟) وتی شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نییە جگە لە خوای تاك و بێ هاوتا و موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایە، فەرمووی(فأن الله غافر لك غوراتك و فجراتك ومبدل سيئاتك حسنات ما كنت كذلك) واتە(خوا لە ناپاکیەکان و لا دانەکانت خۆش دەبێ و خراپەکانت دەکات بە چاکە تا کاتێ بەوجۆرە بیت) وتی ئەی پێغەمبەری خوا تەنانەت ناپاکی و دەرچوونەکانیشم؟ فەرمووی(وغراتك وفجراتك) واتە(ناپاکی و دەرچونەکانیشت) کابراش ڕووی هەڵکردو چوو "الله اكبر" و "لاإلـه إلا الله" ی دەوت.

تەبەرانی لە ئەبو خەروەوە هێناویەتی هات بۆ لای پێغەمبەر وتی: ئەرێ کەسێ هەموو تاوانەکانی کردبێ و چی پێویستی بوو بێ و بەدەستی خستبێ ئایا تەوبەی بۆ هەیە؟ فەرمووی(مسوڵمان بووین؟) وتی بەڵێ، فەرمووی(فافعل الخيرات واترك السيئات فيجعلها الله لك خيرات لها) واتە(دەی چاکەکان بکەن واز لە خراپەکان بێنە خوا هەموویان دەکات بە چاکە بۆت) وتی ناپاکی و دەرچونەکانیشم؟ فەرمووی بەڵێ، کابراش تا چوو هەر الله اكبرى دەکرد.[3]

---

[1] – ضعيف.

[2] – ئەبو داود لە جگە لە ڕێگەی صەفیەی کچی شەیبەوە هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص٢٨٤) دا واهاتووە.

[3] – ئیبن کە پیر(ج٣، ص٣٢٨) دا واهاتووە.

ئیبن حاتەم لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێ هات بۆ لام وتی: ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ زینام کردوو منداڵم بوو منداڵەکەمم کوشت، وتم: نا چاوت نەحەسێتەوەو ڕێزت نەبێ، ئەویش هەستاو پەژارە دای گرتبوو، پاشان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەیانیم کردو بۆم باسکرد ژنەکە چی وت و منیش چیم پێوت، فەرمووی(خراپت وت، مەگەر ئەم ئایەتە ناخوێنیتەوە ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً {٦٨} يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً {٦٩} إِلَّا مَن تَابَ﴾(الفرقان:٦٨-٧٠) منیش خوێندمەوە بۆ ژنەکە، ئەویش کڕنووشی بردو وتی سوپاس بۆ خوا کە دەروونی لێکردمەوە، ئەم فەرموودە لەم ڕووەوە نامۆیەو کەس هەیە لە سەنەدەکەدا کە ناناسرێت، ئیبن جەریر بە سەنەدی خۆی بەو شێوە هێناویەتی و لای ئەو هاتووە: ژنەکە بە پەژارەوە دەرچوو و دەیوت: ئەی هاوار ئەم چاکە بۆ دۆزەخ دروست کراوە؟ هەروەها دەڵێت کاتێ ئەبو هورەیرە لای پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بەهەموو کۆڵانەکانی مەدینەدا گەڕا بەدوای ژنەکەداو نەی دۆزییەوە، بۆشەوی دواتر ژنەکە هات بۆ لای، ئەویش وتی پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرمووە، ژنەکەش سوجدەی بردو وتی: سوپاس بۆ خوا کە دەرووی لێکردمەوەو لەوکارەم تەوبەی پێ بەخشیم، کە نیزەکێکی پێبوو لەگەڵ کچەکەیدا هاتبوون، کەنیزەکەکەی ئازاد کردو تەوبەی کرد[١][٢].

ئیبن ئیسحاق لە ئەبولحەسەنی مەولای تەمیمی داریەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی(والشعراء يتبعهم الغاون) حەسانی کوڕی ثابت و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەو کەعبی کوڕی مالیك هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و دەگریان وتیان: خوا ئەو ئایەتەی دابەزاندو دەزانێت ئێمە شاعیرین، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی

---

[١] - ضعيف.

[٢] - لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص٣٢٨) دا واهاتووە.

خوێندەوە ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ فەرمووی(ئێوە)(وذكرالله كثيرا) فەرمووی(ئێوە)(وانتصوا من بعد ما ضلموا) فەرمووی(ئێوە).[1]

لە ئەبو حەسەنەوە بە دەقی ئیبن حاتەم هێناویەتی. ئەحمەد لە عەتای کوڕی سائیمەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکەم ڕۆژ کە تیایدا عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلام بینی پیرێکی سەرو ڕیش سپیم لەسەر گوێ درێژێ بینی بە دوای تەرمێکەوە بوو، بیستم دەیوت فلانی کوڕی فلان پێی وتم لە پێغەمبەری(ﷺ) بیست دەیفەرموو(من أحب لقاءالله أحب لقاءه ومن كرع لقاء الله كره لقاءه)(هەرکەس حەز بکات بگات بە خوا خوایش حەز دەکات بگات پێی، هەرکەس ڕقی بێت بگات بە خوا خواش حەز ناکات پێی بگات) هەمووان گریان، وتی بۆچی دەگرین، وتیان ئێمە ڕقمانە لە مەرگ، وتی ئەوە ناگرێتەوە، بەڵکو کاتی سەرە مەرگە(فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ {٨٨} فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ)(الواقعة: ٨٨-٨٩) ئەگەر موژدەی ئەوەی پێدرا حەز دەکات بگات بە خوا، بۆ ئەوی دیکەش﴿ وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ {٩٢} فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ {٩٣} وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ کە ئەو موژدەی پێدرا حەز ناکات بە خواو خواش زیاتر حەز ناکات پێی بگات[2].[3]

ئیبن جەریر لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی(إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا) ئەبوبەکر دانیشتبوو کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی گریا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەبوبەکر بۆچی دەگریت؟ وتی ئەو سورەتە دەم گریەنێت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(لولا انكم تخطئون وتذنبون

---

[1]- ئیبن حاتەمو ئیبن جەریر لە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاقەوە هێناویانە، ئیبن ئەبی حەسەنی مەولای بەنی نەوفەل بەو واتایە هێناویەتیو باسی کەعبی نەکردووە. وەك لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٣، ص٣٥٤) دا هاتووە.

[2]- صحیح.

[3]- لە(تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٣٠١) دا واهاتووە.

فيغفرالله لكم لخلق الله أمة يخطئون ويذنبون فيغفر لهم) واتە(ئەگەر ئێوە هەڵەو تاوان نەکەنو خوا لێتان خۆش بێت ئەوا بە دڵنیاییەوە خوا ئوممەتێك دروست دەکات کە هەڵەو تاوان دەکەمو لێیان خۆش دەبێت)[1][2].

ئەبوشەیخ وحاکم لە(الکنی)و بەیهەقی لە کێتبی(عذاب القبر) و ئەبەهانی لە(المجە)وجگە لەوانیش لە عومەرەوە هێناویانە دەڵێت :(پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم ئەی عومەر کاتێ لەنێوان چواربالی ناو زەویدا لە دوو باڵدا بێتو مونکەرو نەکیرت بینی چۆن دەبێت؟)(يا عمر كيف انت إذا كنت في اربع اذرع من الأرض في ذراعين ورأيت منكرا نكيرا) وتم ئەی پێغەمبەری خوا مونکەرو نەکیر چین؟ فەرمووی(فتانا القبر يبعثان القبر بأنيا بهما ويطان في اشعارهما، أصواتهما كالعرد القاصف وابصارهما كالبرق الخاطف، معها مزربة، لواجتمع عليها اهل منى لم يطيقوا رفعها. هي أيسر عليها من عصان هذه – وبيد رسول الله عصية يحركها – فامتعناك فإن تعاييت أو تلويت ضربال بها ضربة تصير بها رماد) واتە(دوو تاقیکەرەوەی ناو گۆڕن، بە کەڵبەکانیان بەناو گۆڕدا دەگەڕێنو بەسەر قژیاندا دەکەون(دەچن) دەنگیان وەك هەورەگرمەی توند وایەو چاوەکانیان وەك هەورە بروسکەی کتوپڕو لەناوبەر وان، مەقاشێکیان پێیە ئەگەر خەڵکی مینا کۆبنەوە بۆی ناتوانن بەرزی بکەنەوە. ئەوە بۆیان لەم گۆچانەی من ئاسانترە– بە دەستی پێغەمبەرەوە(ﷺ) گۆچانۆکەیەك بوو کە دەیجولاند– تاقیت دەکەنەوە، ئەگەر توانای وەڵام دانەوەت نەبوو یان پێچت پێدا بەوە وا لێت دەدەن کە پێی دەبیت بە خۆڵە مێش) وتم ئەی پێغەمبەری خوا من لەسەر ئەو بارەمم، فەرمووی(بەڵێ) وتی دەی چاریان دەکەم،(خۆمیان بۆ ئامادە دەکەم)[3][1].

---

[1] – حسن.

[2] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٤، ص٥٤٠).

[3] – ضعیف.

سەعیدی کوڕی مەنسور بە هەمان شێوە هێناویەتی و عەبدولواحدی مەقدیسی لە کتێبی(التبصیر) دا بۆی زیاد کردووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(سوێند بەوەی بە حەق بە پێغەمبەر ناردوومی جبریل هەواڵی پێدام ئەو دووانە دێن بۆ لات و پرسیارت لێدەکەن و تۆیش دەڵێیت خوا پەروەردگارمە ئەی ئێوە پەروەردگارتان کێیە؟ موحەممەد پێغەمبەرمە ئەی کێ پێغەمبەرتانە؟ ئیسلام ئایینمە ئەی ئایینی ئێوە چیە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی چەند سەر سوڕهێنەرە. نازانین ئێمە نێردراوین بۆ لای تۆ یان تۆ نێردراویت بۆ لامان).[2]

ئیبن عەساکیر لە ئەبو بەحریەی کندیەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب ڕۆژێ دەرچوو، لە کۆڕێکدا بوو کە عوسمانی کوڕی عەففانی تێدا بوو، وتی کەسێکتان لەگەڵە ئەگەر باوەڕی لەنێوان سەربازانێکدا دابەشکرا بەشی دەکردن – مەبەستی عوسمانی کوڕی عەففان بوو –.[3]

پێشتر لە باسی سیفەتی هاوەڵاندا قسی ئیبن عومەرمان هێنا کە پرسیاری کرد: ئایا هاوەڵان پێدەکەنین؟ وتی بەڵێ ئیمانی دڵیشیان لە شاخەکان گەورەتر بوو. عەمماریش لە خۆڕاگری لەسەر سەختیەکان وتی: دڵم بە ئیمان ئارامی دەگرت. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(دڵت چۆنبوو؟) واتە کاتێ بێباوەڕان گرتیان و وازیان لێ نەهێنا تا بە چاك باسی خواوەندەکەی کردن.[4]

---

[1] – لە(کنزالعمال ج٨، ص١٢١) دا واهاتووە.

[2] – وەك لە(الریاض النضرة ج٢، ص٣٤) دا هاتووە.

[3] – لە(المنتخب ج٥، ص٨) دا واهاتووە.

[4] – ئەبونەعیم لە(الحلیە) و ئیبن سەعد لە ئەبو عوبەیدەوە هێناویانە، ئیبن جەریرو بەیهەقی هێناویانە لە تەفسیری ئیبن کەسیر(ج٢، ص٥٨٧) دا هاتووە.

ئەبوبەکر لەسەر خەلیفە دانانی عومەر وتی بە پەروەردگارم دەمترسێنن؟ دەڵێم خوایە چاکترین بەندەتم لەسەر دانان، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا وتی: من لە ئێوە باشتر خواو عومەریش دەناسم، عومەر لە دابەشکردنی هەموو شتی ناو بەیتول ماڵدا بەوکەسەی وت کە دواندی تا بۆ دوژمن یان وشکە ساڵی لە بڕێکی بهێڵێتەوە پێی وت شەیتان لەسەر زمانتە، خوا بەڵگەی ئەوی فێر کردومو لە خراپەی پاراستومی، پێغەمبەر(ﷺ) چی بۆ ئامادەکردووە ئەوەی بۆ ئامادە دەکەم، گوێڕایەڵی و خواو پێغەمبەرەکەی، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: سوێند لەبەر بەیانی لەخوا لانادەم، لە گێڕانەوەیەکی دیکەشدا وتی: لەخوا ترسی خوایان بۆئامادە دەکەم(وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً) یان عەلی(ر.ض) لەباسی حەزی هاوەڵان بۆ بەخشین وتی: باوەڕی بەندەیەك ڕاست نییە تا ئەوەی لە لای خوایە لای دڵنیاتر بێت لەوەی لە دەستی خۆیدایە، کاتێ ویستی ببەخشێت بە داواکارو فاتیمە وتی من شەش درهەمم داناوە بۆگەنم، عامری کوڕی ڕەبیعەش لە باسی گێڕانەوەی ساماندا وتی: هیچ پێویستم بەو برە بڕینەوەت نیە، ئەمڕۆ سورەتێك دابەزی کە لە دنیا بێزاری کردووین(اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مَّعْرِضُونَ).

حاکم(ج٣، ص٢٨٨) لە عائیشەوە هێناویەتی ئوسەیدی کوڕی حوزەیر لە کەسە زۆر چاکەکان بوو، دەیوت ئەگەر من وەك ئەوەبم کە لە یەکێ لە باسی بارمدا بم، بەهەشتی دەبمو گومانم لەوە نییە، کاتێ قورئان دەخوێنمو گوێی لێدەگرم، کاتێ گوێم لە وتاری پێغەمبەرە(ﷺ) کاتێ بەشداری ناشتنی تەرمێکم، هەر تەرمێ ئامادە بووم بە خۆمم وتوە چی پێدەکرێت و چی دێتە ڕێ.[1]

---

[1]- حاکم دەڵێت ئەم فەرموودە صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیان هێناوە، زەهەبی دەڵێت صەحیحە.

# پێرست